تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

خەلیفەی یەکەم

# ئەبووبەکری صیددیق

## خوای لێ ڕازی بێت

نووسینی
دکتۆر علي محمد الصّلابي

وەرگێڕانی
مامۆستا عومەر تۆفیق الخطّاط

کتێبخانەی نارین
هەولێر

دار المعرفة
بەیرووت

خەلیفەی یەکەم

# ئەبوو بەکری صیدیق

خوای لێ ڕازی بێت

خەلیفەی یەكەم

# ئەبوو بەكری صیددیق

خوای لێ ڕازی بێت


نووسینی

دكتۆر علي محمد الصّلابي

وەرگێڕانی

مامۆستا عومەر تۆفیق الخطّاط



كتێبخانەی نارین

هەولێر

دار المعرفة

بەیرووت

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله مستحق الحمد..

والصلاة والسلام على رافع لواء المجد محمد وعلى آله الطيبين وصحبه الميامين..

أما بعد

پێشەکـــی نووسەر:

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستهديه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات اعمالنا، ومن يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادى له واشهد أن لا اله الاّ الله وحده لاشريك له، واشهد أن محمداً عبده ورسوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾النساء: ١

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب: ٧٠-٧١.

پاشان... ئەی پەروەردگار سوپاس بۆتۆ، سوپاسێ کە شایەنی گەورەیی خۆت بێ و مەزنی دەسەڵاتت، سوپاس بۆتۆ تاڕازی دەبیت و سوپایش بۆتۆ کاتێ ڕازیش دەبیت..

هەر لەسەردەمی منداڵیەوە شەیدای ژیانی –ئەبوبکری صدیق بووم- خوای لێ ڕازی بێت- زۆر تامەزرۆی خوێندنەوەو بیستنی ژیاننامە گوڵاویەکەی بووم، ڕۆژان تێپەڕین و ساڵان ڕۆشتن،

خوای تەعالا ڕێزداری کردم بە خوێندن لەزانکۆی ئیسلامی لە شاری مەدینەی مونەوەرە، لەناو ئەو وانانەدا کە بڕیار بوو بیخوێنین وانەی مێژووی ئیسلام و مێژووی جێ نشینە ڕاشیدەکان بوو،

مامۆستای وانەکە داوای لێ کردین کە بە مادەی دیاری کراوەوە نەوەستین کە کتێبی (مێژووی ئیسلام)ی دوکتتور محمود شاکر بوو، بەڵکو ڕێنموونی کردین بە خوێندنەوەی هەردوو کتێبی (البداية والنهاية)ی (ابن كثير) و (الكامل في التأريخ)ی (ابن الاثير) بۆ زیاتر ئاشنابوون بە ژیانی (الصديق))

ئەو ڕێنمونیانە –پاش یارمەتی خوای گەورە- بوونە هۆی ئاشنابوونم دەربارەی کەسایەتی ڕاستەقینەیی و سەردەمەکەی..

هەر کەسەو ناوی نامەی دوکتۆراکەم لەزانکۆی (ام درمان) دیاری کرد لەژێر ناوی (فقه التمكين في القرآن الكريم وأثره في تأخير الأمة) باسەکەم لەسێ بەشدا خۆی دەبینییەوە: یەکەم: (فقه التمكين) لەقورئانی پیرۆزدا، دووەم/ (فقه التمكين) لەژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ، سێ یەم/ (فقه التمكين) لەلای جێ نشینە ڕاشیدەکان.

باسەکەم گەیشتە زیاتر لە (١٢٠٠) لاپەڕە، بەڵام دوکتوری سەرپەرشتیارم پێی باش بوو کە تەنها لەسەر یەکەم بەش بێت کە (فقه التمكين) لە قورئانی پیرۆزەو بەو شێوەیە ڕێڕەوی باسەکەی گۆڕیم و ئەو شێوە تازەیەشی خستە بەردەستی ئەنجوومەنی کۆلیژ و ئەوانیش پێی ڕازی بوون،

پاشان پێی ووتم: پاش بەدەست هێنانی دوکتوراکەت بەیارمەتی خوا دەتوانیت هەردوو بەشەکەی تر کە (فقه التمكين) لەژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ژیاننامەی جێنشینە ڕاشیدەکان وەك کتێب بیاننوسیت بەو هیوایەی خوای گەورە سودمەندی کات بۆ موسڵمانان، بەکۆمەکی خوا بەهۆی هێنانی هۆکاری بەرەو پێش بردن کتێبی (فقه التمكين)ی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بوو بەهۆی پیشاندانی ڕووداوەکان و شی کردنەوەی بەسەرهاتەکان.

ئەم کتێبەی کە ئێستا پێشەکی بۆ دەنووسم دەربارەی (ئەبووبەکر الصديق) کەسایەتی و سەردەمەکەی، چاکەکەی دەگەڕێنمەوە بۆ خوای باڵا دەست و پاشان بۆ مامۆستای

سەرپەرشتیاری دوکتوراکەم و دەستەیەکی چاکەخوازیش لە بانگخوازان و زانایان و مامۆستایان، ئەوانەی هانیان دام بە گرنگی دان بە خوێندنی سەردەمی جیٚ نشینە راشیدەکان..

تەنانەت یەکێکیان پێی ووتم: بۆشایی یەکی گەورە لەنێوان رۆڵەی موسڵمان و سەردەمی جیٚ نشینە راشیدەکان دا دروست بووە، تێکەڵ بوونێکی خراپ ڕووی داوە لە چی لەپێشترە کە گرنگی پیٚ بدریٚ تاوای لیٚ هاتووە بەرەی گەنج بەهەڵەدەوان گرنگی بە ژیانی بانگخوازان و زانایان و چاکەخوازان دەدەن زیاتر لەوەی کە بە ژیاننامەی جیٚ نشینە راشدەکان گرنگی بدەن.

کە ئەو سەردەمە دەوڵەمەندە لە هەموو لایەنێکەوە چ لایەنی ڕامیاری یان ڕاگەیاندن و رەوشت و ئابووری و هزری و جیهادی و فیقهی، کە ئێمە زۆر پێویستمان بەو لایەنانە هەیە،

بەدواداچوون بکەین دەربارەی دەزگاکانی دەوڵەتی ئیسلامی و، وە چۆن بەرەو پێش بران بە تێپەڕبوونی کات، وەك دەزگای دادوەری، دارایی، یاسای جیٚ نشینی، دەزگای سەربازی، دامەزراندنی والی یەکان-سەرکردەکان- و ئەو هەوڵ و تێکۆشان و ئیجتهادی یانەی لەو سەردەمەدا ڕووی دا.. بەتایبەت پاش لێخشانی گەلانی موسڵمان بەشارستانیەتی فارسی و ڕۆمانی و سروشتی بزوتنەوە ڕزگاری خوازی یەکانی موسڵمانەکان.

ئەم کتێبە لەسەرەتاوە تەنها ئەندێشەیەك بوو، خوای گەورە ویستی ببێت بە راستی یەکی بەرچاو، خوا دەستی گرتم، کارەکانی بۆ ئاسان کردم و ناڕەحەتی یەکانی بۆ تەخت کردم، هاوکاریکردم بۆ گەیشتن بەو سەرچاوانە، تاوام لیٚ هات هەوڵ دان بۆ ئەم کارە بوو بە خولیای سەرم و دەستی گرت بەسەر هەست و نەست و بیروهۆشمدا و کردم بە یەکیٚ لە ئامانجە گەورەکانم، شەو نخوونیزۆرم چەشت لەو پێناوەدا و گوێم بە ئازار و ناڕەحەتی و بەربەستەکان نەدا.. هەموو چاکەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ خوای گەورەو میهرەبان.

مێژووی سەردەمی جێنشینە راشیدەکان پڕیەتی لەپەند و ئامۆژگاری، کە پەرش و بڵاوە لە دوو توێی کتێب و سەرچاوە گەروەکاندا، ئیتر هەر لایەنێك هەبێت، چ مێژوویی، فەرمودەیی، فیقهی، ئەدەبی، ڕاڤەیی، کە ئێمە زۆر پێویستمان بەوەیە کۆی کەینەوە و ڕێك و پێکی بکەین و ڕاستی کەینەوە -توثیق- شی بکەینەوە،

مێژووی جێنشینەکان ئەگەر بە جوانی پێش کەش بکرێت، خۆراك بەخش دەبێت بۆ گیانەکان و خاوێن کەرەوەیە بۆ دەروونەکان و رووناکی یە بۆ ژیریی یەکان، دەمەزەرد کەرەوەیە بۆ هیممەتەکان، پەندو وانە پێش کەش دەکات، بیروهۆش پێ دەگەیەنێت.. بێگومان سودێکی باشی لێ وەردەگرین بۆ کاری پەروەردەکردنی بەرەیەکی موسڵمان و گۆش کردنی لەسەر پرۆگرامی پێغەمبەرایەتی، شارەزایش دەبین دەربارەی سەردەمێك کەخوای گەورە دەربارەیان دەفەرمویت: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾ التوبة: ١٠٠.

واتە: (موسڵمانە پێشەینەکانی یەکەمین لە کۆچەریان و پشتیوانان و ئەوانەشی دوای ئەوان هاتن بەچاکی شوێنیان کەوتن، خوا لەوان ڕازی یەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، خوا بەهەشتانێکی بۆ ئامادە کردوون کە کانیاو بەژێر باخچەکانیدا دەڕوات و بەهەمیشەی تیایدادەمێننەوە و ئەوەش بەڕاستی سەرکەوتنی گەورەو مەزنە).

هەروەك لەجێیەکی تردا دەفەرمویت: ﴿مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ٢٩﴾ [ الفتح: ٢٩

واتە: (محمد پێغەمبەری خوایەو ئەوانەشی لە گەڵیدان بەرامبەر کافر و بێباوەڕان توندڕەون و لەناو خۆیاندا نەرم و نیان، دەیان بینێت زۆرکات لەسوژدەو ڕکوعدان).

هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرموێت: (خیر أمتی القرن الذی بعثت فیهم)-مسلم(٤/١٩٦٣-١٩٦٤). واتە: چاکترین ئومەت و گەلی من ئەم سەدەیە کە تیایدانێرراوم:

وە عبدالله ی کوڕی مەسعود-خوا لێی رازی بێ- دەربارەیان دەفەرموێت: (من کان مستناً فلیستن بمن قدمات، فان الحی لا تؤمن علیه الفتنة، أولئك أصحاب محمد -ﷺ- کانوا والله فضل هذه الأمة، وأبرها قاوباً، واعمقها علماً، واقلها تکلفاً، قوماً اختارهم الله لصحبة بنیه،واقامة دینه، فاعرفوا لهم فضلهم، واتبعبوهم من آثارهم، وتمسکوا بما استطعتم من اخلاقهم دینهم، فانهم کانوا علی الهدیً المستقیم) (شرح السنة للبغوي (١-٢١٤-٢١٥).

واتە: هەرکەس دەیەوێت شوێن یەکێ بکەوێت، با شوێنی کەسانی بکەوێت کە مردوون، چونکە زیندوەکان دورنی یە لە تاقیکردنەوە دەرنەچوون، مەبەست لەمردوەکان هاوەڵانی پێغەمبەری خوایە، سوێند بەخوا چاکترینی ئەم ئومەتەن، و خاوەنی پاکترین دڵ و قوڵترین زانست و کەمترین زۆر لەخۆکردن –تکلف- گەلێك بوون خوا هەڵیبژاردن بۆهاورێ یەتی پێغەمبەرەکەی -ﷺ-، بەرپاکردنی ئاینەکەی، چاکەیان پێ بزانن، شوێن پێیان هەڵبگرن، تا ئەتوانن دەست بگرن بە ڕەوشت و ئاینەکەیانەوە، چونکە ئەوان لەسەر ڕێنمایی یە ڕاست و دروست بوون.

هاوەڵان هەستان بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئەم پەڕو ئەوپەڕی دونیادا، سەردەمەکەیان چاکترین سەردەمە، هەرئەوان بوون قورئانیان فێری ئەم ئومەتە کرد و سوننەت و پاشماوەی پێغەمبەری خوایان گێڕایەوە بۆ خەڵکی دوای خۆیان،

مێژووی ئەوان کانزایەکە، شتە گرانبەهاکانی ئەم ئومەتەی تیا شاراوەتەوە لەبیرو هزرو ڕۆشنبیری و زانست و جیهاد و تێکۆشان و بزافی رزگاری خوازیان و هەڵس و کەوتیان لەگەڵ گەل و نەتەوەکان دا نەوەو بەرەکانی داهاتوو سودێکی باش وەردەگرن بۆ بەردەوامی کاروانی ژیان لەژێر ڕێنموونی ڕاست و دروستدا، لەو ڕێگایەوە گرنگی ئامانج و پەیام و گەورەیی و ڕۆڵی خۆی بۆ دەردەکەوێت.

هەر بۆیەش دوژمنانیسەرسەختی ئیسلام بە هەموو بەرەو چینە جیاجیاکانیانەوە هەستیان بە ترسناکی ئەم مێژوە کردووە و دەرکیان بەو کاریگەریە گەورەیەی کردووە لە دروست کردنی

نیشانەکان و تەقاندنەوەی وزەو تواناکانیان.. بۆیە هەستاون بە شێواندن و تێکدان و دەستکاری کردنی و دروست کردنی گومان لەناو دڵی بەرەکانی داهاتوودا..

لەڕابردوودا دەستە گڵاوەکان ڕۆڵیان هەبووە لەم بوارەدا لەم سەردەمەش دا ڕۆژهەڵات ناسەکان —داخ لە دڵە خاچی یەکان- دەستکاریان کرد و چەندان درۆو دەلەسەیان تێ ئاخنی وە،

لەڕابردوودا مێژووی ئیسلامان دوچاری بەهەڵە باس کردن و شێواندنی راستی یەکان بوو لەسەردەستی جولەکەو گاورو مەجوس و ڕافزە، ئەوانەی بەڕواڵەت هاتنە ناو ئیسلام و لەژێرەوەش بەکافریمابوونەوە هەستیان بەوە کرد کە دژایەتی کردنی ئیسلام بەوە دەبێت کە توانج و تانە لەخودی ئاینەکەو کەسایەتی یە ناودارەکانی بدرێت،

دەستیان کردە پیلان دارشتن —بەنهێنی- بۆ ڕوخانی ئیسلام و لەناوبردنی دەوڵەتەکەی، پەرش و بڵاو کردنەوەی شوێن کەوتووەکانی، ئەمەش لەڕێگای هەڵبەستنی هەواڵی درۆو بڵاوکردنەوەی هەواڵە هەڵبەستراوەکان و نانەوەی فیتنە لە دژی جێ نشینی راشیدی سێ یەم — عوسمانی کوڕی عەفان- خوا لێی ڕازی بێ- کە عبداللە ی کوڕی سەبەئی —جولەکە بووە، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە هەڵگیرساندنی ئاگری ئاشوب کە بووبە هۆی شەهید کردنی جێ نشینی سێ یەم و هەروەك هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگ لە نێوان موسڵمانەکاندا لە جەنگی (جەمەل) کە خەریك بوو ئاشتەوایی تەواو بکەوێتە نێوانیان، ئەمەو چەندان جموجوڵ و پیلانی جیاجیا کەمەبەستیش لەوانە لەکەدارکردنی ئسیلام و شوێنکەوتوانی، ئەمەش جگە لەگێڕانەوەی ئەو ڕیوایەتە لاواز، یان دەمهەڵبەستانەی کە لەناو سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامداهاتووە، کە تیایدا شێواندنی ژیاننامەی هاوەڵانە.

وەك —مەسەلەی تەحکیم- کە هەندێکیان بەفێڵ باز، یان گێل، یان کورسی پەرستی و حەز لە دەسەڵات گرتنە دەست تاوانبار دەکەن و ئامانجیش لە وروژاندنی ئەم باسانە لەکەدارکردنی ئیسلام خۆیەتی بەناڕاستەوخۆ، چونکە هاوەڵان ئیسلامیان گەیاندۆتە ئێمە، تانە لێدانیان و کەم کردنەوەی متمانە پێیان تانە لێدان و کەمکردنەوەی متمانەیە لەئیسلام.

ڕۆژ هەڵات ناسەکانیش ئەو ڕووداوە هەڵبەستراوانە یان هێنا —ئەوان و ئەو بەچکە موسڵمانانەش کە لەسەر ئەو بەرنامەی ئەوان بوون- هاتن بە دوور و درێژی دایان ڕشتەوە،

بەڵکو وەك دەست کەوت هەرکەسەو هەوڵی دەدا بەشێکی بگرێتە ئەستۆ مادەم خزمەت بە ئامانجە گڵاوەکانیان دەکات کە ئەویش لەکەدار کردنی ئیسلام و دەم کوتانە سەر ناموسی هاوەڵە بەرێزەکان.[1]

دوژمنان هەستان بە دارشتنەوەی مێژووی ئێمە بەڵام لەسەر پرۆگرامی خوارو خێچی خۆیان، ئەو پرۆگرامە ژەهراویانە کاریان کردە سەر هەندێ لەمێژوو نووسە بەناو موسڵمانەکان، بۆیە نووسینەکانیان لە سەدەی رابردوودا پراوپر نووسینەکانی رۆژهەڵاتناس و جولەکەو مادی یەکان و رافزیەکانیان نقلّ دەکرد، چونکە بیرو بۆچونێکیان دەربارەی ئیسلامی راستەقینەو سروشتە پاکەکەی وەرنەگرتبوو.

چونکە نووسین لەسەر مێژووی ئیسلام بێگومان پێویستی بەتێگەیشتنێکی باش هەیە دەربارەی سروشتی فیکری ئیسلامی و روانینی بۆ ژیان و روداوو شتەکانی تریش، و پێوانەی بۆ بەها بەرزەکانی خەڵکی، و کارتێکردن لەسەر گیان و بیروهۆشەکان، دارشتنەوەی دەروون و کەسایەتی یەکان..

بەتایبەت نووسین لەسەر کەسایەتی یە ئیسلامی یەکان پێویستی بە تێگەیشتنێکی تەواو هەیە لەمەر بەدەمەوەچوون و وەڵام دانەوەی کەسایەتی یە ئیسلامی یەکان بۆ نیگای بیری ئیسلامی،

شێوازی وەڵام دانەوەی ئەو کەسایەتیانە بۆ ئەم نیگایانە مەسەلەیەکی گرنگە لە دارشتنەوی هەست کردنی بەبەها بەرزەکان و شێوازی رەوشتی لە ژیاندا و کاری گەری لەگەڵ رووداوەکان...

وە هەرگیز هیچ کەسێك لە سروشتی فیکرەی ئیسلامی و شێوازی بەرەو رۆچوونی کەسایەتیە ئیسلامی یەکان بۆی، تێ ناگات مەگەر نووسەرێکی باوەردار بەم فیکرەیە و جێگیر

---

[1] سەیری پێشەکی مامۆستا (سید قطب) لەکتێبی (خالدی کوری وەلید)ی شێخ صادق عرجون-لاپەرە (٥).

لە ناو دڵ و دەروونیدا، ئەمەش بۆ ئەوەیە تێگەیشتنی بۆی لەناو کرۆکی ویژدانی یەوە بێت نەك لەدوورەوە بۆی بڕوانێت بە مێشکێکی سارد و ڕەوە.[1]

بەهۆی نەبوونی ئەو پرۆگرامەوە بو کە زۆری مێژوونوسانی هاوچەرخ و نوسەر و ئەدیبەکانی کەوتنە زۆنگاوی ناشیرین کردنی پێشینەکانی ئەم ئوممەتە، وێنەی هاوەڵانیان وا پیشانداکە کۆمەڵەکەسانێ بوون باوەشیان کردبوو بە دونیادا و دەستیان دابووە خوێنڕێژی لەپێناو گەیشتن بە ئاواتەکانیان کە گەیشتنە کورسی دەسەڵات و سەرکەوتن بەسەر نەیارانیاندا..

بەمەش خۆیان دا لەبابەتێك کە زۆر دوور بوو لەراستی ئەو بەرە ناوازەیەی لەقوتابخانەکەی محمد المصطفى ﷺدا پەروەردە بوون.. هەروەك زۆر دوور بوون لە کاریگەری ئیسلام و بیروباوەڕو بنچینەکانی لەسەریان.

بەهۆی ئەم نووسینانەوە بەرەیەك هاتە کایەوە دەربارەی مێژووی خۆی جگە لەشەڕ و شۆڕ و خوێن ڕشتن و فێڵ و ساختە کاری هیچی تر نەزانن، وێنەی هاوەڵان –خوا لێ یان ڕازی بێ- لەبەرچاوی شێوێنرابوو، تا وای لێ هات هەندێ لە موسڵمانان ئەو نووسینە درۆو ناڕاستانە لەم لاو لا بگێڕنەوە بەبێ ئەوەی لەڕاستی و ناڕاستی بکۆڵنەوە، بەڵکو بەس لەبەر ئەوەی لە کتێبی فلان و فلاندا هاتووە.[2]

کەواتە سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی ئیسلامی لەسەر پرۆگرامی (ئەهلی سوننەو جەماعە) زۆر پێویستە بۆ نەوەکانی ئەم ئوممەتە، بۆیە نووسەران و لێکۆڵەرەوان لەم ڕوانگەیەوە پێنووسیان خستە کار، ئەوان لە هیچەوە دەستیان پێ نەکرد، چونکە خوای گەورە ئیسلامەکەی و ئوممەتەکەی پاراست بە فەراهەم هێنانی پیاوانێك هەستن بە لێکۆڵینەوەو ڕاستکردنەوەی مێژووی هاوەڵان و پەردەیان لادا لەسەر هەموو ئەوانەی بەسەر هات و هەواڵیان هەڵبەستبوو بە درۆ لەسەر ژیانیان و چاکەو ئازایەتی یەکەش پاش خوای گەورە دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوایانی (ئەهلی سوننەو جەماعە) لە زانایانی شەرع و فەرموودە، ئەوانەی کە کتێبە سەرچاوەکانیان پڕن

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

[2] **سەیری کتێبی (ابوبکر) –خوا لێی ڕازی بێ- محمد مال الله، ص١٥-١٦.**

لە داستانی ڕاست و دروست و ڕاست کردنەوەی گرنگ کە هەموو درۆ و دەلەسەکانی دایەوە بەناوچاوی خاوەنە درۆزنەکانیانەوە.[1]

منیش لەسەر ڕارەوی ئەهلی سوننە دەستم پێ کرد، ڕووم کردە هەموو سەرچاوە باوەڕ پێ کراوە کۆن و نوێ یەکان .. لە نووسین و پشکنین لەسەر ژیانی جێنشینە ڕاشیدەکان دا بەسەرچاوەکانی وەك تەبەری و ئیبن ئەسیر و زەهەبی یەوە نەوەستام، بەڵکو گەڕامەوە بۆ هەموو کتێبەکانی تەفسیر و فەرموودەو ڕاڤەکانیان، و ژیانی زانایان و هەڵسەنگاندنیان بەزانستی —جرح و تعدیل- و کتێبە فقهی یەکان دەبینم بابەتی مێژوویی زۆریان لەخۆ گرتووە کە لەکتێبە مێژویی یە ناودارەکاندا بەدی ناکرێت،

لە ئەبووبەکری سدیقەوە دەستم پێ کرد و کەسایەتی و سەردەمەکەییم شی کردەوە، ئەو پیاوە سەرداری جێ نشینەکانی ڕاشدینە و پێغەمبەری خوا -ﷺ- هانی داوین و فەرمانی پێ داوین کە شوێن پێیان هەڵگرین و لەسەر پرۆگرام و بەرنامەیان بەردەوام بین وەك دەفەرموێت: (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي)[2]

واتە: بەردەوام بن لەسەر ڕێڕەوی من و ڕێڕەوی جێنشینە ڕاشیدەو ڕێنماکانی دوای خۆم، (ئەبوبەکر الصديق) سەرداری ڕاستگۆیانەو باشترینی پیاوچاکانە پاش نێرراوەکانی خوا — جل جلالە- بەباشترین هاوەڵی پێغەمبەر -ﷺ- زاناترینیان دەژمێردرێت پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەربارەی فەرموویەتی: ((لوكنت متخذاً خليلاً لاتخذت أبابكر، ولكن أخي و صاحبي))[3]، واتە: ئەگەر من دۆستم بگرتایە بێگومان ئەبوبەکرم دەگرت بەڵام برامەو هاوڕێم)).

---

[1] المنهج الاسلامی لکتابة التاريخ- د.محمد المحزون-ص٤

[2] سنن ابی داود ٤-٢٠١، الترمذی ٥-٤٤-حديث حسن صحيح

[3] البخاری-کتاب فضائل الصحابة-ژمارە ٣٦٥٦

هەروەك دەربارەی ئەوە عومەری کوڕی خەتتاب -خوا لێ یان رازی بێ- دەفەرموێت: ((إقتدوا باللذين من بعدي إبي بكر و عمر)[1]، واتە: شوێن پێی ئەو دووانە هەڵگرن کە لەدوای من دەبن: ئەبوبکر و عومەر)).

عومەری کوڕی خطاب -خوا لێی رازی بێ- دەربارەی دەفەرموێت: ((انت سيدنا وخيرنا واحبنا الى رسول الله-ﷺ))[2]، واتە: تۆ ئەی ئەبوبەکر گەورەمانیت و چاکترینمانیت و خۆشەویستترینمان بوویت لەلای پێغەمبەری خوا-ﷺ.

هەروەك علی کوری ابو طالب -خوای لێ ڕازی بێت- دەربارەی ابوبکر محمدی کوڕی حنفیە لێی پرسی: کێ باشترین کەسە پاش پێغەمبەری خوا-ﷺ؟ فەرمووی: ئەبوبکر.[3]

ژیانی ئەبوبەکر -خوا لێی ڕازی بێ- لاپەڕەیەکی پرشنگ دارە لەمێژووی ئیسلامدا، مێژوویەك هەناسەی لە مێژووەکانی تر بڕی و زاڵ بوو بەسەریاندا،

هیچ مێژوویەك و هیچ سەردەمێك نەیتوانیوە بگاتە تۆزی بەشێك لە مێژووی ئیسلام چ لەلایەنی شکوداری و سەربەرزی و چ لایەنی گیان فیدایی و قوربانی دان و بانگەشە بۆ بنەما بەرزەکان، لەبەر ئەوە هەستام بەگەڕان بەدوای هەواڵ و ژیان و سەردەمەکەی ئەبوبەکر -خوای لێ ڕازبێ- لەدوو توێی سەرچاوە بنەڕەتی یەکان داو لەناو دوو توێیاندا دەرم دەهێناو هەستام بەرێك و پێك کردن و ساغ کردنەوەو شی کردنەوەیان تا بەئاسانی بکەوێتە بەردەستی بانگخوازان و وتاربێژان و زانایان و سیاسەتمەداران و بیریاران و سەرکردەی سوپاکان و، دەسەڵات دارانی وڵات و زانست پەروەران، بەڵکو لە ژیانیان سوودی لێ وەربگرن، لەکارەکانیاندا شوێن پێیان هەڵگرن، تا خوای گەورە -عزوجل- سەرفرازی دونیاو قیامەتیان پێ ببەخشێت.

کاتێ هەستام بە تاوتوێ کردنی ڕەوشت و ئاکاری بەرزی -صدیق- و دیمەنە نەبەردیەکانی لە گۆڕەپانی جیهاد و گیان فیدایی دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا -ﷺ-دا و ژیانی لەناو کۆمەڵگای

---

[1] صحيح سنن الترمذي-ئەلبانی(٢٠٠٣)
[2] البخاری کتاب فضائل الصحابة، ژمارە ٣٦٦٨
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو ژمارە ٣٦٧١**

مەدەنی وهەڵوێستە بەرزەکانی پاش مردنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- کە چۆن خوای گەورە بەئەو پیاوە ئوممەتی ڕاوەستاو کرد؟

هەروەك تیشکم خستە سەر روداوی —سەقیفەی بەنی ساعیدە- و ئەو قسەو ڕاگۆڕینەوانەی لەنێوان کۆچەریان و پشتیوانانەدا ڕووی دا..

ئەو قسەو قسەلۆکە نارەوایانەی دراوەتە پاڵ مێژووی —سەقیفەی بەنی ساعیدە-، ئەمەش زیاتر لەلایەن ڕۆژهەڵاتناس و ڕافزیەکان و ئەوانەشی لەسەر بۆچوونی ئەوانن.

هەڵوێستی —ئەبوبەکر-م هێنایەوە دەربارەی ناردنی ئوسامە —خوا لێی رازی بێ- بەسەرکردەی سوپای ئیسلام کە چۆن وانەی مەزنی پێش کەش کرد لەبواری ڕاوێژ شورادا. لەبواری بانگەواز و پێداگری و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و گەڕانەوەی ناکۆکی یەکان بۆلای قورئان و سوننەت و باسی ئادابی جیهاد بەوێنەیەکی پرشنگدار لەڕێنمایی یەکانی —أبوبکر الصدیق- خوای لێ رازی بێ- بە ئاشکرا لەناردنی سوپاکەی ئوسامەدا بەدیار دەکەوێت..

هەستاوم بەڕوونکردنەوەی ڕووداوی —هەڵگەڕاوەکان-الردة-باسی هۆکار و جۆرەکانی و سەرەتای سەرهەڵدانی لەکۆتایی سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا و هەڵوێستی —الصدیق-خوا لێی رازی بێ- لەوبارەیەوە لەکاتی خەلافەتیدا، ئەو پلانە ژیرانەیەی کە دای ڕشت بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردەیەو شێوازی جەنگی لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، پاشان باسی شایستەیی —صدیق-م کردوە کەچۆن پاش یارمەتی خوای —عزوجل- توانی ئەو بزوتنەوەیە سەرکوت بکات بەتەواوەتی..

هەروەك باسی مەرجەکانی زاڵبوون و هۆکارەکانیم کردوە و ڕەوشتەکانی ئەو بەرە زاڵەم باس کردوە کە ئەو سەرۆکایەتی کردوون، ئاماژەم کردوە بۆ سیاسەتمەداری —صدیق- لەجەنگاندن دژی هەموو دەست تێوردانێکی بێگانە بۆ کارو باری وڵاتەکەی، باسی ئاکامەکانی روداوی هەڵگەڕانەوەم کردوەو کە چۆن ئیسلام جیا دەکاتەوە لە هەموو بۆچوون و رەفتار و فیکردا،

باسی بوونی بنکەیەکی تری کەم کردووە بۆ کۆمەڵگا، و ئامادەکردنی کەنداوی عەرەبی وەك ئەو بنکەیە بۆجەنگە ڕزگاریخوازیەکان، و ئامادەکردنی سەرکردایەتی بۆ ئەو جەنگانە، و فقهی ڕووداوی بۆ کێشەی هەڵگەرانەوە، وسوننەتی خوا —جل جلالە- لەوەی کە هەرکەس چاڵ

بۆهەرکەس هەڵکەنێ خۆی تێ دەکەوێ، سەقامگیرکردنی یاسایەکی جوان بۆ بەڕێوەبردن لەکەنداودا،

باسی جەنگە ڕزگاریخوازیەکانی (صدیق)م کردوەو نەخشەو پلانەکانیم ڕوون کردوەتەوە بۆ ڕزگارکردنی عیراق، هەنگاو هەنگاو لەگەڵ خالد دا ڕۆشتووم لەباسی جەنگە ڕزگاریخوازیەکانیدا تا توا خاورووی عێراق لەسەرروویدا بکاتەوە یەکێ لە جەنگە مەزنەکانیندا، کەتیایدا سەرانی وەك موسەنناو قعقاع و خالد ڕۆڵی سەرکردەی پاڵەوانیان بووە و هەر ئەوەش بوو بە بنەمایەکی سەرەکی بۆ جەنگە رزگاریخوازیە گەورەکانی داهاتوو، کە دوای سەردەمی (الصدیق) هاتەکایەوەو بەجارێ مێژووی ئوممەتی ئیسلامی ڕووناك کردەوە بۆ بڵاوبوونەوەی ئاینی خواو جیهاد و قوربانی لەو پێناوەدا کە ئەویش جەنگی قادسیە بوو.

هەروەك بە جوانی باسی ئەو نامانەم کردوەو لەسەریان ڕۆیشتووم کە لەنێوان ئەبوبکر (الصدیق) و خالیدی کوڕی وەلید و عەیازی کوڕی خەنەم (خوایان لێ ڕازی بێ) کەتاییەت بوون بە ڕزگارکردنی عێراقەوە، باسی ئەوەشم کردوە کە چۆن بەنیازیش بووە بدات بەسەر ڕۆمەکانداو بۆ ئەو مەبەستە ڕاوێژی بە هاوەڵە گەورەکان کردووە، باسی دەرکردنی سوپا بۆ وڵاتی یەمەن، و باسی پلان و نەخشە سەربازیەکانیم کردووەو وەسیەت و ئامۆژگاریەکانی کە بۆ سەرکردەی جەنگەکانی دەکرد بەوردی هێناومە،

کە چۆن توانی خالد لەسەرکردایەتی عێراقەوە بگوازێتەوە بۆ شام و بە ئاکام گەیاندنی جەنگی (ئەجنادین و یەرموك)، و باسی سیاسەتەکانی دەرەویم کردوە لەجەنگە ڕزگاریخوازیەکانیدا، کەچۆن هەیبەت و ترسی ووڵاتەکەی دەخستە دڵی وڵاتەکانەوە، و بەردەوام بوونی لەسەر ئەو (جیهاد)ەی کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمانی پێ دابوو لەگەڵ توانایی هەڵس و کەوتی دادپەروەرانە لەگەڵ ئەو گەلە ڕزگارکراوانەو نواندنی نەرم و نیانی لەگەڵیاندا، و لابردنی ئەرکە قورسەکانی سەریان و نەهێشتنی جیاوازی بەشەری لەنێوان ئەوان وبانگخوازاندا.

هەروەك باسی بوونی نەخشەو پلانی جەنگیم کردوە لەلای (الصدیق) کەچۆن نەیداوە بەسەر هیچ گەلێکدا تا بانگی نەکردبن بۆ هاتنە ناو ئیسلام و گەورەیی توانای لە ئامادەکردن و خستنە ڕێی سوپا، بەردەوام کۆمەکی لێ نەبڕینیان و دیاری کردنی ئامانجی جەنگەکان، دیاری کردنی

لێهاتوویی بە ڕۆڵی سەرشانۆی جەنگەکان و بەرەوپێش بردنی شێوازەکان جەنگ، سوور بوونی لەسەر بەردەوام بوونی پەیوەندی خۆی لەگەڵ سەرکردەکانی جەنگەکان،

یەك یەك مافەکانی خواو سەربازو سەرکردەکانی ڕوون دەکردەوە لەڕێگەی نامە بەپێزەکانی یەوە کە بۆی دەناردن و دەبوایە کاریان پێ بکردایە،

و باسی ئەوەشم کردووە کە خۆی پێش مردن عمری کوری خطاب (خوا لێی رازی بێ) دیاری کرد بۆ جێنشینی و لەگەڵ باسی دواساتەکانی تەمەنی لەم ژیانە تیا چووەدا و دوایین وتەی ژیانی لەم دونیایەدا ئایەتی ((توفنی مسلماً والحقنی بالصالحین)) بوو..

لەم کتێبەم دا ویستوومە باس لەوە بکەم کە (صدیق) چۆن لە ئیسلام گەیشتووە و چۆن لەناو خەڵکیدا لەگەڵی ژیاوە، و چۆن ئەو تێگەیشتنەی کاری کردۆتە سەر ڕووداوەکانی ڕۆژانەی سەردەمەکەی،

باسی کەسایەتی یەکەیم کردووە لەزۆر لایەنەوە وەك لایەنی: سیاسی و سەربازی و ئیداری و ژیانی وەك تاکەکەسێك لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیداو ژیانی وەك جێنشینی پێغەمبەری خوا -ﷺ-، پێم لەسەر ئەوە داگرتووە کە ئەبوبەکر (خوا لێی رازی بێت) وەك پیاوی دەوڵەتی کەم وێنە و باسی سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەوەیی و شێوازی بەڕێوەبردنی کارەکانیم کردووە،

و تیشکم خستووەتە سەر دەزگای دادگا کە چۆن لەسەردەمی ئەودا لەسەرەتاکانیدا بووە، بۆئەوەی بتوانین بەردەوام ئەو پێشکەوتنانە بەدی بکەین کەبەسەر ئەو دەزگایەو هەموو دەزگاکانی تردا هاتوون لەسەردەمەکانی تری جێ نشینەکان و مێژووی ئیسلامی دا.

ئەم کتێبە سەروەری و گەورەیی ئەبوبەکر (الصدیق) دەسەلمێنێت، بۆ خوێنەر دەسەلمێ کە ئەو پیاوە بەبیروباوەڕەکەی مەزن بووە، بەزانین و زانیاری مەزن بووە، بە بیروهۆش مەزن بووە، بە تێگەیاندن مەزن بووە، بە ڕەوشت و ئاکار مەزن بووە، (صدیق) هەموو لایەنەکانی مەزنی لەخۆیدا کۆکردبوویەوە کە هۆکارەکەشی لەتێگەیشتن و کارکردنی بەرێنمایی یەکانی ئیسلام و پەیوەندی نەبچڕاوی بەخوای -عزوجل- شوێن پێ هەڵگرتنی وردی پێغەمبەری خوا -ﷺ-.

ئەبوبەکر (الصدیق) (خوا لێی رازی بێت) لەوپێشەوایانەیە کە نەخشەی ژیـان بـۆ خـەڵکی دەکێشێت تا لەکردار و گوفتاری ژیانیاندا چاویان لێ بکەن، ژیاننامەکەی بەهێزترین سەرچـاوەی باوەڕو سۆزی ڕاستەقینەی ئیسلامەتی یەو تێگەیشتنی ڕاست و دروستی ئەم ئاینەیە،

بۆیە ئەوپەڕی تواناو وزەم هەوڵم داوە لەسەر کەسایەتی خۆی و سەردەمەکەی بنووسم بەبێ ئەوە بێ لەکەیی (عصمە) بدەمە پاڵی، و دوور بوون لە هەموو تێکەوتنێك، لەم کارەشـم تـەنها مەبەستم خوا بووەو هیچی تر، پاداشتی ئەوم مەبەست بووە، لەسەر ئەویشە کۆمـەکی کـردنم و سودبەخش کردنی لەلای موسڵمانان، چونکە ئەو خاوەنی ناوی جوانە، بیسەری نزاکانە.

## پێشەکـــی باسەکـــان

## بەشی یەکەم/ ئەبوبەکر الصدیق (ﷺ) لەشاری مەککە:

ئەمەش لە (٥) باسداخۆی دەبینێتەوە:

یەکەم/ ناوو نەژادو شورەت و نازناوو شێوازو بنەماڵەو ژیانی لە سەردەمی نەفامیدا.

دووەم/ موسڵمان بوونی و بانگەواز و دووچاریەکانی و کۆچی یەکەمی.

سێ یەم/ کۆچ کردنی لەگەڵ پێغەمـبەری خوا -ﷺ- بۆ شاری مەدینە.

چوارەم/ ئەبوبەکر لەگۆڕەپانی جیهاد وگیان فیداییدا.

پێنجەم/ ئەبوبەکر (الصدیق) لەناو کۆمەڵگەی مەدەنیدا و هەندێ لەڕەوشـتەکانی و چـاکی یەکانی.

## بەشی دووەم/ کۆچی دوایی پێغەمـبەری خوا -ﷺ- (سەقیفەی بەنی ساعیدە)

لە دووباسدا خۆی دەبینێتەوە:

یەکەم/ مردنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- سەقیفەی بەنی ساعیدە.

دووەم/ پەیماندانی گشتی و بەڕێوەبردنی ئیش و کارە ناوخۆییەکان.

بەشی سێ یەم/ سوپای ئوسامەو جیهادی (الصدیق) دژی هەڵگەڕاوەکان.

لە (٥) باسداخۆی دەبینێتەوە:

یەکەم/ سوپاکەی ئوسامە (خوا لێی ڕازی بێت).

دووەم/ جیهاد و جەنگاندنی دژی هەڵگەڕاوەکان.

سێ یەم/ هێرشێکی سەرتاسەری دژی سەرجەم هەڵگەڕاوەکان.

چوارەم/ موسەیلەمەی درۆزن و بەنی حەنیفە.

پێنجەم/ گرنگترین پەندو ئامۆژگاری و سودەکانی جەنگی هەڵگەڕاوەکان.

بەشی چوارەم/ جەنگە ڕزگاریخوازەکانی و دانانی عومەر بەجێگر و پاشان کۆچی دوایی یەکەی.

ئەمەش لە چوار بەشداخۆی دەبینێتەوە:

یەکەم/ رزگارکردنی ناوچەکانی عیراق.

دووەم/ رزگارکردنی ناوچەکانی شام.

سێ یەم/ گرنگترین پەندو وانەو سوود.

چوارەم/ دانانی عومەر بەجێنشین لەدوای خۆی و کۆچی دوایی.

لەڕۆژی هەینی پاش نوێژی عیشا کە (٥) مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٤٢٢ی کۆچی کە بەرامبەر (٣٠) مانگی مارسی ٢٠٠١ی زاینی،

فەزڵ و چاکەش گشت کات لەلای خوای —عزوجل- ەوەیە، داوا لە خوای گەورە دەکەم بە جوانی لێم وەربگرێت و هاوڕێیەتی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان..

خوای گەورە دەفەرموێت: ((مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ )) فاطر (٢)

لەکۆتایی ئەم پێشەکی یەدا چارم نی یە جگە لەوەی بەدڵێکی پڕ لە خشوعەوەو تەوبەکارانە لەبەردەمی خوای —عزوجل-دا بوەستم و دان بنێم بە بەخشش و چاکەی لەگەڵمدا کەبەڕاستی بەخشش و چاکی هەر لەخۆی دێ، هەر ئەو یارمەتی دەرە، هەر ئەوە سەرخەرمانە، حەمد و سەنای ئەو دەکەم یەکەم جار و دواجار، بەناوە جوانەکانی و ڕەوشتە بەرزەکانی بانگی لێوە دەکەم کە ئەم کارەم سەرتاپا لەبەرخاتری ئەوبێت، و بۆبەندەکانیشی سودبەخش بێت، وە لەسەر هەموو پیتێ نووسیبێتم پاداشتێکم بداتەوەو بیخاتە سەرتای تەرازووی چاکەکانمەوە، و پاداشتی خێری ئەو برایانەشم بداتەوە کە بەهەموو شێوەیەك هاوکاریان کردووم تا ئەم بەرهەمە بەم شێوەیە هاتۆتەبەر، وە داوام لەهەموو خوێنەرێکی موسڵمانە کە ئەم نووسینەم دەچێتە بەردەستی لەدووعای خێر و بزاکانی ئەم بەندە هەژارەی لوطفی خوا بێ بەش نەکەن ((رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ )) النمل١٩.

❊ ❊ ❊

## بەشی یەکەم

### ئەبوبەکری (الصدیق) لەمەککەدا:

جێ باسی یەکەم/

ناوەکەی، نەژادی ، نازناوی، شورەتی ، خانەوادە و ژیانی:

یەکەم/ ناوو نەژاد و شورەت، نازناوی:

ناوی عبەدوڵلا کوڕی عوسمان کوڕی عامرکوڕی عەمر کوڕی کەعب کوڕی سەعد کوڕی تیم کوڕی مرّە کوڕی لوئەی کوڕی غالب ی قورە یشی تیمی.[1]

[1] الاصابه لابن حجر (٤/١٤٤-١٤٥)

لەباپیرەی شەشەمیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا یەك دەگرنەوە کە مـورڕەی کـوڕی کەعبــە[1].
نازناوی بە ئەبوبەکر دەرکردووە، کەسەرچاوەکەی (البکرە)ە واتە حوشتری تازە پێگەیشتوو، کۆی (أبکر)ە و عەرەب (بەکر) بەباوکی هۆزێکی گەورە دەزانن[2].

ئەبوبەکر کۆمەڵێ نازناوی لێ نراوە کە هەریەکەیان گەورەیی و مەزنی و شکۆداری و نەژاد بەرزی ئەو دەگەیەنێت لەوانە:

١-العتیق: واتە (ڕزگار) پێغەمبەری خوا ئەم ناوەی لێ ناوە و پێی فەرمووە: ((أنت عتیـق الله من النار)).[3] واتە: تۆ ڕزگاربووی خوای لە ئاگر، لەگێڕانەوەیەکی تردا عائیـشە (خـوا لێـی ڕازی بێ) دەڵێت: ئەبوبکری (الصدیق) ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێغەمبەری خوا هەرکە چاوی پێ کەوت پێی فەرموو: ((أبشر فأنت عتیق الله من النار)).[4] واتە مـوژدە بـۆ تـۆ ڕزگاری لە ئاگر لەلایەن خواوە)). ئیتر لەو ڕۆژە بەدواناویان نا (عەتیق).[5]

هەرچەندە هەندێ لە مێژوو نووسەکان هۆی جۆراوجۆر باس دەکەن لەسەر ئەم نازناوە، هەندێ دەڵێن: پێیان ووتووە (عەتیق) لەبەر جوانی ڕوومەتی.[6]

هەندێ دەڵێن: لەبەر ئەوەی لەمێژەوە خێرۆمەند بووە[7]

هەندێ تر دەڵێن دایکی ئەبوبەکر کوڕی بۆ نەدەما و دەمردن، کاتێ ئەبوبەکری بـوو ڕووی کردە (کەعبە)ی پیرۆز ووتی: ((اللهم ان هذا عتیقك من الموت فهبە لـی) واتە خوایە ئەمەم لـە مردن بۆ ببەخشە و بیدە بە من.

---

[1] سیرة وحیاة الصدیق، مجدی فتحی ، لا ٢٧

[2] ابوبکر الصدیق علی الطنطاوی، لا ٤٦

[3] الاحسان فی تقریب صحیح ابن حبان (٢٨٠/١٥) سەنەدەکەشی (صحیحە)

[4] رواه الترمذی، ژمارە ٣٦٧٩ في المناقب وصححه الالبانی-رحمه الله (١٣٧٤)

[5] اصحاب الرسول محمود المصری (٥٩/١)

[6] المعجم الکبیر للطبرانی (٥٢/١)

[7] تأریخ الدعوة في الاسلام فی عصر خلفاءالراشدین د.سیری محمد هانی، لاپەڕە ٣٦

سەیر نی یە ئەگەر هەموو ئەم ناوانە ڕاست بن چونکە ئەبوبەکر تابلێی دەمووچاوی جوان و درەوشاوە بووە، نەژادی باش بوو، لەمێژەوە خێر و مەند بووە و لە ئاگری دۆزەخیش دەبەخشرێت بە پێی موژدەکەی پێغەمبەر -ﷺ- بۆی.[1]

٢-الصدیق:

پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئەم نازناوەی لێناوە لە فەرموودەیەکدا کە ئەنەس — خوا لێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری -ﷺ- لەگەڵ ئەبوبەکر و عمر و عوسماندا چوونە سەر ئوحود، ئوحودا لەرزەیەکی کرد پێی فەرموو: ((إثبت یا أحد، فانما علیك نبیٌ وصدیق وشهیدان)).[2] ((ڕاوەستە ئوحود، مەجوڵێ چونکە پێغەمبەرێك و (صدیق)ێك و دووشەهیدت بەسەرەوەیە.

ناوی نراوە (صدیق) چونکە لەبەر زۆر باوەڕ بوونی بە ووتەکانی پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەم بارەیەشەوە دایکی باوەڕداران عائیشە — خوا لێی ڕازی بێت - دەگێڕێتەوە و دەڵێت کاتی شەوڕەوی بەپێغەمبەر -ﷺ- کرا بۆ مزگەوتی ئەقسا، خەڵکی لەوبارەیەوە قسەیان دەکرد، هەندێ هەر لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە کە پێشتر باوەڕیان هێنابوو موسڵمان بوون، کۆمەڵێ پیاو بە خێرایی هاتنە لای ئەوبەکر ووتیان (چ دەڵێیت دەربارەی هاوڕێکەت؟ واگومان دەبات ئەم شەو شەوڕەوی پێکراوە بۆ (بیت المقدس)!. ئەویش ووتی: وای ووتووە؟ ووتیان بەڵێ: ووتی: ئەگەر وای وتبێ ڕاستەکات، ووتیان: تۆ بڕوای پێ دەکەیت هەر ئەم شەو ڕۆشتبێت بۆ (بیت المقدس) و پێش خۆرهەڵهاتن گەڕابێتەوە؟!!.

فەرمووی: بەڵێ، چونکە من لەوەش زیاتر باوەڕم پێ کردوە، من باوەڕم پێ کردوە بە هەواڵی ئاسمان لەماوەی هاتن و چونێکدا، لەبەر ئەوە ناوی نراوە (ئەبوبەکری (الصدیق).[3]

هەموو ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوەی کۆن کە ناوی (الصدیق)ە چونکەزۆر زوو باوەڕی بە پێغەمبەر -ﷺ- هێناو بەردەوام بوو لەسەر ئەم باوەڕپێکردنە و خراپەیەکی لێ نەبینرا تاسەر.[4]

[1] المعجم الکبیر (٥٢/١) الاصابه (١٤٦/١)
[2] بخاري-کتاب ضائل اصحاب النبي باب فضل ابی بکر (١١/٥)
[3] اخرجه الحاکم (٦٢/٣-٦٣) وصححه واقره الذهبی
[4] الطبقات الکبری (١٧٢/٢)

٣-الصاحب-هاوڕێ:

خوای گەورە -عزوجل- ئەم نازناوەی لێناوە لەقورئانی پیرۆزدا وەك دەفەرموێت: ((إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ )) التوبة٤٠.

واتە: ئەگەر ئێوەش سەری نەخەن خوای گەورە سەری خست کاتێ بێ باوەڕان بەدوو قۆڵی دەریان کرد و کاتێ لەناو ئەشکەوتەکەدابوون و بەهاوڕێکەی دەووت: (دڵ گران مەبە خوامان لەگەڵدایە، خوای گەورەش ئارامی ڕژاند بەسەریاندا و بەسەربازە نادیارەکانی خۆی کۆمەکی کردن و ووشە بێ باوەڕیشی خستە ژێر و ووشەی (الله)ی بەرزو بڵند ڕاگرت و خوای گەورە زاڵ و کار بەجێ یە، زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە مەبەست لەوشەی هاوڕێ ئەبوبەکری (الصدیق)ە.

لەئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە ئەبوبەکر بۆی باس کردوە وتوویەتی: قلت للنبي وهو في الغار: لوان أحدهم نظر الى قدميه لابصرنا تحت قدميه!!

فقال النبي -ﷺ-: ((يا أبابكر ما ظنُّكَ باثنين الله ثالثهما)) [1]

واتە کاتێ لە ئەشکەوتکەدا بووین: بە پێغەمبەرم ووت: ئەگەر سەیری بەرپێی خۆیان بکەن دەمانبینن!! پێغەمبەریش -ﷺ- فەرمووی: ئەی ئەبووبەکر گومانت چۆنە بە دوو کەس خوا سێ یەمیان بێت)).

(حافظ) (رەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: گەورەترین سەروەری ئەبوبەکر ئەو ووتەیەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ((الاّ تنصروه فقد نصره الله إذ اخرجه الذين كفوا

[1] البخاري، فضائل الصحابه، ژمارە (٣٦٥٣) فتح الباري (١٥/٧)

ثانی اثنین... تـا دەگاتـە.. ان الله معنـا)) مەبەسـت لـە هـاوڕێ لێـرەدا ئەوبـەکرە بـەبێ ملەجەڕێ.[1]

ئەو فەرموودانەی باس لەوە دەکەن کە هاوڕێی ئەشکەوتی پێغەمبـەری خـوا -ﷺ- بـووە زۆرن و مەشهورن و لەم سەروەریەشدا کەس نایگاتێ.

٤-الاتقی (لەخوا ترس ترین) ئەم نازناوەش دیسان خوای -عزوجل- ناوی لێ ناوە لە قورئاندا وەك دەفەرموێت: ((وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ))[2]

واتە: لەخوا ترسەکان لەو سزایەی خوا بە دوور دەبن.

ئەم باسەش ڕوون دەکەینەوە لەکاتی باسی ئەو بەندە سزا دراوانەی کـە ئەبووبـەکر ئـازادی دەکردن.

٥-الاوّاه: ((زۆر گەڕاوەو تەوبەکار)): ئەمە نازناوی (الاوّاه) دراوەتـە پـاڵ ئەوبـەکر کـە بەڵگەیە لەسەر لە خواترسانی ئەو پیاوە، ئیبراهیمی نەخـەعی دەڵێـت ((کـان أبـوبکر یـسمی بالاواه لرأفته و رحمتـه)[3] واتـە: ئەبووبـەکر بـە (الاوّاه) نـاوی دەرکردبـوو لەبـەر سـۆز و میهرەبانی یەکەی..

دووەم: لەدایك بوون و ڕووخساری:

زانایان لەوەدا ناکۆکیان نی یە کە دوای ساڵی (فیل) لەدایك بووە، بەڵکو لەوەدا جیاوازییان هەیە کە هەندێکیان دەڵێن سێ ساڵ دوای ساڵی فیل، هەندێ تر دەڵێن بەڵکو دوو ساڵ و شەش مانگ و هەندێ تر دەڵێن دوو ساڵ و چەند مانگێك بەدیاری کردنی ژمارەی مانگەکان.[4]

ئەبوبەکر پێ گەیشت لـەناو خانەوادەیـەکی بـەڕیز و حورمـەت لـەناودڵی هۆزەکەیانـدا و ژیانێکی چاك و خۆش گوزەران تاوای کرد بـەهۆی ئـەو ژیانـە (صـدیق)ی لاو نـەفس بەرزانـە و شوێنەوار بەر لەناو گەلەکەیدا گەورە بوو.[5]

---

[1] الاصابه فی تمیز الصحابة (١٤٨/٤).
[2] سورة اللیل (١٧)
[3] الطبقات الکبری (١٧١/٣)
[4] سیرة وحیاة الصدیق، مجدی فتحی السید، لا٢٩، تأریخ الخلفاء، لا ٥٦
[5] تاریخ الدعوة الی الاسلام فی عهد الخلفاء الراشدین، لا٣٠

لەلایەن شێوازیەوە، بەسپی پێست وەسفیان کـردوە، لەشـی باریـك و لاواز بـووە، قەیـسی کوڕی ئەبی حازم لەم بارەیەوە دەڵێت: چوم بۆلای ئەبوبکر، پیاوێکی باریکەلە بوو، سـپی یـەکی لاواز بوو.[1]

ژیاننامە نووسان لەسەردەمی ڕاویەکانەوە دەڵێن: ئەبوبەکر بەوە وەسـف کـراوە ڕوخساری سپی مەیلەو زەرد، بالآیەکی جوان، لاواز و ناوشان تەنگ بووە، کەمێ پشت کۆم، جل و بـەرگی کۆنە دەکردەوە لەم لاو کەلەکەیەوە شۆڕ دەبوویەوە، دەم و چاوی ڕەقەکار بووە، چاوی کەمێ قـوڵ بووە، لوت کۆمەڕ و قاچەکانی باریك بوە، و تەوێڵی زەق بووە، ئێسقانی پەنجـەکانی دەرپـەڕیوە، ریشی دەگرتە خەنەو مووە سپی یەکانی سور دەکرد.[2]

سێ یەم: خانەوادەکەی (الصدیق):

باوکی، (ناوی عوسمان کوڕی عـامری کوڕی عەمرە، بە ئەبوو قوحافە) ناوبانگی دەرکـردوە، لەڕۆژی فەتحی مەککە موسڵمان بوو، ئەبوبەکر دەستی گرت هێنایە خزمـەت پێغەمبـەر -ﷺ- ئەویش پێی فەرموو: ئەبوبەکر خۆزگە لێی بگەڕایتایە، ئێمە بە خۆمان دەهاتین بۆلای، ئەبوبەکر لەوەڵامدا ووتی: ئەو شایانە بێتە خزمەتت ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ-.

دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا -ﷺ- پیرۆزبایی لە ئەبوبەکر کردوە بە بۆنەی موسڵمان بوونی باوکی یەوە، بە ئەبوبەکریشی ووتووە: شێوازی موی سەری بگۆڕن، سەری ئەبو قوحافە ئەوەنـدە سپی بوو لەدار (ثغامە)* دەچوو..

لەم هەواڵەدا بۆمان دەردەکەوێت کە تاچەندێك بەرنامـەی پـەروەردەیی پێغەمبـەری خـوا- ﷺ- گرنگی بەڕێزگرتن لە گەورەو بەساڵاچووان داوە، ئەوەشی ئەمە دەسەلمێنێ فەرمودەیـەکی پێغەمبەرە -ﷺ- کەدەفەرموێت: (لیس منا من لم یوقر کبیرنا ویرحم صغیرنا)[3]

---

[1] الطبقات لابن سعد، لا (١٨٨/٣) اسناده صحیح

[2] البخاری ژمارە (٥٨٩٥). ابوبکر مجدی السید لا (٣٢)

* دارێکە گوڵی سپی دەکات

[3] الترمذی کتاب البر باب(١٥)

واتە: (لەئێمەی موسڵمان نی یە ئەو کەسەی ڕێز لەگەورە نەگرێت و بەزەیی بە بچوکاندا نەیەتەوە).

بەڵام دایکی، ناوی سەلمای کچی صەخری کوڕی عەمری کوڕی کەعبی کوڕی سەعدی کوڕی تیم و شورەتی (ئومول خەیر)ی وەرگرتووە، زوو موسڵمان دەبێت بەدرێژی لە ڕووداوی داواکردنی بینینی پێغەمبەر -ﷺ- لەلایەن ئەبوبەکرەوە لەمەککە.[1]

ئەبوبەکر (الصدیق) لە ژیانیدا (٤) خێزانی هەبووە، (٣) کوڕی لێیان بووەو (٣) کچ. کە ئەمە ناومی خێزانەکانی یەتی:

١-قتیلە کچی عبدالعزّی ی کوڕی ئەسعەدی کوڕی جابری کوڕی مالك.

جیاوازی هەیە لەموسڵمان بوونیدا.[2]، ئەم ئافرەتە دایکی عبداللە و ئەسمایە، ئەبوبەکر — خوا لێی رازی بێت- لەسەردەمی نەفامیدا تەلاقی داوە، لەم دواییانەشدا سەردانی ئەسمای کچی کردەوە لە مەدینەو هەندێ دیاری وشتی وەك ڕۆن و کەشکی بۆ بردوە لەگەڵ خۆیدا، ئەسمایش دیاریەکانی لێ وەرنەگرت و نەیهێشت بێتەماڵەکەی تا پرسی بە عائشە - خوا لێی رازی بێت - نەکرد تا لەپێغەمبەری خوا -ﷺ- بپرسێت بۆی، پێغەمبەری خوایش -ﷺ- فەرمووی: ((لِتُدخلها ولتقبلَ هديتها)) واتە: بابیکاتە ژورەوەو دیاریەکەشی لێ وەربگرێت و لەم بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ((لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ )).[3] واتە:

خوای گەورە بەرگریتان لێ ناکات کە چاکبن لەگەڵ ئەوانەدا کە جەنگتان لەگەڵ ناکەن و لەماڵ و حاڵیش دەریان نەکردوون، وەك ئافرەتان و منداڵان کە سەردانیان بکەن و میوانداریان بکەن و پەیمانیان ببەنە سەر و سپاردەیان بپارێزن و بەتەواوی نرخی شتەکانیان پێ بدەن، خوای

---

[1] تاریخ الدعوة الی الاسلام في عهد خلفاء الراشدين، لا٣٠

[2] الطبقات لابن سعد (١٩٦/٣) (٢٤٩/٨)

٣الممتحنة ئایە تي (٨)

گەورە دادپەروەرانی خۆش دەوێت لێیان ڕازی دەبێت و لەستەمکارانیش زویر دەبێت و سزاشیان دەدات.[1]

٢-ام رومان کچی عامر کوڕی عویمر:

لەهۆزی بەنی کەنانەی کوڕی خەزیمە، مێردەکەی کەناوی حارسی کوڕی سەخبەرە بوو لە مەککە کۆچی دوایی کردبوو، و پاشان ئەبوبەکر – خوا لێی ڕازی بێت - مارەی کرد، زوو موسڵمان بوو، پەیمانی داوە و کۆچی کردوە بۆ مەدینە، دایکی عبدالرحمن و عائشە – خوا لێیان ڕازی بێت - لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا -ﷺ- لەساڵی شەشەمی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

٣-حبیبە کچی خارجە کوڕی زەیدی کوڕی ئەبی زوهەیر:

ئەم خێزانەی لە پشتیوانانەو لە هۆزی خەزرەجە، پاش وەفاتی ئەوبەکر –ئوم کەلسوم ی بوو، ئەبوبەکری (الصدیق) ماڵی باری کردە ناو کەس و کارەکەی لە سونەح کە گەڕەکێ بوو لە بەرزایی یەکانی مەدینە.

٤-ئەسمای کچی عومەیس کوڕی مەعبەدی کوڕی حارس:

بە ئوم عەبدوڵلا ناسراوە، لەکۆچەریانی دێرینە، زوو موسڵمان دەبێت تەنانەت پێش چوونە ماڵی ئەرقەم، پەیمانی بە پێغەمبەری خوا -ﷺ- داوەو لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبی هاوسەریدا کۆچی کردوە بۆ حەبەشە، پاشان لەگەڵیدا کۆچ دەکات بۆ مەدینە، لەجەنگی (موئتە)دا هاوسەرەکەی شەهید دەبێت و پاشان ئەبوبەکری (الصدیق)یش دەیخوازێت و محمدی کوڕی لێ دەبێت، هاوەڵان لە (ئوم عبداللە)وە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە: وەك: عمر، ابو موسی، عبداللە کوڕی عەباس، ام الفضل خێزانی عەباس، لەهەموو خەڵکی ژن و ژنخوازییەکانی بەڕێزتر بووە کە بریتی بون لە: پێغەمبەری خوا -ﷺ- حەمزەو عەبباس و کەسانی تر (خوایان لێ ڕازی بێ).

*کوڕەکانی ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێ) ئەمانە بوون:

١-عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکر:

---

[1] تفسیر المنیر للزحیلی (١٣٥/٢٨)

گەورەترین کوڕی ئەبووبەکرە و لەڕۆژی حودەیبیەدا موسـڵمان بـوو، موسـڵمانیەتیەکی زۆر چاك، هاوەڵێتی پێغەمبەری خوای کردوەو بە ئازاو نەبەرد ناوی دەرکردووەو هەڵوێستی دلێرانەی دیاری هەبووە دوای موسڵمان بوونی.[1]

٢-عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکر:

خاوەنی ڕۆڵی گرنگ لە ڕۆژی کۆچدا، بەڕۆژدا لەمەککەدا دەمایەوە بۆ کۆکردنەوەی هـەواڵ و لەویش دا بە دزی یەوە خۆی دەگەیاندە ئەشکەوتی (ثور)و هەواڵەکانی دەگەیاندە پێغەمبەری خوا -ﷺ- و باوکی، هەرکە ڕۆژ دەبوویەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە،

لەجەنگی (تائیف)دا تیرێکی بەردەکەوێت، بەکاریگەری ئەو تیرەوە لەسەردەمی خەلافـەتی باوکیدا لەمەدینە بەشەهیدی گیان دەسپێرێت[2]،

٣-محمدی کوڕی ئەبوبەکر:

دایکی ناوی ئەسمای کچی عومەیسە، لەساڵی حەجی ماڵئاوایدا لە دایك بووە، یەکێ بـووە لە گەنجەکانی قورەیش، لە ژێرسایەی عەلی کوڕی ئەبو طالب دا گەورە بووەو پاشانیش کردی بە والی و سەرکردەی میسر و هەر لەوێش کوژرا.

٤-ئەسمای کچی ئەبوبەکر:

نازناوی (خاوەن دوو پشتوین)ەو لە عائیشە – خوا لێی رازی بێت - گەورەترە پێغەمبـەری خوا -ﷺ- ناوی ناوە (ذات النطاقين)، واتـە (خـاوەن دو پـشتوێن) چـونکە لـەکاتی کۆچـدا پیاسکەی خواردنی بۆ پێغەمبەری خوا و باوکی ئامادە کرد، نەیزانی بەچی بیبەستێت بە خۆیەوە بۆ ئەوەی نەکەوێت ناچار پشتوێنەکەی پشتی خۆی کرد بە دوو لەتەوەو بە لەتێکیان پیاسـکەکەی پێ بەست و پێغەمبەری خوایش -ﷺ- ئەو ناوەی لێ نا، ئەسما خێزانی زوبێـری کـوڕی عـەوام بووە – خوا لێی رازی بێت - کۆچی کرد بۆ مەدینە لەکاتێکدا کە دوو گیان بوو بە (عبـدالله)ی کوڕی زوبێرەوەو پاش کۆچ کردن بۆ مەدینە (سکەکەی بوو) کە (عبدالله) بوو بە یەکەم کۆرپەی دوای کۆچ لە ئیسلامدا،.

[1] البداية والنهاية (٣٤٦/٦)
[2] نسب قورەیش لا ٢٧٥

ئەسما تەمەنی دەگاتە (١٠٠) ساڵ، بەڵام نە عەقڵی لە دەست دەدات و نە دانیشی دەکەوێت!، (٥٦) فەرموودەی لە زاری پێغەمبەری خواوە -ﷺ- گێڕاوەتەوە، خەڵکانێکی وەك (عبداللە)ی کوڕی عەباس و عبداللە و عروەی کوڕی خۆی و عبداللە ی کوڕی ئەبی مولەیکەو کەسانی تریش فەرموودەیان لەزاری ئەوەوە گێڕاوەتەوە، زۆر خێرۆمەند و سەخی بووە لە ساڵی (٧٣)ی کۆچی لە مەککە کۆچی دوایی دەکات.[1]

٥-عائیشە دایکی ئیمانداران – خوا لێی رازی بێت -:

ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆ – خوا لێیان رازی بێت - پێغەمبەری خوا لەتەمەنی شەش ساڵیدا داوای کرد و لە (٩) ساڵیدا گوایستی یەوە، لەمانگی شەوالدا شایی بۆ کرد، بە زاناترینی ئافرەتان ناوبانگی هەیە، پێغەمبەری خوا بە (دایکی عبداللە) بانگی لێوە کردووە و ئەوەندەی خۆش ویستووە بووە بە نموونەی ئافرەتی چاك[2].

شەعەبی لە مەسروقەوە دەگێڕێتەوە کە هەرکاتێ مەسروقە باسی عائیشە دایکی بڕوادارانی بکردایە دەیووت: ڕاستگۆی کچی ڕاستگۆی پاك داوێنی خۆشەویستی خۆشەویستەکەی خوا -ﷺ- بۆی باس کردم، سەنەدەکانی دەگاتە. (٢٢١٠) فەرموودە، کە (بوخاری و مسلم) لەسەر (صحیح)ی (١٧٤) فەرموودەیان کۆکن و (بوخاری)ش بەتەنها (٥٤) و (مسلم)یش (٦٩) فەرمودەیان بەجیا لێ گەڕاندۆتەوە، (٦٣) ساڵ و چەند مانگێك ژیاوەو لەساڵی (٥٧)ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووەو منداڵی نەبووە[3].

٦-(ام کلثوم) کچی ئەبووبەکر:

دایکی ئوم کەلسوم ناوی حەبیبەی کچی خارجەیە، ئەبوبەکر – خوا لێی رازی بێت - لەکاتی سەرەمەرگدا بەدایکی باوەڕداران –عائشەی ووت: ئەودوانە هەردوکیان براتن و ئەو دوانەش هەردوکیان خوشکتن، عائیشەیش پێی ووت: ئەوە ئەسمایە دەیناسم ئەی خوشکەکەی ترم

---

[1] سیر اعلام النبلاء. ٢/٢٨٧

[2] تأريخ الدعوة في عهد خلفاء الراشيدين، لا٣٤

[3] الطبقات لابن سعد

کێ یە؟ ئەویش ووتی: (سکەکەی) ی کچەکەی خارجە، بەڕاستی دڵم خەبەری داوە وادەزانم کچە، هەروایش دەرچوو، ئەو کچە پاش مردنی ئەبووبەکر لەدایك بوو.[1]

پاشان گەورە بوو —تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا- مارەی کرد بەلام لەجەنگی (جمل)دا شەهید بوو، عائشە (خوا لێی رازی بێت) لەکاتی عیددەی دا دەیبات بۆمەککەو حەجی پێ دەکات..

ئائەمەیە خانەوادەی پیرۆزی (الصدیق) کە خوای —عزوجل- رێزداری کردن بە ئیسلام، لەناو هەموو هاوەڵاندا خوای گەورە ئەم رێزەی تەنها بە ئەبووبەکر داوە — خوا لێی رازی بێت -، زانایان دەڵێن: لەناو هاوەڵاندا نەزانراوە کە کامیان چوارپشتیان هاوڕێ یەتی پێغەمبەری خوایان کردبێ جگە لە خانەوادەی (ئەبوبەکری (الصدیق) نەبێت، بەم شێوەیە: عەبدوڵلای کوڕی زوبێر کە دایکی ئەسمای کچی ئەبوو بەکری کوڕی ئەبوو قوحافەیە کە ئەو چوار وەچەیە هەموویان لەهاوەڵان بوون، و هەروەها محمدی کوڕی عبدالرحمن کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە[2].

لەناو هاوەڵاندا کەسێك بەدی ناکەیت کە باوك و دایك و منداڵەکانی موسڵمان بووبن و خۆی و منداڵەکانیشی پێغەمبەری خوایان دیبێ چ لەسەری ژنان یان پیاوانەوە بێت —وەك باسم کرد- هەرهەموویان باوەڕیان بە پێغەمبەر -ﷺ- هێناوەو هاوەڵێشیان کردووە،

ئەمەیە خێزانی (الصدیق) کەسەکانی کەسی بیروباوەڕن یەك دوو ڕوویان تیا هەڵنەکەوتووەو لەمەشدا لەناو هەموو هاوەڵاندا تاکە - خوا لێیان رازی بێت- .

جاران دەگووترا: باوەڕ قاپیی هەیە و دوو ڕویشی قاپیی،ماڵی ئەبووبەکر لەناو کۆچەریاندا قاپی باوەڕ بوو، لەناو پشتیوانانیشدا (بەنی نەجار)[3].

چوارەم/ ڕەوشتی (الصدیق) لەسەردەمی نەفامیدا:

---

[1] الطبقات (٣/١٩٥). (٣)

[2] ابوبکر الصدیق-محمد رشید رضا لا ٧

[3] أبوبکر الصدیق (١/٢٨٠) محمد بن مال الله کە لە (منهاج السنه) ي ابن تیمیة وەری گرتووە.

ئەبوبەکر (الصدیق) لەسەردەمی نەفامیدا یەکێ بووە لە پیاوماقوڵ و ناودار و سەرکردەکانی قورەیش، پێش هاتنی خۆری ئیسلام ڕێز و شەرەفمەندی لە (١٠) خانەوادەی دەبینێەوە لەناو ئەوانیشا (١٠) کەس، لەوانە:

یەکەم/ عەباسی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی بەنی هاشم، ئاوپێدانی حاجیانی ماڵی خوا لەسەردەمی نەفامی داو لە ئیسلامیشدا پێیان درایەوە.

دووەم/ ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب لەنەوەی ئومەیە، کە ئاڵای قورەیشی لە دەستدابوو، هەرکاتێ قورەیش لەسەر سەرکردەیەك پێك نەهاتنایە ئەویان دەکردە سەرکردەو پێشیان دەخست.

سێیەم/ حارسی کوڕی عامیر لەنەوەی نوفل، ڕفادەیان لەدەستدا بووە کە پارەیەکە قورەیش کۆی دەکردەوە بۆ نەهامەتی و داماوی هەژاران.

چوارەم / عوسمانی کوڕی زەمعەی کوڕی ئەسوەد لەنەوەی (ئەسەد):

ڕاوێژکردنی درابوویە، قورەیش دەستی نەدەکرد بە ئاودا تاپرسی‌بەئەو نەکردایە ئەگەر پێی باش بوایە پشتیشی دەگرتن و ئەگەر بەدڵی نەبوایە خۆیانی سەرپشك دەکرد و ئەوانیش کۆمەکی دەبوون.

پێنجەم/ ئەبوبەکر (الصدیق) لەنەوەی تیم (ئیشناق)ی پێ درابوو کە بریتی بوو لە خوێن و قەرز بژاردن، ئەگەر مافێکی بخستایەتە سەر یەکێك و داوا لە قورەیش بکرایە باوەڕیان پێ دەکرد و هاوکاری بژاردنەکەشیان دەکرد، بەڵام یەکێکی تر ئەم کارەی بکردایە دەست بەرداری دەبوون.

شەشەم/ خالیدی کوڕی وەلید – خوا لێی رازی بێت - لەنەوەی مخزوم، (القبة والاعنة) تایبەت بووە بەوەو (القبة) تاکوتنی چادری جەنگ، یەکسەر هەموو قورەیش لەدەروی کۆدەبوونەوەو خۆیان بۆ جەنگ دەسازاند، (اللغنه) واتە: هەرشتێ تایبەت بی بەوڵاخ و زین کردنی یەوە.

حەوتەم/ عمری کوڕی خەتتاب – خوا لێی رازی بێت - لەنەوەی عەدی لەنەفامیدا ئیش و کاری باڵوێزی تایبەت بووە بەوەوە.

هەشتەم/ سەفوانی کوڕی ئومەییە لەنەوەی جومەح، (أزلام) واتە پێوانەی زەوی و زارەکان، تایبەت بووە بەو.

نۆیەم/ حارسی کوڕی قەیس لەنەوەی سەهم، کاری حکومەتداری پارەوە دارایی تایبەت بەخواکانیان کاری ئەو بووە.[1]

ئەبوبەکری (الصدیق) یەکێك بووە لە پیاوماقوڵانی قورەیش لەسەردەمی نەفامیدا و لەهەرە چاکەکانیان بووە و لەنەهامەتی یەکاندا هانایان بۆ هێناوە، لەمەککە کەس نەگەشتۆتە میوانداریەکانی ئەو.[2]

بەزۆر شت بەناو بانگ بووە لەوانە:

١-نەژاد زانی: بەیەکێ لەزانایانی نەژاد -النسب- دەژمێردرێت، و هەواڵی هەموو عەرەبی لەلابووە، لەوبوارەندا دەستێکی باڵای هەبووەو تاوای لێ هاتووە بە مامۆستای زۆرێ لەنەژادناسان دادەنرێت لەوانە (عەقیل ی کوڕی ئەبو طالب) و کەسانی تریش، لەم کارەیدا عادەتێکی جوانی وای لێ کردووە هەموو عەرەب خۆشیان بوێت ئەویش ئەوەیە بەپێچەوانەی خەڵکانی ترەوە نەنگی و سوکایەتی هیچ تیرەیەکی ناونەبردووە.[3]

لەهەموو قورەیشیەکان زیاتر نەژادی قورەیشی زانیوەو لەهەموویان زیاتر هەواڵی چاك و خراپی یانی لەلابووە.[4] لەم بارەیە عائیشە – خوا لێی رازی بێت - لەپێغەمبەری خواوە -ﷺ- دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ان أبابکر أعلم قریشاً بأنسابها)[5] واتە: ئەبوبەکر شارەزاترینی قورەیشە بەنەژادی قورەیش.

٢-بازرگانی یەکانی:

---

[1] أشهر مشاهیر الاسلام (١٠/١).
[2] نهایة الادب (١٠/٣٩) نقلاً عن تاریخ الدعوة، یُسری محمد لاپەڕە (٤٢).
[3] التهذیب (١٨٠/٢).
[4] الاصابة (١٤٦/٣).
[5] مسلم ژمارە (٢٤٩٠). الطبراني في الکبیر ژمارە (٣٥٨٢).

لەسەردەمی نەفامیدا بازرگـانی کـردوەو، بـۆ ئـیش و کـاری بازرگـانی چـووەتە (بوسـی) لەناوچەی شام، ولاتانیش گەڕاوە، سەرمایەکەی چل هەزار درهەم بـووە، خێـری زۆری بەسـەرەوە دەکرد و لەسەردەمی نەفامیدا بەبەخشندەو سەخی ناوی دەرکردبوو.[1]

٣-خۆشویستی ناو هۆزەکەی و لەناو دلّیانا بووە:

(ئیبن ئیسحاق) لە ژیاننامەکەیدا باس لەوە دەکات کە زۆر خۆشیان ویستووە، حەزیان بـە تێکەڵی کردنی کردووە، دانیان بە چاکەو پیـاوەتی و ڕەوشـت بەرزیـدا نـاوە، ئـەهاتن بـۆلای و سەردانیان دەکرد هەرکارێ بهاتایەتە پێش ئەمەش لەبەر زانـایی و بازرگـانی یەکـەی و خۆشـی دانیشتنەکانی[2]، (ئیبن دەغەنە) لەکاتێکدا ویستی کۆچ بکات پێی ووت: (ئـەی ئەبووبـەکر، تـۆ جوانی ئەم هۆزەیت، لەتەنگانەدا بەهاناوە دەچیت، یارمەتی نەدار ئەدەیت، چاکەکاریت.[3]

ئیبن حەجەر لەسەر ئەم ووتەیەی ئیبن دەغەنە دەڵێت لەگەورەترین سەروەریەکانی ئەبوبـەکر لەووتەکەی ئیبن دەغەنەوە دەردەکەوێت کەکاتێ جیـوارو پەنادانەکـەی ڕەتکـردەوە کـە کۆمـەڵێ وەسفی جوانی کرد کە زۆر نزیك بوو لەو وەسفانەوە کە خەدیجە بە پێغەمبەری خوای ووت کـاتی بوو بە پێغەمبەر، پڕاوپڕ ئەو وەسفانە وەك یەکن لەگەڵ جیاوازی لەکاتەکانیاندا، ئەمە ئەو پەڕی سەناو مەدحە بۆ (صدیق) چونکە ڕەوشتی پێغەمبەر -ﷺ- لەمندالّی یەوە بـەرزترین ڕەوشـت بوەو.[4]

٤-لەسەردەمی نەفامیشدا مەی نەنۆشیوە:

خاوێن ترین کەس بووە لەسەردەمی نەفامیدا، تەنانـەت لـەپێش هـاتنی ئیـسلامدا مـەی خواردنەوەی لەسەر خۆی قەدەغە کردبوو، دایکی بڕواداران عائیـشە – خـوا لێـی ڕازی بێـت - دەڵێت: (ئەبوبەکر – خوا لێی ڕازی بێت - مەی خواردنەوەی لەسەر خـۆی حـەرام کردبـوو، نـە لەسەردەمی نەفامی و نەلەسەردەمی ئیسلامدا نەیخواردوەتەوە، هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو ڕۆژێك

---

[1] ابوبكر الصديق –على طنطاوى، لا ٦٦، تاريخ الاسلام، الخلفاء الراشدين –محمد شاكر لا ٣٠.

[2] السرة النبوية لإبن هشام (٣٧١/١).

[3] البخاري، كتاب مناقب الانصار.

[4] الاصابة (١٤٧/٤).

دای بەلای سەرخۆشێك دا ئاگای لەخۆی نەمابوو، دەستی ئەکرد بە پیسیدا و دەیبرد بۆ دەمی، کاتێ بۆنەکەی دەگەشتە لوتی دەیگەڕاندەوە دواوە، ئەمیش لەسەرخۆی حەرام کرد.[1] لەجێ یەکی تردا عائشە دەگێڕێتەوە:... ئەو و عوسمانی لەسەردەمی نەفامیدا مەیان لەسەرخۆیان قەدەغە کردووە.[2]

(الصدیق) خوای لێ ڕازی بێ –لەوەلاَمی ئەو پرسیارەدا کە پێیان وتبوو: ئایا لەسەردەمی نەفامیدا مەیت خواردۆتەو؟ وتی: پەنا بەخوا، ووتیان: بۆچی؟ ووتی: ناموسی خۆمم پاراستووە لەگەلّ پیاوێتیم/ ئەوەی مەی بخواتەوە ناموس و پیاوێتی خۆی لەدەست دەدات. کاتێ ئەم قسەیەی گەیشتەوە پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرموی(صدق أبوبکر، صدق أبوبکر مرَّتین)[3] واتە: ئەبوبەکر ڕاستی ووت، ئەبوبەکر ڕاستی ووت دووجار.

٥-سوژدەی بۆ بت نەبردوەو:

ئەبوبەکر (الصدیق) — خوا لێی رازی بێت - هەرگیز سەری بۆ بت دانەنەواندووە، جارێك ئەبوبەکری (الصدیق) — خوا لێی رازی بێت - لەناو هاوەلاّنی پێغەمبەری خوادا -ﷺ- ووتی: لە ژیانمدا هەرگیز سوژدەم بۆ بت نەبردووە، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو هەر کە پێگەیشتم باوکم دەستی گرتم و بردمێ ژوورێکی چۆلّ: کە بتی تێدابوو، پێی ووتم ئەمانە خودا بەرزو لێ هاتووەکانی تۆن، و جێی هێشتم و چووە دەرەوە، منیش لەبتەکان نزیك بوومەوەو ووتم: برسیمە خواردنم پێ بدەن، وەلاّمیان نەبوو، ووتم: جل و بەرگم نی یە بۆم بکە؟ وەلاّمیان نەبوو، منیش بەردێکم تێ گرت و بەدەما کەوت.

ئابەم جۆرەو ڕەوشتی بەرزی و بیری ڕووناکی و سروشتی پاکی نەیان هێشتووە هیچ کارێکی سەردەمی نەفامان کە پێچەوانەی سروشتی پاك و ژیری و پیاوەتی ڕاستەقینە بوو، پیاوەتی بڕوشێنێ و کەرامەتی کەم کاتەوە.

---

[1] سیره حیاه الصدیق–مجدی فتحی لا (٣٤).

[2] تاریخ الخفلفاو للسبوص لا ٤٩.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو لا(٢٩).

ئیتر سەیری نی یە ئەگەر کەسێك خاوەنی ئاوا ڕەوشتێك بێت خۆی بگەیەنێتە کەژاوەی بانگەوازی حەق و پێشی پێشیشی لێ بگرێت، و لەدوای موسڵمان بوونی چاکترین موسڵمان دەرچێت پاش پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (خیارکم في الجاهلیة خیارکم في الاسلام اذا فقهوا)[1]

واتە: باشترین کەستان لەسەردەمی نەفامی دا باشترین کەس دەبێت لەسەردەمی ئیسلامیدا ئەگەر لە ئیسلام حاڵی بن.

هەربۆیەشە مامۆستا (رفیق العظم) لەسەر ژیانی ئەبوبەکر -خوای لێ رازی یێت- لەسەردەمی نەفامیدا دەڵێت (ئەی خوای گەورە، کەسێك لەسەردەمی نەفامیدا لەناو بتا گەورە بووبێت و ئاینێکی ڕاست نەبووبێت، دەست گری بێ و نەیاسایەك بەرگری کەر، کەچی ئاوا لەڕەوشت بەرزی بڕوانێت و ئاوا بە جوانی دەست بگرێتە درەختی پاکی و پیاوەتی یەوە،

بێگومان شایانە کە ئیسلامی بینی بە هەموو دڵێکی یەوە باوەشی پێدا بکات، و بێتەی یەکەمین کەس باوەڕ بهێنێ بەپەروەردگاری بەندەکان، بەمو ئیسلامەکەشی لوتی خۆبەزلزان و سەرکەشان بسۆتێنێ، و ڕێگای گرتنەبەری هیدایەت ئاسان بکات، ئەو کەسەی ڕەگ و ڕیشاڵی بەدڕەوشتی لەناو دەروونی بڕواداراندا لە بێخ دەربهێنێت.[2]

ئای لەچاکی (الصدیق) -رضي الله عنه- کەخاوەنی سەرمایەیکی گەورەبوو لەرەوشت بەرزی و بەها جوانەکان و ئاکارە نایابەکان بوو لەناو کۆمەڵگەی قوریش دا لەپێش ئیسلام، خەڵکی مەککە ئەم شایەتی یەی بۆدەدەن کە لەپێش هەموویانەوە بوو لەڕەوشت بەرزی و نموونەییدا، یەکێ نابینی لە قورەیشیەکان ووتەیکی نەنگی دابێتە پاڵ (الصدیق) یان لەشان و شەوکەتی کەم کردبێتەوەی یان ڕەخنەی لێ گرتبێ هەروەك چۆن بەهەموو مسوڵمانە

[1] تاریخ الدعوة في عهد خلفاء الراشدین لا ٤٣.
[2] اشهر مشاهیر الاسلام (١٢/١).

هەژارەکانیان دەکرد، تەنها نەنگی و ڕەخنەیەکی لەسەر بوو ئەویش بڕوا بتەوەکەی بوو بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی.[1]

باسی دووەم/ موسڵمان بوونی.. بانگەوازی.. ئەشکەنجەدانی.. کۆچی یەکەمی

یەکەم/ موسڵمان بوونی:

موسڵمان بوونی ئەبوبەکر (الصديق) لەدایك بوونی گەشتێکی دوور و درێژی بووە بە دوای ئاینێکی ڕاستەقینەدا کە بگونجێ لە گەڵ سروشتی پاك و هێنانە دی حەزو ئارەزووەکانی، و لەگەڵ ژیری ڕاست و دروستدا یەك بگرنەوە، و بینایی یە وردەکانی هەڵبژێرن، بە حوکمی ئەوەی بازرگانی دەکرد پێویستی بەگەڕانی دورو درێژ و بڕینی بیابانەکان و شارو شارۆچکەو دێهاتەکانی کەنداوی عەرەبی، لەباکورەوە بۆ باشور و لە رۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا پەیوەندییەکی بە تینی پەیدا کردبوو لەگەڵ خاوەن ئایینەکاندا بەتایبەت مەسیحییەکان، زۆر بە تاسەوە گوێی بۆ ئەو کەسانە دەگرت کە باسی یەکتاپەرستیان دەکرد، ئاڵای گەڕان بەدوای ئاینی ڕاستەقینە دای هەڵکردبوو.[2]

جارێکیان باسی خۆی دەکرد و دەیووت: لە حەوەشی کەعبەدا دانیشتبووم زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل لەوێ دانیشتبوو، ئومەیەی کوڕی ئەبی سەلت دای بەلایدا، پێی ووت: چۆنی ئەی چاکەخواز؟ ووتی: باشم ووتی: ئەو چاکەیەت دەست کەوتووە؟ ووتی: نەخێر، ووتی:

كل دين يوم القيامة الا ماقضى الله في الحقيقة بور [3]

واتە: هەموو بەرنامەو ئاینێك جگە لە ئاینی ڕاست و دروست لە قیامەتدا تیاچووە ئاینی ڕاست ئەو پێغەمبەرەیە کە لەناو ئێمەدا یان ئێوەدا هەڵدەکەوێت؟

ئەبوبەکر – رضي الله عنه - دەڵێت: تا ئەو کاتەش نەم دەزانی کە خەڵکی چاوەڕوانی پێغەمبەرێك دەکەن و دێت، لەماڵ دەرچووم بۆ لای وەرەقەی کوڕی نۆفل - رضي الله عنه -

---

[1] منهاج السنة لابن تيمية (١/٢٨٨-٢٨٩) لەکتێبی (ابی بکر الصديق افچل الصحابه واحقهم بالخلافه) وەرگیراوە.

[2] مواقف الصديق مع النبى فقي مكة د.عاطف لماضه لا ٦.

[3] تأريخ الخلفاء للسيوطى. لاپەرە ٣١.

دەبینم زۆر سەیری ئاسمان دەکات و لەدڵیشەوە مینگە مینگی یەتی و وەستاندم، و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، ووتی: بەڵێ برازای خۆم، من ئەهلی کتێب و زانست و زانیاریم ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوە لە نەژادێکی مام ناوەندی عەرەبە -بەپێی ئەوەی- من لە نەژادناسیدا شارەزایم هەیە- ئەم هۆزەی تۆ مام ناوەندرتین نەژادن،

ووتم: مامی خۆم ئەو پێغەمبەرە چی دەڵێ؟ ووتی: شتێك دەڵێ لەلای نیگاوە پێی بووترێت، بەس ئەوەی تیایە ستەم ناکات و ستەمی لێ ناکرێت و کاری ستەم کاریش ناکات، هەرکە ئەو پێغەمبەرە هات بەڕاستم زانی و باوەڕم پێ کرد. [1]

ئەبوبەکر ئەم فەترەیەی بینا بیەکی ورد و بیرێکی ڕوناك و هۆشیێکی پرشنگدار و وردبوونەوەیەکی ژیرانە زاڵ بوو بەسرە دەروونیدا، بۆیە زۆری لەو هۆنراوانەی لەبەرکردبوو کە باس لەو پێغەمبەرە دەکەن، بۆیە جارێکیان پێغەمبەری سەروەرمان -ﷺ- لەهاوەڵەکانی -کە ئەبوبەکریشیان تێدابوو- پرسی: کێ لەئێوە وتەکانی قەسی کوڕی ساعدەی ئەیادی لەبەرە کە لەبازاڕی عەکاز ووتی؟

کەس قسەی نەکرد، ئەبوبەکری (الصدیق) ووتی: من لەبەرمە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژە لەبازاڕی عوکاز ئامادەبووم لەسەر پشتی حوشترەکەی وەستابوو دەیووت: (يا ايها الناس اسمعوا وعوا، واذا سمعتم فانتنعوا، انه من عاش مات، ومن مات فات، وكل ما هو آتٍ آت، ان في السماء لخبرا، وان في الارض لعبرا، مهاد موضع، وسقف مرفوع، ونجومٍ تمور، وبحار لن تغور، لي داج، وسماء ذات أبراج!! يقسم قُس ان لله ديناً هو احب اليه من دينكم الذى انتم عليه مالي ارى الناس يذهبون وال يرجعون، ارضوا بالمقام فاقاموا، ام تركوا فناموا. پاشان ئەم هۆنراوەیەی دەووت:

في الذاهبين الاوليـ ـن من القرون لنا بصائر
لمـــا رأيت مواردا للـــموت ليس لها مصدر
ورأيت قومي نحوها يسـعى الاكابر والأصاغر
ايقنت اني لا محـــا له حيث صار القوم صائرُ [2]

---

[1] تأريخ الخلفاء للسيوطى، لا ٥٢.
[2] مواقف الصديق مع النبي بمكة لا ٨.

بەم تەرتیبە نایابە، بەم مێشکە ئاسنینە تیژەوە کە ئەم هەموو شتانەی وەك خۆی لەبەر کردووەو ووتارەکەی قەسی کوڕی ساعیدە بۆ پێغەمبەری خواو هاوەڵان دەگێڕێتەوە.[1]

کاتێ لەشام دەبێت شەو خەوێك دەبینێت و بۆ بوحەیرای ڕاهیبی دەگێڕێتەوە،[2] بوحەیرای لێی دەپرسی: خەڵکی کوێیت؟ دەڵێ: مەککە، دەڵێ: کوێی مەککە؟ دەڵێ: قورەیش، ووتی: تۆچ کارەیت؟ ووتی: بازرگان، ووتی: ئەگەر خوا ئەم خەونەت بەڕاست بگرێت، لەو هۆزەی تۆدا پێغەمبەرێك هەڵدەکەوێت، و تۆ دەبیتە وەزیری لە ژیانیدا و دەبیتە جێگریشی لەپاش مردنی. ئەبووبەکر ئەمەی بەنهێنی هێشتەوە لەدڵی خۆیدا.[3]

موسڵمان بوونی (الصدیق) پاش وردبوونەوەو لێکۆڵینەوەو چاوەڕوانی بوو، ئەوەی هاوکاری کرد زوو موسڵمان بێت ئەو پەیوەندیە قولە بوو کە لەنێوان ئەو و پێغەمبەردا هەبوو لەسەردەمی نەفامیدا.

هەرکە قورئان هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر -ﷺ- خێرا دەستی کرد بە بانگەوازی تاکەکەسی بۆلای خوا، یەکسەر یەکەم کەسێ دەست نیشانی کرد -ئەبوبەکر بوو- چونکە کاتی خۆی هاوڕێی بووەو ڕەوشتە بەرزەکانی و سیفاتە جوانەکانی دەناسی، هەر وەك ئەویش پێغەمبەری خوای باش دەناسی بەڕاستگۆیی و دەسپاکی و ڕەوشت بەرزی یەك کە نەهێڵێ لەگەڵ خەڵکیدا درۆ بکات ئیتر چۆن درۆ بەدەم خوای گەورەوە دەکات؟[4]

کاتێ پێغەمبەری خوا -ﷺ- بانگی کرد بۆ موسڵمان بوون و پێی فەرموو (... من نێرراوی خوام، کەسێ ناردوومی تاکانەو هاو بەشی نی یەو نابێ جگە لەو هیچ شتێ بپەرسترێ و بەردەوام گوێ ڕایەڵی بیت.[5] هەر لەوێدا بڕیاری موسڵمان بوونی خۆی دا بەبێ ئەوەی زمانی تەتەڵەبکات، ڕۆشتە پێشەوە و نەگەڕایەوە، پەیمانی دا بە پێغەمبەر -ﷺ- کەپشتگیری لێ بکات و بەڕاستیش پەیمانی خۆی بردەسەر.

---

[1] **هەمان سەرچاوە لا ٩.**
[2] الخلفاء الراشدون، محمود شاكر لا ٣٤.
[3] الخلفاء الراشدون، محمود شاكر لا ٣٤.
[4] تاريخ الدعوة في عهد خلفاء الراشدين لا ٤٤.
[5] السيرة النبوية للابن هشام (٢٨٦/١) السيرة الحلبية (٤٤٠/١).

بۆیە لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەفەرموێت (إن الله بعثنی اليکم، فقلتم: کذبت، وقال ابوبکر: صدق، وواسانی بنفسه وماله، فهل انتم تارکوا لي صاحبی؟) واتە: خوا منی نارد بۆ ناوتان بە پێغەمبەر، وتتان: درۆ دەکەیت، ئەبووبەکر ووتی: ڕاست ئەکات، بەماڵ و گیان هاوکاری کردم، دە ئیتر ئایا هاوڕێکەمم بۆ واز لێ دێنن؟[1] دووجار فەرموویەتی.

ئابەم شێوە ئەبوبەکری (الصديق) یەکەم پیاوی سەربەست بوو موسڵمان بوو، ئیبراهیمی نەخەعی و حسان کوڕی سابت و ابن عباس و ئەسمای کچی ئەبوبەکر ووتوویانە: ئەبووبەکر یەکەمین پیاوە کەموسڵمان بوو..

یوسفی کوڕی یەعقوبی ماجەشون دەڵێت: باوکم و مامۆستایانیشمان وەك: محمد کوڕی منکدر و ڕەبیعە کوڕی عبدالرحمن وساڵحی کوڕی کیسان و سەعدی کوڕی ئیبراهیم و عثمانی کوڕی محمدی ئەخنەس بەم شیوە هەموویان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە ئەبوبەکر یەکەمین کەسە موسڵمان بووبێت.

ئیبن عەبباس — رضي الله عنه - دەڵێت: یەکەم کەس نوێژی کرد ئەبوبەکر بوو، پاشان نموونەی بەشیعرێکی حەسانی کوڕی سابت — رضي الله عنه - هێنایەوە کە دەڵێت:

إذا تذكرت شجراً من أخي ثقةٍ — فاذكـــر اخاك ابابكر بما فعلا
خير البرية اتقاها واعدلـها — بعـدالنبي واوفاهــا بما جملا
الثاني التالي المحمود مشهده — واول النـــاس صدّق الرسلا
والثاني اثنين في الغار المنيف وقد — طـاف العدو به اذ صعد الجبلا
عاش حيمداً لامـر الله متبعـــا — بهدى صاحبه الماضي وما نتقلا
وكان حب رسول الله قد علموا — من البرية لم يعدل به رجلا [2]

ئەمەو هەرچەندەزانایان لەمەسەلەی موسڵمان (الصديق)دا قسەیان هەیە،ئایا یەکەمین کەس موسڵمان بێت؟ هەندێکیان: بەبەڵێ پێداگری دەکەن ،وهەندێ تر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە علی - رضي الله عنه- یەکەمین کەس بوو موسڵمان بێت، و هەندێ تریش (زەیدی کوڕی حارسە) (رضي الله عنه) دادەنێت.

---

[1] البخاری کتاب فضائل اصحاب النبی ژمارە: ٣٦٦١.
[2] دیوان حسان (١٧/١).

بەڵام (ئیبن کەسیر) زۆر جوان ئەم ووتانەی یەکخستووە ووتوویەتی: ئەم قسانە هەموویان ڕاستن: خەدیجە – رضي الله عنه – یەکەمین کەسە موسڵمان ببێت لەئافرەتاندا. لەناو بەندەکانیشدا زەیدی کوڕی حارسە و لەناو منداڵانیشدا عەلی کوڕی ئەبوطالب – خوایان لێ رازی بێت - و لەناو پیاوانیشدا ئەبوبەکری (الصدیق) – رضي الله عنه -، موسڵمان بوونی ئەو لەموسڵمان بوونی هەموو ئەوانەی پێشتر سودبەخش تربوو، چونکە یەکێك بوو لەسەرکردە گەورەکان، سەرکردەیەکی بەڕێزی ناو قورەیش، پارەدار بوو، بانگ خوازبوو بۆلای ئیسلام، خۆشەویست و ئال و کەیف بوو، سامانی خۆی خەرج دەکرد لەگوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەیدا.

(ئەبوحەنیفە) –رەحمەتی خوای لێ بێ- ئەویش ئەو ووتانەی خستۆتە یەك ووتوویەتی: یەکەم موسڵمان لەناو پیاوانی سەربەستدا ئەبوبەکر بوو، لەناو ژناندا خەدیجەو لەناو بەندەکاندا زەیدی کوڕی حارسەو لەناو منداڵاندا عەلی کوڕی ئەبو تالب (خوا لەهەموویان ڕازی بێت).[1]

بەموسڵمان بوونی ئەبوبەکر خۆشی پەریە دڵی پێغەمبەری خوا -ﷺ- بە جۆرێ دایکی بڕواداران عائشە – رضي الله عنه - دەڵێت: هەرکە پێغەمبەری خوا لە ووتەکانی بوویەوە – ئەبوبەکر-یەکسەر-موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا هەستا لەلای و ڕۆی لەناو مەککەدا کەس ئەوەندەی ئەو دڵخۆش نەبوو، بە موسڵمان بوونی ئەبوبەکر.[2]

ئەبوبەکر کەنزێك بوو خوای گەورە شاردبوویەوە بۆ پێغەمبەرەکەی، خۆشەویسترین قورەیشی بوو لای قورەیشی یەکان، بەو ڕەوشتە بەرزە نازدارەیەوە کە خوا پێی بەخشی بوو وای لێ کردبوو هاوڕێیەتی کردنی زۆر خۆش بوو، لەو کەسانە بوو لەگەڵ خەڵکا هەڵدەکەن و خەڵکیش لەگەڵیان هەڵدەکات.. ڕەوشتی جوانیش هەر خۆی بەسە بۆڕاکێشانی دڵی خەڵك، ئەوەتە پێغەمبەری خوا دەربارەی دەفەرموێت: ((أرحم أُمتي بأُمتي أبوبكر)[3] واتە: بەبەزەیی ترینی ئوممەتم بۆ ئومەتەکەم ئەبوبەکرە).

---

[1] البداية والنهاية (٣/٢٨-٢٩).

[2] هەمان سەرچاوە لا (٣/٢٩)

[3] الألباني-لە صحيح الجامع الصغير.

هەر دو زانستی نەژاد ناسی و مێژووناسی لەلای عەرەب زۆر گرنگ بووەو ئەبوبەکریش — رضى الله عنه - لەهەردوکیاندا دەستێکی باڵای هەبووە و قورەیشیش خۆی ئەمەی دەزانــی کــە لەهەموو زیاتر زانیاری هەیە لەو دوو زانستە داو چاك و خراپی ڕووداوەکانی کۆن شارەزا بوو،

چینی ڕۆشنبیریش بەشداری کۆڕو دانیشتنەکانی (الـصديق) دەبــوون تــا زانیاریــەکی زۆری ئەوتۆی لێ وەربگرن کە لەلای کەسی تر بەو شێوە زۆرە نەبوو، بۆیە هــەردەم گــەنجانی زیــرەك و لاوانی خوێنگەرم هەمیشە بەشداری کۆڕە گەرمەکانی دەبوون، ئەم چینەش چینێکی فیکــر پــاك بوون و حەزی دەکرد ئەم زانستانەیان پێ بگەیەنێت،

هــەروەها چــینی کاســپ کــارو بازرگانــەکانیش بەشــداری کــۆڕو دانیــشتنەکانی دەبــوون، هەرچەندە یەکەمین بازرگانی مەککە نەبوو بەڵام بێ گومان لەناودارترینــەکانی بــوو، خــەڵکانی بەرژەوەندی داریش هاتووچۆیان دەکرد و لەبەر ئالوکەیفی و چاکی و ڕەوشت بەرزی خەڵکە سادە کەش دەهاتن بۆ ماڵەکەی و میوانداریێکی ڕوخۆش بوو زۆر خۆشحاڵ دەبوو بەهاتنی میوانەکانی و هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی مەککی سوودی خۆیانیان لە (الـصديق) ـخ رضى الله عنــه - وەردەگرت.[1]

سەروەتی ئەدەبی و زانستی و کۆمەڵایەتی یەکەی لەکۆمەڵگەی مەککیدا زۆر گەورە بــوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو هەرکە دەستی کردە جموجوڵی بانگــەواز خێــرا باشــترینی خــەڵکی هــاتن بەدەمی یەوە.[2]

دووەم: بانگەوازکردنی:

ئەبوبەکر (رضي الله عنــه)موسڵمان دەبێت و ئەرکی بانگەوازیش لەگەڵ پێغەمبەری خــوادا دەگرێتە ئەستۆ، لەپێغەمبەرەکەیەو ئەوە فێر بوو کە ئیسلام ئاینی کردار و بانگەوازو جیهــاد و قوربانی یە، و باوەڕ دانامەزرێت هەتا موســڵمان خــۆی ئەوەشــی هەیــەتی نەیبەخــشێتە خــوای پەروەردگاری جیهان.[3]

---

[1] سەیری (التربية والقيادة)ی عضبان (١١٥/١) بكە.

[2] هەمان سەرچاوە (١١٦/١).

[3] تاريخ الدعوة في عهد خلفاء الراشدين لا ٨٧.

خوای مەزن –جل جلاله- دەفەرموێت ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾.

الانعام: ١٦٢-١٦٣.

واتە: ((ئەی محمد بڵێ: نوێژ و خواپەرستی و ژیان و مردنم بۆخوای پەروەردگاری جیهانە و تەنهایە و هاوتای نی یە و من بەو جۆرە فەرمانم پێ دراوە و من یەکەمین موسڵمانم)).

ئەبوبەکر (الصدیق) – رضي الله عنه - زۆر دەجوڵا لەپێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازدا و کارەکانیشی زۆر بەبەرەکەت بوو، بەرەو هەرلایەك بجوڵایە کاریگەری و دەستکەوتی باشی بۆ ئیسلام دەبو، نموونەیەکی زیندووی جێ بەجێ کەری ئەم ئایەتەی خوای گەورە بوو کە دەفەرموێت ﴿ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ۖ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ) النحل: ١٢٥.

واتە: بەئامۆژگاریی جوان و حیکمەت و ژیرانە خەڵکی بانگ بکە بۆ ئیسلام و جوانترین شێوە دەمەقاڵەیان لەگەڵدا بکە خوای تۆ چاك دەزانی کێ لەرێگە ڕاستەکەی سەرگەردان دەبێت و کێیش دێتە سەر ڕێگەی هیدایەت.

هەوڵ و جموجوڵی (الصدیق) – رضي الله عنه - بۆ بانگەوازی ڕێگەی خوا دیمەنێك لەوێنەی باوەڕ بوونە بەم ئاینە، و بەدەمەوە چوونی خواو پێغەمبەرەکەیەتی بەوێنەی باوەڕدارێك دان بەخۆی دا ناگرێت و ئۆقرە ناگرێت تا ئەو بەرنامە ناوازەیەی هەڵی گرتووە لە دونیا نەگاتە هەموو خەڵکی،

دوور لەهەوڵێکی کاتی وشەوق و خرۆشی –عاطفی- کەپاش ماوەیەك کز دەبێت و دەکوژێتەوەو نامێنێت، بەڵکو جوڵە و چالاکی ئەبوبەکر – رضي الله عنه - هەر بەگوڕ و تین

بوو بۆ ئیسلام هەتا خوای گەورە، بردیەوە بۆ لای خۆی بەبێ ئەوەی سستی و کوژانەوەو ساردبوونەوە ڕووی تێ بکات.[1]

یەکەم بەرو بوومی بانگەوازی (الصدیق) — رضي الله عنه - موسڵمان کردنی پوختەیەکی لەهەڵبژاردەی خەڵکی چاك، وەکو: عوسمانی کوڕی عەفان و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف و زوبێری کوڕی عەوام و طلحە ی کوڕی عبیداللە و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عوسمانی کوڕی مەزغون و ئەبووسەلەمەی کوری عەبدولئەسەد و ئەبوعوبەیدەی جەڕاح و ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم هەریەکە لەو هاوەڵە بەڕیزانەی دەهێنا و تاك تاك دەیبردنە خزمەتی سەروەر -ﷺ- لەسەردەستی دا موسڵمان دەبوون. هەر ئەوانەش بوونە پایەی سەرەکی کۆشکی مەزنی ئیسلامەتی و بانگەواز، بەڕاستی بوونە کەرەستە بنەڕەتی بەهێزکردنی دەوروپشتی پێغەمبەری خوا -ﷺ- هەربەهۆی ئەوانەوە بوو خوای —عزوجل- پێغەمبەرەکەی سەرخست و خەڵکانێکی زۆر بەلێشاو هاتنە ناو ئاینی خواوە، ژن و پیاو و هەریەکەیان پێشڕەوی بانگەوازی بۆلای ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کۆمەڵێکی تریش لەگەڵ ئەوان —یەك یەك و دوو دوو کۆمەڵێکی کەم لەگەڵ کەمی ژمارەیاندا بوونە سەربازی بانگەوازو قەڵای پەیام بەجۆرێك نەپێشتر و نە دواتر و نە لەمەولایش کەس نایان گاتێ.[2]

ئەبوبەکر زۆر گرنگی دەدا بە خێزان و خانەوادەی خۆی ئەسماو عائشەی کچی و عەبدوڵڵای کوڕی (ئوم دەرمان)ی خێزانی و عامیری کوڕی فەهیرەی خزمەتکاری موسڵمان کرد،

ڕەوشتی جوان و ئاکاری بەرز کە تێکەڵی کەسایەتی (الصدیق) بوو بوون، هۆکارێکی گەورە بوو بۆ کارکردنە سەر دڵی خەڵکی و هاتن بەدەم بانگەوازیەوە بۆلای ئیسلام، خاوەنی سەروەتێکی گەورە بوو لەبواری ڕەوشت بەرزی و گەورەییدا لەناو هۆزەکەیدا، پیاوێکی گونجاو و خۆشەویست بوو لەناویاندا، گونجاوترین کەس بوو بۆ قورەیش بەڵکو تاکانەی زەمانی خۆی بوو لەم بوارەدا، سەرکردەیەکی بەڕێز و بەخشندەبوو.. ماڵی دەبەخشی، سفرەو میوانداریەکی وای هەبوو لە مەککەدا کەسە نەدەگەیشتە ئەو، پیاوێکی زمان پاراوو ڕەوانبێژ بووە.

---

[1] الوحی و تبلیغ الرسالة-یحیی الیحیی لا ٦٢.
[2] محمد رسول الله-عەرجون (٥٣٣/١).

ئەم ڕەوشت و ئاکارە جوانە زۆر پێویستن لە بانگخوازانـدا هـەبن، وەگـەرنا هـەموو بـانگ کردنێکی خەڵکیان بۆلای خوا دەبێتە هاواری بێ هودەی ناو دوڵ، یان فوکردنە ناو لمە، جا ژیانی (صدیق) – رضي الله عنه - بۆمان ڕوون دەکاتە تا چ ئاستێك لە ئیسلام تێ گەیشتبوو وە چـۆن ژیا لەو پێناوەدا، بۆیە جێگای خۆیەتی بـانگ خـوازان چـاوێکی لێ بکـەن لـەکاری بانگـەوازی تاکەکاندا بۆلایِ بەرنامەکەی خوا.

*** *** *** ***

سێ یەم: ئەشکەنجەدانی

ئەشکەنجەدان و ناڕەحەت کردن ڕێگایەکە دەبێت هەموو تاك و کۆمەڵ و گەل و نەتەوەیـەك پیاتێپەڕ بن، ئەم سوننەتەش هاتە ڕێگـای هاوەڵـە بـەڕێزەکان و لـەپێناو ڕەزامەنـدی خـوای – عزوجـل-دا هــەموو بـەڵاو ناڕەحـەتی یـەکان قبـوڵ کـرد بـەجۆرێ کـە کێـوە سەرکەشـەکان لەبەردەمیداخۆیان پێ نەگیرێت، ماڵ و گیانیان خستە پێناو خوای گەورەدا،

مەگــەر خــوا بزانێــت چ ناڕەحــەتی یــەکیان بەســەردا هــات و تەنانــەت ســەرکردە و گەورەپیاوەکانیشی گرتەوە، ئەبوبەکریش – رضي الله عنه - ناڕەحەت کراو تەنانەت خۆڵیان کرد بەسەرو چاویدا، لەناو کەعبەدا ئەوەندە نەعلیان دا بەسەر و چاویداکە لوتی لەدەم و چـاوی جیـا نەدەکرایەوە لەناو خوێندا، پێچایانەوە بەجلەکانی یەوە و چواردەستە بردیانەوە بۆماڵ بەشێوەیەك لەنێوان مان و مردندا بوو. عائشە – رضي الله عنه - دەگێڕێتەوە کەهاوەڵانی پێغەمبەری خـوا -ﷺ- ژمارەیان گەیشتە سی و هەشـت کـەس و ئەبوبـەکری (الـصدیق) – رضـي الله عنـە - هەرداوای لەپێغەمبەر -ﷺ- کە باخۆیان دەربخەین، ئەویش لەوەڵامـدا دەیـووت: جـارێ ئێمـە کەمین ئەی ئەبوبەکر، ئەبوبەکری (الصدیق) هەر کۆڵی نەداو هەر داواکەی دووبارە دەکردەوە تـا پێغەمبەری خوا ڕازی بوو بە کۆمەڵ ڕۆیشتن بۆ کەعبە و لەوێ موسڵمانەکان بڵاوبوونـەوە لـەناو کەعبەدا هەرکەسەو بۆلای هۆزەکەی خۆی،

ئەبووبەکر و پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێکـەوە دانیـشتبون، ئەبوبـەکر هەسـتایە سـەرپێ و دەستی کرد بە ووتاردان و خەڵکی بانگ دەکرد بۆ لای خواو پێغەمبـەر -ﷺ-، بـێ بـاوەڕان –

ئاگریان تێ بەربوو- دایان بەسەر ئەبوبەکرو موسڵمانەکانداو ئەبوبەکریان داگرتەوە بەشەق و زلەو خستیانە ژێر پێ لەقە،

عەتەبەی کوڕی رەبیعەی (لەخوا یاخی) لێی نزیك بوویەوەو بەنەعلێکی زبری گرۆگرکین هات بەدەم و چاویداو خۆی هەڵدایە سەر سکی ئەبوبەکر و تێرو پڕ نەعل کاری روومەت و سەری کرد تا وای لێ کرد چاوو لوتی لێك جیا نەدەکرانەوە، تا ئەوە بوو هۆزەکەی (نەوەی تیم) بوو هاتن و ئەبوبەکریان لەژێر چنگیان دەرهێناوپێچایان بە عباکەی خۆیەوەو هەڵیان گرت و بردیانەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، دڵنیا بوون لەوەی دەمرێت، پاشان نەوەی تیم گەڕانەوە بۆ کەعبەو وتیان: سوێند بەخوا ئەبوبەکر بمرێت ئێمەش عەتەبەی کوڕی رەبیعە دەکوژین، پاشان هاتنەوە بۆ لای ئەبوبەکر و ئەبوقوحافەی باوکی و ئەوانیش هەموو بانگی ئەبوبەکریان دەکرد تاکەمێ بەهۆش هاتەوەو وەڵامی دانەوە، لەئێوارەکەیدا کەوتە قسەو بەکەم ووتەی ووتی: پێغەمبەری خوا -ﷺ- چی بەسەر هاتووە؟ ئەوانیش چی قسەبوو پێیان دەوت و بەجێ یان هێشت و بەدایکیان ووت: ئەی ئومول خەیر بەڵکو خواردن و خواردنەوەی پێ بدەیت،

کاتێ هەر دایکی لەلابوو، دووبارە پێی ووتەوە: پێغەمبەری خوا چی بەسەر هاتووە؟ دایکیشی ووتی سوێند بە خوا دەربارەی ئەم هاوڕێیەت هیچ نازانم، پێی ووت: بڕۆ بۆ لای (ام الجمیل)ی کچی خەتتاب و هەواڵێکی لێ بپرسە، ئەویش ڕۆیشت تا گەیشت بە (ام الجمیل) و پێی ووت: ئەبوبەکر هەواڵی محمدی کوڕی عبدالله دەپرسێت، ئەویش ووتی: نە ئەبوبەکر و نە محمدی کوڕی عبدالله ئەناسم!. ئەگەر حەزیش دەکەیت لەگەڵت دێم سەرێك لە کوڕەکەت ئەدەم، ووتی: بەڵێ،

ئەوەبوو لەگەڵی ڕۆیشت تا گەیشتنە لای (ئەبوبەکر) دەبینێ هەر مەیتێکەو کەوتووە، (ام الجمیل) نزیك بوویەوەو هاواری لێ هەستا بۆی ووتی: سوێند بە خوا هەرکەسێك ئاوای لێ کردووی بێ باوەڕو لە خوا یاخین و لەخوا داواکارم تۆڵەی تۆیان لێ بکاتەوە،

ئەبوبەکر ووتی: پێغەمبەری خوا چۆنە؟ (ام الجمیل) ووتی: ئاخر دایکت دانیشتووە، ووتی: ترست نەبێ لێی، ووتی: ساق و سەلامەتە، ووتی: ئێستا لە کوێ یە؟ ووتی: لە ماڵی ئەرقەمە،

ووتی: پەیمانی خوابێت دەم نەبەم بۆ خواردن و خواردنەوە تا نەم بەن بۆ لای پێغەمبەری خوا -ﷺ-،

ئەوانیش خۆیان گرت ترپەی پێ نەما و خەڵکی چوونەوە ماڵەکانیانەوە، چوونە ژێر باڵی و بردیان بۆلای پێغەمبەری خوا -ﷺ- هەرکە بردیانە ژوورەوە: پێغەمبەری خوا پەلاماری داو ماچی کرد و موسڵمانەکانیش باوەشیان پێدا کرد و پێغەمبەری خوا زۆر دڵی بۆی سوتا، ئەوبەکر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- بەدایك و باوکەوە بە قوربانت بم من هیچم نی یە تەنها جێگە نەعلەکانی ئەو لە خوا یاخی یە بەدەم و چاومەوە ئازاریان هەیە، ئەمەش دایکمە و زۆرچاکە لەگەڵ کوڕەکەیدا و تۆش پیاوێکی پیرۆزیت بانگی بکە بۆلای خوا و لە خوایش داوا بکە بەڵکو لەسەر دەستی تۆ لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکات، ووتی: پێغەمبەری خوا دووعای خێری بۆکردو بانگیشی کرد بۆ ڕێگای خواو ئەویش موسڵمان بوو.[1]

ئەم بەسەرهاتە مەزنەی پێشوو گەلێ وانە و پەندی لەناوخۆدا حەشار داوە سودی زۆر دەبێت بۆ هەرمووسڵمانێك بیەوێت بەڕاستی پەیڕەوی ئەو هاوەڵە شیرینانە بکات، ئێمەش هەوڵ دەدەین هەندێ لەو پەندو ئامۆژگاریانە دەربهێنین:

١-سوربوونی ئەبوبەکری (الصدیق) لەسەر ئاشکراکردنی ئیسلام و دەرخستنی لەبەردەم بێ باوەڕاندا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هێزی باوەڕ و ئازایەتی، لەم ڕێیەشدا بەرگەی مەزنترین ناڕەحەتی گرت کە گەشتە ڕادەیەك هۆزەکەی نەیان دەزانی ئەمێنێت، خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی تەواوی دڵی داگیرکردبوو لە خۆیشی زیاتر، ئیتر پاش موسڵمان بوون هیچ شتێك بەلایەوە گرنگ نەبوو جگە لەبەرزکردنەوەی ئاڵای یەکتاپەرستی و ووشەی (لا الـه الا الله، محمد رسول الله) لەمەککەدا دەنگ بداتەوە ئیتر با نرخەکەشی تیاچوونی گیانی خۆیشی بێت، و هەروایش بوو خەریك بوو (صدیق) — رضي الله عنه - گیانی خۆی دابنێ لە پێناوبیرو باوەڕ و ئیسلامەکەیدا.

٢-سوربوونی (الصدیق) — رضي الله عنه - لەسەر ئاشکراکردنی ئیسلام لەناو ئەو گۆمی سەرکەشی و نەفامی یەدا، ئارەزوو کردنی بوو کە ئەو ئیسلامە ئاشکرا بکرێت کە هەموو دڵی

---

[1] السيرة النبوية لابن كثير (١/٤٣٩-٤٤١) البداية والنهاية (٣/٣٠).

داگیر کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی چ جۆرە سزایەك دادەبارێ بەسەرخۆی و هاوەڵەکانیدا، ئەمەش هیچی کە ناگەیەنێت جگە لەوەی خۆی بۆ خستۆتە ئەو لاوە و خۆی یەك لا کردۆتەوە.

٣-خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی لەخۆشویستنی خۆی زیاتر بوو لە دڵیدا، بەبەڵگەی ئەوەی لەگەڵ هەموو ئەو ئێش و ئازارەیدا هەر کە هۆشی هاتەوە هەواڵی پێغەمبەری خوای دەپرسی، پێش ئەوەی نان و ئاو بەرێت بۆ دەمی دەیووت پێغەمبەری خوا چۆنە؟ بەڵکو سوێندیشی خوارد نان و ئاو نەخوات تا نەیبەن بۆلای و بەچاوی خۆی بەسەلامەتی نەیبینێ،

ئا ئەمەیە خۆشویستنی ڕاستەقینەی خواو پێغەمبەرەکەی و دەبێت هەموو موسڵمانێك ئەو دوانەی لەهەمووشتێك خوشتر بوویت ئیتر با لەو پیناوەشدا سەریش وماڵیشی تیا بچێت.[1]

٤-دەمارگیری خێلایەتی لەو کاتەد ارۆڵی خۆی بینی لەگۆڕینی ڕێڕەوی ڕووداوەکەو هەڵسوکەوت لەگەڵ تاکەکاندا ئیتر با بیروباوەڕیشیان یەك نەبێت، ئەوەتا هۆزەکەی ئەبوبەکر هەڕەشی کوشتنی عوتبە دەکەن ئەگەر ئەوبەکر بمرێت.[2]

٥-کۆمەڵە هەڵوێستێکی جوان لە (أم جمیل)ی کچی خەتتاب بەدی دەکرێت بۆمان دەردەکەوێت کە تا چ ڕادەیەك پەروەردە کراوە لەسەر خۆشەویستی بانگەوازو خەمخواردنی بۆی، جولانەوە بۆ ئەم ئاینە، کاتێ دایکی ئەبوو بەکر لێی دەپرسێت دەربارەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەوەلامدادەڵێت: نە ئەبوبەکر دەناسم و نە محمدی کوڕی عبداللە، ئەمەش هەڵوێستێکی پڕ لە حەزەر و ئاگاداری کردنی تەواوە، چونکە (ام الخیر) تا ئەوکاتەش موسڵمان نەبوو بوو، (أم جمیل) یش موسڵمانەتی خۆی شاردەوە، و نەیویست (ام الخیر) پێی بزانێت و لەهەمان کاتیشدا شوێن و ڕێگەی پێغەمبەری خوای لێ شاردەوە و لە ترسی ئەوەی نەوەك جاسوسی قورەیش بێت.[3]

لەهەمان کاتیشدا ویستی لەسەلامەتی (الصدیق) دڵنیابێت بۆیە پێشنیاری کرد با پێکەوە بچین بۆلای کوڕەکەت، هەرکە گەیشتنە لای ئەبوبەکر، (أم جمیل) ئەوپەڕی حەزەرو دووربینی دەکرد کە نەیهێشت لەوشەکانیدا شتێ بلێ شوێنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئاشکرا بکات تەنها ئەوەندەی بە (الصدیق) ووت: پێغەمبەری خوا -ﷺ- بێوەیە و باشە!.

---

[1] استخلاف ابی بکر الصدیق، د.جمال عبدالهادی لا (٣٢،٣).
[2] محنة المسلمین في العهد الملکی، د.سلیمان السویکت لا ٧٩.
[3] السیرة النبویة قراءة لجوا ابن الحذر لا ٥٠.

ئەوەشمان بۆڕۆشن دەبێتەوە کەم هەڵوێستی کەتمان و حەزەر کردنەدا دەردەکەوێت نەوەکو ئاشکرا بن و لەژێر ئەشکەنجەو سزادا لە ئاینەکەیان پەشیمان ببنەوە کە ووتی: (شەودا هات و ترپەی پێ نەماو خەڵکی بێ دەنگ بوون) [1] ئەوجا ڕۆیشتن بۆ ماڵی ئەرقەم.

٦-چاك هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ دایکیدا و سووربوونی لەسەر هیدایەت دانی ئەمەش بەوەدا دەردەکەوێت کە بەپێغەمبەری خوای -ﷺ- ووت: ئەمە دایکمە و زۆر چاکە لەگەڵمدا تۆش (موبارەکیت) بانگی بکە بۆلای خواو نزای خێری بۆ بکە بەڵکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە لە ئاگری دۆزەخ بیپارێزێت، ئەمەش ترسە لە سزای خواو حەز کردنە لەبەهەشتەکەی، پێغەمبەری خوایش -ﷺ- نزای ڕێنمایی بۆ کرد و ئەویش وەڵامی دایەوەو موسڵمان بوو، هاتە ڕیزی دەستەی یەکەمی باوەڕ دارانی پیرۆز کە هەوڵیان دەدا ئاینەکەی خوای -عزوجل- بڵاو بکەنەوە، و هەست بە سۆزو بەزەیی خوا دەکەین لەگەڵ بەندەکانیدا و لەم ڕووداوەوە یاسای بەخشین لە دوای بەخشینمان بۆ دەردەکەوێت.

٧-ئەبوبەکری (الصدیق) -رضي الله عنه- پاش پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەلایەن ئەشکەنجەو ئازارو ناڕەحەتی یەوە بە پلەیەك دێت، بەپێی ئەوەی زۆر کات لەگەڵ پێغەمبەردا بووەو هاوڕێ تیابەتنی بووە، خۆی داوەتە بەری و خۆی داوە بەسەریدا لەکاتی سزاو ناڕەحەتی یەکاندا بەدەستی هۆزەکەی، بەردەوام بەرگری لێ دەکرد و خۆی دەکردە قوربانی، و ئەویش لەو سزایانە بێ بەش نەدەبوو کە دادەباریە سەر پێغەمبەر، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك بووە لەگەورە پیاوانی قورەیش و ناسرابوو بە ژیرۆمەند و چاکەکار. [2]

چوارەم: بەرگری کردنی لە پێغەمبەری خوا -ﷺ-:

لەو ڕەوشتانەی کە ئەبوبەکر لەکەسانی تر جیا دەکاتەوە: ئازایەتی و بوێری، لەشتی ڕاست و دروستدا لەکەس نەدەترسا، لەکارکردن بۆ بەرزی ئاینی خواو سەرخستنی و بەرگری لە پێغەمبەری خوا -ﷺ- هیچ کات گوێی بە لۆمەی لۆمەکاران نەداوە،

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ٥٦.

[2] محنة المسلمين في العهد الملكي لا ٧٥.

عورووەی کوڕی زوبێر دەڵێت: پرسیارم کرد لە کوڕەکەی عەمری کوڕی عاص کە باسی ناڕەحەت ترین کارێ کە بتپەرستان بەسەر پێغەمبەری خوایاندا هێنابێت ووتی: لەکاتێکدا پێغەمبەر لەناو کەعبەدانوێژی دەکرد، عقبەی کوڕی ئەبی موعیت جلەکانی خۆی ئالاند لە ملی و زۆر بە توندی بایداو ئەبووبەکر بەخێرایی بەرەو ڕووی ڕۆیشتوو هەردووشانی گرتوو لەکۆڵی پێغەمبەری خوای کردەوە -ﷺ- [1] و پێی ووتن: ((أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ ﴿٢٨﴾)) غافر (٢٨) ئایا بەنیازن کەسێ بکوژن کە دەڵێ (الله) خودامەو بەس؟

لەگێڕانەوەیەکی ئەنەسیش دا هاتووە کە دەڵێ: جارێکیان ئەوەندەیان دا لە پێغەمبەری خوا -ﷺ- تا بورایەوەو لەهۆش خۆی چوو، ئەبووبەکر – رضي الله عنه - هەستایەسەر پێ و هاواری کرد: وەیل بۆ ئێوە و لەناوچن ئایا کەسێ دەکوژن کە دەڵێ تەنها (الله) خوامە؟.

لەفەرموودەیەکی ئەسمادا هاتووە دەڵێ: یەکێ هات بۆلای ئەبوبەکر و هاواری کرد: فریای هاوڕێکەت بکەوە، بەپەلە لەماڵ دەرچوو و چوار پەلکەکەی دەلەرینەوەو بەدەم خۆیەوە هاواری دەکرد: دەك لەناوچن ئەتانەوێ پیاوێك بکوژن کە دەڵێت تەنها (الله) خوامە؟!. وازیان لەو هێناو پەلاماری ئەبوبەکریان دا، هەرکە گەڕایەوە وایان لێ دابوو، دەستت نەدەبرد بۆ تەڵە موەکانی پەلکەکانی دەهات بەدەستتەوە. [2]

بەڵام لەفەرمودەکەی —عەلی کوڕی ئەبوتالب دا- رضي الله عنه - ڕۆژێکیان هەستایە سەرپێ و وتاری دەدا و دەیووت: ئەی خەڵکینە کێ ئازاترین کەسە؟ ووتیان: تۆ ئەی ئەمیری موسڵمانان، ووتی: بەڵێ من هیچ کەس بەرانبەرم نەوەستاوە کە لێی نەبەمەوە و بەسەریدا زاڵ نەبم، بەڵام لەڕاستیدا ئەو کەسە ئەبوبەکرە، ئێمە کەپرێکمان بۆ پێغەمبەری خوا -ﷺ- دروست کرد و ووتمان: کێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا -ﷺ- دەبێت تا هەرکەسێ لێی نزیك بێتەوە لەبتپەرستان ئەو پەلاماری بدات و نەهێڵێت؟، سوێند بەخوا یەك کەس لێی نزیك نەبوویەوە جگە

---

[1] البخاري ژمارە (٣٨٥٦).
[2] منهاج السنة (٤/٣) فتح الباری (١٦٩/٧).

لەئەبوبەکر – رضي الله عنـه - نەبێت کەشمشێرەکەی هەڵکێشاو بەسەرسـەری پێغەمبـەرەوە وەستاو هەرکەسێ لەقورەیش پەلاماری کەپرەکەی بدایە خێرا پڕی ئەدایەو خـۆی بـۆ هـەڵ دەدا، ئەمەیە ئازاترین کەس ،

ووتی:- پێغەمبەری خوام بینی -ﷺ- بتپەرستانی قورەیش دەوریان دابوو یەکێ دژایـەتی دەکرد، یەکێ دەیان ووت: تۆ! تۆ هەموو خواکانت کردەوە بەیەك خوا؟ سوێند بـە خـوا کـەس لێی نزیك نەبوویەوە تەنها ئەبوبەکر نەبێت لەمی ئەداو پالێی ئەنا بـەوی تـرەوەو ئـەوانی تـر و بەردەوام دەیووت: لەناوچوون بۆ ئێوە ئایا کەسێ دەکوژن (کەتاوانی نی یە) تەنها ئەوەیە دەڵێـت (الله) خوامە پاشان عەباکەی بەری کۆکردەوەو دەستی کرد بەگریان تا پـشتی تـەڕ بـوو، پاشـان ووتی: توخوا پێتان دەڵێم (مؤمن آل فرعون) باشترە یان ئەو؟ هەموو خەڵکەکە بێدەنگ بـوون، علی – رچی الله عنە - ووتی: دە سوێند بە خوا ساتێکی ئەبوبەکر باشترە لە پڕی سەرزەوی لـە (مؤمن آل فرعون)، چونکە ئەوکەسێ بووە باوەڕەکەی شاردۆتەوە بەڵام ئەم پیاوێك بوو بـاوەڕی خۆی ئاشکرا کرد.[1]

ئەمە وێنەیەکی پرشنگدارە ئەو زۆرانبازیە ڕوون دەکاتەوە کە لەنێوان ڕەواو ناڕەواو ڕێنمایی و گومڕاهی و باوەڕو بێ باوەڕی دا ڕوودەدات، ڕادەی خۆگرتنی (الـصدیق) – رضـي الله عنـه - مان بۆ دەردەکەوێت لەبەردەم ئەشکەنجەو ئازار لەپێناوی خوای تەعالادا، هەروەك چـۆن دیـمەنی کەسایەتیەکی ناوازەکەی دەردەخات، و ئازایەتی یە بێ وێنەکـەی کـە پێـشەوا –عـەلی کـوڕی ئەبوتالب- رضي الله عنە - لەسەردەمی جێ نشینایەتی خۆیدا شایەتی بۆدا، واتە پـاش دەیـان ساڵ، کار دەکاتە سەر عەلی و دەگری و خەڵکیش دەکاتە گریان..

ئەبوبەکر – رضي الله عنە - یەکەمین کەس بوو پاش پێغەمبەری خـوا -ﷺ- دووچـاری ئەشکەنجەو ئازار بوو، یەکەم کەس بوو بەرگری لە پێغەمبەری خوا کـردو یەکـەم کەسـیش بـوو بانگەوازی کرد بۆ لای خوا، وەك دەستە ڕاستی پێغەمبەری خوا وابوو، خۆی یەکلایی کردەوە بۆ کاری بانگەوازو هاوڕێیەتی بەردەوامی پێغەمبەری خواو هاوکاری کردنی لەکاری پـەروەردەکردن و فێرکردن و ڕێزگرتنی ئەوکەسانەی تازە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، ئەمەش (ئـەبو زەڕ) – رضـي

[1] البداية والنهاية (٣/٢٧٢، ٢٧١).

الله عنه - باسی موسڵمان بوونی خۆی دەکات بۆمان و تیایدا دەڵێت: (...ئەبوبەکر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەم بدە ئەم شەو لای من نان بخوات، و لە مێوژی تائیف تێری کردم.[1]

ئا بەم جۆرە (الصديق) — رضي الله عنه - وەستانی لەڕیزی پێغەمبەری خوادا هەموو مەترسی یەکی سەرخۆی لەلا سووك بوو، بەڵام کەمترین تا زۆرترین مەترسی لەسەر پێغەمبەری خوا -ﷺ لەلا سوك نەبوو بەلکو خێرا بەرگری لێ دەکرد و دەست درێژکارانی لێ دوور دەخستەوە.

کاتێ دەیبینی پەلاماری ملیوانی کراسەکەی پێغەمبەری خوایان دەدا خێراخۆی دەگەیاندە نێوان ئەوان و پێغەمبەر و هاواری دەکرد و بەسەریاندا: لەناوچن ئەوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێ تەنها (الله) خوامە؟ ئیتر وازیان لە پێغەمبەر -ﷺ- دەهێناو بەردەبوونە سەرو چاوی ئەو، قژیان ڕادەکێشاو بەجێیان نەدەهێشت مەگەر پاش ئەوەی جلەکانی بەریان لەت و پەت ئەکرد.[2]

پێنجەم: ماڵ بەخشینی لەپێناو ئازادکردنی سزادراوانی ڕێی خوادا:

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بانگەواز لەناو کۆمەڵگای مەککەی نەفامیدا ئازار و ئەشکەنجە چەند جارە بوویەوە لەسەر پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاوەڵەکانی، تا گەشتە چڵەپۆپە بەتایبەت بەرامبەر موسڵمانە بێ کەس و چەوساوەکان، زۆریان پێ کردن بە ئومێدی ئەوەی لەبیروباوەڕ و ئیسلامەکەیان پەشیمانیان بکەنەوە، و بیشیان کەن بەپەند بۆ کەسانی تر، و بۆ دەربڕینی کینە و توڕەبوونی خۆیان بەداباراندنی سزای جۆراوجۆر بۆ سەریان.

(بیلال) — رضي الله عنه - دووچاری سزای گەورە بوو، بیلالیش پشتێکی وای نەبوو بەرگری لێ بکات، و هۆزێکی نەبوو بیپارێزێت، شمشێرێ نەبوو بەرگری لێ بکات، مرۆڤێکی ئابەم جۆرە و لەکۆمەڵگەی نەفامی مەککی دا، بێگومان یەکسانە بە هیچ، هیچ کارێکیشی پێ ناکرێت جگە لەخزمەت کردن و گوێ ڕایەڵی و کڕین و فرۆشتنی وەك مەڕ و بزن،

بەڵام ئەگەر بیەوێت ڕاوبۆچونی هەبێ، بیرێکی هەبێ، خاوەنی بانگەوازێك یان مەسەلەیەك بێت ئەوە تاوانێکی زەبەلاحەو کۆمەڵگەی نەفامی مەککی دەهەژێنێ، پایەکانی دەلەرزێنێ،

---

[1] الفتح (٢١٣/٧) الخلافة الراشد، يحيى اليحيى لا ١٥٦.
[2] عبقرية الصديق للعقاد لا (٨٧).

بەڵام بانگەوازی نویٚ گـەنج و لاوان خۆیـان پـیٚ گەیانـدو بەرامبـەر هەموونـەریت و خوویـەکی باوباپیرانی مەزنیان وەستان و ئەمەش دڵی بەندە لەبیرکراوەکانی، جوڵاندو کردنی بـە مرۆڤیٚکـی نویٚ لە ژیاندا.[1]

و ئیتر پاش باوەڕ هیٚنانی بەم ئاینە نـویٚ یـە هـەموو واتاکـانی بـاوەڕ لـەکانگای دڵیـدا، تەقییەوەو هاتە ڕیزی محمد -ﷺ- و براکانی لە کەژاوەی بـاوەڕی مەزنـداو هەرکـە گەورەکـەی ئومەییەی کوڕی خەلەف -نەفرەتی خوای لیٚ بـیٚ- بەموسـڵمان بـوونی بەندەکـەی خـۆی زانـی دەستی کرد بە هەڕەشە لیٚ کردنی لەلایەك و لەلایەکی تریشەوەبە هەڵخەڵەتاندن دەیوویست وازی پیٚ بهیٚنیٚ، بەڵام سەیر دەکەی بیلال زیاتر سوور دەبیٚـت لەسـەر ئـاینی نـویٚ و ئامـادە نـی یـە جاریٚکی تر بگەڕیٚتەوە بۆ دواوە، بۆلای بیٚ باوەڕی، نەفامی، گومڕایی،

ئومەییە ڕقی لیٚ هەستاو بڕیاری دا بە توندترین شیٚوە سزای بدات، لەبـەر خـۆری گـەرم ی بیابان بەقرچەی نیوەڕۆ چوار میٚخەی دەکیٚشاو شەوو ڕۆژیٚك نان و ئاوی لیٚ قەدەغە کردبـوو، بـە پشتا لەسەر ئـەو لـە گەرمـە هەڵقرچـیٚنەرە ڕای دەخـست و بەخزمـەتکارەکانی دەووت: بـڕۆن بەردیٚکی زۆر گەورە بهیٚنن و بیخەنە سەر سنگی بیٚگومـان بەدەست بەستراوی،

پاشان پیٚی دەووت: ئابەم جۆرە دەبیت تا مردن یان تـا بـیٚ بـاوەڕ دەبیتـەوە بـە (محمـد) و دەست دەکەیتەوە بە پەرستی (لات و عوزا)، بیلالیش - رضي الله عنـه - بەهـەموو خـۆگری و ئارامی یەوە وەڵامی دەدایەوەو دەیگوت: أحـد، أحـد، واتـە: تـەنها خـوا شـایانی خوایـەتی و پەرستنە،

ماوەیەك بەردەوام(ئومەییەی کوڕی خەلەف) بەوشیٚوە ناشایستەیە سزای بیلالی دەدا،[2] باوەڕەکەی پیٚغەمبەری خوا -ئەبوبەکر- رضي الله عنه - ڕۆیشت بۆ جیٚگـای سـزادانەکەو بەڵکو ڕیٚکەوتنیٚ بکات لەگەڵ ئومەییە بۆیە پیٚی ووت: ئایـا لـە خـوا ناترسـی وا ئەکـەی بـەم هەژارە؟ تاکەی! ئەویش ووتی: تۆ میٚشکیت تیٚك داوە دەی تۆش ڕزگاری بکە، ئەبوبەکر- رضي الله عنه - ووتی: ئەیکەم، من خزمەتکاریٚکی ڕەشی لەمە ئازاتر و لەم ئیش کـەرترم هەیـە کـە

---

[1] التربية والقيادية (١٣٦/١).
[2] عتيق العتقاء (ابوبكر الصديق) محمود البغدادى لا ٣٠-٤٠.

لەسەر دینی خۆتە ئەتدەمێ، بمدەرێ، ووتی: قبولّم کرد و ئەبوبەکریش بەندە ڕەشەکەی بۆ هێناو بیلایشی بردو ئازادیشی کرد، [1]

لەگێڕانەوەیەکی تردا کڕیەوە، بە (٧) ئوقیە یان (٤٠) ئوقیە ئاڵتون، [2] ئای کە بیلال چ ئارامی و خۆگری یەکی هەبوو — رضي الله عنه -، بەڕاستی موسڵمان بوو، دڵی پاك بوو، بۆ بەچوارمێخەکێشانیش و بەهەموو جۆرەکانی سزاو بە هەموو بەرامیەوە ستانێك باوەڕەکەی نەلەقاند، هەموو خۆگری و ئارامی یەکی ئەوەندەی تر ڕقی هەڵدەساندن و توڕەی ئەکردن،

بەتایبەتی ئەم بیلالە تاکانە پیاوێك بووکە لەناو لاواز و چەوساوەو موسڵمانەکاندا لەسەر ئیسلام خۆی ڕاگرت و ئازایانە بەرامبەریان وەستاو ووشەی یەکتاپەرستی دەدا بە گوێیاندا و بەهیچ جۆرێ بە دڵی بێ باوەڕانی نەکردو، و لە پێناوی خواداخۆی لەلا بێ نرخ بوو و لای هۆزەکەشی بێ نرخ بوو. [3]

لەدوای هەموو ناخۆشی یەك خۆشی دێت، بۆیە بیلال لەجۆرەها سزاو ئەشکەنجە ڕزگاری بوو، لە کۆتی دیلایەتی ڕزگاری بوو، هەموو ماوەی ژیانی لەو ڕۆژە بەدوا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بەسەری بردو تا مردنیش لێی ڕازی بوو.

ئەبوبەکری (الصديق) — رضي الله عنه - بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی ئازادکردنی بەندە سزادراوەکان و وای لێ هات ئەم کارە بووبە بەرنامە لەناو ئەو نەخشەیەی کە سەرکردایەتی ئیسلامی گرتبوویە بەر بۆ بەرگری لەو سزایانەی دادەباریە سەر موسڵمانە چەوساوەکان، بەپارەو بە پیاوێك بەتاك پشتی بانگەوازی ئەستوور دەکرد و دەگەڕا هەر بەندەیەك لەژێر سزادا بوایە — ئیتر چ ژن بوایە یان پیاو- دەچوو دەیکڕینەوە لەگەورەکانیان لەوانە:

عامیری کوڕی فەهیرە —کەبەشداری جەنگی بەدرو ئوحودی کرد و لە ڕۆژی (بئر معونـه)دا شەهیدکرا، و (ئەم عوبەیس، و (زنیرە کاتێ ئازادی کرد چاوی لەدەست دابوو، قورەیشی یەکان

[1] السيرة النبوية لابنهشام (٣٩٤/١).
[2] التربية القيادية (١٤٠/١).
[3] محنة المسلمين في العهد الملكى لا ٩٢.

ووتیان: تەنها (لات و عوزا)( چاویان کوێرکردوە، زەنیرەیش ووتی: درۆ دەکەن بە خوای کەعبـە، لات و عوزا- نەزیان دەگەیەنن و نە قازانج، خوای گەورە چاوەکانی بۆگێڕایەوە.[1]

خانمێکی تری ئازادکرد بەناوی (نەهدیە) و خوشکەکەی کەهـەردوکیان پێکـەوە کـەنیزەکی ئافرەتێکی نەوەی (عبدالدار) بوو (ئەبوبەکر)داهبەلایاندا کە گەورەکەیان ناردنی بۆ ئـارد و پێـی ووتن: سوێند بەخوا هەرگیز ئازادتان ناکەم، ئەبوبەکرووتی: نانـا سـوێندەکەت بـشکێنە دایکـی فلاّن ووتی: تۆ بیشکێنە، سەرت لێ تێکداون، ئازادیشیان کـە، ووتـی: هـەردووکیان بەچـەندە؟ ووتی: بەوەندە و بەوەنـدە، ووتـی: ئـەوا وەرم گـرتن و هـەردووکیان ئـازادبن و دەی ئاردەکـەی بدەنەوە، هەردووکیان ووتیان: ئەتوانین ئاردەکەی بۆ بێنین؟ ووتی: ئارەزووی خۆتانە.[2]

لێرەدا هەڵوێستەیەکی بیرکردنـەوە دەکـەین کـە چـۆن ئیـسلام یەکـسانی خـستۆتە نێـوان ئەبوبەکری (الصدیق) دووکەنیزەکەکە بەجۆرێ وا قسەی لەگەڵدا بکەن وەك هاوتا لەگەڵ هاوتادان نەك گەورە لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا، و (الصدیق) یش — رضي الله عنه - لەگەڵ ئەو پلەو پایـەو کەسایەتی یە گەورەیەیدا چ لە جاهلی و چ لە ئیـسلامدا- قـسەکەیان لێ وەردەگرێـت- لەگـەڵ ئەوەشـداکە ئـەو پـارەی داوەو ئـازادی کـردوون ئـەی چـۆن ئیـسلام لـەو مـاوە کەمـەدا ئـەو دووکەنیزەکەی پەروەردەکرد لەسەر ئەوەی کـە ڕەوشـت بـەرزبن و کـاتێ ئـازادکران ئـەیانتوانی ئاردەکە فڕێ دەن بە هەوادا یان گیانلەبەرێك یان باڵندەیـەك بیخـوات بـەڵام چـاکیان نوانـد بـۆ دواجار شوێنێکی جوانیان لە دڵی ئەو گەورەیەیاندا جێ هێشت و تا ئاردەکەیان بۆ نەکرد بە نـان بەجێیان نەهێشت.[3]

ئەبوبەکری (الصدیق) جارێك دەدات بەلای کەنیزەکێکی نەوەی (موئەمـەل) کـە تیرەیەکـە لەبەنی عەدی کوڕی کەعب، و موسڵمان بوو بوو عومەری کـوڕی خـەتتابیش لـەو کاتـەدا بـت پەرست بوو موسڵمان نەبوو بوو ئەشکەنجەی دەدا تا لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە، تاوای لێ هـات تاقەتی نەما ئەوەندەی لێدا پێـی ووت: داوای لێبوردنـت لێ ئەکـەم وازم لێ نـەهێناوی مەگـەر

---

[1] السیرة البشریة لابن هشام (٣٩٣/١).
[2] **هەمان سەرچاوە، لاپەڕە (٣٩٣/١).**
[3] السیرة النبویة لابی شهبه لا (٣٤٦/١).

لەبەر بێتاقەت بوون، ئەویش دەیووت دەی خوایش وا لە تۆ بکات، ئەبوبەکر – رضي الله عنه – لێی کڕی و ئازادی کرد.[1]

ئا بەم جۆرە ئازادبەخش بوو، ڕزگارکەری بەندەکان، زانای ئیسلامی شکۆدار، کە لەناو گەلەکەیدا ناسرابوو بە: دەستگرۆیی نەداری دەکرد، سیلەی ڕەحمی بەجێ دەهێنا، ئازاری هەموانی هەڵدەگرت، ڕێزی لە میوان دەگرت، پشتگیری حەق بوو لە ڕووداوەکاندا، لەسەردەمی نەفامیشدا نەکەوتبووە زۆنگاوی گوناە، ئەیکرا لەگەڵ هەموان هەموان ئەیانکرا لەگەڵی، دڵی دەجولا و بەزەیی دەهاتەوە بە چەوساوەو بەندەکاندا، بەشێکی زۆری سامانانەکەی خەرج کرد لە پێناو کڕینی بەندەکان و ئازادکردنیشیان لەبەر خوا، بۆ خوا، ئەمە پێش ئەوەشی یاسا جوانەکانی ئیسلام دەربارەی ئازادکردنی بەندە دابەزێتە خوارەوە کە تیایدا پەیمانی پاداشتی گەورە بدات بەوانەی بەندە ئازاد دەکەن.[2]

کۆمەڵگەی مەککە بەچاوی سوک دەیانڕوانی یە ئەم کارەی ئەبوبەکری (الصدیق) – رضي الله عنه – کە ئەم هەموو سامانەی خەرج دەکات بۆ ئەو چەوساوانە، بەلام لەڕوانگەی ئەبوبەکرەوە، ئەوانە برای ئەون لەم ئاینە نوێ یەدا، یەك کەس لەوانە لەلای ئەو لەهەموو بت پەرستانی سەرزەوی و سەرکەشان باشترە،

بەم جۆرەکەسانەو کەسانی تر دەوڵەتی یەکتاپەرستی دێتە کایەوە، و شارستانی یەتی بەرزی ئیسلام دروستدەکەن،[3]

ئەبوبەکری (الصدیق) بەم کارەی بەتەمای سوپاس و ناوداری و دنیا خۆری نەبوو، بەڵکو بەتەمای ڕەزامەندی خوای گەورە و خاوەن دەسەڵات و ڕێز بوو، ڕۆژێك دایك و باوکی پێی دەڵێن: ئەی کوڕی شیرینم ئەبینم بەندە هەژارەکان ڕزگار دەکەیت، شەلا تۆ پیاوێکی ئازاو بەجەرگت ئازاد بکردایە کە بەرگریان لێ بکردیتایەو لە پشتی تۆ بوونایە؟ ئەبوبەکر – رضي الله عنه – ووتی: باوکی شیرینم ئەوەی دەمەوێت بیکەم بۆ خوام دەوێت،

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام (١/٣٤٦).
[2] السيرة النبوية لابن شهبه (١/٣٤٥).
[3] السيرة النوبية لابن شهبه (١/٣٤٥).

ئیتر جێگای سەرنج نی یە ئەگەر خوای گەورە دەربارەی (الصدیق) ئایەت دابەزێنێتە خوارەوەو تا ڕۆژی قیامەت بخوێنرێتەوە وەك دەفەرموێت: ((فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ ﴿١٢﴾ )) اللیل: ٥-١٢.

ئەبوبەکری (صدیق) لەهەموو کەس مەزن تر بوو لە ماڵ بەخشیندا لەپێناو ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەیدا.

ئەم هاوبەرپرسیارێتی یە (التکافل)ی نێوان تاکەکانی کۆمەڵی ئیسلامی لوتکەیەکە لە لوتکەکانی خێرکردن و ماڵ بەخشین، ئەو بەندە چەوساوانە بە ئیسلام بوونە خاوەنی بیروباوەڕ و بیروڕایەك کە لەپێناویدا چەندو چوون و وتووێژیان دەکرد و دەیان خستە تەوقی سەریان و لە پێناویدا دەکشان، هەوڵدانی ئەبوبەکر – رضي الله عنه - بۆکڕینی بەندەکان و پاشان ئازادکردنیان بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و مەزنی ئەم ئاینە و تا چ ڕادەیەك کاریگەری کردۆتە سەر دڵ و دەروونی.

موسڵمانانی ئەمڕۆ چەندە پێویستیانە ئەم نموونە بەرزانە زیندوو ڕاگرن و ئەم هەستە باڵانە بپارێزن تا تێکەڵی و پێکەوە ژیان دروست ببێ ڕۆڵەکانی موسڵمانان کە ئەمڕۆ دووچاری لەناوبردن و ئیبادەی بە کۆمەڵ بوونەتەوە جێگای خۆیەتی باوەش بکەن بەیەکداو هاوکاری یەکین.

*** *** ***

شەشەم: کۆچی یەکەمی و هەڵوێستی ئیبن دەغەنە:

لە عائیشەوە – رضي الله عنها - دەگێڕنەوە کەووتویەتی: لەوەتی فامم گرتووە و من بزانم باوك و دایکم ئاین و ئاینداریان هەر کردووە، هیچ ڕۆژێ نەبووە کە پێغەمبەری خوا سەرلەبەیانیان و ئێواران -ﷺ- نایەت بۆ ماڵمان، بەڵام پاش ئەوەی موسڵمانان دووچاری

ناڕەحەتی و سزاو ئەشکەنجە بوون، ئەبووبەکر خۆی کۆکردەوە بۆ کۆچ کردن بەرەو وڵاتی حەبەشـە تا گەیشتە (برك الغماد) کەڕێی یەمەن بوو، ئیبن دغەنە-کـە گـەورە هـۆزی (قـارە) بـوو پێـی گەیشت و پێی ووت: بۆکوێ بەنیازی ئەی ئەبوو بەکر؟ ئەبوبەکریش ووتی: گەلەکەم دەرم دەکـەن و ئەمەوێت بگەڕێم بەزەویدا و خوای خۆم بپەرستم، ئیبن دەغەنە ووتی: نمونەی تۆ ئەی ئەبوبـەکر نابێ دەربچێت و نابێ دەربکرێت، چونکە تۆ-هاوکاری نەداری و سـیلەی ڕەحـم بـەجێ دێنـیێ و ئازاری هەموان هەڵدەگریت و میوان دۆستیت، یارمەتی دەری راستیت لە ڕووداوەکاندا، دەی من بەرگریت لێ دەکەم، بگەڕێرەوەو لەووڵاتی خۆتداخوای خۆت بپەرستە.

ئەبوبەکر گەڕایەوەو (ئیبن دەغەنە) لەگەڵیدا هاتـەوەو ئـیبن دەغەنـە گـەڕا بەسـەر گـەورە پیاوانی قورەیشدا و پێی ووتن: وێنەی ئەبوبەکر نابێ دەربکرێت و نابێ دەربـچێت، ئایـا کەسـێ دەردەکەن کە: هاوکاری نەدار دەکات وسەردانی خزم دەکـات و ئـازاری هـەموان هەڵـدەگرێت و میوان دۆستیت و و یارمەتی دەری ڕاستیت لەکاتی ڕوداوەکاندا؟ قورەیشیش قبوڵی ئەم بـەرگری یەی ئیبن دەغەنەیان کرد و پێیان ووت: قبوڵمانە، بەڵام پێی بڵێ با لەماڵەکەی خۆیدا خواناسـی خۆی بکات و نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت -بەئارەزووی خۆی- و بابەوکارانەی ئازارمان ئەدات و بە ئاشکرا نەیکات، چونکە ترسمان هەیە ژن و منداڵەکانمان لە خشتە بەرێت، ئیبن دەغەنە ئـەم قسانەی گەیاندە ئەبوبەکر، ئیتر لەو ڕۆژە بـەدواوە ئـیتر لـە ماڵەکـەی خۆیـدا نوێـژەکانی کـرد بەندایەتی خۆی بەپەنهانی ئەنجام دەداو بەدەنگی بـەرز قورئـانی دەخوێنـد و بـۆ ئەمەبەسـتەش مزگەوتێکی -بچکۆلەی- لەپەنای ماڵەکەی خۆیدا دروستکرد و لەوێدا نوێژی دەکرد و قورئـانی دەخوێند ئیتر لەبەر ئەوەی ئەبوبـەکر پیـاوێکی دڵناسـك بـووەو هـەرکاتێ قورئـانی بخوێندایـە چاوەکانی پڕ دەبوون لەئاو و دەگریا -بۆهەرکە ژنانی قورەیش و منداڵەکانیان گوێیان لە قورئـان خوێندەکانی دەگرت و سەرمام دەبوون پێی و بەتاسەوە گوێیان بۆ دەگرت.

ئیتر سەرانی قورەیش ئەو حاڵەتە زۆر ترساندنی، ناردیـان بـە دوای لای ئـیبن دەغەنـەدا و ئەویش ئامادە بوو، ووتیان: ئێمە قبوڵی ئەوەهات کرد کە ئەبوبـەکر لـەژێر سایەی تـۆدا بێـت بەمەرجێ لەماڵەکەی خۆیدا خواناسی خۆی بکات بەڵام لەو بڕیارە لایداو لەحەوشەی ماڵەکەیـدا مزگەوتێکی دروست کـرد بـە ئاشـکراو بـەدەنگی بـەرز نوێـژی تیـا دەکـات و قورئـانی تێـدا

ئەخوێنێت، ئێمەش ترسی ئەوەمان هەیە کە ژن و منداڵەکانمان لە خشتە بەرێت مەیەڵە وابکات، ئەگەر حەز دەکات لەماڵەکەی خۆیدا بەندایەتی خوای خۆی بکات با بیکات، وە ئەگەر واناکات و هەر بە ئاشکرا دەیکات ئەو پێی بڵێ ژێر سایەکەی (جوار) خۆتت پێ بداتەوە چونکە ئێمە حەزناکەین پەیمانی تۆ بشکێنین، و هەرگیز بەم ئاشکرا کردنەی ڕازی نابین.

عائیشە – رضي الله عنها - دەڵێت:- (ئیبن دەغەنە) هات بۆلای ئەبوبەکر و پێی ووت: خۆت باش دەزانێت من لەسەر چی لەگەڵت ڕێك کەوتم، ئیتر یان بەو شێوەیە بکە کە ڕێك کەوتووین لەسەری یان ژێر سایەکەم (الجوار) بۆ بگێڕەوە، چونکە من حەزناکەم عەرەب پێم بڵێت ناپاکیم کرد لەگەڵ ئەوکەسەی کەبڕیاری پاراستنیم دابوو، ئەبووبەکر پێی ووت: ئەوا ژێرسایەکەتم بۆگێڕایتەوەو ڕازیم بە ژێرسایەی خوای –عزوجل-.[1]

هەرکە لەژێرسایەی (ئیبن دەغەنە) چووە دەرەوە، مەبەستمان ئەبوبەکرە، لەکاتێکدا پاڵی دابوویەوە بە دیواری کەعبەوە بێ مێشکێك لە بێ مێشکەکانی قورەیش خۆڵی کرد بەسەریداو لەوکاتەدا وەلیدی کوڕی موغیرە یان عاسی کوڕی وائیل بوو دای بەلایدا و ئەبوبەکریش پێی ووت: ئایا نابینی ئەم بێ مێشکە چی کرد؟ ووتی: تۆ خۆت بە خۆتت کردووە، و ئەویش دەیووت: ئەی خوایە چەندە بە ئارامی، ئەی خوایە چەندە بە ئارامی، ئەی خوایە چەندە بەئارامی.[2]

لەم ڕووداوەی پێشووشدا کۆمەڵێ پەند و وانەی تێدایە لەوانە:

١-ئەبوبەکر زۆر بەڕێز و عەزیزی ناو هۆزەکەی بووە پێش ئەوەی محمد -ﷺ- ببێت بەپێغەمبەر، ئەوەتە (ئیبن دەغەنە) پێی دەڵێ: وێنەی تۆ ئەی ئەبووبەکر نە دەرئەکرێ و نە دەرئەچێ، چونکە هاوکاری نەدارانی و خزم دۆستی و ئازاری هەموان هەڵدەگری، ڕێز لە میوان دەگری، پشتی هەق دەگری لە پێشهاتەکاندا،

ئەبوبەکر نەهاتە ناو ئیسلام بەمەبەستی پلەو پایەو شۆرەت، هیچ شتێك ئەوەی نەکرد جگە لەخۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی ئیتر با لەوپێناوەشدا دووچاری جۆرەها تاقیکردنەوەبێت،

[1] فتح الباري (٢/٢٧٤).
[2] البداية والنهاية (٣/٩٥).

هیچ نیازێکی نەبووە جگە لەڕەزامەندی خوای -تەعالا- دەیویست کەس و کارو نیشتمان و هۆزەکەی واز لێ بهێنی و بچێ بۆجێ یەك خواپەرستی تێدا بکات، چونکە لەولاتەکەی خۆیدا ئەوەی بۆنەدەکرا.[1]

٢-تێشووی ئەبوبەکر لەبانگەوازەکەیدا -قورئانی پیرۆز بوو، لەبەر ئەوە زۆر گرنگی دەدا بە لەبەرکردن و تێگەیشتن و یاساگیری -فقه- کردەوەکردن پێی، ئەم گرنگی دانەشی بە قورئانی پیرۆز لێهاتوویی پێ بەخشیوو لەبانگەوازدا و لەدەربڕینی شێوازدا و لە قوڵی تێگەیشتنی دا و ڕێزکردنێکی ژیرانەی لەپێش کەش کردنی ئەو بابەتەی کە خەڵکی بۆ بانگ دەکرد، بەرچاو کردنی حاڵی گوێگران و بەهێزی لەبەڵگە هێنانەوەدا.[2]

ئەبوبەکری (الصدیق) - رضي الله عنه - قورئان خوێندن زۆر کاری تێ دەکرد و لەکاتی خوێندنەوەیدا گریان زۆری بۆ ئەهێنا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی یەقین و دڵنیایی تەواو، بەهێزی ئامادەیی دڵیی لەگەڵ خواو لەگەڵ ماناکانی ئەو ئایەتانەی دەیخوێندەوە، گریان ئەوپەڕی مانای کارتێکردنە چ بەغەمباری تەواو یان خۆشی یەکی دەروونی.

موسڵمانی ڕاستەقینەش لەنێوان دەربڕینی خۆشی بەوەی کە خوای گەورە ڕێگەی ڕاستی پێ پیشان داوە، و ترسان لەکەمترین لادان لەم ڕێبازە، ژیان بەسەردەبات، وە ئەگەر خاوەن هەستی زیندوو، بیری بە ئاگای وەك ئەبوبەکر - رضي الله عنه - ئەم قورئانە ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی دەخاتەوە یاد، و لەئەنجامی کاریگەری ئەوەش لەش خشوع وەردەگرێت و پەند و ئامۆژگاری دەبارێ بەسەریدا، دیمەنی ئەم جۆرە کەسانە کاردەکەنە سەر ئەوانەی دەیانبینن، هەر هۆی ئەمەش بوو کە بتپەرستان لە دیمەنی ئەبوبەکر ترسان و لەرزی ئەوەیان لێ نیشت کار بکاتە سەر دڵ و دەروونی ژن و منداڵەکانیان و بێتە ناو ئاینی ئیسلامەوە.[3]

ئەبوبەکری (الصدیق) - رضي الله عنه - لەسەردەستی پێغەمبەری خوادا پەروەردەکراوەو قورئانەکەی خوای لەبەرکرد و لەژیانیدا کاری پێ کرد و زۆریش تیایدا ورددەبوویەوە، هەرگیز

---

[1] استخلاف ابي بكر الصديق لا (١٣٦).
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام في عهد خلفاء الراشدين لا (٨٨).
[3] التأريخ الإسلام للحميدى (ج١٩-٢٠/ لا ٢٠٩).

بەبێ زانیاری قسەی نەکردووە، کاتێك لەمانای ئایەتێك لێیان پرسی و ئەویش ماناکەی نەدەزانی بۆیە ووتی: (أيُ أرض يسعنى أو أىّ سماءٍ تظلنى أذا قلت في كتاب الله مالم يرد الله)[1]

واتە: چ زەویەك بمگرێتە خۆی و چ ئاسمانێك ڕاسەرم بێ ئەگەر شتێك دەربارەی قورئان بڵێم کەخوای گەورە ئەو مەبەستەی نەبووبێ.

یەکێ لەووتەکانی تری کە وادەگەیەنێت زۆر تێگەیشتن و بیرکردنەوەی هەبوو لە قورئاندا وەك دەڵێ: خوای گەورە باسی خەڵکی بەهەشتی کردووە باشترین کردەوەیان بیر دەخاتەوە و لە خراپەکانیش خۆش بووە، کەسێك دەڵێت: من لەکام کەسیانم؟ واتە: باشەکان، یەکێکیش دەڵێت: تۆ لەوانە نیت، واتە: ئەو لەوانەیە.[2]

هەرشتێکی لە قورئاندا لێ بگیرایە بەئەوپەڕی ئەدەب و ڕێزەوەلە پێغەمبەری خوای دەپرسی، کاتی ئایەتی ((لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ) النساء، ١٢٣ هاتە خوارەوە

ئەبوبەکر – رضي الله عنه – ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی پشت شکێن دابەزیوە، چونکە کێ لە ئێمە خراپەی نەکردووە؟ ئەویش فەرمووی: (يا ابابكر، ألست تنصب؟ ألست تحزن؟ ألست تصيبك اللأواء؟ فذلك مما تجزون به)[3] واتە: ئەی ئەبوبەکر، ئایا ماندو نەبوویت؟ ئایا خەم و خەفەتت نەخواردووە؟ ئایا نەخۆش نەکەوتوویت؟ ئێ پاداشتی ئا ئەمانە وەردەگرنەوە.

هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی تەفسیر کردووە لەوانە ئایەتی ((إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ

---

[1] تاريخ الخلفاء للسيوطي لا ١١٧.

[2] الفتاوى لابن تيمية (٢١٢/٦).

[3] احمد (١١/١) **شێخ شاکر دەڵێ: سەنەدەکەی لاوازە، بەڵام صحيح دەبێت بە ڕێگاکانی و هاوتاکانی تر. سەیری مسند إمام احمد ژمارە ٦/١.**

ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ) فصلت، ٣٠. دەربارەی ووتوویەتی: بەلای چەپ و ڕاستدا لاناکەنەوە ودڵیان بۆ هیچ

شتێکی تر لانادات نەبەترس و نە بە خۆشەویستی نە بە هیوا و بەرپرسیارکردن و نە بە پشتبەستن، بەڵکو جگە لە خوا کەسیان خۆش ناوێت، و هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەن، کەسیشیان خۆش ناوێت لەبەر ئەونە بێت، نەلەبەر سود و قازانجێ یان دورخستنەوەی زیانێك و جگە لەو لە هیچ کەس ناترسن ئیتر کێ دەبێ با ببێ، و دڵیان بۆ کەسی تر بێجگە لەو لێنادات)) [1] ئەمەو چەندان ئایەتی تریش.

بانگخوازانی ڕێگەی خوا دەبێت بەردەوام هاوڕێ یەتی قورئانی پیرۆز بکەن، بـە خوێنـدن و لێ وورد بوونەوە، بە دەرهێنانی گەوهـەرەکانی و زانیاریـەکانی بـۆ خـەڵکی، وە دەستەوسـتانی یەکانی –معجزە- قورئان بۆ خەڵکی روون بکەنەوە لەلایەنی بەیان و زانستی و یاسـادانانەوە، و ئەو ڕێگایانەی کە گرتوویەتی یە بـەر بـۆ ڕزگـارکردنی مرۆڤایـەتی یـە لەنارەحـەتی جـەنگ و نەهامەتی یـەکانی بەشـێوازێك بگـونجێ لەگـەڵ ئـەم سـەردەمەدا، و خـستنە گـەڕی هۆکـاری پێشکەوتوو لە پێناو بانگەشەکردن و پیشانی بانگەوازەکەدا، ئەبوبەکر – رضي الله عنـه - چاك لەوە تێ گەیشتبوو کە قورئان خوێندن بەدەنگی بەرزو لەناو مزگەوتدا چ کاری گەریەکی دەبێـت لەسەر بەرەو پێش چوونی بانگەوازی ڕێگەی خوا. [2]

حەوتەم: لەنێوان هۆزەکانی عەرەبدا و لەبازاڕەکانیاندا:

وەك پێشتر زانیمان ئەبوبەکری (الـصديق) – رضـي الله عنـه - لەنەژادناسـیدا زانـابووە و دەستێکی باڵای هەبوو تیایدا، سیوطی-رەحمەتی خوای لێ بێ- دەڵێ: خـەتی (الحـافظ ذهبی)م بینیـوە (رحمـە الله) بەدەسـتی خـۆی نوسـیویە: هەرکەسـی تاکانـەی سـەردەمی خـۆی بـووبێ لەهونەریدا.. بێ گومان ئەبووبەکریش لەزانستی نەژادزانیدا. [3]

---

[1] الفتاوى (٢٢/٢٨).
[2] تاريخ الدعوة الاسلامية في عهد الخلفاء لا ٩٥.
[3] تأريخ الخلفاء لا ١٠٠، **لەکتێبی (تأريخ الدعوه) لا (٩٥) وەرگیراوە.**

بۆیە -ئەبوبەکر- رضي الله عنە - ئەم زانستەی خۆی کردە هۆکارێکی بانگەواز و خستی بەخزمەت ئاینەکەی خوا تاهەموو خاوەن بەهرەیەك لە هەر بوارێکداهەبێت و لەهەر زانستێکدا ببێت ئیتر با تیۆری بێ یان تاقیکردنەوەیی، یان هەر کارو پیشەیەکی گرنگی تر بۆ ژیانی خەڵکی.[1]

دەبینین چۆن -صدیق- رضي الله عنە - کاتێ کە پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ ناو هۆزەکانی عەرەب کاتێ دەیویست بانگەوازەکەی خۆیانی پێ بگەیەنێ، دەبینین کە -ئەبوبەکر- رضي الله عنە = چۆن ئەم زانستەی ژێربار کرد بۆ بانگەواز بۆ لای خوای (عزوجل) و تابلێی وتاربێژێکی زمان پاراو بوو دەیتوانی مەبەستەکانی بگەیەنێت لەناو دو توێی جوانترین وشەدا، زۆرجار لەباتی پێغەمبەر -ﷺ- -وتاری دەدا- ئیتر خۆی -ﷺ- لەوێ بوایە یان نە، و پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەوەرزی حەجدا-بانگی خەڵکی دەکرد تا گوێ بگرن بۆ ووتارەکانی صدیق -ﷺ- وەك سەرەتایەك و ڕێ خۆش کەرێك و یارمەتی دەرێك بۆ بانگەوازەکەی پێغەمبەر نەك خوانەکردە خۆبردنە پێشەوەی ووتەی خواو پێغەمبەرەکەی.

بوونی شارەزایی باشی لە نەژادناسی و زانینی بنەچەی هەموو هۆزەکانی عەرەب، بوونە هۆی ئەوەی یارمەتی دەری بن لەنزیك بوونەوەی لەو هۆزانەو هەڵس و کەوت لەگەڵیان.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب - رضي الله عنە - دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پاش ئەوەی لەلایەن خواوە فەرمانی پێ درا کە بانگەوازەکەی بدات بە گوێی هۆز و تیرەکاندا خۆی و من بۆ ئەو مەبەستە دەرچووین.... تا دەڵێ: گەیشتینە کوڕێکی تر کە سیمای ڕێز و ئارامی پێوە دیار بوو، ئەبوبەکر ڕۆشتە پێشەوە لێیان سلاوی لێ کردن ووتی: ئەم هۆزە کێن؟ وتیان (شەیبان بن سەعلبە)، ئەبوبەکریش لای کردەوە بەلای پێغەمبەری خوادا -ﷺ- پێی ووت: بەدایك و باوکمەوە بەقوربانت بم ئەمانە بەغیرەت ترینی خەڵکین و (مەفروق)یش لەمانە کە بەزمان پاراو سیمای جوان ناوی دەرکردوە لەناویاندا و کە دوپەلکە درێژەکەی بەسەر سنگیدا شۆڕ بوو بوونەوە، و لەپاڵ ئەبوبەکردا دانیشتبوو، ئەبوبەکر - رضي الله عنە - لێی پرسی: زۆر سوپا چەندە لەلاتان؟ مەفروق ووتی: بەهەزار زیاترەوە دەردەچین و هەزاریش لەبەر کەمی ناشکێن، ئەبووبەکر لێی

---

[1] هەمان سەرچاوە لا ٩٦.

پرسی ئەی چۆن بەرگری دەکەن؟ مەفروق ووتی: کاتی ڕووبەڕوو دەبینەوە زۆر زۆر تورەین، لەکاتی جەنگدا تورەترین و ئێمە ئەسپەکانمان لـە کورەکانمـان خۆشـتر دەوێـت و چـەکەکانمان لـە بـاخ و باخاتمان خۆشتر دەوێت، سەرکەوتن لەلایەن خواوەیەو جاریٚ دەبێتە بەشمان و جارجـاریش نـەخێر، وادەزانم تۆ لەباریانی قورەیشی؟

ئەبوبەکر ـخ- ووتی پێی: ئەگەر دەنگ و باسی پێغەمبـەری خواتـان پـێ گەیـشتووە ئـا ئەوەتا، مەفورقیش ووتی: خەڵکی بۆچی بانگ دەکەن ئەی برایانی قورەیشی؟.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: ((ادعوكم الى شهادة الا اله الا الله وحده لا شريك لـه وانـی عبدالله ورسـوله والـى ان تؤتـونى وتنـصرونى، فـان قريـشاً قـد تـضاهرت علـى الله ورسوله واتسغنت بالباطل عن الحق والله هو الغنى الحميد)) واتە: بانگتان دەکەم تا شـایەتی بدەن کە هیچ خوایەك نی یە جگە لە (الله) نەبێت کە تاکانەیەو هاوەبشی نی یە، و من بەنـدەی خواو نێرراوی ئەوم، و بانگتان ئەکەم کە بێن بە دەمموەو سەرم بخەن، چونکە قـورەیش لـە خـواو پێغەمبەرەکەی یاخی بوون و لەبەر خاتری بتە پرو پوچـەکانیان لەڕاسـتی پـشتیان هـەڵکردووە، خوایش زۆر دەوڵەمەند و سوپاسگوزارە))

مەفروق ووتی: ئیٚ بۆچی تر خەڵك بانگ دەکەن؟ سوێند بەخوا تا ئێستا لەم ووشانە جوانترم نەبیستووە، پێغەمبەری خوایش -ﷺ- ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە (﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ )[1] واتە: ((ئەی محمد پێیان بڵێ وەرن با بۆتان بخوێنمەوە کە خوای خۆتان چی لەسەر قەدەغە کردوون، هاوبەشی بۆ پەیدا مەکەن و لەگەڵ دایك و باوکتانا چاك بن و لەبەر نەبوونی منداڵی خۆتان مەکوژن چونکە ئێمە ئێوەش و ئەوانیش دەژێنین و بە ئاشکرا و

---

[1] الانعام ١٥١.

پەنهانی نزیکی بەد ڕەوشتی نەبنەوەو گیانی کەس مەکێشن بەناڕەواو مەگەر شایانی کوشتن بێ و ئەمانە وەسیەتی خوان بۆ ئێوە تا بیربکەنەوە)).

مەفروق ووتی: ئێ چیتر، برای قورەیشی؟ سوێند بە خوا ئەمە قسەی خەڵکی سەر زەوی نی یە، و ئەگەر قسەی ئەوان بوایە ئێمە ئەمان زانی، پێغەمبەری خوایش -ﷺ- ئایەتی (إِنَّ اللَّـهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنْ الفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ).

واتە: خوای گەورە فەرمان دەکات بە دادپەروەری و چاکە خوازی و سەردانی خزمان و بەرگری دەکات لە بەدرەفتاری و خراپەکاری و ستەمکاری و ئامۆژگاریتان دەکات تا بە خۆتانا بچنەوەو بیر بکەنەوە.

مەفروق ووتی: سوێند بە خوا خەڵکی بۆ لوتکەی رەوشت بەرزی بانگ دەکەیت ئەی برای قورەیشی و بۆ کردەوەی جوان، بەڕاستی هۆزەکەت بەدرۆ ئاو بەدرۆیان خستوویتەوەو دژت وەستاون، مەفروق وەك ئەوەی حەز بکات هانیئی کوڕی قوبیسەیش بەشداری قسەکان بکات بۆیە پێی ووت: هانیئی کوڕی قوبەیسەو سەردارمانە و قەرزبژێرمانە، هانیئ هاتە قسەو ووتی: گوێم گرت بۆ قسەکان ئەی برای قورەیشی و باوەڕیشم پێ کردی، من وادەبینم وازهێنان لە ئاینی خۆمان و شوێنکەوتنی ئاینی تۆ بەدانیشتنێ کەلەگەڵمان دانیشتی و ئەوە یەکەم و کۆتا دانیشتن نابێت و بیرمان لەم مەسەلەی تۆ نەکردوەتەوە، و سەیری سەرەنجامی ئەو کارەی تۆمان نەکردووە، ئەم هەنگاونانە خێرایەمان لادانە لەژیری و سەرکەشیەکی عەقڵە، و لاوازی دروبینی یە و هەموو تێکەوتنێ لەپەلەکردنەوە دێ، ئێمەش هۆزێکمان هەیە پێمان خۆش نی یە بەبێ ئەوان هیچ پەیمانێك ببەستین، بەڵام تۆ دەگەڕێیتەوە ئێمەش دەگەڕێینەوە و تۆ دەڕوانیت ئێمەش دەڕوانین.

ئەویش وەك حەز بکات موسەنای کوڕی حاریسەش بەشداربکات لەوتووێژەکاندا بۆیە ووتی: ئەمە موسەننایەو سەردارمانەو خاوەن بڕیاری جەنگمانە..

موسەننا کوڕی حاریسی شەیبانی

موسەننا ووتی: ووتەکانتم بیست و قسەکانتم پێ جوان بوو، ئەی برای قورەیشی، سەرسام بووم پێیان، و وەڵام هەر ئەو وەڵامەیە کە هانیئی کوڕی قوبەیسە پێی ووتن، وازهێنانمان لە ئاینمان و شوێن کەوتنی تۆ بەدانیشتنێ کەلگەڵمان سازت کردووە:

ئێمە ناوچەکەمان کەوتووەتە نێوان دوو بەرداش یەکەمیان یەمامەیەو دووەمیان سەماوەیە، پێغەمبەری خوا فەرمووی (وما هذان الصريان) ئەو دوو بەرداشە کامانەن؟ موسەننا ووتی: یەکەمیان (فطفون)ی دەشت و زەوی عەرەب، دووەمیان: زەوی فارسەکان و ڕووبارەکانی کیسرا، و کیسرایش پەیمانێکی لێ وەرگرتووین شتی تازە نەهێنینە کایەوەو خاوەنەکەشی نەگرینە ئەستۆ، و لەوانەیشە ئەم کارەی تۆ پاشاکان خۆشحاڵ نەکات، ئەوەی لای زەوی عەرەبەوە ڕوودەدات ئەوە خاوەنەکەی تاوانباری ناکرێت و هەموو بەهانەیەکی وەرگیراوە، بەڵام لەسەری ناوچەکانی فارسەوە گوناهەکەی لێ خۆشبوونی نی یەو هیچ بەهانەیەك وەرناگیرێت و ئەگەر ئەتانەوێت لەسەری ناوچەکانی عەرەبی یەوە بەدڵ و گیان دەتپارێزین.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (ماأسأتم الرد اذ أفصحتم بالصدق انه لا يقوم بدين الله الا من أحاط من جميع جوانبه) واتە: بەڕاستی وەڵامەکەتان خراپ نەبوو، کە ڕاستی یەکەیتان ووت، بەڵام ناتوانێ ئاینی خوا بەرپا بکات کەسێ لە هەموولایەنەکانی یەوە نەیگرێت).

پاشان -ﷺ- فەرمووی: (أرأيتم ان لم تلبثوا الا يسيرا حتى يمنحكم الله بلادهم واموالهم ويفرشكم بناتهم اتسبحون الله وتقدسونه؟).

واتە: (ئەی چی دەڵێن ئەگەر ماوەیەکی کەمی تر، دەوڵەت و سامانیان ئەکەوێتە ژێر دەستان و کیژەکانیان جێگەتان بۆ دادەخەن، دەی ئایا خوا بەپاك و بێگەرد و پیرۆز سەیر دەکەن؟ نوعمانی کوڕی شەریك پێی ووت: (خوا شایەت بێ ئەمەت بۆ دەکەین ئەی برای عەرەب).

لەم هەواڵەشدا وانەو پەند و سوودی زۆری تێدایە لەوانە:

١-بەردەوام هاوڕێیەتی -صديق- رضي الله عنه - بۆ پێغەمبەری خوا وای لێ کردبوو بەگشتگیری لە ئیسلام بگات و خوای گەورە وای بۆ ساز کرد تا ببێتە تێگەیشتووترینی هاوەڵان لە ئاینەکەی خوا، لە پێغەمبەری خوا خۆیەوە لەناوەڕۆکی ئیسلام گەیشت و لەسەردەستی ئەو پەروەردە بوو لەسەر تێگەیشتنی واتاکانی، و لەسروشتی بانگەوازەکە گەیشت و بەهەموو

قۆناغـە جیاجیاکانیـدا تێپـەڕی و سـوودی زۆری لەهاوڕێیـەتی پێغەمبـەر -ﷺ- وەرگـرت و لەبەرنامەکەی پەروەردگار تێر ئاو بوو، و لەوناوەندەدا خوای —عزوجل-ی بە جوانی ناسـی، لـە سروشتی ژیان و، لە دروستی بوونەوەر و نهێنی بوون گەیشت، دوای مردن چـی دێـت و —قـەزاو قەدەر- چی یە، بەسەرهاتی شەیتان لەگەڵ ئادەم و ڕاستی ئەو زۆرانبازی یەی نێوان ڕەواو ناڕەوا، و هیدایەت و گومڕایی، باوەڕ و بێ باوەڕی.

خواپەرستی شەو نوێژی لەلا خۆشەویست کردبوو، لەگەڵ یادکردنی خوا و قورئـان خوێنـدن ڕەوتی بەرزکردەوەو دەروونی پاك و گیانی خاوێن کردەوە.

٢-زۆر سودمەند بوو لە هاوڕێیەتی کردنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەکاتی بانگەوازکردنی هۆزەکانی بۆ ئیسلام، زانی کە ئەو پشتگیریەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- لـەهۆزەکانی دەویـست ئەوەبوو کـە نـابێ پـشتگیری کـەر خـۆی ببەسـتێتەوە بـە هـیچ پـەیمانێکی نێودەوڵـەتی دژ و پێچەوانەبی لەگەڵ بانگەوازدا و نەتوانن خۆیانی لێ قوتار بکەن، چونکە گرتنە باوەشی بانگەواز و ئەو حاڵەتەی ئەوان، جۆگەی مەترسی بوو بۆیان کە لەلایەن ئەو دەوڵەتە گەورانەوە لەناو ببرێن کە پەیمانەکەیان لەگەڵدا بەستبوون، چونکە دەیانزانی بانگەوازی ئیسلامی جێگـەی مەترسـی و هەڕەشەیە بۆ سەر بەرژەوەندی یەکانیان.[1]

پارێزگاری بە مەرج و یان پارێزگاری —جزئی- ئامانجی دیاریکراو ناپێکی، ئەوەی شـەیبان جەنگیان ڕانەدەگەیاند دژی کیسرا ئەگەر بیویستایە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بجەنگێ یـان داوای خۆیشی بکات، یان نەدەجەنگان ئەگەر کیسرا بیویستایە پێغەمبەری خوا بگریت و هێرشـی بـۆ بکات، لەبەر ئەوە وتووێژەکان شکستیان هێنا.

٣-(ان دين الله لن ينصره الا من أحاط من جميع جوانبه) واتە: ناتوانێ ئەم دینەی خـوا بەرپابکات مەگەرکەسێ لەهەر چوارلاوە بیپارێزێ، ئەم وەڵامـەی پێغەمبـەری خـوا -ﷺ- بـۆ موسەننای کوڕی حاریسە، کە ئەوەی خستە ڕوو کە لەلای ئاوی عەرەبەوە ئەتوانن بیپارێزن بەڵام لای ئاوی فارسی یەوە نا.

[1] الجهاد والقتال في السياسة الشرعية، محمد هيكل (٤١٢/١).

ئـەوەی دوور ڕۆچـوویێت لـەناو دنیـای سیاسـەتدا ئـەوە لـە قـوڵی تێڕوانینـی ئیـسلامی پێغەمبەرانەی دەکەوێتە بەرچاو بە جۆرێ کە کەسی پێ نەگات.

٤-هەڵوێستی نەوەی شـەیبان ئیـسراحەت بەخـشەو ڕەوشـتی بـەرزو پیـاوەتی لـەو ڕێـزە گەورەیەدا بەدی دەکرێت کە بۆ پێغەمبەریان نوانـد، و ڕوونـی لـە پیـشانداندا و دیـاری کردنـی سنوری توانای پارێزگاری کردنیان، هەروەك ئەوەیان ڕوون کردەوە کـە سروشـتی ئـەم بانگـەوازە بەدڵی پاشاکان نابێت، کەچی ویستی خوایش وابوو کە پاش دە ساڵ یان زیاتر ئەوان یەکەم جـار ئەرکی ڕووبەڕووبوونەوەی پاشاکان ببنەوەو پاش ئەوەی دڵی بە نـوری ئیـسلام ڕونـاك بوویـەوە، موسەننای کوڕی حاریسەی شەیبانی ببێتە خـاوەنی بڕیـاری جـەنگیان و پاڵـەوانی نەبـەردیان و لەسەردەمی —صدیق-دا یەکێ بوو لەسەرکردە مەزنەکانی جەنگە ڕزگاریخوازەکان بوو. ئەو و هۆزەکەی بوێرترین کەس بوون لەناو موسڵمانەکاندا لە ڕووبەڕوبوونەوەی فارسەکاندا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەسەردەمی نەفامیانـدا لێیـان تۆقیبـوون و هـەر بیریـشیان لـە جـەنگ نەدەکردەوە دژیان.

بەڵکو لەسەرەتاوە بانگەوازەکەی پێغەمبەریان بەو بیانووەوە ڕەد کردەوە کە نەوەك ناچاریان بکات ڕووبەڕوی جەنگ ببنەوە لەگەڵ فارسەکاندا، و هەرگیز نەدەهات بە بیریاندا ڕۆژێ لەگەڵیان بجەنگن، لەمەوە گەورەیی ئەم ئاینەمان بۆ دەردەکـەوێت کـە چـۆن خـوای گـەورە موسـڵمانانی لەدنیادا بەرزو بڵند کردەوە، بـە جـۆرێ کردنـی بـە سـەرکردەو سـەرداری زەوی و ئـەم جەنگـە لەچاوەڕوانی خۆشی و شادی هەمیشەیی لەبەهەشتی پان و بەرین دا.[1]

.. *** .. *** .. ***

جێ باسی سێ یەم

کۆچکردنی لەگەل پێغەمبەری خوادا بۆ مەدینە

قورەیش ئازارو ئەشکەنجەی موسڵمانەکانی توندتر کرد، ئـیتر هەنـدێکیان یـەك جـار تـا دووجار کۆچیان کرد بۆحەبەشە لەبەر پارێزگاری ئاینەکەیان، پاشان کۆچکردن بۆ مەدینە.

[1] تأريخ الاسلامی للحمیدی (٦٩/٢) التربية القيادية (٢٠/٢).

هەرکـە پێغەمبـەری خـوا -ﷺ- ڕێگـەی دا بـە موسـڵمانە چەوسـاوەکانی دەسـتی ستەمکارەکانی قورەیش بەوەی کە کۆچ بکەن بۆ مەدینەی پڕ نوور، ئاشکرایە ئەبوبەکر – رضي الله عنه - داوای دەکرد لە پێغەمبەری خوا -ﷺ- کە ڕێگەی بدات کـۆچ بکـات بـۆ مەدینـە بەڵام پێغەمبەر -ﷺ- پێی دەووت (لا تعجل لعل الله يجعل لـك صـاحباً)[1] واتـە پەلـە مەکـە بەڵکو خوای گەورە هاوڕێیەکت بۆ بگەیەنێت.

ئەبوبەکریش – رضي الله عنه - زۆر حەزی دەکرد هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوا بکـات لـەم کۆچـەدا، خـاتوو عائـشە – رضـي الله عنـە - دەگێڕێتـەوە بۆمـان دەربـارەی کۆچـکردنەکەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و باوکی دەڵێت: (پێغەمبەری خوا -ﷺ- هەرگیز جگە لە بەیانیان یان سەر لەئێواران زیاتر نەدەهات بۆماڵی ئەبوبەکر، بەڵام هەر کە ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە کـە خـوا ڕێگەی بەپێغەمبەرەکەی دا کۆچ بکات بۆ شاری مەدینە و شاری مەککە بە جـێ بهێڵێـت، کـە لەکاتی قرچەی نیوەڕۆدا هات بـۆ ماڵمـان کـە هـەرگیز لەوکاتەدانـەهاتووە، دەڵێـت: هـەر کـە ئەبوبەکر بینی ووتی:هەرگیز لەم کاتەدا نەهاتووە بۆ ماڵمان دەبێ شتێکی گرنگ ڕووی دابێت.

عائشە دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر -ﷺ- هاتە ژوورەوە ئەبوبەکر جێگەکەی خـۆی بـۆ چـۆڵ کرد و ئەویش لەسەری دانیشت، کەس لە ماڵ نەبوو جگە لـە مـن و ئـەسمای خوشـکم نـەبێت، پێغەمبەری خوا -ﷺ فەرمووی (أخرج عنـي مـن عنـدك) واتـە: بـا هـەمووی بڕواتـە دەرەوە، ئەبوبەکری ووتی: هەر ئەو دووانە لەماڵن و ئەوانیش کچی مـنن، مەسـەلەکە چـی یـە دایـك و باوکم بەقوربانت بێ! فەرمووی: (ان الله قد أذن لي في الخروج والهجرة) واتـە: خـوای گـەورە ڕێگەی پێدام کە دەرچم و کـۆچ بکـەم، ئەبوبـەکر ووتـی: پێکـەوە –بەهاوڕێیـەتی مـن- ئـەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (الصحبة) بەڵێ: لەگەڵ هاوڕێ دا.

عائشە دەڵێت: سوێند بە خوا تا ئەو ڕۆژەش نەمزانیوە کە هیچ کەسێ لەخۆشیاندا گریـانی دێ تا ئەبووبەکرم بینی لەو ڕۆژەدا دەگریا، و پاشان ووتی: ئەی نێرراوی خوا دوو حوشتری چـاکم بۆ ئەو مەبەستە لە زووەوە ئامادەکردووە، بۆیە کابرایەکیان بە کرێ گرت لە نەوەی دیل ی کـوڕی بەکر بەناوی (عبدالله ی کوڕی ئەریقت) کە کوڕی ژنێك بوو لەنەوەی سەهم ی کوڕی عـەمر بـوو

[1] تأخر الدعوة الى الاسلام لا (١٠٧).

لەوکاتەدا بتپەرست بوو، بۆئەوەی ڕێگەیان پێ پیشان بدات وەردوو وڵاخەکەی دایەدەستی ئەو تاکاتی خۆی ئەو بیان لەوەڕێنێت.[1]

لەگێڕانەوەیەکی تردا بخاری لە عائشەوە - رضي الله عنه - کە دوورودرێژەو وردەکاری گرنگی تێدایە، لەو فەرمودەیەدا هاتووە: (...عائشە دەڵێت: (گەرمەی نیوەڕۆبوو لەماڵی ئەبوبەکر دانیشتبوین کەسێك بە باوکمی ووت: ئەمە پێغەمبەری خوایەو سەروچاوی هەڵبەستبوو- کە هەرگیز لەوکاتەدا نەهاتبو بۆ ماڵمان- ئەبوبەکر ووتی: دایك و باوکم بەساقەی بێ سوێند بەخوا قەت لەم کاتەدا نەهاتووە بۆلامان مەگەر شتێ ڕووی دابێت.

عائشە — رضي الله عنه - دەڵێت: پێغەمبەری خوا -ﷺ هات و ڕوخسەتی وەرگرت و فەرمووی لێ کراو هاتە ژوورەوە، و بە ئەبوبەکری فەرموو: (أخرج من عندك) هەمووی بکەرە دەرەوە، ئەبوبەکریش پێی ووت: کەس و کاری خۆتن و باوکم بەساقەت بێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: (فانی قد أذن لی في الخروج) واتە: خوای ڕێگەی پێ داوم دەربچم، ئەبوبەکریش ووتی: لەگەڵ منداوو پێکەوە هەی باوکم بەقوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی (نعم) واتە بەڵێ، ئەبوبەکری ووتی: باوکم بەقوربانت بێ یەکێ لەو دوو وڵاخە هەڵبژێرە بۆ خۆت، پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (بالثمن) واتە: بەڵام بەپارە.

عائشە دەڵێت: بەجوانترین شێوە خستمانە ڕێ، کۆڵێکمان بۆ گرتن و کرمانە ناو گۆزەیەك ئەسمای کچی ئەبوبەکر پشتوێنەکەی خۆی کرد بە دووکرتەوە و بە لەتێکی دەمی گۆزەکەی بەست لەبەر ئەوەشە پێغەمبەری خوا -ﷺ- ناوی لێ نا (ذات النطاقین) خاوەن دوو پشتوێن، پاشان پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکر خۆیان گەیاندە ئەشکەوتێك لەکێوی (الثور) واتە (گا) بۆماوەی سێ شەو خۆیان تیا حەشارداو عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکر کەلەوکاتەدا گەنجێکی زیتەڵی تێگەیشتوو بوو شەو لەلایان دەمایەوە و پێش خۆر کەوتن بە پەنهانی دەگەڕایەوە بۆ مەککەو بەیانی دەکردەوە لەگەڵ خەڵکی مەککەدا و وەك ئەوەی شەویش هەر لەوێ بووبێت، هەر قسەو باسێ کە بۆنی پیلانی لێ بهاتایە خێرا وەری دەگرت و کەشەو دا دەهات دەیگەیاند

---

[1] السرية النبوية لابن كثير (٣/٢٣٣-٢٣٤).

پێیان، عامیری کوڕی فەهیرە-کە بەندەیەکی ئازادکراوی ئەبوبەکر بوو ڕانە مەڕێکی لەوێوە دەلەوەڕاند و کەنزیکی ئەشکەوتەکە دەبوو یەوە شیری جوان و ئامادەی پێ دەدان و بەڕانە مەڕەکەش جێ پێکانی دەکوژاندەوە و ئەمە ئیشی ئەو بوو لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا.

هەروەك پیاوێکیان بە کرێ گرت -لەنەوەی (الدّيل) کە لەنەوەی عەبدەی کوڕی عەدی بوو- زۆر لێهاتوو بوو لە ڕێگە پیشاندان و دەرکردنی خەڵکی بەنهێنی، و ئە پیاوەلەسەر ئاینی قورەیشیەکان بوو، متمانەیان پێ کردبوو، وڵاخەکانیان دابووە دەستی، شوێنی نهێنی دیاری کراویان ئەشکەوتی -ثور- بوو، پەیمانیان وابوو کەسێ ڕۆژ لەناو ئەو ئەشکەوتەدا بمێننەوەو پاش ئەو ماوەیە هەردووکیان لەگەڵ دەلیلەکەو عامیری کوڕی فەهیرەدا کەوتنە ڕێ، لەکەناری دەریاوە بردنی.[1]

کەس بە کۆچ کردنی پێغەمبەری خوای -ﷺ- نەزانی جگە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئەبوبەکر-خوایان لێ ڕازی بێت - ماڵی ئەبوبەکر، کاتی دیاریکراو هاتە پێشەوەو پێغەمبەر و ئەبوبەکر لەدەرگای پشتەوەی ماڵەکەیانەوە بۆی دەرچوون، کە عەرەب پێی دەڵێن -خوخە- واتە لەنێوان هەموو ماڵەکاندا دەرگایەکی لاوەکی هەبووە بۆ زیاتر پەیوەندی دراوسێ یەتی، ئەمەش لەبەرئەوەی بەنهێنی دەربچن و نەکەونە بەرچاوی خەڵکی قورەیش، و بیان گرن و نەهێڵن دەرچن، و ئەو کۆچە پیرۆزە ئەنجام بدەن، کاتی دیارکراویان شەوبوو بەجۆرێ عبدالله ی کوڕی ئەرەیقیت-لەئەشکەوت چاوەڕوانی دەکردن کە پاش سێ ڕۆژ مانەوە بیانبات بەرەو مەدینە.[2]

پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەکاتی دەرچوونی لەشاری مەککەوە بەرەو مەدینە دەستی نزای بەرز کردەوەو لە (حەزورە) لەبازاڕی مەککەدا وەستاو لای کردەوە بۆ شارە خۆشەویستە پیرۆزەکەی و فەرمووی: (والله إنك خير ارض الله واحب ارض الله الى الله ولولا انى أخرجتُ ما خرجت).[3] واتە: سوێند بە خوا تۆباشرین زەوی خوایت و خۆشەویست ترین زەوی خوایت و ئەگەر هۆزەکەم دەریان نەپەڕاندمایە تیاتا هەرگیز دەرنەدەچووم).

---

[1] البخاري كتاب مناقب الانصار باب هجرة النبي -ﷺ- رقم (٣٩٥).
[2] خاتم النبيين لأبي زهره (٦٩٥/١) السيرة النبوية لابن كثير (٢٣٤/٢).
[3] الترمذي كتاب المناقب، باب فضل مكة (٧٢٢/٢).

پاشان پێغەمبەری خوا و ئەبووبەکر کەوتنە ڕێ و بتپەرستەکانیش ئەیان ویست شوێن پێیان هەڵگرن، هەتا گەیشتنە کێوی (ثور) سەور لەوێ جێ پێکانیان لێ تێك چوو، سەرکەوتن بە کێوەکەدا تا دایان بەلای ئەشکەوتەکەدا و بەدەروازەکەیەوە تەنافی جاڵجاڵۆکەیان بینی، ووتیان: ئەگەر کەسێکی تێچووبێ ئەم تەنافانەی جاڵجاڵۆکەیە تێك دەچوو، ئەمەش یەکێ بوو لەسەربازەکانی خوای –عزوجل- (وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلاَّ هُوَ)[1] واتە: خوا خۆی نەبێ کەس ژمارەی سەربازانی خوا نازانێت و نایانناسێت).

لەگەڵ ئەو هەموو هۆکارانەی پێغەمبەری خوا گرتبوویە بەر، پشتی پێ نەدەبەست بەڵکو متمانەی بە خوا زیاتر بوو و هیوای سەرکەوتن و کۆمەکی ئەو بوو، هەمیشە دەپاڕایەوە بە شێوەیەك کە خوای گەورە فێری کردبوو.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: (وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ ) (الاسراء: ٨٠) واتە: خوایە بە جوانی و بە بێوەی بمکەرە ژوورەوەو بە جوانی و بەبێوەی بمکەرەوە دەرەوە لەلایەن خۆتەوە دەسەلات و کۆمەکیم بۆ بنێرە.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا نزایەك بەدی دەکەین کە خوای گەورە فێری پێغەمبەرەکەی کردووە کە بەو جۆرە هاواری تێ بکات، وە فێر بوونیشە بۆ ئوممەتەکەی کە چۆن ڕوو بکەنە خواو بانگی لێوە بکەن؟ پاڕانەوە بە چوونە ژوورەوەی بەبێوەیی و هاتنە دەرەوەی بەبێوەیی و ڕاست، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بێ وەیان بکات لە هەموو سەفەرەکەدا، سەرەتای، کۆتایی، یەکەم خاڵ و دواخاڵ و ئەوەشی لەو ناوەندەدا بەسەریان دێ، ئەم ووشەی (الصدق)ەش لێرەدا بەهای خۆی هەیە چونکە بتپەرستەکان زۆر هەوڵیان دا لەم ڕێبازە لای بدەن تا بەدەم خواوە درۆ بکات، هەروەك بۆ ووشەی (الصدق) سێبەر هەیە، سێبەری ڕاوەستان لەسەر بیروباوەڕ و دڵنیایی و خاوێنی و دڵسۆزی (واجعل لی سلطاناً نصيراً) سوڵتان و دەستەڵاتێك کە زاڵمان بکات بەسەر دەسەڵات دارانی

[1] المدثر/٣١.
[2] الهجرة النبوية المباركة، لا ٧٢.

زەوی و هێزی بتپەرستان و ووشەی (من لدنك سلطاناً نصيراً) نزيكی و پەيوەندی بەردەوام بە خواوەو كۆمەكی وەرگرتن ی ڕاستەوخۆو بەپەنابردن بۆ ژێرسايەی ئەو.

خاوەنی بانگەواز نابێت بيەوێت لە غەيری خواوە دەسەلاّت و سولّتان پەيدا بكات، و ناشێ لە هيچ هێزێ بترسێ جگە لە هێزی خوا، نابێ بەتەمابێ پشت بە ژێر سايەی كەسێك ببەستێت تا لێوەی سەركەوتن و پارێزگاری بە دەست بهێنێت پێش ئەوەی پشت ببەستێتب بە خوا، چونكە بانگەواز توانای داگيركردنی دلّی دەستەلاّتداران و ناودارانی هەيە، پاشان دەبنە سەربازو خزمەتكاری و بەو هۆيەشەوە ڕزگاريشيان دەبێت، بەلاّم ئەم سەر ناكەوێت ئەگەر خۆی بكاتە سەرباز و خزمەتكاری دەسەلاّتدارەكان، چونكە بانگەواز تايبەتی خوای گەورەيە و خوايش لە هەموو دەستەلاّتدار و ناودارێك بەرز و گەورەترە.[1]

لەكاتێكدا بتپەرستان دەوری ئەكشەوتەكەيان دابوو، ئەيان توانی بەچاو بيانبينن، پێغەمبەر -ﷺ- زۆر بێ باكانە بە (صديق) دەلّێت: خوامان لەگەلّدايە، ئەبوبەكر -رضي الله عنه- خۆی دەگێڕێتەوە دەلّێت: لەناو ئەشكەوتەكەدا بەپێغەمبەری خوام -ﷺ- وت: ئەگەر سەيری بەرپێی خۆيان بكەن ئەمان بينن. ئەويش فەرمووی: (ما ظنك يا ابابكر بأثنين الله ثالثهما).[2] واتە: ئەی ئەبوبەكر گومانت چی يە بە دووكەس خوای گەورە سێ يەميان بێت.

خوای -عزوجل يش ئەم ڕووداوەی لە قورئانەكەيدا هێناوە وەك دەفەرموێت: (إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ) التوبه: ٤٠.

---

[1] فی ظلال القرآن (٢٢٤٧/٤).

[2] البخاری، كتاب فضائل الصحابة، باب مناقب المهاجرين، ژمارە(٣٦٥٣). مسلم ژمارە (٥٣٨١).

واتە: ئەگەر بەتەما نەبن سەری بخەن ئەوە خوا زووتر سەری خست کاتێ بێ باوەڕان دەریان کرد و بەدووقۆڵی چوونە ئەشکەوتەکەوەو بەهاوڕێکەی دەووت دڵگران نەبیت خوامان لەگەڵەو خوایش ئارامی خۆی رژاند بەسەر دڵیاندا و بەسەربازی نادیار سەری خستن و کافران شکستیان خوارد و ووشەی خوا بەبەرزو بڵندی مایەوە، بەڕاستی خوا زاڵ و کار دروستە.

پاش سێ ڕۆژ مانەوەی پێغەمبەر -ﷺ- لەناو ئەشکەوتەکەدا لەگەڵ هاوڕێکەیدا بۆی دەرچوون، کاری گەڕان بەدوایاندا دامرکایەو، و بتپەرستان بێ هیوا بوون لەدۆزینەوەی پێغەمبەری خوا -ﷺ-.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- و هاوڕێکەی پیاوێکیان لەنەوەی (الدیل) گرت بەکرێ بەناوی (عبداللە ی کوڕی ئورەیقیت) بۆ ڕێپیشاندان و پەیمانیشیان لەنێوانا ئەوەبوو کە پاش سێ ڕۆژ بەوڵاخەکانیانەوە لەسەردەمی ئەشکەوتدا ئامادەبێت، ئەوەبوو ئامادەبوو، بەڕێگەیەکدا بردنی کە ڕێگەیەکی لاوەکی بوو زۆر کەسی پیانەدەچوو- تاسەر لەو قورەیشیانە تێك بدات کە دوایان دەکەون.[1]

لەڕێگەکەیاندا بۆشاری مەدینە پێغەمبەر -ﷺ- دای بەلای ماڵی (أُم معبد)[2]دا لەناوچەی قەدید کە هەشت کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورەو لەناوچەی خوزاعەیە و خوشکی حوبەیشی کوڕی خالدی خوزاعی یە کە ئەویش بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە و زانایانی فەرموودە و گێڕەرەوان ئەم هەواڵەیان پشتاوپشت گێڕاوەتەوەو (ئیبن کەسیر) دەڵێت: ئەم بەسەرهاتە بەزۆر ڕێگا گێڕاوەتەوە کە پێکەوە دەیکاتە مەشهور و یەکتریش بەهێز دەکەن.

قورەیشیش لەدانیشتنەکانیاندا لەمەککەوە ڕایان گەیاند هەرکەسێك (محمد) پەیدا بکات و بۆمان بگێڕێتەوە چ بەزیندوویی یان مردوویی (١٠٠) حوشتری پێ دەدەین و ئەم هەواڵە لەناوچەی هۆزەکانی دەوروبەری شاری مەککەدا بڵاوبوویەوە.

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی مەعشەم ویستی ئەو بەخششە زۆرە دەستی خۆی بکەوێت و هەموو هەوڵێکی خستە کار، بەڵام ویستی خوا وابوو-کە کەس لەویستی لانادات- لەو سەرەوە

---

[1] سود لە کتێبی (قصص القرآن)ی زیدان لا(١٠١/٢) وەرگیراوە.

[2] ناوی (عاتیکەی کچی کەعبی خوزاعە)یە و خوشکی

که گەڕایەوە بوو بە بەرگری کارێك لە پێغەمبەری خوا پاش ئەوەی بۆ گرتن و قۆڵبەستنی ڕۆیشتبوو.[1]

هەرکە موسڵمانەکان هەواڵی دەرچوونی پێغەمبەری خوایان بیست لە مەککەوە بەرەو مەدینە، هەموو بەیانی یەك لە شار دەردەچوون و لەناوچەی -حەرە- چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەریان -ﷺ- دەکرد، لە شوێنی خۆیان نەدەجولان تاقرچەی نیوەڕۆ نەهاتایە، چەند ڕۆژێکیان بەو چەشنە چاوەڕوانی یە بردە سەر ئەو ڕۆژەی کە تاریکی کرد و هەموان چوونەوە بۆ ماڵ، یەکێ لەجولەکەکانی مەدینە چووە سەربانی قەڵایەك لە قەڵا بەرزەکانی خۆیان بۆ کارێکی خۆی، بەڵام سەیرێکی دوری کرد بینی وا پێغەمبەری خوا -ﷺ- و هاوڕێکەی لە دورەوە دەرکەوتن سپی ئەکەنەوەو سەرابی بیابانەکە لە چاو وونی دەکردن و دەردەکەوتنەوە.

جولەکەکە خۆی پێ نەگیرا هەر لەسەر قەڵاکەوە بەهەموو دەنگی هاواری کرد: ئەی کۆمەڵانی خەڵکی عەرەب وا دەرکەوت ئەو بەختەتان کە چاوەڕوانی هاتنی دەکەن بۆ بەرپارکردنی دەوڵەتەکەتان، موسڵمانەکان شمشێریان هەڵگرتو خۆیان بەست و دەرچوو، لەناوچەی (حەرە) گەشتن بە پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەی دا بەلایانداو بەلای ڕاستدا تا لەناو ماڵەکانی بەنی عەمری کوری عەوف دا دابەزی..

ئەو ڕۆژە دووشەممە[2] بوو لەمانگی ڕەبیعی یەکەم.[3] ئەوبەکری -رضي الله عنه- هەستابووە سەرپێ و پێغەمبەری خوایش -ﷺ- بەبێ دەنگی دانیشتبوو، پشتیوانەکان دەهاتن و یەك یەك سڵاویان لێ دەکرد تاخۆر گەرمی کرد و ئەبووبەکر بە عەباکەی خۆی سێبەری بۆ دروست کرد، ئەوکاتە خەڵکەکە زانیان پێغەمبەری خوا -ﷺ- کامەیە.[4]

ڕۆژی گەشتنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکر - رضي الله عنه - بۆ مەدینە بوو بوو بە ڕۆژی دەربڕینی خۆشی و سرور، بەشێوەیەك مەدینە تا ئەو ڕۆژە شتی وای بە خۆیەوە نە

---

[1] السيرة النبوية، عرض لوقائع و تحليل لاحداثها للصلابي (ج١/ لا ٥٤٣).

[2] ابن حجر دەڵێ: ئەم ڕۆژە هەمووی کۆکە لەسەری و هەندێ تاك کەوتوونەوەو بەهەینی نازەدی دەکەن، (الفتح (٤/٥٤٤).

[3] الهجرة في القرآن الكريم لا (٣٥١).

[4] هەمان سەرچاوە، لا ٣٥٢.

دیبوو، خەڵکی هەموو جوانترین بەرگی خۆیانیان پۆشیبوو وەك بڵێی جەژن بێت، دەی بەڕاستیش ڕۆژی جەژن بوو، چونکە ئەو ڕۆژە ڕۆژی گواستنەوەی ئیسلام بوو لەناوچەیەکی تەسکی وەك مەککەدا بۆناوچەی بەرفراوان و بەرفراوان بوون لەو جێگە پیرۆزەدا کە مەدینە بوو، لەو شارەشەوە هەموو جێگاکانی تری سەرزەوی گرتەوە، خەڵکی مەدینە هەستیان بەوە کردبوو کە ئەمە فەزڵ و ڕێزێکی گەورەی خوایە بۆیان و خوا بەو چاکەیەی لەگەڵیان تایبەتمەندی کردوون، و شارەکەی ئەوانی کردە جێگای حەوانەوەی پێغەمبەرەکەی و هاوەڵەکانی و هەموو کۆچەریان و پاشان کردنی بە پشت و پەنای ئیسلام و پاشان هەر ئەوشارەش بوو بەپایتەختی دەوڵەتی ئیسلام بە هەموو بەش و لاینەکانی یەوە.

لەبەر ئەو هەست پێکردنە بوو، کە خەڵکی مەدینە هەر هەموویان دەستیان کرد بە دەربڕینی خۆشی و هەڵهەلەو دەیان ووت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی موحەمەد، ئەی پێغەمبەری خوا.[1]

ئا بەم پێشوازیە جەماوەری بەشکۆدارەوە –کەمێژووی مرۆڤایەتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو- پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاتە ناوشاری مەدینە و لەماڵی ئەبوئەیوبی ئەنساری دا لای دا و ئەبوبەکریش – رضي الله عنه - لەماڵی خاریجەی کوڕی زەیدی خەزرەجی ئەنصاری دابەزی.[2]

ئا لێرەوە گەشتی پڕ لەنەهامەتی و ناڕەحەتی و بەربەرەکانی کردن دروست بوو، و پێغەمبەری خوایش زاڵ بوو بەسەریانداو بۆ گەیشتن بە دوارۆژی پرشنگدار بۆ ئومەت و دەوڵەتی ئیسلامی و توانی شارستانی یەتێکی مرۆڤایەتی جوان بێنێتە کایەوە، کە لەسەر بنەمای باوەڕو خواناسی و چاکەو دادپەروەری دای مەزراند، ئەمەش پاش ئەوەی کە زاڵ بوو بە سەر دوو زلهێزی جیهانی دا کە حوکمی هەموو سەرزەویان دەکرد، کە فارس و ڕۆم بوون.[3]

ئەبوبەکریش – رضي الله عنه - هەر لەهەڵهاتنی خۆری بانگەوازەوە تاکۆچی دوایی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ڕۆڵی دەستە راستی بۆ بینیوەو لەسەر خۆو بەبێ دەنگی لەکانیاوی

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥٤.

[2] هەمان سەرچاوە، لا٣٥٤.

[3] الهجرة في القرآن الكريم، ام مخزون لا ٣٥٥.

زولاڵی پێغەمبەراتی دەخواردەوە وەری دەگرت: چی؟ ژێری باوەڕ، دڵنیایی و سوربوون، لەخواترسان و دڵسۆزی.

بەرهەمی ئەم هاوڕێیەتی یەش: چاك بوون، ڕاستگۆیی، بەیادبوون، وریایی، خۆشویستن و دڵپاکی، سوربوون و بەرەو رۆچوون، دڵسۆزی و تێگەیشتن.

بۆیە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا -ﷺ- کۆمەڵێ هەڵوێستی گەورەی نواند لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) و چەندان هەڵوێستی تریش، ناردنی سوپاکەی ئوسامە و جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان، ئەوەی تێك چوو چاکی کردەوە، ئەوەی ڕووخا ڕاستی کردەوە، ئەوەی بڵاوەی لێ کرد کۆی کردەوە، ئەوەی لایدا ڕاستی کردەوە.[1]

لە کۆچ کردنی ئەبوبەکری (صدیق) لەگەڵ پێغەمبەری خوا بۆ شاری مەدینە کۆمەڵێ وانە و پەیوەندی بەسوودی لێ وەردەگرێت:-

یەکەم/ خوای -عزوجل- ئەفەرموێت: (الاّ تنصروه فقد نصره الله إذ اخرجه الذين........كفرو السفلى وكلمةُ الله العليا).[2]

لەم ئایەتە پیرۆزەدا و لە حەوت ڕووەوە چاکی پێشڕەوی (صدیق) – رضي الله عنه - دەردەخات، لەوانە:

١- بێ باوەڕان دەریان کردوە: بێ باوەڕان پێغەمبەری خوایان دەرکرد خوا بە ووشەی (ثاني اثنين) ناوی ئەبوبەکریشی هێناوە کە هەردوکیان دەرکراون و هەروایش بووە.

٢- تاکە هاوڕێی بووە: ئەوەی کە لەگەڵی هاوڕێ بوو کاتێ بێ باوەڕان دەریان پەڕاند و خوای گەورەش سەری خست ئەبوبەکری (صدیق) بوو، دوو قۆڵی بوون و خوای -عزوجل- سێ یەمیان بووە، ووتەی خوای گەورە (ثانى اثنين) لە زۆر شوێندا لەناو هاوەڵە مەزنە شکۆدارەکاندا ئەو تەنیا هاوڕێی پێغەمبەری خوابووە -ﷺ-، وەك: (گەشتی لەگەڵیدا لەشەوی کۆچدا مانەوەی لە خەیمەی پێغەمبەر -ﷺ- لەگەرمەی جەنگی بەدردا، و لەکاتی دەرچوونی بۆ ناو هۆزەکانی عەرەب و بۆ بانگ کردنیان بۆ ئیسلام، یەکێ لەهاوەڵە مەزنەکان کەلەگەڵی

---

[1] في التأريخ الاسلام، شوقي أبوخليل لا ٢٢٦.
[2] التوبة: ٤٠.

دەبوون ئەبوو بەکربوو، ئەمەش تایبەتمەندی دەگەیەنێت لەهاوڕێیەتیدا و ئەبوبەکریش تاکانەیە لەناو هەموو هاوەڵاندا ئەمەش ڕای خەڵکانی زاناو شارەزایانی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر -ﷺ-.

٣-هاوڕێی ناو ئەشکەوتی بوو: بەڵگەی چاکەو پیاوەتی یە لەناو ئەشکەوتدا بەدەقی ئایەتی قورئان، بوخاری و موسلیم لە (صحیحین)دا لە ئەنەسەوە گێڕاویانەتەوە کە ئەبووبەکری صدیق-ەوە — رضي الله عنه - وتویەتی: سەیری ژێر پێی بێ باوەڕانم دەکرد لەپاڵ سەرماندابوو. کاتێ لە ئەشکەوتەکەدا بووین ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئەگەر یەکێکیان سەیری بەرپێی خۆی بکات دەمان بینێت. فەرمووی: (یا أبابکر ماظنك باثنین الله ثالثهما)[1] ئەم فەرموودەیە لەگەڵ ئەوەدا کەزانایانی ئیسلام لەسەر (صحیح)ی و وەرگیراوی ڕێکن و تەنها دووکەس ناکۆك نین تیایدا، ئایەتی قورئانیش بەو مانایە هاتووە.[2]

٤- هاوڕێی تەواوی بووە: ئایەتی (إذ یقول لصاحبه) بەس مانای ئەوە ناگەیەنێت کە لەگەڵیدا بووە، بەڵکو مانای هاوڕێی ڕاستەقینە دەگەیەنێ کە کار لەسەر ئەو هاوڕێیەتی یە بکات و تاوای لێ بێ —کەس نەتوانێت بەو جۆرە بکات و ببێتە هاوڕێ بەمانای ووشە، و ئەمەش شتێکە زانایان بە ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر -ﷺ- تیایدا ڕێکن و جیاوازیان نی یە و لەبەر ئەمەشە هەندێ لە زاناکان دەڵێن (-صدیق- خاوەنی هەندێ تایبەتمەندی چاکی یەکە کەسی پێ ناگات).[3]

٥-خەم خۆری بووە:

ووەشی (لاتحزن) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاوڕێکەی زۆر غەمخۆری بووەو سەرخەری بووە بۆیە خەفەتی خواردووە، چونکە مرۆڤ کاتێ خەفەت دەخوات بۆ کەسێك کە بترسێ لەوەی خۆشەویستەکەی تووشی شتێ ببێ، و خەمخواردنی بۆ پێغەمبەر -ﷺ- لەوڕوانگەیەوە بووە نەوەك بیکوژن و ئیسلام نەگاتە مرۆڤەکان،هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە لەکاتی کۆچیاندا بۆ

---

[1] البخاري، کتاب فضائل الصحابة، ژمارە ٣٦٥٣ و مسلم ١٨٥٤.
[2] منهاج السنة (٤/٢٤٠-٢٤١).
[3] منهاج السنة (١/٢٥٢-٢٤١).

مەدینە جارێ پێشی دەکەوێت و جارێ لە دوایەوە دەڕۆیشت، پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەو بارەوە پرسیاری لێ کرد و ئەویش ووتی: (أذكر الرصد فاكون أمامك فاذكر الطلب فأكون ورائك)[1] واتە: بیر لەتیری پێشەوە ئەکەمەوە دێمە پێشەوە تا لەمن بدات و هەر کە بیر لەوانە دەکەمەوە کە بەدواتەوەن دێمە دواوە تام بکوژن یان بمگرن.

ئیمام احمد لەبەشی (چاکی و لەپێشی هاوەڵاندادەڵێت:.. (ئەبوبەکری جارێ لە پێشەوە و جارێ لە دوایەوە دەڕۆیشت، پێغەمبەری خوا -ﷺ- لێی پرسی (مالك) ئەوە چیتە؟ ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەترسم لەپێشەوە یەکێ بێت بۆت بۆیە من دێمە پێش و ئەترسم لەدواوە بێن بۆت ئەچمە دواوە، وتی: کاتێ گەشتینە بەردەرگای ئەشکەوتەکە ئەبوبەکر - رضي الله عنه - ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەجێی خۆت ڕاوەستە تا ناوەوە دەپشکنم.. یەك کونی تێدا بەدی کرد بە قاچی کەبسی کرد و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر شتی پێوە بدات یان گاز بگرێت با بەمنەوە بدات.[2]

سەیری خۆی وانەکردووە کە خۆی بەرێتە ڕیزی پێغەمبەری خوا -ﷺ- نەخێر، بەڵکو حەزی نەکردووە پێغەمبەری خوا بکوژن و خۆی بژی، بەڵکو حەزی کردووە خۆی و ماڵ و منداڵی بخاتە پێناوی و ئەمەش ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە و ئەبوبەکری -صدیق-یش شایان ترین کەس بوو کە هەستێ بەو ئەرکە.[3]

٦-بەشداری ئەویش لە چاودێری خوایی:

ووشەی (إن الله معنا) لە ئایەتەکەدا ڕاستەوخۆ باس لەوە دەکات ئەبوبەکری -صدیق- رضي الله عنه - بەشداری ئەو چاودێری و ئاگاداربوونە بووە خوای گەورە بۆ هەردووکیان کە هیچ کەس جگە لەخۆی لەم تایبەتمەندی یەدا بەشدار نەبووە،..

ئەمەبەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەگەڵیانە بەپشتگیری و سەرخستن و کۆمەکی بۆ زاڵ بوون بەسەر دوژمنەکانیاندا -پێغەمبەری خوا-ﷺ- ئاگاداری ئەبوبەکر دەکات کەخوای گەورە من و

---

[1] ابوبكر الصديق افضل الصحابة واحقهم بالخلافة. لا ٤٣.
[2] مناهج السنة (٤/٢٦٢-٢٦٣).
[3] **هەمان سەرچاوە.**

تۆ سەردەخات و زاڵمان دەکات بەسەریاندا، ئەم سەرکەوتنەش ڕێز و خۆشەویستی خوایە بۆیان وەك دەفەرموێت: (إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾)[1]. واتە ئێمە پێغەمبەرەکەمان

و بڕواداران سەردەخەین لەدونیاداو لە ڕۆژی دوایشیدا).

ئەمەش ئەوپەڕی سەناخوانی یە بۆ ئەبوبەکر، چونکە ئەوە دەگەیەنێت کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا شاهیدی ئیمانیان بۆدراوەو باوەڕی کە سەرکەوتنی خوایشی لەگەڵدابێت لەحاڵێکدا کە هەموو خەڵکی لەتێکشکاندان جگە لەوانەی خوا سەریان دەخات.[2]

دکتۆر عبدالکریم زەیدان دەربارەی ئەم لەگەڵ بوونەدا دەڵێت: ئەم لەگەڵ بوونە خوایی یەی ئایەتی (ان الله معنا) بەرزترە لەو لەگەڵ بوونەی بۆ لەخواترسان و پیاوچاکان لەئایەتی: (ان الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون)[3]، لەگەڵ بوونی یەکم بۆ خودی پێغەمبەر و خۆی و هاوڕێکەیەتی، نەبەستراوە بەمەرجێکەوە کە ئەوە سەرکەوتنە کە دەهێنێت کە ئەویش لەخواترسان و چاکە خوازی یە، بەڵکو ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەر و هاوڕێکەی کە پشتگیری دەکرێن بە کۆمەڵێ نیشانە و شتانی سەیر و سەرسوڕهێنەر (معجزات).[4]

٧- هاوڕی کاتی دابەزینی ئارامش و سەرکەوتن:

خوای گەورە دەفەرموێت: (فانزل الله سكينته عليه، وايده بجنود لم تروها)[5] واتە: (خوای گەورە

ئارامشی خۆی دابەزاند بەسەریانداو بەسەربازانێك هاوکاری کردن کە نەدەبیران) هەرکەسێ هاوڕێ بێ لەکاتی ترس و تەنگانەدا شایانەو ئاسایشە کە لەکاتی هاتنی سەرکەوتن و پشتگریدا هاوڕێ ی بێ، لێرە پێویست ناکا دووبارە ناوی هاوڕێکەشی بەرێتەوە چونکە لەئایەتەکەدا ئەوە

---

[1] غافر: ٥١.
[2] ابوبكر افضل الصحابة واحقهم بالخلافة لا ٤٣.
[3] النحل: ١٨٢.
[4] منهاج السنة (٤-٢٦٢-٢٦٣).
[5] التوبة: ٤٠.

دەگەیەنێ و لەوکاتەشدا ئەویشی گرتۆتەوە، چونکە ئەگەر زانیمان لەم کاتە کەسەرکەوتنەکە و ئارامی یەکەی بۆ هاتووە هاورێ لەگەڵدا بووە ئەوە لە هەموو خەڵکی زیاتر بەری ئەویش دەکەوێت و دەگیرێتەوە، ئەمەش بەشێکە لەرەوانبێژی قورئان و جوانی دەربڕینەکانی.

دووەم/ تێگەیشتنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکر لە نەخشەدانان و بەکارهێنانی هۆکارەکان:-

ئەوی لەڕووداوی (کۆچ) بەوردی بکۆڵێتەوە، هەر لەسەرەتاوە نەخشە دانانی ورد و بەکارهێنانی هۆکاری جیاجیا هەست پێ دەکات، هەر لە پێشەکی یەکانی یەوە تا ڕووداوەکانی دوایش نەخشەو پلانی ڕاست و دروست و بە نیگا کۆمەکی کراو لە ژیانی پێغەمبەردا دەبینرێت، و نەخشە سازی کردن بەشێکە لە سوننەت و ڕێڕەوی پێغەمبەری خواو بەشێکیشە لە داواکاری خوایی کە دەیەوێت موسڵمان بەکاری بهێنێ، ئەوکەسانەی کە پشتگیری کاری هەڕەمەکی -عفویە- دەکەن بەبەڵگەی ئەوەی کە گوایە تۆکمەکردنی کار و نەخشەکێشان سوننەت نی یە، نموونەی ئەوانە ستەم لە خۆیان و موسڵمانانیش دەکەن.[1]

لەساتەوەختی کۆچی پێغەمبەردا -ﷺ- و لەکاتی جێ بەجێ کردندا ئەم خاڵانە تێبینی دەکرێت:

بوونی ڕێکخستنێکی ورد بۆ کۆچ، تا سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتی و کۆسپ و تەگەرانەی هاتە ڕێگا، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کەهەموو هەنگاوانێ لەهەنگاوەکانی کۆچ حسابی خۆی بۆ کرابوو بەحسابێکی تایبەتی، بۆ نموونە:

١-لەکاتی قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا پێغەمبەر -ﷺ- دێت بۆ ماڵی ئەبوبەکر کە پێشتر عادەتی وای نەبوو، بۆچی ئەمەی کرد؟ تاکەس نەیبینێ.

٢- شارینەوەی دەم و چاوی و هەڵبەستنی لەرێگای هاتنی بۆ ماڵی ئەبووبەکر، چونکە دەم و چاو هەڵبەستراو کەمتر شێوازی دەردەکەوێت و کەمتر دەناسرێتەوە.[2]

---

[1] الاساس في السنة، سعيد حوى (٣٥٧٨).

[2] السيرة النبوية قراءة لجوانب الحذر والحيطه لا ١٤١، البخارى كتاب مناقب الانصار باب هجرة النبي -ﷺ- ژمارە ٣٩٠٥.

٣-لەماڵی ئەبوبەکر فەرمانی دا هەموو بچێتە دەرەوە لەژوورەکەو، پاشان بەس ئەوەی باس کرد کە کۆچ دەکەن و شوێنەکەی دیاری نەکرد.

٤-دەرچوونەکە لەکاتی شەودا بوو، لەدەرگای دواوەی خانوەکەی ئەبوبەکردا.[1]

٥-دووربینی و یەدەك کاری بەڕادەیەك هەستا بەگرتنەبەری کوێرە ڕێگایەك کە زۆرکەسی پیانەدەچوو، پشت بەستن بە شارەزایەکی ناوچە لادێ نیشن و خشپە بیانی یەکان لەگەڵ ئەوەشدا بێ باوەڕبوو بەڵام ڕەوشت بەرزی و دامەزراوی تێدا بوو، ئەمەش لەلایەکی ترەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەسود وەرگرتن لە شارەزایی خەڵکی خۆی لانەداوە ئیتر با سەرچاوەکەی هەر کەسێ هەیە.[2]

مامۆستا عبدالکریم زەیدان ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە بنەماو ئەصڵ ئەوەیە دروست نی یە پشت بە ناموسڵمان ببەسترێت لەکاتی گشتی دا، بەڵام ئەم بنەمایە هەندێ شتی لێ جیا دەکرێتەوە، لەوانە، دروستە پشت بەستن بە ناموسڵمان بەڵام بەچەند مەرجێکی دیاری کراو ئەوەیە: بوونی بەرژەوەندی یان سودەکەی زیاتربێت، و نابێ ئەو داوای کۆمەکی یە زیان بە بانگەواز و لایەنەکانی بانگەواز بدات، و دەبێت متمانەی تەواوت بەو کەسە هەبێت کەکۆمەکی لێ دەخوازیت. دەبێت ئەو کۆمەکی خواستنە نەبێتە هۆی گومانی خراپ -شبهە- لەلایەن موسڵمانانەوە، و دەبێت پێویستی یەکی تەواو مەلموس بەم کۆمەکی خواستنە هەبێت و زۆر جیابێت، بەم مەرجانەی پێشوو نەبێت کۆمەکی خواستن لەبێ باوەڕان دروست نی یە.[3]

ئەبوبەکری -صدیق-رضي الله عنه- هەموو خانەوادەکەی خۆی بانگ کرد بۆ موسڵمان بوون و لەو کارە پڕترسناکی یەشدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو کردیشنی بە خزمەتکاری ئیسلام و هۆکاری سەرکەوتنی (کۆچ)ی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ڕۆڵە گرنگ و ترسناکەکانی دابەش کردبوو بەسەر منداڵەکانیدا لەپێناو جێ بەجێ کردنی کارەکانی پلانی کۆچی پیرۆز.

١-ڕۆڵی عبدالله ی کوڕی أبوبکر- صدیق-خوایان لێ ڕازی بێت -:

[1] معين السيرة للشامي لا ١٤٧.
[2] الهجرة في القرآن الكريم لا ٣٦١.
[3] المستفاد من قصص القرآن (٢/١٤٤-١٤٥).

هەستا بەبینینی ڕۆڵی هەواڵگری ڕاستەقینەو ئاگاداری جموجوڵی دوژمنان، عبدالله لەسەر خۆشەویستی ئاینەکەی گۆش کرابوو، و کردەوە کردن لە پێناو سەرخستنیدا بە بینایی ڕوون و عەقڵ و ژیری یەکی تیژ، کە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە ئەبوبەکر – صدیق-رضي الله عنه - گرنگی لەڕادەبەدەری پێداوە لەپەروەردەکردنیدا و لەکاتی جێ بەجێ کردنی کۆچدا ڕۆڵی خۆی بۆ دیاری کرد و ئەویش بە جوانترین شێوە جێ بەجێ ی کرد، گەڕان بوو لە بەناو کۆڕەکانی خەڵکی مەککەداو گوێی بۆ قسەکانیان دەگرت و لە ڕۆژدا چیان باسکردایە و پاشان بەشەو خۆی دەگەیاندە ئەشکەوت و هەمووی بۆ پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکری باوکی – صدیق-رضي الله عنه - دەگێڕایەوە و نیازی قوریشی یەکان و پیلانەکانیان و ئەوەی لە مێشکیانا بوو هەمووی پێ دەگەیاندن،(عبدالله) ئەونە بەشێوەیەکی جوان ئەم ئەرکەی جێ بەجێ دەکرد یەك کەس لە خەڵکی مەککە گومانیان بۆی نەدەچوو بەشەویش لە ئەشکەوت دەمایەوەو ئێشکی دەدیران و پێش ڕۆژ بوونەوەش بە ئەسپایی خۆی دەکردەوە بەمەککەداو کەس هەستی پێ نەدەکرد.[1]

٢- ڕۆڵی عائیشە و ئەسما-خوایان لێ ڕازی بێ-:

عائیشە و ئەسما ڕۆڵێکی گرنگیان بینی چونکە بەرهەمی ئەو پەروەردە ڕاست و دروستە بوو کە ئەبوبەکر گۆشی کردبوون، ئەوەبوو هەرکە پێغەمبەر -ﷺ- گەشتە ماڵی ئەبوبەکر – صدیق-رضي الله عنه - و نیازی کۆچیان کرد خێرا تفاقی سەفەر و خواردنیان بۆساز کردن، دایکی باوەڕداران دەڵێت: هەردوکیانمان بەجوانترین شێوە خستە ڕێ و کۆڵمان بۆ گرتن کردمانەناو گۆزەکەوەو ئەسماو پارچەیەکی لە پشتێنەکەی خۆی بڕی و دەمی گۆزەکەی پێ بەست و هەر بۆیەشە ناوی لێ نرا (ذات النطاقين) خاوەن دوو پشتوێن.[2]

٣- ڕۆڵی ئەسماو لەخۆگری کاتی نەهامەتی و شارینەوی نهێنی موسڵمانەکان:

بەڕاستی ئەسماو – صدیق-رضي الله عنه - وەك ئافرەتێکی تێگەیشتوو لە ئاینەکەی، و پارێزەری نهێنیەکانی بانگەواز و بەرگەگرتنی جۆرەها ئەشکەنجەو ناڕەحەتی لەو پێناوەدا، ئەسما

[1] السيرة الحلبية (٢/٢١٣) البداية والنهاية (٣/١٨٢).
[2] البداية والنهاية (٣/١٨٤).

خۆی باسی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (کاتێ پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکر ی صدیق- رضي الله عنە - لەماڵ دەرچوون، کۆمەڵێ لە قورەیش کە ئەبوجەهلیشیان لەگەڵدا بوو هاتن بۆ ماڵمان و لەبەردەرگاکەی ماڵی ئەبوبەکردا وەستان و منیش هاتم بەدەمیانەوە، ووتیان: کوا باوکت کچی ئەبوبەکر؟ ووتم: سوێند بە خوا نازانم بەرەو کوێ چوون؟ ئەبوجەهل دەستی بەرزکردەوە -کە پیاوێکی خراپی پیس بوو- یەك زللەی دا لە ڕوومەتم و گوارەکانم پەڕی، پاشان پشتیان هەڵکرد و ڕۆشتن..)[1]

ئەمەبوو ڕۆڵی ئەسماء کە وانەیەکە بۆ سەرجەم ئافرەتانی موسڵمان تا نەوە لەدوای نەوە نهێنی موسڵمانان لە دوژمنان بشارنەوەو ئابەو جۆرەش بەرامبەر ستەمکار و سەرکەشان بووەستنەوە.

٤-ڕۆڵی ئەسماء —رضي الله عنە - لەبڵاوکردنەوەی ئاستی دڵنیایی لەماڵدا:

ئەبوبەکر — رضي الله عنە - کاتێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەرچوو هەموو سامانەکەی لەگەڵ خۆی برد کە نزیکەی (٥) یان (٦) هەزار درهەم بوو، ئەبوقوحافە هات بۆ ماڵی ئەبوبەکر بۆ هەواڵ پرسین و دڵنیابوون لە گوزەرانی منداڵەکانی و لەوکاتەدا چاوەکانی نابینابوون.

ووتی: سوێند بە خوا هەرچی سەیر دەکەم وادەزانم ماڵ کاولی کردوون و هەموو پارەکانی لەگەڵ خۆی بردووە، ئەسمایش ووتی: نەخێر باوەگیان، پاشان دەستی گرت و لەگەل خۆی بردی، ئەسما دەڵێت باوام ئەبوقوحافە هات بۆ ماڵمان چاوەکانی لەدەست دابوو، پێم ووت: پارەو خێراتی چاکی بۆ بەجێ هێشتوین، هەروەك باوکم پارەکانی لەناو تاقێکدا لەماڵەکەدا دادەنا منیش هەندێ بەردم لەجێگەکەیدا داناو بەتانی یەکم پیاداو دەستی باوامم گرت و ووتم: ئەها دەست بدە لە پارەکان، ئەویش دەستێکی پیا هێناو ووتی: دەی چاکە، ئەگەر ئەم هەمووەی بۆ بەجێ هێشتبن چاکی کردووە و ئەمەش بەشتان دەکات، نەخێر سوێند بەخوا هیچی بۆ بەجێ نەهێشتبووین، بەڵکو هەر ویستم ئەو پیرە هێور و دڵنیا بکەمەوە.[2]

[1] الهجرة النبوية المباركة لا١٢٦.

[2] السيرة النبوية لابن هشام (١٠٢/٢) اسناده صحيح.

ئابەم فام و ژیریەوە ئەسماو باوکی خۆی پۆشی، و دڵی باپیرە کوێرەکەشی ئارام کردەوە، بەبێ ئەوەی درۆیەکیش بکات، چونکە ڕاستی کرد باوکی ئەم بەردانەی بۆ بەجێ هێشتبوون کە بەهۆیانەوە دڵی ئەو پیرەی پێ خۆش کرد، بەڵام باوەڕێکی وای بۆ بەجێ هێشتن کە کێو لەبنی نەهێنێ و هیچ گەردەلولێ نەی لەخشێنێ، وگوێ نەدات بە بوون و نەبوونی پارەو سامان، متمانە و دڵنیایی یەکی بێ سنوری بۆ بەجێ هێشتبوون، نەفس بەرزی یەکی وای تیا ڕواندبوون کە بۆشتی گەورەیان دەڕوانی و بۆشتی هیچ و پوچ و بێ ئەهمیەت لانەکاتەوە.

نمونەیەکی بێ وێنەیان دروست کردبوو لەخێزانی موسڵمان کە دووبارە نابێتەوەو کەمیش لەو جۆرە دروست دەبیچتەوە.

ئەسماو – رضي الله عنه - بەم هەڵوێستە بەرزانەیەوە نمونەیەکی گەورەی پێشکەشی ئافرەتان و کچانی موسڵمانی کرد کە زۆر پێویستیان بەوە هەیە چاوی لێ بکەن و شوێن پێی هەڵبگرن، ئەسماو و خوشکەکانی بەم شێوەیە ژیان لە مەککەو سکالای نەبوونی دەردەبڕی، و داوای پێویستی لەکەس نەدەکرد، تا ئەوە بوو پێغەمبەر -ﷺ- زەیدی کوڕی حاریسە و ئەبا رافیعی نارد بۆ مەککەو پێیاندا حوشترێك و (٥٠٠) درهەمی نارد بۆیان و فاطمە وام کولسومی کچی و سەودەی کچی زەمعەی خێزانی و ئوسامەی کوڕی زەید و دایکیشی بەرەکە کە بە (ئوم ئەیمەن) ناسرابوو پێکەوە ناردنی بۆ ماڵی ئەبوبەکر و لەوسەرەوە (عبداللە ی کوڕی ئەبوبەکر) ماڵ و خانەوادەکەی ئەبوبەکری هەموو کۆکردەوەو لەگەڵ ئەو وەفدەدا پێکەوە گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە.[1]

٥- رۆڵی عامیری کوڕی فەهیرە (خزمەتکارەکەی ئەبوبەکر):

زۆرێ لە خەڵکی بەچاوی سووك سەیری خزمەتکار دەکەن و گوێی پێ نادەن و پشت گوێی دەخەن، بەڵام بانگخوازە خوایی یەکان هەرگیز واناکەن، هەموو هەوڵێکیان دەخەنە کار بۆ ڕێنمایی کردنی هەرکەسێ بگەن پێی و دەمیان پێی بگات، لەبەر ئەوە دەبینی ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - ئەدەبێکی جوانی فەهیرەی کوڕی عامیری خزمەتکاری دەکات و لە ئیسلام

---

[1] تاریخ الطبری (٢/١٠٠) الهجرة النبوية المباركة لا ١٢٨.

شارەزای دەکات و وای لێکرد تا ئامادەی بکات بۆ خزمەتکاری ئیسلام و گیان فیدایی لە پێناویدا.

ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - رۆڵێکی پێدابوو لە ڕۆژی کۆچدا، ئەو لەگەڵ لاوەکانی مەککەدا پێکەوە ڕانیان ئەلەوەڕاند بەبێ ئەوەی وا بکات هەست بە شتێ بکەن، ئیتر سەر لەئێوارە ڕانەکەی ئەبوبەکری بەلای ئەشکەوتەکەدا تێ دەپەڕاند و ئەوانیش حەیوانەکانیان دەدۆشی و لێشیان سەردەبڕی بۆ خواردن و پاشان کارەکانی عبدالله ی کوڕی ئەبوبەکری تەواو دەکرد کە ڕانەکەی دەبرد بەسەر جێ پێکانی عبدالله دا و شوێنەوارەکانی دەکوژاندەوە، کە ئەمەش ئەوپەڕی زیرەکی و لێهاتوویی ئامادەکاری دەگەیەنێت بۆسەرکەوتنی کۆچ.[1]

ئەمەش وانەیەکی مەزنەو لە ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - وەردەگیرێت کە چۆن دەبێت موسڵمانان گرنگی بەو خزمەتکارەکان بدەن لەم پەڕەوپەڕی دونیاوە دێتەبەردەستیان یەکەم وەك مرۆڤێکی ئاسایی لەگەڵیان بجولێتەوەو پاشان لەئیسلام حاڵییان بکەن چونکە لەوانە خوای گەورە لەناو ئەوانەدا کەسانێ هەڵبخات کە ئەم دینە وەك پێویست بەرپا بکات.

ئەوەی صدیق – رضي الله عنه -کردی لە خستنە گەڕ و بەکارهێنانی ئەندامانی خێزانەکەی لەبۆ سەرکەوتنی کۆچ، مانای ئەوە دەگەیەنێت کە بەشێوەیەك ورد و جوان کارەکانی بەڕێوە بردووە، دیاری کردنی کاتەکان بەشێوازێکی لێزانانە، دانانی هەرکەسەو لە شوێنی گونجاوی خۆیدا، و پڕکردنەوەی هەموو کەلێنەکان، ئامادەکاری جوان بۆهەموو پێداویستیەکانی کۆچەکە،دانانی کەسانی پێویست بە ژمارەی پێویست نە زیاد و نەکەم.

پێغەمبەری خوا هەموو هۆکارێکی گونجاوی گرتە بەر بە ئەوپەڕی توانایەوە کە پێی درابوو.. پاش ئەوە ئەوجا یارمەتی و چاودێری خوداییان چاوەڕوان دەکرد.[2]

گرتنەبەری هۆکارەکان پێویستە و فەرمانیشی پێ دراوە، بەڵام خۆنابێ گشت کات بەتەمای ئامانجی چاك بێت، چونکە ئەمە پەیوەندە بەویست و ئارەزووی خوای پەروەردگارەوە، ئالێرەوە (پەشت بەستن) –توکل- کارێکی پێویستە و تەواوکەری گرتنەبەری هۆکارەکانە.

---

[1]تاريخ الدعوة في عهد خلفاء الراشدين، لا ١١٥.
[2]اضواء على الهجرة، توفيق محمد، لا ٣٩٣-٣٩٧.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- هەموو هۆکارێکی ئامادەکرد وگشت هۆیەکی بەکارهێنا، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لەگەلّ خوادا بوو بانگی دەکرد و داوای سەرکەوتنی لێ دەکرد و ئا لێرەوە نزا وەلاّم دەدرێتەوە، تاجەگولێنەی سەرکەوتن دەکرێتە سەری کارەکان.[1]

سێ یەم/ ئاستی بەرزی سەربازیەتی –صدیق-و گریانی خۆشی:

کاتێ لەئاستی بەرزی سەربازیەتی (جندیە) –صدیق- دەڕوانین ئاسەواری پەروەردەی پێغەمبەرمان بۆ بەدیار دەکەوێت، ئەوەبوو کاتێ داوای کرد لە پێغەمبەر کە مۆلّەتی بدات کۆچ بکات بۆ مەدینە پێی فەرموو (لا تعجل لعل الله يجعل لك صاحباً) واتە: پەلە مەکە بەلّکو خوا هاوڕێیەکت بۆ پەیدا بکات، لەو ساتەوە دەستی کرد بە نەخشەسازی و ئامادەکاری بۆ ئەو کۆچەو دوو وولاّخی چاکی کڕی و لەمالاّ دابەستەی کردن و ئامادەی کرد بۆ ئەو ڕۆژە.

لەگێڕانەوەیەکی بخاری دا دەلّێت: ماوەی چوار مانگ ئالّفی دا بەو دوو وولاّخە لە گیای (ورق السمر-الخيط).

بەبیری تیژی هەستی بەوە کردبوو کە بەشێوەیەك پەروەردەکراوە کە بۆ سەرکردایەتی کردن بشێت، دەیزانی ساتەوەختی کۆچ کتوپڕی یەو لەناکاودا دێت، لەبەر ئەوە هۆکارەکانی کۆچکردن و تفاق خستن بۆی ئامادەکردو هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەی خستە خزمەتی پێغەمبەر -ﷺ-.

هەرکە پێغەمبەری خوا -ﷺ- هات بۆ مالّیان و پێی ڕاگەیاند کە خوا ڕێگەی کۆچکردنی پێداوەو دەبێ دەربچن، لەخۆشیدا ئەبوبەکر دەستی کرد بە گریان، عائیشە – رضي الله عنە - لەو بارەیەوە دەلّێت: سوێند بە خوا تا ئەو کاتە نەمزانیبوو کەسێ لە خۆشیاندا بگری تا ئەبوبەکرم بینی ئەو ڕۆژە لە خۆیاندا دەگریا، ئەوەش لوتکەی خۆشی و شادی مرۆڤایەتی یە، کە خۆشی و سرور بە گریان دەربڕێت.

ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنە - چاك دەیزانی مانای ئەم هاوڕێیەتی یە ئەوەیە کە بەتەنها و بۆ دە پانزە ڕۆژی بەلایەنی کەمەوە لەگەلّ نێرراوی پەروەردگاری جیهاندا دەبێت، بەتەنها ئەو ژیانی خۆی فیدای گەورەو سەرکردەو خۆشەویستەکەی (محمد المصطفی) -ﷺ-

---

[1] من معين السيرة، لا ١٤٨.

دەكات، دەی كام سەركەوتن لەم بونەوەرەدا دەگاتە ئەم سەركەوتنە؟ كە بەس خـۆی و بەتـەنها و بەبێ یەك كەس لە ئەهلی زەوی و بەبێ یەك كەسی كە لەهاوەڵان تەنها ئەو هاوڕێ و هـاودەمی سەرداری دروست كراوەكان بێت و ئەم هەمووە ماوەیە پێكەوە بن.[1] و مانای خۆشەویستن لە بەر خاتری خوا بە ڕوونی بەدی دەكرێت لە ترس و خەمخواردنی ئەبوبەكر كاتێ لە ئەشكەوتەكەدا بـوو كە بتپەرستەكان ئەیان بینن، بەم كارەشی —ئەبوبەكر- بوو بـە نمونەیـەك كـە پێویـستە لەسـەر هەموو بانگخوازێكی ڕاستەقینە ئابەو جۆرە بێ لەگەڵ سەركردە دەست پاكەكەی كاتێ كەتووشی مەترسی یەك دەبێت و خەمی سەلامەتی بێت.

ئەبوبەكر — رضي الله عنه - لەوكاتە ناهەموارەدا لـەخۆی نەدەترسـا كـە بمرێـت، ئەگـەر وابوایە هەر لەسەرەتاوە قبوڵی هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوای نەدەكرد كە كۆچێكی لێوان لێو بوو لە مەترسی و دەیزانی بچوكترین سزای لەلایەن بتپەرستانەوە ئەگـەر بیانگرتنایـە كوشـتن بـوو، بەڵام ئەو بەس خەمی ژیانی پێغەمبـەری خـوای بـوو، و خـەمی پاشـەڕۆژی ئیـسلام ئەگـەر — خوانەكردە- پێغەمبەر بكەوتایەتە بەردەستی بتپەرستان.

و ئاستی داپۆشینی نهێنـی و شـاردنەوەی ڕاسـتی یـەكان لـەكاتی كـۆچ كردنیـان لـەزۆر هەڵوێست دا: لەوانە: كاتێ كەسێ پرسیاری لێ كرد: ئەم پیاوە كێ یە لەگەڵتدا؟ ووتی: ئەمە ڕێ پیشاندەرەو ڕێم پیشان دەدات، مەبەستیشی لەڕێگەی خێر و هیدایەت بوو، بەڵام پرسـیاركەرەكە وای زانی مەبەستی دەلیلی ڕێگەیە، ئەمەش جوان بەكارهێنانی وەڵامی ناڕاستەوخۆی ئەبوبـەكر دەگەیـەنێت كـە نەشـپرز بـوو، نـە درۆیـشی كـرد.[2] و لەوەڵامەكەیـدا مانـای دوور (توریـە)ی بەكارهێناو جێبەجێ كردنی پەروەردە ئەمنی و پڕ لە كەتمانەكە بـوو كـە لەپێغەمبـەری خـواوە وەری گرتبوو، چونكە كۆچەكە خۆی دەبوایە بەنهێنی بكرایەو پێغەمبەری خـوایش -ﷺ- پێـی ڕازی بوو.[3]

چوارەم: هونەری سەركردایەتی گیانەكان و هونەری هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ دەروونەكان:

---

[1] التربية القيادية (٢/١٩١-١٩٢).
[2] الهجرة النبوية المباركة، ٢-٤.
[3] السيرة النبويةللسباعى، لا ٦٨.

خۆشویستنی قوڵی ئەبوبەکر –خوای لێ رازی بێ- بۆ پێغەمبەری خوا -ﷺ- زاڵ بوو بوو بەسەر دڵیدا لەکاتی کۆچەکەیاندا، و هەروەك باقی هاوەڵان پێغەمبەریان زۆر خۆش ویستووە، ئەم ئەوینە خوایی یەش لە دڵەوە هەڵدەقوڵی و لە پاکی یەوە سەرچەشمەی گرتبوو، خۆشەویستی زارەکی نەبوو لە دووڕوویی یەوە بێ، یان لەبەر بەرژەوەندی یەکی دنیایی، یان لەبەر دەستکەوتێ یان لەبەر ترسێ کە لەڕێدابێ.

یەکێ لە هۆکارەکانی ئەم خۆشویستنەی پێغەمبەر -ﷺ- بوونی سیفاتی سەرکردایەتی ژیرانە تیایدا، شەونخونی دەکێشا تا بە ئارامی بخەون، خۆی دەڕەتاند تا بیانحەوێنێتەوە، خۆی برسی دەکرد تا ئەوان تێربن، لەگەڵ خۆشیاندا خۆشی بوو لەگەڵ غەمیاندا غەمبار، هەرکەسێك بەشێوەیە بکات کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەگەڵ هاوەلەکاندا کردوویەتی چ لەژیانی تایبەتی یان ژیانی گشتی، بەشداری خۆشی و ناخۆشیان بکات و بەم کارانەشی مەبەستی خوابێت، خەڵکی ئابەو جۆرە خۆشیان دەوێت ئیتر باسەرکردەو سەرۆك و بەرپرسی بن لەوڵاتی ئیسلامدا.[1]

وەك شاعرێکی لیبیایی (أحمد رفیق المهدوی) دەڵێت:

فاذا احب الله باطن عبده ظهرت عليه مواهب الفتاح
واذا وصفت لله نية مصلح مال العباد عليه بالاواح[2]

سەرکردایەتی ڕاستەقینە ئەتوانێت سەرکردایەتی گیانەکان بکات پێش هەموو شتێکی تر و ئەتوانێ لەگەڵ دەروونەکاندا هەڵسوکەوت بکات پێش هەموو شتێ تر، بەبێ چاکی سەرکردەیە سەربازەکانیش چاك دەبن.

و بەپێی بەخشندەیی سەرکردەیە خۆشەویست دەبن لای سەربازەکان، پێغەمبەر -ﷺ- زۆر بەسۆز بووە، دڵی سوتاوە بۆ سەربازو شوێنکەوتوانی، ئەو کۆچی نەکردو دەرنەچوو لە ماڵ تا زۆربەی هاوەڵانی کۆچیان نەکرد و دەرنەچوون، کەس نەما جگە لە هەندێ بێ دەسەڵات و چەوساوە یان هەندێ لەوانەی کاری تایبەتیان لەکۆچدا پێ سپێررا بوو[3].

---

[1] الهجرة النبوية لابن فارس، لا ٥٤.
[2] الحركة السنوسية للصلابى (٧/٢).
[3] الهجرة النبوية لابى فارس، لا٥٤.

شایانی باسه ئم خۆشەویستی یەی ئەبوبەکر –خوای لیّ رازی بی- بۆ پیّغەمبەری خوا -ﷺ- تەنها لەبەرخوا بوو، بەوەشدا دەزانین کە خۆشەویستی لەبەر خوابیّ یان لەبەر خوا نەبیّ، ئەبوبەکر پیّغەمبەری خوای خۆش ویستووە، بەلاّم تەنها لەبەر خاتری خوا، بەلاّم ئەبو تالیبی مامی خۆشی دەویست وسەری دەخست و دەیپاراست بەلاّم لەبەر ئارەزوویەکی خیّلاّیەتی و خزمایەتی، خوای عزوجل لە ئەبوبەکری وەرگرت و دەربارەی ئایەتی قورئان دابەزی و فەرمووی:

(وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ ).[1] واتە:

سزای دۆزەخ دور دەبیّت لە تەقواداران، ئەوانەی مالّیان بەزەکات دەبەخشن و هەر بەخششیّك ببەخشیّت تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا دەیبەخشیّ و خوایش لیّی رازی دەبیّت).

بەلاّم "ئەبو تالیب" ئەو خۆشویستنەی لیّ وەرنەگیرا و بەلّکو بردیشی یە نیّو ئاگرەوە، چونکە هاوەلّ پەیدا کەر بوو بۆ خودا کاری بۆ غەیری خوا دەکرد،

بەلاّم ئەبوبەکر بەتەمای پاداشت نەبوو لەکەس، نە لە پیّغەمبەر -ﷺ- و نە لەغەیری ئەویش، بەلّکو باوەڕی پیّ هیّنابوو، خۆشی ویستبوو، پشت و پەناو کۆمەکی بوو، ئەمەش تەنها بۆ خاتری خۆ نزیك کردنەوە لە خوا بوو، بەتەمای پاداشتی خوا بوو، پەیامی خوای دەگەیاند، فەرمانەکانی، بەرگری یەکانی پەیمانی پاداشت و پەیمانی سزای.[2]

پیّنجەم/ نەخۆشکەوتنی ئەبوبەکر –رضي الله عنە- لەمەدینە لەسەرەتای کۆچکردندا

کۆچکردنی پیّغەمبەری خوا -ﷺ- و هاوەلّەکانی لە شاری مەککەی پیرۆز -بلد الامين- و بۆ مەدینە قوربانی دانیّکی زۆر گەورە بوو کە پیّغەمبەر لە فەرموودەیەکدا دەری دەبڕیّت (والله انك لخير أرض الله واحب ارض الله الى الله، ولولا انى أخرجت منك ما خرجت)[3] واتە:

[1] الليل–ئايەتی ١٧–٢١.
[2] الفتاوى لابن تيمية، (٢٨٦/١١).
[3] الترمذي كتاب المناقب باب فضل مكة (٧٢٢/٥) ژمارە، ٣٩٢٥.

سوێند بەخوا تۆ (ئەی شاری مەککەی پیرۆز) باشترین پارچە زەوی خودای و خۆشەویست ترین پارچە زەوی خودای لەلای خودا، ئەگەر دەریان نەکردمایە هەرگیز لێت دەرنەدەچووم.

عائیشە -خوای لێ رازی بێ- دەڵێت (کاتێ پێغەمبەری خوا -ﷺ- پی پیرۆزی نایە شاری مەدینە، لەوکاتەدا مەدینە لە هەموو جێ یەك زیاتر پەتای لەرزوتای تێدا بڵاوبوو، ئاوی دۆڵەکانی بۆنیان گۆڕابوو، هاوەڵانی پێغەمبەر -ﷺ- تووشی نەخۆشی و هەندێ پەتا بوون تەنها خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەو پەتایە پاراست.

عائشە دەڵێت: ئەبوبەکر و عامیری کوڕی فەهیرە و بیلال تووشی ئەو پەتایە بوون، ڕوخسەتم لە پێغەمبەری خوا -ﷺ- خواست کە سەریان لێ بدەم، ڕێگەی پێدام، ڕۆشتم سەردانم کردن و ئەوەش پێش ئەوەبوو حیجاب فەرز ببێت، مەگەر خوا بزانێت چەندێ لەرزووتایان هەبوو، لە ئەبوبەکر نزیك بوومەوە و ووتم: باوکەگیان ئێستە چۆنی؟ ئەویش ئەم دێڕە شیعرەی ووت:

كل امرئ مصبح في أهله　　　والموت أدنى من شراك نعله

دەڵێ: ووتم: سوێند بە خوا باوکم نازانێ ئەڵێ چی، پاشان لە عیمر نزیك بوومەوە و پێم ووت: عامیر ئەی تۆ چۆنی؟ ئەویش بەهۆنراوەوە ووتی: خەریکە دەمرم و وتی:

لقد وجدت الموت قبل ذوقه　　　إن الجبان حتفه من فوقه
كل امرئ مجاهد بطوقه　　　كالثور يحمى جلده بروقه

دیسان ووتم: سوێند بەخوا ئەمیش نازانێ چی دەڵێ، بیلالیش هەرکاتێ تاکە بەری بدایە ئەچووە حەوشەکەو ڕادەکشاو بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد:

الا ليت شعرى هل أبتنى ليلة　　　بوادٍ وحولي إزحز وجليل
وهل أردَنْ يوماً حياة مجنةٍ　　　وهل يبدون لي شامه و طفيل

عائشە -خوای لێ رازی بێ- دەڵێت: پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (اللهم حبِّبْ الينا المدينة كما حببت إلينا مكة، او أشد، وصححها وبارك لنا في صاعها وحدها، وانقل ممّاها واجعلها بالجحفة) واتە: خوایە شار مەدینە خۆشەویست بکە لەلامان وەك خۆشەویستیمان بۆ شاری مەککەو بەڵکو زیاتریش، خاوێنی بکە لە دەردو بەلا و بەرەکەت بخەرە ناو رزق و ڕۆزییان و ئەم لەرزو تایەی تیا هەڵگرەو بیگۆڕەرەوە بۆ دۆڵی (جەحفە).

عائشه دەڵێت: مەسەلی سەردانەکەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا و پێغەمبەریش -ﷺ- فەرمووی (اللهم حبب الينا المدينة كحبنا مكة او اشد، وصححها و بارك لنا في مدها وصاعها، وانقل حماها واجعلها بالمحفة).[1]

خوای گەورەش هات بەدەم نزاکەی پێغەمبەرکەیەوەو هەموو موسڵمانەکان ئەو نەخۆشیەیان پەڕاند، و شاری مەدینەش بوو بە نیشتمیمانێکی نایاب بۆ هەموو ئەو کەسانەی ڕوویان تێ دەکرد و کۆچیان بۆ دەکرد لە هەر ولاتێك و لەهەر ئاوو هەوایەکەوە بوایە..

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا لەشاری مەدینە دامەزرا دەستی کرد بە دامەزراندنی پایەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، برایەتی خستە نێوان کۆچەریان و پشتیوانان، پاشان مزگەوتی دروست کرد، و پەیمان نامەی لەگەڵ جولەکەکانی مەدینە دا مۆر کرد، و دەستی کرد بە خستنەگەڕی پەل و لقە جیهادیەکان، و گرنگی دا بەدامەزراندنی لایەنی ئابوری و زانستی و پەروەردەیی لەکۆمەڵگەی نوێدا، ئەبوبەکریش -خوای لێ رازی بێ- بوو بە وەزیرێکی ڕاستەقینەی دەستە ڕاستی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و هاوڕێی بوو بۆ هەموو جێگایەك، و لەخۆی لە هیچ دیمەن و هەڵوێستێك نەشاردۆتەوەو ڕژدی نەکردوە لە پێشکەشکردنی ڕاوێژ و سامان و ڕادەربڕین.[2]

## جێ باسی چوارەم:

### ئەبوبەکری صدیق - خوای لێ رازی بێ - لەگۆڕەپانی جەنگدا:

هەموو زانایانی مێژوونووس و ژیاننامە دارەکان -السيره- باس لەوە دەکەن کە ئەبوبەکر - خوای لێ رازی بێ - بەشداری جەنگی بەدر و هەموو جەنگەکانی تریش کردووە و یەك جەنگی لە دەست دەرنەچووە، لەپشت پێغەمبەری خواوە مایەوە لە جەنگی ئوحوددا کە هەموو خەڵکی پاشەکشەیان کرد، و پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەرۆژی تەبوك دا ئالای مەزنی ئیسلامی دایە دەستی کە ئالایەکی ڕەش بوو.[3]

---

[1] البخاری، کتاب الدعوات، باب الدعاء يرفع الوباء والوضع، **ژماره (٦٣٧٢)**.
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام في عهد الخلفاء الراشدين، لا ١٢١.
[3] الطبقات الكبرى (١٢٤/١) صفة الصفوة (٢٤٢/١).

(ابن كثير) دەڵێت: زانایانی ژیاننامە هەموو لەسەر ئەوەن کە ئەبوبەکری صدیق — خوای لێ رازی بێ - لەیەك نەبەردیدا لەپێغەمبەری خوا دوانەکەوتووە و هەمیشە بەشداریی کردووە.[1]

زەمەخشەری دەڵێت: ئەو —مەبەستی ئەبوبەکرە- خوای لێ رازی بێ - هەمیشە لە پێغەمبەر جیانەبووەتەوە، بە منداڵی هاوڕێی بووە، بەگەورە یش سامانەکەی خستە پێناوی، بەولاخی خۆی و لەسەر ئەرکی خۆی گەیاندی یە مەدینە، بەدرێژایی تەمەن لە پێناویدا ماڵەکەی بەخشیوە و کچەکەی خۆی پێدا، و بەردەوام لە ناوشار و لەسەفەردا هەر لەگەڵی بووە، و کاتێکیش کۆچی دوایی کرد لە ژورەکەی عائشە —خۆشەویست ترین خێزانیدا- ئەسپەردەی خاکی کرد.[2]

لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دەگێڕنەوە دەڵێت (لە حەوت غەزادا لەگەڵ پێغەمبەردا بەشداریم کردووە، لەگەڵ ئەو لقە جیهادیانەی —سرایا- دەری دەکرد نۆ جار بەشداریم کردووە، جارێك ئەبوبەکر ئەمیرمان بوو، جارێك ئوسامە.[3]

لەم جێ باسەدا هەوڵ دەدەین بەوردی لەگەڵ ژیانی ئەبوبەکری صدیق دا — خوای لێ رازی بێ - بڕوین تالاپەڕە جیهادیەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا -ﷺ- هەڵبدەینەوە، تا ببینین چۆن جیهادی کردوە بە گیان بەو سامان و ڕاو مشوەرەت لە پێناو سەرخستنی ئاینی خوای گەورەدا.

یەکەم/ ئەبوبەکر — خوای لێ رازی بێ - لەجەنگی بەدری گەورەدا:

ئەبووبەکر لەساڵی دووەمی کۆچیدا بەشداری جەنگی بەدری کرد و کۆمەڵێ هەڵوێستی مەشهوریشی نواندووە لەوانە:

١-ڕاوێژکردنی جەنگ:

کاتێ هەواڵی لەدەست دەرچوونی قافڵەکە و سوربوونی بێباوەڕانی قورەیش لەسەر جەنگ دژی پێغەمبەر -ﷺ- راوێژی بەهاوەڵەکانی کرد لەو بارەیەوە.[1] ئەبوبەکر هەستایە سەرپێ و قسەی خۆی کرد و جوانی فەرموو، پاشان عمر هەستایەوە و قسەی خۆی کرد وجوانی فەرموو).

---

[1] اسد الغابة (٣/١١٨).
[2] خصائص العشرة الكرام البررة، لا ٤١.
[3] البخاري كتاب المغازي، باب بعث النبي -ﷺ- اسامة، **ژمارە** ٤٢٧٠.

٢-دەرچوون بۆ سۆراخی دوژمنانی:

پێش دەستپێکردنی جەنگی بەدر پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاوڕێ لەگەڵ ئەبوبەکردا دەستیان کرد بە گەڕان بۆ سوراغی سوپای بتپەرستەکان و ئاشکراکردنیان،، لەکاتی گەڕانیاندا بەو ناوچانەدا گەیشتن بە شێخێکی عەرەب، پێغەمبەری خوا -ﷺ- لێی پرسی دەربارەی سوپای قورەیش و دەربارەی محمد و هاوەڵەکانی و چی دەزانێ لەو بارەیەوە؟

شێخەکەش ووتی: پێتان نالێم تا پێم نەلێن ئێوە کێن؟ پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێی فەرموو: (ئەگەر پێمان بلێیت، پێت دەلێین) (إذا أخبرتنا أخبرناك). شێخەکە ووتی: بیلێم، دەیلێین؟ فەرمووی: (بەڵێ).

شێخەکە ووتی: هەواڵیان پێ داووم کە محمد و هاوەڵەکانی لەڕۆژی ئەوەندەو ئەوەندە دەرچوون، ئەگەر ئەوەی هەواڵەکەی پێ ووتووم ڕاست بکات، ئێستا گەیشتوونەتە فلان شوێن و فلان شوێن، و هەواڵیشم پێ گەیشتووە کە قورەیش لەڕۆژی ئەوەندە و ئەوەندەوە لە ماڵ دەرچوون ئەگەر هەواڵ هێنەرەکە ڕاست بکات ئەوە ئێستا گەشتوونەتە فلان شوێن و فلان شوێن، هەروایش بوو.

پاشان پێی ووتن: ئەوەی ویستتان پێم ووتن، دەی پێم بلێین ئێوە کێن؟ پێغەمبەری خوا -ﷺ-: (نحن من ماء) ئێمە خەڵکی ئاوین، و پاشان پێغەمبەر و ئەبوبەکر کابرای عەرەبیان بەجێ هێشت، کابرایش لە شوێنی خۆیدا ووشك بوو، بەدەم خۆیەوە دەی ووت: خەڵکی کام ئاون؟ تۆ بلێی ئاوی عێراق بێ؟.[2]

لەم ڕووداوەوە دەردەکەوێت کە (صدیق) — خوای لێ ڕازی بێ - چەندێ لە پێغەمبەری خواوە -ﷺ-نزیك بووەوەو ئەبوبەکر لە پێغەمبەرەوە -ﷺ- چەندان وانە فێربووە.

٣-پاسەوانی کردنی پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەناو کەژاوەکەیدا:

کاتێ پێغەمبەر -ﷺ- ڕیزەکانی ڕێك و پێك کرد بۆ جەنگ، گەڕایەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتی، کە بریتی بوو لە کەپرێك بەسەر گردۆلکەیەکەوە دروستیان کردبوو کە دەیڕوانی

---

[1] صحيح البخاری ژمارە ٣٩٥٢.

[2] سيرة ابن هشام (٢/٢٢٨).

بەسەر بەرەکانی جەنگدا و ئەبووبەکر و دەستەیەك لە لاوانی پشتیوانان بەسەرۆکایەتی سەعدی کوڕی مەعاز – خوای لێ ڕازی بێ - لە دەوروپشتی پێغەمبەر بوون و دەیانپاراست.[1]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب – خوای لێ ڕازی بێ - باسی ئەم هەڵوێستە دەکات و دەڵێت: خەڵکینە کێ ئازاترین کەسە؟ ووتیان: تۆ ئەی گەورەی باوەڕداران، ووتی: من کەس بەرامبەرم نەوەستاوەو چاری نەکەم بەڵام ئەو ئازایە ئەبوبەکرە ئێمە کەپرێکمان بۆ پێغەمبەری خوا -ﷺ- دروست کردبوو، ووتمان: کێ پاسەوانی ئەم کەپرەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەگرێت بۆ ئەوەی بتپەرستەکان نزیکی نەبنەوە؟

سوێند بە خوا کەس لێی نزیك نەبوویەوە تەنها ئەبوبەکر نەبێت، کە شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێناو بەڕاسەری پێغەمبەری خواوە وەستاو هیچ کەسێ لە سوپای بتپەرستان نزیك نەدەبوویەوە ئەم پەلاماری دەداو خۆی بۆ هەڵدەدا.[2]

٤-(صدیق) موژدەی سەرکەوتن دەدات بەتەنیشتی پێغەمبەرەوە دەجەنگێ دوای ئەوەی هەموو هۆکارێکی جەنگی گرتەبەر، پاشان ڕووی کردە خوای گەورە و لێی دەپاڕایەوە و داوای ئەو سەرکەوتنانەی لێ دەکرد کە پەیمانی پێ دابوو و لە دوعاکانیدا دەیووت (اللهم أنجزلي ماوعدتني، اللهم ان تهلك هذه العصبة من اهل الاسلام فلا تعبد من الارض أبداً).

ئەوەندە دەپاڕایەوە و نزای دەکرد تا عەبا لەسەرشانی کەوتە خوارەوەو تا ئەبوبەکر هەڵی گرتەوەو دایەوە بەسەر شانیدا پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا بەسە ئەوەندە هاوار کردنت لە خوای گەورە، خوا هەموو پەیمانەکانیت بۆ دەباتە سەر.[3]

خوای (عزوجل)یش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ) واتە: لەخوای گەورە لاڵانەوە و خوایش هات بەدەمتانەوە.

لەگێڕانەوەیەکی (إبن عباس)دا – خوای لێ ڕازی بێ - هاتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەڕۆژی بەدردا دەیگوت: (اللهم انشدكَ عهدك ووعدك الله ان شئت لم تعبد) واتە: ئەی خوایە داوای جێبەجێکردنی بەڵێنەکانت لێ دەکەم، ئەی خوایە ئەگەر بتەوێت هەرگیز

---

[1] سيرة ابن هشام (٢/٢٣٣).
[2] البداية والنهاية (٣/٢٧١-٢٧٢).
[3] مسلم كتاب الجهاد، باب الامداد بالملائكة ببدر، **ژمارە ١٧٦٣** (٣/١٣٨٤).

ناپەرستریێت واتە ئەگەر دەتەوێت بپەرستریێت سەرمان بخە، لەو کاتەدا ئەبوبەکر دەستی گـرت، ووتی: خوات بەسە، پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەرچوو بۆ ناو موجاهیدان بەدەم خۆیـەوە دەیـووت (سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ).[1] واتە: پێڕی قورەیش تێك دەشكێت و بەرەو دواوە هەڵدێنەوە.[2]

پێغەمبەری خوا لەناو کەژاوەکەیدا خەوەنوچـکەیەك بردیـەوە و هەرکـە خەبـەری بوویـەوە فەرمووی: (ابشر يا ابابكر اتـاك نـصر الله، هذا جبريل آخذ بعنـان فرسـه يقوده علـى ثنايـاه النقع) واتە: مژدەبێ ئەی ئەبوبەکر سەرکەوتنت بۆ هات، ئەمە (جبرئيـل)ەو ڕەشـۆی ولاخەکـەی گرتووەو گشت گیانی تۆزاویە) پاشان پێغەمبەری خوا -ﷺ- چووە ناو خەڵکەکەو هـانی دەدان بۆ جەنگ.[3]

ئەبوبەکر — خوای لێ رازی بێ - لەم هەڵوێستەوە وانەیەکی خوایی گرنگ فێربوو لـەبواری خۆ یەکلایی کردنەوەو خۆ پارێزی و دڵسۆزی و پـەنابردن بەتـەنها بـۆلای خـواو چـۆك دادان لـە بەردەمیدا، تا سەرکەوتن بنێرێت، ئەم دیمەنە لە مێشکی —صديق-دا ڕەگی داکوتابوو، لەناو دڵ و ویژدانیدا پاراستبووی و چاوی لەپێغەمبەری خوا دەکرد لەجێ بەجێ کردنیدا لەئاوا ساتێکدا و لە ئاوا جێگایەکدا، و ئەم دیمەنە گرنگەش وەك وانەیەك مایەوە بۆ هەموو سەرکردەو فەرمانڕەواو پێشەواو تاکێـك کـە بیـەوێت شـوێن پێـی پێغەمبـەری ئـازیز -ﷺ- و هاوەڵـە شـیرینەکانی هەڵبگرێت.

هەرکە جەنگەکە گەرم بوو، بوو بە دەستەو یەخە، پێغەمبەری خوا هاتـە نـاو خەڵکەکـەو هانی دەدان تا بجەنگن و موسڵمانەکانیش لەریزەکانیانەوە یادی خوای —تـەعالا-یـان دەکـرد، و خۆیشی دەجەنگا زۆر بە توندی و لە تەنیشتیەوە (صديق) دەجەنگا.[4] وەك سەربازێکی بەجـەرگ و بێ وێنە، و ئامادەش بوو ڕوو بەڕووی هەموو بێ باوەڕێك بووەستێت ئیتر بـا کـوڕی خۆیـشی بوایە.

---

[1] القمر، ٤٥.
[2] البخاری كتاب المغازی باب عصة بدر (٦/٥)، **ژمارە ٣٩٥٣**.
[3] السيرة النبوية لابن هشام (٤٥٧/٢) نقلاً عن تأريخ الدعوة، لا ١٢٥.
[4] البداية والنهاية (٢٧٨/٣).

(عبدالرحمن)ی کوڕی لەڕیزی بێ باوەڕاندا دەجەنگاو یەکێ بوو لە ئازاو سوارچاکەکانی عەرەب، دەستڕاست ترین کەس بوو لە تیر ئەندازیدا لەناو قورەیشیەکاندا، کاتێ موسڵمان بوو بەباوکی ووت: لەرۆژی بەدردا کەوتبویتە ناو قەرەوڵم و جوان دیاربووی لێمەوە بەڵام خۆم لێ لادایت و نەم کوشتی، ئەبوبەکر — خوای لێ رازی بێ - پێی ووت: ئەگەر تۆ دەکەوتیتە قەرەوڵم خۆم لێ لانەدەدایت.[1]

٥-ئەبوبەکری صدیق و دیلەکان:

(إبن عباس) — خوای لێ رازی بێ - دەڵێت: (هەرکە کۆمەڵێ دیل -لەجەنگی بەدر- داگیرا پێغەمبەری خوا -ﷺ- روی کردە ئەبوبەکر وعمر و لیێی پرسین (ماترون في هؤلاء الاسارى؟) ئەبوبەکر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە هەموو ئامۆزاو هۆزو تیرەی خۆمانن، من پێموایە بەرامبەر -پارە- بەرەڵایان بکەیت تاخۆمانی پێ بەهێزبکەین لە جەنگی بێ باوەڕاندا و بەڵکو خوای گەورەیش ڕێنماییان بکات بۆ موسڵمان بوون.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- بە عمری فەرموو (ماترى يا ابن الخطاب؟) ئەی تۆچی دەڵێیت ئەی عمری کوڕی خەتاب؟. ئەویش ووتی: نەخێر سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- من ئەو ڕایەی ئەبوبەکرم نی یە، بەڵام من دەڵێم سەرکەوتوویت بەسەریاندا با بدەین لە گەردنیان، عوقەیل بدەرە دەستی عەلی برای تا لەملی بدات و فلاّن کەسی زاوایشم بدەرە دەستی من لە ملی ئەدەم، ئەوانە سەران و پێشەوایانی بێ باوەڕین.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- ڕاوبۆچوونەکەی ئەبوبەکری قبوڵکرد و ئەوەی منی ڕەت کردەوە، لەڕۆژی داهاتوودا هاتم دەبینم پێغەمبەری خواو ئەبوبەکری صدیق دانیشتوون و دەگرین، وتم ئەی پێغەمبەری خوا، بۆم باس بکە هۆی چی یە تۆ و هاوڕێکەت دەگرێن ئەگەر گریانم هات دەگریم و ئەگەر گریانیشم نەیت بەزۆر خۆم دەگرێنم بۆ گریانەکەی ئێوە.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (ابكي للذي عرض عليَّ اصحابك من اخذهم الفداء، ولقد عرض عليّ عذابهم ادنى من هذه الشجرة) واتە: بۆ ئەوە ئەگریم کە بەقسەی پێشنیاری هاوڕێکانتم کرد و بەرامبەر -پارە- دیلەکانم بەرەڵا کرد، سزای ئەو بۆچوونەیان ئا لەم درەختەی

---

[1] تأريخ الخلفاء للسيوطي، لا ٦٤.

بەردەمم نزیکتر بوویەوە لێم) و خوای گەورەیش ئایەتی نارده خوارەوەو فەرمووی: (مَا كَانَ لِنَبِيّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ... تا ... فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلالاً طَيِّبًا).[1] واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێ نییە ئەسیر بگرێتە خۆ تا جێگیرنەبن بەتەواوی لەسەر زەوی.. تا.. ئەو دەستکەوتانەی گرتووتانە حەڵاڵتانەو بیخۆن) ئا لەوێدا -غەنیمە- حەڵاڵ کرا.

لەگێڕانەوەیەکدا لە عبداللە ی کوڕی مەسعودەوە - خوایان لێ رازی بێ - کەووتوویەتی: لەپاش تەواوبوونی جەنگی بەدر پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمووی: (ماتقولون في هؤلاء الأسرى؟). ئێوە چی دەڵێن: چی بکەین لەم دیلانە؟ ئەبوبەکر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە کەسی خۆتن و نەتەوەی خۆتن لێیان بووەستەو بیان هێڵەوە بەڵکو خوای گەورە لێیان خۆش ببێت-موسڵمان بن.

و عمریش ووتی: ئەی پێغەمبەر -ﷺ- شاربەدەریان کردی و بەدرۆیان خستیتەوە و ئێستا هاتوونەتە بەردەستت بدە لە ملیان.

عبداللە ی کوڕی ڕەواحە - خوای لێ رازی بێ - ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا با کام دۆڵ داری زۆر تێدایە بیانبەین بۆ ئەوێ و بیانسوتێنین.. (إبن عباس) - خوایان لێ رازی بێ - پێی ووت: خزمایەتی و سیلەی ڕەحمت نەهێشت. پێغەمبەری خوا -ﷺ- ڕۆشتە ژوورەوە هیچی نەووت.

هەندێ دەیانووت: ڕاکەی ئەبوبەکر وەردەگرێت، هەندێ تر دەیان ووت: ڕایەکەی عمر وەردەگرێت و هەندێکی تریش ووتیان: بەقسەی عبداللە ی کوڕی ڕەواحە دەکات.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- پاش کەمێ لە خێمەکەی هاتە دەرەوەو فەرمووی: (ان الله ليلين قلوب رجالٍ فيه حتى تكون ألين من اللبن، وان الله ليشد قلوب رجال فيه حتى تكون اشد الحجارة، وان مثلك يا ابابكر كمثل عيسى -عليه السلام- إذ قال (إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ

[1] الانفال، ٦٨-٦٩.

وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ)[1] وان مثلك يا عمر كمثل نوح اذ قال (وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ )[2]

وان مثلك يا عمر كمثل موسى إذ قال (وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلاَ يُؤْمِنُوا حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الأَلِيمَ[3])[4]

واته خوای گەورە دڵی پیاوانێك نەرم دەكات تاوایان لێ دێ وەك نەرم تر لە ماس، و خوای گەورە دڵی پیاوانێك ڕەق دەكات بەجۆرێ لە بەرد ڕەق تر، وێنەی تۆ ئەی ئەبوبەكر وەك عیسى –علیه السلام- وایە كە فەرمووی (ئەگەر سزایان بدەیت بەندەی خۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش بیت تۆ زاڵ وكار دروستیت).

وێنەی تۆش ئەی عمر وەك نوح –علیه السلام- وایت كە داوای كرد لە خوای گەورە و فەرمووی: (خوایە یەك بێ باوەڕ لەسەر زەویدا مەهێڵە و هەموویان بكوژە)، هەروەها نمونەی تۆ وەك موسایە كاتێ ووتی ئەی خوایە تۆ ماڵ و سامانی زۆرت ڕشتووە بەسەر فیرعەون و دارو دەستەكەیدا و ئەی خوایە ئەوانیش خەڵكی پێ گومڕادەكەن خوایە سامانەكەیان لەناو بەرەو دڵیان ڕەق بكە تا باوەڕ نەهێنن تا بە ئاگری دۆزەخ شاد دەبن).

پێغەمبەری خوا -ﷺ- هەركاتێ ڕاوێژی بەهاوەڵەكانی بكردایە –ڕووی لە ئەبوبەكر دەكرد- و ئەو یەكەم كەس بوو ڕای خۆی دەدا، لەوانەیە خەڵكانی تریش ڕای خۆیان دەربڕیبێ یان نا، بەو ڕایەی ئەوی دەكرد، ئەگەر ڕایەكەی پێچەوانەی ڕایەكانی تر بوایە، ڕاكەی ئەوی وەردەگرت.[5]

دووەم: لە (ئوحود) و (حەمرائولئەسەد)دا

---

[1] المائدة، ١١٨.
[2] نوح، ٢٦.
[3] يونسف، ٨٨.
[4] مسلم كتاب الجهاد والسير، ژمارە١٧٦٣(١٣٨٥/٣). مسند امد (٢٧٣/١).
[5] ابوبكر الصديق ، محمد مال الله لا (٣٣٥).

لەجەنگی ئوحوددا موسڵمانەکان دەرسێکی تاڵیـان چەشـت، چـونکە وا شـپرز بـوون لـە پێغەمبەری خوا بڵاوەیان کرد و لەناو گۆڕەپانی جەنگەکەدا پـرش و بـڵاو بوونـەوە و هـەواڵیش بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- کوژراوە، لەم کاتەدا هـاوەڵان کاردانـەوەیان هەریەکـەو بەجۆرێك بوو، گۆڕەپانەکە زۆر فراوان بوو، هەر یەکەو بە خۆیەوە خەریك بوو، ئەبوبـەکر بەپەلـە خەڵکەکەی لاداو خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا -ﷺ- و کۆمەڵێ هـاوەڵی بـەڕێز دەوریـان لێ گرت کە ئەمانە بوون:

ئەبوبەکر، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، علی، طلحـه ، زوبـیر، عمـری کـوڕی خـەتتاب، حارس ی کوڕی صەحمە، ابو دوجانە، سەعدی کوڕی ئـەبی وقـاص، کەسـانێکی تـریش، لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا بە دۆڵەکەی کێوی ئوحوددا جولاًن تا هـەواڵی گەڕانـەوەی هێـزی سـەربازی و دەروونی موسڵمانەکان بدەن.[1]

ئەبوبەکری صدیق – خوای لێ ڕازی بـێ - هـەرکاتێ باسـی ئوحـودی بکردایـە دەیـووت: بەڕاستی ڕۆژ ڕۆژی (طلحـه)بوو و پاشان دەیووت: من یەکەم کەس بووم گەڕامەوە، بینیم پیاوێك لە پێناوی خوادا دەجەنگێت و بەرگری لە پێغەمبەر -ﷺ- دەکات، طلحة یە، ئەوەی لەدەسـتم چوو چوو، لەنێوان من و بتپەرستەکاندا پیاوێك هەبوو نەم ئەزانی کێ بوو بەڵام من نزیك تر بووم لە پێغەمبەری خواوە -ﷺ-، هەنگاوی زلزلی دەنا من نەدەگەشتمەوە پێـی دا، ئـەبینم ئـەبوو عوبەیدەیە، گەشتینە لای پێغەمبەر -ﷺ- دەبینین هـەردوو دانـی پێـشەوەی شـکابوو، دەم و چاوی بریندار بوو، دوو حەلقەی کەمان چەقیبوونە ڕوومەتی پیرۆزی.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێی وتین: فرای هاوڕێکەتان بکەون مەبەستی طلحة بوو -خ- کـە بەردەوام خوێنی لێ دەڕۆشت، ئێمە گوێمان بەقـسەی نـەداو ڕۆشـتم، ئـەو هەڵقانـە لـە کـوڵمی دەرێنمە دەرەوە، ئەبو عوبەیدە هاواری کرد بەسەرمدا و پێی ووتم: سـوێندت ئـەدەم ئـەو مافـە بەمن بدەو وازی لێ بهێنە بۆمن، منیش وازم لێ هێناو ئەویش پێی ناخۆش بوو بەدەسـت دەری بهێنێ و ئازاری هەبێ بۆ پێغەمبەری خوا -ﷺ- بـۆ دەمـی بـرد و بەدانـەکانی و هەڵقەیـەکی یەکەمی دەرهێناو دانە برندەکەی تریشی کەوت، بەو شێوەیەش هەرجوانترین کـەس بـوو، پـاش

[1] مواقف الصديق مع النبى -ﷺ- في المدينة، د.عاطف لمافة، لا ٢٧.

ئەوەی لەچارەسەرکردنی پێغەمبەر -ﷺ- بووینەوە لامان کردەوە بەلای (طلحة)دا کە لەناویەکێ لە چاڵەکاندا کەوتبوو نزیکەی حەفتاو شتێ برینی پێوە بوو لەتیر و شمشێر و ڕم، دەبینم پەنجەکانی قرتابوو، ئێمەش چارەسەرمان کرد.[1]

پلەو پایەی بەرزی ئەبووبەکر لەجەنگی ئوحود دا لە هەڵوێستی ئەبوسوفیاندا دەردەکەوێت کاتێ پرسیاری کرد ووتی: ئایا محمد ماوە؟ سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر -ﷺ- نەیهێشت وەڵامی بدەنەوە، پاشان ووتێ: ئەی کوڕی ئەبو قوحافەتان تێداماوە؟ سێ بارەی کردەوە، پاشان ووتێ: ئەی کوڕی خەتتابتان تیاماوە؟ سێ جار، پاشان گەڕایەوە ناو برادەرەکانی ووتی: دیارە ئەو سیانە مردوون.[2]

ئەمش ئەوە دەگەیەنێت کە سەرکردەی بێ باوەڕان —ئەبوسوفیان کە کۆڵەکەو بناغەکانی پێغەمبەری خوا -ﷺ- و ئەبوبەکر و عمره — خوایان لێ ڕازی بێ - وا کوژراون.[3]

لەکاتێکدا کە بتپەرستان دەیان ویست دەست بگرن بەسەر ئیسلامداو موسڵمانان لەبن بێنن، پلان و نەخشەی پێغەمبەری ئازیز -ﷺ- پێشیان کەوت و فێڵ و فڕی هەڵوەشاندنەوە. پێغەمبەری خوا دوای ئەو هەموو کوشتار و برینە سەختانەی لەموسڵمانان کەوت لەجەنگی ئوحوددا پێی ووتن کێ ئامادەیە شوێنیان بکەوێت و موسڵمانەکانیش لەو ساتە وەختە ناڕەحەت و دژوارەدا گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوایان کرد و کەوتنە دوای بتپەرستەکانی قورەیش.

لە عائیشەوە — خوای لێ ڕازی بێ - دەگێڕنەوە کە بە عوروەی کوڕی زوبێری وتووە: فەرمایشتی خوای تەعالا کە دەفەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾﴾[4] واتە ئەوانەی هاتن بەدەم داواکاری خواو پێغەمبەرەکەیەوە پاش ئەوەی دووچاری شکست و دژواری بوون بۆئەوانەیان چاکەکار و لەخواترسن پاداشتی گەورە هەیە، باوکت یەکێ بوو لەوکەسانە ئەی خوشکەزای خۆم، زوبێر و

[1] محنة المعبود (١٩/٢) نقلاً عن التاريخ الدعوة الاسلامية ، لا ١٣٠.
[2] الفتح (١٨٨/٦) الفتح (٤٠٥/٧).
[3] مواقف الصديق مع النبي -ﷺ- في المدينة. د.عاطف لماضه، لا ٢٨.
[4] آل عمران، ١٧٢.

ئەبوبەکر کاتێ پێغەمبەری خوا لەجەنگی ئوحوددا تووشی ئەوەبوو کە بوو پاشان سوپای بتپەرستەکان ڕۆشتنەوە لەوە ترسا نەبادا بێنەوە فەرمووی: کێ ئامادەیە بکەوێتە شوێنیان؟ حەفتا پیاو ئامادەیی دەربڕی ئەبوبەکر وزوبێر یەکێ بوون لەوانە.[1]

سێ یەم/ لەغەزاکانی (بەنو نەزیر) و (بەنو موستەلەق) و (خەندەق) و (بەنو قورەیزەدا)

أ/پێغەمبەری خوا -ﷺ- ڕۆشت بۆ ناو بەنو نەزیر تاهاوکاری بکەن لە خۆشکردنی لەخوێنی ئەو دووکەسەی کە عەمری کوڕی ئومەییە لەبەنی عامر کوشتبوونی، چونکە عەمر نەیزانیبوو کە لەنێوان پێغەمبەری خواو بەنی عامردا پەیمان هەیە، و لەنێوان بەنی عامیر و بەنی نەزیریشدا عەهدو پەیمان هەبو، کاتێ چووە ناویان پێیان ووت: بەڵێ ئەی باوکی قاسم هاوکاریت دەکەین لەوەی تۆ پێت خۆشە، پاشان لەناو خۆیاندا بە دزیەوە بەیەکتریان ووت: ئەم پیاوە جارێکی تر ئاوا و بەم شێوەیە نایەتەوە بەردەستمان و لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا -ﷺ- لە سێبەری دیوارێکی ماڵەکانی ئەواندا دانیشتبوو، وتیان: کێ ئەچێتە سەریان و بەردێکی گەورە ئەخات بەسەریدا و لەکۆڵمانی دەکاتەوە؟ کەسێك بەناوی (عەمری کوڕی جەحاشی کوڕی کعب) ئامادەیی خۆی دەربڕی ووتی: من ئەیکەم، چووە سەربان تا بەردێکی گەورە بەربداتەوە بەسەری پێغەمبەری خوادا -ﷺ- وەك خۆی ووتی، و پێغەمبەری خوایش -ﷺ- لەناو هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو کە (ئەبوبەکر و عمر و علی) یان تێدابوو پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەئاسمانەوە لە نیازی گڵاوی جولەکەکانی بەنی نەزیر ئاگادار کراو خێرا هەستاو بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ، ئەوەبوو بەهاوەڵەکانی وتبوو ئێوە لێرە بمێننەوە من تا ئەولایە دەڕۆم و ئەوانیش دەستیان کرد بە گەڕان بە دوایدا تا کابرایەکیان بینی لە مەدینەوە هاتبوو، هەواڵی پێغەمبەریان لێ پرسی ئەویش ووتی: بینیم خۆی کرد بە مەدینەدا، ئەوانیش بەخێرایی هاتنەوە بۆلای و ئەویش -ﷺ- هەواڵی مەبەستی خیانەت کارانەی جولەکەکانی بۆگێڕانەوە.

پێغەمبەری خوایش -ﷺ- محمدی کوڕی سەلەمەی نارد بۆ ناویان تا ئاگاداریان بکات کە دەبێ بڕۆن و بەیەکجاری شاری مەدینە بەجێ بهێڵن، ئەوانیش خەڵکانی ناپاك و دوو ڕوو هانیان دان کە بمێننەوەو سەر لەماڵ و حاڵی خۆیان تێك نەدەن و پەیمانی سەرکەوتنیشیان پێ دەدان،

---

[1] مسلم ژمارە ٢٤١٨.

ئەوانیش دڵیان قایم بوو (حەی کوڕی ئەختەب) سوربوویەوە و کەسێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر و ئاگاداریان کرد کە دەرناچن، و پێیان ڕاگەیاند کە پەیمان و بەڵێن نامەکەی نێوانیشمان هەڵدەوەشێنینەوە، ئیتر پاش ئەوە پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمانی دەرکرد بۆ موسڵمانان کە هێرشیان بۆ بکەن و گەمارۆی قەڵاکانیان دا بۆماوەی پازدە ڕۆژ.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- خۆی ئامادە کرد بۆ جەنگ لەگەڵیاندا (إبن ام كلثوم)ی لەمەدینە لەجێی خۆی دانا، مانگی ڕەبیعی یەکەم بوو دەستی کرد بە بڕینی دارخورماکانیان و بۆماوەی شەش شەو گەمارۆی دان و لەو ماوەیەشدا ئایەتی حەرام کردنی مەی نۆشین هاتە خوارەوەو ئەوانیش لەناو قەڵاکانیاندا خۆیان قاییم کردبوو، دەستی کرد بە سوتاندنی دارخورماکانیان و پاشان ڕێك کەوتن لەگەڵیاندا کەیەکێ بارێ حوشتر شت و مەك و ئەوەی بەخۆیان هەڵدەگیرێ لەگەڵ خۆیان دا بیبەن و بەیەکجاری ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵن، و لەو بارەیەوە سورەتی (الحشر) دابەزی یە خوارەوە.[1]

ب/(بەنی موستەلەق) — (بنی مصطلق):

بەنو موستەلەق ویستیان بدەن بەسەر شاری مەدینەدا و پێغەمبەری خوایش -ﷺ- لەدووی شەعبانی ساڵی (٥)ی کۆچیدا، بە (٧٠٠) موجاهید لەهاوەڵەکانی یەوە بۆیان دەرچوو، کاتێ گەشتە ئەوێ ئاڵای کۆچەریانی دایە دەستی ئەبوبەکری صدیق و، هەندێ دەڵێت(عەماری کوڕی یاسر) و ڕایەی پشتیوانانی دایە دەستی سەعدی کوڕی عوباد، و پاشان فەرمانی دا بە (عمری کوڕی خەتاب) و ئەویش لەناو خەڵکەکەوە هاواری کرد و بانگی کردن بۆ شایەتومان هێنان و موسڵمان بوون تا گیان و ماڵیان سەلامەت بێ، ئەوانیش ملەجەڕێ یان کرد، دەستیان کرد بە تیر باران کردنی موسڵمانەکان.

پاشان پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمانی دەرکرد بۆیان و هەموو بەیەك جار هێرشیان کردە سەریان و دەکەسیان لێ کوشتن و ئەوانی تریشیان بە دیل گرت و موسڵمانەکانیش تووشی هیچ نەهاتن تەنها یەك کەسیان لێ کوژرا.[2]

---

[1] البخاری کتاب المغازی، باب حدیث بنی نظیر (٢١٧/٥) مغازی الواقدی.
[2] البدایة والنهایة (١٥٧/٤).

ج/له —خەندەق و بەنی قورەیزە (بنی قُریظة):

ئەبوبەکری صدیق -خوای لیّ رازی بیّ- لەدوو غەزاکەی پێشوودا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووەو بەشداری کردووەو لە جەنگی خەندەقیشدا بە جلەکانی خۆی خۆڵی هەڵدەگرت و دەیکردە دەرەوەی خەندەق، و لەگەڵ باقی هاوەڵاندا توانیان لە کەمترین کاتدا کاری هەڵکەندنی خەندەق بەدەوری مەدینەدا تەواو بکەن و بەشێوەیەك بیرۆکەی خەندەق ئامانجی خۆی پێکا لە پوچەڵکردنەوەی هێرشی سەرتاسەری بتپەرستان.[1]

چـــــوارەم: لە حودەیبییەدا

لەمانگی (ذی القعدة)ی ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەگەڵ (١٤٠٠) کەس لە هاوەڵەکانیدا بەمەبەستی سەردانی کەعبەی پیرۆز بەرەو شاری مەککە بەڕێکەوتن، قوربانی لەگەڵ خۆی بردبوو و لەڕێگەیش بەرگی تەوافی پۆشی (إحرام) تا خەڵکی زیاتر دڵنیا بکاتەوە کەبەمەبەستی جەنگ نی یەو خەڵکی بۆی دەربکەوێت کە دەیەوێت ماڵەکەی خوا بەرز ڕابگرێت و سەردانی بکات، کەسێکی بەپەنهانی نارد -کەخەڵکی خوزاعە- بوو تابزانیّ قورەیش چی دەڵێن، هاتەوەو هەواڵی پێدا کە قورەیش خۆی کۆ دەکاتەوە بۆشەڕ تا نەهێڵن سەردانی کەعبە بکات، پێغەمبەریش -ﷺ- فەمووی: ئادەی ڕێگە چارە دابنێن و ڕاوێژتان پیّ دەکەم، ئەبوبەکر =خوای لیّ رازی بیّ- ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لەماڵ دەرچوویت بەمەبەستی سەردانی ماڵی خواو مەبەستت شەڕ و کوشتنی کەس نی یە، بەردەوام بە لەسەر ئەو مەبەستەت وهەرکەسێك بێتە ڕێگەمان جەنگی لەگەڵ دەکەین.

پێغەمبەری خوایش -ﷺ- فەرمووی: (إمضوا على اسم الله) بڕۆن بەناوی خوای گەورەوە، پاشان قورەیش ڕقی هەڵساو هەر تێکچوون و سوێندیان خوارد کە نەهێڵن بەزۆر بێتە ناو مەککەوە، و پاشان ڕێککەوتن کرا لەنێوان خەڵکی مەککەو پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێغەمبەری خوا دانابوو خەڵکی مەککە هەر مەرج و داواکاریەك بکەن بۆیان جیّ بەجیّ بکات لەبەر کەسایەتی و سیلەی ڕەحم.[2]

---

[1] مواقف الصديق مع النبي في المدينة لا ٣٢.
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام، لا١٣٦.

١-لەڕێکەوتن نامەکەدا:

نوێنەرانی قورەیش هاتن بۆلای پێغەمبەر -ﷺ- و لەوایە یەکەم کەس (بەدیل ی کوڕی وەرقا ) بوو لە خوزاعە، پاش ئەوەی لەمەبەستی پێغەمبەری خواو هاوەڵان دڵنیا بوو گەڕایەوە بۆ مەککە، پاشان موکریزی کوڕی حەفص و پاشان حەلیسی کوڕی عەلقەمە پاشان عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی، لە وتووێژ لەگەڵ ئەم کەسەی دوایی دا ئەبوبەکر و هەندێ لە هاوەڵان ئامادەبوون.[1]

عوروە ووتی: ئەی محمد هەرچی خەڵکی هەرچی و پەرچی یە لە دەوری خۆت کۆت کردۆتەوەو هێناوتە تا بیاندەیت بە گژی کەس و کارەکەی خۆتدا و لەناویان بەریت؟ ئەوەش قورەیشە گەورەو بچوك ژن و پیاو خۆیان بۆ بەستوویت و پێستی پڵنگیان پۆشیوەو پەیمانیان داوە بە خوا کە نەهێڵن بە زۆر بێیتە ناو مەککە، ئەتوانم سوێند بخۆم لە بەرچاومە دەشکێیت و هاوەڵەکانیشت پشتت لێ هەڵدەکەن و ڕادەکەن!!.

ئەبوبەکر ووتی: عەورەتی لات بەدەمت، ئێمە ڕادەکەین و بەجێی دەهێڵین؟

عوروە ووتی: ئەمە کێ یە؟ ووتیان: ئەبوبەکر، ئەویش ووتی: ئەی بە ئەو خوایەی گیانی منی بەدەستە لەبەرچاکەو پیاوەتی یەکانت نەبوایە کە بەسەرمەوەیەو هێشتا عاوەزام نەداویتەوە، ئەم زانی چۆن وەڵامت ئەدەمەوە، بەڵێ ئەبوبەرکی صدیق – خوای لێ رازی بێ - پێشتر چاکەی بەسەریەوە هەبوو بۆیە ڕێزی لێ گرت ووەڵامی قسە ناخۆشەکەی نەدایەوە.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەم ڕووداوە بەبەڵگە دەخوات بۆ ئەوەی لەکاتی زۆر پێویست دا ڕاشکاوانە ئەتوانرێ عەورەت لە جنێودا بەکار بهێنرێت و ناشچێتە بەشی دەم پیسی یەوە کە لەموسڵمان قەدەغە کراوە.[2]

عوروە دەیوست جەنگی دەروونی لەگەڵ موسڵمانەکان دا بکات و لەدەروونەوە تێکیان بشکێنێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو باسی گەورەیی هێزی سەربازی قورەیشی کرد، و زیادەڕەوی بەڕادەیەك کرد کە وای دانا سەرکەوتن بەس بۆ قورەیش دەبێت، و هەواڵی ناکۆکی و شپرزکردنی

---

[1] تاریخ الدعوة الی الاسلام، لا ١٣٦.
[2] ئەبوبکر الصدیق، محمد مال الله، لا ٣٥٠.

ڕیزەکانی موسڵمانان، ئەمەش لەوەوە بوو کە هەوڵی دا متمانە کز بکات لەنێوان سەرکردەو سەربازەکانیدا کاتێ کە پێغەمبەری ووت: (هەرچی خەڵکی هەرچی و پەرچی یە کۆت کردۆتەوە.. من وای بۆ ئەچم ڕادەکەن و پشتت لێ هەڵدەکەن)!!. بەڵام وەڵامدانەوەی —صدیق- خوای لێ ڕازی بێ - زۆر تیژ و کاریگەر بوو لەسەر دەروونی عوروە، و ئەم هەڵوێستەش لە ئەوجی سەربەرزی ئیمانیدا بوو کە خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت (وَلاَ تَهِنُوا وَلاَ تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)[1]، واتە: خۆتان بەکەم مەزانن و غەمبار مەبن، هەر ئێوە سەرکەوتوو دەبن ئەگەر بەڕاستی باوەڕ دار بن).

ب-هەڵوێستی دەربارەی-ئاشتەوایی:

کاتێ کەبتپەرستەکان گەیشتنە ڕێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا -ﷺ- بەسەرۆکایەتی (سوهەیلی کوڕی عەمر) ئەبوبەکر — خوای لێ ڕازی بێ - چاك گوێی شل کردبوو بۆ بەندەکانی ئەو ڕێککەوتن نامەیەدا کەلەگەڵ ئەو ناعەدالەتی و ناڕەزایی یانەی بەڕواڵەت لەناو خاڵەکانیدا هەبوو بەرامبەر بە موسڵمانەکان، بەڵام ئەو چاك لەوە دڵنیابوو کە پێغەمبەری -ﷺ- لەسەر هەق و لەوەحی و نیگاوە نەبێت لە خۆیەوە هیچ ناکات و شتێکی کردوە کە خوا ڕێی پێ پیشان داوە.

مێژوو نووسەکان باسی ئەوە دەکەن کە عومەری کوڕی خەتاب — خوای لێ ڕازی بێ - هات بۆلای پێغەمبەری خواوە -ﷺ- ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بە بەندەکانی ڕێکەوتن نامەکە دەربڕی و بە پێغەمبەری خوا ووت: ئایا تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ فەرمووی: بەڵێ، ووتی: ئەی ئێمە موسڵمان نین؟ فەرمووی: بەڵێ، ووتی: ئەی ئەوان بێ باوەڕنین؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش ووتی: (فعلام نعطى الدنية في ديننا) واتە: دەی ئیتر بۆچی ئەم سەرشۆڕی یە لە ئاینەکەماندا قبوڵ بکەین؟ پێغەمبەری خوایش -ﷺ- فەرمووی: (انا رسول الله ولستُ أعصيه) واتە من پێغەمبەری خوام و سەرپێچی ئەو ناکەم).

---

[1] آل عمران، ١٣٩.

لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرموویەتی: (انا عبدالله ورسوله لن اخالف أمره ولن یضیعني) واتە: من بەندەو پێغەمبەری خوام و سەرپێچی و فەرمانەکانی ناکەم و خوایش من نافـەوتێنێ و پشت گوێم ناخات.[1]

عمریش پێی ووت: ئەی تۆ باسی ئەوەت بـۆ نـەکردین کـە دەچـین و بـەدەوری کەعبەشـدا دەگەڕێین و تەواف دەکەین؟ فەرمووی (بلی، فاخبرتك انا تأتي تذی العالم؟ واتە: بەڵێ، بـەڵام ئایـا ووتم ئەمساڵ؟ ووتی: نا، فەرمووی: دە تۆ دێیت و تە وافیش دەکەیت).

عمر- خوای لێ رازی بێ - دەڵێت: پاشان چـووم بـۆلای ئـەبوو بـەکر و پـێم ووت: (ئـەی ئەبوبەکر ئایا —محمد- پێغەمبەری خوا نی یە؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: ئـەی ئێمـە موسـڵمان نـین؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: ئەی ئەوان بێ باوەڕ نین؟ ووتی: بەڵێ، ووتی: دەی ئیتر بۆچی سەرشۆڕی قبوڵ بکەیت لە ئاینەکەماندا؟ ئەبوبەکر — خوای لێ رازی بێ - وەك ئەوەی ئامۆژگاری عمـر بکـات کە واز لەو نەیاری و قسانە بهێنـی ووتـی: دان بگـرە بەخۆتـدا، ئەگـەر شـاهێدی بـدەیت ئـەو پێغەمبەری خوایە و ڕاستیش ئەوەیە کە ئەو خوایە پێی دەڵێ، ئەویش سەرپێچی و فەرمانی خوا ناکات و خوایش ئەو نافەوتێنی و پشت گوێی ناخات.[2]

(سبحان الله) وەڵامەکەی ئەبوبەکر بۆ عمر، کتومت وەك وەڵامەکـەی پێغەمبــەری خـوا - ﷺ-دابوو بو ئەبووبەکر بەبێ ئەوەی وەڵامی پێغەمبەری بیستبێ، و ەئەبوبەکر لـە عمـر زیـاتر ووتەکانی لەگەڵ ووتەی خواو پێغەمبەردا ڕێك دەکەوتن، بەڵێ عمر لە (گوفتارە کانیـدا) لەگـەڵ خواو پێغەمبەردا ڕێك بوو، پلـەی بـاوەڕ کردنـی دڵ و لـە پلـەی گوفتـار زۆر جیـاترە، چـونکە (صدیق)- خوای لێ رازی بێ - لەبیروباوەڕو باوەڕکردنیشدا لە پێغەمبەری خـواوە وەری گرتبـوو لە هەموو قسەو گوفتارو کردەوەیەکیدا.[3]

پاش ئەو ڕووداوە گرنگە، ئەبوبەکر هەرجارێ باسی ڕێکەوتن نامەی حودەیبیــەی بکردایـە بەسەرکەوتنی مەزنی ناوزەد دەکرد و دەی ووت: لە ئیسلامدا هیچ سەرکەوتنێك (فتح) ئەوەندەی سەرکەوتنی (حودەیبیە) گەورە نەبووە، بەڵام چی دەڵێیت خەڵکەکـە کـورت بـین بـوون و نـەیان

---

[1] السیرة النبویة لابن هشام (٢٤٦/٣) تاریخ الطبری (٣٦٤/٢).
[2] السیرة النبویة وبن هشام (٣٤٦/٣).
[3] الفتاوی لابن تیمیة (١١٧/١١)

دەزانی چی لەنێوان محمد و پەروەردگاریدایە، بەندەکان پەلە پەل دەکەن، بەڵام خوا وەك بەندەکان پەلە پەل ناکات تا ویستەکانی دێنە دی.

لەساڵی کۆچیماڵئاواییدا –حجە الوداع- بینیم سوهەیل ی کوڕی عەمر لەلای شوێنی قوربانی سەربڕینەکەدا –ملی ولاخێکی گرتووەو لە پێغەمبەری خوای نزیك دەکاتەوە و پێغەمبەری خوایش بەدەستەکانی خۆی بۆی سەر دەبڕی، و بانگی سەرتاشی کرد و سەریان تاشی، سەیری سوهەیلم دەکرد کە چۆن هەر تاڵە موویەك لەسەری پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەکەوتە خوارەوە ئەو دەیگرتەوەو دەیخستە سەرچاوی، بیری ئەوکاتەشم دەکردەوە کە لە (حودەیبیە) دا ئەی ووت: نانووسم (بسم الله الرحمن الرحيم) یان (محمد رسول الله) و سوپاسی ئەو خوایەم کرد کە ڕێنموونی کرد بۆ سەر ڕێبازی ئیسلام.[1]

بەڕاستی ئەبوبەکری صدیق – خوای لێ ڕازی بێ - شێری ناو هاوەڵان بوو لەڕادەربڕین داو عاقڵ ترینیان بوو.[2]

پێنجەم: لەجەنگی خەیبەر و پەلی نەجد و بەنی فەزارەدا:

أ/لەخەیبەردا:

پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئابلۆقەی خەیبەری دا و خۆی ئامادە کرد بۆ جەنگ لەگەڵیان یەکەم سەرکردە ناردی ئەبوبەکر بوو – خوای لێ ڕازی بێ =، کە ناردی بۆ لێدانی هەندێ لە پێگەو قەڵای خەیبەر و مەردانە جەنگا بەڵام سەرکەوتن بەدەست نەهات، پاشان عمری نارد و ئەویش مەردانە جەنگا بەڵام هەر سەرکەوتن بەدەست نەهات، پاشان فەرمووی: سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەستی پیاوێك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت، ئەویش علی کوڕی ئەبوتالب بوو – خوای لێ ڕازی بێ -[3]، و هەندێ لە هاوەڵان ڕاوێژیان کرد بە بڕینی دارخورماکانیان تا زیاتر لە جولەکەکان نزیك ببینەوەو پێغەمبەریش -ﷺ- قبوڵی کرد.

دەستیان کرد بە بڕینی دارخورماکان، بەڵام ئەبوبەکر بەوە ڕازی نەبوو بۆیە چوو بۆلای پێغەمبەری خواو ڕاوێژی ئەوەی بۆ کرد کە با دارخورماکان نەبڕن چونکە ئەوە زیانێکی گەورەیە

---

[1] كنز العجال ٣٠١٣٦،نقلاً عن خطب ابی بكر الصديق-محمد عاشور، لا١١٧.
[2] تاريخ الخلفاء للسيوطي، لا ٦١.
[3] فتح البلدان (٦٢/١).

و له سامانی موسڵمانان دەکەوێت چونکە بە زۆربێ یان بەخۆشی هەر دەگیرێن، پێغەمبەریش ڕایەکەی لێ قبوڵ کرد و فەرمانی دا هاوار بکەن ئیتر دار نەبڕنەوەو موسڵمانەکانیش وازیان هێنا لە داربڕین.[1]

ب/لە (نەجد)دا:

(إبن سعد) لە ئەیاسی کوڕی سەلەمەو ئەویش لەباوکی یەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (پێغەمبەری خوا پەلێکی -سریە- نارد بەسەرکردایەتی ئەبوبەکر بۆ نەجد، شەو دامان بەسەر هەندێ لە (هوازن) دا و بەدەستی خۆم حەوت کەسم لێ کوشتن و ووتەکەی پێهێنی مان (أمت، أمت) واتە بمرە بمرە بوو.[2]

ج/ لە بەنی فەزارەدا:

ئیمام أحمد دەگێڕێتەوە لە ڕێی ئەیاسی کوڕی سەلەمەوەو ئەویش لەباوکی یەوە و دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە ووتی: لەگەڵ ئەبوبەکری کوڕی أبی قوحافە دا دەرچووین کە کردبووی بە ئەمیر بەسەرمانەوە و دامان بەسرە (بنی فزارە)داو هەرکە لە ئاو نزیك بوینەوە دابەزین و سەرخەوێکمان شکاند -تعریس-[3]

پاش ئەوەی نوێژی بەیانیمان کرد، دامان بەسەریاندا لەسەر ئاوەکە شەڕ لەگەڵ هەموو ئەوانەی پێیان دەگەیشتین دەکرد، سەلەمە دەڵێت: پاشان دەبینم کۆمەڵێکی زۆر کە ژن و منداڵیشیان تێدابوو بەرەو کێوەکە هەڵدێن، منیش چووم بۆیان و تیرێکم بەسەریاندا تەقاند و کەوتە ئەو دیویان وهەموو یان وەستان و منیش گشتیانم دایە بەری خۆم هێنامنەوە بۆلای ئەبوبەکر، لەناویاندا ژنێکم بینی جلێکی ئەستوری لە بەردا بوو و کچێکی خۆیشی پێ بوو کە بە جوان ترین کچی عەرەب دا دەنرا، و ئەبوبەکر ئەو کچەی بەخشی بە من.

و دەستم بۆ نەبرد تا هێنامەوە بۆ مەدینە و ئەو شەوەش کە لەمدینە بووم لێی نزیك نەبوومەوە، بەیانی یەکەی لە بازاڕدا پێغەمبەری خوام پێگەیشت پێی ووتم: ئەی سەلەمە ئەو ئافرەتەم پێ ببەخشە، منیش ووتم: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا خۆم زۆرم حەز لێ یەتی

---

[1] المغازی للواقدی (٦٤٤/٢).
[2] الطبقات الکبری (١٢٣/١) أبوداود، کتاب الجهاد باب الانیات (٤٣/٣).
[3] احمد(٤٣٠/٤). الطلبات (١٦٤/٤).

و لێشی نزیك نەبوومەتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا -ﷺ- بێ دەنگ بوو- وازی لێ هێنام و لە ڕۆژی داهاتوودا پێم گەیشتەوە لە بازاڕ و پێی ووتم: (ئەی سەلەمە ئەو ئافرەتەم پێ ببەخشە) منیش ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- سوێند بەخوا دەستم بۆ نەبردووەو با بۆ تۆ بێت، پێغەمبەری خوا -ﷺ- دایە مەککەیی یەکان کە کۆمەڵێ دیلی موسڵمانەکانیان لەبەردەستدا بوو، ئەوانیش بەرامبەر ئەو کچە بەرەڵایان کردن.[1]

شەشەم/ لە عەمرە گێڕانەوە و لە (ذات السلاسل) دا

أ-لەعەمرە گێڕانەوەدا: ئەبوبەکری صدیق – خوای لێ رازی بێ -یەکێ بوو لەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا -ﷺ- چون بۆ گێڕانەوەی ئەو عەمرەیەی کە پێشتر بێ باوەڕان نەیان هێشتبوو بیکەن.[2]

ب/لە پەلی (ذات السلاسل)دا:

ڕافعی کوڕی عەمری تائی – خوای لێ رازی بێ - دەڵێت: پێغەمبەری خوا سوپای (ذات السلاسل)ی خستە ڕێ بەسەرۆکایەتی عەمری کوڕی عاص – خوای لێ رازی بێ -و زاتول سەلاسیل شوێنێکە نزیکە لە دۆڵی قەرس و دە ڕۆژ ڕێگە لە مەدینەوە دوورە و ئەبوبەکرو عمر و کۆمەڵێ هاوەڵی بەڕێزی لەگەڵدا نارد، ئەوانیش بەڕێ کەوتن هەتا گەیشتنە کەژی (تەی)،

عەمری کوڕی عاص – خوای لێ رازی بێ - ووتی ئادەی پیاوێ دیاری کەن با لەم ناوچانەدا ڕێ پیشاندەرمان بێت، ووتیان: کەس ناناسین وەك رافعی کوڕی عەمر بێت چونکە لەسەردەمی نەفامیدا لەم ناوچانەدا بەتەنیا ڕێ گری و چەتەیی کردووە.

ڕافیع دەڵێت: پاش ئەوەی لە غەزاکە گەڕاینەوەو گەشتینەوە ئەو جێگەیەی خۆمان ئەبوبەکرم بەرچاو کەوت کە عەبایەکی فەدەکی لەبەردابوو و هەرکاتێ سواری وڵاخەکەی بوایە بەشتێ(وەکو قۆبچە) کۆی دەکردنەوە و هەرکاتێ دابەزیایە بەرەڵای دەکردەوە، و هاتم بۆ لای و پێم وت: ئەی خاوەنی عەبای جوان و کۆکراوە ، من بەچاوێکی تایبەتیەوە لەناوهاوەڵەکانتدا

[1] احمد (٤٣٠/٤) الطبقات (١٦٤/٤).
[2] تاريخ الدعوة الاسلامية، لا ١٤٢.

سەیری تۆ دەکەم، شتێکم پێ بڵێ لەئێوەوە فێرببم ئەگەر لەبەری بکەم وەك ئێوەم لێ بێ و با زۆر درێژ دادڕ نەبێ بیرم دەچێتەوە.

ئەبوبەکر وتی: پێنج پەنجەکەی خۆتت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ، وتی: شایەتی بدە کە هیچ خوایەك نیە تەنها (الله) نەبێت، و محمدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە و پێنج فەرزەی نوێژیش ئەنجام بدە، ئەگەر پارەت هەبوو زەکاتی لێ دەربکە،و حەجی ماڵی خوا بکەو ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگرە، ئایا لەبەرت کردن؟.

وتی:بەڵێ، وتی: شتێکی تریش تابۆت دەکرێ ئەمیری دوو کەسیش مەکە، وتی: بۆ ئەمیری و گەورەیی بێجگە ئێوە ئەی خەڵکی خانوبەرە دامەزراوەکان بۆ کەسی تر هەیە، ئەبوبەکریش وت: لەوانیە ڕۆژێ بێتە پێشەوە کە خەڵکانێکی زۆر لەتۆ خوارتریش هەڵپەی بۆ بکەن، کاتێ خوای گەورە و (عز و جل) پێغەمبەری خوای نارد، خەڵکی هاتنە ناوئیسلامەوە، هەندێ لەبەرخوای (عز و جل) هاتنە ناو ئیسلام و خوایش هیدایەتی دان، هەندێ تر لەترسی شمشێر موسڵمان بوون، بەڵام هەر هەمووشیان سەربە کۆمەڵی خوایین و هەمووشیان لەژێر سایەی خوادان و پارێزراون، و مرۆڤیش کە دەبێتە (ئەمیر)، خەڵکی زوڵم و زۆر لەیەکتری دەکەن و ئەویش تۆڵە لە هەندێ ناکاتەوە بۆ هەندێکی تر و خوایش تۆڵە لەو دەکاتەوە، کەسێ لەئێوە دەبینێ سەرێ مەڕی دراوسێکەی داگیردەکرێت پێی ناخۆشە و ڕەگی لاملی سور هەڵئەگەڕێ، خوایش لەپشتی دراوسێ کەیەوەیەتی[1]

ئالەم ئامۆژگاریەی صدیقەوە —خوای لێ ڕازی بێ- پەندو ئامۆژگاری زۆری تێدایە بۆ نەوەکانی موسڵمانان کە هاوەڵێکی بەڕێزی وك ئەبوبەکر کە پەروەردەکراوی دەستی ئیسلام و دەستی پێغەمبەری خوایە -ﷺ- گرنگترینیان:

١-گرنگی پەرستشەکان: نوێژ کە کۆڵەکەی ئاینەو زەکات و ڕۆژو حەجکردن.

---

[1] مجمع الزوائد(٢٠٢/٥) .

٢-داوای بەرپرسیاریتی نەکردن(مەبەبە ئەمیر) هەروەك چۆن پێغەمبەری خواش ئامۆژگاری ئەبو زەری غەفاری کردو پێی فەرموو: (وانها امانة و انها يوم القيامة خزي و ندامة، الامن اخذها بحقها)[1]

واتە: ئەی ئەبوزەر داوای ئەمیری مەککە، چونکە سپاردەیە و لە ڕۆژی دوایشدا سەرشۆڕی و پەشیمانی یە، مەگەر بۆکەسێ بەهەقی خۆی پێی هەستێت.

لەبەر ئەوە ئەبوبەکری تێگەیشتوو لە ووتەکانی محمدی خۆشەویستی -ﷺ- و لەگێڕانەوەیەکدا دەڵێت: (وان يك أميراً فانه اطول الناس حساباً، واغلظهم حساباً، ومن لا يكن أميراً فانه أيسر الناس حساباً، و أهونهم عذاباً).[2]

واتە: هەرکەسێ بەرپرس بێت لێپرسینەوەی قیامەتی لە هەمووان دوورو درێژترەو سزاکەشی لەهەمووی سەخت ترە و هەرکەسێ بەرپرس نەبێت ئەوە لەهەمووکەس ئاسانترە لێپرسینەوەی و سزاشی لە هەمووان سوکترە، ئەمەیە تێگەیشتنی -صدیق-خوای لێ رازی بێ- بۆ مەقامی بەرپرسیارێتی.[3]

٣-خوای گەورە ستەمکردنی لەسەر خۆی حەرام کردووە، و بەرگریشی کردووە لە بەندەکانی کە ستەم لەیەکتر بکەن، چونکە ستەم دەبێتە تاریکایی بۆ خاوەنەکەی لە ڕۆژی دوایی دا و بەرگری کردوە لەستەم کردن لە باوەڕداران وەك خوا لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: (من آذى لي ولياً فقد اذنته بالحرب) واتە: هەرکەسێ دۆست و خۆشەویستێکی من ئازار بدات ئەوە جەنگی لەگەڵدا ڕادەگەیەنم، ئەوانە لەژێر پەناو سایەی خوادان و خوایش تووڕە دەبێت لەبەرخاتر ژێرسایەکانی.[4]

---

[1] مسلم، كتاب الأمارة، ژ١٨٢٥.
[2] استخلاف ابى بكر الصديق، جمال عبدالهادى، لا ١٣٩.
[3] مسند امام احمد (٦/٢٥٦).
[4] إستخلاف ابى بكر-جمال عبدالهادى، لا ١٤٠.

٤-لەسەردەمی یەکەمی ئیسلامدا چاکترینی خەڵکی دەبوونە بەرپرس، بەڵام پاش ئەوان ئەمیرەکان زۆر بوون و کەسانێك وەریان گرت کە شایانی نەبوون و ئەم جۆرە بەرپرسیارێتی یە ئاسانەو نزیکە وەری بگرێ کەسانێ کە شایان نەبن پێی.[1]

٥-لەجەنگی (ذات السلاسل)دا هەڵوێستێکی دیاری -صدیق- خوای لێ رازی بێ - بەدی دەکەین لە ڕێزگرتن لەگەورەو سەرکردەکان، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەبوبەکر - خوای لێ رازی بێ - خاوەنی دەرونێکی زۆر بەهێز و توانایەکی هەڵکەوتوو لە بیناکردنی پیاواندا ، و ڕێزگرتن و بەرز ڕاگرتنیان.

لە عەبدوڵڵای کوڕی بەریدەوە دەگێڕنەوە کە ووتوویەتی: (لەجەنگی (ذات السلاسل)دا پێغەمبەری خوا عەمری کوڕی عاصی - خوای لێ رازی بێ - کرد بە ئەمیر و ئەبوبەکر و عمریشی لەگەڵدا نارد و هەر گەیشتنە شوێنی جەنگەکە (عەمر) فەرمانی دەرکرد بە هیچ شێوەیەك ئاگر نەکەنەوە، (عمر) زۆر توڕەبوو ویستی ئاگر بکاتەوە، ئەبوبەکر نەیهێشت و پێی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا نەیکردووە بەسەرکردەو بەرپرس بەسەرتەوە مەگەر لەبەر ئەو زیرەکی یەی لە جەنگدا، و عمریش - خوای لێ رازی بێ - هێور بوویەوە.[2]

حەوتەم: فەتحی مەککە و تائیف و حونەین.

١-لەڕزگارکردنی مەککەدا لە ساڵی ٨ی کۆچی:

هۆی ڕزگارکردنی مەککە لە دوای ئاگربەستی حودەیبیەوە بوو وەك (ابن إسحاق) باسی کردووە و دەڵێ: زوهەری بۆی گێڕامەوە لەعوروەی کوڕی زوبێروە ئەویش لە میسوەری کوڕی مەخرەمەو مەروانی کوڕی حەکەم کە هەردووکیان بۆیان گێڕاوەتەوەو وتوویانە: یەکێ لەبەندەکانی ئاشتی نامەی حودەیبیە ئەوە بوو کە هەر تیرەیەك بۆی هەیە بێتە هاوپەیمانی محمد، بۆ هەموو تیرەیەکیش هەیە ببێتە هاوپەیمانی قورەیش، خوزاعە پەلاماری داو خۆی گەیاندە

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤٠.

[2] الحاكم في المستدرك و قال: حديث صحيح الاسناد وقال الذهبيك صحيح. كتاب المغازى (٤٢/٣).

هاوپەیمانێتی و محمد و (بەنی بەکر) یش خۆیان هەڵدایە نێو هاوپەیمانێتی قورەیش، نزیکی حەڤدە تا هەژدە مانگ بەو شێوەیە مانەوە.

پاشان (بەنو بەکر) شەوێکیان هێرشیان بردە سەر خوزاعەو لەسەر ئاوی وەتیر- کەنزیکە لەمەککەوە- و قورەیش ووتی: محمد پێمان نازانێت و بەم شێوە کەس نامان بینێت بە چەك و تفاق هاوکارییان بکەن و ئەمەش وەك قینێك لە پێغەمبەری خوا -ﷺ-.

عەمری کوڕی سالمیش لە خوزاعەیی یەکان خۆی گەیاندە مەدینە بەم پارچە شیعرە داوای پشتگیری و هاوپەیمانەتی یەکەیان کرد ووتی:

اللهم انی ناشد محمداً     حلف أبينا وابيك الاتلدا
فانصر هداك الله نصراً اعتدا     وادعُ عبادالله يأتوا مددا

پێغەمبەری خوا -ﷺ- پێی فەرموو: (نصرت يا عمرو بن سالم)[1]. واتە: سەرت دەخەین ئەی عەمری کوڕی سالم.

پێغەمبەری خوا -ﷺ- و هاوەڵانی خۆیان ئامادە کرد بۆ دەرچوون بەرەو مەککە، هەواڵەکەیان بە نهێنی هێشتەوە، و لە خوای گەورە پاڕایەوە کە کوێرایی بێ باوەڕانی مەککە دابهێنێ تا لەناکاودا سوپای ئیسلام شاری مەککە ڕزگار بکات قورەیش ترسی ئەوە لێ نیشت کە پێغەمبەر -ﷺ- بەڕووداوەکەی زانیبێت، بۆیە ئەبوسوفیان خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا پێی ووت: ئەی محمد، پەیمانەکەی نێوانمان توندتر بکەو ماوەکەشمان زیاتر بکە، پێغەمبەری خوایش -ﷺ- تەنها لەبەرئەوە هاتوویت بۆشتێ لەلایەن ئێوەوە ڕووی داوە؟

ووتی: پەنا بەخوا، ئێمە هێشتا هەر لەسەر بەڵێن و پەیمان و ڕێکەوتننامەی ڕۆژی حودەیبیەین و هەرگیز ناگۆڕێن و هەروا دەبین، لەلای پێغەمبەری خوا چووە دەرەوە بەمەبەستی بینینی هاوەڵان خوایان لێ ڕازی بێت.[2]

١-ئەبوبەکر و ئەبوسوفیان:

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام (٤/٤٤).
[2] التاريخ السياسي والعسكري، د.على معطى، لا ٣٦٥. الطبرى (٣/٤٣).

ئەبوسوفیان داوای کرد لە ئەبوبەکری صدیق –رضي الله عنه- کە بەڵێن نامەکە نوێ بکاتەوەو ماوەکەشی درێژ بکاتەوە، ئەبوبەکریش پێی ووت: ژێر سایەم ژێر سایەی پێغەمبەری خوایە -ﷺ-، سوێند بە خوا مێرووله قاچ بەرزەکان شەڕتان لەگەڵدا دەکەن یارمەتیتان دەدەم.

ئالێرەدا ژیری و سیاسەت مەداری ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - دەردەکەوێت، و بوونی باوەڕی پتەو بەبەرنامە ڕاستەقینەکەی لەسەریەتی بەدیار دەبێت، و لەبەردەم ئەبوسوفیاندا بێ ترس و بە ئاشکرا دەڵێت (ئامادەم بەهەر شێوەیەك بووە بجەنگم لەگەڵتان ئەگەر مێروولەکانیش ببینم لەگەڵ قورەیشدا دەجەنگن چەندێ پێم بکرێت یارمەتیان دەدەم.

٢-لەنێوان ئەبوبەکری صدیق و عائیشەدا:

ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - چو بۆلای عائیشە و لەوکاتەدا عائیشە گەنمی بێژنگ دەکرد، و پێغەمبەری خوا -ﷺ- فەرمانی پێ کردبوو کە ئەم مەسەلەیە بە نهێنی بهێڵێتەوە.. ئەبوبەکر لێی پرسی: کچی خۆم ئەم نان و چێشتە بە چ مەبەستێ سازی دەکەیت؟ بێ دەنگ بوو، پێی ووت: ئایا پێغەمبەری خوا -ﷺ- نیازی جەنگێکی هەیە؟ ئەو هەر بێدەنگ بوو، ووتی: لەوانەیە مەبەستی جەنگ لەگەڵ بنەماڵەی زەردەکان بکات –واتا ڕۆمەکان-؟

عائیشە هەر بێدەنگ بوو، ووتی: لەوانەیە بەسەر قورەیشدا بدات؟ ئەو هەر بێدەنگ بوو، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاتە ژوورەوەو ئەبوبەکری صدیق – رضي الله عنه - پێی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- دەرچوونێکت بەدەستەوەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ)، پێی ووت: لەوانەیە بۆ ڕۆمە زەردەکان بێت؟ فەرمووی: (نەخێر) ووتی: دەی مەبەستت قورەیشە؟ فەرمووی: (بەڵێ)، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا -ﷺ- ئەی لەنێوان تۆ و ئەواندا ئاگر بەست نی یە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی نەتزانیوە چیان بەسەر بەنی کەعبی –خوزاعە-دا هێناوە؟

ئالێرەدا ئەبوبەکری خۆی سپارد بە پێغەمبەر -ﷺ- و خۆی ساز کرد تا لەگەڵ سەرکردەدا بێت -ﷺ- لەم کارە گەورەیەدا، و سەرجەم کۆچەریان و پشتیوانان لەگەڵیدا ڕۆیشتن و کەسیان لێی دوانەکەوت.[1]

---

[1]مغازي الواقدي (٢/٧٩٦).

٣-ئەبوبەکری صدیق و چوونە ناو مەککەوە:

هەر کە پێغەمبەری خوا -ﷺ- لەساڵی (فەتح)دا خۆی کرد بە ناو شاری مەککەدا و ئەبوبەکریش لە تەنیشتیەوە بوو، ئافرەتانی دەبینی کە ڕوومەتی وڵاخەکانیان دەڕنی، پێغەمبەری خوا -ﷺ- زەردەیەك گرتی و ووتی: ئەی ئەبوبەکر (حسان) لەم بارەیەوە چی دەڵێت؟

ئەبوبەکریش شیعرەکەی ووت:

عدمنا خيلنا ان لم تروها تثير النقع موعدها كداء
يبادين الاسنّة مصغيات على اكتافها الاسل الظّماء
تظل جيادنا متمطرات تلطمهنّ بالخمر النساء.[1]

پێغەمبەری خوایش -ﷺ- فەرمووی: (ادخلوها من حيث قال حسان)

واتە: بەو شێوەیەی حسان دەڵێت بچنە ناو شارەوە.[2]، ئەم بەخششە گەورە لەم کەش و هەوا مەزنەدا بە موسڵمان بوونی (أبو قحافە) باوکی ئەبوبەکر تاجی لەسەر نرا بۆی.[3]

ب/لە حونەیندا:

موسڵمانەکان لەجەنگی حونەین دا وانەیەکی تاڵیان چەشت، هەر لەسەرەتای جەنگەکەوە تووشی شکست هاتن، تاوایان لێ هات لەتاو نارەحەتی کتوپڕیەکان هەریەکەو بەلایەکدا هەڵدەهاتن، وەك ئیمامی تەبەری دەڵێت: واپرشوبڵاو بوونەوە کەس نەی دەپەرژایە سەر کەس.[4]

تا وای لێ هات پێغەمبەری خوا -ﷺ- هاواری دەکرد و دەیفەرموو: (أين انتم الناس؟!هلموا اليّ انا رسول الله انا محمد بن عبدالله يا معشر الانصار، انا عبدالله ورسوله...) واتە: بۆکوێ ئەی خەڵکینە؟! بەرەو من وەرن، من پێغەمبەری خوام، من محمدی کوڕی عبداللە م، ئەی کۆمەڵانی پشتیوانان من بەندەو پێغەمبەری خوام...)

پاشان عباسی مامی بانگ کرد، کە دەنگی گەورە بوو، پێی فەرموو: (يا عباس، ناد، يا معشر الانصار، يا اصحاب السمره).[1] واتە: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئەی ئەوانەی لەژێر دارەکەدا بەیعەتتان پێ دام).

---

[1] الحاكم في المستدرك، صحيح الاسناد ووافقة الذهبي (٣/٧٢).
[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو** (٣/٧٢).
[3] تأريخ الدعوة الاسلامية، لا ١٤٧.
[4] تأريخ الطبرى (٣/٧٤).

ئەمە حالّی موسڵمانان بوو لەسەرەتای جەنگەکەوە، پێغەمبەری خوا کەس لە دەوری نەمایەوە ژمارەیەکی کەم نەبێت، کەس خۆی نەگرت و ئارامیان نەبوو جگە لەدەستەیەکی کەم نەبێت لە هاوەڵان کە ئەبوبەکر پێشەنگیان بوو، پاشان خوای گەورە سەرکەوتنی پێ خەڵات کردن سەرکەوتنێکی سەربەرزانەی پشتگیری کراو.[2]

ئالێرەشدا هەندێ هەڵوێستی صدیق - رضي الله عنه - هەیە، لەوانە:

١-فتوادانی ئەبووبەکر لە حوزوری پێغەمبەری خوادا -ﷺ-:

ئەبو قوتادە دەڵێت: جەنگی حونەین بوو، دەبینم جەنگاوەرێکی موسوڵمان جەنگ لەگەڵ یەکێك لە بێباوەڕاندا دەکات، یەکێکی تر لە بێباوەڕان دەیویست لە دواوە بە دزیەوە بیکوژێت، منیش بە ڕاکردن خۆم گەیاندە ئەوەی دواوە و شمشێری لێ هەڵکێشام بکوژێت و منیش دام لە دەستی دەستیم قرتاند و ئەویش هیچی بۆ نەکرا باوەشی پێدا کردم و بەتوندی و لە خۆم ترسام، پاشان بە چۆکدا کەوت و منیش کوشتم، موسوڵمانان بەرەو دواوە هەڵاتن و منیش لەگەڵیان هەڵاتم، دەبینم عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) لە نێو خەڵکەکە دایە، وتم: ئەرێ ئەو خەڵکە چییانە؟ وتی: خوا فەرمانی داوە، پاشان خەڵکەکە خۆیان گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «من اقام بينة على قتيل قتله، فله سلبه»[3].

واتا: هەر کەسێك شایەت و بەڵگەی هەبێت کە بێباوەڕێکی کوشتووە، ئەوە هەموو شتەکانی ئەو کوژراوە بۆ ئەوە.

ڕۆیشتم بەڵگەیەك، نیشانەیەك بدۆزمەوە کە بیسەلمێنیت ئەو کوژراوەی خۆم هی منە، کەسم دەست نەکەوت شایەتیم بۆ بدات، لەو لاوە بۆ خۆم دانیشتم، پاشان پێم باش بوو بۆ پێغەمبەری خوای باس بکەم و باسم کرد، لەوێدا پیاوێك وتی: شمشێری ئەو کوژراوە لای منە، با بۆ من بێت، ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) وتی: نەخێر، نایدات بە (ئوصەیبیغ)ی باڵندەیەکی بێ

---

[1]سلم كتاب، الجهاد والسير، باب في غزوة حنين (١٣٩/٣) ژمارە ١٧٧٥.

[2]مواقف الصديق مع النبي في المدينة لا ٣٤.

[3]مافق الصديق مع النبي في المدينة: لا ٤٣.

غیرەتی قورەیش و شێرێك لە شێرەكانی خوا بێ بەش بكات كە لە پێناوی خوا و پێغەمبەردا جەنگاوە. ئەبو قوتادە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) شمشێرەكەی دا بە من و بە پارەی ئەو شمشێرە باخێكم پێ كڕی و ئەوە یەكەمین پارەیەك بوو لە ئیسلامدا بێتە گیرفانی من[1].

ئەم شێوازی دەمكوت كردن و نەهێشتن و فتوادان و سوێند خواردنی ئەبو بەكرە لە حزوری پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پاشان پێغەمبەریش (ﷺ) بە قسەی ئەو بكات و باوەڕیشی پێ بكات و كار بە فتواكەی بكات، ڕێزێكی مەزنە بۆی، كەسی دیكە شتی وای پێ نەكراوە[2].

لەو بەسەرهاتەی پێشوودا ئەوە تێبینی دەكەین كە تا چ ڕاددەیەك ئەبو قوتادە (رضي الله عنه)گیانی برا موسوڵمانەكانی پاراستووە، بە هەر ناڕەحەتیەك بووە ئەو بێباوەڕەی لە كۆڵ كردووەتەوە و كوشتوویەتی... وە لە هەڵوێستەكەی ئەبو بەكری صدیقدا (رضي الله عنه)دەردەكەوێت كە تا چ ڕاددەیەك سوور بووە لەسەر سەرخستنی هەق و پاراستنی مافەكان و بەرگری كردن لێی، بەڵگەیشە لەسەر پتەوی باوەڕی و ئەو پەڕی یەقین و دڵنیایی و ڕێزلێنانی لە پەیوەندی برایەتی موسوڵمانانە و ئەمەش شوێنەوارێكی بەرز و بڵندە بۆ ئەبو بەكری صدیق (رضي الله عنه)[3].

٢- صدیق و هۆنراوەكەی عەباسی كوڕی مەرداس:

عەباسی كوڕی مەرداس كاتێك بەشی خۆی وەرگرت لە دەسكەوتەكانی حونەین، بە دڵی نەبوو، بۆیە بە شیعرەوە گلەیی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كرد كە كەمی پێداوە، وتی:

كانت نهاباً تلافيتها ... بكرّي على المهر في الاجرع
وايقاظي القوم ان يرقدوا ... إذا هجع الناس لم أهجع
فاصبح نهبي ونهب العبيد ... بين عيينة والاقرع
وقد كنت في الحرب ذا تدرء ... فلم اعط شيئاً ولم أمنع
الا افائل اعطيتها ... عديد قوائمها الاربع
وما كان حصن ولا حابس ... يفوقان شيخى في المجمع
وما كنت دون امرىءٍ منهما ... ومن تضع اليوم لا ترقع

---

[1] البخاري كتاب المغازي (١١٩/٥) ژمارە ٤٣٢٢.
[2] الرياض النظرة في مناقب العشرة لابي جعفر محب الدين لا ١٨٥.
[3] التأريخ الاسلامي للحميدي (٢٦/٨).

مانای هۆنراوەکە بە کورتی باس لەوە دەکات و دەڵێت من جەرگ قایمانە شەرم کرد و هەڵنەهاتم کەچی وەك خەڵکی ترم بەرکەوت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «اذهبوا به، فاقطعوا عني لسانه»، واتـا: «بـڕۆن لە باتی من زمانی ببڕن» و ئەوانیش ئەوەندەی تریان لە غەنیمە دایە تـا ڕازی بـوو، مەبەسـتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر ئەوە بوو کە ڕازی بکەن تا بێ دەنگ بێت[1].

پاش ئەوە عباس هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەویش پێی فەرموو: ئایا تۆ وتووتە: فاصبح نهبی ونهب العبید بین الاقرع والعینه ؟ ئەبو بەکر وتی: بین العینه والاقرع، پێغەمبەری خوا فەرمووی: هەردووکیان یەکێکن، ئەبو بەکر وتی: شایەتی ئەدەم کە تۆ ئەوەی کە خوای گەورە دەربارەت دەفەرموویت: ﴿وَمَا عَلَّمْنَـٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾﴾ (یس:٦٩)

واتا: شیعرمان فێر نەکردووە و نابێت شیعر بزانێت ئەو تەنها یادخەرەوەیەکی ئاشکرایە.

ج- لە تائیف دا:

لە گەمارۆدانی شاری تائیف دا هاوەڵانی پێغەمبەر شەهید و بریندariyان لێ کەوتەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆکەی سەر تائیفی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ مەدینە، یەکێك لەوانەی لەوێ شەهید بوو عبداللە ی کوڕی ئەبو بەکر بوو (خوا لە خۆی و لە باوکی ڕازی بێت) تیرێکی بەر کەوتبوو، هەر بەو تیرە گیانی سپارد پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەری (ﷺ)[2].

پاش ئەوەی شاندی (ثە قیف) لە تائیفەوە هاتن بۆ مەدینە تا موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا بکەن و هەر کە وەفدەکە لە دوورەوە دەرکەوت خێرا هەر یەکە لە ئەبو بەکر و

[1] السيرة النبوية لابن هشام (١٤٧/٤).
[2] السيرة النبوية لابن هشام (١٤٧/٤).

موغیره دەیان ویست مژدەی هاتنیان بە پێغەمبەری خوا بدەن، ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)سەرکەوت بە بردنی ئەو مژدەیە[1] .

پاش ئەوەی موسوڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد و پێغەمبەریش (ﷺ) ناوی نووسین و بەڵێن نامەی پێ پڕ کردنەوە ویستی کەسێك بکاتە ئەمیر و گەورەیان و ئەبو بەکر ئاماژەی بە (عوسمانی کوڕی ئەبی عاص) کرد کە منداڵ ترین کەسیان بوو، ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئەم لاوەم دیوە لە هەر هەموویان زیاتر سوور بووە لەسەر تێگەیشتنی ئیسلام و فێربوونی قورئان[2] .

ئەم عوسمانە لە هاجرە بە دزی گەلەکەیەوە کاتێك بخەوتنایە ئەو خۆی دەگەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پرسیاری لە ئیسلام لێ دەکرد و قورئان فێر دەبوو، تا ئەوە بوو لە ئایین تێگەیشت و شارەزا بوو، هەر کاتێك بهاتایە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بخەوتایە خۆی دەگەیاندە ئەبو بەکر، پێغەمبەر ئەم کارەی زۆر بە دڵ بوو بۆیە سەرسام بوو لێی و خۆشی دەویست[3] .

کاتێك کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) خاوەنی ئەو تیرەی ناسیەوە لە ناو وەفدەکەدا کە کوڕەکەی پێکابوو وتەیەکی وای فەرموو کە مەزنی باوەڕەکەی دەگەیەنێت، لە قاسمی کوڕی محمدەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: عبداللە ی کوڕی ئەبو بەکر لە جەنگی تائیفدا تیرێکی بەرکەوت، چل شەو پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ئەویش گیانی بەخشی، کاتێك وەفدی (سەقیف) هاتن بۆ مەدینە تیرەکەی هێنا کە لە لای خۆی هەڵیگرتبوو، پێی نیشاندا و وتی: کەس ئەم تیرە دەناسێتەوە کە هی کێیە؟ سەعیدی کوڕی عوبەید کە برای (بەنی عەجلان) بوو وتی: ئەمە تیری منە و من خۆم سازم کردووە و پەرم لێداوە و منیش تێم گرت.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) فەرمووی: «بەم تیرە بوو عبداللە ی کوڕی ئەبو بەکر شەهید کرا، سوپاس بۆ ئەو خوایە بە دەستی تۆ کوڕەکەم سەر بەرز بوو، تۆ سەر شۆڕ نەبووی بە

---

[1] تأريخ الدعوة الاسلامية (لا: ١٥١).
[2] تأريخ الدعوة الاسلامية (لا ١٥٢).
[3] خطب ابي بكر الصديق محمد احمد عاشور (لا ١١٨).

دەستی ئەو، ئەمەش بۆ هەردووکتان باش بوو. الحمد لله الذي اكرمه بيدك، ولم يهنك بيده، فانه اوسع لكما»[1].

هەشتەم/ لە جەنگی تەبووك و ئەمیری حەج و حەجی ماڵئاوایی:

أ- لە جەنگی تەبووکدا:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سوپایەکی گەورەوە کە ژمارەیان دەگەیشتە سی هەزار کەس بەرەو جەنگی تەبووك کەوتە رێ بە مەبەستی جەنگ لەگەڵ رۆمەکان لە شام، کاتێك سوپای موسوڵمانان لە ناوچەی (ثنية الوداع)دا کۆ بووەوە بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لەوێدا سەرکردە و فەرمانڕەوا و ئاڵا بەدەستەکانی دیاری کرد و ئاڵا سەرەکیە گەورەکەی دایە دەستی ئەبو بەکر (ﷺ)[2] و لەم غەزایەدا کۆمەڵێك هەڵوێستی ئەبو بەکر بەدی دەکرێت لەوانە:

١- هەڵوێستی لە کاتی مردنی هاوەڵێك بە ناوی (عبدالله ذي البجادين) (ﷺ):

عبدالله ی کوڕی مەسعود ئەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خودا بووم (ﷺ) لە نیوەی شەودا خەبەرم بوویەوە و لە غەزای تەبووکدا بووین، بڵێسەیەکی ئاگرم بەدی کرد لە لایەکی سەربازگەکەوە، دەڵێت: منیش بەرەو ڕووی چووم و هەر سەیرم دەکرد، دەبینم پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو بەکر و عومەرن و دەبینم عبدالله ذي البجادين المزني مردووە، سەیر دەکەم چاڵیان بۆ هەڵکەندووە، پێغەمبەری خوایش لە لایدا بوو، ئەبو بەکر و عومەریش نزیکیان دەکردەوە لێی و پێغەمبەر فەرمووی: «ادنيا اليّ اخيكما» واتا: براکەتانم لێ نزیك بکەنەوە، ئەوانیش تەرمەکەیان لێ نزیك کردەوە و ئەویش لە ناو گۆڕەکەیدا لێی وەرگرتن و لەسەر لایەك ڕایکشاند و وتی: «اللهم اني راض عنه فارض عنه»، واتا: خوایە من لێی ڕازیم و تۆش لێی ڕازی بە. ڕاویەکە عبدالله ی کوڕی مەسعود دەڵێت: لەوێدا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتی: خۆزگە من خاوەنی ئەو گۆڕە بوومایە[3].

---

[1] خطب ابي بكر الصديق محمد احمد عاشور (لا ١١٨).
[2] صفة الصفوة (١/١٤٣).
[3] صحيح السيرة النبوية (لا: ٥٩٨).

ئەبو بەکر (ﷺ) هەر کاتێك مردوویەکی ئەسپاردە بکردایە دەیوت: «بسم الله و علی ملة رسول الله (ﷺ) و بالیقین والبعث بعد الموت»[1]، واتا: بە ناوی خوا و لەسەر ڕێڕەوی ئاینی پێغەمبەری خوا و بە دڵنیایی و زیندووبوونەوەی دوای مردن.

٢- ئەبو بەکر داوا دەکات لە پێغەمبەر دوعا بکات بۆ موسوڵمانان:

عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) دەڵێت: لە قرچەی گەرمادا بوو دەچوین بۆ جەنگی تەبووك، لە شوێنێك دابەزین و زۆر تێنوومان بوو، گومانمان دەبرد کە لە تێنواندا خەریك بوو گەروومان دەقرتا، تا وامان لێ هات خەڵکی حوشترەکەی ژێر خۆی سەر دەبڕی تا ئاوی ناو سکەکەی بخواتەوە، پاشان ئەوی تری دەخستە جگەری.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە هەمیشە دوعاکانت بە خێر دەگیرێت، دەی هاواری تێ بکە، پێغەمبەریش فەرمووی: «اتحب ذالك» حەز دەکەیت دوعا بکەم؟ وتم: بەڵێ، دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان دای نەنایەوە، تا ئاسمان خۆی ئامادەکرد و هەور هات و بارانێکی لە سەرخۆ باری و هەموو شتەکانمان پڕ کرد لە ئاو و پاشان ڕۆیشتین سەیر بکەین بزانین تا کوێ باریوە دەبینین لەو لای سەربازگەکەمانەوە نەباریوە[2].

٣-ماڵ بەخشینی ئەبو بەکر لە تەبووکدا:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر هانی هاوەڵەکانی دەدا لەسەر ماڵ بەخشین و خێرکردن لە غەزای تەبووکدا، چونکە دەیزانی ڕێگەکە زۆر دوور و سوپای بێباوەڕان زۆرن، پەیمانی پاداشتی خودایی گەورەی دەدا بەو کەسانەی ماڵ و پارە دەبەخشن و هەموو هاوەڵان هەر یەکە و بە پێی توانای سامانی خۆی بە ئیسلام و عوسمانی کوڕی عەفان گەورەترین پشکی هەبوو لە ماڵ بەخشیندا لە پێناوی بەڕێکردنی ئەم غەزایە[3].

عومەر نیوەی سامانەکەی بەخشی و وای زانی پێش ئەبو بەکر دەداتەوە لەو کارەیدا، با واز بهێنین عومەر (ﷺ) خۆی بۆمان بگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژێك

---

[1] منصف عبدالرزاق (٤٩٧/٣) نقلا عن موسوعة فقه الصديق (لا: ٢٢٢).
[2] ابن حبان كتاب الجهاد باب غزوة التبوك (ژمارە ١٧٠٧).
[3] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (لا: ٦١٥).

فەرمانی دا بەسەر هەموومااندا تا ماڵ ببەخشین، لەو کاتەدا من پارەیەکم لە دەستدا بوو، وتم: ئەمڕۆ پێشی ئەبو بەکر دەدەمەوە، سامانەکەم کرد بە دوو بەشەوە و بەشێکی تەواویم هێنا و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم: ئەی چیت بۆ ماڵ و منداڵەکەت بەجێ هێشتووە؟ وتم: ئەوەندەی تر، دەڵێت: ئەبو بەکر هات و هەموو سامانەکەی خستە بەر دەستی پێغەمبەری خوا و پێغەمبەریش (ﷺ) پێی وت: ئەی چیت بۆ ماڵ و منداڵەکەت هێشتۆتەوە؟ وتی: خوا و پێغەمبەری خوام بۆ بە جیهێشتوونەتەوە، وتم: هەرگیز لە هیچ شتێکدا پێشبڕکێت لەگەڵ ناکەم[1].

ئەم خێرەی عومەر لە پێشبڕکێ و کێبڕکێی حەڵاڵەوە دەکرد، بەڵام ئەبو بەکر لەو باشتر بوو، سەیری کەسی نەدەکرد و لەبەر کێبڕکێی کەس ئەو کارەی نەدەکرد[2].

ب/ صدیق (ﷺ) دەبێتە ئەمیری حەج لە ساڵی (٩)ی کۆچیدا:

پەروەردەکردنی کۆمەڵگە و دروستکردنی دەوڵەت لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەسەر هەموو ئاستەکاندا بوو، لە بوارەکانی بیروباوەڕەوە بە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازی و پەرستشەوە بووە.

جێ بە جێکردنی فەرمانی حەجکردن لە ساڵانی ڕابردوودا نەکرابوو، حەجی ساڵی (٨)هەشتەمی کۆچی و لە دوای فەتحی مەککەوە و عەتابی کوڕی ئەسەید دانرابوو حەج بە موسوڵمانان بکات، تا ئەو ساتە وەختەش حەجی موسوڵمانان لە حەجی بێباوەڕان جیانەکرابووەوە[3].

کاتێك ساتە وەختی حەج هاتە پێشەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی حەج بکات، بەڵام فەرمووی: «انه يحضر البيت عراة المشركون يطوفون بالبيت، فلا احب ان أحج حتى لايكون ذلك»، واتا: بێباوەڕانیش دێن بۆ حەج و بە ڕووتی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕێنەوە و

---

[1] سنن ابي داود، كتاب الزكاة (٢/٣١٢-٣١٣)، **ژمارە ١٦٧٨ و ئەلبانی بە فەرموودەیەکی (حەسەن) دایناوە.**

[2] الفتاوى لإبن تيمية (١٠/٧٢-٧٣).

[3] دراسات في عهد النبوة، عماالدين خليل (لا: ٢٢٢).

منیش تا ئەوە بمێنێت حەز ناکەم حەج بکەم، بۆیە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)ی کرد بە ئەمیر و پێشەوای حاجیانی ساڵی نوێی کۆچی و هەر کە ئەبو بەکر حاجیانی ماڵی خوای خستەڕێ و لە مەدینە دەرچوون سورەتی (بەرائەت) هاتە خوارەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) عەلی بانگ کرد و فەرمانی پێدا خۆی بگەیەنێتە ئەبو بەکری صدیق و بە سواری حوشترەکەی پێغەمبەری خوا کە ناوی (عچباو) بوو لە (ذي حليفة) گەیشت بە ئەبو بەکر و کاتێك ئەبو بەکر چاوی پێ کەوت پێی وت: بە فەرمانڕەوایی هاتووی یان فەرمانبەر؟ وتی: بەڵکو فەرمانبەر، کەوتنە ڕێ و لەوێ ئەبو بەکر هەروەك حەجی سەردەمی نەفامی حەجی پێ کردن، حجی ئەو ساڵە لە مانگی (ذي الحجة)دا بوو، وەك زۆربەی ڕیوایەتەکان دەگێڕنەوە نەك لە مانگی (ذي العقدة) دا بووبێت، ئەبو بەکر پێش (نزويه) وتارێکی بۆ دان و لە عەرەفە و ڕۆژی قوربانی کردن و ڕۆژی (النفر الاول)دا وتاری بۆ دان فەرمانەکانی حەجی بۆ ڕوون دەکردنەوە، چۆن لە عەرەفە دەوەستن و چۆن دێنە خوارەوە و ڕۆژی سەربڕین و بەردبارانکردنی شەیتان و چەندان شتی تریشی بۆ باس دەکرن، عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش (ﷺ) لە دوای هەموو وتارێکی صدیق بە دەنگی بەرز سەرەتای سوڕەتی بەرائەی بۆ دەخوێندەوە پاشان بانگی بۆ چوار شت دەکرد: ناچێتە بەهەشتەوە جگە لە ئیماندار، کەس بە ڕووتی بە دەوری کەعبەدا ناسوڕێتەوە و (تەواف)ناکات، هەر کەس پەیمان لە نێوان ئەو و پێغەمبەری خوادا هەیە تا کاتی دیاریکراوی خۆی بەردەوام دەبێت، و لەم ساڵەش بە دواوە نابێت بت پەرست بێت بۆ حەج[1].

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) ئەبو هورەیرە و چەند کەسێ تری ڕاسپارد کە هاوکاریی عەلی بکەن لە ئەنجامدانی کارەکەیدا[2].

هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەرکی هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو بەڵێن و پەیماننامانەی لەگەڵ بت پەرستاندا دابووی دابەسەر عەلیدا لە کاتی حەجدا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو لەناو عەرەبدا وا باو بوو کە بەستنی پەیماننامە و هەڵوەشاندنەوەی دەبووایە سەرۆکی هۆز یان کەسێ لە نزیکەکانی بوایە و ئەمەش پێچەوانە نەبوو لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا بۆیە

[1] صحيح السيرة النبوية (لا: ٦٢٥).
[2] السيرة النبوية لإبن شعبة (٢/٥٣٧).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەشتە فریای کارەکە و علی نارد بە دوایاندا و لەبەر ئەم هۆیە بوو عەلی نارد تا سەرەتای سورەتی بەرائە بگەیەنێت، نەك ئەوەی شیعەکانی ڕافیزە دەیلێن گوایە ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عەلی شایانی خەلافەتە نەك ئەبوبکر! و لەسەرئەم مەسەلەیە دوکتور (محمد ئەبو شوهبە) دەڵێت: نازانم چۆن بێ ئاگا بوون لە وتەکەی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) کە بە عەلی (رضي الله عنه) وت: (امیر ام مأمور)[1]؟ واتە بە ئەمیری هاتووی یان هەر لەگەڵماندا بیت؟ وە چۆن فەرمانبەر شایانی خەلافەتە تا فەرمانڕەوا؟[2]

ئەم حەجەیش ڕێ خۆشکردن و پێشەکی بوو بۆ حەجە گەورەکە (حەجی ماڵئاوایی) و ئەبوبکر ڕای گەیاند کە سەردەمی بت پەرستی بەسەر چوو و سەردەمی نوێ هاتۆتە کایەوە و خەڵکیش لەسەریانە بێن بە دەم شەرعی خوای گەورەوە.

دوای ئەم ڕاگەیاندنەی کە لەناو هۆزەکانی عەرەبدا لەکەنداوی عەرەبیدا بڵاو بویەوە، بۆیان دەرکەوت مەسەلەکە ڕاستە و سەردەمی بت پەرستی بەسەر چوو بە تەواوی، ئیتر دەستیان کرد بەناردنی وەفد و ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونی خۆیان و هاتنە ناو بازنەی یەکتا پەرستی[3].

ج/ لە حەجی ماڵئاواییدا:

ئیمام ئەحمەد_ ڕەحمەتی خوای لێ بێ_ لە عبداللەی کوڕی زوبێر و ئەویش لە باوکی یەوە گێڕاویەتی یەوە کە ئەسمای کچی ئەبو بکر وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بە مەبەستی حەج کردن لە ماڵ دەرچوین تا گەیشتینە دۆڵی (عەرەج) و پێغەمبەری خوا لەوێ لایدا، و عائیشە لە پاڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو، و حوشترەکەی ئەبوبکر بە خزمەتکارەکەی بوو، ئەبو بەکریش دانیشتبوو هەر چاوەڕوانی دەکرد، تا خزمەتکارەکەی پەیدابوو بە بێ حوشترەکەی! وتی: ئەی حوشترەکەت کوا؟ وتی: دوێنێ لێم ون بوو! دەستی کرد بە لێدانی و

[1] صحيح السسيرة النبوية (لا: ٧٢٤).
[2] السيره النبويه لإبن شعبه (٢/٥٤٠).
[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پێغەمبەری خواش بە زەردەخەنەوە پێکەنی و دەیفەرموو: (إنظروا الی هذا المحرم کیف یصنع) واتا: سەیری ئەم پیاوە کەن لای خۆی پۆشاکی (إحرام)ی پۆشیوە، چی دەکات![1]



## جێ باسی پێنجەم

ئەبوبەکر لە کۆمەڵگای مەدینــەدا، لەگــەڵ هەنــدێ لــە ڕەوشــتەکانی و هەنــدێ لــە چاکیەکانی:

ژیانی ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە کۆمەڵگەی مەدینەدا پڕیەتی لــە وانــە و پەنــدی بەسود و نمونەیەکی زیندوی تێگەیشتنی زیندوی ئیسلام و جێ بەجێ کردنیەتی لەناو خەڵکیــدا، کەسایەتی صدیق (ﷺ) کۆمەڵێ ڕەوشتی گەورە وە لە خەڵکانی تر جیادەبێتەوە، وەسپ کردنی لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە زۆر فەرموودەدا کــە جیــایی و پێــشکەوتنی لــە زۆری هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) خوا لە هەمویان ڕازی بێت.

١- هەڵوێستی لەگەڵ (فەحناس) زانای جولەکەکان:

زیاتر لەیەك کەس لە ژیاننامە نووس و لێکدەرەوانی قورئان باسی ئــەوەیان کــردووە کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) جارێکیان دەڕواتــە (میــدراس) کــە تایبــەت بــوە بــە تــەورات خوێندنــەوەوە، دەبینــێ کــە هــەموو جولەکــەکان دەوریــان گرتــووە، لــە پیاوێــك پێیــان دەوت (فەحناس) کە یەکێ بوو لەشارەزا و خوێندەوارەکانیان، لەو کاتەدا زانایەکی تریان لەوێ بوو بــە ناوی (ئەشیع)[2]، ئەبو بەکری (ﷺ) بە فەحناسی وت: بێ قەزابی،! لە خوا بترسە و موســوڵمان ببە، سوێند بە خوا تۆ بــاش دەزانیــت کــە محمــد پێغەمبــەری خوایــە، لــە لایــەن خــواوە ئــەو ڕاستیانەتان بۆ باس کراوە، لە ناو تەورات و ئینجیلــی خۆتانــا تۆمــار کــراوە، فــەحناس وتــی: سوێند بە خوا ئەی ئەبو بەکر هەژار نین پێویستمان بە خوا نیە، ئەو پێویستی بە ئێمەیە، ئێمــە لێی ناپاڕێینەوە و بەڵکو ئەو لێمان دەپاڕێتەوە، ئێمە دەوڵەمەندین و نامانکەوێتە ئەو بگرە ئەو دەیکەوێتە ئێمە، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە بۆ قەرز لــە ئێمــە دەکــات وەك هاوڕێکــەتان دەڵێــت:

---

[1] مسند احمد (٦/٣٤٤).
[2] السیرة النبویة لإبن هشام (١/٥٥٨-٥٥٩).

بەرگری لە سوو خواردن لە ئێمە دەکات بەڵام سوومان دەداتێ، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە سووی پێ نەدەداین، ئەبو بەکر زۆر ڕقی هەستا و بە بۆکز هات بە دەم و چاوی فەحناسدا و پیس لێیدا و پێی وت: ئەگەر لەبەر ئەو پەیماننامەیەی نێوانمان نەبوایە ئێستا ئەمدا لە ملت ئەی دوژمنی خوا.

(فەحناس) چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی: ئەی محمد سەیر کە هاوڕێکەت چی بەسەر هێناوم؟ پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو بەکری فەرموو: ما حملك على ما صنعت؟ چی وای لێ کردی کە وای لێ بکەیت؟ ئەبو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم دوژمنی خوایە قسەیەکی زۆر گەورەی کردووە، ئەمە وا گومان دەبات خوای گەورە هەژارە و ئەمان دەوڵەمەندن، هەر کە وای وت منیش لەبەر خاتری خوا خۆم پێ نەگیرا و تووڕە بووم و کێشام بە دەم و چاویدا.

(فەحناس) وتی شتی وام نەوتووە، خوای گەورەش ئایەتی قورئانی ناردە خوارەوە دەربارەی قسەکەی فەحناس وەڵامی ئەوی دایەوە و ڕاستی وتەی ئەبو بەکری ڕاگەیاند و فەرمووی: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾ (ال عمران: ١٨١)، واتا: بە ڕاستی خوای گەورە بیستی وتەی ئەوانەی وتیان خوای گەورە هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین، ئەو قسەیەیان لەسەر دەنووسین و پێشتریش پێغەمبەرانینان بێ تاوان کوشتووە، لە قیامەتدا پێیان دەڵێین: سزای سووتێنەر بچەژن.

هەر دەربارەی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) و ئەو تووڕەبوونەی کە نواندی[1] وتەی خوای گەورە هاتە خوارەوە و فەرمووی: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ

[1] تفسير القرطبي (٤/٢٩٥).

مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾ (ال عمران: ١٨٦).

واتا: له خۆیشتان و ماڵ و منداڵیشتان تاقی دەکرێنەوە و له جوولەکه و گاورانی پێش خۆتان و له بتپەرستەکانیش وتەی ناشرین زۆر دەبیستن، ئەگەر ئارام بگرن و له خوای خۆتان بترسن ئەوا کارێکی زۆر گەورە و مەزنە.

٢- پاراستنی نهێنی پێغەمبەر (ﷺ):

عومەری کوڕی خەتاب وتی: به مردنی خونەسی کوڕی حوزافه (رضي الله عنه) که بەشداربوونی جەنگی بەدر بوو حەفصه بێوەژن کەوت، گەیشتم به عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) وتم ئەگەر پێت خۆش بێت حەفصەت لێ ماره دەکەم، ئەویش وتی با بزانم، پاش ماوەیەك پێم گەیشت و وتی: وا بزانم لەمڕۆژانه ژن نەهێنم باشه، پاشان گەیشتم به ئەبو بەکر و هەمان داوام لێ کردبەڵام بێدەنگ بوو، ئەوەم به لاوه قورستر بوو تا نەهێنانەکەی عوسمان، چەند شەوێك ماوەوه و پاش ئەوه پێغەمبەری خوا داوای کرد لێم و منیش مارەم بڕی لێی، پاش ئەوه ئەبو بەکرم پێ گەیشت و وتی: لەوانەیه دڵت شتێکی کردبێت که وەڵامم نەدایتەوه، وتم: بەڵێ، وتی: لەبەر هیچ شتێك نەبوو که وەڵامم نەدایتەوه تەنها لەبەر ئەوه نەبێت که زانیم پێغەمبەری خوا ناوی هێنا و منیش حەزم نەکرد نهێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدرکێنم و ئەگەر نەیخواستایه خۆم مارەم دەکرد[1]!

٣- ئەبو بەکر و ئایەتی نوێژی هەینی:

جابری کوڕی عبدالله (رضي الله عنه) دەڵێت: له کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) وتاری ڕۆژی هەینی دەخوێندەوه، قافڵەی بازرگانی شاری مەدینه گەیشته ناوشار، و هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر چوون به دەمیەوه و کەس به تەنها له مزگەوتدا نەما تەنها دوانزه کەس نەبێت، ئەم ئایەته

[1] الفتح (٨١/٩) الطبقات الكبرى (٨٢/٨).

دابەزیە خوارەوە ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا ۚ قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ ۚ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ ﴿١١﴾﴾ (الجمعه:١١).

واتە کاتێ کە بازرگانی و شتی بێ بایەخیان بینی هەموو ڕایان کرد بە دەمیەوە و تۆیان بەتەنیا بە پێوە هێشتەوە، ئەی محمد پێیان ڕابگەیەنە کە ئەوەی لای خودا ئامادە کراوە بۆتان زۆر لە بازرگانی و شتانی بێ بایەخ باشترە و خوایش باشترین ڕۆزی دەرە.

جابر دەڵێ: ئەبوبکر و عمر یەکێ بوون لە (١٢) کەسەی مانەوە لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ)[1].

٤- پێغەمبەری خوا خۆ بەزلزانی لە ئەبو بەکر بە دوور دەگرێت:

لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «من جرّ ثوبه خيلاءً لم ينظر الله اليه يوم القيامة» واتا: هەر کەسێك جلەکانی بە زەویدا بخشێنێت بۆ فیز و خۆ هەڵنان، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری ناکات، لێرەدا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتی: من لایەکی جلەکانم لە زەوی دەخشێت بەڵام هەر خووم پێوە گرتووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «انك لست تصنع ذلك خيلاءً»[2]، واتا: تۆ ئەی ئەبو بەکر لەو کەسانە نیت کە بۆ فیز و خۆ بە زلزانی دەیکەن.

٥- ئەبو بەکر و لە حەڵاڵ پرسین:

لە قەیسی کوڕی ئەبو حازمەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئەبو بەکر (رضي الله عنه) خزمەتکارێکی هەبوو، هەر کاتێك شتێکی لە شوێنێك پەیدا بکردایە و بە دەستیەوە بوایە، ئەبو بەکر نەیدەخوارد تا پرسیاری سەرچاوەکەی نەکردایە، ئەگەر پێی باش بوایە دەیخوارد و ئەگەر پێی باش نەبوایە نەیدەخوارد.

[1] الاحسان في التقريب صحيح ابن حيان (٣٠٠/١٥)، مسلم **ژمارە ٨٦٣**.
[2] البخاری **ژمارە** (٣٦٦).

بەڵام شەوێکیان لە بیری چوو پرسیاری لێ بکات و شتەکەی خوارد و پاشان لێی پرسی و ئەویش پێی وت: لەو شوێنە پەیدام کردووە و ئەمیش پێی ناخۆش بوو، بۆیە دەستی کرد بە قوڕگی خۆیدا و هەرچی خواردبوو خۆی ڕشاندەوە[1].

ئەمە نموونەیەکی جوانە لە (وەرعی) ئەبو بەکر لە خواردن و خواردنەوەیدا زۆر ئاگاداری حەڵاڵ و حەرام بوو، لەو شتانەش بە دوور دەکەوتەوە کە گومانی حەرامی لێ بکرێت (شبهات)، ئەم ڕەوشتەش ئەوپەڕی مانای تەقوا و لە خوا ترسانە، لە ئیسلامیشدا گرنگی ئەو کەسانە شاراوە نیە کە خۆیان لە حەرام دەپارێزن لە خواردن و خواردنەوە و پۆشاکیاندا، ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بە وەرگرتن و وەرنەگرتنی دوعا و پاڕانەوەکانە[2]، هەروەك لە فەرموودەی (أشعث أغبر)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: «يميده الى السماء، يارب، يارب، ومطعمه حرام ومشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام، فانّى يستجاب لذلك»[3]، واتا: دەست بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەڵێت «خوایە گیان... کەچی خواردنی حەرامە، خواردنەوەی حەرامە، جلوبەرگی حەرامە و بە حەرام گۆش کراوە، ئیتر چۆن نزاکەی وەردەگیرێت».

٦- بمکەنە ژوور لە ئاشتیدا وەك چۆن لە شەڕدا کردمتانە ژوور:

جارێکیان ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لە دەنگی قیڕەی عائیشە بوو، کاتێك لێی نزیك بوویەوە خەریك بوو زلەیەکی لێبدات وتی: دەبینم خەریکە دەنگ بەسەر پێغەمبەری خوا هەڵدەبڕیت ها... پێغەمبەری خوایش چووە نێوانیان و نەیهێشت لێی بدات، ئەبو بەکریش بە توڕەییەوە چووە دەرەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك ئەبو بەکر دەرچوو بە عائیشەی فەرموو: «أرأيت كيف أنقذتك من الرجل»، واتا: بینیت چۆن ڕزگارم کردیت لە دەستی ئەو پیاوە؟ ئەبو بەکر (رضي الله عنه) چەند ڕۆژێك مایەوە و پاشان مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خواست و دەبینێت ئاشت بوونەتەوە، پێی وتن: لە

[1] الزهد لإمام احمد (١١٠) نقلا عن التأريخ الاسلامى للحميدي (١٣/١٩).
[2] التأريخ الاسلامي للحميدي (١٣/١٩).
[3] **مسلم ژمارە ١٠١٥ (٧٠٣/٢).**

ئاشتیتاندا بمکەنە ژوور هەروەك چۆن لە شەڕەکەتاندا منتان کردە ژوور، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەی وا دەکەین[1].

**٧- فەرمان بە چاکەکردن و بەرگری لە خراپە کردنی:**

ئەبو بەکر لە ڕۆژی جەژن خۆی کرد بەماڵی عائیشەدا، دوو کیژی ئەنصاری لە لا بوو گۆرانیان بۆ دەگوت... ئەبو بەکر وتی: «امزمور الشیطان في بیت رسول الله (ﷺ)؟»، واتا: ئایا ئاوازی شەیتان لە ماڵی پێغەمبەردایە؟ پێغەمبەری خواش لە ژوورەوە بوو ڕووی لە دیوارەکەوە بوو فەرمووی: وازیان لێ بێنە ئەبو بەکر، هەموو گەلێك جەژنی خۆی هەیە و ئێمەش ئەمە جەژنمانە جەژنی گەلی ئیسلام[2].

بەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە هاوەڵانی کۆنەبوونەتەوە بۆ گوێ گرتن و عادەتی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) نەبووە، لەبەر ئەوەیشە کە صدیق ناوی لێنا (ئاوازی شەیتان).

پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بوو ئەو کیژۆڵانە گۆرانی بڵێن بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەمڕۆ جەژنیانە، منداڵانیش ڕێگەی یاری و خۆشیان لە جەژناندا پێدراوە وەك لە فەرموودەدا هاتووە: «لیعلم المشرکون ان فی دیننا فسحه»[3]، واتا: تا بێباوەڕان بزانن لە ئایینی ئێمە فراوانی هەیە.

وە عائیشە هەندێك یاری هەبوو یاری پێ دەکردن و کچانی هاوڕێشی دەهاتن بۆ ئەوێ پێکەوە یاریان دەکرد، لە ناو فەرموودەکە ئەوەی تیا نیە کە پێغەمبەری خوا گوێی لێ گرتبوون، کردن و نەکردنیش پەیوەندی بە گوێگرتنەوە هەیە نەك تەنها گوێ لێ بوون[4].

کەواتە بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوانەی بۆیان هەیە یاری بکەن لە جەژندا ئەتوانن یاری خۆیان بکەن، وەك ئەو کچۆڵەیەی پشتیوانان کە لە ماڵی عائیشەدا گۆرانیان دەووت[1].

---

[1] ابو داوود (٤٩٩٩) وضعف الاباني له (ضیف ابي داوود).

[2] مسلم في صلاة العیدین ژمارە ٨٩٢. دەقە عەرەبیەکەی (دعها یا أبا بکر، فان لکل قوم عیدا، و هذا عیدنا اهل الاسلام).

[3] الفتاوی (١١/٨٠) و مسند احمد (٦/١١٦/٢٢٣) عن عائیشة.

[4] هەمان سەرچاوە (١١٨/٣٠).

٨- ڕێزگرتنی لە میوان:

عبدالرحمن کوڕی ئەبو بەکر دەڵێت: «أصحاب الصُّفّه» کۆمەڵە موسوڵمانێکی هەژار بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جارێکیان وتی: «من كان عند طعام الإثنين فليذهب به للثالث ومن كان له طعام أربعة فاليذهب به للخامس»، واتا: هەر کەسێك خواردنی دوو کەسی هەیە با بەشی سێیەمیشی لێبدات، هەر کەسێك خواردنی چوار کەسی هەیە با بەشی پێنجەمیشی لێ بدات.

ئێوارەیەك ئەبو بەکر (ﷺ) لە ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نانی خوارد و پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك لە شەو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، خێزانەکەی پێی وت: تۆ لە کوێ بوویت میوانت هەیە؟ پێی وت: چیت پێداون بیخۆن؟ وتی: وتیان دەمی بۆ نابەین تا نەیەیتەوە، خواردنیان بۆ برا بەڵام ئەوان سەرکەوتن و نەیان خوارد.

ئەبو بەکر دەڵێت: ڕۆیشتم و خۆم حەشارد و پاشان هەندێك قسەم پێ وتن، پاشان وتی: بخۆن نۆشی گیانتان بێت، سوێند بە خوا هەرگیز من نایخۆم – پێشی ئێوە – و میوانەکان سوێندیان خوارد تا ئەو نان نەخوات ئەوانیش نەیخۆن، ئەبو بەکر (ﷺ)وتی: ئەمە کاری شەیتانە، دەڵێت: بانگی خواردنی کرد و هێنایان و تێری خوارد و، وتی: سوێند بە خوا تیکەیەکمان نەدەخوارد کە خواردنەکە دوای ئەو زیاد نەکات، دەڵێت تا تێریان خوارد و خواردنەکە لە یەکەم جار زیاتر بوو، ئەبو بەکر سەیری کرد دەبینێت وەك خۆی ماوەتەوە و کەمی نەکردووە و بە خێزانەکەی وت: ئەی خوشکی بەنی فیراس ئەمە چیە؟ وتی: نا بە بینایی چاوانم (قرە عینی) ئەو خواردنە ئێستە سێ قات زیاترە لە پێشتر، ئەبو بەکر دەستی کرد بە خواردنی نانەکە و وتی: ئەو سوێندە لە شەیتانەوە بوو کە من خواردم و پاشان تیکەیەکی خوارد و ئەمەی تری هەڵگرت و بردی بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەیانیەکەیدا و لە نێوان ئێمە و کۆمەڵێك کەسدا پەیمان هەبوو کاتەکەی هات و بڵاوبووینەوە بۆ دوانزە کەس و هەر کەسێکیش لەوان کۆمەڵێك کەسی لەگەڵدا بوومەگەر خوا بزانێت چەندێ بوون هەر هەموویان تێر و پڕیان لێ خوارد[٢].

---

[١] هەمان سەرچاوە (٣٠/١١٨).

[٢] مسلم كتاب الاشربة ژمارە (٢٠٥٧).

لەم بەسەرهاتەدا کۆمەڵێك پەند و ئامۆژگاری لە خۆ گرتووە لەوانە:

أ- سوور بوونی صدیق (ﷺ) لەسەر جێ بەجێ کردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر تایبەت بە ڕێزنان لە میوان وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فقربه الیهم قال الا تأکلون﴾، واتا: ئیبراهیم (علیه السلام) خواردنەکەی لە میوانەکان نزیك کردەوەو پێی وتن: ئەو ناخۆن؟ یان فەرموودەی پێغەمبەر کە دەفەرموویت: «من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیکرم ضیفه»، واتا: هەر کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوان بگرێت.

ب- لەم بەسەرهاتەشدا یەکێك لە (کرامە)[1]تەکانی صدیق بەدی دەکرێت، کە پارووپەکی نەبردووە بۆ دەمی خواردنەکە زیاتر بووە لە پێشتر و کەمی نەکردووە، هەموو تێربوون و خواردنەکەش وەك خۆی بووە، ئەبو بەکر و خێزانەکەی سەیریان کرد دەبینن وەك خۆیەتی و کەم ناکات. پاشان بردی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش دای بە خەڵکانێکی زۆر و هەموویانی تێرکرد[2]، ئەم کەرامەتەش صدیق (ﷺ) لە بەرەکەتی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە وەریگرتبوو لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە.

ئەمەش دەکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی لە دۆستانی خوایە، چونکە دۆستانی خوا بەو شێوەیە دەژین کە شوێنکەوتەی محمد دەبن (ﷺ) هەرچی بدات بەسەریاندا بە گوێی دەکەن و هەرچیان لێ قەدەغە بکات قەدەغەی دەکەن. شوێنی دەکەون لە هەر شتێکدا کە بزانن دەبێت شوێنی بکەون و خوای گەورەش بە فریشتە و سەربازانی خۆی پشتگیری دەکات و لە نووری خۆی دەهاوێتە نێو دڵیان، بە کۆمەڵێك (کەرامات) زیاتر ڕێزداریان دەکات وەك چۆن بەندە و دۆستی لە خوا ترسیەکان ڕێزدار دەکات.

---

[1] کەرامەت: هەندێك ڕووداوی نائاسایی لەسەر دەستی پیاوچاکان بەدی دەکرێت بە مەرجێك خۆی پێشتر بەو کەرامەتە نەزانێت لە کتو پڕیدا لەسەر دەستی ڕوودەدات و ئەمەش تایبەتە بە پیاوچاکان و لە خواترسان وەك چۆن (معجزة) تایبەتە بە پێغەمبەران.

[2] الفتاوی (١١/١٥٣).

ج- عائیشە دایکی باوەڕداران (خوای لیّ ڕازی بێت) دەڵێت: ئەبو بەکر هەرگیز سوێندی خۆی نەشکاندووە، تا ئایەتی (کەفارەتی سوێند) هاتە خوارەوە، وتی: سوێند بۆ هەر شتێك بخۆم و بزانم خێر لە شتێکی تر دایە ئەوە سوێندەکەم دەشکێنم و ئەو کارە خێرە دەکەم و پاشان کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم[1].

هەر کاتێك سوێندی بۆ شتێك بخواردایە و بەڵام دوایی لە شتی تردا خێری بدیایە کەفارەتەکەی دەدا و کارە خێرەکەی دەکرد، لەم چیرۆکەوە ئەمەمان بۆ دەردەکەوێت چونکە سوێندەکەی خۆی واز لێهێنا لەبەر ڕێزی میوانەکان و دەستی کرد بە خواردن لەگەڵیاندا[2].

٩- ئەمە یەکەمین هۆی پیرۆزیتان نیە ئەی ئەبو بەکر:

عائیشە (خوای لیّ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەرچووین لە یەکێك لە دەرچوون و گەشتەکانیدا تا گەیشتینە ناوچەی بیدا یان (ذات الجیش) ملوانکەکەم لە مل دا نەمابوو، پێغەمبەری خوا دەستی کرد بە گەڕان بە دوایدا و خەڵکەکەش هەموو دەستیان کرد بە گەڕان لەگەڵیدا و شوێنەکەش وشکە دۆڵ بوو ئاوی لیّ نەبوو و خەڵکەکەش ئاویان پیّ نەمابوو، خەڵکی هاتن بۆ لای ئەبو بەکر و پێیان وت: نابینی عائیشە چی کردووە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) موسوڵمانانیشی ڕاوەستاندووە لە جێگەیەکدا کە نە ئاوی لێیە و نە ئاویان پێیە، ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) هات لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا سەری خستبووە سەر ڕانم و خەوی لیّ کەوتبوو پێی وتم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خەڵکەکەت لە شوێنێکدا ڕاگیر کردووە کە نە ئاوی لێیە و نە ئاویان پێیە، وتم: سەرزەنشتم بکە و ئەویش ئەوەندەی قسە پیّ وتم تا خوا دەڵیّ بەسە، وە بە دەم قسەوە دەیکوتایە کەلەکەم و منیش لە ترسی ئەوەی پێغەمبەری خوا بە خەبەر نەیەت نەدەجوڵام و پێغەمبەری خوا تا بە یانی خەوت بەبیّ ئاو، خوای گەورەش ئایەتی تەیەمومی ناردەخوارەوە و فەرمووی: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ (النساء:٤٣)، واتا: ئەگەر ئاو نەبوو بە خۆڵی گڵ دەست نوێژ بگرن.

---

[1] سنن البيهقي (١٠/٣٤).
[2] موسوعة فقه ابو بكر (لا:٢٤١).

ئوسەیدی کوڕی حوزەیر (ﷺ) وتی: (یەکەمین بەرەکەتی ئێوە نیە ئەی ئالی ئەبو بەکر) و عائیشە دەڵێت: چووین سەیری لای حوشترەکەمان کرد کە من سواری بووم، بینیمان لە ژێریایەتی و بینیمانەوە[1].

لەم چیرۆکەشەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەبو بەکر (ﷺ)تا چ ڕاددەیەك ڕێز و ئەدەبی لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) نواندووە و چۆن ناڕەحەت بووە و تێك چووە ئەگەر (محمد) توشی شتێك بوو بێت و قبوولی ئەو ناڕەحەت کردنەشی نەکردووە ئەگەر لە نزیکترین کەسی خۆیشیەوە بوو بێت و لە نازدارترین کەسی پێغەمبەرەوە بوو بێت کە عائیشەیە (خوای لێ ڕازی بێت).

بە ڕاستی ئەبو بەکر پێشەنگی بانگخوازانە لە نواندنی ئەدەبی لە ڕادەبەدەر بەرامبەر پێغەمبەری خوا و لەگەڵ خۆیدا و لەگەڵ موسوڵمانانیشدا[2].

١٠- پشتگیری پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ صدیق (ﷺ):

لە فەرموودە صەحیحەکاندا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی ئەبو بەکری گرتووە و نەیهێشتووە کەس بەرامبەری بوەستێت، ئەبی دەردا (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: «لەگەڵ پێغەمبەری خوا دانیشتبووم ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) بە خێرایی هات بۆ لامان و چمکی عەباکەی بە دەست گرتبوو تا ئەژنۆی هەڵکردبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: «أما صاحبکم فقد غامر»، واتا: هەرچی دەڕوانم هاوڕێکەتان شەڕی کردووە، وە سڵاوی کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێك لە نێوان من و عومەری کوڕی خەتاب ڕوویدا خێرا چوومەوە بۆ لای و پەشیمانی خۆمم بۆ دەربڕی و داوام لێ کرد لێم خۆش ببێت کەچی ئەو وتی لێت خۆش نابم و منیش هاتم بۆ لای تۆ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: «یغفر الله لك یا أبا بکر»، دەك خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبو بەکر و سێ جار دووبارەی کردەوە».

---

[1] البخاری ژمارە ٣٦٧٢.

[2] تأریخ الدعوة الاسلامیة (لا:٤٠٢-٤٠٣).

پاشان عومەر پەشیمان بوویەوە و هات بۆ ماڵی ئەبو بەکر و وتی: ئەبو بەکر لە ماڵەوەیە؟ وتیان: نا، هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و سلاَوی لیَ کرد و لەو کاتەدا بەرچاوی پێغەمبەر ڕەش بوو بوو.

تا ئەبو بەکر بەزەیی بە پێغەمبەردا هاتەوە و لەبەر دەمیدا بە چۆکدا کەوت و دووجار لەسەر یەك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خوا خەتای من بووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: «إنّ الله بعثني اليكم، فقلتم كذبت وقال ابو بكر: صدق، وواساني بنفسه وماله، فهل أنتم تاركوا لي صاحبي»، واتا: دووجار لەسەر یەك وتی: خوای گەورە منی نارد بۆ ناو ئێوە وتتان درۆ دەکەیت کەچی ئەو وتی: ڕاستەکەیت، بە گیان و سامانی پشتگیری منی کردووە و دڵی خۆش کردووم دەی ئێوە ئیتر بۆچی واز لە هاوڕێکەی من ناهێنن؟! پاش ئەوە هەرگیز ئازاری نەدراوە[1].

لەم چیرۆکەشدا پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە لەوانە: سروشتی مرۆڤانەی هاوەڵان کە ناکۆکی لە نێوانیان ڕوویداوە و خێرا پەشیمان بوونەوەی ئەوەی هەڵە و لەسەر ناهەق بووە و داوای لێبووردن کردن و چاو پۆشی لە برا موسولمانەکەی، خۆشەویستی هاوەڵان لە ناو یەکدا و شوێن و پلە و پایەی صدیق لە لای پێغەمبەری خوا و هاوەڵان... تا دوایی...

١١- بڵێ: خوا لێت خۆش ببێت ئەی ئەبو بەکر:

ڕەبیعەی ئەسلەمی (رضي الله عنه) وتی: من خزمەتی پێغەمبەری خوام دەکرد... فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە و پاشان وتی: پێغەمبەری خوا پارچەیەك زەوی دا بە من و پارچەیەکیشی بە ئەبو بەکر دا، شتی دونیایی هاتە پێشەوە و من و ئەبو بەکر لەسەر دار خورمایەك دەمان تێك گیرا، من وتم: لەناو زەویەکەی مندایە، ئەبو بەکریش دەیووت: نەخێر لە زەویەکەی مندایە، لەو بارەیەوە قسە کەوتە نێوانمان و ئەبو بەکر قسەیەکی ناشرینی پێ وتم و خۆیشی پەشیمان بوویەوە و پێی وتم: تۆش قسەیەکی وام پێ بڵێ تا ببین بە هەق بە هەق، دەڵێت: وتم من شتی وا ناکەم.

---

[1] مسند امام أحمد (٤/٥٨-٥٩).

ئەبو بەکر وتی: ئەیکەی باشە ئەگینا سکالای خۆم دەبەمە بەر دەمی پێغەمبەری خوا بۆت، وتم: هەر نایکەم، ئەویش زەویەکەی بەجێهێشت و خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش بە دوایدا، هەندێك خزم و کەسی ئەسلەم هاتن و وتیان پێم: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو بەکر، هێشتا ئەو شکات دەکات کە ئەو قسەیەشی کردووە، منیش وتم: ئەزانن ئەمە کێیە؟ ئەمە (ئەبو بەکری صدیق)ە و ئەمە دووەم کەسەکەی ناو ئەشکەوتە و حورمەتدار و ڕیش سپیەکەی ناو موسوڵمانانە، نەکەن بێن و لاکاتەوە و بزانێت کە ئێوە لەسەر من دەکەنەوە تووڕە ببێت و پێغەمبەری خوایش لەبەر ئەو لە من تووڕە ببێت و خوای گەورەیش بە تووڕە بوونی پێغەمبەرەکەی لە من تووڕە دەبێت و (ڕەبیعە) لە ناو دەچێت. وتیان ئەی چی دەڵێیت؟ وتی: بگەڕێنەوە.

دەڵێ: ئەبو بەکر (ﷺ) خۆی گەیاندە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش بە تەنها بە دوایدا بووم و مەسەلەکەی وەك خۆی بۆ گێڕایەوە و قسەکەشی کە بە منی وتبوو بۆی باس کرد وتم پێی: قسەکەم پێ بڵێرەوە تا هەق بە هەق دەربچین، وتم: نایڵێم، پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی: «أجل فلا ترد عليه ولكن قل: غفر الله لك يا أبا بكر»، واتا: زۆر باشە پێی مەڵێرەوە بەڵام پێی بڵێ: خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبو بەکر، منیش وتم: خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبو بەکر، حەسەنی بەسری دەڵێت: «ئەبو بەکر بە دەم گریانەوە هەستا و ڕۆیشتەوە»[1].

«هەر بۆ خوا ئەم ویژدانە چ ویژدانێك؟! ئەم دەروونەش چ دەروونێکە؟! شتێکی لە دەم دەرچووە بەرامبەر بە برایەکی موسوڵمان بە هیچ ڕازی نابێت تا تۆڵەی ئەو شتە وەرنەگرێتەوە و لێی خۆش بێت، ئەوپەڕی ڕەوشت بەرزی و ڕاگرتنی هەست و شعور لە کاتی گوناە کردنیدا و هەموو دڵی داگیر دەکات، لە دەم دەرچوونی قسەیەك با بچووکیش بێت ببێتە ئێشێك و بەر بێتە ویژدان، دانامرکێتەوە تا تۆڵەی لێ نەکەنەوە و ئەو موسوڵمانە لە خۆی ڕازی بکاتەوە»[2].

خۆ جنێوێکی گەورە نەبوو، بەڵام ئێشی بە (ڕەبیعە) گەیاند، هەر ئەوەی زانی ئەبو بەکر هەموو گیانی کەوتە هەژان، وە ڕازی نەبوو تۆڵەی لێ نەکرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کاتە

---

[1] مسند احمد (٤/٥٨-٥٩).
[2] اشهر مشاهير الاسلام (١/٨٨).

دووەم پیاوی ئیسلام بوو دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وشەیەکی پێ وتبوو زۆر ناشیرین نەبوو چونکە ڕەوشتی بەرزی ڕێگەی پێ نەدەدا و لە سەردەمی نەفامیشدا شتی وای لێ نەبیستراوە[1].

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە گەوجێتی ئەو وشەیە زۆر ترسا، بۆیە سکالاّی خۆی بردە بەردەم پێغەمبەری خوا، ئەمەش شتێکی سەیرە کە ئەبو بەکر لە تاو ئەو وشەیە مەسەلەی زەویەکەی و ناکۆکی نێوان خۆی و ڕەبیعەی لە بیر چوویەوە، چونکە مافی خەڵکەکان پێویستە خاوەنەکەی لێی خۆش بێت[2]...

لەمەشەوە وانەیەکی گەورە بەدی دەکەین بۆ زانایان و مامۆستایان و کاربەدەستان و بانگخوازان لە چۆنیەتی چارەسەرکردنی هەڵە و لەبەر چاوگرتنی مافی خەڵکی و پێ پیانانی.

هەندێك لە خزمانی ڕەبیعە ئەم کارەی ڕەبیعەیان پێ باش نەبوو، کە ئەبو بەکر قسەکەشی وتووە کەچی شکاتیش دەکات لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوان ئەوەیان نەدەزانی کە ئەبو بەکر دەیزانی لە نەهێشتنی کێشەی ناکۆکی، لابردنی ئەو شتانەی دەنووسین بە دڵەکانەوە و — خۆشەویستی ناهێڵن — لە دونیا پێش ئەوەی بنووسرێت لە سەریان لە نامەی کردەوەکانیاندا و لێپرسینەوەی لەسەر بێت لە ڕۆژی دواییدا.

لەگەڵ ئەوەی کە ڕەبیعە لێی ڕازی بوو، ئامادەش نەبوو لە بەردەمی پێغەمبەردا قسەکەی پێ بڵێتەوە کەچی ئەبو بەکر لە ترس و خۆفی خودا دەستی کرد بە گریان، کە ئەمەش بەڵگەی بەهێزی باوەڕی بتەوی یەقین و دڵنیاییەکەی.

لە کۆتاییدا هەڵوێستەکەی ڕەبیعەش شایانی ئەوەیە هەڵوێستەیەکی لەبەردەمدا بکەین کە چۆن ڕێزی لە ئەبو بەکر گرت و ئامادە نەبوو قسەکەی پێ بڵێتەوە، ئەمەش ڕێزدانانە بۆ بەڕێزان و خاوەن زانست و چاکەکان و بەڵگەشە لەسەر بتەوی ئایین و گەورەیی ئەقڵی[3].

١٢- پێشبڕکێی لە کاری چاکدا:

---

[1] خلفاء الرسول، خالد محمد خالد (لا: ١٠٣).
[2] التأريخ الاسلام (١٦/١٩).
[3] هەمان سەرچاوی پێشوو.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) بە ڕەوشت بەرز وەسف کراوە، بە پێشبڕکێ کردنی کاری چاکە ناوبانگی دەرکردووە تا وای لێهاتووە لە کاری چاکەدا بۆتە پێشەنگ، لە خێرکردندا چاوی لێکراوە، زۆر سوور بووە لەسەر خێرکردن، زۆر لەوە دڵنیا بوو کە ئەوەی ئەمڕۆ بۆ مرۆڤ دەکرێت لەوانەیە سبەینێ بۆی نەلوێت، چونکە ئەمڕۆ کردە و کردن هەیە و لێپرسینەوە نیە و سبەینێ لێپرسینەوە دەبێت و کردە و کردن نامێنێت، بۆیە هەردەم لەوانە بوو زۆر خێرا دەچوو بە دەم کاری چاکەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «من أصبح منكم صائما؟»، واتا: کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە ڕۆژووە؟ ئەبو بەکر وتی: من، فەرمووی: فمن تبع منكم جنازة؟ کێ لە ئێوە ئەمڕۆ لەگەڵ مردوویەکدا چووە بۆسەر قەبران؟ ئەبو بەکر وتی: من، پێغەمبەر فەرمووی: من أطعم منكم مسكينا؟ئەی کێ ئەمڕۆ هەژارێکی تێر کردووە؟ ئەبو بەکر وتی: من، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ما اجتمعن في امرىءٍ إلا دخل الجنه»[1]، واتا: ئەم کارانە لە هەر کەسێکدا کۆ ببنەوە ئەیبەنە بەهەشت.

١٣- ڕق خواردنەوەی:

ئەبو هورەیرەوە (ﷺ) وتی: پیاوێك جنێوی بە ئەبو بەکر دا و پێغەمبەری خوایش (ﷺ) دانیشتبوو، پێغەمبەری خوا سەری سووڕ دەما و زەردەخەنە گرتبووی، کاتێك کابرا هەر بەردەوام دووبارەی دەکردەوە، ئەبو بەکر هەندێك لە قسەکانی پێ وتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووڕە بوو هەستا و ڕۆیی و ئەبو بەکریش هەستا و کەوتە دوای و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ دانیشبووی و ئەو قسەی پێ دەوتم و کە زانیم هەر واز ناهێنێت، هەندێك لە قسەکانیم پێ وتەوە، کەچی تۆ هەستایت و ڕۆیشتیت!!!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرموو: «إنه كان معك ملك يرد عنك، فلما رددت عليه بعض قوله وقع الشيطان، فلم أكن لاقعد مع الشيطان»، واتا: فریشتەیەکت لەگەڵدا بوو لە باتی تۆ وەڵامی دەدایەوە، بەڵام کە تۆ وەڵامی هەندێك لە وتەکانیت دایەوە شەیتان هاتە نێو مەسەلەکە و منیش لە شوێنێك دانانیشم کە شەیتانی لێ بێت. پاشان فەرمووی: «ئەی ئەبو

[1] صحيح مسلم ژمارە ١٠٢٨.

بەکر سێ شت هەر سیانیان ڕاستن، هەر بەندەیەك خراپەی بەرامبەر بکرێت و لەبەر خاتری خوا قسە نەکات ئەوا خوا سەری دەخات و سەر بەرزی دەکات، هەر کەسێك پارە و ماڵ ببەخشێت لەبەر سیلەی ڕەحم ئەوا خوای گەورە بۆی زیاد دەکات، هەر کەسێك بپاڕێتەوە و داوای پارە بکات بۆ ئەوەی پارەکانی زۆرتر بکات ئەوا خوای گەورە نەدار و کەم پارەی دەکات»[1].

خۆ ئەبو بەکر لەناو خەڵکدا بە (ڕق خۆرەوە) ناسرا بوو بەڵام بۆیە وەڵامی ئەو پیاوەی دایەوە چونکە وای زانی ئەو ئیتر بێدەنگ دەبێـت، بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هانی دا بۆ لەسەرخۆیی و نەرم و نیانی، ڕێنمونی کرد بۆ سەبر و ئارامگرتن لە کاتی ڕق هەڵساندا، چونکە نەرم و نیانی و ڕق خواردنەوە ئینسان لەبەر چاوی خەڵکی گەورە و بەنرخ دەکات و لە لای خوای گەورەش نرخ و ڕێزی زیاد دەکات.

هەر لەم هەڵوێستەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە صدیق (ﷺ) زۆر لەسەر ئەوەی پێغەمبەری خوا تورە نەکات و هەوڵی ڕازی کردنی بدات...

لە فەرموودەکەشدا باسی خراپی تورەبوون لەبەر خۆ — نفس — و بانگ نەکردنی تێدایە و هەڕەشەشی تێدایە.

دوورکەوتنەوەی پێغەمبەران لە هەر کۆڕێك کە شەیتانی لێ بێت و باسی ئەو ستەمکارە بە ئارامەی دەیەوێت لەبەر پاداشتی خوایی قسە نەکات، وە تیایدا هانی خەڵکی دەدات ماڵ ببەخشن و سیلەی ڕەحم بە جێ بهێنن و باسی خراپەی سواڵکردن و سواڵکەرانی کرد.

صدیق (ﷺ) بەردەوام دەستی دەگرت بە نەرم و نیانی و ڕق خواردنەوە تا وای لێهات ناسرا بە لەسەرخۆیی و نەرم و نیان، نەرم ئەوتار و بە بەزەیی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە (صدیق) هەرگیز تورە نەبووە، بەڵام لەبەر خاتری خوا تورە بووە و بینیبێتی سنووری خوا شکێنراوە زۆر زۆر تورە بووە[2].

[1] الدر المنثور للسیوطي (٧٤/٢) مجمع الزوائد (١٩٠/٨) حدیث مرسل.
[2] وەك ئەوەی لەگەڵ فەحناسی جوودا کردی.

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بە درێژایی ژیانی بیری لە ئایەتێکی خوا دەکردەوە و لێی وورد دەبوویەوە و کاریشی پێ دەکرد کە دەفەرمووێت: ﴿۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤﴾ (ال عمران: ١٣٣-١٣٤).

واتا: خێراکەن خۆتان بگەیەننە ڕەزامەندی خوا و بەهەشتێك ئەوەندەی زەوی و ئاسمانەکان پانە و بۆ لە خوا ترسان ئامادە کراوە* ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا دەبەخشن و ڕقی خۆیان دەخۆنەوە و لە خەڵکی دەبوورن و خوایش چاکەکارانی زۆر خۆش دەوێت.

١٤- بەڵێ سوێند بە خوا من حەز دەکەم خوا لێم خۆش بێت:

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بژێوی ژیانی (مسطح بن أثاثة)ی گرتبووە ئەستۆ لە بوختانە بە ناوبانگەکەدا کە بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە هەڵبەسترا بەشداری کرد، ئەبو بەکر سوێندی خوارد کە ئیتر کەمترین سوودی پێ نەگەیەنێت، بەڵام کە ئایەتی قورئانی دابەزی و فەرمووی: ﴿وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٢٢﴾ (النور:٢٢).

واتا: چاکەکاران و دەست ڕۆیشتوانتان با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچەر یانی ڕێی خوا بێ بەش بکەن لە دەستگرۆیی، بەڵکو با لێبوردە بن و چاو پۆشی بکەن، ئایا حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت؟ خوا لێبووردە و بە بەزەیی یە.

لەوێدا ئەبو بەکر (ﷺ) وتی: سوێند بە خوا حەز دەکەم خوا لێم خۆش ببێت و گەڕایەوە سەر پارە بەخشین و خێرکردنەکانی پێشووی کە دەیدا بە کۆمەڵێك هەژار وتی: هەرگیز لێیان ناگرمەوە[1].

صدیق (ﷺ) وا لەو ئایەتە پیرۆزە گەیشتبوو کە موسوڵمان دەبێت بە ڕەوشت و ئەخلاقیاتی ئیسلام خۆی بڕازێنێتەوە و لە هەڵە و ناتەواوی و پێخلیسکانی خەڵکی ببورێت، چونکە ئەگەر وای کرد خوای گەورەش لێی خۆش دەبێـ و گوناهەکانی بۆ دەپۆشێت، چونکە وەك دەڵێن: «کما تدین تدان»، چۆن قەرز دەکەیت دەبێت قەرزیشت لێ بکەن، خوای گەورەش دەفەرمووێـت: ﴿ألا تحبون ان یغفر الله لکم﴾، واتا: چۆن حەز دەکەن خوا لە خراپە و گوناه و پێخلیسکانەکانتان ببورێت ئێوەش وابن و لە خەڵی ببوورن[2].

هەروەك لە ئایەتەکەشدا بە ڕوونی باس لەوە دەکات ئەگەر سوێندتان خوارد شتێك نەکەن و دوایی بۆتان دەرکەوت بیکەن باشە ئەوا کەفارەتەکەی بدەن و ئەو کارە باشە بکەن، هەندێك لە زانایان وتوویانە: ئەم ئایەتە ئومێد بەخشترین ئایەتە لە هەموو قورئاندا لە لایەن بەزەیی خوا بە جنێودەرە تاوانبارەکان لە وشەکانیدا[3].

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەبو بەکر (ﷺ) باشترین کەسە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە خوای گەورە بە هەندێك ڕەوشتی سەیر وەسفی کردووە و لە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و پلە و پایەی لەم ئاینەدا، ئیمامی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا (١٤) ڕەوشتی دەرهێناوە لە ئایەتی ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ﴾، لەوانە: خاوەنی چاکەی بێ سنوور بەبێ ئەوەی تایبەت بێت بە کەسێك و کەسانێکی تری لێ بە دوور بێت، چاکەش هەموو چاکەیەك دەگرێتەوە و لە هەموو کەسیش چاکترە، یەکێ تر لەوانە: خوای گەورە بە (الفضل والسعە) ناوی بردووە و بە کۆ هێناویەتی نەك بە تاك و بە گشتی نەك بە تایبەتی،

[1] البخاري ژمارە (٤٧٥٠).
[2] تفسیر المنیر (١١٩/١٨).
[3] هەمان سەرچاوە (١٩٠/١٨).

کەواتە پێویستە بوترێت: خاڵیە لە گوناه و تاوان، چونکە کەسێك ئەمانە ڕەوشتی بێت نابێتە ئەهلی دۆزەخ[1].

١٥- دەرچوونی لە مەدینەوە بۆ شام بە مەبەستی بازرگانی:

لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو بەکر تا شاری بوصرا ی وڵاتی شام دەڕۆیشت بۆ کاروباری بازرگانی و بەڵام پاشان هاوڕێیتی کردن و پێکەوە ژیانی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بووە هۆی ئەوەی نەچێت بۆ بازرگانی و پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری ئەو کارەی لێ نەکردووە لەگەڵ ئەمەشدا زۆر خۆشی ویستووە[2].

لەم کارەشیدا گرنگی ئەوە دەردەکەوێت کە موسوڵمان دەبێت سەرچاوەیەکی ڕۆزی پەیداکردنی هەبێت کە وای لێ بکات دەست لە خەڵکی پان نەکاتەوە، بەڵکو بەو کاسبیەی فریای نەداری بکەوێت و کەسێك لە دیلی و بەندەیی ڕزگار بکات و لە ماڵ بەخشینی ڕێی خوا و پێشبڕکێی خەڵکی تر بکات.

١٦- غیرەی صدیق و پاك ڕاگرتنی خێزانی لە لایەن پێغەمبەرەوە:

عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەندێك لە پیاوانی بەنی هاشم خۆیان کرد بە ماڵی ئەبو بەکردا و تەنها ئەسمای کچی عومەیسی خێزانی لە ماڵ بوو، لەو کاتەدا ئەبو بەکریش هاتەوە بۆ ماڵ و ئەو پیاوە بێگانانەی بینی، پێی ناخۆش بوو، ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا باس کرد، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: «ان الله قد برأها من ذلك»، واتا: خوای گەورە لەو شتانە بە دووری خستووە و پاشان چووە سەر مینبەرەکەی و فەرمووی: «لا يدخل رجل بعد يومي هذا على مغيبة إلا ومعه رجل أو اثنان»[3].

واتا: لەمڕۆ بە دوا کەس خۆی نەکات بە ماڵی کەسێکدا کە تەنها ئافرەتەکە لە ماڵ بێت مەگەر لەگەڵ کەسێك یان دوانی تردا بێت.

١٧- لە خوا ترسانی:

[1] تفسير الرازي (٣٥١/١٨).
[2] فتح الباري (٣٥٧/٤) نقلا عن الخلافة الراشدة والدولة الاموية (لا: ١٦٣).
[3] الرياض النظر في مناقب العسرة لأبي جعفر أحمد الطبري (لا: ٢٣٧).

ترسان لە خوای گەورە کارێکی ئەوەندە گەورەیە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە تاوانکردن و چاودێری خوای تیا دروست دەکات لە نهێنی و ئاشکرادا، کردەوەکانی خاوێن دەبن و کارەکانی درەوشاوە دەبن و فەرمانیش دراوە بەسەر موسوڵماناندا کە لە خوا بترسن و خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ (البقرە:٤٠).

واتا: ئەی نەوەی ئیسرائیل — جوولەکە و گاور — ئەو ناز و نیعمەتانی منتان لە بیر نەچێت کە داومە بەسەرتاندا و پەیمانەکانتان بەرنە سەر و منیش پەیمانم دەبەمە سەر لەگەڵتاندا و تەنها لە منیش بترسن.

هەروەها پاداشتی گەورەی ئامادە کردووە بۆ ئەو کەسانەی لە خوا دەترسن وەك دەفەرموێت: ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ۝٤٦﴾ (الرحمن:٤٦)، واتا: بۆئەو کەسەی لە خوای خۆی دەترسێت دوو باخچەی لە بەهەشتدا بۆ ئامادەکراوە.

ئەنەس (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتارێکی بۆ داین کە هەرگیز وتاری وام نەبیستووە، تیایدا وتی: «لو تعلمون من الله ما أعلم لضحكتم قليلاً ولبكيتم كثيراً»، واتا: ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیایە — لە نارەحەتیەکانی ڕۆژی دوایی — زۆر کەم پێدەکەنین و زۆر زۆر دەگریان. هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو سەریان داخستبوو لە ژێرەوە مینگەی گریانیان دەهات[1].

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە نێوان ترسان لە خوا و بە تەمای ڕەزامەندی ئەو دەژیا بە جۆرێك بووبووە سەر مەشق بۆ هەموو موسوڵمانێك ئیتر فەرمانڕەوا بێت یان ژێر دەستە، سەرکردە بێت یان سەرباز بە مەرجێك مەبەستی ئەوە بێت لە ڕۆژی دواییدا بە تەمای ڕزگار بوون بێت[2].

ابن سیرین دەڵێت: «لم يكن أحد أهيب من بعد النبي (ﷺ) من ابي بكر»، واتا: هیچ کەس نەبووە لە دوای پێغەمبەر لە لەخواترساندا بگاتە ئەبو بەکر.

---

[1] البخاري كتاب التفسير باب لاتسألوا عن أشياء (٦٨/٦).
[2] تأريخ الدعوة الاسلامية (لا: ٣٩٦).

قەیس دەڵێت: « ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)م بینی زمانی خۆی ئەگرت و دەیوت: هذا الذي أرودني الموارد، واتا: ئا ئەم زمانە ئەمباتە ناو نەهامەتیەکان»[1].

مەیمونی کوڕی مەهدان دەڵێت: ئەبو بەکر (رضي الله عنه) قەلە ڕەشێکی هێنا پەڕ و باڵی هەبوو، ئەی دا بەم دیو و بەو دیودا و دەیوت: هیچ نێچیرێك ڕاوناکرێت و هیچ درەختێك نابڕێت تەنها ئەوە نەبێت یەکێ لە یادکار و تەسبیح کارێکی پەروەردگار لە ناوچووە[2].

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) دەڵێت: «أبکوا فان لم تبکوا فتباکوا»[3]، بگرین ئەگەر گریانیشتان نەهات بە زۆر خۆتان بگریێنن.

لە حەسەنی بەسریەوە دەڵێت: ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) وتوویەتی: «والله لوددت اني كنت هذه الشجرة تؤكل وتعضد»[4]، واتا: ئەبو بەکر ئاماژەی بۆ درەختێك کرد و وتی: بریا من ئەم درەختە بوومایە بیانخواردمایە و بەکاریان بهێنامایە.

ئەبو بەکر لە جێیکی تردا دەڵێت: «لوددت اني كنت شعرة في جنب عبد مؤمن»[5]، ئاواتە خواز بووم موویەك بوومایە بە لەشی موسوڵمانێکەوە.

زۆر جار ئەم شیعرەی دووبارە دەکردەوە:

لا تزال تنعي حبيبا حتى تكونه

وقد يرجوا الفتى الرجا يموت دونه[6]

بەردەوام خۆشەویستانت بەڕێ دەکەیت بۆ سەر قەبران و کەسێك بە تەمای گەڕانەوەیە و کەچی فریای ناکەوێت.

دووەم:

[1] صفة الصفوة (٢/٢٥٣).

[2] الزهد لإمام أحمد باب زهد ابي بكر (لا: ١١٠).

[3] هەمان سەرچاوە (لا: ١٠٨).

[4] هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١١٢.

[5] هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١١٢.

[6] هەمان سەرچاوە لاپەڕە ١٠٨.

گرنگترین ڕەوشتەکانی صدیق (ﷺ) و هەندێك چاکی و پیاوەتیەکانی کەسایەتی صدیق (ﷺ) کەسایەتیەکی سەرکردەیە و هەموو ڕەوشتەکانی سەرکردەیەکی خوایی — قائد ربانی — تێدا بووە، هەموویان لە هەندێك شتدا کۆ دەکەینەوە و لەسەر هەندێکیشی بە درێژی دەدوێین، گرنگترینیان: ١- بیروباوەڕی دروست، زانیاری شەرعی، متمانە بە خوا، سەرمەشقی، ڕاستگۆیی، لێهاتن و ئازایەتی، پیاوەتی، دونیا نەویستی، قوربانیدان، ژیری لە هەڵبژاردنی بەرپرس و یارمەتی دەرانیدا، نەرم و نیانی، ئارامی، نەفس بەرزی و ئیرادەیەکی بتەو، دادپەروەری و توانایی چارەسەرکردنی کێشەکان، توانای فێرکردن و ئامادەکردنی کەسانی سەرکردە.

ئەمە و چەندان ڕەوشتی تر لە لێکۆڵەرەوان ئەتوانن لە سەردەمی مەککی و هاوڕێیەتی پێغەمبەر و لە غەزاکانیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ژیانی مەزنی ناو کۆمەڵگە.

هەندێك لە ڕەوشتەکانی تریشی لە پاش بوون بە خەلیفە و جێگری پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەکەوێت کە توانی بە یارمەتی خوا و بە هۆی ئەو سیفاتە خواییە جوانانەیەوە توانی پارێزگاری لە دەوڵەتی ئیسلام بکات و بزاڤی لە ئایین هەڵگەڕاوەکان سەرکوت بکات، بە کۆمەکی خوا توانی ئومەتی ئیسلام بگوێزێتەوە بەرەو ئەو ئامانجانەی بۆی کێشرابوو بە چەندان هەنگاوی گرنگ، گرنگترین ئەو ڕەوشتانەی کە تیشك دەخەینە سەری و لەم باسەدا لەسەری دەدوێین لەوانە:

١- مەزنی باوەڕی بە خوای تەعالا:

صدیق (ﷺ) باوەڕی بە خوای تەعالا زۆر بتەو بووە و لە ناو کرۆکی باوەڕگیشتبوو، یەکتاپەرستی چووبوو بە ناخی دڵ و دەروونیدا و شوێنەواریشیان بە ئەندامەکانی لەشیەوە بەدی دەکرا و هەموو ژیانی بە شوێنەوارانەوە بردە سەر، بە ڕەوشتی بەرز خۆی ڕازاندبووەوە و لە ڕەوشتە نائاساییەکان خۆی خاوێن دەکردەوە سوور بوو لەسەر دەستگرتن بە شەریعەتی خواوە و شوێنکەوتنی ڕینموونیەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕی بە خوای گەورە هۆکاری ئەو جموجۆڵ و چالاکی و هەوڵ و تەقەلا و خۆماندووکردن و کۆششکردن و جیهاد وپەروەردە، بەرز ڕاگرتن و

سەربەرزیلە ناو دڵیدا یەقین و باوەڕێکی بتەوی وای هەبوو کە باوەڕی هیچ لە هاوەڵانی پێ نەدەگەیشت، ئەبو بەکری کوڕی عەیاش دەڵێت: «ما سبقهم ابو بكر بكثرة صلاة ولا صيام، ولكن بشيء وقر في قلبه»[1].

واتا: ئەبو بەکر (ﷺ) بە نوێژ و ڕۆژی زۆر نەبوو پێشکەوتنەکەی، بەڵکو بە هۆی شتێکەوە بوو لە ناخی دڵیدا ڕەگی داکوتابوو.

هەر لەبەر ئەوەشە دەڵێن: «ئەگەر باوەڕی ئەبو بەکر و باوەڕی هەموو خەڵکی سەر زەوی بکێشرێت، تای ئەبو بەکر قورستر دەبێت، هەروەك خاوەنانی (کتێبی سونەن) لە ئەبی بەکرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا فەرمووی: «من راى أحد منكم رؤيا؟»، کامتان خەوتان بینیوە؟ پیاوێك وتی: من تەرازوویەکم بینی لە ئاسمانەوە دابەزی تۆ و ئەبو بەکریان کێشا تۆ لە ئەبو بەکر سەنگینتر بوویت، پاشان باوەڕی ئەبو بەکر و عومەریان کێشا باوەڕی ئەبو بەکر قورستر بوو، پاشان عومەر و عوسمانیان کێشا عومەر قورستر بوو لە عوسمان و پاشان تەرازووەکەیان بەرزکرایەوە، پێغەمبەری خوا پێی ناخۆش بوو بۆیە فەرمووی: «خلافة النبوة ثم يأتي الملك من يشاء»[2]، واتا: ئەوە ماوەی جێنشینی پێغەمبەر دیاری دەکات و پاش ئەوان ئیتر دەسەڵات دەکەوێتە دەستی کەسانێك خوا بیەوێت.

لە ئەبو هوریرەوە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش ئەوەی نوێژی بەیانی کرد، ڕووی بۆ لای خەڵکەکە وەرچەرخاند و وتی: «بينما رجل يسوق بقرة له، قد حمل عليها، التفتت بقرة فقالت: اني لم أخلق لهذا، انما خلقت للحرث»، فقال الناس سبحان الله، تعجبا وفزعاً، أبقره تتكلم؟ فقال رسول الله (ﷺ)«نعم فاني أؤمن به وابو بكر وعمر، وبينما راع في غنمه، عدا عليه الذئب فأخذ منها شاةً فطالبه الراعي حتى استنقذها منه، فالتفت اليه الذئب فقال له: من لها يوم السبع، يوم ليس لها راع غيري؟»، فقال الناس سبحان الله، ذئب يتكلم؟ قال: اني أؤمن بهذا انا و ابو بكر و عمر، وما هما ثم»[3].

---

[1] فضائل الصحابة للإمام أحمد (١٧٣/١).

[2] ابو داوود ژمارە: ٤٦٣٤، الترمذي ژمارە (٢٢٨٨).

[3] مسلم ژمارە ٢٣٨٨.

واتا: جارێکیان پیاوێك بارێکی لە مانگاکەی نابوو، دابوویە بەر، مانگاکە لای کردەوە و پێی وت: من بۆ بار هەڵگرتن دروست نەکراوم، من بۆ کێڵگە و زەوی کێڵان کراوم، خەڵکەکە بە سەر سوورِمان و ترسەوە وتیان: سبحان الله، مانگا قسەی کردووە؟ پێغەمبەری خوا فەرمووی: من و ئەبو بەکر و عومەر باوەڕمان پێی هەیە، وە جارێکی تریش شوانێك بە لای ڕانەکەیەوە بوو، گورگێك هات وسەری مەڕی قرتاند و پیاوەکەش شوێنی کەوت و هەر چۆنێك بوو لێی سەندەوە، گورگەکەش لای کردەوە بۆ لای و پێی وت: ئەی ڕۆژی حەوتەم چی دەکەیت ئەو ڕۆژە بەس خۆم بە لایانەوە دەبم؟ خەڵکەکەش سەریان سوورِما و بە تێك چوونەوە وتیان: سبحان الله، گورگ قسە دەکات؟ فەرمووی: بە لێ‌ من و ئەبو بەکر و عومەر باوەڕمان پێی هەیە و ئەوانەش کەم نین.

لەبەر باوەڕی پتەوی و دەست گرتنی تەواوی بە شەرعەوە و ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لەگەڵ ئیسلامدا، پێغەمبەری خوا خۆشی ویستووە، لە هەموو هاوەڵانیش زیاتر خۆشەویست بوو لە لای، لە عەمری کوڕی عاصەوە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە سەرکردایەتی سوپای (ذات السلاسل) ناردمی، دەڵێت: منیش هاتم و پێم وت: کێت لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت؟ فەرمووی: عائیشە، وتم: لە پیاوان؟ فەرمووی: باوکی، وتم ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: پاش ئەو عومەری کوڕی خەتاب، هەندێك ناوی تریشی هێنا[1].

هەر لەبەر باوەڕەکەی و دەستگرتنی تەواوی بە بەرنامەکەی خواوە و هەوڵ و تەقەلاکانی بۆ سەرخستن و بەرزی ئایینی پەروەردگاری جیهانیان، شایستەی مژدەی بەهەشت بوو لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) وە هەر ئەویشە لە هەموو دەرگاکانیەوە بانگ دەکرێت.

ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) جارێکیان دەست نوێژ دەگرێت و لەماڵ دەردەچێت و لە دڵی خۆیدا دەڵێت: «بە درێژایی ئەمڕۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەبم»، دەڵێت هات بۆ مزگەوت هەواڵی پێغەمبەری پرسی (ﷺ) پێیان وت ئا لێرەوە ڕۆیشت و منیش شوێنی کەوتم تا خۆی کرد بە (بیری ئەریس)دا و منیش لەبەر دەرگاکەیدا دانیشتم کە لە پەلی خورما بۆی کرابوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) تارەتی گرت و دەست نوێژێکی گرت و منیش چوومە ژوورەوە

[1] صحیح البخاری ژمارە ٣٦٦٢.

دەبینم بەسەر بیرەکەوە دانیشتووە و قاچی هەڵکردووە و خستوویەتیە ناو بیرەکەوە، سڵاوم لێ کرد، پاشان چووم لەبەر دەرگاکەیدا دانیشتم و وتم: ئەمڕۆ دەرگاوانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبم، یەکێك پاڵی نا بە دەرگاکەوە، وتم: کێیە؟ وتی: ئەبو بەکرم، وتم پێی کەمێك ئارام بگرە، پاشان وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەبو بەکرە و داوا دەکات بێتە ژوورەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: رێی پێبدە و مژدەی بەهەشتی بدەرێ، منیش ڕۆیشتم و بە ئەبو بەکرم وت: فەرموو وەرە ژوورەوە و پێغەمبەری خوایش مژدەی بەهەشتی پێدایت، ئەبو بەکر هاتە ژوورەوە و لە لای ڕاستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت و وەك پێغەمبەری خوا هەردوو قاچی هەڵکرد و خستیە ناو ئاوەکەوە...»[1].

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «من انفق زوجين من شيءٍ من الاشياء في سبيل الله دعي من ابواب الجنة، يا عبدالله هذا خير، فمن كان من أهل الصلاة دعي من باب الصلاة، ومن كان من أهل الجهاد دعي من باب الجهاد، ومن كان من أهل الصيام دعي من باب الريان، ومن كان من أهل الصدقة دعي من باب الصدقة»[2].

واتا: هەر کەسێك لە هەر شتێك جووتێك ببەخشێت لە پێناوی خوادا لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت: ئەی بەندەی خوا ئەمە چاکەکەتە، هەر کەسێك لەگەڵ نوێژ بووبێت لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێت، هەر کەسێك جیهادی کردبێت لە دەرگای جیهادەوە و هەر کەسێك ڕۆژووی گرتبێت لە دەرگای (ڕەیان)ەوە بانگ دەکرێت و هەر کەسێك خێری کردبێت لە دەرگای خێرەوە بانگ دەکرێت.

لێرەدا ئەبو بەکر وتی: چ پێویست دەکات لەو هەموو دەرگایەوە بانگ بکرێت!! وتی: ئەی هەیە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (نعم، وأرجو ان تكون منهم يا أبابكر)[3]، واتا بەڵێ، وە هیوادارم تۆ یەکێك بیت لەوانە.

٢- زانستی ئەبو بەکر (ﷺ):

---

[1] البخاری ژمارە ٣٦٧٤.

[2] البخاری ژمارە ٣٦٦٦.

[3] البخاری ژمارە ٣٦٦٦.

ئەبو بەکر (ﷺ) لە هەموو کەس زیاتر زانیاری هەبوو دەربارەی خوا ولە هەموو کەس زیاتر لێی دەترسا[1]، وە ئەهلی سونە هەموو لەسەر ئەوەن کە ئەبو بەکر زاناترین کەسی گەلی ئیسلامە و زیاتر کەسێك باسی کۆی دەنگیان کردووە لەو بارەیەوە[2].

هۆی شارەزاییە زۆرەکەشی بۆ ئەو هاوڕێیەتیە بەردەوامەی دەگەڕێتەوە کە بە شەو و ڕۆژ لە هەموو هاوەڵان زیاتر لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەبوو، لە ناو شاردا، لە سەفەردا، و شەوانیش دوای نوێژی عیشا لە خزمەت پێغەمبەردا شەونشینی دەکرد، دەربارەی ئیش و کاری موسوڵمانان لێدوانی لەگەڵ دەکرد.

هەر کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژی بە هاوەڵان بکردایە یەکەمین کەس قسەی خۆی دەکرد ئەبو بەکر بوو، لەوانەیە یەکێکی تریش قسەی کردبێت و لەوانەشە کەسی تر قسەی نەکردبێت، وە تەنها ڕایەکەی ئەوی پەسەند دەکرد، ئەگەر ڕایەکان جیاواز بوونایە ڕایەکەی ئەبو بەکری قبووڵ دەکرد[3].

یەکەمین کەس بوو پێغەمبەری خوا لە جیاتی خۆی کردی بە ئەمیری حەج و کاروباری حەجیش ئەوەندە وردە ئەو شارەزاییەی نەبوایە دای نەدەنا لەو جێگەیەدا، هەروەك لەباتی خۆی دایناوە بەرنوێژی موسوڵمانان بکات و ئەگەر لەبەر شارەزایی و دانایی نەبوایە نەیدەکرد و کەسی تری لەباتی خۆی بۆ بەرنوێژی و حەج دانەناوە.

کۆکردنەوەی صەدەقە و خێرات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناوە لەسەر موسوڵمانان ئەنەس (ﷺ) لە ئەبو بەکرەوە وەریگرتووە و ئەوەش ڕاستترین ڕیوایەتەکانە و سوودیشیان لێ وەرگرتووە بۆ زانینی ئەو مەسەلانەی تایبەتن بە (ناسخ و مەنسوخ)ەوە کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شارەزایی و لێهاتوویی لە بواری فەرموودە ناسخەکاندا و هیچ کەس شتێکی لێ نەگێڕاوەتەوە کە پێچەوانەی دەقێکی شەرعی بێت و ئەمەش بەڵگەی هەڵکەوتوویی و

[1] تاريخ الخلفاء للسيوطي.
[2] الفتاوى (١٣/١٣٧).
[3] ابو بكر الصديق، محمد مال الله (لا: ٣٣٤-٣٣٥).

لێهاتوویی لە زانستدا و بە گشتی لە شەرعدا شتێکی لێ نەبیستراوە کە غەڵەتی کردبێت، کە خەڵکانی تر و لە زۆر لە مەسەلە شەرعیەکاندا لێی ڕوودەدات[1].

لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) و لە حزووریدا فەتوای داوە و پێغەمبەریش (ﷺ) بە فەتواکانی ڕازی بووە، ئەم پلە و پایەشی بۆ کەسی تر نەبووە جگە لەو، سەلەبەکەی ئەبی قەتادە لە حەتیندا بەڵگەیە لەسەر ئەمە، دانایی و لێهاتوویی زانستی بە تەواوی پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) دەردەکەوێت و گەلی موسوڵمان لە هیچ مەسەلەیەکدا ناکۆکیان نەبووە کە ئەم بە بەڵگەی ڕاست و دروستی قورئان و فەرموودە یەکیان نەخاتەوە، ئەمەش بەهۆی کەمالی عیلمی صدیق و دادپەروەریەکەیەوە بووە، شارەزایی لە هێنانەوەی بەڵگەگەلێکدا کە ناکۆکی هەڵگرێ و بیانخات بە لایەکدا و هەر کاتێك فەرمانی دەربکردایە گوێڕایەڵی دەبوون.

هەر ئەو بوو لە کاتی مردنی پێغەمبەری نازداردا (ﷺ) هاوەڵانی هێور کردەوە و لەسەر بیر و باوەڕ دایمەزراندنەوە، ئەویش شوێنی ئەسپاردەکردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەری دیاریکرد، میراتیەکانی بۆ ڕوون کردنەوە، پێویستی جەنگ دژ بە زەکات نەدەرانی بۆ هاوەڵان ڕوون کردەوە و گومانی عومەری ڕەواندەوە، تێی گەیاندن جێنشینی دەبێت لە ناو قورەیشیەکاندا بێت و سوپای ئوسامەی خستە ڕێ و وتێی گەیاندن کە بەندەیەك ئیختیاری لە مانەوە لە دونیا و مردنی پێدراوە پێغەمبەری خوا بوو کە (بە یارمەتی) خوا لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوی پێوە بینی کە بەڵگەیە لەسەر زانایی ئەبو بەکر، عبداللە ی کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: «رأيت كأني أعطيت عسا مملوءاً لبناً، فشربت منه حتى تملأن، فرأيتها تجري في عروقي بين الجلد واللحم ففضلت منها فضلة، فاعطيتها أبا بكر، قالوا يا رسول الله هذا علم أعطاكه الله حتى إذا تملئت منه، فضلت فضلة، فاعطيت أبا بكر، فقال (ﷺ) : قد أصبتم».

واتا: لە خەوما سوراحیەکی پڕ لە شیریان دا بە دەستمەوە و منیش نام بەسەرەوە تا تێرم لێ خوارد، دەمبینی لە نێوان پێست و گۆشتمدا هاتوچۆی دەکرد، کەمێکم لێ مایەوە، دام

---

[1] ابو بكر الصديق أفضل الصحابة وأحقهم بالخلافة (لا: ٦٠).

به ئەبو بەکر، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە زانستە و خوا بە تۆی داوە و تێر و پڕت لێ وەرگرتووە و ئەوەشی لە خۆت زیاد بووە، بەخشیووتە بە ئەبو بەکر، فەرمووی: پێکاوتانە[1].

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) زۆر باوەڕی بە خەو هەبووە، جوانیش خەو پەرژینی دەکرد، هەر کاتێك بەیانی دەهات، دەیوت: «هەر کەسێك خەوێکی خۆشی بینیوە با بۆمان بگێڕێتەوە» وە دەیوت: «لان یری رجل مسلم، مسبغ الوضوء رؤیا صالحة احب الي من كذا و كذا».

واتا: «کەسێکی موسوڵمان بە دەست نوێژەوە و بخەوێت و خەوێکی خۆش ببینێت لە ئەوە و ئەوە خۆشترە لە لام»[2].

یەکێك لە خەو پەرژینەکان ئەمە بوو: ئیبن عەباس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وت: لە خەومدا هەورێکم بینی ڕۆن و هەنگوینی لێ دەباری، خەڵکم ئەبینی ئەیان چنیەوە، هەندێك زۆر و هەندێك کەمی کۆکردەوە، پاشان گوریسێکم بینی لو نێوان زەوی و ئاسماندا بوو، تۆ دەستت پێ دەگرت و بەرز بوویتەوە، پیاوێکی تریش دەستی پێوە گرت و قرتا و بەڵام دوایی لکایەوە بە یەکدا.

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆم و باوکم بە قوربانت بین، بەو خودایە لێم گەڕێیت تا خۆم ئەو خەوە لێك دەدەمەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «أعبر»، لێکی بدەرەوە، وتی: هەورەکە ئیسلامە، ئەو ڕۆن و هەنگوینەش دەربارەی قورئانە، چێژ و شیرینیەکەی بە گوێرەی کەم و زۆر دەگاتە خەڵکی، ئەو گوریسەی نێوان زەوی و ئاسمان ئەو ڕاستیەیە کە تۆی لەسەری و دەستی پێوە دەگریت و بەرزت دەکاتەوە و کەسێ تر دەستی پێوە دەگرێت ئەویش بەرز دەکاتەوە کەسێکی تریش دەستی پێوە دەگرێت ئەویش بەرز دەکاتەوە و دەی بۆم ڕوون بکەرەوە دایك و باوکم بە ساقەت بێ ئەی پێغەمبەری خوا بزانم پێکام یان بە هەڵە دا چووم؟

---

[1] الاحسان في تقريب صحيح ابن حبان (١٥/٢٦٩
[2] خطب ابي بكر الصديق، احمد محمد عاشور جمال الكوفي (لا:١٥٥).

پێغەمبەری خوا فەرمووی: «أصبت بعضا واخطأت بعضاً»، واتا: هەندێکی وایە و هەندێکی تری بە هەڵە لێکت دایەوە، ئەبو بەکر وتی: سوێند بە خوا هەڵەکانم پێ دەڵێیت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «لا تقسم»، واتا: سوێند مەخۆ[1].

عائیشە دەگێڕێتەوە کە لە خەویدا سێ مانگ کەوتنە ناو ژوورەکەی و بۆ ئەبو بەکری گێڕایەوە لە هەموو کەسێك جوانتر خەو پەرژینی دەکرد، ئەویش وتی: ئەگەر ئەم خەوەت ڕاست بێت سێ کەس لە ناو ژوورەکەی تۆدا بە خاك دەسپێردرێن کە لە هەموو خەڵکی زەوی باشترن، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی فەرموو ئەبو بەکر بە عائیشەی فەرموو: ئەمە باشترین مانگیانتە[2].

لەگەڵ ئەوەشدا کە زیرەکترین و زاناترینی ناو هاوەڵان بوو هەرگیز خۆی سەغڵەت نەکردووە لە (تکلف) دوور کەوتوتەوە: ئیبراهیمی نەخەعی دوڵێت: «ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) ئایەتی ﴿وفاكهة وأبا﴾ (عبس:٣١)ی دەخوێندەوە، لەو کاتەدا لێیان پرسی وشەی (أبا) مانای چی دەگەیەنێت؟ یەکێك وتی: ماناکەی ئەوەیە و ئەوەیە، ئەبو بەکر فەرمووی: ئەمە زۆر لە خۆکردنە و کام زەوی لە خۆیم بگرێت و کام ئاسمان بە سەرمەوە بێت ئەگەر مانایەکی قورئان بکەم بە نەشارەزایی نەزانین»[3].

٣- پاڕانەوە و زۆر لالانەوە:

پاڕانەوە و نزا دەرگایەکی زۆر گەورەیە، ئەگەر لە هەر بەندەیەك بکرێتەوە خێر و بەرەکەت دەڕژێت بەسەریدا، بۆیە ئەبو بەکر زۆر سوور بوو لەسەر بوونی پەیوەندی جوان و بەردەوام بە خوای پەروەردگارەوە و هەمیشە دوعا و پاڕانەوەی دەکرد، هەروەك دوعا کەمترین هۆکاری سەرکەوتنە بەسەر دوژمناندا وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ

[1] البخاري كتاب التفسير ژمارە ٧٠٤٦.
[2] تأريخ الخلفاء للسيوطي (لا: ١٢٩).
[3] فتح البارى (١٣/٢٥٨)، فيه انقطاع بين ابراهيمالنخعي وابي بكر.

ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾ (غافر: ٦٠).

واتا: خوای ئێوه فەرموویەتی بانگم بکەن دێم بە دەمتانەوە و ئەو کەسانەی خۆیان بە زل ئەزانن لە بەندایەتیدا بە پۆرت شکاوی ئەیان خەمە ئاگرەوە.

وە خوای گەورە لە جێیەکی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ (البقره: ١٨٦).

واتا: ئەی محمد، ئەگەر بەندەکانم هەواڵی من دەپرسن من زۆر نزیکم لێیان و دێم بە دەم هەر کەسێکەوە بانگم لێ بکات، دەی وەرن بە دەممەوە و باوەڕم پێ بهێنن تا لەسەر ڕێگەی ڕاست بەردەوام بن.

ئەبو بەکر بەردەوام لە پێغەمبەری جیا نەبۆتەوە و هەمیشە بە یەکەوە بوون، چاك پێغەمبەری خوای بینی بوو کە چۆن دەپاڕێتەوە لە خوا و داوای کۆمەك و سەرکەوتنی لێ دەکات، زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی پەرستشە مەزنەکان لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەربگرێت و هەموو دوعاکانی بەو جۆرە بن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ژیانیدا کردوویەتی، کە بۆ موسوڵمانان باش نیە و نابێت شێوازی نزا و صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر بەو جۆرەی لە پێغەمبەری خواوە بۆمان ماوەتەوە نەیکەین و شێوازی تر دابهێنین ئیتر با بە ڕواڵەت وشەکانیشی جوان و پاراو و پڕمانا بن.

چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و مامۆستای چاکە و ڕێنماییە بۆ سەر ڕێگای ڕاست وئەو دەزانێت چی چاکە و باشترە[1].

لە هەردوو صەحیحی بوخاری و مسلمدا هاتووە: کە ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعایەکم فێر بکە با لە نوێژدا بەو جۆرە خوای خۆم بانگ بکەم،

[1] ابو بکر الصدیق، علي طنطاوي (لا: ٢٠٧).

فەرمووی: «اللهم إني ظلمت نفسي ظلما كثيراً ولا يغفر الذنوب إلا انت، فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني انك أنت الغفور الرحيم»[1].

واتا: ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی من ستەمم لە خۆم کردووە ستەمێکی ئیجگار زۆر و کێ بێ لە گوناه خۆش بێت جگە لە تۆ، لێم خۆش ببە بە لێخۆشبوونی خۆت و بەزەییت پێمدا بێتەوە چونکە بە ڕاستی تۆ لێبووردە و بە سۆزیت.

لەم نزایەدابەندە وا ناوی خۆی دەبات کە زۆر پێویستی بە لێخۆش بوونە، تیایدا ناوی پەروەردگار دەهێنێت بە جۆرێك کە تاکە دەروازەیە و کەسێك کاری لێخۆش بوونی پێ ناکرێت... و تیایدا ئەوە دەگەیەنێت کە بەندە ڕاستەوخۆ دەتوانێت داواکاری پێشکەش بکات، وە ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە لێخۆشبوون دێتە دی چونکە وەسفی خودا واکراوە لە ئایەتەکەدا کە لێخۆشبووە، بە و بە بەزەییە، ئەمەش جوانترین و تەواوترین شێوازی داواکردنە[2].

لە کتێبەکانی سونەندا هاتووە کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) وتوویەتی: «ئەی پێغەمبەری خوا نزا و پاڕانەوەیەکم فێر بکە ئەگەر بەیانیان و ئێواران بیانخوێنم، ئەویش (ﷺ) فەرمووی: بڵێ: «اللهم فاطر السماوات والارض، عالم الغيب والشهادة، رب كل شيء ومليكه، أشهد ان لا اله إلا انت، أعوذ بك من شر نفسي، ومن شر الشيطان و شركه، وان اقترف على نفسي سوءً او اجره الى مسلم»، بەیانیان و سەر لە ئێواران و ئەو کاتەی چویتە ژێر جێگا ئەم دوعایە بخوێنە»[3].

ئەبو بەکر (ﷺ) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەوە تێگەیشتبوو کەس نیە بڵێت من پێویستم بە تەوبە نیە و لێخۆش بوونم پێویست لە گوناهەکانم، بەڵکو هەمیشە هەموو کەسێك پێویستی پێیەتی خوای – عز وجل – ئەفەرموویت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ

[1] مسلم الذكر والدعاء ژمارە ٢٧٠٥، بخاري ژمارە ٨٤٣.
[2] الفتاوى (١٤٦/٩).
[3] ابو داود في الادب ژمارە ٥٠٦٧، الترمذي في الدعوات ژمارە ٣٥٢٩.

ظَلُومًا جَهُولاً ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾﴾ (الاحزاب: ٧٢-٧٣).

سروشتی مرۆڤ خاوەنەکەی بەرەو ستەمکاری و گەوجی کاری دەبات بۆ مەبەستی موسوڵمانان چ پیاو بن یان ژن تەوبەو گەڕانەوەیە و خوای گەورە لە قورئانەکەیدا باسی تەوبەکردنی پیاوچاکان و لێخۆشبوونی خوای گەورە دەکات بۆیان، لە هەردوو صەحیحی بوخاری و مسلم دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «لن يدخل الجنة أحد بعمله»، واتا: هیچ کەس بە کردەوەی خۆی ناچێتە ناو بەهەشتەوە، هاوەڵان وتیان: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «ولا انا إلا أن يتغمدني الله برحمته»[1]، واتا: تەنانەت منیش مەگەر خوا بمانخاتە بەر ڕەحمەتی خۆی.

ئەمەش پێچەوانە نیە لەگەڵ وتەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾﴾ (الحاقە: ٢٤)، واتا: بخۆن و بخۆنەوە — لە ناو بەهەشتدا — بە هۆی کردەوەی چاکتان لە ڕۆژی دونیای ڕابردوودا.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەشی ڕەدکردۆتەوە کە هەر کەسێك کردەوەی بوو، ئیتر دەچێتە بەهەشت بەڵام ئایەتەکە ئەوەی دەرخستووە کە کردەوەش هۆکارێکە بۆ چوونە بەهەشت و وتەی ئەوانەی کە دەڵێن: «إذا احب الله عبدا لم تضره الذنوب»، ئەگەر خوای کەسێکی خۆش ویست گوناه کردن زیانی لێ نادات، واتا: ئەگەر خوا کەسێکی خۆش ویست دەیخاتە سەر ڕێکەی تەوبە و پەشیمانی لە گوناه و بەردەوام نابێت لەسەر هیچ گوناهێك، هەر کەسێك گومانی وا بێت کە بەردەوام بوونیش لەسەر گوناه و تاوان زیان لەو کەسە نادات — کە خوا خۆشی دەوێت — ئەو گومڕا و پێچەوانەی قورئان و فەرموودەیە و کۆی — اجماع — زانایانی

[1] البخاري في الرقا ٤٦٣٦.

پێشینه، چونکه هەر کەسێك ئەوەندەی گەردیلەیەك چاکە بکات لە قیامەتدا دەیبینێتەوە و ئەوەشی گەردیلەیەك خراپە و تاوان بکات لە قیامەتاد دەیبینێتەوە و دێتەوە ڕێگای[1].

ئەبو بەکر (ﷺ) هەمیشە دەمی بە زیکر و یادی خواوە بووە، زۆریش لە خوا لاڵاوەتەوە و هەمیشە ڕووی تێ کردووە، لە هەموو کاتێکدا دوعای کردووە و هەرگیز بێ نزا نەبووە، هەندێك لە دوعا و پاڕانەوەکانیمان پێ گەیشتووە، لەوانە:

١- أسالك تمام النعمة في الشياء كلها، والشكر لك عليها حتى ترضى، وبعد الرضا، والخيرة ماتكون اليه الخيرة، بجميع الميسور كلها، لا بميسورها يا كريم[2].

واتا: داوای نیعمەت و بەخششت لێ دەکەم لە هەموو شتێکدا، سوپاس کردنیشت لەسەری تا ڕازی دەبیت و پاش ڕازی بوونیشت، چاکە هەڵبژاردن لەو شتانەی کە چاکەن و دەبێت هەڵبژێرین، بە هەموو ئاسانکاریەکانەوە نەك بە ناڕەحەت کردن ئەی کەریم ئەی بەخشندە.

٢- لە دوعاکانیدا دەیوت: «اللهم اني اسالك الذي هو خير لي في عاقبة الخير، اللهم اجعل ما تعطيني من الخير رضوانك والدرجات العلى من جنات النعيم».

واتا: ئەی خودایە، من داوات لێ دەکەم چی چاکە بۆم، بۆم بکە لە کۆتایی هەموو چاکەیەکدا، خوایە دوا شتێك پێم ببەخشی ڕەزامەندی خۆت و پلەی بەرز بێت لە بەهەشتە پڕ لە نیعمەتەکانتدا.

٣- لە دوعاکانیدا دەیوت: «اللهم اجعل خير عمري آخره، وخير عملي خواتمه، وخير أيامي يوم ألقاك»[3]، واتا: ئەی خودایە باشترینی تەمەنم دوا ساتەکانی بێت و باشترین کردەوەم لە کۆتاییەکەی بێت و خۆشترین ڕۆژم ئەو ڕۆژە بێت کە بە تۆ شاد ئەبمەوە.

٤- ئەگەر گوێی لە کەسێك بوایە کە مەدح و پیاهەڵدانی بکردایە، دەیووت: «الهم انت اعلم بي من نفسي، وانا اعلم بنفسي منهم، اللهم اجعلني خيراً مما يصفون واغفرلي ما لا يعلمون، ولا تؤاخذني بما يقولون»[4].

---

[1] الفتاوى (١٤٦/١١).
[2] الشكر لإبن ابي الدنيا ژمارە ١٠٩ نقلا عن خطب ابي بكر (لا: ٣٩).
[3] كنز العمال ذمارة ٥٠٣٠ نقلا عن خطب ابي بكر (لا: ٣٩).
[4] أسد الغاية (٣٢٤/٣).

واتا: ئەی خوایە، تۆ لە خۆم باشتر من دەناسیت، وە منیش خۆم باشتر لە ئەوان دەناسم، ئەی خوایە لەوەی ئەوان گومانم پێ دەبەن باشترم کەی و لەو شتانەش خۆش بە کە ئەوان نایزانن، وە لێم نەگری لەسەر ئەو قسانەی ئەوان کە پێم دەڵێن.

ئەمە هەندێك لە ڕەوشت و چاکەکانی صدیق (ﷺ) بوو کە بە کورتی باسمان کرد، لەمەولایش کاریگەری پەروەردەی پێغەمبەر (ﷺ) دەبینین بە سەریەوە پاش مردنی، وە چۆن ڕاوەستا لە جێیەکدا (بە کۆمەکی خوا) کە کەسی تر توانای ئەو ڕاوەستانەی نەبوو.

پاشان باسی ئەو پەروەردە قووڵ و باوەڕی پتەو و زانستی لە بن نەهاتووەی و قوتابیەتی لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و سەربازیەتی گوێڕایەڵی و بڕینی هەنگاوەکان بە هاوڕێیەتی سەرکردە مەزنەکەی (ﷺ).

هەر کە بوو بە جێنشینی پێغەمبەر و سەرکردەی گەلی موسوڵمان توانی کەشتی ئیسلام بەرەو کەناری ئاشتی بەرێت لەگەڵ ئەو هەمووە گەردەلوول و شەپۆلە یاخیەکان و ئاشووبە تاریکەکان.

# بەشی دووەم

وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ)، سەقیفەی بەنی ساعیدە، سوپاکەی ئوسامە

## جێ باسی یەکەم

## وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) و سەقیفەی بەنی ساعیدە

### یەکەم: وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

هەموو گیانێکی خاوێن و شەفاف هەندێ شتی شاراوەی لە پشت پەردەی غەیبەوە بە یارمەتی خوا هەست پێ دەکات، دڵە خاوێن و دڵنیاکان جاربەجار خاوەنەکانیان لە هەواڵی داهاتوو ئاگادار دەکەن، عەقڵ و مێشکە زیندووە بە نووری باوەڕ ڕووناکەکان ئاماژە و مەبەستی دەستەواژەکان تێدەگەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشکی شێری هەبوو لەم ڕەوشتانەی سەرەوەدا و ئەو چڵەپۆپەیە لەو بوارەدا و کەس پێی ناگات و لەو باشتر نابێت[1]. هەندێ لە

[1] سەیری (السیرة النبوية لإبن شعبة) (٥٧٨/٢) بکە.

ئایەتەکانی قورئان ئەوە دووپات دەکەنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئادەمیزادە و وەك هەموو ئادەمیزادێکی تر شەرابی مردن دەنۆشێت و ئازاری گیان کێشانی دەبێت هەروەك برایانی لە پێغەمبەرانی پێشوو چەشتیان.

لەو ئایەتانەی قورئانەوە تێگەیشت مردنی نزیك بۆتەوە و هەندێك لەو ئایەتانە ڕاستەوخۆ باسی مردنی پێغەمبەری دەکرد و هەندێکی تریان بە ناڕاستەوخۆ ئەو مانایەی دەگەیاند و تاك و ترای هاوەڵان هەستیان پێ دەکرد بە تایبەتی هاوەڵانی مەزنی وەك ئەبو بەکر و عەبباس ومعاذ خوایان لێ ڕازی بێت[1].

١- نەخۆش کەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) سەرەتای ئازار:

لە مانگی (ذي الحجة)دا پێغەمبەری خوا لە حەجیماڵئاوایی گەڕایەوە و ڕۆژەکانی تری لە مەدینە بەسەر برد، پاش مانگی (محەرەم) و (صەفەر) دەستی کرد بە ئامادەکردن و بەڕێ کردنی سوپای ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حارسە، فەرمانی پێدرا کە بەرەو فەلەستین و بەلقان بەڕێ بکەوێت، و خەڵکیش لە کۆچەریان و پشتیوانان هەموو خۆیان ئامادە کرد.

لەو کاتەدا ئوسامە گەنجێکی تەمەن (١٨) ساڵ بوو، هەندێ ڕەخنەیان لەوە هەبوو کە هەروەك کۆیلە و مەوالی بوو، تەمەنیشی منداڵ بوو لەگەڵ ئەوەدا کرابوو بە سەرکردە لە ناو ئەو هەمووە پیاوەی ناو کۆچەریان و پشتیوانان، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) ڕەخنەکەی دەربارەی ئوسامە لێ قبووڵ نەکردن[2].

فەرمووی: «ان يطعنوه في الامارة، فقد طعنوا في امارة ابيه، وايم الله ان كان خليفاً للامارة، وان كان ابوه احب الناس الي وان ابنه لمن احب الناس اليّ بعده»[3].

واتا: ئەگەر تانەی سەرکردەیی ئوسامە بدەن ئەوا ڕەخنەشیان لە باوکی گرتووە کاتی خۆی، ئەگەر باوکی خۆشەویسترین کەسی من بووبێت ئەوە کوڕەکەشی خۆشەویسترین کەسە لای من.

---

[1] مرض النبي ووفاته، خالد ابو صالح (لا: ٣٣).
[2] السيرة النبوية الصحيحة (٥٢٢/٢).
[3] **البخاري كتاب فضائل اصحاب النبي (ﷺ) (٢١٣/٤) ژمارە ٤٤٦٩.**

لەو کاتەدا کە خەڵکی خۆیان ساز دەکرد بۆ بەشداری جیهاد لە سوپاکەی ئوسامەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی کرد بە هاواری ئازاری ئەو نەخۆشیەی کە دواجار بە هۆیەوە وەفاتی کرد، لە نێوان نەخۆش کەوتن و مردنەکەیدا هەندێ ڕووداو ڕوویدا لەوانە:

سەردانی شەهیدانی ئوحدی کرد و نوێژی لەسەر کردن[1]، ڕوخسەت وەرگرتنی لە خێزانەکانی کە ڕێی پێ بدەن لە ماڵی عائیشەدا بمێنێتەوە.

ئازاری زۆری نەخۆشیەکەی و وەسیەتی کرد کە بت پەرست نەهێڵن لە کەنداودا بژین و مۆڵەتی ناردنی وەفد[2]، وە نەیهێشت گۆڕەکەی دوای خۆی بکەن بە مزگەوت وەسیەتی پێ کردن بەوەی گومانی چاکە بە خوا بەرن و ئاگاتان لە نوێژەکانتان و ژێردەستەکانتان بێت.

ئەوەشی بۆ ڕوون کردنەوە کە مژدەی پێغەمبەران تەواو بوو تەنها خەو بینینی ڕاست و دروست نەبێت[3]، و وەسیەتی کرد بە موسڵمانان لەگەڵ پشتیواناندا چاك بن[4].

لە نەخۆشیەکەیدا وتارێکی دا و فەرمووی «ان الله خیر عبدا بین الدنیا و بین ماعند الله فاختار ذلك العبد ماعند الله»، واتە: خوای گەورە بەندەیەکی سەرپشك کرد بە مانەوە لە دنیا یان گەیشتن بەناز و نیعمەتی خوا، ئەویش گەیشتن بە ناز و نیعمەتی خوای هەڵبژارد. لەوێدا ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) دەستی کرد بە گریان ئەبوسەعیدی خودری (رضي الله عنه) دەڵێ: سەرسام بووین لەوەی هەرکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو بەندەیەی بۆ کردین کە سەرپشك کرابوو، یەکسەر ئەبوبەکر (رضي الله عنه) دەستی کرد بە گریان، کەچی ئەبوبەکر لە هەموومان زیرەکتر بوو، بەندەکە پێغەمبەر خۆی بوو.

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «ان امّن الناس علی في صحبته وماله ابوبکر، ولو کنت متخذاً خلیلا غیر ربي، لاتخذت ابا بکر، ولکن اخوة الاسلام ومودته، لایبقین في المسجد الاسدّ الا باب أبي بکر»[5]، واتە: کەسێ هاوڕێ یەتی وسامانەکەیم بە هی

[1] البخاري كتاب الجفائز **ژماره** ١٣٤٤.
[2] البخاري كتاب الجهاد والسير **ژماره** (٣٣٥).
[3] مسلم كتاب الصلاة (١/٣٤٨).
[4] البخاري كتاب مناقب الانصار **ژماره** ٣٧.
[5] البخاري كتاب فضائل الصحابة (ژماره: ٣٦٥٤).

خۆم زانیبێ ئەبوبەکرە، ئەگەر بێجگە لە خوا کەسێکی ترم بە دۆست بگرتایە ئەبو بەکر دەبوو، هەموو دەرگای ماڵەکانی سەر مزگەوت داخەن بێجگە دەرگای ماڵی ئەبو بەکر.

(الحافظ إبن حجر) دەڵێت: ئەبو بەکر (ﷺ) لەو دەستەواژەیە تێگەیشن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ ناوی ئەبو بەکر کرد لە کاتی نەخۆشی مردنەکەیدا و تێگەیشت مەبەستی ئەمە بۆیە دەستی کرد بە گریان[1].

کاتی نوێژ هاتوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئازارەکەی زۆری بۆ هێنابوو، بۆیە بە بیلالی فەرموو: «مروا ابا بکر فلیصل بالناس»، واتا: فەرمان بە ئەبو بەکر بکەن با بەر نوێژیتان بۆ بکات. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو بەکر زۆر دڵی ناسکە و خۆی پێ ناگیرێت و دەگری، ناتوانێت لەو جێیەی تۆدا بەرنوێژی موسوڵمانان بکات، ئەویش (ﷺ) دیسان دووبارەی کردەوە و ئەوانیش دووبارەیان کردەوە، لە جاری سێیەمدا فەرمووی: «انکنّ صواحب یوسف[2]، مروا ابا بکر فلیصل بالناس »، واتا: ئەی عائیشە ئەم قسانە مەکەن ئەڵێی برادەرانی یوسفن، دە بە ئەبو بەکر بڵێن بەرنوێژی خەڵکەکە بکات.

ئەبو بەکر لە ماڵ دەرچوو، بەڵام بینی پێغەمبەری خوا کەمێك ئازاری سوك بووە و دوو کەس چوونە ژێر باڵی و سەیری قاچەکانیم دەکرد خۆیان پێ نەدەگیرا لە تاو ئێش و ئازار، ئەبو بەکر ویستی لە مینبەرەکە بڕواتە دواوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد کە لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە و پاشان خۆیشی لە پاڵیشیدا دانیشت، بە (ئەعمەش)یان وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دابەست لە دوای ئەبو بەکرەوە و خەڵکیش نوێژیان دابەست لە دواوە؟ بەسەر ئاماژەی کرد کە بەڵێ[3].

ئیتر لەو ڕۆژە بە دواوە ئەبو بەکر (ﷺ) پێش نوێژی موسوڵمانانی دەکرد، تا ئەو ڕۆژەی دوو شەممە بوو لە نوێژی بەیانیدا بوون، پێغەمبەری خوا پەردەی ژوورەکەی لادا و سەیرێکی موسوڵمانانی کرد، کە چۆن لە بردەم خوای خۆیاندا وەستاون، وە چۆن داری بانگەواز و

---

[1] فتح الباري (١٦/٧).

[2] **لە سەرەوە مەبەستێکی هەیە و لە خوارەوەش مەبەستێکی تر.**

[3] البخاري كتاب الاذان **ژمارە** ٧١٢.

جیهادەکەی هاتۆتە بەر، و گەلێك هاتوونەتە کایەوە کە بەردەوامن لەسەر بەجێهێنانی نوێژ، پێغەمبەرەکەیان ببێنێت ە نەمێنێت ئەمان هەر دەیکەن و نایفەوتێنن، چاو و دڵی بەو دیمەنە ڕۆشن بوویەوە، بەم سەرکەوتنەی کە تا ئێستا هیچ پێغەمبەر و هیچ بانگەوازکارێك پێی نەگەیشتووە، لەوە دڵنیا بوو کە پەیوەندی ئەم ئومەتە پەیوەندیەکی بەردەوامە بە خوای خۆیان و بەندایەتی کردنەوە بۆی و بە مردنی پێغەمبەرەکەیان ناپچڕێت، ئەو دیمەنە مەگەر خوا بزانێت چەند دڵخۆشی کردبێت و لەو کاتە نارەحەتەیدا ڕووی وەك مانگ گەش بوویەوە و پرشنگی دەدا[1].

هاوەڵان (ﷺ) دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) پەردەی ژوورەکەی عائیشەی لادا و هەستابوویە سەر پێ و سەیری دەکردین و دەم و چاوی ئەتوت پەرەی کتێبە و پاشان زەردەخەنەیەك گرتی و پێکەنی، نیازمان بوو لە خۆشیاندا نوێژەکانمان ببڕین و وامان زانی بۆ نوێژ دێتە دەرەوە، ئاماژەی بۆ کردین کە لەسەر نوێژی خۆتان بەردەوام بن و چوویە ژوورەکەی و پەردەکەی دادایەوە[2]..

تا وای لێ هات هەندێ لە هاوەڵان دڵنیا بوون لە تەندروستی پێغەمبەرەکەیان و چوون بە دەم ئیش و کاری خۆیانەوە، ئەبو بەکر (ﷺ) هات بۆ لای عائیشەی کچی و پێی وت: دەبینم پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئازارەکەی نەماوە، ئەمڕۆش دەبێت لە ماڵی (کچی خاریجە) بم کە خێزانی بوو لە ناوچە شاخاویەکانی سەرووی مەدینەدا دەژیا کە ناوچەی (سونەح)یان پێ دەووت و سواری وڵاخەکەی بوو و بەرەو ماڵەکەی کەوتە ڕێ[3].

ئازاری سەرە مەرگ زۆری بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هێنا و ئوسامە چووە ژوورەوە بۆ لای و دەبینێت دەمی بەستراوە و ناتوانێت قسە بکات، دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و دەیهێنا بەسەری ئوسامەدا، بۆیان دەرکەوت دوعای خێری بۆ دەکات و عائیشەیش (خوای لێ ڕازی بێت) هاتە ژوورەوە و باوەشی پێداکرد و سەری نا بە سنگی خۆیەوە و عبدالرحمن ی کوڕی ئەبو

[1] السيرة النبوية للنداوي (ل: ١٠٤).
[2] البخاري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٤٨).
[3] السيرة النبوية لأبي شعبة (٥٩٣/٢).

بەکر هاتە ژوورەوە و سیواکێکی بە دەستەوە بوو، پێغەمبەری خوا هەر بۆ سیواکەکەی دەڕوانی، عائیشە وتی: سیواکت بۆ بکەم؟ ئاماژەی کرد کە (بەڵێ).

ئەمیش سیواکەکەی لە براکەی سەند و جوان نەرمی کردەوە دایە دەستی و ئەویش زۆر بە جوانی سیواکی پێ کرد و بەردەوامیش دەیفەرموو: «فی الرفیق الاعلی»[1]، واتا: بۆ لای دۆستی بەرز و بڵندم، کە خوای گەورە بوو.

لە لای پێغەمبەردا لە جامۆلکەیەکدا ئاو دانرابوو دەستی پێدا دەکرد و دەیهێنا بە دەم و چاوی خۆیدا و دەیفەرموو «لا اله الا الله، انّ للموت سکرات»، واتا: لا الە الا اللە، بە ڕاستی گیان کێشانیش ئازاری هەیە، وە هەردوو دەستی کردەوە و دەیووت: «فی الرفیق الاعلی» و هەتا گیانی پیرۆزی دەرچوو و دەستەکانی شل بوون[2]، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە فەرموویەتی: «اللهم أعنّي على سكرات الموت»[3]، واتا: ئەی خودایە یارمەتیم بدە لە کاتی ئازاری گیان کێشاندا.

لە ڕیوایەتێکی تردا عائیشە دەڵێت: گوێم شل بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش ئەوەی گیانی دەربچێت ڕاکشابوو دەیووت: «اللهم اغفر لی، وارحمنی والحقنی بالرفیق الاعلی»[4]، واتا: خوایە لێم خۆش ببە و بەزەیت بێتەوە پێمدا و بمگەیەنە بۆ لای هاوڕێی بەرز و بڵندم.

وە (فاطمة)یش (خوای لێ ڕازی بێت) لەو کاتەدا خۆی کرد بە ژووردا و وتی: ئای لە نەهامەتی باوکە گیان، ئەویش پێی فەرموو: «لیس علی ابیك كرب بعد الیوم»، واتا: دوای ئەمڕۆ ئیتر باوکت نەهامەتی نابینێت.

هەر کە گیانی پاکی دەرچوو (فاطمة) هاواری کرد:باوکە گیان، چوو بە دەم پەروەردگارەوە کە بانگی کرد و ئەمیش چوو بە دەمیەوە... باوکە گیان... بەهەشتی فیردەوسە جێگات، باوکە گیان.. سەرەخۆشی لە جوبرەئیل دەکەین.

---

[1] البخاري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٣٧).
[2] البخاري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٤٩).
[3] الترمذي كتاب الجنائز ژمارە ٩٧٨٠.
[4] البخاري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٤٠).

کاتێك کە ئەسپاردەی خاکیان کرد فاتمە (خوای لێ ڕازی بێت) بـە ئەنەسـی وت: «یا أنس کیف طابت أنفسکم ان تحثوا علی رسول الله التراب؟!»[1]، واتا: ئەی ئەنەس ئـەوە چـۆن دڵتان هات خۆڵ بکەن بەسەر لاشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟!

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دونیا دەرچوو کە فەرمانڕەوایی کەنداوی عـەرەبی دەکـرد و سـەرجەم پاشـاکانی زەوی لێ دەترسـان و هاوەڵـە بەڕێزەکانیـشی بـە گیـان و مـاڵ و منداڵیانەوەخۆیان دەکردە قوربانی و لە پاش خۆیشی نە دینار و نە درهـەم و نـە خزمـەتکار و کەنیزەکی بەجێ نەهێشت، تەنها شتێك بەجێی هێـشتبێت ئەسـپە سـپیەکەی و شمـشێرەکەی و پارچە زەویەك کە کردبووی بە خێـر بـۆ ڕێبـوار و غـەریبان[2]، کاتێـك کـە لـە دونیـا دەرچـوو قەلغانەکەی لە لای جوولەکەیەك بوو لە باتی (٣٠) ئەندازە (صاع) جۆ کە لێی وەرگرتبـوو بـە قەرز[3].

ڕۆژی دووشەممەی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١١)ی کۆچی و پـاش نوێـژی نیـوەڕۆ وەفاتی فەرموو[4]، لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا، کە ئەو ڕۆژە ڕەشترین ڕۆژ بوو کـە تێپـەڕی بەسـەر موسوڵماناندا، نەهامەتیەکی مەزنیش بوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی هەروەك چـۆن ڕۆژی لـە دایـك بوونەکەی بەختەوەرترین ڕۆژ بوو کە خۆری لەسەر هەڵهاتبێت[5].

ئەنەس دەڵێت: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خـوا پـای خـستە نێـو شـاری مەدینـەوە هەموو شتێك ڕووناك بوویـەوە، ئـەو ڕۆژەش کـە کۆچـی دوایـی کـرد هـەموو شـتێك تاریـك هەڵگەڕا[6]، (أم أیمن) دەستی کرد بە گریان لێیان پرسی بۆچی دەگریت بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟

---

[1] البخاري کتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٦٢).
[2] البخاري کتاب المغازي.
[3] السیرة النبویة للندوي (لا: ٤٠٣).
[4] البدایة والنهایة (٤/٢٢٣).
[5] السیرة النبویة للندوي (لا: ٤٠٤).
[6] لترمذي (٥/٥٤٩) ژمارە ٣٦١٨.

ئەویش فەرمووی: من هەر دەمزانی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ڕۆژێـك دەمرێـت، بـەڵام بـۆ ئـەوە ئەگریم کە ئیتر وەحی تەواو دەبێت و نایەتە خوارەوە[1].

**دووەم: ترسناکی نەهامەتیەکە و هەڵوێستی ئەبو بەکر لێی:**

(إبن رجب) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچـی دوایـی کـرد، موسـوڵمانان شـلەژان، هەنـدێکیان هـەر تێکـچوون و هەنـدێکی تریـان کـەوتن و نـەیانتوانی جـارێکی تـر هەڵبستنەوە، هەندێکی تریان زمانیان بەسترا و قسەی بۆ نەدەهات هەندێکی تریان مردنەکەیان ڕەد دەکردەوە و بە درۆیان دەخستەوە[2].

(قرطبي) دەربارەی گەورەیی کۆسـکەوتنەکە و ئـەو شتانەشـی بـە هۆیـەوە ڕوویـدا دەڵێت: گەورەترین نەهامەتی نەهامەتیەکە تووشی ئایینی مرۆڤ بێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: «إذا أصاب أحدكم مصيبة فليذكر مصابه بي فانه أعظم المصائب»[3]، واتا: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە تووشی کارەساتێك هات با کارەساتی لە دونیا دەرچوونی منتان بیر بکەوێتەوە چونکە ئەوە گەورەترین کارەساتە.

بە ڕاستی وایە، ڕاستی فەرمووە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) چـونکە کارەسـاتە بەسـەر موسوڵمانان هاتبێت تا ڕۆژی قیامـەت، وەحـی کۆتـایی هـات، پێغەمبەرایـەتی تـەواو بـوو، یەکەمین خراپە سەری هەڵدا کە لە ئایین پاشگەز بوونەوە ڕوویدا لە هەندێ هـۆزی عـەرەب نـاو شتانیشی تریش و یەکەمین دابڕانی سەرەتای ناتەواوە دەرکەوت[4].

(إبن إسحاق) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد نەهامەتیـەکی زەبـەلاح ڕووی لـە موسـوڵمانان کـرد، وەك پـێم گەیـشتووە عائیـشە (خـوای لێ ڕازی بێـت) وتوویەتی: «کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) مرد، عەرەب لە ئیسلام هەڵگەڕانـەوە و جوولەکـە و

---

[1] مسلم (١٩٠٧/٤).
[2] لطائف المعارف (لا: ١١٤١).
[3] السلسلة الصحيحة للألباني (ژمارە: ١١٠٦).
[4] التفسير القرطبي (١٧٦/٢).

گاورەکان دڵیان ئاوی خوارد و دوو ڕوویی سەری هەڵدا، موسـوڵمانەکان وەك ڕانێکیـان بەسـەر هات لە شەوێکی زستانی باراناویدا سەری لێ تێك چوو، بە مردنی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ)»[1].

قازی ئەبو بەکر (إبن العربی) دەڵێت: «حاڵی خەڵکی تێك چـوو، مردنـی پێغەمبـەر (ﷺ) پشت شکێن بوو، کارەساتی تەمەن بوو، عەلی (رضي الله عنه) لە ماڵی (فاطمة)دا خۆی شـاردەوە و عوسمان (رضي الله عنه) بێ دەم و زمان کەوتبوو، عومەری کـوڕی خـەتاب (رضي الله عنه) هـاواری ئـەکرد: « پێغەمبەری خوا نەمردووە، بۆ سەردانی خوا ڕۆیشتووە هەروەك چۆن موسـا، پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەگەڕێتەوە، دەست و قاچی کەسانێك دەبڕێت لەسەر ئەم مەسەلەیە»[2].

بەڵام هەر کە ئـەبو بـەکر (رضي الله عنه) هەواڵەکـەی زانـی خێـرا لـە (سـونەح)ەوە سـواری وڵاخەکەی بوو هاتەوە، دابەزی، و قسەی لەگەڵ کەس نەکرد، وە بەرەو ژوورەکەی عائیشە کەوتە ڕێ، بەرەو لای لاشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەوتە ڕێ کە بە قوماشێکی (حیبرە) داپۆشـرابوو، سەری لادا و خۆی دا بە سەریدا و دەستی کرد بە گریان و پاشان وتی: دایك و باوکم بە سـاقەت بێ، سوێند بە خوا دوو مردنت بەسەردا نایەت، وا مردنی یەکەمت بەسەردا هات[3].

پاشان ئەبو بەکر و عمر چوونە دەرەوە بۆ لای خەڵکەکە و عمـر بـە توڕەییـەکی لـە ڕادەبەدەرەوە قسەی دەکرد و ئەبو بەکر پێی وت: عمر دانیشە، ئەو هەر بەردەوام بوو، ئیتر ئەبو بەکر هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە وتاردان و سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای کرد و وتی:

پاشان، هەر کەسێك محمدی ئەپەرست، محمد مرد، هەر کەسێك خوای ئەپەرست خوا زیندووە و نامرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ

---

[1] ابن هشام (٣٢٣/٤).
[2] العواصم من القواصم (لا: ٣٨).
[3] البخاري کتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٥٢).

﴿فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ (ال عمران: ١٤٤)، خەڵکی دەستیان کرد بە ناڵە و گریان[1].

عمر (رضي الله عنه) دەڵێت: سوێند بە خوا هەر کە گوێم لە ئەبو بەکر بوو ئەو ئایەتەی دەخوێند قاچەکانم خۆیان پێ ڕانەگیرا و کەوتمە سەر زەوی، لەوێدا زانیم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کردووە[2].

قرطبي دەڵێت: ئەم ئایەتە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئازایەتی و غیرەتی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه)، چونکە ئازایەتی و غیرەت مەنی ئەوەیە لە کاتی کارەسات و نەهامەتیدا دڵ خۆگر و ڕاوەستاو بێت، کارەساتیش نیە لە مردنی پێغەمبەر (ﷺ) گەورەتر بێت و غیرەتیەکەی ئاشکرا بوو، خەڵکی ئەیووت: پێغەمبەر نەمردووە یەکێك لەوانە عمر بوو، عوسمانیش زمانی بەسترا و عەلیش خۆی شاردەوە و کاروبارەکان تێك چوون، صدیق (رضي الله عنه) هەر کە لە سونەیح گەڕایەوە کارەکانی گەڕاندەوە شوێنی خۆی[3].

بەم وشە کەمانە و بە بەڵگە هێنانەوەی ئایەتێکی قورئانی پیرۆز توانی خەڵکی لەو تێکچوون و شپرزەییە ڕزگار بکات و بە گەڕانەوەیەکی جوان بیانگەڕێنێتەوە بۆ سەر تێگەیشتنی ڕاست و دروست، خوای گەورە بەس خۆی هەمیشە زیندووە و نامرێت، هەر ئەویشە شایانی پەرستنە و ئیسلام بەردەوام دوای مردنی پێغەمبەریش دەمێنێت[4]. هەروەك چۆن لە ڕیوایەتی وتەیەی صدیق دا هاتووە کە دەڵێت: ئایینی خوا بەرپایە، وشەی خوا تێر و تەواوە و خوایش سەری دەخات هەر کەسێك ئایینەکەی ئەو سەر بخات، ئایینەکەی سەربەرز بکات، قورئانەکەی خوامان لە ناودایە کە ڕووناکی و چارەسەرە و بە هۆی ئەوەوە خوا پێغەبەرەکەی هیدایەت دا و حەڵاڵ و حەرامی خوای گەورەی تێدا کۆ بووەتەوە و سوێند بە خوا گوێ بە هیچ کەسێك نادەین بێتە ڕێگەمان، شمشێری خوا هەر تیژە و هێشتا دامان نەناوە و جیهادیش

---

[1] البخاري كتاب فضائل الصحابة (ژمارە: ٣٦٦٨).
[2] البخاري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٤٥٤).
[3] تفسير القرطبي (٢٢٢/٤).
[4] استخلاف ابو بكر جمال عبدالهادي (لا: ١٦٠).

دەکەین دژی هەموو ئەوانەی بەرامبەرمان دەوەستن، هەروەك چۆن جاران لە پشت پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کردوومانە و کەسێش ستەم ناکات لە خۆی نەبێت[1].

مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کارەساتێکی گەورە بوو، بەڵا و تاقیکردنەوەیەکی قورس بوو، لەو کاتەدا و پاش ئەو کاتەش گەورەیی صدیق (رضي الله عنه) دەرکەوت، وەك سەرکردەیەکی ئومەتی ئیسلامی بێ وێنە و بێ هاوتا[2].

تا ئەوپەڕی سنوور دڵی پڕ لە یەقین و دڵنیایی بوو، ئەمەش لە پتەوی تێگەیشتنی لە ڕاستیەکان کە تیایدا لە هەستی بەندایەتی و پێغەبەرایەتی و مردن زۆر جوان تێگەیشتبوو.

لەو ساتە وەختە دژوارەدا ژیری صدیق (رضي الله عنه) دەرکەوت، وە خەڵکی بەرەو یەکتاپەرستی بردەوە (هەر کەسێك خوای پەرست خوا هەمیشە زیندووە و نامرێت) یەکتاپەرستی لە ناو دڵیاندا ڕەگی داکوتابوو، هەر کە یادخستنەوەکەی صدیق (رضي الله عنه)یان بیست خێرا گەڕانەوە بۆ لای ڕاستی[3].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: سوێند بە خوا خەڵکەکە وایان دەزانی ئەوئایەتەیان نەبیستووە ئەو ساتە نەبێت کە لە ئەبو بەکریان بیست، ئەوجا زانیان خوای گەورە ئەوها ئایەتێکی ناردۆتە خوارەوە و هەموو خەڵکی لەوەوە وەریان گرتەوە و هەر کەسێك گوێی لێ بوو بە دەم خۆیەوە دەیوتەوە[4].

**سێیەم: سەقیفەی بەنی ساعیدە:**

هەر ئەو ڕۆژەی هاوەڵان زانیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کردووە، هەموو پشتیوانان لە سەقیفەی بەنی ساعیدە کۆبوونەوە تا کەسێك دیاری بکەن بە جێنشێنی ئەو[5].

پشتیوانان قسەیان کرد بە یەکێ و لە دەوری سەرکردەیان سەعیدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) کۆبوونەوە، هەر کە هەواڵی کۆبوونەوەکەی پشتیوانان گەیشتە کۆچەریان لەگەڵ ئەبو

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي (٢١٨/٧).
[2] ابو بكر رجل الدولة، مجدي حمدي (لا: ٢٥-٢٦).
[3] استخلاف ابي بكر الصديق (لا: ١٦٠).
[4] البخاري كتاب الجنائز (ژمارە: ١٢٤١-١٢٤٢).
[5] التأريخ الاسلامي (٢١/٩).

بەکردا کۆبوونەوە بە مەبەستی دانانی جێنشین[1]، کۆچەریان بە خۆیان وت: با بڕۆین بۆ لای برا پشتیوانەکانمان و ئەوانیش مافیان هەیە لە دەستنیشان کردنیدا[2].

عمر (ﷺ) دەڵێت: دەرچووین بۆ لایان، کاتێك لێیان نزیك بووینەوە دوو پیاوی چاکیان گەیشتن پێمان و باسی ئەو ڕێککەوتنەی پشتیوانانی بۆ کردین، وتی: بۆ کوێ ئەچن ئەی کۆچەریان؟ ئەڕۆین بۆ لای برا پشتیوانانمان، وتیان: پێویست ناکات بڕۆن بۆ لایان، ئێوە ئیشی خۆتان بکەن، وتم: سوێند بە خوا ئەڕۆین بۆ لایان و کەوتینە ڕێ بەرەو سەقیفەی بەنی ساعیدە، دەبینین هەموویان لەوێ کۆبوونەتەوە و دەنگیان کردووە بە یەك لەسەر پیاوێك که سەر و ملی داپۆشرابوو لە ناویاندا وتم: ئەمە کێیە؟ وتیان: سەعدی کوڕی عوبادەیە (ﷺ)، وتم: چیەتی؟ وتیان: گەرمایەتی.

کاتێك دانیشتین وتاربێژیان هەستایە سەر پێ و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد بە جۆرێك کە شایەنی بێت، پاشان وتی: پاشان، ئێمە پشتیوانانی خوا و دەستەی ئیسلام و ئێوەش ئەی کۆچەرییان کۆمەڵێکن لە ئێمە و لە لایەن گەلەکەتانەوە دەرکراون و کەچی وا خەریکە ئێمە لە بناغە دەردەهێنن و لە ئیش و کاری — خەلافەت — دوورمان دەخەنەوە، کاتێك بێدەنگ بوو ویستم قسە بکەم چونکە پێشتر وتارێکم ئامادە کردبوو — لە مێشکمدا گەڵاڵەم کردبوو — دەمویست لە خزمەت ئەبو بەکردا پێشکەشی بکەم و بە دەم خۆمەوە لێم دەوتەوە و ویستم قسە بکەم، ئەبو بەکر وتی: پەلە مەکە، منیش پێم خۆش نەبوو توڕەی بکەم، ئەو دەستی بە قسە کرد، ئەو لە من نەرم و نیان تر و لە من بەڕێز و ویقار تر بوو، سوێند بە خوا تەنها وشەیەکی بۆ نەهێشتم لە ناو وتارەکەمدا دەمویست بیڵێم، کەچی ئەویان وەك ئەو یان لەو جوانتری وت، بۆیە من بێدەنگ بووم.

وتی: ئەو شتە چاکانەی ئێوە باستان کرد هەمووی لە ئێوەدا هەیە و ئێوە شایستەی ئەوەن، ئەم مەسەلەیە بۆ ئەم هۆزەی قورەیش، نەژادیان مامناوەندە لە ناو هەموو عەرەبدا و من ئەم پیاوەم بە دڵە جا هەر کامیانتان پێ باشترە بەیعەتی پێ بدەن، لەوێدا دەستی من و

---

[1] عصر الخلافة الراشدة للعمري (لا: ٤٠).

[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

ئەبو عوبەیدەی گرت و ئەو لە نێوان هەردووکامدا دانیشتبوو، من پێم ناخۆش نەبوو هیچ کام لە وتەکانی، بەڵام سوێند بە خوا بیانبردمایە و سەریان ببڕیمایە پێم خۆشتر بوو لەوەی کە ببمە گەورەی گەلێك کە ئەبو بەکریان تێدابێت، مەگەر لە سەرەمەرگدا شتێك بێت بە خەیاڵمدا کە ئێستا وا نیم.

یەکێك لە پشتیوانەکان وتی: من داری پشت خورێنم و بنکی دار خورما و با لە ئێمە ئەمیرێك و لە ئێوەش ئەمیرێك، واتا بە سەرە ئەی قورەیشیەکان دەنگ بەرز بوویەوە و گاڵە گاڵ دروست بوو تا وای لێ هات زۆر ترسام لە دووبەرەکی بۆیە وتم: ئەی ئەبو بەکر دەستت بێنە، دەستی هێنا، من بەیعەتی خۆمم پێدا و کۆچەریەکانیش بە دوای مندا و پاشان پشتیوانەکانیش هەستان و یەك بە یەك بەیعەتیان پێدا[1].

لە ڕیوایەتی ئەحمەددا هاتووە: ئەبو بەکر دەستی کرد بە وتار و هەرچی ئایەتێك لەسەر پشتیوانان هاتبێتە خوار و هەرچی فەرموودەیەك پێغەمبەر لە سەریان فەرموو بێتی خستیەوە یاد و وتی: ئێوە باش دەزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «لو سلك الناس واديا وسلك الانصار وادياً سلكت وادى الانصار»، واتا: ئەگەر هەموو خەڵکی بە دۆڵێکدا بڕۆن و پشتیوانانیش بە دۆڵێکدا بڕۆن، ئەوە من بە دۆڵەکەی پشتیواناندا دەڕۆم.

وە تۆش ئەی سەعد[2] خۆت دانیشتبووی کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: «قريش ولاة هذا الامر فبر الناس تبع لبرهم،و فاجر الناس تبع لفاجرهم»، واتا: قورەیش سەرکردەیی و پێشەوایی هی خۆتانە، چاکان شوێنی چاکانیان دەکەون و خراپەکارانیش شوێنی خراپەکارانیان دەکەون، دەڵێت: سەعد (رضي الله عنه) لەوێدا وتی: ڕاست دەکەیت لە ئێوە ئەمیران و لە ئێمەش وەزیران[3].

**چوارەم: گرنگترین پەند و ئامۆژگاری لەم ڕووداوەدا:**

---

[1] البخاري كتاب الحدود (ژمارە: ٦٨٣٠).

[2] **سەعدی کوڕی قوبادی خەزرەجی** (رضي الله عنه).

[3] مسند احمد (٥/١)، الخلافة الخلفاء البساوي (لا: ٥٠).

١- توانایی ئەبو بەكر (ﷺ) لە هەڵسوكەوتی جوان و توانای ڕازیكردن و قایلكردنی خەڵكی:

لە ڕیوایەتەكەی ئەحمددا دەردەكەوێت كە چۆن توانیویەتی بچێتە ناو دڵی پشتیوانەكان و ڕازیان بكات بەوەی كە ئەو بە ڕاستی دەزانێت بەبێ ئەوەی موسوڵمانان بەرەو ئاشوب و دووبەرەكی بەرێت، بەجوانی لەسەر پشتیوانان دوا و هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی باسی چاكیان دەكات خستیەوە یاد.

ئەمەش پرۆگرامێكی ئیسلامیە كە لە سەرەتاوە باسی چاكی و لێهاتوویی نەیاران بكرێت تا دەربكەوێت كە تۆ لەگەڵیدا بە ویژدانیت و هەروەك هەڵمژین و دامركانەوەی توڕەیی بەرامبەرە و دەرهێنانی ڕەگی خۆخۆیی و من منۆكێ كردن لە دەروونیدا تا ئامادەی بكەیت بۆ قبوولكردنی هەق كاتێك بۆی ڕوون بوویەوە و لە ناو ڕینموونیەكانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لەم بارەیەوە نموونە زۆرە.

لەوە ئەبو بەكر گەیشتە جوانترین ڕا، هەرچەندە زۆر قورس و گەورە بوو لەسەر ئەوان چونكە ئەوەی دەگەیاند كە جێنشینی بۆ ئەوان نیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دەق فەرموویەتی كە قورەیش لەم مەسەلەیەدا لە پێش خەڵكانی ترەوەن[1].

(ابن عربی المالكی) باسی ئەوەی كردووە كە ئەبو بەكر (ﷺ) ئەوەی ڕوون كردەوە كە قورەیش شایانی خەلافەتە بەوەی كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاگاداری ئەوە دەكات كە لەگەڵ پشتیواناندا چاكبن و چاكەی چاكەكاران وەربگرن و لە خراپەی خراپەكارانیان ببوورن.

هەروەها بە بەڵگەی ئەوەی كە وتی: خوای گەورە لە قورئاندا ئێمەی بە ڕاستگۆیان — صادقین — و ئیوەی بە ڕزگاربووان — مصلحين — ناوبردووە.

لە ئایەتی: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّـٰدِقُونَ

[1] التأريخ الاسلامي (٢٩/٩).

﴿۞ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۞﴾ (الحشر:٨-٩)، خوای گەورەیش ئەمەی فەرمووە کە دەبێت هەمووان لەگەڵ (صادقین)دا بن وەك دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ۞﴾ (التوبه:١١٩)، ئەمە و چەندان بەڵگەی بەهێز و بەپێزی تر کە توانی وا بکات لە پشتیوانان مل بدەن بۆی[١].

لە وتارکەشیدا صدیق (رضي الله عنه) ئەوەی ڕوون کردەوە کە هەرچی ئەو هۆزەی خۆی دەپاڵێوێت بۆ پۆستی جێنشینی دەبێت سەرجەم عەرەب ڕازی بن بە سەرکردایەتیان و دانیان پیا بنێن، تا خەڵکانی تر نەیەنە سەر حوکم و ئاشوب هەڵبگیرسێت، ڕوونیشی کردەوە بۆیان کە عەرەب تەنها دان بە موسوڵمانانی قورەیشدا دەنێن چونکە لە تیرەی پێغەمبەرن (ﷺ) و هەموو عەرەبیش بە کۆی دەنگ لەسەر ئەوەن کە گەورەیی و سەرکردایەتی و ڕێز شایانی ئەوانە...

بەم وشە پڕشنگدارانەوە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) توانی قەناعەت بە پشتیوانان بکات کە ببن بە وەزیر و سەربازی دڵسۆز و ئەمەکدار هەروەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەری خوا وا بوون و بەو جۆرە توانی ڕیزەکانی موسوڵمانان بکات بە یەك.

٢- خۆلادانی عمر و ئەبو بەکر لە کورسی جێنشینی و مەبەستی هەمووان لە پاراستنی یەکڕیزی موسوڵمان:

ئەوەبوو ئەبو بەکر پاش ئەوەی قسەکانی تەواو کرد عمر و ئەبو عوبەیدەی جەڕاحی دەست نیشان کرد، بەڵام عومەر (رضي الله عنه) ئەمەی پێ ناخۆش بوو، بۆیە دواتر وتی: «قسەکانی تری ئەبو بەکرم پێ ناخۆش نەبوو، بەڵام سوێند بە خوا بیاندایە لە ملم و سەریان لە لاشەم

[١] العواصم من القواصم (لا: ١٠).

جیاکردمایەتەوە پێم خۆشتر بوو لەوەی ببم بە جێنشین و سەرکردەی گەلێك ئەبو بەکری تێدا بێت»[1].

بەم قەناعەتەی عومەرەوە ئەبو بەکر شایانترە ببێتە جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیە پێی وت: دەستت بێنە ئەی ئەبو بەکر، ئەویش دەستی هێنا، و دەڵێت من بەیعەتم پێدا و پاشان کۆچەریان پاش ئەوانیش پشتیوانان.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە عومەر وتی: «..... ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایا نازانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا بە ئەبو بەکر کە لە باتی خۆی پێش نوێژی موسوڵمانان بکات، دەی ئایا کامتان قبوولّی ئەوە دەکەن کە پێشی ئەبو بەکر بکەون؟ پشتیوانان وتیان: پەنا بە خوا لەوەی پێشی ئەبو بەکر بکەوین»[2].

ئەمەش تێبینیەکی گرنگ بوو کە عومەر دەرکی پێکرد، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگدا سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێش نوێژی بکات، ئەمەش وەك ئاماژەیەك وایە بۆ ئەوەی ئەو لە هەمووان شایانترە بە پێشەوایەتی، و قسەکانی عومەر (رضي الله عنه) ئەو پەڕی بێ فیزی و نەفس شکاندن و ڕەوشت بەرزی دەنوێنێت.

پلە و پایە نەویستی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) ئەو کاتە دەرکەوت کە وتاری دا و تیایدا داوای لێبووردنی کرد لە قبوولکردنی خەلافەت، وتی: سوێند بە خوا هیچ ڕۆژێك هیچ شەوێك سوور نەبووم لەسەر دەستکەوتنی پێشەوایی و هەرگیز حەزم لێ نەکردووە و هیچ کاتیش داوام لە خوای گەورە نەکردووە کە دەستمی بخات نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا، بەڵام لە ئاشووب و دووبەرەکی ترسام، و من حەوانەوە و خۆشی لە سەرکردایەتیدا نابینم، بەڵام کارێکی زۆر گەورەم گرتە ئەستۆ و لە توانا و وزەی مندا نیە ئەگەر هاوکاری خوای گەورەم لەگەڵدا نەبێت، و ئاواتەخواز بووم کەسێك لەو جێیەدا بوایە بە تواناترین کەس بوایە بە سەریدا[3].

---

[1] البخاري كتاب المحاربين ٦٨٣٠.

[2] مسند احمد (١٢/١) و صحيح اسنادة احمد شاكر (٢١٣/١) **ژمارە** ١٣٣.

[3] المستدك (٦٦/٣)، قال الحاكم صحيح واقره الذهبي.

له جێیەکی تردا دەڵێت: «ئاواتە خواز بووم لە ڕۆژی سەقیفەی بەنی ساعیدەدا ئەم کارەم بکردایەتە ملی یەکێك لەو دوو پیاوە (عمر و ابو عبیدە) و منیش ببومایە بە وەزیر و هاوکاریان»[1].

لە زۆر جێگەی تری وتارەکانی ئەبو بەکردا داوای لێبووردنی کردووە لەسەر وەرگرتنی خەلافەت، و داوای کردووە لە کۆڵی ببنەوە و دەڵێت: «.... ئەی خەڵکینە ئەم کارەی من وەرمگرتووە، تایبەتە بە ئێوەوە و کێتان پێ خۆشە بیخەنە شوێنی من و من وەك یەکێکی وەك ئێوە دەبم».

خەڵکەکە وەڵامیان دایەوە، هەموو بە تۆ ڕازی بووین، تۆ دووەمی دووەم کەسەکەی ئەشکەوتیت لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ)[2]، وە داوای کرد لە موسوڵمانان کە کێ پێی ڕازی نیە و سوێندی دان کە بیڵێن تا واز لە کورسی دەسەڵات بهێنێت و وتی: ئەی خەڵکینە کێ پەشیمانە لەو بەیعەتەی بە منی داوە با هەڵسێتە سەر پێ، عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) هەستایە سەر پێ و شمشێرەکەی دەرهێنا و ئەوەندە لێی نزیك بوویەوە کە پێی خستە سەر تەختەی مینبەرەکە و قاچەکەی تری لەسەر زەوی بوو و وتی: «والله لا نقيلك ولا نستقيلك، قدمك رسول الله فمن ذا يؤخرك؟»، واتا: سوێند بە خوا نە لات دەبەین و نە داواشت لێ دەکەین لاچیت، تۆ پێغەمبەری خوا پشتی خستوویت کێ دەتوانێت دوات بخات؟[3]

خۆ ئەبو بەکر تەنها نەبوو لە پلەوپایە نەویستن بەڵکو هەموو کەسەکانی ئەو سەردەمە قورئانیە وا بوون.. لەو دەقانەی پێشتر باسمان کرد بۆمان دەردەکەوێت و دەتوانین بڵێین: «ئەو وتووێژانەی لە سەقیفەی بەنی ساعیدە ڕوویدا لەم ڕێڕەوە دەرناچێت، بەڵکو دڵسۆزی سووربوونی پشتیوانان دەردەخات لە پاراستنی دوا ڕۆژی بانگەوازی ئیسلامی و ئامادەییان بۆ قوربانی دانی بەردەوام لەو پێناوەدا، هەر کە لەوە دڵنیا بوون خێرا پەلاماری بەیعەتدانیان دا بە ئەبو بەکر کە ئەو لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە قبووڵی کردبوو، وەگەرنا تێروانینی هاوەڵان بۆ

[1] الانصار في العصر الراشدي، حامد محمد خليفة (لا: ١٠٨)، تأريخ الخلفاء للسيوطي (لا: ٩١).
[2] الخلافة الراشدة للعمري (لا: ١٣
[3] الانصار في العصر الراشدي (لا: ١٠٨).

پلەوپایە زۆر جیاوازە لە بۆچوون و ڕای ئەوانەی دوای ئەوان هاتن و بەبێ هیچ بنەمایەکی زانستیانە دەمیان کوتایە ئەو باسە، بەبێ ئەوەی بابەتیانە بڕواننە مەسەلەکانی ئەو سەردەمە و بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە گیانی تێڕوانین و ئاواتی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و بەڵکو زۆر بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەمیان کوتا، ئەگەر کۆبوونەوەی سەقیفەی بەنی ساعیدە ڕیزەکانی موسوڵمانانی ترازاندبوو وەك هەندێ لەو قەڵەم بە دەستانە بۆی دەچن[1]. ئەی بۆچی کە پشتیوانان کە شار شاری خۆیان بوو، سوپا سوپای خۆیان بوو، کەرەستە کەرەستەی خۆیان بوو، کەچی قبووڵی ئەنجامەکەیان کرد و ملیان دا بە جێنشینی ئەبو بەکر و بوونە سەربازی سوپاکانی و بەرەو خۆرهەڵات و خۆرئاوا دەستیان دایە جیهاد و گیان فیدایی؟ چۆن وا دەبوون ئەگەر زۆر سوور و گەرم و گوڕ نەبوونایە لەسەری؟»[2].

ڕاستیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کە پشتیوانان زۆر سوور بوون لەسەر جێ بەجێ کردنی سیاسەتەکانی خەلیفە و هەوڵدان بۆ جەنگ دژی هەڵگەڕاوەکان، و یەك کەس لە بەیعەتی ئەبو بەکر دوا نەکەوت لە پشتیوانان و موسوڵمانانی تر، برایەتی نێوان کۆچەریان و پشتیوانان زۆر لەوە گەورەترە کە کینەبازان لە نووسینەکانیاندا ویستوویانە تۆوی دووبەرەکی لە نێوانیاندا بچێنن[3].

### ٣- سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) و هەڵوێستی لە خەلافەتی ئەبو بەکر:

سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) لە دوای ئەو گفت و گۆ و وتو وێژانەی لە سەقیفەی بەنی ساعیدە ڕوویدا بەیعەتی دا بە ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) و لە پلەوپایەی بەرزی خۆی دابەزی کە داوای خەلافەت بوو، و دانی نا بە خەلافەتی صدیقدا، و کوڕی مامەکەی کە ناوی بەشیری کوڕی سەعدی ئەنصاری بوو یەکەمین کەس کە بەیعەتی دا بە ئەبو بەکر و هیچ کێشە و نیزاعێك ڕووی نەداوە کە لە ڕێگەیەکی ڕاست و دروستەوە پێمان گەیشتبێت، نە بچووك، نە گەورە و ترسناك نە هیچ درزێك و دووبەرەکیەك نەکەوتە نێوان ئەوانەی دەیانویست خەلافەت لە ئەوان بێت وەك چۆن هەندێ لە مێژوو نووسەکان بە هەڵە بۆی چوون.

---

[1] الاسلام واصول الحكم، محمد عمارة (لا: ٧١،٧٤).
[2] الانصار في العصر الراشدي (لا: ١٠٩).
[3] الانصار في العصر الراشدي.

بەڵام برایەتی موسوڵمانەتی وەك خۆی ماوەتەوە و بەڵکو وەك لە نووسراوە بڕواپێکراوەکاندا هاتووە بەهێزتریش بووە، هیچ شتێکی باوەڕپێکراو لە بەر دەستدا نیە کە پیلان و ڕێککەوتنێکی پێش وەخت لە نێوان ئەبو بەکر و عومەر و ئەبو عوبەیدەدا ڕووی دابێت بۆ دەستگرتن بەسەر کورسی دەسەڵاتدا پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[1] چونکە ئەوان زۆر لەوە لە خواترستر و چاکتر بوون کە ئەو جۆرە کارانە بکەن.

هەنێ نووسەری مێژوو نووس و ئەوانەی بە ئارەزووی خۆیان شت ئەنووسن و دوور لە بابەتیانە دەست ئەدەنە پێنووس، وایان لە سەعدی کوڕی عوبادە (ﷺ) کردووە کە گوایە بەربەرەکانێی کۆچەریەکانی کردووە بە شێوەیەکی زۆر دژوار، پیلانی بۆ دروست دەکرد، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە هەموو هۆکارێکی دووبەرەکی دروستکردنی بەکار دەهێنا.

کەچی ئەم پیاوە ئەگەر سەیرێکی ژیان و بەسەرهاتی بکەین، چەندین هەڵوێستی وای بووە لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) کە دەیباتە ڕیزی هاوەڵە هەڵبژاردە چاکەکان، ئەوانەی کە دونیا پەرستیان مەبەست نەبووە و بە زانایی خۆیان نەیاننازیوە، یەکێك بوو لە نەقیبەکانی شاری مەدینە، تا وای لە بێباوەڕانی مەککە کرد کە بۆی دابنیشن و لە بۆسەیەکدا گرتیان و دەستیان بەست بە ملیەوە و بە دیلکراوی بردیانەوە بۆ مەککە، تا جوبەیری کوڕی موتعیمی کوڕی عەدی ڕزگاری کرد لە دەستیان و ناردیەوە چونکە ئەو لە مەدینەدا ئەوانی پاراستبوو کاتی خۆی، یەکێ بوو لەو کەسانەی کە بەشداری جەنگی بەدری کردووە[2]، پلە و مەقامی ئەهلی بەدری بەدەست هێناوە، لە خانەوادەیەکی دەرماڵدار و بەخشندە بووە و پێغەمبەری خوا شایانی ئەو ڕاستیەی بۆ دەدات و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش خوا پشتی بە ئەو و سەعدی کوڕی مەعاز (ﷺ) بەستبوو، وەك لە غەزای خەندەقدا ڕاوێژی پێ کردن بەوەی کە ٣\١ یەك لەسەر سێی بەروبوومی شاری مەدینە بدەن بە عویەینەی کوڕی حصنی کوڕی فەزاری لە باتی ئەوەی

[1] استخلاف ابي بكر، جمال عبدالهادي (لا: ٥١،٥٢،٥٣).
[2] الاستعاب في معرفة الاصحاب (٢/٥٩٤).

بتپەرستەکان بەربدات و بڕواتەوە، و وەڵامی هەردوو سەعد ئەوەند جوان بوو بەڵگەیە لەسەر قووڵی باوەڕ و ئەوپەڕی ئامادەیی قوربانیدان[1].

هەڵوێستەکانی سەعد لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) زانراو و مەشهورن، ئەم هاوەڵە ئازیزە خاوەنی سەروەری گەورە لە پێناو خزمەت بە ئیسلام و هاوڕێیەتی پاك و ڕاستەقینەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناچێتە عەقڵەوە و شتی وا نەبووە کە بیەوێت دەمارگیری سەردەمی نەفامی زیندوو بکاتەوە لە کۆنگرەی سەقیفەدا و لە ڕێگەی دووبەرەکی نانەوەدا بیەوێت خەلافەت بگرێتە دەست.

هەروەك لە کتێبە ڕاست و دروست و باوەڕپێکراوەکاندا نەهاتووە ئەوەی کە هەندێ لە سەرچاوە گومان لێکراوەکان نەقڵی کردووە کە گوایە لە دوای بەیعەتی بە ئەبو بەکر، نوێژی لە پشتەوە نەکردووە و لەگەڵ ئەواندا حەجی نەکردووە[2]، وەك بڵێی لە کۆمەڵی موسوڵمانان خۆی دابڕیووە[3].

کە ئەمە ئەوپەڕی ناڕەوا و هەڵبەستراوە، چونکە لە ڕیوایەتە ڕاست و دروستەکاندا هاتووە کە سەعد بەیعەتی داوە بە ئەبوبکر ، و لەو کاتەدا ئەبو بەکر لە سەقیفەدا وتاری دەدا بە پشتیوانانی ووت: بێگومان هەمووتان دەزانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «ئەگەر خەڵکی بە دۆڵێکدا بڕۆن و پشتیوانانیش بە دۆڵێکی تردا بڕۆن، ئەوە من بە دۆڵەکەی پشتیواناندا دەڕۆم»[4]، و پاشان شتێکی وەبیر سەعد هێنایەوە کە بەڵگەیەکی ئاشکرای حاشا هەڵنەگرە و پێی وت: ئەی سەعد، بێگومان دەزانیت کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی و تۆش دانیشتبووی «کاری پێشەوایی تایبەتمەندی قورەیشە و چاك لەگەڵ چاکیاندایە و خراپیش

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدون، سالم البهنساوي (لا: ٤٨). **وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لە سەردەمی نەفامیشدا ئەوەمان قبووڵ نەبووە ئێستا چۆن قبووڵ دەکەین.**

[2] الخلافة والخلفاء الراشدون سالم البهنساوي (لا: ٤٩).

[3] **هەمان سەرچاوە.**

[4] البخاري كتاب التمنى (**ژمارە:** ٧٧٤٤).

لەگەڵ خراپیان))، سەعدیش وتی: ڕاستەکەیت ئێمە وەزیر و ئێوەش ئەمیرن[1]، و خەڵکەکەش بەیعەتیان دا و سەعدیش بەیعەتی خۆی پێدا.

بەمە دەسەڵمێت کە سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) بەیعەتی خۆی داوە بە ئەبو بەکر و بەوەش واتا هەموو پشتیوانان بە کۆی دەنگ دەنگیان بە ئەبو بەکر دا، ئیتر هیچ مانایەك نامێنێت بۆ ڕیوایەتە ناڕەوا و درۆ و دەلەسەکان و ئەوەش پێچەوانەی ڕاستی و واقیعە و تۆمەتێکی گەورە و ترسناکە دەدرێتە پاڵ گەورە و سەرداری پشتیوانەکان کە گوایە ڕیزی موسوڵمانەکانی درز تێ کردووە، و بێ وەفاییە بەرامبەر ئەو هەموو جیهاد و هەوڵ و تێکۆشان و قوربانی دان و خۆنەویستیەی لە بەردەم کۆچەریاندا، ئەمەش تانەیەکی گەورە لە موسوڵمانەتیەکە دەدەن کە گوایە – حاشا بۆ خوا – وتوویەتی: بەیعەتتان پێ نادەم تا هەرچی تیرم پێیە تێتان نەگرم، و سەری ڕمەکەم بە خوێن سوور نەکەم، و بە شمشێرەکەم لێتان نەدەم، و ئەو لەگەڵ ئەوان نوێژی نەدەکرد و لەگەڵ ئەوان فەوتاوی نەدەگێڕایەوە و ئەرکەکانی حەجی لەگەڵ نەدەکردن.

ئەم ڕیوایەتانەی کە تانە لە یەکڕیزی کۆچەریان و پشتیوانەکان دەدەن و ئەوانەشی باوەڕیان پێ دەکەن ڕیوایەتێکی ناڕەوا و بێ بایەخن.

چونکە گێڕەرەوە – ڕاو – هەوا و ئارەزوو پەرستە و هەواڵ نووسەرێکی بێ نرخە و متمانەی پێ ناکرێت[2]، بە تایبەت لە مەسەلە پڕجیاوازیەکاندا.

زەهەبی دەربارەی ئەم ڕیوایەتە دەڵێت: «سەنەدەکانی وەك دەردەکەوێت لە ئەوپەڕی لاوازیدایە و کۆتاییەکەشی پێچەوانەی ژیانی سەعدی کوڕی عوبادەیە (رضي الله عنه) و دژە بەو

---

[1] مسند الامام الاحمد (ذمارة: ١٨)، صحيح لفيرة.

[2] ميزان الاعتدال في نقد الرجال، للذهبي (٢٩٩٢/٣) و گێڕەرەوەکەشی لوطی کوڕی یەحیا ئەبو مخنف بە (متروك) نابراوە و فەرموودەی لێ وەرنەگیراوە و کەس متمانەی پێ نیە جگە لە شیعەکان و بە گەورە مێژوو نووسی خۆیان دەزانن لەسەر قسەی (ابن قومی) سەیری (حروبات ابن مخنف) بکە (في التأريخ الطبري، لدكتور يحيى اليحيى (لا: ٤٥-٤٦).

بەیعەتەی کە لە گەردنیدا بووە بە گوێڕایەڵی و گوێگرتن، و ئەگەر وا بووایە ئەو هەموو چاکەیەیان لێ نەدەگێڕایەوە)).

٤- ئەو شتانەی دەربارەی جیاوازی نێوان عومەر و حبابی کوڕی منزیر وتراوە:

دەربارەی کێشمەکێشمی سەقیفەی بەنی ساعیدە لە نێوان عومەر و حەبابی کوڕی مونزیر سلمی ئەنصاری، ڕای بەهێز ئەوەیە کە درۆیە و ڕاست نیە، و عومەر هیچ کات حەبابی تورە نەکردووە لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لە عومەرەوە دەگێڕنەوە کە وتویەتی: حەبابی کوڕی مونزیر وەڵامی قسەکانی منی داوەتەوە و من تەنها وشەیەك قسەم لەگەڵ نەکردووە، چونکە زووتر لە سەردەمی ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)شتێك کەوتبووە نێوانمان و پیغەمبەر بەرگری لێ کردم کە هەرگیز تەنها وشەیەکی لەگەڵدا نەڵێم کە پێی ناخۆش بێت.

هەروەك ئەوەی گوایە لەم کێشەکێشمەدا لە حەباب دەگێڕنەوە زۆر جیاوازە لە کارە جوان و شیاوەکانی، کە بە ناوی (پرس و ڕادار)[1] نازناوی دەرکردبوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جێگەی پرس و ڕای پێغەمبەر بوو چ لە جەنگی بەدر چ لە خەیبەر[2].

بەڵام وشەکانی حەبابی کوڕی مونزیر (رضي الله عنه)((ئەمیرێك لە ئێمە و ئەمیرێك لە ئێوە)) بەوە پاساوی دا و وا ڕوونی کردەوە کە مەبەستی گەیشتن بە ئەمیری نەبووە، و دەڵێت: ((سوێند بە خوا ئێمە بۆ بەربەرەکانێی ئێوە ئەمەمان نەکردووە و نایکەین، بەڵام لەوە ترساوین کە ئەم کارە بکەوێتە دەستی کەسانێك کە ئێمە و باوك براکانمان کووشتووە))[3]، کۆچەریەکانیش قسەیان لێ وەرگرت و بیانووەکەیان قبووڵ کرد لە کاتێکدا کە هەردوو لایان پێکەوە دەستیان هەبووە لە کوشتنی بت پەرستەکاندا[4].

٥- فەرموودەی ((پێشەوایان لە قورەیش دەبن)) و هەڵوێستی پشتیوانان لێی:

[1] الاستعاب (٣١٦/١).
[2] الانصلر في العصر الراشدي (لا:١٠٠).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[4] **هەمان شەرچاوەی پێشوو.**

فەرموودەی «پێشەوایان لە قورەیش دەبن» لە هەردوو صەحیحی بوخاری و مسلمدا و لە کتێبەکانی تری حەدیسدا هاتووە، بە وشەی جیا جیا، لە صەحیحی بوخاریدا لە موعاویە (ﷺ) دەڵێت: «إنّ هذا الامر في قريش لايعاديهم أحد الا اكيه الله في النار على وجهه ما اقاموا الدين»[1].

واتا: ئەمری پێشەوایی و ئەمیری لە ناو قورەیشدا دەبێت و هیچ کەس دژایەتیان ناکات خوای گەورە بە ڕوودا بە ناو ئاگری دۆزەخدا بە دەما نەیانخشێنێت تا ئەوەندەی قورەیش ئایینی خوا بەرپا بکەن.

لە صەحیحی مسلمیشدا هاتووە «لا يزال الاسلام عزيزا بخلفاء كلهم من قريش»[2]، واتا: بەردەوام ئیسلام لە گەشە و سەرکەوتندا دەبێ بە کۆمەڵە جێنشینێك هەموویان لە قورەیشن.

لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «لا يزال هذا الامر في قريش ما بقى منهم إثنان»[3]، واتا: خەلافەت و جێنشینی لە ناو قورەیشدا دەبێت تا دوو کەسیان بمێنن.

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: «الناس تبع لقريش في هذا الشأن مسلمهم لمسلمهم و كافرهم لكافرهم»[4]، واتا: خەڵکی شوێن قورەیش دەکەون موسوڵمانان شوێن موسوڵمانان و بێ باوەڕیشیان شوێن بێ باوەڕیان دەکەون.

لە بەکیری کوڕی وەهەبی جەزەرەی دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالکی ئەنصاری پێی وتم: قسەیەکت بۆ ئەکەم بۆ هەموو کەسی ناکەم، لەماڵێکی ئەنصاری دانیشتبووین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات و دەستی گرتبوو بەم بەراوبەری دەرگاکەوە[5] و فەرمووی: «الائمة من قريش ان لهم عليكم حقا، ولكم عليهم حقا مثل ذلك، ما ان استرحموا فرحموا وان عاهدوا أوفوا وان

[1] البخاري كتاب الاحكام (ژمارە: ٧١٣٩).
[2] مسلم كتاب الامارة (ژمارە ١٨٢).
[3] البخاري كتاب الاحكام (ژمارە: ٧١٤٠).
[4] مسلم كتاب الامارة (ژمارە: ١٨١٨).
[5] الفتح الرباني للساعاتس باب الخلافة ج٥ (٦٥/٢٣) ابن ابي شيبة (٥٤٤/٥).

حكموا عدلوا»[1]، واتا: پێشەوایان لە قورەیش دەبن، مافیان بەسەرتانەوە هەیە، هەروەك ئێوەش مافتان بەسەریانەوە هەیە تا داوای بەزەییتان لیّ دەکرێت بە بەزەیی بن و پەیمانیاندا بیبەنە سەر و فەرمانڕەواییان کرد دادپەروەر بن.

لە (الفتح الباری)دا ئیبن حەجەر فەرموودەی زۆری هێناوە لە ژێر ناوی (الامراء من قريش) و گەڕاندوونیەوە بۆ کتێبەکانی (سونەت و مەسانید و موسەنەففات)[2].

لەم بارەیەوە فەرموودە ئەوەندە زۆرە کە کتێبێك نابینیت خالّی بێت لێیی، هەر یەکە و بە شێوازێك ڕیوایەتکراوە، بەلاّم هەموویان لە یەکەوە نزیکن و بە هەموویان ئەوە دەسەلمێنن کە کاری پێشەوایەتی و جێنشینی تایبەتە بە قورەیش واتا تەنها خەلافەت و ئەگینا هەموو پۆستەکانی تر هەمووی تیایدا یەکسانن[3].

بەلاّم فەرموودەکان مەرجیان لەسەر قورەیش داناوە بەبیّ ئەو مەرجانە شوێنکەوتنی کوێرانەیە شوێنکەوتنیان، لەو مەرجانە: تا ئیسلام بەرپا کەن وەك لە فەرموودەکەی موعاویەدا، و تا بە بەزەیی و خاوەن پەیمان و دادپەروەر بن وەك لە فەرموودەکەی ئەنەسدا هاتووە، ئەوانەیان ئەم سیّ مەرجانەیان تێدا نەبێت ئەوا بەر نەفرەتی خوا و فریشتەکان هەموو خەلّکی دەکەون[4].

ئا بەم شێوەیە فەرموودەکان ئاگاداری ئەوەیان کردووە کە ئەگەر قورەیش لە فەرمانڕەواییدا کار بە قورئانی پیرۆز نەکات و جیّ بە جیّی نەکات ئیتر جێگەی مەترسین بۆ هەموو ئومەتی ئیسلام، ئاگاداری کردوونەتەوە کە گوێڕایەڵیان مەبن و پشتیان مەگرن چونکە پشتگیریان گەورەترین مەترسیە بۆ ئیسلام و ئومەتی ئیسلام بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: «ان هلاك امتي ام فساد أمتي رؤوس اغيلمة سفاء من قريش»[5]، واتا: لەناوچوونی ئومەتەکەم یان خراپ بوونیان لەوەدا دەبێت هەندیّ منداڵ و مەزمی نەفامی

[1] المنصف لابي شيبة (٥/٥٤٤).
[2] الانصار في العصر الراشدي (لا: ١١١).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[4] مصف ابن شيبة (٥/٥٤٤).
[5] البخاري كتاب الفتن (**ژمارە:** ٧٠٥٨).

قورەیش کاروبار بگرنە دەست. پرسیاریان لێ کرد ئەی ئەو کاتە چی بکەین؟ فەرمووی: «لو ان الناس اعتزلوهم»، واتا: باش وایە خەڵکەکە دوورە پەرێز بن لێیان.

لەم دەقانەوە مەسەلەی (پێشەوایان لە قورەیش دەبن) ڕوون دەبێتەوە و لەسەر ئەم بنچینە و بناغەیە پشتیوانان ڕازی بوون و بە گوێڕایەڵی قورە یش و ئەمەشیان لە سەرجەم بەیعەتەکانیاندا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دووپات دەکردەوە کە بیستن و گوێڕایەڵی و خۆگری لە کاتی خۆنەویستیدا و کێشمە کێشمە لەگەڵ خاوەنی هەقدا نەکەن مەگەر کوفر و بێ باوەڕی بە ئاشکرا بینین لە لایەن خواوە و ڕاستیەکەیان لێ ئاشکرا بێت[1].

پشتیوانان بە تەواوی لە مەسەلە (پێشەوایی لە قورەیش)ە تێگەیشتبوون، و شتێکی نەزانراو نەبوو لە لایان، فەرموودەکانی (الائمة من قريش) زۆری لە پشتیوانان گێڕراونەتەوە، ئەوانەشیان کە نەیانبیستبوو، بێدەنگ بوون کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) ڕاستیەکەی بۆ ڕوون کردنەوە، لەبەر ئەوە هیچ کام لە پشتیوانان نەگەڕایەوە تا بزانێت شتی وا هەیە یان نیە، کاری (جێنشینی) بە ڕاوێژ و پرس و ڕا و گەڕانەوە بۆ لای دەقەکانی قورئان و فەرموودە و بەڵگەی ژیری سەلمێنرا کە ئەوە مافی قورەیشە، و لە هیچ یەکێك لە پشتیوانان نەبیستراوە کە دوای بەیعەتی سەقیفە داوای خەلافەتی بۆ خۆی کردبێت. ئەوەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە پشتیوانان باوەڕیان بە ئەنجامەکانی گفت و گۆیەکەی سەقیفە کردبوو[2].

لەبەر ئەمەیە کە بۆ خۆی دەڵێت و لێی وەرناگیرێت هەر کەسێك وتی: فەرموودەی (پێشەوایان لە قورەیشن) شیعارێك بوو قورەیشیەکان هەڵیان گرت تا خەلافەتی پێ بپچڕن لە پشتیوانان بۆ خۆیان، یان ئەوە ڕاوبۆچوونی ئەبو بەکر بووە و فەرموودە نەبووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەڵکە بیرێکی سیاسی قورەیشیەکان بووە، و لەو سەردەمەدا بڵاو بووە کە ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگەی عەرەبی ئەو سەردەمە بووە.

بۆیە ئەم فەرموودانەی پێشوو بدرێنە پاڵ ئەبو بەکر (ﷺ) یان بڵێن شیاوی قورەیشیەکان بووە، شێوەیەکە لە شێوەکانی شێواندنی مێژوویی سەردەمی خەلیفە ڕاشیدیەکان

---

[1] البخاري كتاب الفتن (ژمارە: ٧٠٥٦).

[2] الانصار في العصر الراشدي (لا: ١١٦).

و سەردەمی یەکەمی ئیسلام کە لەسەر بناغەی هەوڵ و تێکۆشانی کۆچەریان و پشتیوانان و ئەوانەی دوای خۆیان هاتە کایەوە و لەسەر بنەمای برایەتی موسوڵمانەتی نێوان ئەو دوو چینە بەرێزە دروست بوو وەك ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لە بارەی پشتیوانانەوە دەڵێت: ئێمە و پشتیوانان وەك شاعیرێك دەڵێت:

ابو ان يملونا ولو ان أمّنا تلاقي الذي يلقون منا لمت[1].

---

**ئەو ئایەتە پیرۆزانەی ئاماژە بە جێنشینی - صدیق - دەکەن:**

هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆز ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) شایانترین کەسی ئومەتی ئیسلامە کە ببێتە جێنشینی سەرداری مرۆڤایەتی (ﷺ) ئەو ئایەتانەش ئەمانەن:

١- وتەی خوای گەورە: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ (الفاتحە: ٦-٧)، بەڵگەکەشی ئەوەیە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) یەکێکە لەوانەی کە خوای گەورە فەرمانی داوە کە بەندەکانی داوای لێ بکەن ڕێنموونیان بکات بۆ ڕێگای ڕاست و بیانخاتە سەر ڕێگای ئەوانەی کە بەخششی خۆی ڕژاندووە بە سەریاندا و لەوانە – صدیقەکان – لە وتەکانی خوای گەورەدا ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا ۝٦٩﴾ (النساء: ٦٩)، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی داوە بە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) کە ئەو یەکێکە لە «الصديقين» ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو یەکێکە لەوانە و بەڵکو یەکێکی زۆر گرنگە لەوانە.

---

[1] الانصار في العصر الراشدي، هەمان لاپەڕەی پێشوو.

ئەگەر ئەبو بەکر(ﷺ) یەکێك بێت لەوانەی کە لەسەر ڕێگای ڕاستن ئیتر گومان لەوەدا نامێنێت لە لای هیچ ژیرمەندێك کە شایانترین کەسی ئومەتە بە جێگەی محمد المصطفی (ﷺ)[1].

محمدی کوڕی عومەری ڕازی دەڵێت: ئایەتی: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ (الفاتحه: ٦-٧)،بەڵگەیە لەسەر پێشەوایەتی ئەبو بەکر (ﷺ) چونکە وەك ئەوە وایە بڵێت خوایە ڕێنموونی هەموومان بکە بۆ سەر ڕێگەی ئەوانەی نیعمەتی خۆتت باراندووە بەسەریاندا، ئەوانەش لە ئایەتێکی تردا ڕوونی کردۆتەوە کە کێن ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (النساء: ٦٩)، وە گومانیشی تێدا نیە کە سەرداری ڕاستگۆیان ئەبو بەکرە (ﷺ)، مانای ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە خوای گەورە ڕێنموونیمان بکە بۆ سەر ئەوز ڕێگایەی (صدیقین) کە ئەبو بەکریش یەکێك بووە لەوانە،چونکە ئەگەر پەنا بە خوا ئەبو بەکر گومڕا بووایە دروست نەبوو شوێن پێی هەڵبگیرێت، کەواتە ئایەتەکە ئیمامەت و پێشەوایەتی ئەبو بەکر دەگەیەنێت[2]..

محمد امین شنقیطي دەڵێت: لەم ئایەتە پیرۆزەوە ڕاستی و دروستی ئیمامەتی ئەبو بەکرمان بۆ دەردەکەوێت (ﷺ) چونکە یەکێکە لەوانە دەبێت لە نوێژدا هەموو ڕۆژێك داوا لە خوای گەورە بکەین بمانخاتە سەر ڕێگەی ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) و ڕوونی دەکاتەوە ڕێگای ئەوان ڕێگای ڕاستە، وەك دەفەرمووێت: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾، لە ناو ئەوانەدا کە بەخششی خوایان بەسەردا ڕژاوە – صدیقین – بەدی

---

[1] عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة، ناصر حسن الشيخ (٥٣٢/٢).
[2] التفسير الرازي (٢٦٠/١).

دەکەین کە پێویستە داوا لە خوا بکەین بمانخاتە سەر ڕێگای ئەوان کە ئەمەش گومان لەوەدا ناهێڵێت ئەبو بەکر لەسەر (صراط المستقیم) بووە و شایانی جێنشینی بووە[1].

٢- وتەی خوای گەورە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾﴾ (المائدە: ٥٤).

لەو ڕەوشتانەی لەم ئایەتەدا باسکراوە کەسانێکن خوایان خۆش دەوێت و خوایش ئەوانی خۆش دەوێت و لەگەڵ موسوڵمانانداندا نەرمن و لەگەڵ کافراندا توند و تیژ، ئەبو بەکری صدیق یەکەمین کەسە کە ڕەوشتەکانی ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە و سوپاکەشی لە هاوەڵانی بەڕێز کە دژی هەڵگەڕاوەکان جەنگان و خوا بە جوانترین و تەواوترین ڕەوشت وەسفی کردوون.

بەڵگەی ئایەتەکەش لەسەر جێنشینی صدیق لەوەدایە کە لە زانستی خودادا هەبووە کە دوای وەفاتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کۆمەڵێك لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە و خوایش پەیمانی داوە کە باوەڕدارانێکی وا دێنە کایەوە کە خوایان خۆش بوێت و خواش ئەوانی خۆش دەوێت، لەگەڵ بڕواداراندا نەرمن و لەگەڵ بێ باوەڕاندا توند و تیژ و لە پێناوی خوادا دەجەنگن و گوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نادەن.

هەر کە ئەوەی لە عیلمی خوادا بوو، پاش مردنی پێغەمبەرەکەی هاتە دی و ئەبو بەکر (ﷺ) دەستی کرد بە جەنگ دژی ئەو هەڵگەڕاوانە و لەگەڵ پاڵەوانانی هاوەڵاندا دای بە سەریاندا و گوێی بۆ لۆمەی لۆمەکاران نەدا، تا خوای گەورە هەقی سەرخست و نارەوای تێك شکاند و پەیمانەکەی بردە سەر دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو جیهان و بوو بەبەڵگەیەکیش لەسەر شایانیەتی جێنشینی ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)[2].

---

[1] أضواء البيان (٣٦/١).
[2] الاعتقاد للبيهقي (لا: ١٧٣-١٧٤).

٣- خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾ (التوبە: ٤٠).

(أبو عبدالله القرطبي) دەڵێت: هەندێ لە زانایان دەربارەی ئایەتی: ﴿ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي ٱلْغَارِ﴾، دەڵێن: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جێنشینی پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه)ە، چونکە جێگر و (ثان) هەمیشە جێگری یەکەمە و بیستوومە لە مامۆستایان (ابو عباس احمد بن عمر) دەڵێت: لەبەر ئەوەی شایانی خۆیەتی پێی بوترێت (ثاني اثنين) چونکە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکر هەمان کاری یەکەمی پێغەمبەری تووش بوویەوە کە ئەویش پاشگەزبوونەوەی هەموو عەرەب بوو، چونکە ئیسلام تەنها لە مەدینە و یەك لادێی بچووکدا مایەوە بە ناوی (جاسا) لە بەحرەین.

ئەبو بەکر سەر لە نوێ بانگی کردنەوە بۆ لای ئیسلام و جەنگا لەگەڵیاندا تا گەڕانەوە ناو بازنەی ئیسلامەتی، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردی ئا لەو لایەنەوە هەقی خۆیەتی پێی بوترێت «دووەمی دووەم کەسەکە»، «ثاني اثنين»[1].

٤- خوای گەورە دەفەرموویێت: [وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ

[1] تفسير القرطبي (٨/١٤٧-١٤٨).

﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾ (التوبه: ١٠٠).

بەڵگەی ئەم ئایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) شایانی پێشەوایەتی بووە دوای وەفاتی پێغەبەر، ئەوەیە کە کۆچکردن کارێکی قورس و گرانە لەسەر دەروونی و پێچەوانەی سروشتە و هەر کەسێك پێی هەستێت ئەوە دەبێتە پێشەنگ بۆ خەڵکانی تریش لەو گوێڕایەڵیەدا، کە ئەمەش هۆکارێکی چاك بوو بۆ بەهێزکردنی دڵی پێغەمبەر و دوورخستنەوەی مەترسیەکان لە سەری، هەروەك چۆن دەست پێشخەری لە پشتیوانی کردندا و گومانی تیا نیە ئەوانەی سەرەتا پشتیوانی و یارمەتی خۆیان پێشکەش کرد سەرکەوتن و بردیانەوە بە پلەیەکی بەرز.

ئەگەر دان بەوەدا نرا ئەوە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لە خزمەت پێغەمبەردا بووە هەموو کاتێك لەبەر ئەوە لە هەموو هاوەڵان زیاتر لە کۆچەریانە و لە هەموویشیان باشترە و ئەگەر وایش بێت دەبێت مافێکی سروشتی بێت کە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ببێتە ئیمام و دواتر ئەم ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوونە لەبەر ئەوەی کە ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) گەورەییان زیاترە و پیشەوایەتیەکەیان ڕاست و دروست و لە شوێنی خۆیدا بووە[1].

٥- خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٥٥﴾ (النور: ٥٥).

---

[1] تفسیر الرازي (١٦/١٦٨-١٦٩).

ئەم ئایەتە پڕا و پڕ بەسەر خەلافەتی ئەبو بەکری صدیقدا (ﷺ) جێ بەجێ دەبێت چونکە ئەو وەسفانەی خوای گەورە لە ئایەتەکەدا باسی دەکات لە جێنشین کردن و دەسەلات پێدان لە ئیش و کاری جێنشینی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت) بەدی دەکرێت و دەبێتە بەلگەیش لەسەر ڕاستی و دروستی مافی جێنشینیەکەیان[1].

(حافظ ابن کثیر) دەلێت: «هەندێ لە (سەلەف) وتوویانە: جێنشینی ئەبو بەکر و عومەر ڕاستە و مافێکی سروشتی خۆیانە و پاشان بەلگەی ئەم ئایەتەشیان هێناوەتەوە»[2].

٦- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾﴾ (الفتح: ١٦).

(ابو الحسن الاشعری) ڕەحمەتی خوای لەسەربێت دەلێت: ئەم ئایەتانە پێشەوایەتی ئەبو بەکر دەسەلمێنێت کە لە سورەتی بەرائەتدا هاتووە کە بە دانیشتوەکان ئەوانەی جیهادیان نەکرد دەفەرموێت: ﴿فَإِن رَّجَعَكَ اللَّهُ إِلَىٰ طَائِفَةٍ مِّنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ ﴿٨٣﴾﴾ (التوبه:٨٣).

لە سورەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ ۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا

[1] تفسیر القران العظیم لابن کثیر (٥/١٢١).
[2] هەمان سەرچاوە.

﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾﴾ (الفتح:١٥).

پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿كَذَٰلِكُمْ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبْلُ ۖ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾﴾ (الفتح: ١٥)، ولە شوێنێکی تردا دەفەرموویت: ﴿قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَٰتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا۟ يُؤْتِكُمُ ٱللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟﴾ (الفتح:١٦)، واتا ئەگەر گوێ نەدەن بە هاواری ئەوەی بانگتان دەکات بۆ جەنگتان ﴿كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾﴾ (الفتح:١٦)، ئەوەی بانگتان دەکات بۆ جیهاد و جەنگ کەسێکی ترە جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چونکە ئەو خوا پێی فەرمووە کە بڵێت هەرگیز لەگەڵم نەیەن بۆ جەنگ و دوژمنانم بۆ مەکوژن نامەوێت، کەواتە ئەو کەسەی بانگیان دەکات بۆ جیهاد جێنشینی دوای پێغەمبەرە (ﷺ)[1]، (اولی بأس شدید) فارس و ڕۆمەکانە وەك حسن البصری دەڵێت: و عەتایش دەڵێت: فارسەکانە، هەندێ تر دەڵێن بنو حەنیفەیە لە یەمامە کە موسەیلەمە لەوانە[2].

٧- خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾ (الحشر: ٨).

[1] الابانة عن اصول الريانة(لا: ٦٧)، مقالات الاسلاميين (١٤٤/٢).
[2] الابانة عن اصول الديانة(لا: ٦٧).

بەڵگەی ئەو ئایەتە لەسەر خەلافەتی ئەبو بەکر (ﷺ) ئەوەیە خوای گەورە ناوی لێ ناون (الصادقون) ئەو کەسەی خواوەند ناوی لێ بنێت (الصدیق) هەرگیز درۆی لێ ناوەشێتەوە و درۆ ناکات بە ڕەوشتی خۆی لە هیچ حالەتێکدا.

ئەو کەسانەی کە خوای گەورە بە ڕەوشتی (صدیق) ناویان دەبات بە کۆی دەنگ ئەبو بەکریان ناو نا (جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ)) و ئا لەم ڕوانگەیەوە ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەر شایانی یەتی خەلافەت بۆ ئەبو بەکری صدیق (ﷺ)[1].

**٧- ئەو فەرموودانەی ئاماژە بۆ خەلافەتی ئەبو بەکر دەکەن:**

ئەو فەرموودانەی کە باس لە خەلافەتی ئەبو بەکر دەکەن زۆرن و مەشهوورن و موتەواتەرن و بە ئاشکرایش ئەو مانایە دەگەیەنن ئیتر یان ڕاستەوخۆ یان بە ئاماژەی ئەوە دەگەیەنن، لەبەر مەشهوور بوونی و دەما و دەم پێ کردنی – تواتر – وای لێهاتووە لە ئیسلامدا ئەبێت هەموان بیزانین و ئەهلی بیدعەچیان ناتوانن ملە جەڕێی تێدا بکەن[2]، لەو فەرموودانە:

أ- لە (جوبەیری کوڕی موتعم)ەوە (ﷺ) دەڵێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش پێی فەرموو – سەرم لێ بدەرەوە – ئافرەتەکە وتی: ئەی ئەگەر هاتمەوە و تۆم نەبینیەوە چی بکەم؟ فەرمووی: «ان لم تجدني فأتِ أبا بكر»، ئەگەر منت نەدۆزیەوە وەرە بۆ لای ئەبو بەکر!!

(ابن حجر) دەڵێت: لەو فەرموودەیەدا دەڵێ بەڵێن و پەیمانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر خەلیفەکەی دوای خۆیەتی، کە ئەمەش بەرپەرچدانەوەی شیعەی تێدایە کە دەڵێن گوایە پێغەمبەر وەصیەتی کردووە بۆ عەلی و عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێت)[3].

ب- لە حوزەیفەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە دەڵێت: لە لای پێغەمبەر دانیشتبووین فەرمووی: «اني لا ادري قدر بقائي فيكم فاقتدوا بالذين من بعدي – اشارة الى ابو بكر و

---

[1] عقيدة اهل السنة والجماعة (٥٣٨/٢) ناصر حسن الشيخ.
[2] مسلم (١٨٥٦/٤-١٨٥٧).
[3] فتح الباري (٢٤/٧).

عمر – وتمسكوا بعهد عمار وما حدثكم إبن مسعود فصدقوه»[1]، واتا: من نازانم چەندێکی تر لە ناوتاندا دەمێنمەوە شوێنی پێی ئەو دوو کەسە هەڵبگرن دوای خۆم – ئاماژەی بۆ ئەبو بەکر و عومەر کرد – و پەیمانی عەمار بەرنەسەر و ابن مسعودیش هەرچی بۆ گێڕانەوە باوەڕی پێ بکەن.

لە فەرموودەکەدا مەبەست لە (ئەو دوانە) ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) کە دوای خۆم جێنشینم دەبن و هانی خەڵکی دا تا شوێنیان بکەون لەبەر ڕەوشتی بەرزیان و پاکی نهێنیان و لە فەرموودەکەشدا بە ناڕاستەوخۆ ئاماژەی تێدایە بۆ جێنشینی[2].

ج- ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «بينا انا نائم أريت اني أنزع على حوضي أسقى الناس، فجائني ابو بكر فاخذ الدلو من يدي ليروحني، فنزع دلوين وفي نزعه ضعف والله يغفر له، فجاء ابن الخطاب فأخذ منه فلم أر نزع رجل قط أقوى منه، حتى لولى الناس والحوض ملآن يتفجر»[3].

واتا: لە خەومدا بینیم وا لەسەر حەوزەکەمم و ئاوی لێ هەڵدەگۆزم دەیبەخشم بە خەڵکی، ئەبو بەکر دۆڵچەکەی لێ گرتم تا ئەو هەڵی گۆزێت و من بحەوێمەوە، دوو دۆڵچەی دەرهێنا بەڵام کەمی و لاوازی پێوە دیاربوو – خوا لێی خۆش بێت – پاشان عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) هات و دۆڵچەکەی لەو وەرگرت و نەمدیوە لە ئاو هەڵگۆزیندا وێنەی ئەو لە بەهێزیدا، تا خەڵکەکە ڕۆشتن و حەوزەکە هەر پڕ بوو خەریك بوو ئەتەقی.

ئیمامی شافعی – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – ئەڵێت: خەوی پێغەمبەران نیگا و وەحی یە، مەبەست لە (کەمی لاوازی پێوە دیاربوو) واتە کەم فەرمانڕەوایی دەکات و زوو دەمرێت و خەریك بوونی بە جەنگ و کوشتاری هەڵگەڕاوەکانەوە لە جەنگە ڕزگاریخوازیەکان دوای خست کە لە سەردەمی دوور و درێژی عومەردا بە ئەنجام گەیەنران[4].

---

[1] سلسلة الاحاديث الصحيحة للالباني (٣/٢٣٣-٢٣٦).
[2] تحفة الاحوذي بشرح الترمذي (١٠/١٤٧).
[3] مسلم (٤/١٨٦١-١٨٦٢).
[4] الاعتقاد للبيهقي (لا: ١٧١).

د- عائیشه – خوای لێ ڕازی بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) له کاتی نەخۆشیەکەیدا پێی وتم: «أدعي لي ابا بكر أباك، وأخاك حتى اكتب كتابا فاني اخاف ان يتمنى متمن ويقول: انا أولى ويأبى الله والمؤمنون الا أبا بكر»[1].

واتا: دایکی ئیمانداران عائیشه دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) له کاتی نەخۆشیەکەیدا پێی وتم: «ئەبو بەکری باوکت و براکەتم بۆ بانگ بکە با وەسیەت نامەیەکیان بۆ بنووسم بۆ دوای خۆم چونکە من ئەترسم کەسێك ئاوات بخوازێت – ببێتە جێنشین – یان کەسێك بڵێ: من شایانترم پێی و موسوڵمانان و خوای گەورەیش بە ئەبو بەکر نەبێت ڕازی نابن».

ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر چاکی صدیق (رضي الله عنه)، بە شێوەیەك هەواڵی دا چی ڕوو دەدات پاش خۆی، و موسوڵمانان پەیمانی خەلافەت بە ئەبو بەکر نەبێت بە کەسی تر نادەن و لە فەرموودەکەدا ئاماژەی ئەوەشی تێدایە کە دووبەرەکی دروست دەبێت، و کت و مت هەر وایش بوو لە سەقیفە دەمەقاڵە دروست بوو پاشان لەسەر ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێکهاتن[2].

هـ- عوبەیدولای کوڕی عەبدولا دەڵێت: چووم بۆ سەردانی عائیشە و پێم وت: باسی نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) بۆ ناکەیت؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) حاڵی زۆر خراپ بوو، فەرمووی: «خەڵکەکە نوێژیان کرد؟»، وتمان: نەء، ئەوان هەموو چاوەڕوانی تۆ دەکەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی: «ضعوا لي ماءً في المخضب»واتا: لە تەشتێکدا ئاوم بۆ بێنن، ئێمەش بۆمان هێنا و دەست نوێژی گرت و ویستی هەڵسێتە سەر پێ کەوت و لە هۆش خۆی چوو، پاش ماوەیەك بە هۆش هاتەوە فەرمووی: خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتمان: نەء، ئەوان چاوەڕوانی تۆ دەکەن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، دیسان فەرمووی تەشتێك ئاوم بۆ بێنن و بۆمان هێنا و دیسان دەستنوێژی گرتەوە و ویستی هەستێتە سەر پێ نەیتوانی و لە هۆش خۆی چوویەوە، پاشان بە هۆشی خۆی هاتەوە و پرسی: خەڵکەکە نوێژیان کرد؟ وتمان: نەء، هێشتا هەر چاوەڕوانی ئێوەن، عائیشە دەڵێت: خەڵکی لە مزگەوتەکە مابوونەوە تا عیشایەکی درەنگ

[1] مسلم (١٨٥٧/٤).
[2] عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة (٥٤٢/٢).

هەر چاوەڕوانی نوێژی بە کۆمەڵیان دەکرد، و پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بە دوای ئەبو بەکردا تا بەرنوێژی خەڵکەکە بکات، کاتێك پێیان وت پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردووی بەرنوێژی خەڵکەکە بکەیت، ئەبو بەکر کەسێکی دڵ ناسك و بە گریان بوو لە نوێژدا بۆیە بە عومەری وت: تۆ نوێژیان بۆ بکە، ئەویش پێی وت: تۆ شایانتریت بەو کارە و ئا بەو جۆرە ئەبو بەکر چەند ڕۆژێك بەرنوێژی موسوڵمانانی دەکرد.

پاش ماوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) هەستی کرد کەمێك باش بووەتەوە، چووە ژێر باڵی دوو پیاو کە یەکێکیان عەباس بوو، هات بۆ مزگەوت بۆ نوێژی نیوەڕۆ، لەو کاتەدا ئەبو بەکر بەرنوێژی دەکرد، کاتێك پێغەمبەری بینی (ﷺ) چووە دواوە، پێغەمبەری خوا ئاماژەی بۆ کرد لە جێی خۆی بمێنێت و نەیەتە دواە و بەو دوانەی وت: لە تەنیشتی ئەبو بەکر دامنیشێنن، و ئەوانیش و ئەبو بەکر بە نوێژی پێغەمبەر نوێژی دەکرد و موسوڵمانانیش بە نوێژی ئەبو بەکر نوێژەکەیان دەکرد، وە پێغەمبەر بە دانیشتنەوە بوو.

عوبەیدوڵلا: دەڵێت: چووم بۆ لای عبدالله ی کوری عەباس — (ﷺ) -پێم ووت: با لە لاتدا بیگێرمەوە ئەوەی عائیشە بۆی باس کردم سەبارەت بە نەخۆشی یەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش ووتی: فەرموو باسی بکە، منیش بۆم گێرایەوە و ملە جەرێی لە هیچی نەکرد بەڵکو هەر ئەوەندە ووتی: ناوی پیاوەکەی تری هێنا کە چووبووە ژێر باڵی پێغەمبەر (ﷺ) ووتم: نەء، ووتی: ئەوە (علی) بوو[1].

ئەم فەرموودەیە کۆمەڵێ سوودی گەورەی لە خۆ گرتوە لەوانە: گەورەیی و پیاوچاکی ئەبوبەکر و سەنگینی ئەو بەسەر هەموو هاوەڵاندا (خوایان لێ ڕازی بێت)، ئاماژەیشە بۆ ئەوەی ئەو شایانی خەلافەتە دوای خۆی، و ئەوەشی تێدایە کە ئیمام بۆی هەیە کەسێکی تر لەباتی خۆی دابنێ بۆ بەرنوێژی ئەگەر خۆی بیانوویەکی بۆ دروست ببێ، و تیایشیدا گەورەیی عمر ئاشکرا دەبێت پاش ئەبوبەکر چونکە ئەبوبەکر جگە لەو بە کەسی تری نەگوت[2].

---

[1] مسلم **ژمارە** ٤١٨، البخاري **ژمارە** ٦٨٧.

[2] شرح النووي (١٣٧/٤).

و- عبداللەی کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: «کاتێ پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کرد، پشتیوانان وتیان: ئەمیرێ لەئێمەو ئەمیرێ لە ئێوە، عمری کوری خەتاب(ﷺ) پێ ی وتن: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئایا نازانن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبوبەکری کردە پێش نوێژ لە جیاتی خۆی؟ کامتان حەز دەکەن پێشی ئەبوبەکر بکەون؟ پشتیوانان هەموو وتیان: پەنا بە خوا لەوەی پێشی ئەبوبەکر بکەوین»[1].

ز- (ابن سعد) بە سەنەدی خۆی لە حەسەنەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: عەلی(ﷺ) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) گیانی سپارد، ئێمە سەیرمان کرد بزانین کێ بکەینە پێشەوامان، دەبینین پێغەمبەری خوا ئەبو بەکری لە نوێژدا کردە پێشەوامان، و ئێمەش ڕازی بووین کەسێك بکەین بە پێشەوای دینیمان کە پێغەمبەری خوا ڕازی بووە بیکات بە پێشەوای دینیمان، وە بۆیە ئەبو بەکرمان پێش خست[2].

(ابنو الحسن الاشعری) لەسەر مەسەلەی پێش خستنی پێغەمبەری خوا بۆ ئەبو بەکر لە نوێژدا وتوویەتی: «ئەوەی کە کردوویەتی بە بەرنوێژ لە ژیانی خۆیدا لە باتی خۆیدا ئەوە شتێکە هەموو موسوڵمانێك لە ئیسلامدا ئەوە دەزانێت، دەڵێت: ئەم پێش خستنەشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە هەموو هاوەڵان زیاتر خوێندەوار بووە، چونکە لە فەرموودەی صەحیح و دروستدا لە ناو هەموو زانایاندا هەیە، ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: «یؤم قوم اقرأكم لكتاب الله، فان كانوا في القراءة سواء فاعلمهم بالسنة، فان كانوا في السنة سواء، فاكبرهم سنّا، فان كانوا في السنّ سواء فاقدمهم اسلاماً»».

واتا: با کەسانێك بەرنوێژیتان بکەن شارەزاترینتان بن لە قورئان خوێندندا و ئەگەر لەوەشدا وەك یەك بوون با زاناترینیان بە قورئان و فەرموودە، ئەگەر لەوەشدا یەکسان بوون، با بە تەمەنترینیان ئەگەر لە تەمەنیشدا وەك یەك بوون ئەو کەسەیان زووتر هاتۆتە ناو ئیسلامەوە.

[1] المستدرك (٦٧/٣).
[2] الطبقات لابن سعد (١٨٣/٣).

(ابن كثير) دەڵێت: ئەمە قسەی ئەشعەری یە کە پێویستە بە ئاوی ئاڵتوون بنووسرێتەوە و ئەم مەرج و وەسفانەی پێشوو هەموویان لە ئەبو بەکردا (ﷺ) هاتبووە دی خوای گەورە لێی ڕازی بێت و ڕازیشی بکات[1].

ئەو ئەهلی سونەش لەسەر ئیمامی ئەبو بەکر دوو ڕایان هەیە کە لەسەر ئەوەی ئایا دەقەکان ڕاستەوخۆ ئەوە دەسەلمێنن یان ناڕاستەوخۆ و لە ڕێگای ئاماژە و تێگەیشتن لە دەقە پیرۆزەکان.

**ڕای یەکەم:** دەڵێن لە ناو دەقەکاندا ناڕاستەوخۆ ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت و ئەم ڕایەش دەڵێن ڕای حەسەنی بەسریە و دەستەیەك لە زانایانی فەرموودەیە[2]. لە ئیمام احمدی کوڕی حەنبەلیشەوە دەگێڕنەوە و بەڵگەکانیشیان ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە نوێژدا پێشی خستووە و تەنها دەرگایەکەی ئەبو بەکری هێشتەوە لەسەر مزگەوت.

**ڕای دووەمیش دەڵێن:** خەلافەتی ئەبو بەکر (ﷺ) بە دەقی ڕوون و ئاشکرا باسی لێوە کراوە و ئەمەش وتەی کۆمەڵێکی تر لە ئەهلی فەرموودە[3] و محمدی کوڕی حزم (الظاهري)یش وا دەڵێت و ئەم تاقمە بەڵگەی ئەو فەرموودەیە دەهێننەوە کە بە پێغەمبەری خوای وت: ئەگەر هاتمەوە و تۆم نەدیەوە چی بکەم، پێی فەرموو: «ئەگەر منت نەدیەوە خۆت بگەیەنە لای ئەبو بەکر»[4] و بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) ئەبو بەکری باوکت و براکەشتم بۆ بانگ بکە تا شتێکیان بۆ بنووسم چونکە ترسی ئەوەم هەیە ئاواتەخوازێك ئاوات بخوازێت و کەسێك بڵێت: من شایانترم، خوای گەورە و موسوڵمانانیش بە ئەبو بەکر نەبێت بە کەس ڕازی نابن[5].

[1] البداية والنهاية (٥/٢٦٥).
[2] منهاج اهل السنة لابن تيمية (١/١٣٤-١٣٥).
[3] عقيدة اهل السنة والجماعة في الصحابة (٢/٥٤٧).
[4] مسلم (٤/١٨٥٦-١٨٥٧).
[5] مسلم (٤/١٨٥٧)، **فەرموودەی ژمارە** ٢٣٨٧.

هەروەها بە فەرموودەی خەونەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە خەویدا لەسەر حەوزەکە بوو ئاوی هەڵدەگۆست و دەدیدا بە خەڵکی، وە ئەبو بەکر هات و دۆڵچەکەی لە دەست گرت بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ماندوو نەبێت و خۆی ئاوی دەرهێنا بۆ خەڵکەکە[1].

ئەوە کە من بۆی دەچم لە لێکۆڵینەوەکەمدا پێی گەیشتووم ئەوەیە: کە پێغەمبەری خوا فەرمانی نەداوە کە دوای خۆی ئەبو بەکر بکەن بە جێنشینی، بەڵکو شتێکی لە ئەوەوە بۆ روون کردوونەتەوە کە خوای گەورە پێی وتووە کە موسوڵمانان لە پاشەڕۆژدا هەڵی دەبژێرن و دەیکەن بە گەورەی خۆیان ئەوەش لەبەر کۆمەڵی پیاوچاکی و لێهاتوویی یە بەرزانەی کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە و تیایدا بەسەر هەموو ئومەتی محمد بەرز و بڵندی کردۆتەوە — خوای گەورە لێی ڕازی بێت و ڕازیشی بکات[2].

(ابن تيميه) ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت، دەڵێت: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێی خۆش کردووە بۆ موسوڵمانان کە ئەبو بەکر هەڵبژێرن دوای خۆی و ڕینموونی کردوون لە زۆر شتدا چ بە کردەوە چ بە وتەکانی و هەواڵی داوە کە دەبێتە جێنشینی و پێی خۆش بووە و پێی ڕازی بووە، و نیازی کرد کە شتێك بنووسێت بۆ موسوڵمانان کە پاش خۆی ئەبو بەکر بکەن بە سەرداری خۆیان بەڵام بە نووسین نەینووسی و هەر بە دەربڕینی ئەو نیازە وازی هێناوە، ئەگەر بیزانیایە کە ئومەت تێناگات و حاڵی نەبووە کێ بکرێت بە خەلیفە ئەوە ڕوونی دەکردەوە و دیاریشی دەکرد، بەڵام چەندان بەڵگە و نیشانەی بۆ دیاری کردوون کە بزانن مەبەستی ئەوەیە ئەبو بەکر هەڵبژێرن و ئامانجەکەشی هاتە دی.

لەبەر ئەو هۆیەش بوو عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) لە وتارەکەیدا لە بەردەمی سەرجەم کۆچەریان و پشتیوانانندا وتی: کەستان لە ناودا نیە وەك ئەبو بەکر خەڵکی لا بکەنەوە بۆ لای و .... تا وتی: جێنشینی ئەبو بەکر دەقەکانی قورئان و فەرموودە سەلماندوویانە و ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەری لەسەرە بۆ ئەو کارەی موسوڵمانان هەڵیان بژارد لەبەر ئەو هەموو

---

[1] مسلم (١٨٦١/٤-١٨٦٢).
[2] مسلم (١٨٦١/٤-١٨٦٢).

دەقانەی باسی پیاوچاکی و پتەوی باوەڕی دەکات کە چ بە دەقەکان و چ بە کۆی دەنگ (إجمـاع) سەلمێنراوە.

دەقەکان بەڵگەن کە خوا و پێغەمبەری خوا بەو هەڵبژاردنە ڕازین و بە هەقی دەزانن و خوای گەورە فەرمانی پێداوە و هەواڵیشی داوە کە موسوڵمانان هەڵی دەبژێرن و ئەمـەش زۆر لەوە بەهێزترە کە بە دەقێك دیاری بکردایە، چونکە ئەو کاتە تەنها بەو دەقـە موسـوڵمانان بـە شایستەیان دەزانی.

هەربەوەی موسوڵمانان بەبێ بوونی نووسینی پەیمانێك، خۆیان هەڵیان بژارد و چەندان دەقیش هەیە کە وەسفی ئەو هەڵبژاردنەیان دەکات و بە چاکی لە قەڵەم دەدات، وە ڕەزامەنـدی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) لە سەری گەورەترین بەڵگەیە کە موسوڵمانان لەبەر خاتری ئەو هـەمووە چاکی زۆرەی صدیق بووە کە هەڵیان بژاردووە و لە هیچ کەسێکی تردا نەبووە و ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مافێکی سروشتی خۆی بووە، بۆیە هیچ پێویـست بـەوە نـەکردووە کـە دەقێکـی ئایەت یان فەرمووده ڕاستەوخۆ دیاری بکردایە[1].

٨- بوونی (هاودەنگ) لەسەر خەلافەتی ئەبو بەکر (رضي الله عنه):

ئەهلی سونە و جەماعەت بە گشتی لەسەر ئەوەن کە شـایانترین کـەس بـە جێگـری پێغەمبەری خوا دوای مردنی ئەبو بەکری صدیقە (رضي الله عنه)، ئەمەش لەبەر پیاوچاکی و پێشینەیی و پێشخستنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆیی لە بەرنوێژیدا لە ناو هەموو هاوەڵاندا، و هـاوەڵانیش چاك تێگەیشتن مەبەستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەی کە لە ناو هەموویاندا ئەوی هەڵبژارد بـۆ بەرنوێژی ئەوانیش بۆ خەلافەت هەڵیان بژارد و شوێنی کەوتن.

یەك کەس لە هاوەڵان نـاڕەزا نـەبوو، وە خـوای گـەورەش ئومـەتی ئیـسلام لەسـەر گومڕایی هەرگیز کۆ ناکاتەوە، بە خۆشی خۆیان بەیعەتیان پێدا و لە هەموو دڵیانەوە گوێڕایەڵی بوون و کەسیش خۆی لەو بە پێشتر نەزانی[2].

---

[1] منهاج السنة (١/١٣٩-١٤٠)، مجموع الفتاوى (٣٥/٤٧-٤٩).

[2] عقيدة اهل السنة في الصحابة (٢/٥٥٠).

پرسیاریان لە سەعیدی کوڕی زەید کرد کەی ئەبو بەکر هەڵبژێردرا بە خەلیفە؟ وتی: ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد و هاوەڵان پێیان خۆش نەبوو بۆ چەند کاتێکیش بێ کۆمەڵ و بێ سەرکردە نەبن[1].

هەندێ لە زانایان و هەڵگرانی مەشخەڵی زانست لە پیاوانی بڕوا پێکراو بوونی (هاودەنگی هاوەڵان) — اجماع الصحابە — باس دەکەن و کەسانی دوای ئەوانیش لە ئەهلی سونە و جەماعەت لەسەر ئەوە هاودەنگن کە ئەبو بەکر لە هەموو ئومەتی ئیسلام شایانتربووە بۆ خەلافەت[2].

**ئەمەش هەندێکە لە وتەی ئەو زانایانە:**

أ- خەتیبی بەغدادی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت، دەڵێت: کۆچەریان و پشتیوانان سەرجەم بە خەلافەتی ئەبو بەکر ڕازی بوون و پێیان وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کەسیش دوای ئەو پێی نەوتراوە خەلیفە، دەڵێن کاتێك پێغەمبەری خوا لە دونیا دەرچوو سێ هەزار کەسی بەجێهێشت کە هەموویان بە ئەبو بەکریان دەوت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لێی ڕازی بوون (رضي الله عنه)[3].

ب- (ابو الحسن الاشعری) دەڵێت: خوای گەورە وەسف و سەنای کۆچەریان و پشتیوانانی کردووە و لە زۆر جێگای قورئاندا ناویانی بە چاکە هێناوە و سەنا خوانی ئەو کەسانەیە کە لە پەیمانی (رضوان)دا بەشداریان کردووە، وەك دەفەرموویت: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ (الفتح: ١٨)، واتا: خوا لەسەر هەموو ئەو کەسانە ڕازی بوو کە لە ژێر درەختەکەدا دەستیان خستە ناو دەستت پەیمانیان پێدایت.

---

[1] اباطیل یجب ان تمنی من التأریخ – ابراهیم شعوط (لا: ١٠١).
[2] عقیدة اهل السنة والجماعة في الصحابة (٢/٥٥٠).
[3] تأریخ بغداد (١٠/١٣٠-١٣١).

دەی هەموو ئەو کەسانە - کە خوا ئاوا بە چاکە و سەناخوانی باسیان دەکات — هاودەنگ بوون لەسەر ئیمامەتی ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) و ناویان نا خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بەیعەتیان پێدا و گوێڕایەڵی بوون و دانیان بە شایستەییەکەیدا نا کە لە هەموویان چاکترە لەو لایەنانەوە کە دەبێت لە ئیمامدا هەبێت وەك زانایی و دونیا نەویستی و ڕا و بۆچوونی بەهێز بێت و ڕامیاری ئومەت بێت... هتد[1]...

ج- (عبدالملك الجوينى) دەڵێت: «پێشەوایەتی ئەبوبەکر بە کۆی دەنگی هەموو هاوەڵان بوو، ئەوەی کە لە هەندێ — ڕافزیەکانی شیعە — هەڵدەوەرن و دەڵێن: علی (ﷺ) بە توندی نەیاری ئاشکرا کردووە - بەیعەتی نەداوە - درۆی ئاشکرایە، بەڵێ عەلی (ﷺ) لەو کاتەدا لە سەقیفە نەبوو لە تاو خەفەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەری خۆی هەڵگرتبوو، بەڵام پاشان لە ڕاپرسی و بەیعەت دانە جەماوەریەکەدا بەشداری کرد و پەیمانی دا بە ئەبو بەکر بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە»[2].

د- (ابو بكر الباقلانى) دەربارەی ئەوەی کە هاوەڵان هەر هەموویان بە کۆدەنگی بە خەلافەتی ئەبو بەکر ڕازی بوون (ﷺ) و (ئەبو بەکر گوێڕایەڵی و پێشەوایەتی و مل شوری فەرمانەکانی یان دەربڕی، تەنانەت (امير المؤمنين) علی کوڕی ابو تالیب (ﷺ) وەڵامی ئەبو بەکری دایەوە کە لە پەیمانە ئاشکراکەدا وتی: من لابەرن لە خەلیفایەتی چونکە من باشترین کەستان نیم، وتی: نەخێر هەرگیز لات نابەین و ناشبێت لابچیت، پێغەمبەری خوا لە ئیش و کاری ئایندا پێشی خستی دەی ئایا ئێمە بۆ ئیش و کاری دونیایی ڕازی نەبین پێت، مەبەستی لەوە بوو کاتی خۆی پێغەمبەری (ﷺ) لە جێی خۆی کردی بە بەرنوێژی موسوڵمانان و خۆیشی ئامادەبوو، وە لە کاری حەجیشدا سەرگەورەیی پێ سپاردیت بە سەرمانەوە، ئەبو بەکر چاکترین کەسی ئیسلام بوو و باوەڕیشی لە هەموویان قورس و پتەوتر بووە، و لەوان تێگەیشتووتر و زاناتر بووە[3].

٦- پلە و پایەی خەلیفە و خەلیفایەتی:

---

[1] الابانة في اصول الديانة (لا: ٦٦).
[2] كتاب الارشاد (لا: ٣٦١).
[3] الانصف فيما يجب اعتقاده، ولا يجوز الجهل به(لا: ٦٥).

جێنشینی ئیسلامی ڕێبازێکه ئومەتی ئیسلامی بۆ خۆی هەڵیبژاردووه، هەموو لەسەر ئەو ڕێگایە کۆبوونەتەوه وەك شێوازێکی حوکمڕانی بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان و بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی، یاسای جێنشینی لەو کاتەدا هاتە کایەوه کە پێویستی کرد بە یاسایەکی ئا لەم چەشنە هەستن قەناعەتیان بە چاکیەکەی کرد، پاشانیش بۆیە موسوڵمانان پەلەیان کرد لە دانانی جێنشین بۆ پێغەمبەرەکەیان (ﷺ).

(امام ابو حسن الماردی) دەڵێت: گەورەیی خوا لەوه دابوو کە پیاوێکی وای هەڵخست شوێنی پێغەمبەرەکەی بگرێتەوه و گەلی موسڵمانیش لەسەری پێك بێن، و کاروباری سیاسی درایە دەست تا ئیشەکان بەجوانی بەڕێوه بەرێت لە ژێر ڕۆشنایی ئاینێکی ڕەوا، خەڵکیش لەسەر ڕایەکی وەرگیراو کۆکاتەوه، تاوای لێ هات جێنشینی بوو بە بنەمایەکی سەرەکی و کاروباری ولاتی لەسەر دامەزرا و بەرژەوەندی گشتی لەسەر ڕێکخراو کاروبارەکانی گشتی لەسەر بەر قەرار بوو، و لەویشەوه دیاری کردنی فەرمانڕەوای یە تایبەتیەکان هاتە کایەوه[1].

ئومەتی ئیسلامی دەبویە ڕووبەڕووی ناڕەحەتی و تالاوی زۆر ببوایە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا بۆ خوری پەروەردگار و دەبوایە زۆر بە ژیرانە و خێرا کارەکانی یەکلایی بکردایەتەوه و بواری نەدایە کە دووبەرەکی و لەت بوون کە گومانی خراپی دەبردە دڵی کەسەکانەوه یان لاوازکردن و داڕمان ڕوو لە ئەو ولاتە بکات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بونیادی نا[2].

بەوەی کە خەلافەت یاسای حوکمڕانی موسوڵمانان بووه و ئەویش لە دەستووری موسوڵمانانەوه سەرچەشمەی گرتووه و ئەویش لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوه هەڵقولاوە[3].

زانایانی ئیسلام دەربارەی بنەماکانی خەلافەتی ئیسلامی وتوویانە ڕاوێژ و بەیعەتدان کە دوو بنچینەن و لە قورئاندا ئاماژەیان بۆ کراوه[4]، وشەی (خلافه) هەندێ جار بە مانای (ئیمارە) یان (ئیمامە) دێت و هەموو موسوڵمانان لەسەر ئەوەن کە بوونی خەلیفە واجب و

---

[1] الاحكام السلطانية (لا:٣).

[2] عصر الخلفاء الراشدون، د. فتحية النيراوي (لا:٢٢).

[3] عصر الخلفاء الراشدون (لا: ٢٣).

[4] **هەمان سەرچاوە.**

پێویستە، و دیاریکردنی خەلیفە فەرزە لەسەر موسوڵمانان کە بتوانێت چاودێری کاروبارەکانی میللەت بکات و حدود و یاساکانی شەرع بەرپا بکات و کۆشش بکات لە پێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازدا و پاراستنی ئایین و گەل و جیهاد، و هەستێت بە جێ بەجێ کردنی شەریعەت و پاراستنی مافی تاکەکان و نەهێشتنی ستەم و هێنانەدی پێداویستیەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە، ئەمەش بە ئایەتی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و هاودەنگی زانایان — إجماع-.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ﴾ (النساء:٥٩)، واتا: ئەی باوەڕداران گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەر و کاربەدەستەکانتان بکەن.

لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾ (ص:٢٦)، واتا: ئەی داوود ئێمە تۆمان کردووە بە جێنشین لەسەر زەویدا تا بە ڕاستی حوکم بکەیت لە ناو خەڵکیدا و شوێن ئارەزووەکان نەکەویت چۆن ئەوانەی شوێن هەوا و ئارەزووەکانیان دەکەون ڕێگای خوا گوم دەکەن و ئەوانەشی ڕێگای خوایان وون کردووە سزای سەختیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی قیامەتیان فەرامۆش کردووە.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: «من خلع يدا في طاعة لقى الله يوم القيامة لا حجة له، ومن مات وليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية»[1].

---

[1] مسلم (١٤٧٨/٣) ژمارە: ١٨٥١.

واتا: ئەوەی خۆی لە گوێڕایەڵی ئەمیر مەرەخەس بکات، ڕۆژی دوایی لە لای خوای گەورە بەڵگەی ڕزگاری پێ نیە، و ئەو کەسەی بمرێت و بەبێ بەیعەتدان بە خەلیفەی موسوڵمانان ئەوە بە نەفامی مردووە.

بەڵام بۆ مەسەلەی (هاودەنگی) لەسەر پێویستی بوونی خەلیفە، ئەوە بوو کە هاوەڵان نەیانهێشت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بنێژرێت هەتا کۆبوونەوە لەسەر دیاریکردنی ئیمام یان خەلیفە، و ئەبو بەکر (رضي الله عنه) هۆی قبوولکردنی خەلیفایەتی دەگێڕێتەوە بۆ ترسان لە هەڵگیرسانی ئاشوب ئەگەر موسوڵمانان پێشەوایەك بۆ خۆیان دیاری نەکەن[1].

شەهرستانی لەسەر ئەوە دەڵێت: «نە بە دڵی ئەبو بەکردا و نە بە دڵی هیچ کەسێکدا هاتووە کە قەید ناکات سەر زەوی بێ پێشەوا بێت»، بەمەدا دەردەکەوێت کە هاوەڵان کە جیلی یەکەمی ئەم ئیسلامەن لەسەر ئەوە کۆك بوون کە دەبێت ئیمام هەبێت، ئەوەش کە بەو کۆ دەنگیەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بوونی خەلیفە و ئیمام واجب و پێویستە[2].

ئەوەشی کە داخ لە دڵانی ئیسم ڕەواجی پێ دەدن و بڵاوی دەکەنەوە کە گوایە خەڵکی لە پێناو بە دەستهێنانی پلە و پایە و دەسەڵات ناشتنی پێغەمبەریان لە بیر چوویەوە[3].

ئەمەو (ئیبن خلدون) یش پێناسەی (خلافە) دەکات و دەڵێت: هەڵگرتنی هەموو شتێکە و لە ژێر ڕۆشنایی تێڕوانینەکانی شەرعدایە لە پاراستنی بەرژەوەندیەکانی دونیا و ئاخیرەتە، چونکە هەموو شتێکی دونیا لە لای خوا پەیوەندە بە بەرژەوەندی قیامەتەوە، لە ڕاستیدا جێنشینی خاوەنی شەرع کە خوا و پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) لە پێناو پاراستنی ئایینی ئیسلام و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دونیا پێی[4].

(ابو الحسن الندوی) دەربارەی مەرج و پێداویستیەکانی خەلافەت قسە دەکات و بە کۆمەڵێك بەڵگە لە ناو ژیاننامەی ئەبو بەکردا (رضي الله عنه) دەردەهێنێت کە هەموو مەرجەکانی

---

[1] الخلافة والخلفاء الراشدون (لا: ٥٩).
[2] الملل والغل للشهرستاني (٨٣/٧) نظام الحكم محمود الخالدي (لا: ٢٣٧-٢٤٠).
[3] الخلافة والخلفاء الراشدون (لا:٤٩).
[4] المقدمة (لا: ١٩١).

خەلافەتی تێدا هاتبووە دی، ئێمەش بە کورتی لەسەر ئەو مەرجانە دەدوێین بە بێ باسی نموونەی ژیانی چونکە لە ناو دوو توێی ئەم کتێبەدا هەمووی باسکراوە، گرنگترینی ئەو مەرجانە:

أ- بەوە جیادەکرێتەوە کە بە درێژایی ژیانی جێگای متمانەی پێغەمبەری خوا بووە و شاهێدیشی بۆ داوە، وەك لە ژیانیدا کردوویەتی بە جێنشینی خۆی لە هەندێ پایەی سەرەکی ئیسلامدا وەك نوێژ و حەج، و لە کارە گرنگەکاندا و هاوڕێیەتی کردنی لە بۆنە و جێگا پڕ مەترسیەکاندا کە کەس بە هاوڕێ ناگیرێت لەو حاڵەتانەدا مەگەر کەسێکی زۆر جێگەی متمانە و بتوانرێت بە تەواوەتی پشتی پێ ببەسترێت.

ب- ئەبو بەکر بەوە لە هاوڕێیەتی جیادەکرێتەوە کە خۆگر و دڵقایم بووە لەبەر دەم ڕەهێڵە و گەردەلولێکدا کە خەریك بوو ئایین لە بناغە بێنێت و لە ڕیشە دەربهێنێت، و هەموو هەوڵەکانی خاوەنی پەیام – پێغەمبەر (ﷺ) – بێ هیوا ببێت، خەریك بوو کەسانێك کە باوەڕی پتەو و هاوڕێیەتی دوور و درێژیان هەبوو دڵیان دەربێت، بەڵام ئەم وەك کێوە سەرکەشەکان خۆی گرت و زەڕەیەك نەلەخشا، توانی ڕۆڵی جێنشینی پێغەمبەران ببینێت بە ڕاستگۆیی دامەزراویەوە، پەردە لەسەر چاوەکان لابات و تۆز و گەردی سەر کاکڵەی ئایین و بیرو باوەڕە ڕاست و دروستەکەی لاببات.

ج- بەوەش جیا دەکرێتەوە لە هاوەڵانی کە تێگەیشتنێکی قووڵ و دووری هەبوو بۆ ئیسلام و ژیانی لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بە هەموو شێوە و ڕەنگێکیەوە و لە کاتی ئاشتی و لە کاتی جەنگدا و لە کاتی ترس و لە کاتی دڵنیاییدا، لە تەنیایی و لە ناو کۆمەڵدا و لە خۆشی و لە ناخۆشیدا.

د- بەوەش جیا دەکرێتەوە کە زۆر مەبەستی بووە ئیسلام وەك سەرچاوە ڕۆشنەکەی خۆی بمێنێتەوە وەك چۆن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) و ئەم غیرەیەشی بۆ دین لە غیرەی پیاوانێك زیاترە کە لە ناموس و کەرامەتی خێزانەکانیان کچ و دایك و خوشکانیاندا بن، وە نەترس و نە تەماداری و نە تەئویل و نە پێناخۆش بوونی کەسانێکی نزیك و خۆشەویستی نەیانتوانیوە لە جۆش و خرۆشەی بۆ دین لای بدەن.

ه- زۆر ورد بووه و زۆریش سوور بووه لەسەر ئەوەی کە حەز و ئاواتەکانی پێغەمبەری خوا بێنێتە دی پاش چوونی (ﷺ) بە موو لەوە لای نەداوە و کەسی تر نەیتوانیوە لای بدات و لە لۆمەی لۆمەکارانیش نەترساوە.

و- بەوەش جیادەکرێتەوە کە دونیا نەویست بووە و حەزی بە ڕابواردنی دونیا نەکردووە بە شێوەیەك کە کەسی پێ نەگەیشتووە مەگەر پێشەوا و ڕێنماکارەکەی — پێغەمبەر (ﷺ) و هەرگیز نەهاتووە بە خەیاڵیدا گرتنە دەستی دەسەڵات و وڵات بە ڕێوەبردن و گەورەکردنی لە بەرژەوەندی هۆز و بنەماڵەکەی، هەروەك چۆن دەسەڵاتدار حوکمڕایانی ناوچەکە دەیانکرد کە فارس و ڕۆمەکان بوون[1].

ئەم ڕەوشتە بەرز و مەرجە پێویستانە هەمووی لە گەورەمان ئەبو بەکر هاتە دی، هەروەك لە ژیانی پێغەمبەردا و لە دوای کۆچی پێغەمبەریش واتە خەلافەت و تا مردن هەر بەو جۆرە ژیاوە، بە جۆرێك کە کەس ناتوانێت گومانی یان ملەجەڕی لە ڕاستی ئەم مەسەلەیەدا بکات چونکە لە ڕێگای بەڵگەی حاشا هەڵنەگرەوە و بە تەواتور پێمان گەیشتووە[2].

ئەمەش ئەهلی — حل و عقد — لە قسە ڕۆیشتوو گەورە پیاون لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا بەیعەتیان پێدا بە تایبەتی و لە ڕۆژی داهاتووشدا بەیعەتی گشتی پێدرا لە مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)[3].

ئەوەی لە سەقیفەدا ڕوویدا کۆمەڵێك بنەمای جێگیر کرد لەوانەش:

١- سەرکردایەتی کردنی ئومەتی ئیسلام بە ڕەزامەندی و هەڵبژاردن نەبێت نابێت.

٢- بەیعەتدان یەکێکە لە بنچینەکانی هەڵبژاردن و شەریعەت پێدانی سەرکردەیە.

٣- نابێت خەلافەت وەربگیرێت مەگەر کەسانێکی زۆر دیندار و شایستەی بەڕێوەبردن.

---

[1] المرتضى – سيرة باي الحسن علي بن ابي طالب (رضي الله عنه) (لا: ٦٥-٦٦).

[2] **هەمان سەرچاوەی لا: ٦٧.**

[3] الخلافة والخلفاء الراشدون (لا: ٦٦-٦٧).

٤- هەڵبژاردنی خەلیفە دەبێت لەسەر بنەمای ئیسلامی و کەسایەتی و ڕەوشتی بێت و مەسەلە خەلافەت لە ڕێگای پشتاوپشت و خێڵەکایەتیەوە نابێت.

ناوهێنانی "قورەیش" لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا لەبەر ئەوەبوو کە واقیعێکی ئەو سەردەمە بوو دەبوایە کاری لەگەڵدا بکرایە و بە زۆر شتی هاو وێنەی ئیش کراوە کە مادام دژ و پێچەوانە نیە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا، و ئەو گفت و گۆیانەی لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا ڕوویدا لەسەر بنەمای دەروون سافی و ئاسایشی دەروونی بەرپا بوو لە ناو موسوڵمانەکاندا و دوور بوو لە هەموو هەلەج و مەلەج بەدرۆخستنەوە و پیلان گێڕان و پەیمان شکاندن، بەڵکو ملکەچ کردن بوو بۆ دەقە شەرعیەکان بە جۆرێك لە گفتو گۆکاندا سەرکرەوتن بۆ کەس نەبوو بەڵکو دانان بوو بە دەقە شەرعیەکاندا[1].

دکتۆر تۆفیق شاوی هەندێ بەڵگە بە نموونە دەهێنێتەوە لەسەر ڕاوێژی گشتی لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدیەکاندا لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا ڕوویداوە لەوانە:

* یەکەم بڕیاری ڕۆژی سەقیفە ئەوەی سەلماند کە یاسای حوکمڕانی و دەستووری وڵات لە ڕێگەی ڕاوێژ و شوراوە دەبێت و جێ بە جێ کردنی فەرمانی قورئانی پیرۆزە کە فەرمان بە شورا دەدات، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەم بنەمایە جێگای یەك دەنگیان بوو، و پاڵپشتی ئەم ( یەك دەنگیە) دەقە قورئانیەکان بوو کە شورایان بە پێویست و فەرز داناوە.

بە واتایەکی تر ئەم (یەك دەنگیە) بنەمایەکی بنەڕتی شەرعی جێگیر کرد کە دەریخست کە یاسای حوکمڕانی لە ئیسلامدا لەسەر بناغەی پرس و ڕاوێژی کارپێکراو دارێژراوە، ئەمەش یەکەمین بنەمایەکی دەستووری بوو کە بە کۆی دەنگ لەسەری پێك بێن پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) پاشانیش ئەم یەك دەنگیە پشتگیر و جێبەجێکاری دەقەکانی قورئان و فەرموودە بوو کە شوورایان بە (واجب) داناوە.

* هەروەها لە ڕۆژی سەقیفەی بەنی ساعیدەدا بڕیاری ئەوە درا کە هەڵبژاردنی خەلیفە و دیاریکردنی سنووری کارەکانی دەبێت لە ڕێگای شوراوە بێت، واتا بەیعەت پێدانی سەربەست کە مافی ئەوەی پێ ببەخشێت کە سەرۆکایەتی وڵات بکات بە چەند مەرج و بەندێك

---

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة للشجاع (لا: ٢٥٦).

لەسەر ئەو بنەمایە کە خەڵکەکە مەبەستیانە دەنگی خۆیان داوە و ئەمەش دووەمینی بنەمای دەستووری بوو کە بە کۆی دەنگی جێگیر بوو، ئەوەش بڕیارێکی هەمگی بوو وەك بڕیارەکەی پێشوو.

* وەك کار کردنێك لەسەر ئەو دوو بنەمایەی پێشوو ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) هەڵبژێردرا تا ببێتە یەکەمین خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی[1].

ئەم مافەی بۆ یەکلاییی نەبوویەوە تا لە ڕۆژی داهاتووشدا و لە دەنگدانی گشتی — بیعە عامە — دا جێگیر کرا، واتا ڕەزامەندی جەماوەری موسوڵمانان لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) و پاشان قبووڵکردنی لەسەر ئەو مەرجانەی لە وتارەکەیدا باسی کرد[2]، لەمەو لایش بە درێژی لە سەری دەدوێین - إن شاء الله-.

## جێ باسی دووەم

(دەنگدانی گشتی و بەڕێوەبردنی کاروباری ناوەخۆ)

یەکەم: دەنگدانی گشتی — البیعە العامە - :

دوای ئەوەی لە دەنگدانی تایبەتی — نهێنی — دا لە سەقیفەی بەنی ساعیدەدا ئـەبو بەکر بە خەلیفە هەڵبـژێردرا، عومـەری کـوڕی خـەتاب (رضي الله عنه) هەڵوێـستێکی نوانـد لـە ڕۆژی داهاتوودا دەربارەی پشتگیریکردن لەو هەڵبژاردنەی ئەبو بەکردا کاتێـك سـەرجەم موسـوڵمانان کۆبوونەوە بۆ دەنگدانی گشتی[3].

ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێت: پاش ئەوەی ئەبو بەکر لـە سـەقیفەدا هەڵبـژێردرا و لـە ڕۆژی داهاتوودا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لەسەر مینبەرەکەدا دانیشتبوو و عومەر هەستایە سەر پێ و پێش ئەبو بەکر دەستی کرد بە وتاردان و پاش سوپاسکردنی خوای گەورە بـەو جـۆرەی شـایانی بوو، وتی:

---

[1] فقه الشوریوالاستشارة، د. توقیف الشاوي (لا: ١٤٠).
[2] **هەمان سەرچاوەی لا ١٤٢**
[3] عصر الخلافة الراشدین، د. فتحیة النبراوي (لا: ٣٠).

من دوێنێ شتێکم عەرزی ئێوە کرد کە لە ڕاستیدا لە قورئاندا ئایەتی لەسەر نیە و هەروەك وەسیەتی پێغەمبەری خوایش (ﷺ) نەبوو، هەرچەندە من وام ئەزانی پێغەمبەری خوا لە ژیاندا ئەمەمان بۆ دیاری دەکات، خوای گەورە کتێبەکەی خۆی لە ناوتاندا جێ هێشتووە کە بەو هۆیەوە ڕینمایی کردووە و پێغەمبەرەکەشی بوو (ﷺ)، ئەگەر دەستی پێوە بگرن خوا ڕینماییتان دەکات هەروەك ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی کرد، خوا کۆ دەنگی کردوون لەسەر چاکترین کەستان، هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووەم دووەم کەسەکەی ناو ئەشکەوتەکە و دەی هەستن دەنگی خۆتانی پێ بدەن، و خەڵکەکەش هەموو هەستان و بەیعەتیان پێدا و پاش بەیعەتی سەقیفە.

پاشان ئەبو بەرکر هەستایەوە و پاش ئەوەی سوپاس و سەنای خوای کرد بەو شێوەیەی شایانیەتی، وتی:

«اما بعد اني قد وليت عليكم ولست بخيركم، فان أحسنت فاعينوني، وان اسئت فقوموني، الصدق امانة، والكذب خيانة، والضعيف قوي عندي حتى أريح عليه حقه انشاء الله، والقوي فيكم ضعيف حتى أخذ الحق منه ان شاء الله، لايدع قوم الجهاد في سبيل الله الا ضربهم الذل، ولا تشيع الفاحشة في قوم الا عمهم الله بالبلاء، اطيعوني ما اطعت الله ورسوله فاذا عصيت الله ورسوله فلا طاعة لي عليهم، قوموا الى صلاتكم يرحمكم الله»[1].

واتا: بووم بە سەرگەورەتان و لە کەسیشتان باشتر نیم، ئەگەر باشم کرد کۆمەکیم بکەن، ئەگەر خراپم کرد ڕاستم کەنەوە، ڕاستگۆیی ڕاسپاردەیە، درۆکردنیش ناپاکیە، لە لای من لاوازتان بەهێزتانە – ان شاء الله – تۆڵەی بۆ دەکەمەوە و بەهێزیشتان لاوازە لە لام تا ان شاء الله تۆڵەی لێ دەسەنم، وە هیچ گەلێك جیهاد و گیان فیدایی لە پێناوی خوادا واز لێ ناهێنێت مەگەر خوا سەرشۆڕیان دەکات، و بەدڕەوشتیش لە ناو هەر گەلێکدا ئاشکرا ببێت خوای گەورە بەڵای سەرتاسەرتان بۆ دەنێرێت، تا گوێڕایەڵی خودام، گوێڕایەڵم بن، ە ئەگەر سەرپێچیم کرد بۆتان نیە بە گوێم بکەن، دەی فەرموون هەستن بۆ نوێژەکانتان ڕەحمەتی خواتان لێ بێت[2].

عومەر (رضي الله عنه) ئەو ڕۆژە بە ئەبو بەکری وت: سەرکەوە سەر مینبەرەکە، ئەوەندە پێی وتەوە هەتا سەرکەوتەسەر مینبەرەکە و خەڵکەکەش بەیعەتیان پێدا.

---

[1] التأريخ الاسلامي (٢٨/٩).
[2] البداية والنهاية (٣٠٥/٦-٣٠٦) إسناده صحيح.

ئـەم وتـارە جوانــەی ئـەبو بـەكر (ﷺ) لەگـەڵ كورتیەكەشـیدا بـە چـاوی وتـارە ئیسلامیەكان مەزەندە دەكرێت، تیایدا ئـەبو بـەكری صـدیق (ﷺ) بنـەماكانی داد و بـەزەیی نواندنی دەسەڵاتداری دیاری كردووە بەرامبەر بە ژێردەستەكان، تیشكی خستە سەر ئـەوەی كـە گوێڕایەڵی كاربەدەستان پابەندە بە گوێڕایەڵی خوای گەورە و پێغەمبەرەكەیـەتی، جیهـادی لـە پێناو بەرزی وشەی (الله) دووپـاتكردەوە و گرنگیەكـەی ڕوونكـردەوە كـە سـەربەرزی ئومـەتی تێدایەـ باسی دووركەوتنەوەی كرد لە خراپەكاری گرنگیەكەشی بەوە وابەستە كرد كە پاراسـتنی كۆمەڵگەی تێدایە لە فەوتان و تیاچوون[1].

لەو وتارەوە و لەو ڕووداوانەشی كە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕوویدا— لێكۆڵەرەوەوان ئەتوانن ڕواڵەتی یاسایی حوكمڕانیان بـۆ دەربكـەوێت لـە سـەردەمی خەلافـەتی ڕاشیدەدا و گرنگترینیان:

١- زاراوەی (بەیعەت):

زانیان پێناسەی بەیعەتیان كردووە بە وشەی جیا جیا، لەوانە پێناسەكەی ئیبن خەلدون كە دەڵێت: «پەیماندانە بە دەسەڵاتد اران بە گوێڕایەڵی كردنیان»[2]، و هەندێكی تـر وا پێناسـەی دەكەن: «بەیعەتدان لەسەر پابەند بوون لەسەر ئیسلامەتی».

هەروەها پێناسەیش كراوە بەوەی كە بەڵێندان و پەیمان بەستن و گرێبەستیەكە لەسـەر زیندووكردنەوەی هەموو ئەو شتانەی قورئان و سونەت بـە زینـدوو ڕایـانگرتبوو و بـەرپاكردنی هەموو ئەو شتانەی ئەوان بەرپایان كردبوو[3].

موسوڵمانان هەر كاتێك بەیعەتیان بە ئەمیر بدایە دەستیان دەخستە ناو دەسـتی وەك دووپاتكردنەوەیەكی بەڵێن و ملكەچیە، وەك هاوشێوەی كڕین و فرۆشتن و بەم كـردارەش دەڵـێن (بەیعەت) دان[4].

---

[1] التأريخ الاسلامي (٢٨/٩).
[2] المقدمة (لا: ٢٩).
[3] جامع الاصول في احاديث الرسول (٢٥٢/١).
[4] **هەمان سەرچاوەی پێشوو** (لا: ٢٥٠).

لە بەیعەتدانەکەی گەلی موسوڵمانەوە لە (صدیق) (ﷺ) ئەوە فێر دەبین کە دەسەڵاتدار لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هەر کە گەیشتە سەر کورسی حوکم لە لاڕێگەی (ئەهلی حەل و عەقدەوە کە زانایان و سیاسەتداران و ڕیش سپیانی ئومەت و پاشان خەڵکانی تریش بە گشتی دەنگی خۆیان پێدا و مەرجەکانی تێدا هاتە دی، ئەو کاتە پێویستە و واجبە لەسەر سەرجەم موسوڵمانان بەیعەتی پێبدەن و لە سەری پێك بێن، و پشتی بگرن و دژی ئەو کەسانەی لە دژی دەوەستن، ئەمەش لەبەر یەکڕیزی گەل و ڕاوەستانی بنیاتی ئومەتی دژی دوژمنانی دەوڵەتی ئیسلامی چ لە ناوخۆی بن یان دەرەکی[1].

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «من مات ولیس في عنقه بیعة مات میتة جاهلیة»[2]، واتا: هەر کەسێك بمرێت و بەیعەتی بە کەس نەدابێت ئەوە شێوازی نەفامی دەمرێت، لەم فەرموودەیەدا هانی تێدایە بۆ بەیعەتدان و هەڕەشەشی تێدایە لەسەر وازهێنانی، ئەوەی بمرێت و دەنگی خۆی بە کەس نەدابێت ئەوە لەسەر گومڕایی دەژێت و بە گومڕایش دەمرێت[3].

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جێیەکی تردا دەفەرمووێت: «ومن بایع اماما فأعطاه صفقة یده وثمرة قلبه فلیطعه ماستطاع، فان جاء آخر ینازعه فاضربوا عنق الاخر»[4]، واتا: هەر کەسێك بەیعەتی بە ئیمامێك دا و دەستی خستە ناو دەستی و دڵی خۆی پێشکەش کرد با چەندێك بۆی دەکرێت بە گوێی بکات، ئەگەر کەسێکی تر هات و شانەخڕێی ئیمامەتی کرد لەگەڵیدا ئەوا بدات لە ملی ئەمەی دوایی.

سەیرەکە پێغەمبەری نازدار (ﷺ) فەرمانی کوشتنی ئەو کەسەی داوە کە لەسەرکردەی موسوڵمانان هەڵدەگەڕێتەوە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نادروستی ئەو کردەوەیە،

[1] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.
[2] مسلم کتاب الامارة (ژمارە: ١٨٥١).
[3] نظام الحکم في الاسلام (لا: ٢٥٠).
[4] مسلم کتاب الامارة (ژمارە ١٨٥٢)ز

چونکە داوای بەیعەتێکی تر دەکات پاش بەیعەتەکەی یەکەم کە فەرز و پێویستە لەسەر موسوڵمانان[1].

ئەم بەیعەتەش لە پایتەختی ئیسلامدا بۆ ئیمام ئەنجام دەدرێت، و دەبێتە خەلیفە، بەڵام لە هەرێمەکاندا ئیمام دیاری دەکات، و یان جێگیرەکانی ئیمام دیاری دەکەن، هەروەك چۆن لە بەیعەتەکەی (صدیق)دا ڕوویدا، شاری مەککە و تائف جێگری خەلیفە ئەمیری بۆ دیاری کردن، ئەوانەی ئیمام یان خەلیفە بۆ موسوڵمانان دیاری دەکەن پێیان دەڵێن «ئەهلی حەل و عەقد» واتا کەسانی قسە ڕۆیشتوو لە زاناکانی ئیسلام و سەرکردە سیاسیەکانی و ئەنجوومەنی شورا و ئەمیری شارەکان، ئیتر خەڵکانی گشتی دەتوانن بێنە ژێر ڕکێفی بەیعەتەکەی ئیمامەوە و ڕێگرێکیش نیە ئەگەر بیانەوێت بە خۆشیان دەنگ بدەن[2].

وە هەندێك لە زانایان دەڵێن دەبێت بەیعەتی گشتیش بدرێت بە خەلیفە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەبو بەکر (ﷺ) کاری خەلافەتی وەرنەگرت تا خەڵکانی گشتیش دەنگیان بۆ نەدا[3].

بەیعەت بەم مانایە تایبەتیەی کە بۆ ئەبو بەکر (ﷺ) درا تایبەتە بە خەلیفەوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، ونادرێت بە کەسانی تایبەت ئیتر لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت یان لە کاتی نەبوونی دەوڵەتی ئیسلامیدا بێت، چونکە ئەم بەیعەتە کۆمەڵێ حوکم و شتی بە دوادا دێت[4].

پوختەی ئەم وتانە ئەوەیە: بەیعەت بەمانا تایبەتی یەکەی واتا مل کەچی و گوێڕایەڵی و دۆستایەتی خۆت بۆ خەلیفە دەردەخات بەرامبەر بەوەی کە ئەویش حوکم بە قورئان بکات، کە لە ناو کرۆك و لە ژێرەوە گرێ بەستێکە لە نێوان دولایەندا، ئیمام لایەنی یەکەمە لە لایەکەوە، و ئوممەتی ئیسلامیش لایەنی دووەمە لە لایەکی ترەوە.

ئیمام دەنگی پێ دەدرێت بەرامبە بەوەی کە حوکم بە فەرمانەکانی قورئان و سوننەت بکات و ملکەچی تەواوی شەریعەتی ئیسلام بێت بە بیروباوەڕ، شەریعەت و یاسای ژیان، و

[1] نظام الحكم في الاسلام (لا: ٢٥٣).
[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.**
[3] فقه الشورى د. الشاوي (لا: ٤٣٩). عصر خلفاء الراشدون (لا: ٣٠).
[4] نظام الحكم في الاسلام (لا: ٢٥٤).

ئومەتیش لە بەرامبەردا بەڵێنی ئەوە دەدات کە ملکەچ و گوێڕایەڵ و جێبەجێکار بێت بۆ ئەو ئیمامە لە سنووری شەرعدا.

بەیعەت یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی یاسای حوکمڕانی ئیسلامی و لەو بوارەدا تاکانە یاسایە لە ناو هەموو یاساکانی کۆن و نوێدا، مانای وایە ئیمامیش و ئومەتیش دەبێت وابەستە و پابەند بن بە هەموو فەرمانەکانی ئیسلامەوە، بۆ کەسیان نیە چ حاکم بێت یان ئەهلی حەل و عەقد کە لە سنووری شەریعەتی ئیسلام بڕۆنە دەرەوە، یان کۆمەڵە یاسایەك دابنێن کە پێچەوانەی قورئان و سونەت بێت، یان پێچەوانەی بنەما گشتیەکانی شەریعەت بێت، ئەو کردەوەیەش بە لە ئیسلام دەرچوون دادەنرێت و بەڵکو بە ئاشکرا بانگەشەی دەنگە دژی یاسای دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵکو لەوەش دوورتر قورئانی پیرۆز بە دوور لە ئیمان وبێباوەڕ ناویان دەبات[1].

وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ (النساء: ٦٥)، واتا: سوێند بە خوای تۆ ئەی محمد باوەڕیان نەهێناوە تا تۆ نەکەن بە حەکەم لە هەموو کێشەیەکدا لە ناویاندا ڕوودەدات و پاشانیش ئەگەر ڕازیش نەبن بە حوکمڕانیەکەت و ملکەچی نەبن بە تەواوەتی...

ئەمەیە تێگەیشتن لە زاراوەی (بەیعەت) لە سەردەمی خەلیفەی یەکەمی ئیسلامدا (رضي الله عنه).

٢- سەرچاوەی یاسادانان لە دەوڵەتی صدیقدا:

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە خەڵکەکەی وت: بە گوێم بکەن تا بە گوێی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەم و ئەگەر سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەیم کرد گوێڕایەڵی کردنم لە سەرتان پێویست نیە، کەواتە: سەرچاوەکانی یاسادانانله لای ئەبو بەکر (رضي الله عنه) ئەمانە بووە:

---

[1] نظام الحكم في الاسلام (لا: ١٥٢-١٥٣).

أ- قورئانی پیرۆز:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾﴾ (النساء:١٠٥).

قورئان سەرچاوەی یەکەمە کە هەموو حوکمێکی شەرعیان لەخۆ گرتووە لە ئیش و کارەکانی ژیاندا، هەروەك کۆمەڵێك بنەما و ئەحکامی یەکلاییکەرەوەی لە خۆ گرتووە کە هەموو بەشێك بە بەشەکانی ژیان چاکسازی دەکات، وەك قورئانی پیرۆز هەموو پێداویستیەکانی دروستکردنی دەوڵەتی بۆ موسوڵمانان ڕوون کردۆتەوە.

ب- سونەتی پاك و خاوێن:

بە سەرچاوەی دووەم هەژمار دەکرێت کە دەستووری ئیسلامی پێك دەهێنێت، لەو ڕوانگە پاکەوە شێوازی پڕاکتیزەکردن و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی قورئان[1].

ئەو دەوڵەتەی ئەبو بەکر (ﷺ) دایمەزراند، شەریعەت تیایدا سەروەر بوو، فەرمانڕەوایی شەریعەتی ئیسلامی لە سەرووی هەموو یاسا و یاسادانانێکەوە بوو، وێنەیەکی پرشنگداری دەوڵەتی ئیسلامی نیشان دەدات کە شەریعەت باڵادەست بوو، کە تیایدا هەموو دەزگاکان ژێرباری شەریعەت بوون و حوکمیش تیایدا پابەندی شەریعەت بوو بەبێ دواکەوتن و پێشکەوتن لێی[2].

دەوڵەتی صدیق بوو، کۆمەڵگەیەکیش هاوەڵان شەریعەتی سەروەری هەمووانە، فەرمانڕەوا و ژێردەستە پێکەوە گوێڕایەڵی شەریعەت بوون، هەر لەبەر ئەوە بوو کە ئەبو بەکر (ﷺ) گوێڕایەڵی هاوەڵان بۆی بەستەوە بە ئەندازەی گوێڕایەڵی ئەم بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «لا طاعة في معصية الخالق، انما الطاعة في المعروف»[3].

---

[1] فقه التمكين في القران الكريم للصلابي (لا: ٤٣٢).
[2] نظام الحكم في الاسلام (لا: ٢٢٧).
[3] البخاري ژمارە ٧١٤٥ز

واتا: گوێڕایەڵی نیە لە سەرپێچیدا بەڵکو گوێڕایەڵی لە چاکەدا دەبێت.

٣- مافی میللەت لە چاودێری کردنی فەرمانڕەوا و لێپرسینەوەی:

ئەبو بەکر (ﷺ) زانی: «فان احسنت فاعینونی وان اسئات فقومونی»[1]، واتا: ئەگەر چاکم کرد هاوکاریم بکەن و ئەگەر خراپم کرد ڕاستم بکەنەوە.

ئەمەش ئەبو بەکرە دان بەو مافەدا دەنێت بۆ میللەت کە مافی چاودێریکردنی کارەکانی و لێپرسینەوەی یان هەیە، بەڵکو لە دەستگریشی بن لە هەموو کارێکی خراپە و ناڕەوا، هەوڵ بدەن پابەند بێت بە هەموو ڕێڕەوێکی ڕاست و دروستەوە[2].

صدیق (ﷺ) هەر لە یەکەمین وتاریدا ئەوەی ڕوون کردەوە کە فەرمانڕەوایان دەکەونە هەڵەوە و ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبن، ئەو دەسەڵاتەشی کە شتێکی تاکە کەسیە وەرنەگرتووە تا خۆی لە خەڵکانی تر بەرزتر بگرێت، چونکە سەردەمی پەیام و پەیامبەرانی بێ گوناه تەواو بوو، و ئەو دوایین پێغەمبەرەی کە لە لایەن خواوە نیگای بۆ دەهات گەڕایەوە بۆ لای خوای خۆی.

دەسەڵاتێکی ئایینی هەبوو لەو بێ گوناهیەوە (عصمه) وەری گرتبوو کە لە پێغەمبەرایەتیەکەی پێی درا بوو، هەروەك بۆ مەسەلەی نیردراویەکەی پێویستە چونکە لە ئاسمانەوە فەرمانی بۆ دێتە خوارەوە، بەڵام ئەم بێ گوناهیە بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆتایی هات و پاش ئەو ئیتر خەلافەت و دەسەڵات لە ڕێگەی بەیعەت پێدان و ڕەزامەندی میللەتەوە دەبێت[3].

میللەت لە فکر و تێگەیشتنی ئەبو بەکردا خاوەنی ئیدارەیەکی زیندوە بەهۆشەوە توانای کۆمەکی و ئامۆژگاری و چاودێری و ڕاستکردنەوەی ئەمیری هەیە، لەسەر ژێردەستەکان پێویستە پشتگیری خەلیفە بکەن و دەست بدەنە باڵی لە کاروباری ئایین و جیهاددا، یەکێك لە سەرخستنەکانی پێشەوا ئەوەیە کە بە چاوی سووك سەیر نەکرێت و بەرز ڕابگیرێت تا ڕێزی لێ بگیرێت، چونکە گەورەیی کردنی میللەت و سەرکردایەتی کردن بۆ بەرزی وشەی خوا ئەوە

---

[1] البداية والنهاية (٣٠٥/٦).

[2] فقه الشورى والاستشارة (لا: ٤٤١).

[3] فقه الشورى والاستشارة (لا: ٤٤١).

پێویست دەکات کە بەرێز و گەورە و شایستە سەیر بکرێت، ئەمەش وەك ڕێزێکە بۆ ئەو شەرعەی خوا کە ئەم بەرز ڕای دەگرێت و بەرگری لێ دەکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: «ان من اجلال الله تعالى: اکرام ذي شيبة المسلم، وحامل القران غير المغلي فيه والجافي عنه، واکرام ذي السلطان المقسط»[1].

واتا: «لە ڕێزگرتنی خوای – عز وجل – ە: ڕێزگرتنی ئەوانەی لە ناو موسوڵمانێتیدا پیر بوون، و هەڵگرانی قورئان ئەوانەی زۆر ڕۆچوون تیایدا و نە زۆریش پشتی لێ هەڵدەکەن ووشکی بنوێنن بەرامبەری، و دەسالاتدارانی دادپەروەر».

میللەت لە ئیسلامدا دەبێت ڕاوێژی جوان و ئامۆژگاری بە نرخ پێشکەشی دەسەڵاتداران بکات و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: «الدين النصيحه»، واتا: ئایینی ئیسلام ئایینی ئامۆژگاریکردنە، هاوەڵان وتیان: بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «لله ولكتابه ورسوله ولأئمة المسلمين عامتهم»[2]، واتا: بۆ خوا و قورئانەکەی و پێغەمبەرەکەی و پێشەوایانی موسوڵمانان و خەڵکانی گشتی.

لە بیری هاوەڵان ئەوە جێگیر بوو کە ڕاوەستاوی گەل بە ڕاوەستاوی کاربەدەستانەوەیە، بۆیە ئەرکی سەرشانی میللەتە ئامۆژگاریان بکەن و ڕاستیان بکەنەوە.

دەوڵەتە نوێیەکەی صدیق ئەم سیاسەتە سەرکەوتووەی ئەبو بەکری بە ئاشکرا تێدابەدی دەکرا، لیژنەی تایبەتمەند و ئەنجومەنی ڕاوێژکاری دروست کرد، کە نەخشە و پلانی بۆ حاکم دیاری دەکرد و زانیاری پێدەدا و هەر شتێك باش بوایە پێیان پیشان دەدا.

ئەوەی کە جێگای داخە کە زۆرێك لە وڵاتانی موسوڵمان ئەمڕۆ پشتیان لەم بەرنامەیە ژیرانەیە هەڵکردووە، نەخۆشی نەهامەتیەکانی گەورە بووە بەوەی دەسەڵاتداران بە ئارەزووی خۆیان و بە زۆر حوکمی میللەت دەکەن، ئەم دواکەوتنەش کە ئەمڕۆ دەیبینین لە زۆرێك لەو وڵاتانەدا لە ئەنجامی ئەم زۆرە ملێیەیە – کە دیکتاتۆریەتی نەفرەت لێکراوەکە گیانی ئامۆژگاریکردن و ئازایەتی لە ناو گەلدا کوشتووە، و تۆوی ترس و تۆقاندنی تیا چێنراوە

[1] صحيح سنن ابي داوود (ژمارە: ٣٥٠٤).

[2] مسلم كتاب الايمان باب ان الدين النصيحة (ژمارە: ٥٥).

مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ کردبێت، بەڵام ئەو گەلەی ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆی دەزانێت کە چاودێری کردنی دەسەڵاتە و ئامۆژگاری کردنیەتی کە ئەویش دەبێتە هۆی سەرکەوتن و جێگیر بوونی لەسەر زەویدا، لەوێشەوە بەرەو دونیای پان و بەرین بانگەوازی خوا بڵاودەکەنەوە[1].

٤- جێگیرکردنی بەرنامەی (داد و یەکسانی) لە ناو خەڵکدا:

ئەبو بەکر وتی: لاوازتان لە لام بەهێزتانە تا مافەکەی بۆ وەردەگرمەوە (انشاء الله) و بەهێزیشتان لە لام لاوازتانە تا هەقی لێ دەسەنمەوە (انشاء الله)[2].

یەکێك لە ئامانجەکانی حوکمی ئیسلامی سوور بوونە لەسەر بەرپاکردنی بنەماکانی یاساو ڕێسای ئیسلام کە کاری بەرپاکردنی کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان لە ئەستۆ دەگرێت، لەو بنەمایانە: ڕاوێژکردن، دادپەروەری، یەکسانی و سەربەستیەکان، وەك لە وتارەکەی صدیقدا (ﷺ) دانی بەو بنەمایە دا ناوە (شورا) لە شێوازی هەڵبژاردن و بەیعەتدانی و لە مزگەوتی گەورەی مەدینەدا دەرکەوت، و ئامادەبوونی کۆمەڵێکی زۆر لە موسوڵمانان.

(دادپەروەریش) لە ناوەڕۆکی وتارەکەیدا بەدی دەکرێت و گومانی تێدا نیە کە دادپەروەری لە فکری صدیقدا ئەو دادپەروەریە ئیسلامیەیە کە دەبێتە کۆڵەکەیەکی سەرەکی دامەزراندنی کۆمەڵگەی ئیسلامی و حوکمی ئیسلامی، ئیسلامیش هیچ بوونێکی نابێت لە کۆمەڵگەیەکدا کە دوور بێت لە دادپەروەری و دەورە درابێت بە ستەمکاری.

بەرپاکردنی دادپەروەری لە ناو تاك ك کۆمەڵ و وڵاتدا، لەو کارە خۆبەخشانە نیە کە بە ئارەزووی حاکم بێت چ کاتێك پێی خۆش بێت پێی هەستێت، بەڵکو لە ئیسلامدا یەکێکە لە پیرۆزترین فەرمانەکانی و گرنگترینیانە، هەموو ئومەتی ئیسلام لەسەر ئەوەن کە دادپەروەری پێویستە و واجبە[3]، وەك فەخری ڕازی دەڵێت: «هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە دەبێت حاکم و کاربەدەست دادپەروەر بێت و بە دادپەروەریش حوکمی خەڵکی بکات»[4].

---

[1] تأريخ لادعوة الاسلام (لا: ٢٤٩).
[2] البداية والنهاية (٣٠٥/٦).
[3] فقه التمكين في القران الكريم (لا: ٤٥٥).
[4] تفسير الرازي (١٤١/١٠).

ئەم فەرمانەش ئایەتی قورئان و فەرمووده پاڵپشتی دەکات، کە لە ئامانجەکانی دەوڵەتی ئیسلامی بەرپاکردنی کۆمەڵگەیەك کە داد و یەکسانی باڵ بکێشێت بە سەریدا، و لە ناوبردنی ستەم و ستەمکاری بە هەموو شێوەکانیەوە، دەبێت بوار بڕەخسێنێت بۆ هەموو تاکێك کە داوای مافی خۆی بکات بە ئاسانترین و خێراترین شێوە، و پێویست بە سەرفکردنی سامان و ماندووبوون نەکات، و ڕێگەش بگرێت لە هەموو ئەو هۆکارانەی کە ڕێگر دەبن لە گەیشتنی خاوەن ماف بە مافەکانی.

ئیسلام بە پێویست و واجبی داناوە لەسەر دەسەڵاتداران کە دادپەروەری لە ناو خەڵکدا بەرپا بکەن  بەبێ گوێ دانە زمان و وڵات و نەژاد و باری کۆمەڵایەتیان، و ئەو داد بەرپا دەکات لە نێوان هەردوو ناکۆکدا و فەرمان بە هەق و ڕاستی دەدات، ئیتر گوێش بەوە نادات کە ئەو کەسە تاوانبارە هاوڕێی بێت یان دوژمن، دەوڵەمەند بێت یان هەژار، کرێکار بێت یان خاوەن کار[1].

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا ۚ اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾﴾ (المائده: ٨).

واتا: ئەی باوەڕداران بۆ خوا ڕاوەستاو بن و شایانی عەدل بن و ناحەزی و نەیاریتان لەگەڵ هەندێکدا واتان لێ نەکات دادپەروەری بەرپا نەکەن، دادپەروەر بن ئەوە لە خوا ترسان نزیکتان دەکاتەوە و لە خوایش بترسن چونکە خوا بە کردەوەکانتان ئاگادارە.

بەڕاستی ئەبو بەکر (ﷺ) لە دادپەروەریدا سەرمەشق بووە بە جۆرێك دڵەکانی کەمەندکێش کردوە و سەرسامی کردوون، دادپەروەری لە ڕوانگەی ئەوە بانگەوازە بۆ لای ئیسلام بە کردەوە، و دڵی خەڵکی دەکاتەوە بۆ باوەڕهێنان، دادپەروەر بوو لە بەخشین و موچەدا،

---

[1] فقه التمكين في القران الكريم (لا: ٤٥٩

و داواشی لێ دەکردن هاوکاری بکەن لە بەرپاکردنی دادپەروەریدا و لە ڕووداوێکیشدا داوای کرد تۆڵە لە خۆی بکەنەوە لە بەڵگەیەکی گەورە لەسەر دادپەروەری و ترسان لە خوای گەورە[1].

لە عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕنەوە: کە ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) ڕۆژێکی هەینی وتاری دا و وتی: «سبەینێ هەر هەمووتان زەکاتی وشترەکانتانم بۆ بهێنن تا بەشی کەم لە موسوڵمانان، و بێ پرسیش کەس خۆی نەکات بە ژووردا، ئافرەتێك بە مێردەکەی وت: ئەم ڕەشۆیە بەرە بەڵکو خوای گەورە حوشترێکمان پێ بە خەڵات بکات، هات و ئەبو بەکر و عومەری بینی لە ناو حوشترەکاندا بوون ئەویش هاتە ژوورەوە لەگەڵیاندا و ئەبو بەکر لای کردەوە و وتی: بۆچی هاتوویتە ژوورەوە؟ پاشان ڕەشۆکەی لێ وەرگرت و دانەیەکی دا بە پشتیدا، پاش ئەوەی لە دابەشکردنی حوشترەکان بوویەوە ئەو پیاوەی بانگ کرد و ڕەشۆکەی دایەوە دەستی و وتی: لێم بدەرەوە.... عومەریش وتی: سوێند بە خوا لێت ناداتەوە با نەبێت بە باو، ئەبو بەکریش وتی: کێ فریام دەکەوێت ڕۆژی قیامەت؟ عومەر وتی: ڕازی بکە، ئەویش فەرمانی دا کە حوشترێك بە بارەکەیەوە و پارچەیەك قوماش و پێنج دیناری زێڕی پێدا و ڕازی کرد»[2].

بەڵام ئەو بنەمایەی کە ئەبو بەکر جێگیری کرد لە ناو موسوڵماناندا، بە یەکێك لە بنەما گشتیەکان دادەنرێت کە ئیسلام جێگیری کردووە و یەکێکە لەو بنەمایانەی کە کۆمەڵگەی ئیسلامی لەسەر دروست دەبێت و لەم بوارەشدا پێشی هەموو یاسا و ڕێسایەکی سەردەمی ئەمڕۆ کەوتووە.

قورئانی پیرۆزیش بنەمای دادپەروەری دووپات دەکاتەوە لە سوڕەتی (الحجرات) ئایەتی سیانزەدا دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾.

---

[1] تأريخ الدعوة الى الاسلام في عصر الخلفاء (لا: ٤١٠).
[2] هەمان سەرچاوە (٤١١).

واتا: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە تاقە نێر و مێیەك دروست كردووە و پاشان كردوومانن بە گەل و هۆز تا یەكتری جوان بناسن و بەڕێزترینیشتان لە لای خوا لە خوا ترسترینتانە و خوایش زانا و بە ئاگایە.

خەڵكی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هەموو وەك یەكن، ئیتر حاكم بێت یان میللەت، ژن بێت یان پیاو، عەرەب یان عەجەم[1]، سپی بێت یان ڕەش.

ئیسلام هەموو ئەم جیاوازیانەی سڕیەوە كە پێشتر بە بۆنەی ڕەنگ و ڕەگەز و چین و نەژادەوە لە ناو كۆمەڵگەدا باو بوو، و فەرمانڕەوا و ژێر دەستەكان لە ڕوانگەی شەرعەوە وەك یەكن[2].

پراكتیزەكردنەكانی صدیق (رضي الله عنه) لەماوەی خەلافەتیدا باشترین شاهێدی ئەم ڕاستیەن كە دەڵێت: «بووم بە گەورەتان بەڵام لە هیچتان باشتر نیم و ئەگەر باشم كرد كۆمەكم بن و ئەگەر خراپم كرد دەستم بگرن و ڕاستم بكەنەوە، و بەهێزتان لە لام لاوازە هەتا تۆڵەی لێ دەكەمەوە و لاوازتان لە لام بەهێزە تا تۆڵەی بۆ دەستێنم»[3].

لە خەزێنەی موسوڵمانانی دەبەخشی و بەبێ جیاوازی دابەشی دەكرد، (ابن سعد) و كەسانی تریش گێڕاویانەتەوە كە ئەبو بەكر (رضي الله عنه) لە سونەحماڵێكی هەبوو — هەر لەو ماڵەشدا (بيت المال)یشی دروست كردبوو كە پاسەوانیشی بۆ دانەنابوو، پێیان ووت: بۆچی پاسەوانێكی بۆ دانانێیت؟ وتی: ترسی نیە، وتیان: چۆن؟ وتی: قوفڵی پێوەیە و پاشانیش هەمووی دەبەخشی و هیچی تێدا نەدەهێشتەوە، كاتێك ماڵیشی باری كردبوو بۆ مەدینە (بيت المال)ەكەشی گواستەوە بۆ ماڵەكەی خۆی، لە هۆزی جوهەینەوە كانزایەكی زۆر نێردرا بۆ بەیتول مال وهەر لە سەردەمی ئەویشدا كانزای بەنی سەلیم دۆزرایەوە و زەكاتیان لێ دەركرد و خستیانە بیتول ماڵ و ئەویش بە یەكسانی دابەشی كرد بەسەر خەڵكیدا، دای بە سەربەست و بەندە، نێر و مێ، گەورە و بچووك وەك یەك.

---

[1] بە هەموو گەلێك جگە لە عەرەب دەڵێن: (عجم).
[2] فقه التمكين في القران الكريم (لا: ٤٦٠-٤٦١).
[3] البداية والنهاية (٦/٣٠٥).

عائیشه (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: یەکەمساڵ دەیدا بە هەموو بەنە و سەربەست و ژن و پیاو و کەنیزەك و لە ساڵی داهاتوودا کردی بە بیست بیست، خەڵکانێك لە موسوڵمانان هاتنە لای و پێیان وت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا، تۆ ئەمماڵەت بە یەکسانی بەشکرد لە ناو خەڵکیدا و جیاوازیت نەخست، لە کاتێکدا خەڵکانێك هەن پێشینەی چاك و ڕێزیان هەیە، و ئەگەر کەمێك زیاترت بدایە بەو خاوەن فەزڵ و پێشینانە باشتر نەبوو؟ وتی: ئەوەی باستان کرد لە پێشینەی چاك و ڕێزداری من چۆنی بزانم چونکە خوا باشی دەزانێت و پاداشتیان لای ئەوە، بەڵام ئەمە موچەیە و ژیانە، یەکسانی تیایدا لە جیاوازی کردن باشترە[1].

لەسەردەمی ئەودا هەمووان وەك یەکیان وەردەگرت لە خەزێنەی (بيت المال) و عومەری فاروق (رضي الله عنه) لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ دەکات و پێی دەڵێت: ئایا بە یەك چاو سەیری کەسێك دەکەیت کە دوو کۆچی کردووە و بە هەردوو قیبلە نوێژی کردووە و کەسێك کە دوای فەتحی مەککە موسوڵمان بووە؟ ئەبو بەکر وتی: ئەوان بۆ خوایان کرد و پاداشتیان لەسەر خوای گەورەیە، و دونیایش هۆکاری ڕێبوارە.

هەرچەندە عومەر (رضي الله عنه) لە سەرەتای خەلافەتیدا ئەو شێوازی دابەشکردنەی گۆڕی و بە پێی پێشینەی موسوڵمانەتی و جیهاد و گیان فیدایی سامانی بەسەر موسوڵماناندا دابەش دەکرد، بەڵام لە دوا ساتەکانی ژیانیدا وتی: ئەگەر عومر باقی بێت لە ساڵانی داهاتوو دەگەڕێمەوە سەر شێوازی دابەشکردنی ئەبو بەکر و یەکسانیم دەخستەوە ناو خەڵکی[2].

وشتر و وڵاخ و چەکی دەکڕی و لە پێناوی خوادا دیبەخشی و ساڵێك قوماشی (قطيفة)ی کڕی کە لە لادێ دەچنرا و لە زستاندا دابەشی کرد بەسەر بێوەژنەکانی شاری مەدینە و دەور و بەری دا، و سامانی خەزێنەی موسوڵمانان گەیشتە دوو سەد هەزار و زیاتریش و لە کاری چاکە دا هەمووی دابەش کرد[3].

ئەبو بەکر شوێن ڕێڕەوی خوایی کەوت لە بەرقەرارکردنی دادپەروەریەکەیدا و هێنانەدی یەکسانی لە نێو خەڵکیدا، ئاگاداری مافی هەژاران بوو، خۆی بە یەکێك لەو هەژار و

---

[1] ابو بكر الصديق طنطاوي (١٨٧-١٨٨)، ابن سعد (١٩٣/٣).
[2] الاحكام السلطانية للماوردي (لا: ٢٠١).
[3] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٥٨).

داماوانە دەزانی بە چاوێکی کراوە و بە ئیرادەیەکی بەهێز کە هیچ هێزێکی سەر زەوی نەیتوانی لەو ڕێڕەوە ڕاستە لای بدات و شتی بەسەردا بسەپێنێت.

ئەمەیە ئیسلام لە تێگەیشتنی صدیقدا (ﷺ) پیاوی دەوڵەت، کە ئازایانە زوڵم و ستەمی خستە ژێر پێی و نەتەوەکەی و بە دادپەروەری سەر بەرزی کردنەوە و بەو هۆیەوە دڵنیایی بۆ دەوڵەتەکەی و پاراستنی ڕۆڵی خۆی فەراهەم هێنا لە پاراستنی گەل و نەتەوەدا[1].

ئەبو بەکر (ﷺ) هەر لە یەکەم ساتی دەست بەکار بوونیەوە هەستا بە پراکتیزەکردنی ئەم بنەما بەرزانە، چاك دەیزانی کە دادپەروەری هۆی سەر بەرزی حاکم و ژێردەستەیە، لەبەر ئەمەش بوو کە صدیق (ﷺ) دەستی کرد بە جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی و بە دەم خۆیەوە ئەم ئایەتەی دەووتەوە: ﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ۝٩٠﴾ (النحل:٩٠).

واتا: خوای گەورە فەرمانی دەرکردووە بە دادپەروەری و چاکەخوازی و خزمایەتی و بەرگریشی کردووە لە بەدڕەوشتی و خراپە و ستەمکاری، ئامۆژگاریتان دەکات تا بیر بکەنەوە.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) دەیویست موسوڵمانان لە ئایینەکەیان دڵنیابن و سەربەستی بانگەوازیان هەبێت، ئەو کاتە دڵنیایی سەر دەکێشێت بەسەر هەموو موسوڵماناندا کە ببینن فەرمانڕەواکەیان لەسەر بنەمای دادپەروەریەکی دوور لە ئارەزووکاری فەرمانڕەوایی دەکات.

حوکمڕانیش لەسەر ئەم بنەمایە ئەوە پێویست دەکات لەسەری کە لە هەموو شتێکی تاکە کەسی خۆی دابڕنێت و دادپەروەری و بەزەیی لە فەرمانڕەواییەکەیدا کۆ ببێتەوە، تێڕوانینی صدیق (ﷺ) بۆ فەرمانڕەوییکردن لەسەر بنەمای خۆ لە بیر کردن دروست بوو بوو، بە شێوەیەك خۆی بۆ خوا یەکلایی بکاتەوە کە هەست بە لاوازی لاواز و پێداویستی کۆمەڵگە بکات و

[1] ابو بکر رجل الدولة (لا: ٤٦).

دادپەروەری خۆی بەرز ڕابگرێت لە هەموو هەوا و ئارەزوویەك، لە پێناوی خوادا خۆی و منداڵەکانی و کەسەکانی لە بیر بچێت، پاشان بە دواداچوونی هەموو کارە بچوك و گەورەکانی دەوڵەتی بە هەموو وریایی ئاگادار یەکەوە هەبێت[1].

بە پێی ئەم وتانەی پێشوو، دادپەروەری ئاڵای بشەکێتەوە لە ناو خەڵکیدا، لاواز دڵنیایە لە دەستکەوتنی مافی، و لەوەش دڵنیایە لاوازیەکەی نامێنێت بە چەسپاندنی دادپەروەری، کەواتە بەوەوە ئازایە و کەس بۆی نیە مافی زەوت بکات یان مافی بفەوتێنێت.

و بەهێزیش کاتێ کە ستەم دەکات و ئەو دەستی دەگرێت و ناهێڵێت وتۆڵەی لە هەژاری لێ دەسەنێت و خۆی ناداتە پاڵ ناودار و فەرمانڕەوا و خزمەکانیەوە بۆ بە دەستهێنانی دەست ڕۆیشتن یان پلە و پایە، و ئەمەش ئەوپەڕی سەر بڵندیە و جێگیر بوونی حوکمڕانی یە لەسەر زەوی[2].

ئەو وشەیەی (ابن تیمیە)چەند جوانە کە دەڵێت: «ان الله ینصر الدولة العادلة وان کانت کافرة، ولا ینصر الدولة الظالمة ولو کانت مسلمة....... بالعدل تستصلح الرجال وتستمزر الاموال»، واتا: خوای گەورە دەوڵەتی دادپەروەر سەردەخات ئیتر با بێ باوەڕیش بێت، دەوڵەتی ستەمکار سەرناخات با موسڵمانیش بێت........ بە دادپەروەری پیاوان چاکساز دەبن و سامانیش پارێزراو.

٥- ڕاستگۆیی بنەمای هەڵسوکەوتە لە نێوان فەرمانڕەوا و میللەتدا:

ئەبو بەکر (ﷺ) وتی: ڕاستگۆیی سپاردەیە و درۆزنیش ناپاکی یە، بەمەش بنەمایەکی سەرەکی ئاشکرا کرد کە دەوڵەتەکەی لەسەر دادەمەزرێت و ئەویش ئەوەیە: کە ڕاستگۆیی فەرمانڕەوا لەگەڵ بناغەی هەڵسوکەوتە، ئەم بنەما سیاسیە ژیرانەیەش کاری گەرمی گرنگی هەیە لەسەر بەهێزی گەل، بە جۆرێك کە پردی متمانە دروست دەکات لە نێوان گەل و فەرمانڕەواکەیدا و ئەمەش ڕەوشتێکی سیاسیە و لەو ڕوانگەی بانگەشەی ئیسلام بۆ ڕاستگۆیی یەوە سەرچاوە دەگرێ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ

[1] الصديق ل(هيكل باشا) لا: ٢٢٤.
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٤٦).

وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ (التوبه: ١١٩)، واتا: ئەی باوەڕداران لە خوا بترسن و لەگەڵ پێڕی ڕاستگۆیاندا بن.

هەڕەشەیش کراوە لە لایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) لەو کەسانەی درۆ دەکەن بە تایبەت پادشا و کار بەدەستان وەك دەفەرمووێت: «ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولا يزكيهم ولا ينظر اليهم ولهم عذاب اليم: شيخ زان و ملك كذاب و عائل مستكبر»[1].

واتا: سێ کۆمەڵ لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە لەگەڵیان نادوێت و لە گوناھ پاکیان ناکاتەوە و سەیریشیان ناکات و سزای سەختیشی بۆ ئامادە کردوون: پیاوێك داوێن پیسی بکات، فەرمانڕەوای درۆزن و هەژاری خۆ بە زل زان.

ئەم وشانە (ڕاستگۆیی سپاردەیە) مانای زۆر لە خۆی دەگرێت، گیانێکە بە ناو خەڵکدا دێت و دەڕوات، گوڕ و تین دەبەخشێت، هیوا دروست دەکات، بەڵام (درۆ ناپاکیە) ئا بەو چەشنە ئەبو بەکر خۆی لە ماناکان دەدات و هەر شتە و بە ناوی خۆیەوە ناوی دەنێت، فەرمانڕەوای درۆزن ئەو بریکارە ناپاکەیە کە نانی میللەت دەخوات و ئەشیان خەڵەتێنێت.

چەند چارە ڕەشە ئەو فەرمانڕەوایەی درۆ لەگەڵ گەلەکەیدا دەکات و بەڵام ناوی تری لێ دەنێت!! ئەبو بەکر (ﷺ) بە ناپاك ناوی برد و دوژمنی ژمارەیەکی گەلەکەیەتی، چونکە ئایا دوای ناپاکی ئیتر چ دوژمنایەتیەك هەیە لەو گەورەتر؟.

بەڕاستی دەڵێی صدیق (ﷺ) لە ناوماندا ماوە و بەم هەڵوێستە جوانەی کۆمەڵی فەرمانڕەوابەرز ڕادەگرێت و کۆمەڵی تر دەدات بە زەویدا!، دروست کردنی پیاوانی شیاو بەرزترین هونەری حوکمڕانیە، چونکە ئەوانن کەرەستەی گەل و بەهای بەرزی کە بە هۆیەوە گەل لە نارەحەتی یەکانی ڕۆژان، گومانی تێدا نیە هەر کەسێك لە وشەکانی صدیق (ﷺ) ورد بێتەوە باوەڕی پێ دەکات چونکە بەڕاستی پێشەوا بوو لەم هونەرە بەرزەدا، بە تەواوەتی لەسەر ڕێرەوی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) دەڕۆیشت[2].

---

[1] مسلم كتاب الايمان (ژمارە: ١٧٢).

[2] ابوبكر رجل الدولة مجدي حمدي (لا: ٣٦-٣٧).

بەڕاستی گەلانی دونیا ئەمڕۆ زۆر پێویستیان بەو پرۆگرامە خواییە هەیە لە بواری هەڵسو کەوتی نێوان فەرمانڕەوا و میللەتدا تا بەرگری بکات لە شێوازەکانی دەست تێوەردان و تەزویرکاری هەڵبژاردنەکان و تۆمەت خستنە پاڵ ئەم و ئەو، وە بە کارهێنانی هۆیەکانی گەیاندن وەك هۆکارێك بۆ برەودان بە تۆمەتبارکردنی ئەو کەسانەی کە نەیاری دەسەڵاتن و ڕەخنە دەگرن، گەلیش پێویستە سەرپەرشتی ئەوە بکات کە فەرمانڕەواکان دەست بە ڕاستگۆیی و ڕاسپاردەییەوە بگرن و لە ڕێگای دەزگاکانەوە کە یارمەتیان دەدات بۆ ڕاست کردنەوەی فەرمانڕەواکان ئەگەر لایاندا[1]، و نەهێڵن ئیرادە و ناموس و سەربەستی و سامانیان بدزن.

٦- ڕاگەیاندنی بەردەوامی جیهاد و ئامادەکردنی گەل بۆ ئەو مەبەستە:

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لە وتارەکەیدا وتی: «هەر گەلێك جیهاد و قوربانی بە گیان واز لێ بهێنێت خوای گەورە سەرشۆڕیان دەکات بە سەرشۆڕی»[2]، ئەبو بەکر وانەی پەروەردەیی جیهادی لە پێغەمبەر و سەرکردەکەیەوە وەرگرت (ﷺ) بە کردەوە لە گۆڕەپانی جەنگی نێوان بێ باوەڕان و باوەڕداران، گومڕایان و ڕێنموونی کراوان، چاکە و خراپە، و پێشتر باسی هەڵوێستەکانی صدیقم کرد لە هەموو غەزاکانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ).

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) چاك لەو فەرموودەیەی پێشەواکەی (ﷺ) گەیشتبوو کە دەفەرمووێت: «إڑا تبايعتم بالمينه وأخڑتم اڑناب البقر، ورچيتم بالزرع، وتركتم الجهاد سلگ الله عليكم ڑلا لاينزعه حتى تراجعوا الى دينكم»[3].

واتا: ئەگەر خەریکی جۆرە کڕین و فرۆشتنێك و دەستتان گرتبوو دە کلکی وڵاخەکانتانەوە و بە کشتوکاڵ ڕازی بوون و جیهاد و خەباتی گیان فیداییتان وارز لێ هێنا خوا سەر شۆڕتان دەکات و لە سەرتان لای نابات تا نەگەڕێنەوە سەر ئایینەکەتان.

ئومەت دووچاری سەرشۆڕی دەبێت ئەگەر بە هەر بەهانەیەك جیهاد واز لێ بهێنێت، بەو شێوەیە صدیق (رضي الله عنه) جیهادی کرد بە یەکێك لە ڕاستیەکانی دەوڵەتەکەی[4]، بۆیە هەموو

[1] فقه الشورى والاستشارة (٤٤٢).
[2] البداية والنهاية (٣٠٥/٦).
[3] سنن ابي داود و صحيحه الالباني (رحمه الله).
[4] ابوبكر رجل الدولة (لا: ٧٣).

توانای گەلی موسوڵمانی خستە پێناوی بەردەوامی جیهاد، تا ستەم لەسەر ستەم لێکراوان هەڵبگیرێت و سەربەستی بگەڕێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی لە دەستیان چوو بوو، بە بانگەوازی خواوە هەموو سەر زەوی بگرێتەوە و هەموو بەربەستەکان و ئەو ڕێگەیەش لابدات.

٧- ڕاگەیاندنی جەنگ دژی بەدڕەوشتی:

لە وتارەکەیدا وتی: «بەدڕەوشتی لە هەر گەلێکدا بڵاوببێتەوە خوا دووچاری بەڵایان دەکات»[١]، صدیق لێرە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێنێتەوە یاد کە فەرموویەتی: «لم تظهر الفاحشة في قوم قط حتى يعلنوا بها، الافشا فيهم الطاعون والاوجاع التي لم تكن مضت في اسلافهم الذين مضوا»[٢].

واتا: بەدڕەوشتی لە هیچ گەلێکدا سەر دەرناهێنێت تا ئاشکرا نەکرێت و ئەو کاتە تاعون و کۆمەڵێك نەخۆشی تریان تێدا بڵاودەبێتەوە کە لە ناو ئومەتەکانی پێش ئەواندا نەبووە.

خراپەکاری — داوێن پیسی — نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی کوشندەیە و دەرمانی نیە، ڕێگایەکیشە بۆ توانەوە و لاوازکردنی کۆمەڵگە و هیچ شتێك بە پیرۆزی نامێنێتەوە، کۆمەڵگەی بەدڕەوشت غیرەتی تێدا نامێنێت و بێ ناموسی قبووڵ دەکەن و پێی ڕازی دەبن، کۆمەڵگەیەکی لاواز و بێ ئابڕوو و پڕ لە نەخۆشی و دەرد دایە، و حاڵی خەڵکیش لەو ڕۆژەدا باشترین شاهیدە.

ئەبو بەکر (ﷺ) مەبەستی بوو بەهای ئومەت و ڕەوشتی بەرزی بپارێزێت[٣]، لە سیاسەتەکانیدا زۆر بە دەم خاوێن ڕاگرتنی گەلی موسڵمانەوە بووە، دوورخستنەوەیان لە خراپەکاری چ بە نهێنی چ بە ئاشکرا، ئا بەو جۆرە مەبەستی بوو گەلێکی بەهێز بێنێتە کایەوە ئارەزووەکانی زاڵ نەبێت بە سەریدا و شەیتان گومڕایان نەکات، تا گەلێك بێت بەرهەم بدات و چاکە ببەخشێت و پیاوەتی بداتە هەموو کەس.

---

[١] البداية والنهاية (٦/٣٠٥).

[٢] صحيح الالباني (٣٧٥/٢) ژمارە ٤٠١٩ لە ئیبن ماجەدا.

[٣] ابوبكر رجل الدولة (لا: ٦٦).

پەیوەندی ڕەوشت بە بەرپاکردنی دەوڵەت و دەرکەوتنی شارستانیەوە زۆر ئاشکرایە، هەر کاتێك ڕەوشت تێك چوو، دەروونەکان پیس بوون، نەتەوەکان لە ناو دەچن، خراپە و لە ڕیشە دەرهاتن ڕۆوو لە هەموو لایەك دەکات.

ئەو کەسەی بە وردی لە ژیانی گەلانی پێشوو دەکۆڵێتەوە و بە چاوێکی وردەوە دەڕوانێتە شارستانیەتەکانی کۆن، بۆی دەردەکەوێت کە شارستانیەتەکان لەسەر بنەمای ڕەوشتی جوان و ڕاست و دروست بەرپابوون وەك شارستانیەتی سەردەمی داود و سولەیمان (علیهما السلام) و ئەوەشی لەسەر دەستی (ذي القرنين)دا هاتەدی و زۆرێك لە گەلانی تریش کە لەسەر بنەمای ڕەوشت و بەها بەرزەکان شارستانیەتیان پێکەوە ناوە... تا لەسەر ئەو بنەمایانە بوون بە هێز و بە پێز بوون، بەڵام هەر گەردی داوێن پیسی تێکەوت خۆی دایە دەستی شەیتانەکان، لە باتی بەخششی خوا بێ باوەڕیان نواند و خۆشیان و گەلەکەشیان لە ناو برد، هێزیان نەما و شارستانیەتیەکانیان لە ناو چوو[1].

بە ڕاستی ئەبو بەکر (﵁) لە سونەتی خوا باش حاڵی بوو لە دامەزراندنی شارستانیەتەکان ولە ناو چوونیان و تێگەیشت کە لەناوچوونی گەلان بە ڕابواردن و خراپەکاری و چەقینە ناو زۆنگاوی بەدڕەوشتیە لە ناوبەرەکان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَآ أَرَدۡنَآ أَن نُّهۡلِكَ قَرۡيَةً أَمَرۡنَا مُتۡرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيۡهَا ٱلۡقَوۡلُ فَدَمَّرۡنَٰهَا تَدۡمِيرٗا ١٦﴾ (الاسراء: ١٦).

واتا: هەر کاتێك بمانەوێت گەلێك لە ناو ببەین فەرمانمان دەدا بە سەریاندا و لە بەرامبەردا بە خراپە و بەدڕەوشتی هەڵسو کەوتیان دەکرد و ئێمەش لە ناومان دەبردن.

واتا: هەندێك فەرمانی شەرعیان دەدا بە سەریاندا وەك کردنی هەندێك کار و نەکردنی هەندێك کاری تر و ئەوانیش سەرپێچیان دەکرد و شایانی سزا دەبوون، لە یەکێك لە خوێندنەوەکاندا هاتووە کە بە میمی شەدەدار (أمّرنا) واتا کردمان بە سەرکردە و ژیانی خۆشمان بۆ ڕەخساندن و بوونی ماڵ و منداڵ و سامانی زۆر یەکێە لە هۆیەکانی سەر لێ تێکچوون بەڵام

[1] تاريخ الدعوة الاسلام (لا:٢٥٢).

ئەمە حالەتێکی دەروونیە و ئامادە نابێت خۆی بداتە دەستی پرۆگرام و بەرنامەی خوا، وە هەموو خۆش گوزەرانیە زیادە ڕەوی نیە[1].

ئەو سیاسەتەی ئەبو بەکر گرتیە بەر لە جەنگی دژی خراپەکاریدا، شایانی ئەوەی هەموو سەرکردەکانی ناو موسڵمانا چاوی لێ بکەن بە گژی داوێن پیسیدا بچنەوە، چونکە فەرمانڕەوای لە خواترسی و ڕەوشت بەرز ئەتوانێت گەل پەروەردە بکات لەسەر ڕەوشتی بەرز، ئەو کات گەلێك دێنێتە کایەوە تامی مرۆڤەکان بچەژێت و لە ناو دەمارەکانی لەشیدا خوێنی مرۆڤانە هاتوچۆ بکات.

بەڵام ئەگەر فەرمانڕەوا ڕەوشت بەرزی لێ سەنرابوویەوە و چووبووە ڕێزی گێل و گەمژەکان، ئەوە خراپە و بەدڕەوشتی لە ناو گەلەکەیدا بڵاو دەکاتەوە و بگرە پارێزگاریشی لێ دەکات بە هێزی دەسەڵات و یاسا!، وە هەڵدەستێت بە دژایەتی کردنی ڕەوشت بەرزی و بەها بەرزەکانی گەلەکەی بەرەو زۆنگاوی داوێن پیسی دەبات، وەك ئاژەڵێکی ون بوویان لێ دەکات و دەبن بە ئاژەڵێکی بێ شوان کە بەس ئەلەوەڕێن و هیچی تر نازانن و بەس خۆیان قەڵەو و جوان و ڕازاوە ئەکەن.

ئیتر پاش ئەوە دەبنە کۆڵەبنە – أقزام – و خواحافیزی لە پیاوەتی و ناوداری دەکەن[2]، ئەو کاتە فەرموودەی خوایان تیا دێتە دی کە دەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾﴾ (النحل: ١١٢)، واتا: خوا نموونەی گەلێکتان بۆ باس دەکات کە پڕ لە ئاشتی و دڵنیایی بوو.. لە هەموو لایەکەوە ڕۆزیان بۆ دەهات، بەڵام لە بەرامبەر ئەو هەموو نیعمەتانە بێباوەڕیان نواند و خوایش کەوڵی ترس و برسیەتی کردە بەریان لە ئەنجامی کاری خۆیان.

---

[1] منهج كتاب التأريخ الاسلامي محمد صامل (٦٥).
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٥٣).

ئەمە هەندێك بوو لەو خاڵانەی كە خوای گەورە خستیە بەر چاومان و ئێمەش ڕوونمان كردەوە لە وتارەكەی صدیقدا كە لەبەر دەم ئومەتی موسڵماندا پێشكەشی كرد و تیایدا سیاسەتی دەوڵەتی دارشت، بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوایی دیاری كرد و پەیوەندی نێوان ئەو بە گەلەكەیەوە و هەندێ خاڵی تریش لەو بنەما گرنگانەی كە بینای دەوڵەت و پەروەردەكردنی گەلانی لەسەر دادەمەزرێت، ئا بەم جۆرە خەلافەتی ئیسلامی هاتە كایەوە، پێناسەی فەرمانڕەوایی بە شێوەیەكی زانستیانە دیاری كرا، سوور بوونی ئومەت لەسەر دانانی خەلیفە و هەڵبژاردنی بەو شێوەیە و پەلە كردنی خەڵكی بۆ ڕەزامەندی دەربڕین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەلماندیان كە ئەو یاسا و بەرنامەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هێنایە كایەوە دەبێت بەردەوام بێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) با لە دونیایش دەرچووبێت خۆ ئایینێك و قورئانێكی بەجێهێشتووە تا لەسەر ڕێنمویەكانی برۆن، ڕازی بوونی خەڵكی لەو ڕۆژەدا مانای ئەوەی دەگەیاند كە دەیانەوێت بەردەوام بن لەو پڕۆگرامەی پێغەمبەری خوای لەسەر بووە (ﷺ).[1]

موسڵمانان ماوەیەكی كەم شادومان بوون بەو حكومەتەی صدیق (رضي الله عنه) و دوو ساڵ و شتێك بوو، ئەبو بەكر سنووری دەسەڵاتی خەلیفەی لە وتارەكەیدا دیاری كرد، وتارێك لەسەر ئاستی هەموو ڕژێمەكانی حوكمڕانی ئەو سەردەمە و ئەمڕۆش جوانترین بوو، حكومەتێكی ڕاوێژكاری بوو، بە شێوەیەكی كەم هەڵدەكەوێت خوازیارانی سەربەستی و دادپەروەری لە هیچ سەردەمێكدا باشتر بن لەو حكومەتە[2].

سەركردەكەشی قوتابیەكی زیرەك و زانا و نەجیبی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو كە خاوەنی گەورەترین باوەڕ بوو ئەویش ئەبو بەكر (رضي الله عنه)بوو.

تا ڕادەیەك ئیمام مالك ئەوەی ڕوون كردۆتەوە كە هیچ كەس بە ئیمام ناژمێردرێت تا ئەو مەرجانە لە خۆ نەگرێت كە ئەبو بەكری صدیق لە دوو توێی وتارەكەیدا دیاری كرد.

**دووەم: بەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆ:**

---

[1] دراسات في الحضارة الاسلامية، احمد ابراهيم الشريف (لا: ٢١٠-٢١٩).
[2] اشهر مشهير الاسلام في الحرب والسياسة (لا: ١٢٠).

ئەبو بەکر (ﷺ) ویستی ئەو سیاسەتانەی کە بۆ دەوڵەتەکەی کێشابووی جێبەجێی بکات، بۆیە لە هاوەڵە بەڕێزەکان کۆمەکی یاریدەدەری بۆ خۆی هەڵبژارد تا هاوکاری بن لە ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکاندا، بۆ ئەو مەبەستە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی (ﷺ) کرد بە (وەزیری دارایی) وە لەبەر ئەوەی بە دەست پاکی ئومەتی ئیسلام ناسرابوو کاری (بيت المال)ی دایە دەست، و عومەری کوڕی خەتابیشی کرد بە دادوەر، واتا (وەزیری داد) وە خۆیشی لە ناو کاری دادگا کاری دەکرد.

زەیدی کوڕی ثابتی (ﷺ) کرد بە نووسەر واتا (وەزیری پۆستە و گەیاندن)[1]. هەندێ جاریش نامە و نووسراوەکانی هەندێ لە هاوەڵانی تریش پێی هەڵدەستان وەك عەلی کوڕی ئەبو تالیب (ﷺ) و عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ).

هاوەڵانی نازناوی جێنشینی پێغەمبەری خوایان لێنا و ویستیان یەکلایی بکەنەوە بۆ ئیش و کاری دەوڵەت و خەلافەت، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوێکی بازرگان بوو هەموو بەیانیەك بە مەبەستی کڕین و فرۆشتن خۆی دەگەیاندە بازاڕ، کاتێك بە خەلیفە هەڵبژێردرا هەر وەك جاران قوماشی گرت بەسەر شانیەوە و بەرەو بازاڕکەوتە ڕێ تا بیفرۆشێت، لە ڕێگا عومەر و ئەبو عوبەیدەی پێ گەیشت و لێیان پرسی بۆ کوێ دەچیت؟ تۆ کە بویتە ئەمیری موسڵمانان؟ وتی: ئەی بە چیماڵ و منداڵم بژێنم؟ وتیان: وەرە لەگەڵمان تا ڕۆژانەیەکت بۆ ببڕینەوە، ئەویش لەگەڵیان ڕۆیشت و ڕۆژی نیو حەیوانیان بۆ دیاری کرد[2].

لە کتێبی (الرياض النضرة)دا هاتووە کە ساڵانەیان بۆ بڕیەوە خۆی دەدا لە (٢٥٠) دینار لە ساڵێکدا، و لەگەڵ سەر و پێ یەکدا، و ئەمەش بژێوی ژیانی بەڕێوە نەدەبرد، وتیان: هەرچی هەبوو هەمووی بەخشیبووە بەیتول مال.

ئەبوبەکر خۆی گەیاندە لای بەقیع و مامەڵەیەکی دەکرد و عمر (ﷺ) هات دەبینێ کۆمەڵێ ژن دانیشتوون، ووتی: بۆچی دانیشتوون؟ وتیان: هاتووین بۆ لای خەلیفە تا حوکممان بکات، عمریش خۆی گەیاندە بازاڕ و دەستی ئەبوبەکری گرت ووتی: (وەرە بۆ ئێرە) ئەویش

---

[1] في التأريخ الاسلامي، ابو خليل (لا: ٢١٨).
[2] الرياض النضرة في مناقب العشرة (لا: ٢٩١).

ووتی پێویستم بە ئەمیری کردنی ئێوە نیە[1] شتێکیان بۆ بڕیومەتەوە نە بەشی خۆم و نە بەشی ماڵ و منداڵە کەشم دەکات. عمر ووتی: بۆت زیاد بکەین، ئەبوبەکر ووتی: ساڵانەکەم بۆ بکەن بە (٣٠٠) دینار و مەڕێکی تەواو، عمر ووتی: ناتوانم ئەمە بکەم، لەوکاتەدا علی (ﷺ) هات و بەو شێوەیە بینینی بە عمری ووت: بۆی تەواو بکە، عمر ووتی: تۆ بەباشی دەزانیت؟ ووتی: بەڵێ عمر ووتی: بۆمان تەواوکردی[2].

ئەبوبەکریش ڕۆشتە سەر مینبەر و خەڵکیش لێ ی کۆبوونەوە و ڕووی تێ کردن و پێ ی ووتن (ئەی خەڵکینە من موچەکەم (٢٥٠) دینار و سەر و پێ یەکی ڕۆژانەیە بەڵام عمر و علی (خوایان لێ ڕازی بێت) بۆیان زیاد کردم بۆ (٣٠٠) دینا رو مەڕێکی تەواو ئایا ئێوە بەمە ڕازین؟ کۆچەریانیش ووتیان: خوایە شاهیدبە هەموو ڕازی بووین[3].

ئا بەم شێوەیە هاوەڵان تێگەیشتنێکی بەرزیان هەبوو سەبارەت بە سپاردەی حوکمڕانی و سەر گەورەیی ئاین، ئەوان مووچە بۆ سەرۆکەکەیان دیاری دەکەن تاخۆی بۆ مەسەلەی خەلافەت یەکلایی بکاتەوە و چونکە ئەمیر لە کات و فیکر و هەوڵی دەگرێت، ئێ پاشانیش مانایەکی گەورە و جوان بە ئیسلام دەدات کە تیایدا کاروباری دارایی لە کاروباری خەلافەت بە جیا دەگرن.

ئەم مانایەی خەلافەت حوکمڕانی ڕۆژئاوا لەم دواییانەدا پێی گەیشت، چونکە ماوەیەکی دوور و درێژ لە پێناو دروشمی (ئەوەی بۆ قەیسەرە هی قەیسەرە) دەجەنگان و خوێنیان دەڕشت و هەردەم شەکاوە بوو ئەم ئالآیە، ئەم مانایە پڕاوپڕ لە وتەیەکی لویسی پازدەهەمدا دەردەکەوێتکە بە تەواوی دارایی خستبووە گەردن و خزمەتی دەوڵەت و سەرۆکەکەیەوە و دەڵێت: «من دەوڵەتم و دەوڵەتیش منە»! ئەم لویسە بازرگانێکی زۆر ناودار بووە و لەسەر ژیانی بژێوی گەلەکەی خۆی دەوڵەمەند دەکرد و گەلی داماویش لە برساندا لاکەی

[1] الرياض النضرة في مناقب العشرة (لا: ٢٩١).
[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەهات و کەسیش ئەمەی بە شورەیی سەیر نەدەکرد... ئیّ وایە، ئەی ئەو ڕەگی دارە و گەلیش چڵ و پۆپ؟![1]

ئەمڕۆ مرۆڤایەتی لە چ ئاستێکدایە لە چاو ئەو هاوەڵە شیرینانەدا (خوا لێیان ڕازی بێت) دوای ئەوان خەزێنە کەوتە دەستی کەسانێك بە ئارەزووی خۆیان خەرجیان دەکرد، بڕژێنە و بڕژێنە سەرفیان دەکرد، هەروەك بودجەی تایبەتی لە ڕادەبەدەریان دەخرێتە بەر دەست، لە سەرووی ئەمانەشەوە بەلێشاو پارە دەنێرن بۆ بانکەکانی دەرەوەی وڵاتەکەیان، تا وای لێهاتووە ئەو دەوڵەتە بێگانانە لەسەر ئەم پارانە دەژین و کاسپی پێوە دەکەن، زۆربەی زۆری خاوەنەکانیان فەرمانڕەوا و بەرپرسانی وڵاتە ژێردەستە و هەژارەکانن، هەرچەندە دەرکەوتووە هیچ سوودێك لەم سامانە نابینن و با دە ئەوەندەی تر زۆرتر بێت بەشیان ناکات و سوودی نیە بۆ خاوەنەکەی شای ئێران لەگەڵ زەبەلاحی سامانەکەیدا لە بانکەکانی جیهان پارچەیەك زەوی نەبوو بیگرێتە ئەستۆ ئەمە لە دونیا، لە قیامەتدا مەسەلەکە زۆر سەخت تر و لێپرسینەوە گەورەترە[2].

لەسەر فەرمانڕەواکانی موسوڵمانان پێویستە چاو لە ئەم هاوەڵە مەزنە بکات (رضي الله عنه) کە توانی دەوڵەتی ئیسلام پاش کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگرێت و بەڕێوەی بەرێت، چەند جوانە وتەکەی کە دەڵێت: «گەلەکەم باش دەزانن کە من کاسبیەکی وام هەبوو نەمهێشتووە ماڵ و منداڵەکەم ڕووت و ڕەجاڵ بن، بەڵام من خەریك کراوم بە ئیش و کاری موسوڵمانانەوە، خانەوادەی ئەبو بەکر ناچارن لەم ماڵەی دەوڵەتەدا مووچەیان هەبێت و من بۆ موسوڵمانان کار دەکەم»[3].

بەڕاستی وتەی صدیق (رضي الله عنه) کۆمەڵێك مانای قەشەنگ دەدات بە دەستەوە، لە ئیسلامدا بەرپرسیارێتی دەسکەوت نیە، ئەو بڕەپارەیەشی وەك مانگانە بۆی دەبڕنەوە لە باتی ئەوەیە کە خۆی یەکلایی بکاتەوە بۆ کاروباری دەوڵەت و دەستی لە هەموو کاسبیەك دەپچڕێت[4].

---

[1] ابوبكر رجل الدولة (لا: ٣٥).
[2] التأريخ الاسلامي، محمود شاكر (لا:١١).
[3] البخاري كتاب البيوع، باب كسب الرجل وعمله (ژمارە: ٢٠٧٠).
[4] ابوبكر رجل الدولة (لا: ٣٥).

بە ڕاستی صدیق (ﷺ) و هاوەڵانی بەڕێز (خوایان لێ ڕازی بێت) توانیان لاپەڕەیەکی پڕشنگدار بە ناو چاوی مێژووەوە بنووسن، کە مرۆڤایەتی لە ئەوپەڕی پێشکەوتنیدا ئەیەوێت بگات پێیان کەچی لە خۆی دەبینێتەوە کە لەبەر پێیاندا بە دەما کەوتووە[1].

ئەبو بەکر (ﷺ)بەوپەڕی توانا هەوڵی دا کۆشکی دەوڵەتی ئیسلامی ڕابگرێت و گرنگی دەدا بە پتەوکردنی ڕیزەکانی ناوخۆ، هیچ کەلێنێك یان کونێکی نەهێشتەوە کە لێیەوە بتوانرێت کار لە ڕمانی ئەو کۆشکە مەزنە بکرێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایمەزراند، و گرنگی بە میللەت دەدا و لەم ڕوانگەیەشەوە نموونە زۆرە، گرنگی تایبەتی بە دادگا و دادپەروەری داوە، چاودێری و بەدواداچوونی ئەمیری ناوچەکانی هەبووە، لەسەر پرۆگرامی پێغەمبەر (ﷺ) لای نەدا لە هیچ هەنگاوێکدا، ئەمەش هەندێکە لەو سیاسەتە سەرکەوتوانەیەی:

**١- ئەبو بەکر لەناو کۆمەڵگەدا:**

صدیق (ﷺ) لەناو موسوڵماناندا دەژیا وەك خەلیفە و هیچ هەلێکی لە دەست نەدەدا و هیچ ڕۆژێك بە سەریدا تێنەدەپەڕی کە شتێك فێری خەڵکی نەکات و فەرمان بە چاکە نەدات و ڕێگری لە خراپە نەکات و هەڵوێستەکانی تیشك و ڕووناکی دەدا بە میللەتەکەی و ڕینموونی و باوەڕ و ڕەوشتیان زیادی دەکرد، لەو هەڵوێستانەدا:

أ- مەڕ دۆشینەکانی، پیرەژنە کوێرەکە، سەردانی (ام ایمن):

پێش ئەوەی ببێتە خەلیفەی موسوڵمانان مەڕی گەڕەکەکەی خۆیانی دەدۆشی، هەر کە بە جێنشینی پێغەمبەری هەڵبژێردرا، ژنێکی گەڕەك وتی: لە ئیستەوە ئیتر مەڕەکانمان بۆ نادۆشێت، ئەبو بەکر بیستیەوە و وتی: بە تەمەنم بۆتان دەدۆشم هیوادارم ئەم کارە نوێیەی دراوە بە سەرمدا لەو ڕەوشتانەم نەخات کە جاران لەسەری بووم، هەر بۆی دەدۆشین هەر لە دوورەوە پێی دەوتن: (بیدەمە بەری یان لاییەم لە بەری)؟ و بۆ ماوەی شەش مانگ لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو لە سونەح مایەوە و پاشان بەماڵەوە باریان کرد بۆ مەدینە[2].

---

[1] هەمان سەرچاوە (لا:٣٦).
[2] ابن سعد في الطبقات (١٨٣/٣) و لة شاهد، فاسناده حسن الفيرة.

لەم هەواڵەدا شتێك لە ڕەوشتی ئەبو بەكر دەردەخات، ئەوەش خۆ بە بچووك زانینی گەورەی پیاوێكی گەورەیە، لە تەمەندا گەورە، لە پلە و مەقامدا گەورە، كە خەلیفەی موسوڵمانان بوو، و زۆر هەوڵی دەدا كە ڕەوشتە جوانەكانی پێشووی هەر بەردەوام بێت، ئیتر با كاتیشی لێ بگرێت و ئەو زۆر پێویستی بەو كاتەش هەبێت، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هاوەڵان زۆر بە پەرۆش بوون بۆ كۆكردنەوەی چاكە ئیتر با لە كۆشش و كاریشیان بگرێت[1].

ئەمەیە ئەبو بەكر (ﷺ) بە گوڕ و تینێكی ڕاستگۆیانە و بە ڕاوەستاویەكی سەیرەوە كەنداوی عەرەبی ژێر بار خست، خستیە خزمەت ئاینی پاكی ئیسلامەوە، پاشان خستیە ڕێ و ئامادەی كرد بۆ جەنگاندن دژی دوو دەوڵەتە زلهێزەكەی سەر زەوی ئەو سەردەمە، و سەركەوتیش بەسەریاندا.

ئەبو بەكر... مەڕی دەدۆشی بۆ ژنانی گەڕەك، و دەیوت: هیوادارم ئەم كارەی وەرم گرتووە لە كارە خێریەكانم نەكات كە جاران لە سەری بووم، خۆ ئەو كارەی درابوو بە سەریدا كارێكی ئاسان نەبوو، بەڵكو جێنشینی كردنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، سەر گەورەیی كردنی هەموو عەرەبە، سەركردایەتی كردنی ئەو سوپایەیە كە ڕۆیشتووە فارس لە مل هوڕی بخات و پۆرتی دەوڵەتی ڕۆم بشكێنێت و لە جێگەیاندا دەوڵەتی قانوون و دادپەروەری دابمەزرێنێت، دەوڵەتی زانست و شارستانیەت، كەچی هیوا دەخوازێت ئەم كارە گەورەیە لە كارە چاكەكانی جارانی نەخات و هەروەك ئەوسا مەڕی ژنانی گەڕەك بدۆشێت[2]!

لە بەروبوومەكانی باوەڕ بە خوای گەورە كۆمەڵێك ڕەوشتی بەرزە، كە خۆ بە بچووك زانین بێ فیزی یەكێكە لەوانە كە لە ئەبو بەكردا جێگیر بوو لەم هەڵوێستە و لە چەندان هەڵوێستی تریدا، كاتێك لغاوی حوشترەكەی لە دەست كەوتە سەر زەوی دادەبەزی خۆی هەڵی دەگرتەوە و كاتێك پێیان وت: پێمان بڵێ خۆمان ئەیدەینەوە بە دەستت، ئەویش لە وەڵامدا دەیووت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ كردووین كە داوای هیچ لە كەس نەكەین[3].

[1] التأريخ الاسلامي (٨/١٩).
[2] ابو بكر الصديق (ﷺ) طنطاوي (١٨٦).
[3] التأريخ الاسلامي، محمود شاكر(لا: ٨).

صدیق (رضي الله عنه) نموونەیەکی زیندووی جێ بە جێ کەرد و تێگەیشتوو بوو لە ئایەتی خوای گەورە دەربارەی خاکی بوونی و بێ فیزی کە دەفەرموویێت: ﴿فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِي ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾﴾ (القصص: ٤٠).

واتا: فیرعەون و سەربازەکانیمان هەوادایە ناو دەریاوە و سەیر کە ئاکامی ستەمکاری چیە؟

وە لە فەرموودەی سەردارەکەی (ﷺ) کە دەفەرمویێت: «مانقصت صدقة من مال، وما زاد الله عبداً بعفو الاعزا، وما تواضع احد لله الا رفعه الله».

واتا: ماڵ و سامان بە خێر و زەکات کەم ناکات، خوای گەورەش ئەو بەندەیە سەر بەرز دەکات کە لێبووردەیە، هەر کەسێکیش لەبەر خوا خۆی بە کەم بزانێت خوا بەرز و بڵندی دەکاتەوە.

ئەم ڕەوشتە بەرزە وای لێ کردبوو خزمەتی موسوڵمانانی دەکرد بە تایبەتی ئەوانەی لاواز بوون و پێویستیان پێی هەبوو، لە ئەبی صالحە غەفاریەوە دەگێڕنەوە کە دەیووت: عومەری کوڕی خەتتاب هاتوچۆی ژنێکی پیری نابینای دەکرد لە شەودا و هەمیشە کاری بۆ دەکرد، کەچی هەر کاتێك دەڕۆیشت دەبینێت کەسێکی تر پێش ئەو ئیشەکەی بۆ کردووە! چەند جارێکی تریش هاتەوە هەر وا بوو، بۆیە بڕیاری دا کە لە دوورەوە چاودێری بکات تا بزانێت کێیە ئەو کەسە، کاتێك سەیری کرد دەبینێت ئەبو بەکری صدیقە (رضي الله عنه) و لەو کاتەشدا خەلیفەی موسوڵمانان بوو[1].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: «پاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە عومەری وت: با بڕۆین سەرێك لە (ام ایمن) بدەین وەك ئەوسا کە پێغەمبەری خوا سەری لێ دەدا، هەر کە چووین بۆ لای دەستی بە گریان کرد، پێیان وت: بۆچی دەگریت؟ خۆ پێغەمبەر لە لای خوای باشتر بوو بۆی تا ئێرە، ئەویش وتی: بۆ ئەوە ناگریم

[1] ابو بکر الصدیق – طنطاوي (لا: ٢٩).

که ئەوەی لای خوایە باشتر نیە بۆ پێغەمبەرەکەی، بەڵام بۆ ئەوە دەگریم پردی پەیوەندیمان بە ئاسمانەوە نیگا بوو پچڕا، ئەوانیشی کردە پڕمەی گریانو لەگەڵیدا دەستیان کرد بە گریان»[1].

ب- ئامۆژگاریکردنی بۆ ئەو ئافرەتەی بڕیاری دابوو قسە لەگەڵ کەس نەکات:

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) کاری سەردەمی نەفامی و شت هێنان و زیادکردنی ئایینی بنەبڕکرد، بانگەشەی دەکرد بۆ کاری ئیسلامی و دەست گرتن بە سونەتەوە[2].

لە قەیسی کوڕی حازمەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە ئەبو بەکر (ﷺ) چوو بۆ جێگەیەك ئافرەتێکی ئەحمسی لێ بوو ناوی زەینەب بوو، دەبینێت قسە ناکات، ئەبو بەکر وتی: ئەوە بۆچی قسە ناکەیت؟ وتیان نیەتی هێناوە حەجێکی بێدەنگ بکات، ئەویش وتی: قسە بکە، ئەمە لە ئیسلامدا دروست نیە، ئەمە لە ڕەوشتی سەردەمی نەفامیە، دەڵێ: دەستی کرد بە قسەکردن و وتی: تۆ کێی؟ وتی: من یەکێکم لە کۆچەریەکان، وتی: کامتان لە کۆچەریەکان؟ وتی: لە قورەیش، وتی: تۆ کێی لە قورەیش؟ ئەبو بەکر وتی ئاه کە پرسیار ئەکەی: من ئەبو بەکرم، ئەویش وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا تا کەی لەسەر ئەم ڕەوشت و ڕێنمونیە جوانانە دەمێنیت کە خوای گەورە دوای سەردەمی نەفامی بۆی هێناوێت؟ وتی: لەسەری دەمێنمەوە تا گەورە و سەرکردەکانتان لەسەری بەردەوام بن، ژنەکە وتی: گەورە و سەرکردە کێن؟ وتی: بۆ ئێوە لە ناو هۆزەکانتان گەورە و سەرکردەتان نەبووە فەرمان دەرکەن و ئێوەش بە گوێیان بکەن. وتی: بەڵێ، وتی: ئێ ئەوانەن بەسەر خەڵکەوە[3].

خەتتابی دەڵێت: لە شێوازێکی حەجی سەردەمی نەفامی بێ دەنگی بوو، کە هەیان بوو شەو و ڕۆژێك بەبێ دەنگی دەمایەوە، وازیان پێ هێنرا، فەرمانیان پێ درا قسەی چاك بکەن، هەندێك لە زانایان ئەمە بە بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك قەراری دا – نذر – کە قسە نەکات ئەتوانێت قەراردانەکەی بشکێنێت و کەفارەتەکەیشی نەدات چونکە دانەمەزراوە، ئەوەتا ئەبو بەکر داوای کەفارەتەکەی لێ نەکرد، چونکە ئەبو بەکر وتی: دروست

[1] مسلم فضائل الصحابة (ژمارە: ٢٤٥٤).
[2] صحيح التوفيق في سيرة حياة الصديق (لا: ١٤٠).
[3] البخاري ٣٨٣٤.

نیە ئەو قەراردادەیە — نذر — و لە کردەوەی سەردەمی نەفامیە و ئیسلام ئەوەی ڕماندووە، ئەمەش لە خۆیەوە نالێت بەڵکو دیارە لە پێغەمبەری خوای بیستووە (ﷺ) دەچێتە خانەی — فەرموودەوە[1] ...

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو فەرموودانەی باسی چاکی بێدەنگی دەکەن لەگەڵ ئەمەدا پێچەوانە نین چونکە دوو مەبەستی جیان، ئەو بێدەنگیەی کە دروستە ئەوەیە لە قسەی ناڕەوا و پڕ و پووچ بێدەنگ بیت بەڵام لە کاتی وتنی شتی هەق بێ دەنگی قەدەغە کراوە و لە شتی ئەو نێوانەدا ئارەزووی خۆیەتی و خوا باشتریشی لێ دەزانێت[2].

ج- گرنگی دانی بە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە:

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) فەرمانی بە چاکە دەدا و بەرگری لە خراپە دەکرد و ئەو شتانەشی ڕوون دەکردەوە کە لێی تێنەدەگەیشتن، قەیسی کوڕی ئەبی حازم دەڵێت: بیستم لە ئەبو بەکری صدیقەوە دەیووت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ﴾ (المائدة:١٠٥)، واتا: ئەی باوەڕداران ئاگاتان لە خۆتان بێت و هەموو ئەوانەی گومڕا دەبن زەرەر بە ئێوە ناگات. لەسەر ئەم ئایەتە دەڵێت: «من لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: «ان القوم اذا رأوا المنكر فلم يغيروه عمهم الله بعقاب»، واتا: ئەگەر هەر هۆزێك خراپەیەك لە ناویان بکرێت و بەرگری لێ نەکەن ئەوە خوا بە گشتی سزایان بۆ دەنێرێت، لە ڕیوایەتێکی تردا: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە بەڵام خۆی مانای ناکەن و ئێمە لە پێغەمبەرەوە بیستوومانە کە دەفەرمووێت: «ان الناس اذا رأوا الظالم فلم يأخذوا على يديه، أوشك ان يعمهم الله بعقاب»[3]، واتا: خەڵکی ئەگەر ستەمکار ببینن و بەرگری نەکەن ئەوا خوا بە گشتی سزایان بۆ دەنێرێت».

[1] فتح الباري (٧/١٥٠).
[2] هەمان سەرچاوە (٧/١٥١).
[3] حديث صحيح سنن ابي داود ژمارە ٤٣٣٨.

ئەوەی دەڵێت: بەڵام مانای ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡ﴾ پێچەوانە نیە لەگەڵ فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ڕێەڕوی ڕاست لای لێکۆڵەرەوانی زانست ئەوەیە کە «ئەگەر ئێوە بەو شێوەیەتان کرد کە فەرمانتان پێدراوە و کەمتەرخەمیتان نەکرد، ئەوە کەمتەرخەمی کەسانی تر زیانی نیە بۆ ئێوە و نموونەشی بەم ئایەتە هێنایەوە ﴿ولا تَزِرُ وازِرَةٌ وِزرَ أخرى﴾، واتا: کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، و ئەگەر وا بێت و هەرچی دراوە بە سەریدا لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە ئەگەر کردی و بەرامبەرەکەی نەیکرد لۆمە و سەرزەنشت ئەوی ترە و ئەو ئەرکەی سەر شانی جێبەجێ کردووە»[1].

زۆر سوور بووە لەسەر ئەوەی کە خەڵکی لەسەر ڕاستی بن و ڕاستی کردوونەتەوە و مەیمونی کوڕی مەهران دەڵێت: پیاوێك هات و سڵاوی لە ئەبو بەکر کرد و وتی: سڵاوت لێ بێت ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا، ئەبو بەکر پێی وت: لەناو ئەم هەموو خەڵکەدا — بەس لە من — لە هەمووان بێت[2]، جاری وا هەبوو وازی لە سونەتێك هێناوە لە ترسی ئەوەی خەڵکانی نەشارەزا وا بزانن واجبە، لە حوزەیفەی کوڕی ئوسەید (ﷺ)دەگێڕنەوە دەڵێت: ئەبو بەکر و عومەرم بینیوە قوربانیان سەر نەبڕیوە، لە ترسی ئەوەی نەبادا چاویان لێ بکرێت — هەموو ساڵێك — و لە ڕیوایەتێکدا نەوەك ببێت بە سونەت[3].

زۆر جار ئامۆژگاری عبدالرحمنی کوڕی دەکرد کە تا بۆی دەکرێت لەگەڵ دراوسێکانیدا چاك بێت، جارێکیان لەگەڵ دراوسێیەکەی دەمی تێك گیرا بوو ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: دژایەتی و ناکۆکی لەگەڵ دراوسێکەتدا نەکەیت چونکە خەڵکی ئەڕۆن بەڵام ئەوان ئەمێننەوە[4].

---

[1] عون المعبود سرح سنن ابي داود (٣٢٩/١١).
[2] الجامع الاخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب (١٧٢/١) ژماره ٢٥٥.
[3] اسناده صحيح اخرجه الطبراني في الكبير ژمارة ٣٠٥٧.
[4] الزهد لإبن مبارك (٥٥١/١).

لەگەڵ باوکیدا زۆر چاك بووە، کاتێك چوو بۆ عەمرە لە ساڵی دوانزەی کۆچیدا گەیشتە مەککە و ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی ئەبو قوحافەی باوکی لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجدا لەبەر دەرگاکەدا دانیشتبوو پێیان وت: ئەمە کوڕەکەتە وا هات، هەستایە سەر پێ، ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) بە پەلە لە حوشترەکەی دابەزی و حوشترەکەی نیشاند و بە پەلە بۆ لای باوکی چوو تا بگاتە خزمەت باوکی و لەوێ خەڵکانی تریش دەهاتن سڵاویان لێ دەکرد.

ئەبو قوحافەی باوکی پێی وت: ئەی عەتیق، ئەو مەردمە تا بۆت دەکرێت چاك بە لەگەڵیاندا، ئەبو بەکر وتی: باوکە گیان — لاحول ولا قوه الا بالله — کارێکی زۆر گەورەم هەڵگرتووە توانام بە سەریا ناشکێت مەگەر بە یارمەتی خوا[1].

زۆر گرنگی بە نوێژ دەدا و بە خشوعەوە نوێژی دەکرد و سوور بوو لەسەر ئەوەی بەندایەتیەکان جوان ئەنجام بدات و لە نوێژدا هەرگیز ئاوڕی نەداوەتەوە[2]، تەنانەت مەککیەکان دەیان وت: (ابن جریج) لە (عەتا) وە نوێژی وەرگرتووە و ئەویش لە (ابن الزبیر) و ئەویش لە (ابو بکر)ەوە و ئەبو بەکریش لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم).

عبدالرزاق دەڵێت: هەرگیز کەسم نەبینیوە وەك ئیبن جورەیج جوان نوێژ بکات.[3]

لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: «ئەبو بەکر نوێژی بەیانی کرد بۆ خەڵکی و لەو دوو رکاتەدا سوڕەتی (البقرە)ی خوێند،و کاتی ڕۆیشتنەوە عومەر پێی وت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا لێ نەبوویتەوە تا خۆرمان دی هەڵهات، ئەویش وتی: ئەگەر سەری دەرهێنا دەمانبینێت کە لە ڕیزی بێ ئاگاییدا نین».[4]

هەردەم هانی خەڵکی دەدا لەسەر نارەحەتی و نەهامەتیەکان ئارام بگرن و خۆگر بن و بەو پیاوەی وت کە منداڵی مردبوو: «لیس مع العزاء مصیبة، ولا مع الجزع فائدة، الموت اهون مما قبله واشد مما بعده، اذکروا فقد رسول الله (صلى الله عليه وسلم) تصغر مصیبتکم، وعظم الله

---

[1] صفة الصفوة (١/٢٥٨).
[2] فضائل الصحابة للامام احمد (١/٢٥٤).
[3] **هەمان سەرچاوە (١/٢٥٥).**
[4] الریاض النضرة في المناقب العشرة (لا: ٢٤٤).

اجرکم»[1]، لەگەڵ سەرخۆشی کردندا نەهامەتیەکە نامێنێت، لەگەڵ ناشکوری و نارەزاییدا پاداشت نامێنێت و مردن ئاسانترە لەو شتانەی پێش خۆی و نارەحەت ترە بۆ ئەو شتانەی دوای خۆی، یادی لە دەست چوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەن کارەساتی لە دەست چووەکان لە لا بچووك دەبێتەوە.

عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بە پیاوێکی وت منداڵەکەی مردبوو «عوضك الله منه کما عوضك منك»[2].

زۆر خەڵکی دەترساند لە ستەمکردن و پەیمان شکاندن و تەڵەکەبازی و دەیووت: «ثلاث من کن فیه کن علیه، البغي والنکث والمنکر»[3]، واتا: سێ شت لە هەر کەسدا هەبن دژی دەبن: سەرکەشی و پەیمان شکێنی و تەڵەکەبازی.

ئامۆژگاری خەڵکی دەکردو خوای بیر دەخستنەوە و لە ئامۆژگاریەکانی:-

«الظلمات خمس والسرج خمس: حب الدنیا ظلمة والسراج له التقوی، والذنب ظلمة والسراج له التوبة، والقبر ظلمة والسراج له لا اله الا الله، والاخرة ظلمة والسراج لها العمل الصالح، والصراط ظلمة والسراج لهااليقين»[4]

تاریکاییەکان پێنجن وچراکانیش پێنج ،خۆشویستنی دنیا تاریکیەو چراکەی لە خواترسانە ، وتاوان تاریکییەو تەوبەکردن چراکەیەتی ،وگۆڕ تاریکیەو ولااله الا الله رووناکەرەوەیەتی ،، ئاخیرەت تاریکیەو کردەوەی چاك چراکەیەتی ، سیرات تاریکیەو بێ گومانی چراکەیەتی .

لە رێگەی مینبەر و وتارەکانی هەینی یەوە هانی خەڵکی دەدا بۆ ڕاستگۆیی و شەرم کردن و پەند وەرگرتن و خۆسازدان بۆ ڕۆژی گەڕانەوە بۆ لای خوا و خۆ دوور گرتن لە لەخۆبایی بوون.

لە ئەوسەتی کوڕی ئیسماعیلەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: بیستم لە ئەبو بەکری صدیقەوە کە وتاری دەدا پاش ساڵێك بەسەر وەفاتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەیوت: پار ساڵ ئەم کاتانە

[1] عیون الاخبار (٦٢/٣).
[2] **هەمان سەرچاوە(٦٢/٣).**
[3] مجمع الامثال للمیداني (٤٥٠/٢).
[4] فوائد الکلام للخلفاء الکرام، قاسم عاشور (لا: ٢٩).

پێغەمبەری خوا لەم جێگەیەی مندا بوو، پاشان دایە پرمەی گریان. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێت: چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسك و قسەی بۆ نەدەهات، پاشان وتی: ئەی خەڵکینە داوای لەش ساغی و بێ وەیی لە خوا بکەن، هیچ کەسێك پاش باوەڕی یەقین هیچ شتێکی پێ نەبەخشراوە باشتر لە بێ وەیی (العافیە)، ڕاستگۆ بن چونکە لەگەڵ چاکە کاریدا لە بەهەشت دان، درۆزن مەبن چونکە درۆزن لەگەڵ خراپەکاریدا لە ناو ئاگری دۆزەخ دان، پێ لە یەکتر مەبڕن، چاڵ بۆ یەکتر هەڵ مەکەنن، کێشەبازی مەکەن، حەسوودی بە یەك مەبەن، ببن بە بەندەی خوا بە برایانە.[1]

زوبێری کوڕی عەوام (ﷺ) دەڵێت: ئەبوبەکر لە وتارێکیدا دەیوت: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان، شەرم لە خوای گەورە بکەن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە من لەو دەشتانە دەمەوێت سەرئاوێك بکەم لە شەرماندا لە خوای گەورە خۆم کۆ دەکەمەوە و سەر و دەم و چاوم دادەپۆشم.[2]

عبداللە کوڕی حەکیمیش دەڵێت: ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) وتاری بۆ دەداین و دەیوت: «پاشان..ئامۆژگاریتان دەکەم بە لە خواترسان، سەنا خوانیشی بکەن بە پێ ی گەورەیی و شایستەیی خۆی، ترس و حەز پێکەوە گرێ بدەن، زۆر لالأنە و پاڕانەوە لە خوا ئەنجام بدەن، چونکە خوای عزوجل وەسفی زەکەریا-علیە السلام- دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ٩٠﴾ (الانبیاء:٩٠)، واتە: لە کاری چاکەدا خێرایی و پێشبڕکێیان دەکرد و لە خۆشەویستی و لە ترسیان لە ئێمە هاواریان تێ دەکردین و زۆر سەر کزبوون بۆمان.

[1] صحیح التوفیق في سیرة وحیاة الصدیق (لا: ١٧٩).
[2] هەمان سەرچاوە (لا: ١٨٢).

پاشان ئەی بەندەکانی خوا چاك بزانن نەفسی ئێوەی بە بارمتە گرتووە و لەسەر ئەوەش بەڵێن و پەیمانی لێ وەرگرتوون، شتی کەم و لە ناوچووتان لێ دەکڕێت و لە بەرامبەردا شتی زۆر و گرانبەهاتان دەداتێ... ئەمەش کتێبەکەی خوایە کە لە ناوتاندایە و سەرسوورهێنەرەکانی تەواو نابن، ڕووناکیەکەی خامۆش نابێـت، باوەڕ بە وتەکانی بکەن، پەند وەربگرن بە کتێبەکەی، ڕووناکی و ڕۆشنایی لێ وەربگرن بۆ ڕۆژە تاریکەکان، ئەو بۆ خواناسی دروستی کردوون، فریشتەی بە سەرەوە ڕاسپاردوون تا چاودێری کار و کردەوەتان بکەن.

پاشان بزانن کە ئێوە بێئاگایانە دێن و دەچن کەچی ئەجەلیش نادیارە و خۆی بۆ مەڵاس داوون، ئەگەر دەتانەوێت لە کاتی کردەوەی چاکەدا بمرن هەموو کات لە کردەوەی چاکە دابن، وە ناشتوانن ئەمە بکەن بەبێ یارمەتی خوا، ئاگاداری تەمەنتان بن با لە کاتی خراپەکاری و کاری ناشایستە تەواو نەبێت.

خەڵکانێك هەبوون تەمەنیان بۆ خەڵکی تر بەسەر برد و خۆیان لە بیر چوو، دەخیلتان بم وەك ئەوانە مەبن، خێرا بن، خێرا بن.

پاشان... ڕزگار بن، ڕزگار بن،.. بە دواتانەوەن زۆر بە گەرمی داواتان دەکەن و زوو تێدەپەڕێت.

لە ڕیوایەتێکدا: «کوا براکانتان کە دەتان ناسین؟ وە کوان هاوڕێکانتان؟! ڕۆیشتن بۆ ئەم شوێنەی لێی هاتبوون، ئەوەی کردیان لە ڕۆژی ڕابردوودا پێشی خۆیان خست، کەوتنە ناوی ئیتر پاشەڕۆژیان نەگبەتی بێت یان بەختەوەری، کوان ستەمکاران ئەوانەی شەڕیان دروست کردووە و شورایان بە دەورا دەکرد، ئێستا چوونە ژێر بەرد و دەریاکان؟ کوان ئەو دەم و چاوە درەوشاوانەی کە زۆر سەرسام و دڵخۆش بوون بەو گەنجێتیەیان؟ کوان پاشاکان؟ ئەوانەی لە جەنگەکاندا سەردەکەوتن؟ ڕۆژگار لەق و پۆپی کردن و چوونە ناو گۆڕی تاریك.

خێر نیە لە وتەیەکدا لەبەر خاتری خوا نەبێت، خێریش نیە لە سامانێکدا لەبەر خاتری خوا نەبەخشرێت، خێریش لەو کەسەدا نیە کە نەفامیەکەی زاڵ بێت بەسەر ژیریەکەیدا خێریش لەو کەسەدا نیە کە لە پێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران دەترسێت».

خوای گەورە خزمایەتی لەگەڵ کەسدا نیە تا بەو هۆیەوە چاکەی پێ بدات، یان خراپەی لەسەر لابات تەنها بە گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی فەرمانەکانی نەبێت.

خێر و خۆشی نیە لە خۆشیەکدا بە دوایدا ئاگر بێت، خراپە و ناخۆشیش نیە لە ناخۆشیەکدا بە دوایدا بەهەشت بێت، وە بزانن ئێوە بەڵێنی خواتان نەشکاندووە و بە گوێی خواتان کردووە و مافی خۆتان پێداوە.

ئامۆژگاریتان دەکەم لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەژارن پێویستیتان پێیەتی — لە خوا بترسن، سەناخوانی بن بەوەی بەو شێوەیەی شایستەیەتی، داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن چونکە خوا زۆر لێبووردەیە، ئەم وتانەم ئەڵێم و داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە بۆ خۆم و بۆ ئێوەش دەکەم.

ئا بەم شێوەیە صدیق (رضي الله عنه) گرنگی بە کۆمەڵگە دەدا و ئامۆژگاری موسوڵمانانی دەکرد و هانی دەدان بۆ چاکە و فەرمانی بە چاکە دەدا و بەرگری لە خراپە دەکرد، ئەمەش مشتێکە لە دەشتێك و کەمێکە لە زۆر.

٢- دادوەری لە سەردەمی صدیقدا:

سەردەمی صدیق (رضي الله عنه) سەرەتای خەلافەتی ڕاشیدە بوو کە گرنگیەکەی لەوەدا دەردەکەوێت کە پەیوەست بوو بە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و نزیك بوو لێی.

سەردەمێکی ڕاشیدە بوو بە گشتی و بە تایبەتی لە لایەنی دادوەری یەوە، کە درێژەی ئەو دادوەریە بووە کە پێغەمبەری خوای لەسەر بووە، لەگەڵ پاراستنی هەموو ئەو حوکمانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) جێگیر بوو بوو، کە بە وردی لەسەری دەڕۆیشت و بە موو لێی لا نەدەدا.

گرنگی ئەو سەردەمە لە دوو لایەنی گرنگەوە دەردەکەوێت:

- پارێزگاری لە دەقەکانی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد کە تایبەت بوون بە دادگا و دادوەریەوە و دەستی پێوە دەگرت، لەسەر ئەو ڕێڕەوە دەڕۆیشت و بەردەوامیش پابەند بوو پێیانەوە.

- دانانی ڕێکخراوی دادگایی تازە بۆ جێگیر کردنی پایەکانی ئایینی ئیسلامی پان و پۆڕ و ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕوداوە تازە و جۆر بە جۆرەکان.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) خۆی ڕاستەوخۆ کاروباری دادگای ڕادەپەڕاند و لە سەردمەی ئەودا دادگا جیانەکرابوویەوە لە فەرمانڕەوایی گشتی، هەروەك سەردمەی پێغەمبەری خوا مابوویەوە، خەڵکی هێشتا لە سەردەمەی پێغەمبەرایەتیەوە نزیك بوون، خۆیان بە ئاسانی لەسەر ڕێنموونی ئیسلام دەڕۆیشتن و بەپێی یاسا و شەریعەت کاریان دەکرد، کەم جار ناکۆکیەك باسکراوە لە ناویاندا ڕوویدا بێت. لە شاری مەدینەدا عومەری ڕاسپاردبوو بۆ هاوکاری خۆی لە بەڕێوەبردنی هەندێ کار و باری دادگادا، هەرچەندە ئەمە ئەوەی نەدەگەیاند کە بە تەواوی کاروباری دادگای دابووە دەستی عومەر (ﷺ).[1]

هەروەك هەموو ئەو فەرمانڕەوا و دادوەرانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی دایناببوون وەك خۆی هێشتیەوە کە یان هەردوو کارەکە لە کەسێکدا کۆبوو بوویەوە یان دوو کەسی جیا دەیبردن بەڕێوە[2]، لەمەولایش بە یارمەتی خوا ناوی ئەو دادوەر و فەرمانڕەوایانە (الوالی) دەهێنین:

سەرچاوەکانی دادگا لە سەردمەی صدیقدا ئەمانە بوون:

١- قورئانی پیرۆز.

٢- کۆدەنگی (الاجماع) بە ڕاوێژکردن لەگەڵ کەسانی زانا و فەتوا دەردا.

٣- کۆشش کردن و ڕا دەربڕین، ئەمەش لە مەسەلەیەکدا کە قورئان و سونەت و کۆدەنگی لەسەر نەبێت.[3]

ئەبو بەکر ئەگەر مەسەلەیەکی بۆ بهاتایەتە پێش سەیری دەکرد ئەگەر حوکمەکەی لە قورئاندا هەبوایە کاری پێ دەکرد، و ئەگەر لە قورئاندا بەدی نەکردایە، کاری بە سونەتی پێغەمبەری خوا دەکرد، ئەگەر لە قورئان و سونەتیش نەهاتایە پرسیاری لە خەڵك دەکرد: ئایا

---

[1] وقائع الندوة النظم الاسلامية أبو ظبي (٣٦٦/١).
[2] تأريخ القضاء في الاسلام (لا: ١٣٤).
[3] وقائع الندوة النظم الاسلامية أبو ظبي (٣٩٠/١).

ئێوە بزانن کە پێغەمبەری خوا لە فلان مەسەلەدا قسەی کردووە، لەوانەیە یەکێك هەڵبستایەتەوە و دەیوت: ئا بەم جۆرە و بەو جۆرە ئەو مەسەلەیەی چارەسەر کردووە، ئەویش بەو شێوەیە چارەی دەکرد و دەیوت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە ناوماندا کەسانێکی وای هەڵخستووە ڕووداوەکانی پێغەمبەرەکەمان بۆ دەپارێزێت، ئەگەر دامایە بە دیار مەسەلەیەکەوە سەرانی موسوڵمانان و زانایانی کۆ دەکردەوە و ڕاوێژی پێ دەکردن، ئەگەر سەرجەم ڕایان بهتایەتە سەر شتێك ئەو حوکمەی جێگیر دەکرد.[1]

وا دیارە ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) کارکردن بە ئەنجامی شورا و ڕاوێژی بە پێویست زانیوە ئەگەر ڕای ئەهلی شورا هاتە سەر مەسەلەیەك بۆ ئەمیر نیە لێی لابدات و پێچەوانەیان بێت، لە مەسەلەی دادگادا ئەمە رای صدیقە (رضي الله عنه) وە هەر کاتێك ڕاوێژکارانی بهاتایەنەتە سەر شتێك ئیشی پێ دەکرد، هەر بەو شێوەیەش فەرمانی دا بە عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) کاتێك خالیدی کوڕی وەلیدی بۆ نارد وەك پاڵپشتێك و پێی وت: پرس و ڕایان پێ بکە و بە پێچەوانەی ئەوان کار مەکە.[2]

لە وەرگرتنی هەواڵدا زۆر ورد بوو قوبەیسەی کوڕی زوئەیب دەڵێت: نەنکم هات بۆ لای ئەبو بەکر داوای بەشە میراتی خۆی دەکرد، پێی وت: هیچ بەشێك لە قورئاندا بۆ تۆ نابینم، واش نازانم پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم بارەیەوە شتێکی فەرمووبێت، پاشان پرسیاری لە خەڵکی کرد لەو بارەیەوە، موغیرە (رضي الله عنه) وتی: من خۆم لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم (ﷺ) شەش یەکی پێداوە، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێی وت: کەسی ترت لەگەڵدایە؟ (ابن مسلمە)یش ئەو شاهێدیەی دا کە ئەویش لەوێ بووە، ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) شەش یەکی بۆ داپیرە چەسپاند[3]، هەروەك ڕایشی وا بوو کە دادوەر بە زانستی خۆی نابێت هیچ مەسەلەیەك بچەسپێنێت، تا

---

[1] موسوعة فقه ابي بكر الصديق، **قلعچی** (لا: ١٥٥).

[2] **هەمان سەرچاوە (لا: ١٥٦).**

[3] تذكرة الحفاظ للذهبي (٢/١).

شایەتێکی تر پاڵپشتی نەکات، لە ئەبو بەکرەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: ئەگەر کەسێك ببینم کە پێویست بێت (حەد)ی لێ بدرێت لێی نادەم تا کەسێکی تر شاهێد نەبێت بە سەریەوە.[1]

ئەمەش هەندێکە لەو مەسەلانەی کە ئەبو بەکر دادوەری تێدا کردوون:

١- مەسەلەی تۆڵە سەندن:

علی کوڕی ماجد السهمی دەڵێت: «لەگەڵ پیاوێکدا بوو بە شەڕم، تۆزێك لە گوێچکەیم قرتاند، ئەبو بەکر (ﷺ) بە مەبەستی حەجکردن، مەسەلەکەمان برایە بەر دەستی، ئەویش بە عومەری وت: شتێکت بیستووە لەم بارەیەوە تا کاری پێ بکەم؟ وتی: بەڵێ، کابرای کەڵەشاخ گرم بۆ بانگە کەن، هەر کە عومەر ناوی کەڵە شاخی برد ئەبو بەکر وتی: لە پێغەمبەری خوام بیست (ﷺ) کە دەیفەرموو: «إني واهبت لخالتي غلاما، ارجوا ان يبارك لعافية، واني نهيت ان تجعله حجاما او قصابا، او صانعا»، واتا: خزمەتکارێکم بەخشی بە پورم و هیوادارم خوا لێی پیرۆز کات و پێم وت: نەیکات بە کەڵەشاخ گر و قەصاب و پیشەوەر».[2]

٢- بژێوی باوك لەسەر کوڕە:

لە قەیسی کوڕی حازمەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: «لە لای ئەبو بەکری صدیق بووم (ﷺ) پیاوێك پێی وت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەم پیاوە ئەیەوێت هەموو ماڵەکەمی بدەمێ و بیماشێتەوە، ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: تۆ ئەوەندەت بۆ هەیە پێداویستیت تەواو بکات، کابراش وتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە: «انت ومالك لابيك»؟ واتا: خۆیشت و سامانەکەشت هی باوکتە؟». ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: بەوە ڕازی بە کە خوا پێی ڕازی بووە بۆت، واتا: خەرجیت بکێشێت و بەس، و خەڵکانی تریش لە منزری کوڕی زیادەوە گێڕاویانەتەوە.[3]

---

[1] تراث الخلفاء الراشدون، د. صبحي محمد صافي (لا: ١٨٦).
[2] اخبار القضاة لوكيع (١٠٢/٢).
[3] السنن الكبرى (٤٨١/٧)، لە کتابی (تأريخ القضاة) رخيلي وەرگيراوە، **فەرموودەیەکی زۆر لاوازە و بەڵکو لە هەڵبەستراوەوە نزیکە** – الالباني (ارواء: ٣٢٩/٣).

٣- بەرگریەکی ڕەوا:

لە ئەبو مولەیکەوە ئەویش لە باوایەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێك گازێك لە دەستی پیاوێکی تر دەگرێت، هەردوو دانی پێشەوەی خۆی دەکەوێت و ئەبو بەکریش مافی ئەو دوو دانانەی بە فیڕۆ دەدا.[١]

٤- فەرماندان بە دارکاری — جەڵدە لێدان:

ئیمام مالك لە نافیعەوە دەگێڕێتەوە کە صەفیەی کچی ئەبو عوبەید بۆی باس کردووە: کە پیاوێك چوو بووە لای کە کچێکی شوو نەکردوو، سکی پڕبوو، پاشان خۆی دانی نا بەوەدا کە زینای کردووە، و ژنی نەهێنابوو، ئەبو بەکر فەرمانی دەرکرد کە داری حەدیان لێدا و دووریشی خستەوە بۆ ناوچەی فەدەك.

بەڵام داری حەدی لە ئافرەتەکە نەدا و دووریشی نەخستەوە چونکە بەزۆر ئەو کارەی لەگەڵدا کرابوو پاشان لێی مارە کردوو بۆی گوێستەوە.[٢]

پاشان پرسیاریان لە ئەبو بەکر کرد دەربارەی پیاوێك زینا لەگەڵ ئافرەتێك دا بکات و پاشان مارەی بکات، لە وەڵامدا وتی: چی لەوە باشترە، لە شەرواڵ پیسیەوە بڕۆن بۆ نیکاحی خاوێن.[٣]

٣- منداڵ لە لای ژن دەبێت تا شوو نەکات:

عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) خێزانەکەی کە ژنێکی ئەنصاری بوو دایکی عاصم بوو تەلاقی دا و لە نزیکی عەرەفاتەوە پێی گەیشت، منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو، دەبینێت پێی گرتووە و لە شیر بڕاوەتەوە، دەستی منداڵەکەی ڕاکێشت و ویستی بە زۆر لێی بسەنێت و منداڵەکەش ئێشی پێ گەیشت و دەستی کردە گریان، وتی: من شایانم بەم کوڕە نەك تۆ، ئافرەتەکەش لای ئەبو بەکر شکاتی لێ کرد و منداڵەکەی دایەوە بە ژنەکە و وتی: باوەش و

[١] الموطأ كتاب الحدود (ژمارە: ٨٤٨).

[٢] مصنف عبدالرزاق (ژمارە: ١٢٧٩٦).

[٣] **هەمان سەرچاوە(١٢٧٩٦)، ڕاویەکی نەناسراوی هەیە.**

جێگە و بۆنی ئەو ژنە لە تۆ باشترە بۆ ئەو منداڵە تا گەورە دەبێت و دەبێتە لاو و بە ئارەزووی خۆی یەکێکتان هەڵدەبژێرێت.[1]

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە وتوویەتی: ئەو ژنە بە سۆزتر و بە بەزەیی تر و نەرم تر و بە ئارام ترە لە تۆ و ئەو شایانی منداڵەکەیەتی تا شوو نەکات.[2]

ئەمەش هەندێکە لە حوکمڕانی و مەسەلە دادگاییەکان کە لە سەردەمی صدیقدا ڕوویداوە و بەمەشدا دادگایی کردن لە سەردەمی صدیق لە سەردەمەکانی تر جیا دەکاتەوە بە زۆر شت لەوانە:

أ- دادگا لە سەردەمی ئەبو بەکر دا، درێژەپێدانی شێوازی دادگایی بوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) و پابەند بوو پێوەی و لەسەر ئەوە پەیڕەوە دەڕۆیشت و بڵاوکردنەوەی پەروەردەی ئیسلامی و پەیوەندی بە تین بە بیروباوەڕەوە و زیاتریش بە کاریگەری ئایین دەبەسترا، ئاسانی لە بەڕێوەچوونی سکاڵا و دادگاییکردندا، کورتکردنەوەی کاروبارە داگاییەکان و کەمی ژمارەی سکاڵا و شکاتەکان.

ب- ئەو حوکمە دادوەریانەی لەم سەردەمەدا ئەنجام دراوە، بوو بە جێگەی تێڕوانینی لێکۆڵەرەوان، و بوون بە سەرچاوەی حوکمی شەرعی و کۆششە دادگاییەکان و ڕاو بۆچوونە فیقهیەکان لە سەردەمەکانی داهاتوودا.

ج- خودی صدیق خۆی لەگەڵ ئەوەشدا خەلیفە و فەرمانڕەوا بوو دابەزیوەتە ناو مەسەلە دادگاییەکان و لە سکاڵاکانی کۆڵیوەتەوە.

د- لە سەردەمی صدیقدا (ﷺ) کۆمەڵێك سەرچاوەی دادگاییکردن هاتە کایەوە کە پێشتر بەو شێوەیە ڕێزبەند نەکرابوون وەك – قورئان – سونەت – کۆدەنگ و لێچواندن (قیاس) و ئیشکردن بە ڕووداوە دادگاییەکانی پێشوو و ڕاو بۆچوون دەربڕین لەگەڵ ڕاوێژ پێکردندا.[3]

[1] منصف عبدالرزاق (٥٤/٧)، ژمارە (١٢٦٠١).

[2] هەمان سەرچاوە (٥٤/٧)، ژمارە (١٢٦٠٠).

[3] تأريخ القضاء في الاسلام (لا: ١٥٧-١٥٨).

ه- شێوازی دادگای ئەم سەردەمە ڕەچاوی پاراستنی مافی لاوازان و سەرخستنی ستەم لێکراوان و یەکسانی کردن لە نێوان شکاتکەر و شکات لێکراو، وە بەرپاکردنی هەق و شەرعی خوا بەسەر هەمرواندا، ئیتر با بەسەر خەلیفە یان ئەمیر یان هەر فەرمانڕەوایەکی تریش دا بوایە، هەر قازی خۆیشی فەرمانەکەی جێبەجێ دەکرد ئەگەر لایەنی شکات لێکراو بە خۆشی خۆی جێبەجێی نەکردایە و ڕاستەوخۆیش جێبەجێ کردنەکە دوای دەرچوونی حوکمەکە دەبوو.[1]

ئەبو بەکری (ﷺ) فەرمانڕەوای (والی) دیاری دەکرد بۆ ئەو ولاَتانەی کە ڕزگار دەکرا و سەرپەرشتی کاری ئیداری و حوکمڕانی و پێشەوایەتی نوێژ و کۆ کردنەوەی زەکات و هەموو کارێکی فەرمانڕەوایی دەدایە دەستیان، و لە جوان هەڵبژاردنەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکۆڵێتەوە کە چۆن والی و فەرمانڕەوا و سەرکردەکانی هەڵدەبژارد بۆ شار و ولاَتان و ئەویش چاوی لێ دەکرد لەم کارەیدا، بۆیە دەبینین هەموو ئەو والی و سەرکردانەی پێغەمبەری خوا لە ژیانیدا داینابوون، لە شوێنی خۆیاندا هێشتنیەوە و کەسیانی نەگۆڕی، مەگەر لە شوێنێکی تر داینایە کە لەو جێگەیە گرنگتر بوایە و خۆیشی پێی خۆش بوایە وەکو عەمری کوڕی عاص.[2]

سنووری دەسەلاَتی ئەو والیانە هەمان ئیش و کار و دەسەلاَت بوو کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەری بوون بە تایبەت ئەوانەیان کە پێشتر پێغەمبەر (ﷺ) داینابوون، لەویشانە:

أ- بەرپاکردنی نوێژ و بەرنوێژی کردنی خەڵکی، کە ئەوەش لە گرنگترین ئیش و کارەکانی ئەو فەرمانڕەوایە بوو چونکە مانای ئایینی و دونیایی و ڕامیاری و کۆمەلاَیەتی تێدابوو، والیەکان بە تایبەتی هەمیشە نوێژی هەینیان بۆ موسوڵمانان کردووە، بەلاَم سەرکردەکان کاری بەرنوێژیان درابوویە دەست بە گشتی.

ب- جیهاد و گیان فیدایی کە سەرکردەی سوپاکان هەڵدەستان پێی لەناوچە ڕزگار کراوەکاندا، ئەوان هەڵدەستان بە کارەکانی و خۆیشیان یان جێگرەکانیان بە هەندێ

---

[1] هەمان سەرچاوە (لا: ١٦٠).

[2] الولاية على البلدان، عبدالعزيز ابراهيم العمري (٥٥/١).

کاری گرنگ هەڵدەسان وەك دابەشکردنی دەسکەوتەکان و سەرا ڕۆی دیلەکان و شتانی تریش، لەگەڵ هەندێ شتی گرنگی تریش کە لەکاتی شەڕەکاندا دەکران وەك ڕێکەوتنی ئاگربەست و ئاشتی یان لەگەڵ سوپای دوژمناندا.

ئەم کارانەش هەموو سەرکردەکان تیاندا یەکسان بوون و چ لە شام و عێراق یان سەرکردەکانی ئەو شوێنانەی کە پاشگەزبوونەوەی تیادا ڕوویدا وەك یەمەن و بەحرین و عەمان و نەجد، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە جیهاد هەریەك ئامانج و شێوە بوو لە هەر کوێ بوو بێت .

ج- بەڕێوەبردنی ئەو ولاّتانەی کە ڕزگار دەکران و دانانی دادوەر و بەرپرس بەسەریانەوە لەلایەن سەرکردەکانی جیهادەوە خۆیان و بەدان پیانانی خەلیفە ئەبو بەکرەوە، یان لە لایەن خەلیفە ئەبو بەکر خۆیەوە یان بەرپرسەکانی ئەو شوێنەوە دیاری دەکران.

د- وەرگرتنی بەیعەت لە خەڵکی ئەو شوێنانەی کە ڕزگار دەکرا بۆ خەلیفە ئەبو بەکر کە والی ئەو شوێنانەی وەك یەمەن، مەککە، تائف، شوێنەکانی تریش هەڵدەستان بە وەرگرتنی بەیعەت بۆ خەلیفە.

هـ- هەندێك کاری گرنگی وەك دارایی دەدرایە دەستی والیەکان یان هەر کەسێکی تر کە خەلیفە دیاری بکردایە یان والی دیاری بکردایە وەك وەرگرتنی زەکات لە دەوڵەمەندان و دابەشکردنەوەی بەسەر هەژاراندا یان وەرگرتنی سەرانە (جزیە) لە خاوەنی ئایینەکان و خەرج کردنەوەی بە شێوەیەکی شەرعی و لە شوێنی خۆیدا هەروەك لە سەردەمی پێغەمبەری خوایشدا (ﷺ) هەر بەم شێوەیە بوو.

و- تازەکردنەوەی ئەو پەیمانانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) مۆر کرابوون وەك ئەوەی والی شاری نەجران ئەو پەیمانانەی نوێ کردەوە کە لە نێوان خەڵکەکە و پێغەمبەری خوادا مۆر کرابوو ئەمەش لەسەر داوای گەورەکانی نەجران.[1]

ز- لە کارە گرنگەکانی والیەکان بەرپاکردنی سزای حەد بوو (الحدود) و پاراستنی ئاسایشی ولاّت و ڕای خۆیان بەکار دەهێنا ئەگەر لە هەر مەسەلەیەکدا دەقێکی شەرعی نەهاتبایە، وەك ئەوەی موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییەبەو دوو ژنەی کرد کە بە

---

[1] الولاية على البلدان (٥٩/١).

گۆرانیەوە زەمی پێغەمبەری خوایان کرد و بە مردنەکەی دڵخۆش بوون، وە لەمەولا (انشاء الله) لە باسی جیهادی صدیق لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا ئەم باسە بە درێژی باس دەکەین.

ح- والیەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە کاروباری فێرکردندا دەربارەی مەسەلە ئایینیەکان لەو وڵاتانەدا کە ئەوان سەرۆکاریان دەکرد، زۆرێك لەو والیانەش دەرسی گشتیان لە مزگەوتەکاندا هەبووە بۆ فێرکردنی قورئان و حوکمە شەرعیەکان، ئەمەش کارکردن بوو بە سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم کارەش لە گەورەترین و گرنگترین کارەکان بوو لە دیدی پێغەمبەری خوا و ئەبو بەکرەوە، وە هەموو والیەکانی ئەبو بەکر بەوە بە ناوبانگ بوون، یەکێك لە مێژوو نووسەکان دەربارەی کاری (زیاد) لە شاری حەزرەمووت دەی کرد، کە پاش ئەوەشی بووە والی هەروەك جاران هەموو بەیانیەك دەچووە مزگەوت قورئانی فێر موسوڵمانان دەکرد.[1]

ئا بەم ڕەوشتەیان والیەکان ڕۆڵێکی گرنگیان دیوە لە بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا لەو وڵاتانەی کە سەرۆکاریان کردووە، هەڵدەستان بە جێگیرکردنی ئیسلام لەو جێگایانەی تازە موسوڵمان بوو بوون یان لەو جێگایانەشی کە پێشتر موسوڵمان بوون بەڵام پاشگەز بوونەوە و پاشگەز بوونەوەکەشیان تازە بوو لە تێگەیشتنیانەوە بوو لە ئیسلام.

ئەمەو لەو شوێنانەشی کە ئیسلام تێیدا جێگیری دڵان بوو وەك مەککە و مەدینە و تائف، خەڵکانێك بە فەرمانی والی یان خەلیفە هەڵدەسان بە وتنەوەی وانەی قورئان، یان کەسانێك بە و کارە هەستاون کە خەلیفە خۆی بەتایبەتی بۆ کاروباری فێرکردن دیاری کردبوون.[2]

(والی) خۆی سەرپەرشتیاری یەکەمی ئەو هەرێمانە بوو کە سەروکایەتی دەکرد، و لەکاتی سەفەردا دەبوایە کەسێکی تریان لەجێی خۆیان دیاری بکردایە هەڵسانایە بەئیشە کانیان تادەگەڕانەوە.

---

[1] الولاية على البلدان (١/٦٠).
[2] الولاية على البلدان (١/٦١).

بۆ نموونه موهاجیری کوڕی ئومەییە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردی بە سەرۆکی کندە و پاش ئەویش ئەبو بەکر لە جێی خۆیدا هێشتیەوە و بەڵام موهاجیر نەخۆش بوو لە کاتی خۆیدا نەیتوانی بگاتە یەمەن بۆیە جوابی نارد بۆ زیاد کە لە باتی خۆی کارەکان بە ڕێوە بەرێت تا چاك دەبێتەوە و دەگاتە ئەوێ، ئەبو بەکریش بەو کارە ڕازی بوو،[1] هەروەها خالیدیش کاتێك والی عێراق بوو جێگری بۆ خۆی دانابوو بەسەر شاری حیرەوە تا دەگەڕێتەوە.

ئەبو بەکر (ﷺ) پێش ئەوەی والیەك دیاری بکات بۆ ناوچەیەك ڕاوێژی بە هاوەڵانی دەکرد، دەربارەی ئەو کەسە و عومەری کوڕی خەتتاب و عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوایان لێ ڕازی بێت)کەسانێکی تریش ڕاوێژکاری یەکەمی بوون.[2]

ئەبو بەکر (ﷺ) کەسی بۆ بەرپرسیارێتیەك دیاری نەدەکرد تا پرس و ڕای بەو کەسە خۆی نەکردایە بە تایبەتی ئەگەر بیویستایە یەکێك بۆ شوێنێکی تر بگوێزێتەوە هەروەك چۆن ویستی عەمری کوڕی عاص لە شوێنەکەی خۆی بگوێزێتەوە بۆ فەلەستین، و بڕیارەکەی دەرنەکرد تا ڕاوێژی پێ نەکرد و ڕازی نەکرد.[3]

هەروەها سەربەستی خستە دەستی موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە لە کوێ پێی خۆشە با هەڵی بژێرێت لە نێوان حەزرەمەوت و یەمەن و موهاجیریش یەمەنی هەڵبژارد و ئەویش لەوێ داینا.[4]

لەو کارانەی ئەبو بەکر دەیکرد و وەك کار کردنیش بە سونەت و ڕێڕەوی پێغەمبەری خوا هەڵدەسا بە دیاریکردنی سەرۆك بۆ هۆزەکە و هەر لە هۆزەکەی خۆی ئەگەر بیزانیایە کەسی شیاویان تێدایە، وەك تائف و هەندێ هۆزی تریش و هەر کاتێك بیویستایە کەسێك بکاتە سەرۆك نامەی بۆ دەنووسی سنووری جوگرافی دەسەڵاتەکەی بۆ دیاری دەکرد، و هەندێ جاریش نەخشەی گەیشتن بە ئەو شوێنە و ئەو ڕێگایانەی پێیدا تێپەڕ دەبێت بۆ دیاری دەکردن بە

---

[1] الولاية على البلدان (١/٥٥).
[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.**
[3] **هەمان سەرچاوەی** (١/٥٥).
[4] **هەمان سەرچاوەی** (١/٥٥).

تایبەتی ئەو ناوچەیە هێشتا فەتح نەکرابێت و لە ژێر دەسەلاتی ئیسلامدا نەبێت، ئەمەش لە جێگەکانی دژ بە هەلگەڕاوەکان و ڕزگارکردنی عێراق و شام دەردەکەوێت.

هەندێ جار دوو هەرێمی دەکردە یەك بە تایبەت پاش لێبوونەوە لە جەنگ دژی هەلگەڕاوەکان کە هەستا بە نوساندنی کیندە بە هەرێمی حەزرەمەوتەوە کە زیادی کوڕی لەبیدی بەیازی حوکمی دەکرد و پاش ئەوە زیاد والی هەردوو شوێنەکە بوو.[1]

هەڵس و کەوتی ئەبو بەکر (ﷺ) لەگەڵ والیەکانیدا بریتی بوو لە ڕێزگرتنی دوو لایەنە و هەرگیز لێڵی ڕووی تێ نەکردووە، ئەی دەربارەی پەیوەندی کردنیان بە یەکەوە زۆر بەردەوام بوو لە ڕێگەی نامەوە، کە شێوازی بەڕێوەبردنی کار و زاڵ بوون بەسەر کۆسپەکاندا ڕوون دەکردەوە.

زۆرجار والیەکان نامەیان بۆ دەنووسی و تیایدا داوای ڕاوێژیان دەکرد لە بارەی مەسەلە جیا جیاکانەوە و ئەویش ڕوونکردنەوەی خۆی بە نامەهێنەرەکەدا دەناردەوە بۆیان، یان بە زمانی نوێی خۆی پێ دەگەیاندن، ئەو پۆستەچیانە نوێترین هەواڵی سەرکەوتنەکانی جیهاد و پێشتریش هەواڵی جەنگەکان دژی هەلگەڕاوەکانیان بۆ دەهێنایەوە و هەندێ لە والیەکان لە خۆیانەوە هەڵدەستان بە ناردنی هەواڵ و پێشهاتەکانی هەرێمەکەیان بۆ خەلیفە.[2]

والیەکانیش پەیوەندیان پێکەوە دەکردلە ڕێگای نوێنەر و نامە بەرەکانیانەوە و یان ڕاستەوخۆ سەردانی یەکتر و چاوپێکەوتنیان دەکرد، ئەمەش زیاتر لە نێوان والیەکانی حەزرەمەوت و یەمەندا ڕووی دەدا، و لە نێوان والیەکانی شامیشدا ڕووی دەدا بە تایبەت بۆ لێکدادان و ڕوونکردنەوەی نەخشە سەربازیەکان.

زۆرێ لە نامەکانی ئەبو بەکر (ﷺ) بۆ والیەکانی هاندانیان بوو لەسەر دونیا نەویستی و لەبەرچاوگرتنی پاداشتی ڕۆژی دوایی، هەندێ لەو نامانە بە شێوەی نامەی ڕەسمی و مۆرکراو لە دیوانی خەلافەتەوە دەنێردران بۆ والی و سەرکردەکانی جەنگ.[3]

---

[1] الولاية على البلدان (١/٥٦).
[2] الولاية على البلدان (١/٥٧).
[3] **هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.**

لە سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکردا (ﷺ) ولاّتی ئیسلام بریتی بوو لە هەرێم یان ولایات کە ئەمە ناوەکانیان بوو:

١- مەدینە: پایتەختی دەولّەت بوو، خەلیفە خۆی لەوێ دادەنیشت.

٢- مەککە: عیتابی کوڕی ئەسید سەرۆکایەتی دەکرد کە پێشتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناببوو، ئەبوبەکریش لە جێ ی خۆی هێشتی یەوە.

٣- تائیف: عوسمانی کوڕی ئەبی عاص سەروکایەتی دەکرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناببوو، ئەبوبەکر لە جێی خۆی هێشتبوویەوە.

٤- صنعا: موهاجری کوڕی ئومەیە سەرۆکایەتی دەکرد و خۆیشی لە دەستی هەڵگەڕاوەکان ڕزگاری کردەوە.

٥- حەزرەمووت: بەسەرۆکایەتی زیادی کوڕی لەبید.

٦- زوبێد و ڕوقەع: ئەبو موسای ئەشعەری (ﷺ) حوکمی دەکرد.

٧- خەولان: بەسەرۆکایەتی یەعلای کوڕی ئەبی ئومەییە.

٨- النجد: بەسەرۆکایەتی مەعازی کوڕی جەبەل (ﷺ).

٩- نەجران: بەسەرۆکایەتی جەریری کوری عبداللە.

١٠- حەرش: بەسەرۆکایەتی عبداللە ی کوڕی نور.

١١- بەحرەین: بەسەرۆکایەتی عەلای کوڕی حەزرەمی.

١٢- عیراق و شام: کە سەرکردەکانی جەنگ سەروکایەتیان دەکرد.

١٣- عومان: بەسەرۆکایەتی حوزەیفەی کوڕی موحصین.

١٤- یەمامە: بەسەرۆکایەتی سلیطی کوڕی قەیس.

٤- هەڵوێستی عەلی و زوبێر (خوایان لێ ڕازی بێت) لە خەلیفایەتی صدیق:

دەنگوباسی زۆر هەیە سەبارەت بە دواکەوتنی عەلی لە بەیعەت دانی بە ئەبوبەکر و هەروەها زوبێری کوڕی عەوامیش، کە زۆربەی ئەو هەواڵانە ناڕاستن تەنها ئەو هەواڵە نەبێت (ابن عباس) (ﷺ) دەیگێڕێتەوە و دەڵێت: عەلی و زوبێر و ئەوانەشی لەگەڵیاندا بوون لە ماڵی فاتیمەی کچی پێغەمبەر بوون و دواکەوتن بە بۆنەی ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێ لە کۆچەرییاندا

خەریك بوون بە تەرمی پێغەمبەری خوا بە فەرمانی ئەبوبەکر، و ئەمەش زۆر لەوەدا ڕوون دەبێتەوە کە سالمی کوڕی عەبید (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە ئەبوبەکر وتی بە خزمەکانی پێغەمبەر و لە سەرویانەوە عەلی: هاوڕێکەتان لە لای ئێوەیە و فەرمان بدەن با بیشۆن.[1]

لە ڕۆژی داهاتوودا کە ڕۆژی سێ شەممە بوو عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زوبێری کوڕی عەوام بەیعەتیان بە ئەبوبەکری صدیق دا. ئەبو سەعیدی خودری (ﷺ) دەڵێت: کاتێك ئەبو بەکر سەرکەوت بۆ سەر مینبەرەکە، سەیرێکی خەڵکەکەی کرد و زوبێری نەبینی، بۆیە ناردی بە دوایدا و ئەویش هات، ئەبو بەکر پێی وت: ئەی پورزای پێغەمبەر و ئەی هاوڕێی تایبەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئایا دەتەوێت موسوڵمانان پەرتەوازە بکەیت؟ زوبەیریش وتی: تۆ هیچت لەسەر نیە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا، پاشان هەستایە سەر پێ و بەیعەتی دایە ئەبو بەکر.

هەروەها سەیرێکی تری خەڵکەکی کرد و عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نەبینی، ناردی بەدوایدا هات، ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: ئەی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەری خوا ئایا دەتەوێت موسوڵمانان پەرتەوازە بکەیت؟ ئەویش بە هەمان شێوە وتی: تۆ هیچت لەسەر نیە ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا، پاشان هەستایە سەر پێ و بەیعەتی خۆی پێدا.[2]

ئەوەی کە گەورەیی و گرنگی فەرموودەکەی ئەبو سەعید خودری دەردەخات، ئەوەیە کە ئیمام مسلم خاوەنی کتێبی (جامع الصحیح) کە دوای کتێبەکەی بوخاری ڕاست ترین کتێبە لە فەرموودەدا، مسلم دەڕوات بۆ لای محمدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی حوزەیمەی مامۆستای دەربارەی ئەم فەرموودەیە لێی دەپرسێت، (ئیبن حوزەیمە) یش فەرموودەکەی بۆ دەنووسێت و دان بە صحیحیدا دەنێت، مسلمیش پێی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە لە (بەدەنە)[3]یەك باشترە (ئیبن خوزەیمە)ش وتی: نەك هەر ئەوەندەی (بەدەنە)یەك دەبێت بەڵکو خۆی دەدات لە (بدرە)[4]یەك پارە.

---

[1] صحيح التوفيق في سيرة و حياة الصديق (لا: ٩٨).

[2] صحيح ابن كثير في البداية والنهاية (٥/٢٤٩).

[3] **بەدەنە: حوشترێکی زۆر قەڵەوە و لە کەعبەشدا بکرێتە قوربانی.**

[4] بدرة مال: (١٢) **هەزار دینار**

(ئیبن کثیر) لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: (ئیسنادەکەی صەحیحە) و تیایدا و سودێکی گەورە هەیە، کە دەنگدانی عەلی تێدایە لە یەکەم ڕۆژی مردنی پێغەمبەر (ﷺ) یان دووەم ڕۆژەکەی ، وە ئەمە ڕاستە، چونکە عەلی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ئەبو بەکر جیا نەبۆتەوە، وە لە تەنها یەك نوێژێشدا لێی دوا نەکەوتووە.[1]

لە ڕیوایەتی حەبیبی کوڕی ئەبی سابت دا هاتووە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب لە ماڵەوە بوو، پیاوێك هات بۆ لای و وتی: ئەبو بەکر دانیشتووە بۆ بەیعەت پێدان، ئەویش خێرا و بە پەلە بە کراسێکەوە کە قۆپچەکانی دانەخستبوو وە هیچیشی بەسەردا لەبەر نەکردبوو، بە پەلە خۆی گەیاندە مزگەوت، زۆر بە پەلە بوو، نەبادا لە بەیعەتدان دوا بکەوێت، وە بەیعەتی دا بە ئەبو بەکر و پاشان دانیشت و ناردی عەباکەیان بۆ هێنا و کردی بەسەر کراسەکەیدا.[2]

عەمری کوڕی حەریس لە سەعیدی کوڕی زەیدی پرسی: ئایا لە کاتی مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ بوویت؟ وتی: بەڵێ، وتی: کەی دەنگ درا بە ئەبو بەکر؟ وتی: هەر ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، موسوڵمانان پێیان خۆش نەبوو هەندێ کاتیش بێت بەبێ سەر گەورە و کۆمەڵ بمێننەوە. وتی: کەس دژایەتی ئەم بەیعەتەی ئەبو بەکری نەکرد؟ وتی: نەخێر مەگەر هەڵگەڕاوەیەك لە ئیسلام یان خەریك بێت هەڵگەڕێتەوە و خوای گەورە ( پشتیوانانی ڕزگار کرد و لەسەر ئەبو بەکر کۆبوونەوە و، بەیعەتیان پێدا.

وتی: ئەی هیچ کەس لە کۆچەریان دوا کەوتن؟

وتی: هەموو کۆچەریان یەك لە دوای یەك دەنگی خۆیان پێدا.[3]

ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیبیش (ﷺ) هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان لە صدیق جیا نەبۆتەوەو لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا لێی نەبڕاوە، لە هەموو ڕۆژێکدا بەشداری دەکرد و هاوکاری بوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری موسوڵماناندا.[4]

---

[1] البداية والنهاية (٥/٢٤٩).
[2] الخلفاء الراشدون للخالدي (لا: ٥٨).
[3] **هەمان سەرچاوە (لا:٥٦).**
[4] الخلفاء الراشدون(٥٦).

(ابن كثير) و زۆرێك له ئەهلی زانست پێیان وایه كه عەلی (ﷺ) پاش شەش مانگ لەسەر بەیعەتی یەكەمیدا، بەیعەتی تازە كردۆتەوە كە دوای مردنی فاتمە دەكات و لەسەر ئەم بەیعەتەش كۆمەڵێك ڕیوایەتی "صحیح" هەیە.[1]

عەلی (ﷺ) لە سەردەمی خەلافەتی صدیقدا سەبەتەیەك بووە لە ئامۆژگاری بۆ خەلیفە، وە ئەو شتەی هەڵبژاردووە كە لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵماناندا بێت، بەڵگەی ڕوون و ئاشكرا لەسەر دڵسۆزی بۆ ئەبو بەكر و قسەی خێری بۆ ئیسلام و موسوڵمانان و سوور بوونی لەسەر بەردەوامی خەلافەت و كۆبوونەوەی وتەی موسوڵمانان، ئەوەش ئەوەیە كە هەڵوێستی مەزنی لەو كاتەدا بوو كە ئەبو بەكر ویستی خۆی بە خۆی بڕوات بۆ (ذي القصة) خۆی بەشداری جەنگ دژی هەڵگەڕاوەكان بكات و خۆی سەرپەرشتی بەرەكانی جەنگ بكات كە ئەوەش زۆر ترسناك بوو بۆ مانەوەی بوونی ئیسلام.[2]

لە (ابن عمر)ە وە دەگێڕنەوە كە دەڵێن: هەر كە ئەبو بەكر (ﷺ) گەیشتە (ذی القصة) ی نزیك شاری مەدینە، بەسواری ولآخەكە یەوە دەركەوت، خێرا عەلی كوڕی ئەبو تالیب ڕشوەی ولآخەكەی گرت و وتی: بۆ كوێ ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ منیش ئەوەت پێ دەڵێم كە پێغەمبەری خوا لەجەنگی ئوحودا پێی وت: شمشێرەكەت لادەو با بە لەناوچونت كارەساتبار نەبین، بگەڕێوە بۆ مەدینە، سوێند بە خوا بە مردنی تۆ ئیسلام دەوڵەت ویاسای نامێنێت، ئەویش گەڕایەوە.[3]

ئەگەر عەلی (ﷺ) خوا بە دووری بگرێت لەوە — بە ئەبو بەكر خۆشحاڵ نەبوایە و لە دڵەوە بەیعەتی پێ نەدابێت، ئەمە هەلێكی زێڕینە بۆ عەلی كە واز لە ئەبو بەكر بهێنێت، تا چی ترسناكە بە سەریدا بێت و لە ناو بچێت و كەش و هەوا لە بار بێــت بۆ خۆی، كە ئەو — پەنا بە خوا — ئەو زۆر لەوە مەزنتر بوو كە ڕقی لێ هەڵبگرێت و بیەوێت لە كۆڵی خۆی

---

[1] البداية والنهاية.
[2] المرتضى سيرة علي بن ابي طالب، للندوي (٩٧).
[3] البدية والنهية (٦/٢١٤ـ٢١٥).

بکاتەوە، و کەسێکی بۆ ڕاسپێرێت کە تیرۆری بکات هەروەك چۆن سیاسەتمەدارانی ئەمڕۆ لەگەڵ نەیارەکانیاندا دەیکەن.[1]

٥- «ئێمەی پێغەمبەران میراتی جێ ناهێڵین هەرچیمان هەیە (صدقه)یە بۆ موسوڵمانان»[2]

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: فاتمە و عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) هاتنە خزمەت ئەبو بەکر و داوای میراتی پێغەمبەری خوایان کرد کە لەو کاتەدا داوای زەویەکەی فەدەك و بەشەکەی خەیبەری، وە ئەبو بەکریش پێی وتن: لە پێغەمبەری خوام بیستووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: «لانورث، ماترکنا صدقة، انما یأکل ال محمد من هذا المال»،[3] واتا: ئێمە میراتمان نیە، ئەوەی جێی دەهێڵین خێرە و خزمانی محمدیش لەو خێرەدا بەشدارن.

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو بەکر وتی: «..... هەرگیز شتێك واز لێ ناهێنم کە پێغەمبەری خوا کاری پێ کردووە، چونکە من لەوە دەترسم کە لە شتێکدا وەك ئەو نەکەم و لە ڕێگەی لابدەم».[4]

عائیشە دەڵێت: «کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد، ماوەیەك پاش ئەوە خێزانەکانی عوسمانی کوڕی عەفانیان نارد بۆ لای ئەبو بەکر تا داوای میرات و پاشماوەی پێغەمبەری هاوسەریان کرد (ﷺ) عائیشە پێی وتن: ئەی باشە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە: « لانورث، ماترکنا صدقة »[5]، ئێمە میراتمان بۆ کەس نیە و ئەوەی لێمان جێ دەمێنێت دەکرێتە خێر؟».

---

[1] المرتضى سيرة علي بن ابي طالب (لا: ٩٧).
[2] البخاري (٦٧٢٥).
[3] البخاري (٦٧٢٥).
[4] مسلم **ژمارە** (١٧٥٩).
[5] البخاري (٦٧٣٠)، المسلم (**ژمارە**: ١٧٥٨).

لە ئەبی هورەیرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: «لا یقسم ورپتی دیناراً، ما ترکت بعد نفقه نسائی ومؤنه عاملی فهو صدقه»[1]، واتا: کەسەکانم پارەکانم بەش نەکەنن هەرچیم بەجێ هێشتووە دەکرێتە خێر جگە لە خەرجی خێزانەکانم و خواردنی خزمەتکارەکەم.[2]

لەگەڵ فاتمەدا ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) ئەمەی کرد، لە ژێر ڕۆشنایی جێبە جێ کردنی فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ن بۆیە دەیوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاری بە هەرچی کردبێت منیش کاری پێ دەکەم وە دەیوت: سوێند بە خوا هیچ شتێك واز لێ ناهێنم پێغەمبەری خوا کردبێتی و منیش دەیکەم.[3]

فاتمە پاش بیستنی فەرموودەکە هیچی نەووت ئەمەش بەڵگەیەکی لەسەر ئەوە تێدایە کە فاتمە چۆن لە ئاستی فەرموودەدا مل شۆڕ بووە.

(ابن قتیبه) دەڵێت: داکۆکی کردنی فاتمە لەسەر داوای میرات لە ئەبو بەکر شتێکی خراپ نەبووە، چونکە ئەو بەو فەرموودەیەی نەزانیوە و گومانی وا بووە ئەویش وەك هەموو وەچەیەکی تر میراتی باوکی بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام هەر کە فەرموودەکەی پێی وت یەکسەر وازی هێنا.[4]

قازی (عیاض) دەڵێت: وازهێنانی فاتمە لەسەر داواکاری میرات پاش ئەوەی ئەبو بەکر فەرموودەکەی بۆ هێنایەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو مەسەلەیە کۆ دەنگی لەسەرە و ئەو فەرموودەیەی بۆ باس نەکرابوو، هەر بیستی وازی لە ڕایەکەی خۆی هێنا، ئیتر پاش ئەوە نە خۆی و نە منداڵەکانی داوای میراتیان نەکرد، وە کاتێکیش ئیمام عەلی (ﷺ) بوو بە جێنشین لەو بڕیارانەی ئەبو بەکر و عمر (خوایان لێ ڕازی بێت) لای نەدا.[5]

---

[1] البخاري (٦٧٢٩).
[2] مسلم ١٧٥٨.
[3] البخاري (١٧٦٧).
[4] تأويل مختلف الحديث (لا: ١٨٩).
[5] شرح صحيح المسلم للنووي (٣١٨/١٢).

حەمادی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لە ڕیوایەتە صەحیحەکاندا هاتووە کە ئەوەی فاتمە و عەباس و عەلی بۆ کچەکەی داوای میراتیان کردووە لە ئەبو بەکر، تا ئەوە بوو ئەبو بەکر و گەورە هاوەڵان ئاگاداریان کردن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: « لانورث، ماترکنا صدقة» ئیتر قسەکەیان وەرگرت و زانیان ڕاستە خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتی وای نەفەرمووایە، ئەوە ئەبو بەکر و عومەر سوودمەندی یەکەم دەبوون لە میراتی کچەکانیان — عائیشە و حفصە — کەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەریان (ﷺ) ئیش پێ کرد و عائیشە و حفصە و کەسانی تریشیان بێ بەش کرد.

ئەگەر میراتی پێغەمبەر (ﷺ)بەش بکرایە ئەوە گەورەترین شانازی بوو بۆ ئەبو بەکر و عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) کە کچەکانیان میراتبەری محمدن (ﷺ).[1]

ئەوەی هەندێ ڕاوی باسی لێوە دەکەن گوایە فاتمە توڕە بووە و دەنگی لە صدیق وەرگرتووە تا مردن لە ڕاستیەوە زۆر دوورە بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- بەیهەقی لە ڕێگەی شەرعیەوە ڕیوایەتی کردووە: کە ئەبو بەکر سەردانی فاتمەی کردووە و عەلی پێی وت: حەز دەکەی ڕێگا بدەم؟ وتی: بەڵێ، ڕێگەی پێدا و چووە ژوورەوە و داوای لێ کرد لێی ڕازی بێت و ئەویش لێی ڕازی بوو.[2]

ئا بەم شێوە ئەو هۆکارانە دەڕەوێتەوە کە فاتمەی وا لێکردبوو دەنگ لە ئەبو بەکر (ﷺ) وەربگرێت و ئێ چۆن وا ئەبێت ئەوەتا ئەبو بەکر دەڵێت: «سوێند بە خوا سەردانی خزمەکانی پێغەمبەری خوام پێ خۆشترە لە سەردانی خزمەکانی خۆم!».[3]

ب- لەبەر خەفەتی لە دەست چوونی پێشەوای مرۆڤایەتی هیچی لە بیر نەمابوو، کە ئەوەش نەهامەتیەکی ئەوەندە گەورە یە گاڵتە بە هەموو نەهامەتیەکانی تر دەکات، هەروەها تووش بوونی بە نەخۆشیەوە و کەوتنی لە جێگەدا بۆ ماوەیەکی زۆر لە زۆر ئیش و کار دوور کەوتبووەیەوە چ جای بینینی خەلیفەیەکی سەرقاڵ لە هەموو

---

[1] البداية والنهاية (٢٥٢/٥-٢٥٣).
[2] أباطل يجب ان تحمى من التأريخ (لا: ١٠٩).
[3] العقيدة في اهل البيت بين الافراط والتفريط. د. سالم السحيجي (لا: ٢٩١).

ساتەکاندا بە ئیش و کاری نەتەوەکەیەوە، وەك جەنگی هەڵگەڕاوەکان و شتانی تریشەوە.

هەروەك دەیزانی کە گەڕانەوەی بۆ لای باوکی نزیك بۆتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ)هەواڵی پێدابوو کە تۆ یەکەم کەسم دەبیت پاش خۆم دەگەیت پێم، واتا دەمریت، هەر کەسێك وەك ئەو بزانێت کە نزیکە بمرێت هەرگیز دونیا و دونیا پەرستی نایەت بە خەیاڵیدا. چەند جوانە وتەکەی (موهیب) کە ئیمام عەینی بۆمانی پاراستووە کە دەڵێت: «یەك کەس ریوایەتی وای نەگێڕاوەتەوە کە گوایە یەکیان دیبێت و سڵاویان بۆ یەکتر نەکردبێـت، بەڵکو هەر لە ماڵ دەمایەوە و لە ماڵ دەرنەدەچوو، کە ڕاوی ناوی بردووە بە دەنگ وەرگرتن».[1]

ئەمەو ئەوەش دووپات کراوەتەوە کە ئەبو بەکر (ﷺ) لە سەردەمی خەلافەتەکەیدا بەردەوام دەستی بە خزمانی پێغەمبەرەوە بوو و لە فەیئەکەی پێغەمبەری خوا کە لەو دینە بوو پێی دەدان و لە ماڵەکەی فەدەك و پێنج یەکی خەیبەری بەش دەدان، بەڵام وەك میرات دابەشی نەکردووە بە سەریاندا و ئەمەش لەسەر وتەی پێغەمبەری خوا خۆی (ﷺ).

لە محمدی کوڕی حوسەینەوە دەگێڕنەوە کە ناسرابوو بە محمد الباقی و هەروەها لە زەیدی کوڕی عەلی یەوە کە وتویانە: بە هیچ شێوەیەك لە ئەبو بەکر نەبینراوە ستەم یان لادان یان هەرگیز (خزمانی پێغەمبەر)نەبیستراوە لێیان سکاڵای زوڵم یان ماف خواردنیان کردبێت.[2]

پاش ئەوەی کە شەش مانگ بەسەر مردنی پێغەمبەری خوادا تێپەڕی فاتمە کۆچی دوایی کرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پێدا کە ئەو یەکەمین کەسە لە خزمانی پێغەمبەر پێی، لەگەڵ ئەوەشدا پێی فەرموو: «اما ترضين أن تكون سيدة نساء أهل الجنة؟»، واتا: ئایا ڕازی نابیت بەوەی کە سەرداری ئافرەتانی بەهەشت بیت؟

ئەو کاتەش ڕۆژی سێ شەممە (٣)ی ڕەمەزانی (١١)ی کۆچی بوو، لە مالیکی کوڕی جەعفەری کوڕی محمد لە باوکیەوە و ئەویش لە باپیریەوە عەلی کوڕی حسین دەڵێت: فاتمە لە نێوان نوێژی مەغریب و عیشا کۆچی دوایی کرد و ئەبو بەکر و عوسمان و زوبەیر و عبدالرحمن

---

[1] أباطل يجب ان تحمى من التأريخ (لا: ١٠٨).
[2] المرتضى لابن حسن الندوي (لا: ٩٠-٩١). تقلا عن نهج البلاغة شرح ابي حديد.

کوڕی عەوف ئامادەی بوون، کاتێك ئامادەی نوێژکردن کرا عەلی وتی: ئەبو بەکر بەرنوێژی بکە، ئەبو بەکر وتی: چۆن تا تۆ وەستابیت ئەی ئەبو حسن؟ عەلی وتی: بەڵێ برۆ پێشەوە، سوێند بە خوا جگە لە تۆ کەسی تر نوێژی لەسەر ناکات، ئەبو بەکر نوێژی بەسەرەوە کرد و هەر بە شەو بە خاك سپێردرا.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە ئەبو بەکر (ﷺ)نوێژی لەسەر فاتمە کرد (خوا لێی ڕازی بێت) و چوار (الله اکبر)ی کرد،[1] لە ڕیوایەتی مسلم هاتووە کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب نوێژی بەسەرەوە کردووە و ئەو ڕیوایەتەش صەحیح و ڕاستە.[2]

ئەمەو پەیوەندی صدیق (ﷺ) بە خزمانی پێغەمبەرەوە (أهل البيت) پەیوەندیکی خۆشی و پڕ لە ڕێز بووە کە شایانیان بێت، و دۆستایەتی و خۆشەویستی لە نێوان ئەبو بەکر و عەلی دا هەبووە و عەلی یەکێك لە کوڕەکانی خۆی ناو ناوە ئەبو بەکر.[3]

عەلی (ﷺ) لە پاش مردنی ئەبو بەکر محمدی کوڕی گرتە ئەستۆ و خستیە ژێر چاودێری خۆی و لە سەردەمی خۆیدا هەڵی بژارد بۆ والی یەکێك لە شوێنەکان و تەنانەت ئەوەشی لەسەر کەوت، زمانەکان دەم درێژیان کرد ڕەخنەیان لێ گرت لەبەر ئەو کوڕەی ئەبو بەکر.[4]

ئەمەی باسمان کرد هەندێ بوو لەو مەسەلانەی کە صدیق چارەسەی کردن و دەستی گرت بە شوێن کەوتنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە هەموو سووربوون و وردیەکەوە خوا لە ئەویش و هەموو هاوەڵە بەڕێزەکان خۆش بێت.

***　***　***　***　***

---

[1] المرتضی للندوي (٩٤)، نقلا عن الطبقات الكيرى (٢٩/٧).
[2] مسلم ژمارە: ١٧٥٩.
[3] المرتضی – الندوي (لا: ٩٨).
[4] المرتضی – الندوي (لا:٩٨).

# بەشی سێیەم

## سوپای ئوسامە و جیهادی صدیق (ﷺ) لەگەڵ پاشگەزبووەکاندا:

## جێ باسی یەکەم

## سوپای ئوسامە

### یەکەم: خستنە ڕێی سوپای ئوسامە (ﷺ) لە لایەن ئەبو بەکرەوە (ﷺ):

دەوڵەتی ڕۆمان یەکێك بوو لەو دوو دەوڵەتەی لە کەنداوی عەرەبییەوە نزیك بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، زۆرێك لە بەشی سەرووی کەنداوی داگیر کردبوو،فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچانە لە لایەن دەوڵەتی ڕۆمانەوە دیاری دەکران و گوێڕایەڵی ڕۆمەکان بوون.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگخوازان و نوێنەری خۆی ناردە ئەو ناوچانە و (دحیە الکلبی) بە نامەیەکەوە نارد بۆ لای (هەرقل)ی ڕۆم و تیایدا بانگی کرد بۆ موسوڵمان بوون[1]، بەڵام سەرکەشی نواند و لووت بەرزی بردی بە قوڕدا، نەخشەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زۆر ئاشکرا بوو کە مەبەستی بوو هەیبەت و شکۆی ڕۆم لەبەر چاوی عەرەبدا بشکێنێت، پاشانیش ڕزگارکردنی ناوچەکانیان لە لایەن سوپای ئیسلامەوە بێتە دی.

لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا سوپایەکی نارد و لەگەڵ عەرەبە گاورەکان و سوپای ڕۆمدا بەشەڕهاتن لە ناوچەی مۆتە سەرکردەکانی سوپای ئیسلام یەك بە یەك شەهید بوون کە ئەمانە بوون زەیدی کوڕی حارسە و پاشانیش جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب پاشان عبداللە ی کوڕی ڕەواحە - خوایان لێ ڕازی بێت - و پاش ئەوان شمشێری خوا خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) سەرکردایەتی سوپاکەی گرتە دەست و سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ مەدینەی پڕ نور.[2]

لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا لەگەڵ سوپاکەیدا دەرچوو بەرەو وڵاتی شام و بە سوپایەکی گەورەوە گەیشتە تەبووك[3]، بەڵام نە لەگەڵ ڕۆم و نە لەگەڵ هۆزە عەرەبەکاندا تێك هەڵنەشاخا و

---

[1] البخاري كتاب الوحي (ژمارە: ٧).

[2] السيرة النبوية الصحيحة للعمري (٢/٤٦٧-٤٧٠).

[3] مسلم كتاب الفضائل (٤/٤٧٨٤).

سەرکردەی ئەو ناوچە و شارانە لەگەڵی ڕێککەوتن لەسەر دانی سەرانە و پاش بیست ڕۆژ مانەوە لە تەبووك سوپای ئیسلام بەرەو شاری مەدینە گەڕانەوە.[1]

لە ساڵی (١١)ی کۆچیدا پێغەمبەری خوا نیازی کرد هێرشێك بەرێت بۆ سەر ڕۆمەکان لە ناوچەی بەلقا و فەلەستین بە سوپایەکەوە کە گەورە هاوەڵانی کۆچەریان و پشتیوانان تیایدا سەرباز بوون و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد بە سەرکردەیان.[2]

(حافظ ابن حجر) دەڵێت: ئامادەکردنی سوپاکەی ئوسامە لە ڕۆژی شەممەدا بوو دوو ڕۆژ پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)، واتا پێش نەخۆشیەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پێکرد و هانی خەڵکی دەدا بۆ جەنگی ڕۆم لە دوایین ڕۆژەکانی مانگی سەفەردا.

ئوسامەی بانگ کرد و پێی فەرموو: «سر الى موضع مقتل أبيك فاوطئهم الخيل، فقد وليتك هذا الجيش»،[3] واتا: بڕۆ بۆ ئەو شوێنەی کە باوکتی تێدا شەهید کرا و با پای وڵاخەکەت بگاتە ناو جەرگەیان، من کردوومیت بە سەرکردەی ئەم سوپایە.

هەندێ کەس تانەیان دا لە سەرکردەیی ئوسامە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بەم فەرموودەیە وەڵامی دانەوە: «ان تطعنوا في امارته فقد طعنتم في امارة ابيه من قبل، وايم الله! ان كان لخليقاً للامارة، وان كان لمن احب الناس اليّ، وان هذا لمن احب الناس اليّ بعده».[4]

واتا: ئەگەر تانە لە فەرماندەیی ئوسامە بگرن ئەوە پێشتریش تانەتان لە فەرمانڕەوایی باوکی داوە، سوێند بە خوا! شایانی فەرماندەیی بووە و هەر ئەویش خۆشەویست ترین کەسم بووە و ئەمەش خۆشەویست ترین کەسمە دوای ئەو.

[1] الاسيرة النبوية الصحيحة (٢/٥٣٥).
[2] قصة بعث جيش أسامة، د. فضل الهي(لا: ٨).
[3] فتح البارى (٨/١٥٢).
[4] البخاري كتاب المفازي (ژمارە: ٤٤٦٩).

له پاش ئامادەكردنی سوپا بە دوو ڕۆژ پێغەمبەری خوا نەخۆش كەوت و ئازار زۆری بۆ هێنا و سوپاكەش لە ناوچەی (جورف) مایەوە لە (٣) میل لە مەدینەوە دوور بوو، پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینە.[١]

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ لای پەروەردگاری بە سۆز وەزع بە تەواوی گۆڕا و بەو شێوەیەی لێهات كە دایكی باوەڕداران عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) باسی دەكات و دەڵێت: كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) گیانی كێشرا سەرتاسەری عەرەب پاشگەز بوونەوە، دووبەرەكی ئاوێتەی دڵەكان بوو، سوێند بە خوا ئەوەی بەسەر من هات بەسەر كێوە سەركەشەكانیش بهاتایە تێك دەشكان، هاوەڵانی محمد (ﷺ) وەك ڕانە مەڕێكی بێ شوان و لە شەوێكی باراناویدا و لەناو دارستانێكی پڕ لە دڕندەیان لێهاتبوو.[٢]

لە ڕۆژی سێیەمدا ئەبو بەكر (رضي الله عنه) خەلافەتی گرتە دەست و فەرمانی دا بە پیاوێك لە ناو خەڵكیدا جاڕبدات: «دەبێت سوپای ئوسامە بەڕێ بكەوێت و یەك كەس لە سوپای ئوسامە ئەمشەو لە مەدینەدا نەمێنێت و خێرا خۆی بگەیەنێتەوە جورف».[٣]

ئەبو بەكر (رضي الله عنه) هەستایە سەر پێ و ستایشی خوای كرد و وتی: منیش یەكێكم وەك ئێوە، من نازانم لەوانەیە ئێش و كارێك بە من بسپێرن كە پێغەمبەری خوا بۆی جێبەجێ كرابێت چونكە ئەو خواهەڵی بژارد لە بۆ هەموو جیهان و لە هەموو كۆسپ و نەهامەتیەك پاراستوویەتی، وە من شوێنكەوتەم و داهێنەر نیم، ئەگەر ڕاست بووم دەنگم پێ بدەن و ئەگەر لایشم دا ڕاستم بكەنەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) گیانی كێشرا تەنها كەسێ شتێكی لەسەر نەبوو تەنانەت قەمچیەكیشی بە ناڕەوا لە كەس نەدابوو، من شەیتانێكم لەگەڵدایە و دێتە ڕێگام خۆتانم لێ لابدەن، ئێوە دێن و دەچن و ئەجەلیش لێتان شاراوەیە كاتەكەی، ئەگەر دەتوانن كاتێك ئەجەلتان دێت لە كردەوەی چاكی خوایی دا بن بیكەن، وە ئەمەش بە یارمەتی خوا نەبێت ناتوانن و لە كاتێكدا ئەجەل مۆڵەتتان پێ دەدات كردەوەتان چاك بكەن پێش ئەوەی

---

[١] السيرة النبوية في ضوء المصادر الاصلية (لا: ٦٨٥).
[٢] البداية والنهاية (٦/٣٠٩).
[٣] **هەمان سەرچاوە (٦/٣٠٧).**

ئەجەل ڕێتان پێ بگرێت و نەهێڵێت کردەوەی چاك بکەن، کەسانێك بوون لەبیریان چوو دەمرن و کردەوەی چاکیان خستە دوای مردن، دەخیلتان بم لەوانە مەبن، لێنەون، لێنەون، پەلە بکەن، پەلە بکەن، خۆ دەرباز کەن، خۆ دەرباز کەن، داواکاری زۆر بە دواتانەوەن، ئەجەلێك کە زۆر کت و پڕ و خێرایە، ئاگاتان لە مردن بێت، لە باو و باپیر و منداڵتان پەند وەربگرن، بە گوێی زیندووەکان مەکەن مەگەر بەو شێوەیەی بە گوێی مردووەکانتان کرد.

دەڵێت: دووبارە هەستایە سەر پێ و سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی: خوا هیچ کردەوەیەك وەرناگرێت تەنها ئەو کردەوانە نەبێت کە لەبەر خاتری ئەو کرابێت و بەس، تەنها لەبەر خوا کاری چاکە ئەنجام بدەن چونکە ئەو دڵسۆزیەتان بەکاردێت بۆ ڕۆژی نەبوونی پێداویستیتان، پەند وەربگرن ئەی بەندەکانی خوا لەو کەسانەی پێش خۆتان مردوون، بیر لەوانەی پێش خۆتان بکەنەوە، تا دوێنێ لە کوێ بوون؟ ئەی ئەمڕۆ کوان چییان بەسەر هات؟ کوان دەسەڵاتدارەکانی ناو گۆڕەپانی جەنگ و سەرکەوتوانی جەنگەکان، ڕۆژگار جێی پێ لەق کردن و ئێستا بوون بە خۆڵ، نەبوونی و نەهامەتی زۆریان بەسەردا هات، پیاوانی خراپەکار بۆ ژنانی خراپەکار و ژنانی خراپەکار بۆ پیاوانی خراپەکار.

کوان ئەو پاشایانەی زەویان ئاوەدان کردۆتەوە؟ دوور خرانەوە و باسیان نەما، وەك هەر نەبووبن، بەڵام خوای گەورە ئاکامی کارە ناشایستەکانیانی هێشتۆتەوە لەسەریان، لە حەز و ئارەزواتی کردن، ڕۆیشتن و کردەوەش کردەوەی خۆیانە و دونیاش دونیای کەسانی ترە.

ئێمەش بە دوایاندا هاتووین، ئەگەر پەندیان لێ وەربگرین ڕزگارمان دەبێت، ئەگەر ئێمەش گل بینەوە وەك ئەوانمان لێ دێت، کوان دەم و چاوە درەوشاوە و جوانەکان، ئەوانەی بە گەنجێتی خۆیان سەرسام بوون؟ بوون بە خۆڵ، وایان لێهات پەشیمان بوون لەسەر ئەو پێداکێشانە ناڕەوایانەیان.

کوان ئەو پاشایانەی شاری گەورە و قەڵای مەزنیان دامەزراند و شتانی سەر سووڕهێنەریان تیا دادەنا؟ بە جێیان هێشت بۆ خەڵکانی دوای خۆیان و ئەوە ماڵەکانیانە و بوونەتە کەلاوە و خۆیشیان لە ناو گۆڕەتاریکەکاندا ڕاکشاون.

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا ﴿٩٨﴾﴾ (مريم: ٩٨)، واتا: چەندان سەدەی پێش ئەوانمان لەناو بردووە و ئایا هەست بە مانیان دەکەیت یان گوێت لە چپەیان دەبێت؟

کوان ئەوانەی دەتانناسین لە باوك و براکانتان؟ ئەجەل هات و تەواوی کردن، ڕۆیشتن بۆ ئەو جێگەیەی لێی هاتبوون و بە نەگبەتی یان بە بەختیاری لە پاش مردن، خوای گەورە هاوەڵی نیە و لە نێوان ئەو و هیچ کەس لە دروست کراوەکانیدا هۆکارێك نیە تا بە هۆیەوە خێر و چاکەی پێ بدات، و لە خراپەش دووری بخاتەوە، تەنها بە گوێڕایەڵی و شوێن کەوتنی و زمانەکانیەتی، وە بزانن ئێوە بەندەیەکی قەرزارن و ئەو شتانەی لای خوایش بە گوێڕایەڵی نەبێت دەست ناکەوێت، دەی کاتی ئەوە هاتووە ئاگری دۆزەخ لە خۆتان لابدەن و لە بەهەشتیش دوور نەکەونەوە.[1]

لەم وتارەدا کۆمەڵێك پەند و ئامۆژگاری هەیە لەوانە:

أ- ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئەو جێگری پێغەمبەری خوایە و جێگری خوای گەورە نیە، ئەو مرۆڤێکی پارێزراو و بێتاوان نیە (معصوم)، ناتوانێت لە جێی ئەو بێت لە پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەیدا، بەڵکو لە سیاسەتەکانیدا شوێنکەوتەیە نەك داهێنەر (مبدع)، واتا لەسەر بەرنامەی پێغەمبەرە (ﷺ) لە حوکم کردن بە دادپەروەری و چاکەخوازیدا.[2]

ب- دیاریکردنی ئەرکی گەل (میللەت) لە چاودێری کردنی سوڵتان و یارمەتی دانی تا بە چاکی بێنێتەوە و ئامۆژگاری بکەن و پشتی بگرن تا لە ڕێگەی ڕاست بەردەوام بێت و لە سونەت لانەدات و دەست نەکات بە خودکاری (بدعە).

ج- ئەوەی ڕوون کردەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادپەروەر بووە لە نێوان گەلدا و ستەمی لە کەس نەکردووە، لەبەر ئەوە مافی یان سکاڵایەکی گەورە یان بچووکی لەسەر پێغەمبەر نەبووە،

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٠٧-٣٠٨).
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (٤٢٣).

وە ئەوە دەگەیەنێت کە منیش لەسەر هەمان پەیڕەو و پرۆگرامی ئەو دەڕۆم لە بلاوکردنەوەی داد و دورکەوتنەوە لە ستەمکاری، و پاشان لەسەر گەلە لەم بوارەدا هاوکاری بن، ئەگەر بینیان تورەیە با لەو کاتەدا لە نزیکی نەبن نەوەك ئازارێکیان پێ بگەیەنێت، ئەو کاتە سەرپێچی ڕێرەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەکات،[1] ئەو شەیتانەی دێتە ڕێی ئەبوبەکر دێتەڕێی هەموو ئادەمیزادێك، چونکە هەموو کەسێ خوای گەورە هاوەڵێکی بەردەوامی چاکی فریشتەی هەیە و هاوەڵێکی خراپی لە جن هەیە.[2]

شەیتانیش لە مرۆڤەوە نزیکە وەك چۆن خوێن بەناو ڕەگەکانی لەشیدا هاتوچۆ دەکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت (ما من احد الا وقد وكل به قرينه من الملائكة و قرينه من الجن)، پێیان ووت تەنانەت تۆش پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: وانا الا ان الله اعانني عليه فاسلم فلا يامرني الا بخير)،[3] واتە: هیچ کەسێك نییە خوا دوو هاوەڵی هەمیشەیی بۆ دانەنابێت یەکەم لە فریشتەیە و دووەم لە جنۆکە، وتیان: ئەی تۆ، فەرمووی: منیش بەلام ئەوەندە هەیە خوا یارمەتی دام و موسڵمان بووە و بە چاکە نەبێ فەرمانم پێ نادات).

هەروەها لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە کاتی لەشەودا بوو پێغەمبەری خوا لە دەرەوە لەگەڵ (صفیە) ی خێزانیدا قسەی دەکرد و لەو کاتەدا هەندێ لە پشتیوانان لەوێوە تێپەڕین بەخێرایی، پێی فەرومون (على رسلكما، انها صفية بنت حي، ثم قال: اني خشيت ان يقذف الشيطان في قلوبكما شيئا ان الشيطان يجري من بني ادم مجرى الدم)،[4] واتە: لەسەر خۆ بڕۆن، ئەوە صفیەی کچی حویی یە خێزانەکەم، و پاشان فەرمووی: لەوە ترسام شەیتان شتێ بخاتە دڵتانەوە، چونکە شەیتان وەك خوێن بەناو ڕەگەکانی مرۆڤدا هاتوچۆ دەکات، مەبەستی صدیق لەمەدا: ئەوە بوو کە بڵێ من بێ تاوان(معصوم) نیم وەك پێغەمبەری (ﷺ) و ئەمەش ڕاستیەکە.[5]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[2] ابو بكر الصديق، محمد مال الله (لا: ١٩٦).
[3] مسلم (٢١٦٧/٤-٢١٦٨).
[4] البخاري كتاب بدء الخلق (١٢٤/٤).
[5] ابو بكر الصديق، محمد مال الله (لا: ١٩٧).

د- سووربوونی صدیق لەسەر ئامۆژگاری کردنی موسڵمانەکان و مردن خستنەوە بیریـان و باسی ئاکامی پاشاکانی پێشووی بۆ کردن و هانی دان بۆ کاری چاکە تا خۆیان ئامادە بکەن بۆ گەیشتن بەخوا و لە ژیانیشدا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست لەسەر ڕێڕەوی پرۆگرامی خوای گەورە برۆن.[1]

تێبینـی ئـەوەش دەکـەین کـە چـۆن صـدیق (ﷺ) تـوانی لـە وتارەکەیـدا توانـای ڕوونکردنەوەی دەربخات بۆ نەتەوەکەی، ئەو بە تواناترین وتاربێژانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو.

مامۆستا عەقاد دەربـارەی دەڵێـت (وتارەکـانی صـدیق (ﷺ) سـەنگینترین بـووە بـە پێوانەی خەڵکی و ژیربێژیش، وتەی بێ وێنەی وای هەیە کە بەڵگەیە لەسەر شـارەزایی تـەواوی خاوەنەکەیی و کەمێکی ئەوەندە جوان لە باتی زۆردا دەبێت، هـەروەك چـۆن مـشتێك نیـشانەی خەروارێکە بەسە کە ئالەم بڕگانەوە کانگاوی فیکـر و دەروونـی صـدیقت بـۆ دەربکـەوێت کـە دەڵێت: «بەرەو ڕووی مردن برۆ ژیانت دەست دەکـەوێت» یـان «ڕاسـترین ڕاسـتگۆیی دەسـت پاکیە» و «خراپترین درۆیش ناپاکیە»، «ئارامی نیوەی باوەڕە یەقین هەموو باوەڕە».

ئەمانە وشەیەکن ڕاستی و پێکانی مەبەستیان پێوە دیارە و هەروەك ڕەوانبێژی و جـوان دەربڕینیان پێوە دیارە، مانای ئەوەیە کانزایـە و کـانێکی لـە پـشتدایە، خـۆی لـە درێـژدا دڕی ڕۆشنبیرەکان لاداوە کە دەیانەوێت ڕۆشنبیری خۆیان دەربخەن، چونکە ئەم تێگەیـشتنە نـاوکرۆکی ڕۆشنبیریە، ئەو خاوەنی لێهاتوویی لە وتارەکەیدا بوو بە تەنیشتی ڕەوانبێژی لە قسەدا.[2]

**ردووەم: لەنێوان ئەبو بەکر و هاوەڵاندا دەربارەی دەرکردنی سوپای ئوسامە:**

هەندێ لە هاوەڵان پێشنیاریان بۆ کرد کە سـوپاکە بهێڵێتـەوە ووتیـان: ئەمانـە گـەورە پیاوانی ناو ئیسلامن و عەرەبیشن وەك دەبینن سنگیان لێ هەڵتەکاندوویت و نابێت ئەو سوپایە لە خۆت دوور بخەیتەوە.[3]

ئوسامەیش عومەری کوڕی خـەتتابی ڕاسـپارد کـە بـڕوات ڕوخـسەت لـە ئـەبو بـەکر وەربگرێت تا سوپاکەی بۆ مەدینە بگێڕێتـەوە، وتـی: مـن سـەردار و گـەورەی موسـوڵمانەکانم

[1] تاريخ الدوة الى الاسلام (لا: ٤٢٣).
[2] عبقرية الصديق (لا: ١٣٩).
[3] البداية والنهاية (٣٠٨/٦).

هەموو لەگەڵدایە و ترسم هەیە کە بێباوەڕانی هێرش بکەنە سەر خەلیفەی پێغەمبەری خوا و خێزان و کەس و کارەکەی (ﷺ).[1]

بەلاّم ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بەگوێ ی کەسی نەکرد هەر سوور بو لەسەر ناردنی سوپاکە بۆ شام ئیتر بار و کەش و ئاکامەکان بەچی دەگەن بگەن، بەلاّم نە ئوسامە و نە سەرانی سوپاکەی بەو کارە دڵ ئاسودە نەبوون و کۆمەڵێ هەوڵی تریان دا بۆ ئەوەی ئەبوبەکر ڕازی بکەن بەڕاکەی خۆیان و کاتێ کە زیاتر سەرکرایە جەرگی ئەبوبەکر، کۆچەریان و پشتیوانانی کۆکردەوە و بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلەیە کۆی کردنەوە، لەم دانیشتنەدا لێکۆڵینەوەیەکی تێر و تەسەل و دوور و درێژ لەو بارەیەوە کرا و لە سەرووی نەیارەکانیەوە عمری کوڕی خەتتاب بوو (رضي الله عنه) کە ئەوەی دەردەخست کە ترسی خەلیفە و خێزانەکانی پێغەمبەری خوا و شاری مەدینە بوو کە بکەوێتە ژێر چنگی عەرەبە پاشگەز بووەکان، بەلاّم هەر کە زۆربەی هاوەڵە مەزنەکان لەسەر ئەو ڕایە سووربون و ترسی گەورەیان لەسەر خەلیفە و مەدینە بوو ئەگەر ئەو سوپایە لەوێ نەمێنێ، ئیتر ئەبوبەکر بلاّوەی بە دانیشتنەکەی کرد کە دانیشتنی یەکەم بوو.[2]

بۆ ئەوەی بە جوانتر و بە درێژتر لەو بارەیەوە وتو وێژ بکەن دانیشتنی یەکەمی هەڵگرت و دانیشتنێکی گەورەتری لە مزگەوتدا بەرپاکرد تا زیاتر بوار هەبێت بۆ هەموان کە سەربەستانە ڕای خۆیان بخەنە ڕوو.[3]

لەو دانیشتنە گەورەیەدا ئەوەی بە هاوەڵان ڕاگەیاند کە ئەو بیرە لە مێشکیان دەربکەن کە پروژەیەك ڕەتبکاتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایمەزراندووە و پێی ڕاگەیاندن کە ئەم پرۆژەیە دەگەیەنمە شوێنی خۆی ئەگەر عەرەبە دەشتەکیە پاشگەز بووەکانیش مەدینە داگیر بکەن و ڕووی کردە هاوەڵان و بە دەم وتاردانەوە پێی وتن (والذی نفس ابي بکر بیده: لو ظننت ان السباع تخطفني لانفذت بعث اسامة کما امر بە رسول الله (ﷺ) ولو لم یبق فی القری غیري لانفذته).[4]

---

[1] الکامل لابن کثیر (٢/٢٢٦).
[2] الشوری بین الاصال والمعاصرة، عزالدین التمیمي (٨٢-٨٣).
[3] ملامح الشوری في الدعوة الاسلامیة، عدنان المحوی (لا: ٢٥٧).
[4] تاریخ الطبري (٤/٤٥).

واتە سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر بشزانم شێر و پڵنگ دەمفڕێنن هەر ئەو سوپایەی ئوسامە دەخەمەڕێ هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی داوە، ئیتر با لە مەدینەشدا کەس نەمێنێ خۆم نەبێت.

بەڵێ بەڕاستی ئەبوبەکر لەسەر ڕاستی بوو کاتێ دەیویست سوپای ئوسامە بەڕێ بخات لە کاتێکدا هەموو موسڵمانان دژی ئەو بڕیارە بوون، چونکە ئەوە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆژگار و ڕووداوەکان سەلماندیان کە ڕایەکەی ڕاست و دروست بوو کاتی سوور بوو لەسەر جێ بەجێ کردنی.[1]

پشتیوانەکان داوایان کرد کە کەسێکی بە تەمەنتر لە ئوسامە بکاتە سەرکردەیان و بۆ ئەو مەبەستە عمری کوڕی خەتابیان نارد بۆ لای ئەبوبەکر (رضي الله عنه) تا لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکات.عمر (رضي الله عنه) وتی: پشتیوانان داوا دەکەن کەسێکی لە ئوسامە بەتەمەن تریان بکەیتە سەرکردە.

هەر کە ئەبوبەکر ئەو قسەیەی بیست پەلاماری عمری دا و ڕیشی گرت و پێی ووت: دایك ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات و لەناو چیت ئەی کوڕی خەتاب: پێغەمبەری خوا (ﷺ) داینا وە ئەتەوێت من لاییبەم؟ عمر هەستا و چووە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکە و پێیان ووت: چیت کرد؟ وتی: بکەونەڕێ دایك ڕۆڵەڕۆتان بۆ بکات: بە بۆنەی ئێوەوە لەلایەن خەلیفە وە تووشی ئەوە و ئەوە بووم.[2]

پاشان ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) ڕۆشت بۆ ناو سوپاکە و یەك یەك سەیری کردن و لەگەڵیاندا کەوتەڕێ، ئەو بە پێ دەڕۆیشت و ئوسامەیش بە سواری، وعبد الرحمن کوڕی عەوف ڕەشۆی ولاخەکەی ئەبوبەکری بە دەستەوە گرتبوو، ئوسامە ڕووی کردە خەلیفە پێی ووت: ئەی جێ نشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوێند بەخوا یان تۆش سواربە یان منیش دادەبەزم. ئەویش وتی: سوێند بە خوا نە تۆ دادەبەزیت و نە منیش سوار دەبم، چی تیایە ئەگەر لە پێناوی خوادا قاچەکانم خۆڵاوی بن.

---

[1] الشورى بين الاصال والمعاصرة (٨٣).
[2] تأريخ الطبري (٤٦/٦).

پاشان صدیق (ﷺ) بە ئوسامەی ووت: ئەگەر دەتەوێت هاوکاریم بکەیت بەڵکو (عمر)م بۆ جێ بهێڵین؟ ئوسامەش: عمری بۆ گل دایەوە. واتە عمر بکاتە وەزیری خۆی.[1]

پاشان صدیق (ﷺ) ڕووی کردە سوپاکە و پێی وتن: ئەی خەڵکینە، ڕاوەستن با دە ئامۆژگاریتان بکەم و لەمنەوە وەری بگرن و بیپارێزن بۆم، ناپاکی مەکەن، دەستکەوت نەشارنەوە بۆ خۆتان ، غەدر و پەیمان شکێن نەکەن، و جەستەی کەس نە شێوێنن، درەختی بەردار نەبڕن، بزن و مەڕ و مانگا و حوشتر سەرنەبڕن مەگەر لەبەر خواردن و برسێتی، ئێوە دەگەن بە کەسانێك لە گۆشەیەکدا خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ بەندایەتی وازیان لێ بهێنن با خەریکی کاری خۆیان بن، دەگەن بە خەڵکانێك خواردنتان لێ ڕا دەدەن ئێوەش ئەگەر ویستتان لێیان وەربگرن و بیخۆن و ناوی خوای گەورەی لێ بێنن، وە دەگەن بە گەلانێك کە بە جۆرێك سەریان تاشیوە ناوەڕاستی سەریان دەتاشن و ئەم لاو ئەو لاکەی دەهێڵنەوە بە شمشێر بدەن لە ملیان، بە ناوی خواوە هەنگاو هەڵبگرن.

پاشان صدیق ئامۆژگاری ئوسامەی کرد کە بەو جۆرە ڕەفتار بکات کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردوویەتی پێی وت: بەو شێوەی بکە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێ داویت لە ناوچەی (قضاعة)ەوە دەست پێ بکە و پاشان برۆ بەرەو (ئابل)[2] و کەم و کوڕی مەکە لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پەلە پەل مەکە لەو کارەی بە تۆی سپاردووە.[3]

ئوسامەش هەر بەو شێوەیەی کرد بە سوپاکەی و گەیشتنە ناوچەی (قضاعة) و سوارەکانی تێدا بڵاوکردەوە و دای بەسەر ئابلدا سەرکەوت و دەستکەوتی باشیشی دەستکەوت،[4] ڕۆیشتن و گەڕانەوەی چل ڕۆژی پێ چوو.[5]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] ناوچەیەکە لە خوارووی ئەردەنی ئێستاوە.

[3] تاریخ الگبری (٤٧/٤).

[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[5] تاریخ خلیفە بن خیاگ (لا:١٠١).

هەواڵی مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دەرچوونی سوپای ئوسامە بەیەکەوە گەیشتە (هێرقل) و ڕۆمەکان وتیان: ئەمانە چین سەرکردەکەیان دەمرێت کەچی لە هێرش کردن بۆ سەر ناوچەکانمان ناکەون؟!،[1] و عەرەبەکانیش وتیان: ئەگەر هێز و توانایان نەبێت ئا لەم کاتەدا ئاوا هێزێك دەرناکەن[2]، بۆیە لە زۆر شت دەستیان هەڵگرت کە دەیانویست بیکەن.[3]

**سێیەم: گرنگترین پەند و ئامۆژگاری لە دەرکردنی سوپای ئوسامە لە لایەن ئەبوبەکری صدیقەوە (ﷺ):**

١- گوزەرانەکان دەگۆڕێن و ناڕەحەتیەکان دێن و بەڵام باوەڕداران فەرمانی ئایین لە یاد ناکەن:

گۆڕانکاری زۆر ترسناك و ناڕەحەتە! چەند خێرایە! پاك و بێگەردی بۆئەو خوایەی گوزەرانەکان دەگۆڕێت بە ئارەزووی خۆی لە جۆرێك بۆ جۆرێکی تر (فعال لما يريد)[4] هەرچی بوێت دەیکات.

عەرەب چین چین نوێنەریان دەنارد بۆ مەدینە بۆ گوێڕایەڵی و ملکەچی و بەلێشاوێك دەهاتن تا ئەوەبوو ساڵی نۆیەمی کۆچی ناونرابوو (ساڵی شاندەکان) کەچی حاڵ وا دەگۆڕێت خەڵکی مەدینە دەترسان هۆزە عەرەبەکان بێن و بدەن بەسەر پایتەختدا نەك هەر ئەوەندە بەڵکو دەترسان بدەن بەسەریاندا و ئیسلام و موسوڵمانان لە بناغە دەر بهێنن.[5]

ئەمەش شتێکی نامۆ نیە، سونەتی خوا لەسەر هەموو گەلێك هەر وابووە و بەردەوام لەسەر حاڵێك نەماوەتەوە بەڵکو دەگۆڕێت بە جۆرەها گۆڕان، ئەمەش ئەو خوایە هەواڵی پێداوین کە خۆی ڕۆژگارەکان بەو شێوەیە خۆی دەیەوێت دەگۆڕێت وەك دەفەرمووێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ (ال عمران: ١٤٠).

---

[1] عهد خلفاء الراشدون للذهبي (لا: ٢٠).
[2] قصة بعث ابي بكر جيش أسامة
[3] الكامل لابن كثير (٢/٢٢٧).
[4] البروج (١٦).
[5] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ١٨).

ئەبو بەکری ڕازی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: واتە ڕۆژەکان ئەگێرێت لە ناو خەڵکدا، نەخۆشی و نەناخۆشی لە لای کەسێك نامێنێت، ڕۆژێ ئەو دڵخۆشە و دوژمنانی نیگەرانن کەچی ڕۆژی داهاتوو بە پێچەوانەوە و هیچ حاڵێك و هیچ گوزەرانێك تا سەر بۆ کەس بەردەوام نابێت.[1]

بە شێوەی کرداری داهاتوو هاتووە (نداولها) مانای ئەوە دەگەیەنێت ئەم سونەتەی خوا بەردەوام لە تازەبوونەوەدایە و گەلان لە گۆڕانکاریدان ئا لەم بارەیەوە قازی ئەبو سعود دەڵێت: «شێوازی داهاتووی مانای ئەوەیە تازەگەرێتی و بەردەوام نەمان لەسەر حاڵێك سونەتێکە و هەموو گەلان بەگشتی پیا تێدەپەڕن»[2]، وتویانە: «الایام دول والحرب سجال»، واتا: ڕۆژان دەگەڕێن بەناو هەمواندا و جەنگیش بە جارە جارێ ئەو و جارێ ئەتۆ.[3]

شاعیریش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| فيوم علينا ويوم لنا | ويوم نساء يوم نسير |
| ڕۆژێك ڕۆژمانە و ڕۆژێکیش نا | ڕۆژێك خەفەتبار ڕۆژێکیش خۆشحاڵ |

ئەبو بەکر (ﷺ) ئومەتی ئیسلامی فێری ئەوە کرد کە ئارامی وخۆگری هەبێت لەبەر دەم نارەحەتی و نەهامەتەکاندا و سەرکەوتن لەگەڵ ئارامی دایە، و نابێت مەئویس و بێ هیوا بین لە ڕەحەتی خوا (إن رحمة الله قريب من المحسنين).

موسوڵمان دەبێت هەمیشە ئەوەی لە یاد بێت کە نارەحەتی هەرچەندە زۆر بێت نەهامەتی هەرچەندە بەهێز و گەورە بێت سونەتی خوا وایە بەدوایدا خۆشی و ڕەحەتی دێت ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝﴾ (الشرح: ٥-٦).

موسوڵمانان کارەکانی هەموو جێی سەر سوڕمانن لەم دونیایەدا پێغەمبەری خوا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت: «عجباً لأمر المؤمن ان أمره كله خير وليس ذالك لاحد الا لمؤمن، ان اصابته سراء شكر فكان خيراً له، وان اصابته ضراء صبر وكان

[1] تفسير الرازي (١٥/٩)، تفسير القرطبي(٢١٨/٤).
[2] تفسير ابو سعود (٨٢/٢)، روح المعاني للالوسي(٦٨/٤).
[3] روح المعاني للالوسي(٦٨/٤).

خيراً له»[1]، واتا: ئيش و كاري موسوڵمان سەيرە، هەموو كارێكى خەيرە و ئەمەش تەنها بۆ موسوڵمانە، توشى خۆشى دەبێت سوپاسى خوا دكات خێرى دەگات، وتۆشى نارەحەتى دەبێت و ئارام دەگرێت خێرى دەگات.

كەواتە لەو وانە و پەندە بەسوودانەى لە ناردنى سوپاى ئوسامەدا وەرى دەگرێت ئەوەيە لە گەورەترين و نارەحەت ترين نەهامەتيدا نابێت ئيسلامەكەمان لە ياد بچێت، وە مردنى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) نەتوانى رێگر بێت لەبەردەم صديقدا كە سوپاى ئوسامە بخاتە رێ، كە ئەو توشهاتەيەش زۆر گەورە بوو رووى لە موسوڵمانەكان كردبوو، بەڵام صديق (رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەكەيەوە (ﷺ) فێرى ئەوەبوو كە گرنگى دان بە ئيسلام لە سەرووى هەموو گرنگيەكەوەيە و تا لە ژيانيدا بوو هەر بەو چەشنە بوو.[2]

٢- كاروانى بانگەواز نەبەستراوە بە كەسەوە، پێويستە شوێن پێغەمبەر كەوتن:

لە بەسەرهاتى خستنە رێى سوپاكەى ئوسامە لە لايەن ئەبو بەكرەوە (رضي الله عنه) ئەوە بەدى دەكەين كە صديق (رضي الله عنه) بە كردەوە و بە وتە سەلماندى كە كاروانى بانگەواز وەستانى بۆ نيە، تەنانەت بە مردنى فەخرى كائنات و پێشەواى پێغەمبەران و سەركردەى موسوڵمانانيش (ﷺ).

سەلماندى كە دەبێت كارى بانگەواز بەردەوام بێت بە دەركردنى سوپاى ئوسامە، ئەوە بوو لە رۆژى سێيەمى كۆچى پێغەمبەردا فەرمانى بە جارچيەكەيدا كە سەربازەكانى سوپاى ئوسامە (رضي الله عنه) لە مەدينە دا نەمێنن و خۆيان بگەيەننەوە سەربازگەكەيان لە جورف.

لە وتارەكەيدا كە دوا بە بەيعەت پێدانەكەى پێشكەشى موسوڵمانانى كرد تيايدا ئەوەى دووپات كردەوە كە دەبێت هەوڵ و تێكۆشان بۆ بەرزى ئيسلام دەبێت بەردەوام بێت.[3]

لە ريوايەتەكەيدا هاتووە كە وتويەتى: «خەڵكينە لە خوا بترسن! دەست بە ئيسلامەكەتانەوە بگرن و پشت بە خواى خۆتان ببەستن، ئاينى خوا هەر راوەستاوە، خوا سەرى دەخات ئەو كەسەى ئەو سەر دەخات و ئاينەكەش بەرز رادەگرێت، سوێند بە خوا گوێمان لێ نيە كێ هێرشمان بۆ دێنێت با بيهێنێت، شمشێرى خوا بە بەرشتە و هێشتا دامان نەناوە، دەجەنگين

[1] مسلم (٤/٢٢٩٥).
[2] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٢٤).
[3] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٢٧).

دژی ئەوانەی پێچەوانەمانن هەروەك چۆن كاتی خۆی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا تێدەكۆشاین و هەر كەسەیش سەركەشی بكات بەس بۆ خۆی زەرەر دەكات». [1]

لەو پەندانەی كە دەبێت لە ناردنی سوپای ئوسامەوە وەربگیرێت ئەوەیە كە دەبێت موسوڵمانان لە خۆشی و ناخۆشیدا شوێن پێغەمبەری خوا (ﷺ) بكەون، وە صدیق (رضي الله عنه) بە كردەوە ئەوەی ڕوون كردەوە كە توند بە دانەكانی فەرمانەكانی پێغەمبەری خوای ڕاگیركردووە و جێ بە جێشیان دەكات ئیتر با جۆرەكانی مەترسیشی تێدا بێت، ئەمەش لەم بەسەرهاتەدا چەند جارێك بە ئاشكرا دەركەوت:

أ- كاتێك كە وەزعەكە ناهەموار بوو پێشنیاریان بۆ كرد كە سوپای ئوسامە دەر نەكات ئەویش وتە ڕشنگدارەكەی فەرمووی «سوێند بەوەی گیانی ئەبو بەكری بە دەستە ئەگەر بشزانم دڕندەكان دەمفڕێنن سوپای ئوسامە ئەخەمە ڕێ هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا فەرمانی دەركرد (ﷺ) وە ئەگەر كەسیش نەمێنێت جگە لە خۆم و هەر دەری دەكەم». [2]

ب- كاتێك ئوسامە (رضي الله عنه) داوی لێ كرد كە سوپاكەی لە جورف بگێڕێتەوە بۆ مەدینە لە ترسی هێرشی هەڵگەڕاوەكان و خەمی خەلیفە و پایتەخت، ئەویش ڕێگەی پێ نەدا، بەڵكو ئەوپەڕی ویست و سوور بوونی خۆی دەربڕی لە شوێنكەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتی: ئەگەر سەگ و گورگ فڕاندوومیان هەرگیز ویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەت ناكەمەوە. [3]

بە كردەوە و بەم هەڵوێستە جوامێریەی ئەو ئایەتەی جێبەجێ كرد كە بۆ هیچ كەس نیە ئەگەر خوا و پێغەمبەر فەرمانێكیان دەركرد بە ئارەزووی خۆی بكات لە جێبەجێكردنیدا وەك دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ (الاحزاب: ٣٦).

---

[1] البداية والنهاية (٢١٣/٥-٢١٤).

[2] التاريخ الطبري (٤٥/٤).

[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

ج- کاتێك داوای لێ کرا پیاوێکی بە تەمەن تر لە ئوسامە دابنێت بۆ فەرماندەیی سوپاکە، زۆر زۆر تووڕە بوو، نەڕاندی بەسەر عومەری فاروقدا کە چۆن وێراویەتی ئاوا پێشنیارێك بگەیەنێت، پێی وت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات و لەناو چیت ئەی عومەر!، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایناوە بە من دەڵێی لایبە!؟[1]

د- گرنگی دانی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە لانەدان لە کارەکانی پێغەمبەری خوا و جێبەجێ کردنیان لە دەرچوونی لە مەدینە لەگەڵ سوپاکەی ئوسامەدا و بە پێ و ئوسامەیش بە سواریەوە بوو، صدیق (رضي الله عنه) بەم کارەی جێبەجێ کەری سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کاتێك مەعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) نارد بۆ یەمەن.

ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی دەکات لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە (رضي الله عنه) کە کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردی بۆ یەمەن پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵیدا ڕۆیشت و ڕەوانەی کرد و مەعاز بە سواری و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پیادەیی بە تەنیشتیدا دەڕۆیشت.[2]

شێخ أحمەد البنا لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) ئەمەی کرد لەگەڵ ئوسامەدا لەگەڵ ئەوەشدا زۆر منداڵ بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش مردنی ئاڵای سوپای دایە دەستی بەڵام کردن بواری نەدا ڕەوانەی بکات تا دەرەوەی مەدینە بەپێ، بۆیە ئەبو بەکر بەو کارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا و بەپێ ڕەوانەی کرد وەك چاوکردنێك لە پێغەمبەری خوا (ﷺ).[3]

هـ- هەروەها چاولێکردن و گوێڕایەڵی پێغەمبەری بۆ پێغەمبەری خوا لەوەدا دەردەکەوێت کە پێش دەرچوونی سوپای ئیسلام ئامۆژگاری کردن چونکە سەرداری مرۆڤایەتیش پێش دەرچوونی سوپا ئامۆژگاری دەکردن،صدیق (رضي الله عنه) هەر بەمەوە نەوەستا بەڵکو زۆربەی ئامۆژگاریەکانی لە بڕگەی ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) وەرگرتبوو بۆ سوپاکان.[4]

---

[1] التأريخ الطبري (٤٦/٤).
[2] الفتح الرباني لترتيب مسند الامام احمد بن حنبل الشيباني (٢١٥/٢١).
[3] بلوغ الاماني (٢١٥/٢١).
[4] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٣٥).

ئەبو بەکر (ﷺ) هەر بە وتەکانی نەوەستا بەڵکو بە کردەوەش سەلماندی شوێن پێغەمبەری خوا دەکەوێت بەڵکو فەرمانی دا بە ئوسامە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی پێ وتووە وا بکات و لە (قضاعة)ەوە دەست پێ بکات و بدات بەسەر (ئابول)دا و کەمتەرخەمی نەکات لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێی وت: وا بکە، کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتوویت.

لە ڕیوایەتێکی تردا پێی وتووە: «بڕۆ بەو جۆرە بکە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتوویت و پاشان پەلامارەکانیشت بەو جۆرە بن کە پێغەمبەری خوا پێی وتوویت و لە فەلەستینەوە دەست پێ بکە، لەوێشەوە بەرەو خەڵی (موئتە) و خوایش پارێزەری ئەو شوێنانە دەبێت کە بەجێیان دەهێڵیت».[1]

لە ڕیوایەتەکەی (ابن الاثیر)دا دەڵێت: «ئامۆژگاری ئوسامەی کرد (ﷺ) کە بەو شێوەیە هەنگاو بنێت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوە».[2]

هاوەڵان هەموو ملکەچی فەرمانی خەلیفەیان بوون و پێی ڕازی بوون، دەستیان گرت بە فەرمانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بە پێی توانا هەوڵی بە جێهێنانیان دا و خوایش سەری خستن و بە دەستکەوتەکان ڕۆزی دان، ترس و هەیبەتی ئەوانی خستە دڵی خەڵکی و شەڕ و خراپەکاری و پیلانی دوژمنانی لێ دوور خستنەوە.[3]

تۆماس ئارنۆڵد دەربارەی ناردنی سوپای ئوسامە دەڵێت: «دوای مردنی محمد (ﷺ)ئەبو بەکر (ﷺ) ئەو سوپایەی خستە ڕێ کە پێغەمبەر (ﷺ) پێشتر بە نیاز بوو بیخاتە ڕێ بۆ کەنارەکانی شام، ئەمە سەرەڕای ئەو ناڕازییەی کە هەندێ لە موسوڵمانەکان دەریان دەبڕی بە هۆی ئاڵۆز بوونی وەزعی ولاتە عەرەبییەکان لەو کاتەدا، نەیاریەکەی نەهێشتن بە وتەی: شتێك بەڕێ دەکەم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوە، ئەگەر بشزانم شێر و پڵنگ ئەم فڕێنن هەر سوپای ئوسامە بەڕێ دەکەم هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێداوە»[4]، پاشان

---

[1] عهد خلفاء الراشدون للذهبي (لا: ٢٠).
[2] الكامل في التأريخ (٢/٢٣٧).
[3] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٣٦).
[4] الدعوة الى الاسلام (لا: ٦٣).

دەڵێت: «ئەمە بویە ژمارەیەکی ئەو زنجیرە هێرشە جوانانەی کرایە سەر عەرەب لە سوریا و فارس و سەرووی ئەفریقیا، توانیان دەوڵەتی فارس بچووك بکەنەوە و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیش بێبەش بکەن لە جوانترین ویلایەتەکانی».[1]

لە بەردەم دەقی قورئان یان سونەتدا، زۆرینەی هاوەڵان پێیان وت باش بوو ئەو سوپایەی ئوسامە لە مەدینە گل بداتەوە و پێیان وت: وا عەرەب پشتیان لێ هەڵکردوویت و بە بڵاوەپێکردنی سوپای ئیسلام هیچ سوودێك وەدەست ناهێنیت!.[2]

خۆ ئەوانە هاوەڵ بوون، وەك خەڵکانی گشتی نەبوون، بەڵکو ئەو هاوەڵانە بوون کە بە چاترین خەڵك دادەنرێن لەسەر زەویدا لە پاش پێغەمبەران (علیهم الصلاه والسلام) لەگەڵ ئەوەشدا صدیق (ﷺ) ئەهاتە سەر قسەکانیان و بۆی ڕوون دەکردنەوە کە بە گوێکردنی وتەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پێشتر و بەرێزترە.[3]

ئەم ڕاستیە کاتێك بەدەرکەوت کە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) کۆچی دوایی کرد و هاوەڵان زۆریکیان پێیان وا بوو – یەکێك لەوانە عومەر بوو- کە نەمردووە، ژمارەیەکی کەمیش پێیان وا بوو مردووە، - ئەبو بەکر یەکێك لەوانە – بەڵام ئەبو بەکر دەستی گرت بە دەقەوە و بۆی ڕوون کردنەوە کە لەسەر هەڵەن، کەسێك بڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەمردووە.[4]

(حافظ إبن حجر) لەسەر ڕای زۆرینە دەربارەی مردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت لە مەسەلەی (إجتهاد)دا وا دەبێت ژمارەیەکی زۆر کەم دەیپێکێت و ژمارەیەکی زۆریش لەسەر هەڵەن، نابێت ڕای زۆرینە پەسەند کراو بێت،[5] پوختەی قسە ئەوەیە کە لە بەسەرهاتی ناردنی سوپای ئوسامە لە لایەن ئەبو بەکرەوە ئەو سوودە وەردەگرین کە مەرج نیە بۆچوون ئەگەر زۆرینەی لەگەڵدا بێت مەرج نیە ڕاست بێت.[6]

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[2] تاريخ خليفة بن خياط (لا: ١٠).
[3] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٤٤).
[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[5] فتح الباري (١٤٨/٨).
[6] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٤٦).

ئەوەشی لێ وەردەگرین کە موسوڵمانان هەر کاتێك هەقیان بۆ ڕۆشن بوویەوە گەردنیان کەچ دەکەن بۆی، کاتێك صدیق (ﷺ)بۆی ڕوون کردنەوە کە دەرکردنی سوپای ئوسامە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئوسامەشی کردۆتە فەرماندە، ئیتر ئەو ئیمانداره پیاوچاکانە گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەری ئازیز بوون.[1]

٤- بانگەواز دەبێت بە کردەوە بێـ، و شوێنەواری گونجان لە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا:

کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) هەر سوور بوو لەسەر مانەوەی ئوسامەی کوڕی زەید (ﷺ) مەبەستی ئەوە بوو بەردەوام دەست بگیرێت بە ڕێڕەوی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) و بڕیارەکانی جێبەجێ بکرێت، بەوەشەوە نەوەستا کە بە ئەمیری سوپا هێشتیەوە بەڵکو بە کردەوەش ئەوەی سەلماند ئەمەش لە دوو خاڵدا:

أ- ئەبو بەکر (ﷺ) بە پێ سوپای ئوسامەی ڕەوانە کرد و ئوسامەش بە سواری وڵاخەکەیەوە بوو، لە تەمەنی (١٨) یان (٢٠) ساڵان بووە، ئەبو بەکریش تەمەنی لە سەرووی شەستەوە بوو، هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەو بە پێ بڕوات شان بە شانی ئوسامە ئوسامەش بە سواری و کاتێك ئوسامە پێی وت یان من دادەبەزم یان تۆش سوار بە، ئەویش بە هیچ کامیان ڕازی نەبوو.

ئەبو بەکر (ﷺ) بەم کارەی ویستی ئەوە بچەسپێنێت لای سوپاکەی ئوسامە کە ڕێزی فەرماندەکەیان بگرن و دان بە بەرێزیەکەی دا بنێن،ئەو ڕووگیریەشیان لە دڵدا دەرکات، وەك ئەوەی بەم ڕۆیشتنەی بە پێ و لە شانی ئوسامەی سواردا بە هەموو ئەندامانی سوپا بڵێت: موسوڵمانەکان بڕوانن من کە ئەبو بەکرم و خەلیفەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) کەچی ئاوا بە پێ لە شانی ئوسامەدا ڕێ دەکەم کە ئەمەش دان نانە بە شایستەیی ئەو فەرماندەیەی کە پێغەمبەری خۆشەویست و سەرکردەی مەزنمان — سەلات و سەلامی پەروەردگارمی لەسەر بێت — هەڵی بژاردووە، ئیتر نازانم چۆن ئێوە ڕەخنە لە فەرماندەییەکەی دەگرن؟!.[2]

[1] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٥٢).
[2] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا:٦٦).

ب- ئەبو بەکر (ﷺ) زۆر حەزی دەکرد عومەر (ﷺ) لە مەدینە گل بداتەوە و بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات وەزیری دەستە ڕاستی بێت، بەڵام نەیسەپاند بەسەر ئوسامەدا بەڵکو داوای یارمەتی لێ کرد کە عومەری بۆ بەجێ بهێڵێت لە مەدینە ئەگەر بە گونجاوی دەزانێت، ئا بەم شێوەیە صدیق (ﷺ) نموونەیەکی زیندووی بە کردەوە نیشانی سوپاکەدا تا ئەوانیش دان بە فەرمانڕەوایی و ڕێزداری ئوسامەدا بنێن (ﷺ)، ئەمەش بانگەشەیەکی کردەوەیی بە هێزە بۆ گوێڕایەڵی سەرکردەکەیان .

ئەمەی کە صدیق کاری بانگەوازی لەگەڵ کردەوەدا هاوملی کرد ئا ئەمەشە ئیسلام داوای دەکات، خوای (عز وجل)یش زەمی ئەو کەسانە دەکات کە بە خەڵکی دەڵێن چاکە بکەن و کەچی خۆیان لە بیر چووە وەك لە قورئاندا دەفەرمووێت: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ (البقرە: ٤٤).

هەروەها لەم بەسەرهاتەدا شوێنەواری گەورەی لاوانمان بۆ دەردەکەوێت لە خزمەتکردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا، و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەید گەنجێکی (١٨)ساڵ دەکاتە فەرماندەی سوپایەك کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی بەهێزترین دەسەڵاتی سەر زەوی ئەو کاتە لە لای خەڵکی - ئەبو بەکریش (ﷺ) — لەو پۆستەدا هێشتیەوە لەگەڵ ئەو هەموو بۆڵە بۆڵ و ڕەخنەگرتنەدا، کەچی فەرماندەی لاو بە سەرکەوتوویی بە دەستکەوتەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەمەش زەنگێکە بۆ لاوان تا ڕۆڵی خۆیان بزانن لە خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، ئەگەر بە چاوێکی ورد بڕوانینە قۆناغی مەککی و مەدینەش ڕۆڵی کۆمەڵێك لاوی خوێن گەرمان بۆ بەرچاو دەکەوێت لە خزمەتکردن بە قورئان و سوننەت و بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، بەشداری کردنیان لە غەزا و گیان فیداکاری لە پێناوی خوا و بانگەواز بۆ لای بەرنامە ناوازەکەی پەروەردگار.[1]

٦- وێنەیەکی پڕشنگدار لە ڕەوشتەکانی جیهاد لە ئیسلامدا:

---

[1] قصة بعث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٧٠).

یەکێکی تر لە سوودەکانی ناردنی سوپای ئوسامە (ﷺ) ئەوەیە کە وێنەیەکی جوان و پڕشنگداری جیهادی ئیسلامیمان نیشان دەدات، ئەو وێنەیەش بە جوانی لە ئامۆژگاریەکانی صدیق (ﷺ) بۆ سوپاکەدا دەردەکەوێت، کاتێك ڕەوانەی کردن، ئەبو بەکر (ﷺ) لەم کارەیدا چاوی لە سەرداری مرۆڤایەتی کرد (ﷺ) کە ئامۆژگاری فەرماندەی سوپاکانی دەکرد پێش دەرچوونیان.[1]

لە بڕگەکانی ئەو ئامۆژگاریانەدا مەبەستی سەرەکی جەنگی ئیسلامی دەردەکەوێت، کە بانگەواز کردن بۆ لای ئیسلام و گەلانیش ئاوا ڕەوشت گەلێك ببینن خۆیان پێ ڕاناگیرێت و موسوڵمان دەبن، بە هەموو حەزێکیانەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەڵدەبژێرن لەوانە:

أ- کاتێك دەبینن سوپاکە ناپاکی ناکات و سپاردە پارێزە، بەڵێنەکانی دەباتە سەر و ماڵی خەڵکی بە تالآن نابات و بە ناهەق دەست ناگرێت بەسەر سامانیاندا.

ب- سوپایەك کەس لووت و گوێ ناکات بەڵکو کوشتنیشی هەر جوانە هەر وەك لێبووردنیشی جوانە، بەزەیی بە منداڵدا دێتەوە و ڕێزی دەگرێت، ڕێز لە پیاوی پیر و بەساڵاچوو دەگرێت، ناموسی ئافرەتیش دەپارێزێت و ئاگای لێیان دەبێت.

ج- سوپایەك سامانی وڵاتە ڕزگارکراوەکان بە هەدەر نادات، بەڵکو دار خورماکان دەپارێزێت و نایسوتێنێت، درەختی بەردار نابڕێت، زەویەکشتوکاڵیەکان لەناو نابات و کێڵگەکانیان لە بەین نابات.

د- لە کاتێکدا سامانی مرۆیی دەپارێزێت، غەدر ناکات، ناپاکی ناکات، دزی لە دەستکەوتەکانی شەڕ ناکات، جەستەی کوژراو ناشێوێنێت، دەستی ناچێتە خوێنی منداڵ و پیر و بەساڵاچوان و ژنان و سامانی کشتوکاڵی دەپارێزێت، دار خورما لە بن ناهێنێت، درەختی بەردار نابڕێت، لە هەمان کاتیشدا پارێزگاری لە سامانی ئاژەڵ دەکات و مەڕ و بزن و مانگا و حوشتر سەر نابڕێت مەگەر بۆ خواردن، دەی ئایا سوپاکانی ئەم سەردەمە هیچێك لەم سەروەتانە دەپارێزن؟ یان ئەو وڵاتەی ئەو لەگەڵی دەجەنگێت دەیکات بە یەك پارچە وێرانە و کاولگە؟! بچووکترین نموونە

---

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

لەسەر ئەوە دەوڵەتی شیوعیەتی بێباوەڕ چی نەکرد بە ئەفغانستان،[1] ئەی بۆسنە چی پێ نەکرا لە لایەن سربەکانەوە؟ ئەی کۆسۆڤا؟ ئەی کشمیر لە لایەن هندەکانەوە؟ بەس لەبەر ئەوەی موسوڵمان بوون، ئەی فەلەستینیەکان جولەکە چیان پێ ناکات؟! ئای چ جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان ڕێنموونی خوایی و گومڕایی بێباوەڕان!.

هـ- سوپایەکە ڕێز لە بیروباوەڕەکان و ئاینەکانی پێشوو دەگرێت و پارێزگاری لەوانە دەکات کە بۆ خوا پەرستی چوونەتە گۆشەیەك، بە هیچ شێوەیەك دەست درێژیان بۆ ناکات.... ئەمەش بانگەشەیەکە بە کردەوە بۆ لێبووردەیی و دادپەروەری ئیسلام، بەڵام ئەوانەی خراپەکاری لەسەر زەویدا بڵاودەکەنەوە و لەگەڵ ڕاستیدا دەجەنگن ئەوانە پاداشتی ڕەوایان کوشتنیانە تا ببنە پەند بۆ کەسانی تریش.[2]

ئەو وشانەی لە وەسیەت نامەکەی صدیقدا هاتبوو، تەنها وشەیەك نە بوو پێشکەش بکرێت و بەس، بەڵکو موسوڵمانەکان خاڵ بە خاڵ جێبەجێیان کرد لە سەردەمی ئەودا و لە سەردەمەکانی دوای ئەویش،[3]

بە یارمەتی خوا لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانیدا بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

٦- کاریگەری سوپای ئوسامە لەسەر پاراستنی هەیبەتی دەوڵەتی ئیسلامی:

سوپای ئوسامە (ﷺ) بە سەرکەوتوویی و دەستکەوتی باشەوە گەڕایەوە مەدینەی پایتەخت، پاش ئەوەی زیرەی بە ڕۆمەکان کرد تەنانەت هێرقل کاتێك لە شاری (حمص) بوو هەموو کەسایەتیە گاوری و ڕامیاریەکانی کۆ کردەوە و پێی وتن ئا ئەمە بوو من کاتی خۆی ئێوەم لێ ئاگادار کرد بەڵام ئێوە گوێتان بۆ نەگرتم، عەرەب لە دووری مانگێك ڕێگەوە دێت و دەدات بە سەرتاندا!، پاشان بۆشی هەڵدێت و کەسیش هیچ ناڵێت، یەنافی برای پێی وت: لەو ناوچانەدا سەرباز جێگیر بکە تا ئاگایان لە بەلقان بێت، ئەویش سەربازی زۆری نارد و لە

[1] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٦٩).
[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو**
[3] قصة عث ابي بكر جيش اسامة (لا: ٨١).

هاوڕێکانی ، خۆیشی کرد بە سەرکردەیان و لەوێ مانەوە تا لە سەردەمی ئەبو بەکر و عومەردا نوێنەریان هات بۆ شام.[1]

پاشان هەموو ڕۆمەکان بە سەرسامیەوە دەیان وت: سەرگەورەیان دەمرێت کەچی لە هێرشکردنی خۆیان بۆ سەرمان ناکەون!،[2] هۆزە عەرەبەکانیش دڵیان کەوتە لەرزە لە ترساندا کە هێز و پێزی دەوڵەتیان بینی.[3]

هەر کە سوپای ئیسلام بە سەرکردایەتی ئوسامە (ﷺ) بە سەرکەوتوویی گەیشتەوە شاری مەدینە ، ئەبو بەکر کە لەگەڵ گەورەپیاوانی کۆچەریان و پشتیواناندا گەیشتن پێی بە خۆشی و هەڵهەڵەوە، دانیشتوانی مەدینەیش بە شادومانی و خۆشی و سەر سوورمانەوە پێشوازیان لێ کرد، ئوسامە گەیشتە مەدینە و چوو بۆ مزگەوتەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوو ڕکات نوێژی سوپاسگوزاری بۆ خوا کرد، لەسەر ئەو بەخششەی ڕژاندی بەسەر ئەو و موسوڵماناندا.

ئەم غەزایە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر ژیانی موسوڵمانەکان و لەسەر ژیانی هۆزە عەرەبەکان، ئەوانەی بە نیازی شۆڕش بوون دژی دەوڵەتی ئیسلامی، هەروەها کاریگەری لەسەر ژیانی ڕۆمەکان هەبوو کە دەوڵەتەکەیان هاوسنوور بوو لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلام.[4]

ئەوەی ئەم سوپایە کردی بە ڕۆم و هۆزە عەرەبەکان لەلایەنی جەنگی دەروونیەوە و لەلایەن سەرباز و چەك و تەقەمەنیەوە نەیکرد، ئەو هەڵگەڕاوانەی بەنیاز بوون بدەن بەسەرمەدینەدا کۆڵیاندا و بڵاوەی بە هەموو ئەوانە کرد لە دژی ئیسلام کۆبوو بوونەوە، موسڵمانەکان هودنەیان بەست لەگەڵ ئەوانەدا کە بەنیاز بوون لە دژیان هەڵگەڕێنەوە، ئەو ترس و لەرزەی بردیە ناو دڵەکان هەرگیز بە پیاوان و چەکی زۆر نەدەکرا.[5]

---

[1] المغازي (١١٢٤/٣)، طبقات ان سعيد (١٩٢/٢).
[2] تهذيب ابن عساكر (١٢٥/١) تأريخ ابن عساكر (٤٣٩/١).
[3] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٧٠).

[5] عبقرية الصديق للعقاد (لا: ١٠٩).

بەڕاستی ناردنی ئەم سوپایە بوو بە نیعمەت بۆ موسڵمانان، چونکە بەرەی باکوور کە بەرەی هەڵگەڕاوەکان بوون، بوو بەلاوازترین بەرەکانی جەنگ، لە شوێنەواری ئەمە بەرەی جەنگی هەڵگەڕاوەکان. لەکاتی ڕزگار کردندا زۆر لە بەرەی جەنگی دوژمنان لە عێراق ئاسانتر بوو لەلای سوپای ئیسلام، هەموو ئەمانە لەلای چارەسەردۆزان - بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکران کە ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لەکاتی کێشە و ناڕەحەتیەکاندا لە هەمووان بیری تیژتر و تێگەیشتنی قوڵتر بووە.[1]

## جۆ باسی دووەم

## جیهاد و تێکۆشانی ئەبوبەکر لە دژی هەڵگەڕاوەکان

یەکەم: پێناسەی (هەڵگەڕاوە) و هەندێ ئایەت کە موسڵمان لە ترسناکی (هەڵگەڕانەوە-ئاگادار دەکاتەوە):

١- پێناسەی هەڵگەڕانەوە (الردة):

نەوەوی پێناسەی هەڵگەڕانەوە دەکات دەڵێت: دابڕان لە ئیسلام لە نیەتدا یان بە کوفر کردن یان کردەوەیەکی کوفر، ئیتر با بە گاڵتە بیڵێ یان لەسەر کەشیدا یان باوەڕی وابێ، هەر کەس گومانی لە بوونی خوا یان پێغەمبەران یان پێغەمبەرێك بە درۆ بخاتەوە یان حەرامێك کە لای هەمووان بە کۆی دەنگ حەرامە ئەو بە حەلاڵی بزانێت وەك (داوێن پیسی) و بە پێچەوانەشەوە، یان بەشێك بڵێن پێویست ناکات و(واجب) نی یە لە کاتێکدا لەلای هەموو زانایان (واجب) بێت یان بە پێچەوانەشەوە، یان نیازی کردبێت بەبێ باوەڕ یان بیروباوەڕی ڕاڕا بوو، ئەوە کافر و بێ باوەڕ بووە.[2]

بەلاّم (ابن حزم الظاهري) بەم جۆرە پێناسەی دەکات: هەر کەسێك خەڵکی هەموو لە موسوڵمانیەتەکەی دڵنیا بن و بێجگە ئیسلام بە هیچ بەرنامەیەك ڕازی نەبێت و لە ناکایەکدا بۆیان دەرکەوت وازی لە ئیسلام هێناوە بووە بە گاور و جوولەکە یان هەر ئایینێکی تر یان هەر بۆتە بێ ئایین.[3]

---

[1] حركة الردة، د. علي الختوم (لا: ١٦٨).
[2] محمد الزهري شرح على متن المنهاج لشرف الدين النووي (لا: ٥١٩).
[3] المحلى (١١/١٨٨).

(ابن عليثي ماكلي) له پێناسەکەيدا دەڵێت: موسوڵمان بێباوەڕ ببێتەوە بە وتەيەکی ڕاستەوخۆی پێچ و پەنا، يان وشەيەك تەنها بێباوەڕی بگەيەنێت، يان کردەوەيەك ئەو مانايە بدات بە دەستەوە.[1]

(عثمان الحنبلي) يش وا پێناسەی دەکات: لە وشەی گەڕانەوە بۆ دواوە وەرگيراوە وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ ﴿٢١﴾ )[2] واتا: پشتا و پشت مەگەڕێنەوە، واتا لە ئيسلام، بەڵام لە شەرعدا ئەمەيە: هەر

کەسێك هەر شتێك بکات کە پاش موسوڵمانيەتی بەرەو بێباوەڕی ببيات.[3]

مانای وايە هەر کەسێك ملەجەڕێ لە شتێکدا بکات کە لە ئيسلامدا زۆر ڕوون و ئاشکرا بێت وەك نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، پێغەمبەرايەتی و دۆستايەتی باوەڕداران يان قسەيەك، يان کردەوەيەك بنوێنێت کە بێجگە لە بێباوەڕی هيچ پاساوێکی تری نەبێت.[4]

٢- هەندێك ئايەتی قورئان کە ئاماژە بۆ هەڵگەڕاوەکان دەکات:

خوای گەورە لە قورئانی پيرۆزدا هەندێ دەستەواژەی بەکار هێناوە کە ئاماژەيە بۆ پيسی و دەردەتاکی هەڵگەڕاوەکان لە ئايينەکەی، لەوانە گەڕانەوەی بۆ دواوە يان پشتاوپشت يان وەرگەڕانی زەرەرمەند، سڕينەوەی دەم و چاو، گەڕانەوەی هەردوو دەست بۆ ناو دەم، گومان کردن و ڕاڕايی و ڕوو ڕەش بوون.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ (ال عمران: ١٤٩).

---

[1] احکام المرتد للسامرائي (لا: ١٨).

[2] **هەمان سەرچاوە (لا:٤٤).**

[3] حرکة الردة: د. علی العتوم (لا:١٨)، **ئەم کتێبە گرنگترين سەرچاوەيە لە مەسەلەی هەڵگەڕانەوەدا.**

[4] **هەمان سەرچاوە، (لا:١٨٠).**

واتا: ئەی بڕواداران ئەگەر بە قسەی بێباوەڕان بکەن لە ڕێگا لاتان دەدەن و خەسارومەندتان دەکەن.

هەروەها دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾﴾ (النساء: ٤٧)، واتا: ئەی گاور و جوولەکە بڕوا بهێنن بەو کتێبەی ناردوومانەتە خوار، کە باوەڕی بە کتێبەکانی ئێوە هەیە، پێش ئەوەی هەندێك دەم و چاو لەناو بەرین یان هەڵیان گێڕینەوە بۆ دواوە یان نەفرەتیان لێ بکەین هەروەك چۆن پێشتر نەفرەتمان لە دەستەی ڕۆژی شەممە کرد، با بزانن خوا کاری خۆی جێبەجێ دەکات.

لە تەفسیری (ابن کثیر)دا هاتووە دەڵێت: (طمس) واتا کوێریان دەکەین، (ونردها علی ادبارها)، واتا: چاویان دەبەینە پشتی سەریان، ئەمەش ئەوپەڕی تۆڵە و سزایە بۆیان، ئەمەش نموونەیەکی جوانە خوای گەورە دەیهێنێتەوە کە ئەوانە لە ڕاستی لایاندا و گەڕاندنیەوە سەر ناڕەوایی، لە بەرچاوڕۆشنیەوە بردنیەوە بەرەو گومڕایی، هەر ڕا دەکەن و پاشە و پاش بۆ دواوە تێ ئەتەقێنن.[1]

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾﴾ (ال عمران: ١٠٦).

واتا: ڕۆژی قیامەت کۆمەڵێ ڕووسپی و کۆمەڵێ ڕووڕەش دەبن، ئەوانەی ڕوویان ڕەش دەبێت، پێیان دەڵێن: ئەوە پاش باوەڕهێنان کافر بوونەوە دە بچێژن سزای سەخت لەبەر ئەو بێباوەڕیەتان.

---

[1] تفسير ابن كثير (١/٥٠٧-٥٠٨)، صبغة حلبي.

(قرطبي) کۆمەڵێك ڕازی لەسەر ئەو ئایەتە هێناوە لەوانە ڕای (قەتادە) کە فەرموودەیەکی ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو ئایەتەی پێشوو باسی هەڵگەڕاوەکان دەکات، کە پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: «یرد علی الحوض یوم القیامة، رهط من أصحابي فیجلون عن الحوض فاقول: یا رب أصحابي، فیقول: انك لا علم لك بما حدثوا بعدك، أنهم إرتدوا علی أدبارهم القهقري».[1]

واتا: لە ڕۆژی دواییدا کۆمەڵێك لە هاوەڵانم دەیانەوێت بێنە سەر حەوزی کەوسەر بەڵام نایەڵن منیش دەڵێم: خوای گەورە ئەوانە هاوەڵی منن، ئەویش دەڵێت: تۆ نازانیت دوای تۆ چیان کردووە و چیان داهێناوە و ئەوانە پشتاوپشت بۆ دواوە گەڕانەوە.

لە ڕیوایەتێکی تردا لە (إبن عباس) ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت «یجاء برجال من أمتي فیؤخذ بهم ذات الیمین، فاقول: أصحابي، فیقال: إنك لا تدري ماأحدثوا بعدك، فاقول: کما قال العبد الصالح: [وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾] (المائدة:١١٧).

واتا: لە دوا ڕۆژدا پیاوانێکی ئومەتم دێن بۆ سەر حەوز بەڵام بەم لاو لادا ڕاویان دەنێن منیش دەڵێم: هاوەڵی منن، دەڵێن: تۆ نازانیت دوای تۆ چیان داهێناوە، منیش دەڵێم: هەر وەك چۆن بەندەی پیاو چاکی خوا بە قەومەکەی وت: «ئەی خوایە گیان من تا لە ناویانا بووم بەر پرسیارم، کاتێك منت مراند ئیتر خۆت چاودێر بووی بە سەریانەوە»، دەڵێن: «إنهم لم یزالوا مرتدین علی أعقابهم منذ فارقتهم»[2]

واتا: ئەوانە لەوەی تۆ لە ناویاندا نەماییت پاشگەز بوونەتەوە لە ئایین.

**دووەم: هۆیەکانی پاشگەزبوونەوە و جۆرەکانی:**

ئەو پاشگەزبوونەوەیەی کە هۆزە عەرەبەکان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردیان کۆمەڵێك هۆکاری هەبوو: لەوانە: ئەبڵەق بوون بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئایین

[1] تفسیر القرطبي (٤/١٦٦).
[2] الخصائص الکبری للسیوطي (٢/٤٥٦).

لاوازی و تێنەگەیشتن لە دەقەکان، بیرکردنەوە لەسەردەمی نەفامی و وازهێنان لە ڕەوشتە بەد خوەکان و لە یاسا دەرچوون، هەستان دژی دەسەڵات ڕەوایی شەرع، ڕەگەز پەرستی پێشوو، یان دەسکەوتنی موڵك، کاسبی کردن لەسەر حیسابی ئاین و پارە خۆش ویستن، حەسوودی و ئێرەیی، کاریگەری بێگانە وەك ڕۆڵی جوولەکە و ئاگر پەرستەکان،[1] لەسەر هەموو ئەم هۆکارانە دەدوێین (انشاء الله تعالی).بەڵام جۆرەکانی: هەبوو بە یەك جار و بە تەواوی وازی لە ئیسلام هێنا و گەڕایەوە سەر بت پەرستی، هەندێکی تریان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی خۆی دەکرد، هەندێکیان بانگەشەی وازهێنان لە نوێژ و هەندێکی تریان لەسەر ئیسلام و نوێژەکانیان بەردەوام بوون بەڵام زەکاتیان نەدەدا، هەندێ شاکامیان دەبڕی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەڕانەوە سەر ڕەوشتی سەردەمی نەفامی و هەندێکیشیان واقیان وڕمابوو، ڕاڕابوو سەیری دەکرد بزانێت مەسەلەکە بەرەو کوێ دەڕوات، هەموو ئەمانە زانایانی فیقھ و مێژووناس ڕوونیان کردۆتەوە.

(الخطابي) دەڵێت: هەڵگەڕاوەکان دوو جۆرن: جۆرێکیان لە ئاین هەڵگەڕانەوە و لە ئومەت چوونە دەرەوە و بێباوەڕ بوونەوە، ئەمەش دوو دەستەن:

دەستەی یەکەم: تاقمەکەی موسەیلەمەی درۆزن لە بەنی حەنیفە و کەسانی تریش کە باوەڕیان پێ کردبوو لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەکەی، وە تاقمی ئەسوەدی عەنسی و ئەوانەشی بە دەمیەوە هاتبوون لە خەڵکی یەمەن و کەسانی تریش، ئەم دەستەیە بە گشتی باوەڕیان بە پێغەمبەریەتی محمد (ﷺ) نەمابوو بەڵکو خۆیانیان بە پێغەمبەر دەزانی.

دەستەی دووەم: لە ئاین پاشگەز بوونەوە و شەرعیان ڕەت دەکردەوە و وازیان لە نوێژ و ڕۆژو و زەکات هێنا و گەڕانەوە سەر ڕێڕەوی نەفامی ئەوسایان.

جۆری دووەم: جیاوازیان دەکرد لە نێوان نوێژ و زەکاتدا و بە نوێژکردن ڕازی بوون بەڵام ملەجەڕێی زەکاتیان دەکرد کە فەرز بێت و دەبێت بدرێت بە خەلیفە.[2] لەناو ئەو زەکات

---

[1] حرکة الردة، علی العتوم (لا: ١١٠-١٣٧).
[2] شرح صحیح المسلم للنووي (٢٠٢/١).

نەدەرانەدا هەبوو خۆی زەکاتی دەدا بەڵام بەرگری لە خەڵکی نەدەکرد کە بیدەن، بەڵام سەرۆکەکانیان دەستیان گرت بە سەریاندا و بەرگریان لێ کردن.[1]

لەم دابەشکردنی جۆرەکانی هەڵگەڕانەوەدا نزیکە لەو جۆرانەی قازی (عیّاض) ناوی بردوون کە لای ئەو سێ جۆرن:

١- کۆمەڵی گەڕانەوە بۆ بت پەرستی.

٢- کۆمەڵێك شوێن موسەیلەمە و ئەسوەدی عەنسی کەوتن، کە پاگەندەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد.

٣- کۆمەڵێك لەسەر موسوڵمانەتی مانەوە بەڵام دەیان وت زەکات پێویست (فرض) نیە و بەوە تەئویلیان دەکرد کە گوایە زەکات تایبەت بووە بە سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ).[2]

د. عبدالرحمن صالح محمود هەڵگەڕاوەکان دەکات بە چوار بەشەوە:

١- کۆمەڵێك گەڕانەوە سەر بت پەرستی.

٢- کۆمەڵێك شوێن پێغەمبەرانی درۆزن کەوتن موسەیلەمە و ئەسوەد عەنسی.

٣- کۆمەڵێك باوەڕیان بە پێویستی دانی زەکات نەمابوو.

کۆمەڵێك باوەڕیان پێی مابوو بەڵام دەیان وت نایدەین بە ئەبو بەکر.[3]

### سێیەم: پاشگەز بوونەوە لە دوا ساتەکانی سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا:

ئەم لە ئیسلام پاشگەز بوونەوەیە لە ساڵی نۆیەمی کۆچیەوە دەستی پێکرد کە بە ساڵی شاندەکان ناسرابوو، ئەو ساڵە بوو کە کەنداوی عەرەبی بە گشتی هاتن و ملکەچی و موسوڵمان بوونی خۆیان دەربری لە ڕێگەی سەرۆکەکانیانەوە کە لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ مەدینە.

---

[1] **هەمان سەرچاوە (١-٢-٣).**

[2] فتح الباري (٢٧٦/١٢).

[3] الحكم بغير ما أنزل الله، د. عبدالرحمن صالح المحمود(٢٣٩).

بزاقی پاشگەز بوونەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا دەرنەکەوتبوو، تا کۆتایی ساڵی دەیەمی کۆچی کە ساڵی حەجیماڵئاوایی دەکات لە پێغەمبەری خواوە دوا حەجی کرد و تیایدا ئێش و ئازار هات بۆ پێغەمبەر و پێیشی کۆچی دوایی کرد و بەو بۆنەیەوە چاوپۆشی لە خەڵکی دەکرد.

ورده ورده ژیلەمۆی ژێر خۆڵەمێشەکان گەشە دەبوون، ئەژدیها کەم کەم لە کونەکانیانەوە سەریان دەردەهێنا و ئەوانەی دڵ نەخۆش بوون وێرایان لە سنووری شەرع دەربچن، ئەسوەدی عەنسی لە یەمەن و موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە و (طليحة الاسدي) لە ناو هۆزەکەی خۆیدا ئەم کارەیان ئاشکرا کرد.[1]

لەبەر ئەوەی ترسناك ترین هەڵگەڕاوەکان — موسەیلەمەی درۆزن و ئەسوەدی عەنسی بوو، کە سوور بوون لەسەر بەردەوام بوون لەسەر ڕێڕەوی خۆیان و بەبێ ئەوەی بیر لە ئاکامەکانی بکەنەوە، و هێزی گەورە و توانای مادی زۆریان لەبەر دەستدا بوو.

خوای گەورە دڵی پێغەمبەرەکەی و ئەویش دڵی ئومەتەکەی خۆش کرد و جارێکیان لەسەر بڵند گۆکەی خۆی وتاری دەدا و دەیفەرموو: «أيها الناس، اني قد رأيت ليلة القدر، ثم أنسيتها، ورأيت في ذراعي سوارين من ذهب فكرهتهما، فنفختهما فطاراً، فاولتهما الكذابين: صاحب اليمن وصاحب اليمامة».[2]

واتا: ئەی خەڵکینە، من لە خەومدا شەوی بە قەدرم (قدر) پێ نیشان درا، بەڵام بیرم برایەوە و لە قۆڵمدا دوو بازن هەبوون، ئاڵتوون بوون، زۆرم پێ ناخۆش بوون، فووم لێ کردن، چوون بە هەوادا، بەوە خەو پەرژینی دەکەم: کە دوو درۆزنەکەن، ئەوەی یەمەن و ئەوەی یەمامە.

زانایان خەو پەرژینەکەیان بەم جۆرە لێك داوەتەوە و دەڵێن: بە فوو واتا بە خۆی لە ناویان نابات و ناونانیان بە ئاڵتون واتا درۆزن و چاو خەڵەتێن بە بە باق و بریق، بازنی قۆڵ واتا سەر گەورەن چونکە پادشایان بازنیان لە قۆڵ کردووە و بە قۆڵمەوە بوو واتا ماوەیەك موسوڵمانان بەو هۆیەوە نیگەران و شپرزە دەبن وەك چۆن باز و بەند ناخۆشە بۆ باڵ.[3]

---

[1] حركة الردة (لا: ٦٥).
[2] البخاري (ژمارە: ٣٦٢١).
[3] حركة الردة (لا: ٦٦).

د. غلی العتوم ئاوا خەو پەرژینی کردووە و دەڵێت:.... بە فوو چوون بە ئاسمانا مانای لاوازی فرت و فێڵیان دەگەیەنێت، چونکە کەفی سەر دەریا هەرچەندە زۆر بێت هەر دادەمرکێتەوە مادام ئەم فرت و فێڵە سەرچاوەکەی شەیتان بێت و کا و بایە و لە ناو دەچێت، کە بە کەمترین هێرشی موجاهیدانی پێناوی خوا ئەتوێتەوە و نامێنێت، بە ئاڵتون ناوی بردن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بۆ بە دەستهێنانی دونیا ئەوەیان کرد چونکە ئاڵتون سونبولی هیچ و پووچی دونیایە کە خەڵکی بە دوایدا هەڵپەیان دێت، بە بازن ناوی بردوون کە ئەوە دەگەیەنێت دەیانەوێت دەورەی موسوڵمانان بدەن و لە ناویان بەرن هەروەك چۆن بازن دەوری قۆڵ دەدات.[1]

**چوارەم: هەڵوێستی ئەبو بەکر (ﷺ) لە پاشگەزبووان:**

هەر کە پاشگەز بوونەوە کەوتە ناوەوە، ئەبو بەکر (ﷺ) هەستایە سەرپێ و وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و سوپاس و ستایشی خوای کرد و وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی ڕێنموونی کرد و بە تەواوەتی، بەخشی تا دەوڵەمەند بوون و خوای گەورە کاتێك محمدی (ﷺ) نارد، زانیاری پرش و بلاّو بوو، ئیسلام نامۆ و دەرکراو بوو، پەتی باریك بوو، جلی شڕ بوو، دۆستەکانی لێ ون دەبوو، خوا لە جولەکە و گاور زویر بووە توشی خێریان ناکات لەبەر چاکیان، خراپەشیان لێ لا نادات لەبەر خراپی خۆیان، گۆڕانیان خستە ناو کتێبەکەیان، شتانێکیان تێکەڵ کرد کەتیای نەبوو، عەرەبەکان ژیانیان ئاسایشە و ئیتر وا دەزانن خوا دەیانپارێزێت، نەیپەرستن و هاواری تێ نەکەن، ژیانیان لێ تێك دەدات، ئایینی ڕاستیان لێ ون دەکات لە ناو ڕەقانی زەویدا لەگەڵ بوونی هەوردا.

خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی دوایین پێغەمبەری لە ناویاندا هەڵخست و کردنی بە گەلێکی مامناوەند، بە شوێنکەوتووانی سەری خستن بەسەر کەسانی تردا، تا گیانی پێغەمبەرەکەی کێشا و دوای ئەوە هەندێکیان شەیتان سواری سەریان بوو پاش ئەوەی لێی دابەزیبوو، دەستی گرتن و هەلی لە ناوبردنیانی دەست کەوت.

---

[1] حرکة الردة (لا: ٦٦).

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ (ال عمران: ١٤٤)، واتا: محمد تەنها پێغەمبەرێکی خوایە و وەکو پێغەمبەرانی پێشووی خۆی وایە و ئەگەر بمرێت یان بکوژرێت پشتاوپشت هەڵگەڕێنەوە، هەر کەسێك هەڵگەڕێتەوە خوا هیچ زیان ناکات و پاداشتی سوپاس گوزارانیش دەداتەوە.

ئەم عەرەبە دەشتەکیانەی چوار دەورتان مەڕ و بزن و حوشتری خۆیانم لێ قەدەغە دەکەن، هیچ کاتێك ئاوا دەست قوچاو نەبوون، ئێوەش هیچ ڕۆژێك هێندەی ئەمڕۆ بەهێز نەبوون بۆ هێرش بردن بە بەرەکەتی پێغەمبەرەکەتان کە دەیداتە دەست ئەو خوایەی لە گومڕاییەوە بەرەو ڕێنموونی و لە هەژاریەوە بەرەو دەوڵەمەندی بردی: ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ (ال عمران: ١٠٣).

واتا: ئێوە لە کەناری ئاگردا بوون و خوا ڕزگاری کردن لێی...

سوێند بە خوا واز ناهێنم لە جەنگ و جیهاد لە پێناوی خوادا تا خوای گەورە پەیمانەکانی دێنێتە دی، کێش دەکوژرێت با بکوژرێت و دەبێتە خاوەنی بەهەشت، خوای گەورەش جێنشین و بەرەکانی خۆی لەسەر زەوی دەهێڵێتەوە و فەرمانی خوایش ڕاستە، پەیمان شکێنی تیا نیە، ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾﴾ (النور: ٥٥).

واتا: خوای گەورە پەیمانی داوە بەو باوەڕدارانەی کردەوەی چاکە دەکەن کە فەرمانڕەوایی زەویان دەداتە دەست و ئەو ئاینەی کە پێی ڕازی بووە بۆیان جێگیر دەکات و دەیانکاتە خاوەنی زەوی هەروەك چۆن بۆ پێش ئەوانیشی کردووە و ترس و دڵە ڕاوکێیان دەگۆڕێت بۆ دڵنیایی، ئەم پەرستن و هاوەڵم بۆ پەیدا ناکەن و ئەوەی پاش ئەوە بێباوەڕ بێتەوە ئەوانە لە سنوور دەرچووانن.

هەندێ لە هاوەڵان.. کە عومەریش یەکێك بوو لەوانە — پێشنیاریان کرد بۆ خەلیفە کە واز لەوانە بهێنێت کە زەکات نادەن تا بڵاوەڕ دەچەسپێتەوە لە دڵیاندا پاشان دەیدەن بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد.[1]

لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد و ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بوو بە خەلیفە و عەرەبیش ئەوەی کافر بوویەوە کافر بوویەوە و عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بە ئەبو بەکری وت: چۆن جەنگ لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت؟ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیفەرمووە: «امرت ان اقاتل الناس حتى يشهد ان لا اله الا الله، فمن قالها عصم مني ماله ونفسه الا بحقه وحسابه على الله»، واتا فەرمانم پێ دراوە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم تا شایەتی دەدەن هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) و ئەگەر وتیان ئیتر خوێن و ماڵیان لەسەرم قەدەغە دەبێت مەگەر بە هەقی خۆی و لێپرسینەوەشی لەسەر خوایە.

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتی: سوێند بە خوا دەجەنگم لەگەڵ ئەوانەدا جیاوازی دەکەن لە نێوان نوێژ و زەکاتدا، زەکات مافێکی سامانەکەیانە، سوێند بە خوا ئەگەر بزنە مێیەکم نەدەنێ کە کاتی خۆی بە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) داوە لەگەڵیاندا دەجەنگم.

لە ڕیوایەتێکی تردا: سوێند بە خوا ڕشۆیەکی حوشترم لێ بگرنەوە کە کاتی خۆی داویانە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەجەنگم لەگەڵیان.

عومەر وتی: سوێند بە خوا ئەوە خوای گەورە خستویەتیە دڵی ئەبو بەکرەوە و هەر ئەمەش ڕاستە.[2]

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣١٥).
[2] البخاري (ژمارە: ٦٩٢٤). مسلم ژمارە: ٢. البداية والنهاية (٦/٣١٥).

پاش ئەوە عومەر (ﷺ) دەیووت: سوێند بە خوا باوەڕی ئەبو بەکر (ﷺ) بەرامبەر باوەڕی هەموو ئومەتە لە مەسەلەی جەنگانی دژی هەڵگەڕاوەکان.[1]

ئا بەم شێوەیە ئەبو بەکر لە گفت و گۆکەیدا هەندێ مەسەلەی فیقهی گرنگی بۆ عومەر ڕۆشن کردەوە، کە ئەو پەی پێ نەدەبرد، ئەویش ئەوە بوو کە ئەو ڕستەی لە فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە و عومەر بە بەڵگەی نەجەنگان دەهێنێتەوە بەڵگەی جەنگانە دژی زەکات نەدەران ئیتر با شایەتمانیشی هێنابێت، ڕستەکەشی ئەمەیە: «فاذا قالوها عصموا مني دمائهم واموالهم الا بحقها».[2]

واتا: ئەگەر شایەتمانیان هێنا ماڵ و گیانیان حەرام دەبێت مەگەر بە هەقی خۆی.

هەر واش بوو، جەنگانی ئەبو بەکر (ﷺ) دژی هەڵگەڕاوەکان ڕایەکی زۆر گرنگ بوو، ئەو ڕایەش بۆ ئەو ساتە وەختە لە بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان بوو، چ ساتەوەختێك لەوە گرنگترە کە ڕووبەڕووی تیاچوون و تێك شکان و شکست و گەڕانەوە بۆ سەردەمی نەفامی ببیتەوە.

ئەگەر خوا و ئەم بڕیارە یەکلاکەرەوەیەی ئەبو بەکر (ﷺ) نەبوایە ئەوا مێژوو ڕێڕەوی دەگۆڕا و کاتژمێر بۆ دواوە دەگەڕایەوە و جارێکی تر نەفامی سەر زەوی گەندەڵ دەکردەوە.[3]

بەڕاستی تێگەیشتنی وردی دەرکەوت دەربارەی ئیسلام و زۆری غیرەتی بۆ ئەم ئایینە و مانەوەی لە سەرچاوە ڕوونەکەی سەردەمی پێغەمبەرەکەی لەو وشەیەدا بەدی دەکرێت کە لە دڵیدا کۆ بوویەوە و لەسەر زمانی دەری بڕی، ئەوەش وشەیەکە خۆی دەدات لە وتارێکی درێژ و کتێبێکی گشتگیر و پڕ، ئەوەش ئەو دوو وتەیەی بوو کاتێك فەرمووی کە هەموو هۆزە عەرەبەکان دەیان وت ئیتر زەکات نادەین بە (بیت المال)! یان هەر دەریان نەدەکرد یان هەر باوەڕیان پێی نەمابوو: «قد انقطع الوحي وتمّ الدين، اينقص وانا حي».[4]

---

[1] حروب الردة، محمد احمد باشميل (لا: ٢٤).
[2] مسلم (ژمارە: ٢١).
[3] الشورى بين الاصالة المعاصرة (لا: ٨٦).
[4] المرتضى لإبي الجسن الندوي (لا: ٧٠).

واتا: وەحی و سروش کۆتایی هات و ئاین تێر و تەسەل بوو، ئایا کەم و کورت بێتەوە کە من بەسەر زیندووم؟!

لە ڕیوایەتی عومەردا دەڵێت: وتم ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە نەرم و بە سۆز بە لەگەڵ خەڵکی، ئەویش پێی وتم: «أجبار في الجاهية وخوار في الاسلام؟ قد انقطع الوحي وتمّ الدين، اينقص وانا حي؟»[1].

واتا: ئازا و دلێری لە سەردەمی نەفامیدا و کەچی ترسنۆکی لە ئیسلام؟ وەحی و سروش کۆتایی هات و ئاین تەواو کراوە، دەی ئایا کەم و کورت بکرێتەوە لە کاتێکدا من بەسەر زیندووم؟!.

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) گوێی بۆ ڕاو بۆچوونەکانی هاوەڵان گرت سەبارەت بە پاشگەزبووەکان، بڕیاری جەنگی نەدا هەتا بە وردی گوێی بۆ ڕاو بۆچوونەکان نەگرت، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەو زۆر خێرا بوو لە یەکلایی کردنەوەدا و پاش ئەوەی ڕای ڕاستی لە لا ڕۆشن ببوایەتەوە بڕیاری خۆی دەدا و نەبوونی ڕاڕایی یەکێك بوو لە ڕەوشتە دیارەکانی ئەبو بەکر — ئەو خەلیفە مەزنە — لە هەموو ژیانیدا،[2] وە هەموو موسوڵمانان هاتنە سەر قسەکەی و پاش ئەوەی ڕاستی ڕایەکەیان بۆ دەرکەوت.

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) ئا لەم کاتە ناهەموارەدا و لەم زروفە کتوپڕە لە سەرسامیەدا، لە هەموو هاوەڵان زیاتر تێگەیشتوو بوو، بیر تیژتر بوو، خۆگرتر بوو، ئا لێرەوە سەعیدی کوڕی موسەیەب — ڕەحمەتی خوای لێ بێت — دەڵێت: «کان أفقههم» لە هەموو هاوەڵان تێگەیشتووتر بوو، ڕاو بۆچوونیشی لە سەرووی هەموویانەوە بووە.[3]

ئەبو بەکر لە هەموو هاوەڵان زیاتر بیری تیژتر بوو، چونکە لە ڕێگەی ئەو ئیمانەیەوە کە لە ئیمانی هەموویان زیاتر بوو، تێگەیشت کە زەکات لە شایەتمان جیا ناکرێتەوە، ئەوەی دان بە یەکتایی خوا دەنێت دەبێت دانیش بنێت بە زەکاتدا و بزانێت مافێکە و لە سامانەکەیدایە

[1] مشكاة المصابيح، كتاب مناقب (ژمارە: ٦٠٣٤).
[2] الشورى بين الاصالة المعاصرة (لا: ٨٦).
[3] البدر والتأريخ للمقدسي (١٥٣/٥).

که له ڕاستیدا هی خوای گەورەیە، «لا اله الا الله» وتن بە بێ زەکات دان هیچ کێشێکی نیە له ژیانی گەلاندا، شمشێر و جیهاد بەرپا کراوه بۆ پارێزگاری له دانی زەکات هەروەك چۆن بۆ پارێزگاری وشەی «لا اله الا الله» دانراوه و وەك یەکن کتومت، ئا ئەمەیە ئیسلام و جگە لەمە بە ئیسلام دانانرێت.[1]

چونکە خوای گەورە هەڕەشەی سەخت ئاراستەی ئەوانە دەکات کە باوەڕ بە هەندێ له قورئان دەهێنن و بێباوەڕن بە هەندێکی تری و دەفەرمووێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾﴾ (البقرە: ٨٥).

واتا: باوەڕ بە هەندێ له قورئان دێنن و بێباوەڕن بە هەندێکی تر؟ دەی پاداشتی ئەوانەتان وا دەکەن چیە؟ جگە له سەرشۆڕی له دونیا و سزای سەخت له دوارۆژدا، و بزانن خوایش بێ ئاگا نیەلە کردەوەکانتان.

هەڵوێستی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) دابەزین و خۆ دان بە دەستەوە و چەن و چوونی تیا نەکرا، ڕایەکی دروست بوو کۆمەکی خوایی پێوە دیاربوو، مانەوەی ئەم ئایینە پاکە دوای خوای گەورە وەك خۆی بە پاکی و بێگەردی و جانەدانی (أصیل) دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پیاوە بەرزە (رضي الله عنه).

هەموو دان بەوەدا دەنێن و مێژوویش شاهێدە کە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بەرامبەر پاشگەزبووە سەرکەشەکان و ئەوانەی دەیانویست ئیسلام کەم کەم و دەنکە دەنکە فەرمانەکانی له ناو بەرن و هەڵیوەشێننەوە، شێرانە وەستا بە جۆرێك کە چاوکردن بوو له پێغەمبەران و نێردراوانی خوا له سەردەمەکانی خۆیاندا، بە ڕاستی مافی تەواوی دا بەو جێنشینیەی کە له

[1] حياة ابي بكر، محمود شلبي (١٢٣).

شوێنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو بەو شێوەیەی موسوڵمانان وەسفی چاکەی دەکەن و دوعای خێری بۆ دەکەن تا دونیا دونیایە.[1]

**پێنجەم: نەخشەی صدیق بۆ پارێزگاری شاری مەدینە:**

نوێنەری هەندێك لەو هۆزانەی کە زەکاتیان نەدەدا بە خەلیفە هاتن بۆ مەدینە ویستیان صدیق ڕازی بکەن گوزەشتی لێ بکات و لێی بێدەنگ بێت، بەڵام ئەو هەر لەسەر ڕای خۆی سوور بوو، ناچار وەفدەکان بە نائومێدی مەدینەیان بەجێ هێشت، و دوو شتیان بۆ دەرکەوت:

١- مەسەلەی زەکات نەدان قسەی تیا ناکرێت و جێگای مشت و مڕ نیە، وە فەرمانی ئیسلام تیایدا ڕوون و ئاشکرایە بۆیە هیچ هیوایەك نیەکە جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی دابەزێت بە تایبەت پاش ئەوەی موسوڵمانانیش مەسەلەکەیان بۆ ڕۆشن بوویەوە و پشتی خەلیفەی خۆیانیان گرت.

٢- هەروەك دەبێت ئەو هەلە بقۆزنەوە کە موسوڵمانان لە حالەتی شکستی و لاوازیدان — بە گومانی ئەوان — و ژمارەیان کەم بۆتەوە و هێرشێکی ڕامالڵەر بکەنە سەریان و حکومەتی ئیسلامی دەڕوخێنن و ئاینەکەش لە ناو دەبەن.

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه)نیشانەی غەدر و ناپاکی لە ناو چەوانیان خوێندەوە و بێ نرخی و هیچ و پوچیانی دەرك پێکرد، بۆیە بە هاوڕێکانی وت: سەر زەوی کافر بوونەتەوە،وەفدەکانیان ئێوە بە کەم دەزانن و ئێوەش چی دەزانن ئایا بە شەو دەدەن بە سەرتانا یان بە ڕۆژ؟! زۆر نزیك کەوتوونەتەوە لێتان ئەوانە بە تەما بوون زەکات نەدانیان لێ قبووڵ بکەین، بەڵام لێمان قبووڵ نەکردن، و بەڵێن و پەیمانمان لەگەڵیان ڕەت کردەوە، خۆتان ئامادە باش بکەن و ئامادە بن.[2]

بەم شێوەی خوارەوە پلانی دارشت:

---

[1] المرتضى للندوي (لا: ٧٢).
[2] تأريخ الطبري (٦٤/٤).

أ- پێویستی کرد لەسەر دانیشتوانی شاری مەدینە کە تا بەیانی لە مزگەوت بمێننەوە تا لە ئەو پەڕی ئامادە باشی دابن.

ب- پاسەوانی دانا بە هەموو چوار دەورەی شاردا، تا بەرپەرچی هەر هێرش و دان بە سەرێکدا بدەنەوە.

ج- بەسەر پاسەوانەکانەوە فەرماندەی دانا وەك عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زوبێری کوڕی عەوام و تەلحەی کوڕی عبیداللە و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عبدالحمن کوڕی عەوف و عبداللە کوڕی مەسعود (خوا لێیان ڕازی بێت).[1]

د- ئەبو بەکر (ﷺ)جوابی نارد بۆ هەموو ئەو هۆزانەی کە لەسەر موسوڵمانەتی ڕاوەستاو بوون وەك (ئەسلەم، غەفار، مزینە، ئەشجەع، جهینە، کعب) و فەرمانی پێدان بە خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد و غەزا لەگەڵ پاشگەز بووەکان ئەوانیش هاتن بە دەم داواکاریەکەیەوە، تا وای لێ هات شاری مەدینەیان پڕکرد و ولاخ و حوشتریان پێ بوو هەموویان خستە ژێر ڕکێفی صدیق.[2]

ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر زۆر چەکدار و حوشتری ئەو هۆزانەی کە بۆ کۆمەکی صدیق ناردیان، تەنها (جهینە) خۆی (٤٠٠) چەکدار بە هەموو کەرەستەیەکی پێویستەوە ناردبوو و (عەمری کوڕی مورەی جوهەینی) سەد حوشتری نارد بۆ کۆمەکی موسوڵمانان و ئەبو بەکریش دابەشی کرد بەسەر موسوڵماناندا.[3]

هـ- وە بۆ هەڵگەڕاوەکان لە شوێنە دوورەکان لە مەدینەوەن کە مەترسیان کەمتر بوو، بە نامە جەنگی لەگەڵ دەکردن کە هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی دەیکرد نامەی دەنارد بۆ والی و فەرماندەی موسوڵمانان و تیایدا هانی دەدان بۆ ئەوەی بچن بە گژ پاشگەزبووەکاندا و هانی خەڵکەکەشی بدەن تا لەم کارەدا لەگەڵیاندا بن.

---

[1] **هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.**

[2] الثابتون على الاسلام ايام فتنة اردة، د. مهدي رزق الله (لا: ٢١).

[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

بۆ نموونە نامەی نارد بۆ خەڵکی یەمەن کە پێڕی پاشگەزبووی (الاسود العنسی) تیابوو، کە تیایدا نووسیبووی: پاشان، یارمەتی ئەو کوڕانە بدەن و چوار دەورەیان بدەن و لە دژی نەیارەکان هاوکاریان بن و گوێ بۆ (فەیرۆز) بگرن و لەگەڵی بن چونکە من کردوومە بە گەورەتان.[1]

ئەم نامەیە زۆر بەرهەم دار بوو، موسوڵمانە فارسەکان بە سەرۆکایەتی فەیرۆز و بە هاوکاری برا عەرەبەکانیان هێرشیان بردە سەر هەڵگەڕاوە سەرکەشەکان تا خوای گەورە پیلانەکانی پوچەڵ کردنەوە و یەمەن کەم کەم گەڕایەوە سەر ڕێگەی ڕاست.[2]

و: بەڵام ئەوانەی لە شاری مەدینەوە نزیك بوون وەك عەبس و زبیان، چاری نەبوو جگە لەوەی ڕووبەڕوویان ببێتەوە لەگەڵ ئەو وەزع و بارە ناهەموارەدا کە شارەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێدا تێدەپەڕی کە ژن و منداڵەکانیان دەبردە ناو قەڵا و دۆڵەکان بۆ ئەوەی لە شەڕ و خراپەی هەڵگەڕاوەکان بە دوور بن،[3] وە خۆی و ئەوانەی دەوروبەری ئامادە کرد بۆ جەنگان دژیان.

**شەشەم: نسکۆی هەڵگەڕاوەکان لە گرتنی شاری مەدینە:**

لە پاش سێ ڕۆژ گەڕانەوەی وەفدی پاشگەزبووەکان لە مەدینە هەندێ لە هۆزەکانی ئەسەد و غەتفان و عەبەس و زەبیان و بیکر دایان بەسەر شاری مەدینەدا بە شەو هەندێکیان وەك پاڵپشت لە ناوچەی حوسا هێشتەوە، پاسەوانانی دەوری شار هەستیان بەمە کرد و خێرا ئەبو بەکریان لێ ئاگادار کرد، ئەویش پێی وتن لە جێی خۆتان بمێننەوە، ئەوانیش مانەوە، لارزنگیان دا لە حوشترەکانیان دەرچوون دوژمنانیش هەڵاتن، موسوڵمانەکانیش شوێنیان کەوتن تا گەیشتنە ناوچەی حوسا، دەستەی بێباوەڕان لەوێ بوون بۆیان دەرپەڕین، فێڵیان لە موسوڵمانەکان کرد بۆ ئەوەی حوشترەکانیان بترسێنن گۆزەیان هێنابوو بەستبویانەوە کاتێك حوشتری موسوڵمانەکان نزیك بوونەوە پاڵیان نا بە گۆزەکانەوە بەڕووی موسوڵمانەکاندا،

---

[1] البدء التأريخ للمقدسي (١٥٧/٥).
[2] حركة الردة (لا: ١٣٩).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

حوشترەکان پشتاوپشت گەڕانەوە دواوە، سوپای موسوڵمانەکان پەلاماریان دان و ئەوانیش هەموو هەڵاتن و هەرچیان پێ بوو بەجێیان هێشت و موسوڵمانەکان هەموو حوشترەکانیان دانەبەر و بە دەستکەوتەوە گەڕانەوە بۆ مەدینە و کەسیان لێ نەکوژرا و برینداریشیان نەبوو.[1]

کۆمەڵێك گومانیان وابوو موسوڵمانەکان لاواز بوون ئەو ئەو هەواڵەشیان نارد بۆ خەڵکی (ژو القصة) ئەوانیش بە پێی ئەو هەواڵە بەڕێ کەوتن و هەستیان نەکرد کە خوای گەورە نیازی دیکەی هەیە، پێی خۆش بوو بیانخاتە داوەوە، ئەو شەوە ئەبو بەکر خۆی ئامادەکرد و موسوڵمانانیشی ساز کرد، ئیتر بەو شەوە کەوتنە ڕێ، لە لای ڕاستی سوپاکەی نوعمانی کوڕی موقرین و لە لای چەپیشەوە عبدالله کوڕی موقرین، لەبەر دەمیشەوە سویدی کوڕی موقرین بە سوارچاکانەوە لە بەرەبەیاندا دەبینن لەگەڵ دوژمناندا بەرامبەر یەك وەستاون، هەڵگەڕاوەکان هەستیان بە وتە و جووڵەی موسوڵمانەکان نەکرد تا هەڵیان کوتایە سەریان و شمشێریان لێ ڕاستکردنەوە تا ڕۆژ بوویەوە بەردەوام دەجەنگان خۆر سەری دەرهێنابوو بە تەواوی هەڵگەڕاوەکان پشتاوپشت گەڕانەوە و ڕایان کرد، بە تەواوی سەرکەوتن بە سەریاندا و لەو شەوەدا (جبال) کوژرا کە برای (طليحة الاسدي) بوو، ئەبو بەکر کەوتە دوایان تا گەیشتنە (ذو القصة) و لەوێ خۆی گەڕایەوە بۆ مەدینە و نعمانی کوڕی مقرینی لەگەڵ کۆمەڵێك موجاهیددا لەوێ دانا، بەنو زوبیان و عەبس پەلاماری ئەو ژمارە کەمەی موسوڵمانەکانیان دا و پاش شەڕ و تێکالان هەموویان شەهید کردن، هەڵگەڕاوەکان ئەم کارە نارەوایەیان کرد و ئەبو بەکریش زۆری پێ ناخۆش بوو، بۆیە سوێندی خوارد، ئەبێت ئەوانە هەموویان بکوژرێن و لە هەموو قەبیلەیەکیان کە موسوڵمانەکانیان کوشتووە، بە ژمارەی موسوڵمانە کوژراوەکان و زیاتریشیان لێ دەکوژین.[2]

ئەبو بەکر بڕیاری خۆیدا کە تۆڵە بۆ ئەو موسوڵمانە شەهیدانە بکاتەوە و دەرسێکی چاکی ئەو بێباوەڕانەش دابدات و پاشانیش سوێندەکەی خۆی بردە سەر، موسوڵمانانی

---

[1] تأريخ الطبري (٦٧/٤).
[2] تأريخ الطبري (٦٦/٤).

هۆزەکانیش زیاتر لەسەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام دامەزراو بوون و بێباوەڕانیش زیاتر لاواز و سەر شۆڕ و بێ نرخ بوون.

ئیتر زەکاتی هۆزەکان داباری بەسەر شاری مەینەدا و کەسانی دەوڵەمەندی وەك: صفوان و زبرقان و پاشان عەدی، زەکاتیان گەیشتە ناو شار، ئەوەی صەفوان لە سەرەتای شەودا و ئەوەی زبرقان لە نێوەی شەودا و ئەوەی عەدی لە کۆتایی شەودا گەیشت،[1] لە یەك شەودا مەدینە زەکاتی سێ هۆزی گەورەی عەرەبی پێ گەیشت.

هەر کە یەکێك دەردەکەوت، زەکاتی هۆزەکەی دەهێنا خێرا خەڵکەکە دەیان وت: ترسناکە، ئەبو بەکریش (ﷺ) دەیوت: نەخێر بەڵکو (موژدە هێنەرە) و هەر ئەوەندەیان دەزانی بە زەکاتی هۆزەکەیەوە دەگەیشتە بەرەوە، خەڵکەکەش بە ئەبو بەکریان دەوت: زۆر جار موژدەی خۆشت پێداوین.[2]

ئا لەم کاتە خۆشە مژدە بەخشانەدا کە بوو بووە مایەی دڵخۆشی خەڵکی و دەوڵەمەندی خەزێنەی موسوڵمانان، سوپای ئوسامەیش بە سوپا سەرکەوتووەکەیەوە گەڕایەوە، بەو شێوەیەی کردبوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی پێی ووتبوو و پاشانیش ئەبو بەکر (ﷺ) ئامۆژگاری کردبوو.[3]

ئەبو ەبکر لە شوێنی خۆی کردی بە بەرپرسی شاری مەدینە و بە سەربازانیشی وت: بحەوێنەوە و تەزوویەکی پشتتان دەربکەن.[4]

پاشان لەگەڵ کۆمەڵێك موجاهیدا بەرەو (ذو القصة) کەوتنە ڕێ و موسوڵمانەکان پێیان وت: بۆ خوا پێت دەڵێین ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خۆت تووشی مەترسی مەکە؟! چونکە ئەگەر تۆ لەناو بچیت یاساکان تێك دەچن و ئێ مانی تۆش بۆ سەر دڵی

---

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[2] تأريخ الطبري (٦٧/٤).
[3] الصديق اول الخلفاء للشرقاوي (لا: ٧٥).
[4] تأريخ الطبري (٣٧/٤).

دوژمنان زۆر سەختە لە باتی خۆت پیاوێك دابنێ ئەگەر تیاچوو، کەسێکی تر، ئەبو بەکریش وتی: نا سوێند بە خوا شتی وا ناکەم من بە خۆم دڵی ئێوە شادمان دەکەم.[١]

ناو کرۆك و کانزای ئەبو بەکر لە کاتی کارەساتی هەڵگەڕانەوەدا بە جوانترین شێوە دەرکەوت لە وێنەی سەرکردەیەکی باوەڕدار کە لە پێناوی گەلەکەیدا خۆی دەکاتە قوربانی، سەرکردە لە فەرهەنگی موسوڵمانانداندا سەرمەشقە لە کارەکانیدا، لە ئاسەواری ئەم سیاسەتە ڕاستگۆیانەیەوە توانی موسوڵمانەکان بەهێز بکات و هانیان بدات بۆ جەنگان دژی دوژمنانیان و ئەوانیش گوێڕایەڵی هەموو فەرمانێك بوون لە سەرکردایەتیەوە بۆیان دابەزێت.[٢]

لەگەڵ سوارەکانیدا بەرەو (ذي حوسا و ذو القصة) کەوتنە ڕێ و نعمان و عبدالله و سوید هەروەك جاران بوون لە ناو سوپاکەدا، تا گەیشتە ناوچەی ڕەبەزە لە ئەبرەق و خوای گەورە حارس و عەوفی تێکشکاند (حطيئة) شیان بە دیل گرت، هۆزی عەبەس و بەنو بەکر تێیان قوچاند و ئەبو بەکر چەند ڕۆژێك لە ئەبرەق مایەوە، دەبینێت بەنو زوبیان دەستیان گرتووە بەسەر وڵاتدا وتی: حەرامە لەسەر زوبیان کە ئەم وڵاتەیان لە ژێر چنگدا بێت کە خوای گەورە غەنیمەی ئێمەی کردووە و دەری کردن.

لەو ڕۆژە بە دواوە هەڵگەڕاوەکان دەستیان نەڕۆیشت و لەو دەرگایەوەی لێی چووبوونە دەرەوە، لێوەی هاتنە ژوورەوە و لە هەموو خەڵکی بورا و لە هەموو شتێك گوزەشت، (بنو ثعلب) ە هاتنەوە و وتیان دێینەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆمان، ئەبو بەکر نەیهێشت، ئەوانیش هاتن بۆ مەدینە و بە ئەبو بەکریان وت: لەسەر چی ماڵ وحاڵ و زەوی خۆمانمان لێ قەدەغە دەکەیت؟! وتی: درۆ ئەکەن، وڵاتی ئێوە نیە، بە من بەخشراوە و من ڕزگارم کردووە و لێیان زویر نەبوو، ناوچەی ئەبرەقی کرد بە قاغە بۆ لەوەڕاندنی وەڵاخی موسوڵمانان، ناوچەکانی تری ڕەبەزەی کرد بە لەوەڕگای وڵاخ و مەڕ و ماڵاتی (بنو ثعلبة)، پاش ماوەیەك هەمووی کرد بە موڵکی (بيت المال)ی موسوڵمانان ئەوەش بە هۆی شەڕ و ناکۆکیەوە بوو لە ناو خۆیاندا بەرپایان کرد لەگەڵ کۆکەرەوانی زەکاتدا.

---

[١] التفسير الطبري (٦٧/٤).
[٢] حركة الردة (٣١٩).

ئا بەم شێوەیە موسوڵمانانە سیرەتی ژیانی ئەبو بەکرەوە (ﷺ)ئەوە فێر دەبن کە هەرگیز گیانی خۆی لە گیانی شوێنکەوتوانی خۆشتر نەویستووە لە هیچ شتێکی دونیاییدا، ئیش و کاری موسوڵمانان لەو ڕۆژەوە تێك چووە کە بە داخەوە سەرکردایەتی بە هۆکاری بەرز بوونەوە دەزانن و بەدەرگایەك بۆی دەڕوانن کە لێیەوە دەستکەوتیان دەست بکەوێت و خراپەیان لێ دوور بخاتەوە و لە پێناو بێ وەییدا، لە پشت میکرۆفۆنەکانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە یان لە ژووری کۆبوونەوەکانەوە بڕیار و قسەکانی پێشکەش دەکات و ئیتر هیچ بەشداریەکی ڕاستەوخۆ و ڕاستەقینەیەکیان نیە لە ناو مەسەلە گەورە و گرنگەکانی گەلەکەیدا.[1]

دەرچوونی ئەبو بەکر (ﷺ) سێ جار لەسەر یەك بۆ جیهاد و بەرەکانی جەنگ، ئەوپەڕی مانای قوربانیدان و گیان فیداییە، کەموسوڵمانەکان تکایان لێ دەکرد کە لە مەدینە بمێنێتەوە و لە باتی خۆی کەسێك بکات بە سەرکردەی جەنگاوەرەکان بەڵام ئەو قبووڵی نەدەکرد و دەیوت: نا، سوێند بە خوا واناکەم ومن بە ئامادەیی خۆم دڵی ئێوە خۆش و ئاسوودە دەکەم، ئەمەش مانای ئەوپەڕی خۆ بەکەم زانینی دەگەیەنێت، بە گرنگی دانی زۆری بە بەرژەوەندی گەلەکەی، و خۆ نەویستی و بەو کارەی توانی ببێتە سەرمەشقێکی چاك بۆ کەسانی تر، کە گومانی تێدا نیە کە خەلیفەی موسوڵمانان بێت و تەمەنی لە سەرووی شەستساڵیەوە بێت و سێ جار لەسەر یەك دەربچێت لەگەڵ سەربازەکانیدا بۆ جیهاد ئەوپەڕی وزە بەخشین و غیرەت پێدانە بۆ هاوڕێکانی.[2]

لە یەکێك لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کاتێك چراری کوڕی ئەرز هەواڵی پێدا کە (طليحة الاسدي)کۆبوونەتەوە دژمان، دەڵێت: کەسم نەدیوە پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك ئەو خۆی ساز داو خۆی تێکدا لە پێناو ئامادەکاریدا، وەك ئەوەی پێمان وتبێت ئەبێت تۆ بڕۆیت بۆیان.[3]

ئەم وەسەف گەورەیە بۆ ئەبو بەکر (ﷺ) لە یەقین و ئەوپەڕی دڵنیاییەوە بوو، متمانەی تەواوی بە هاتنەدی سەرجەم بەڵێن و پەیمانی خوا بۆ دۆستانی با سەرخستنیان بەسەر

---

[1] حركة الردة (٣٢١).
[2] التأريخ الاسلامي للحميدي (٤٨/٩).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

دوژمناندا و جێگیرکردنیان لەسەر زەوی، خۆ ئەبو بەکر (ﷺ) بە کردەوەی زۆر گەورە پێشی هاوەڵان نەکەوتووە، بەڵکو پێشیان کەوت بە کێوێك لە یەقینی و دڵنیاییەوە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت).[1]

دەگێڕنەوە کاتێك پێیان وت: ئەوەی بەسەر تۆدا باریوە ئەگەر بەسەر کێوەکاندا یان بەسەر دەریاکاندا دابارییایە لە ناوی دەبرد کەچی تۆ لاواز نەبوویت.

لە وەڵامدا وتی: لە دوای شەوەکەی ئەشکەوتی (الثور)ەوە دڵم ئاگای ترسی نەزانیوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك زانی من دڵتەنگم ووتی: پێویست بەوە ناکات ئەی ئەبو بەکر، خوا خۆی بەڵێنی داوە ئەم کارە دەگەیەنێتە ئەنجام.[2]

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئازایەتیەکی سروشتی تێدا بووە، خاوەنی ئازایەتیەکی ئایینیش بووە، هێزێکی دڵنیایی و یەقینی تەواوی بە خوای (عز وجل) و متمانەی تەواوی هەبوو کە خوای گەورە ئەو و موسوڵمانان سەردەخات، ئەم جۆرە غیرە ت و ئازایەتیەش بۆ هیچ کەس نیە جگە لە کەسانی شێر دڵ، کە زیاد بکات بە زیاد بوونی ئیمان و کەم بکات بە کەم بوونی.

و صدیق (ﷺ) لە هەموو هاوەڵان زیاتر چاو نەترس بووە، بە جۆرێك کەسێك لەوان لەو بوارەدا نزیکیشی نەبۆتەوە.[3]

## جێ باسی سێیەم

## هێرشی سەرتاسەری بۆ سەر هەڵگەڕاوەکان:

هۆکاری زۆر گیرایە بەر بۆ ڕێگرتن و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، ئەوانە لەسەر ئیسلام مابوونەوە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە ڕووبەڕوو بوونەوەی هۆزەکانیاندا، هەندێ لەوانە بەرامبەر کەس و کار و هۆزەکانیان وەستان و ئامۆژگاریان دەکردن و لە ئاکامی خراپی ئەو کارەی دەستیان دابوویە ئاگاداریان دەکردنەوە و لە ترسناکی هەڵوەشاندنەوەی بیروباوەڕەکەیان دەیان ترساندن.

[1] التأريخ الاسلامي للحميدي (٩/٤٨).
[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[3] ابو بكر افضل الصحابة واحقهم بالخلافة (لا: ٦٩).

هەنگاوی یەکەم بە وشە دەستی پێ کرد، وشەیش هیچ ڕۆژێ لە ڕۆژان لاوازترین هەڵوێست نەبووە، بەڵکو بە هێزترین بووە، چونکە هەر قسەیە بە دوایدا هەنگاوی کردن بە کردەوە دێت و ڕاستی وتەکە دەسەلمێنرێت، هەندێ جار زمان و قسە بووەتە هۆی ئەوەی خاوەنەکەی لە پێناویدا سەر بڕاوە، لە هەموو هۆزەکاندا کە هەڵگەڕانەوە ڕووی دابێت لە بەرامبەردا کەسانێك هەڵکەوتوون دڵیان لەسەر ڕاستی دامەزراوە و لەو پێناوەشدا ژیاون، ئەوانە هەستیان بەو ناڕەوایی یە کردوە کە هۆزەکانیانی تێ کەوتووە، بۆیە لە کەمیندا بۆیان دانیشتن و هۆشیاریان دەکردنەوە لە سەرەنجامی خراپ کە چاوەڕوانیان دەکات، ئیتر هۆزەکانیشیان لە ڕوویاندا دەوەستان و گاڵتەیان بە عەقڵیان دەکرد و پاشان دەستیان بۆ درێژ دەکردن، یان هەر لە هۆز دەریان دەکردن، یان هەر هەندێ جار شەهیدیشیان دەکردن.

هەندێ لەو موسڵمانانە قسەکانیان کاریگەری خۆی هەبوو، وەك عەدی کوڕی حاتەم لەگەڵ هۆزەکەی و جارود لەگەڵ خەڵکی بەحرەین.[1]

لەمەولا بە درێژی باسی ئەوە دەبینی کە چۆن هەندێ لەوانە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لە ئامۆژگاری هۆزەکانیاندا، بۆیە خۆیان بوون بە کۆمەڵێکی موسڵمانی ڕاوەستاو لەسەر ئیسلامەکەیان و هەڵوێستی گونجاویان گرتە بەر دژ بە هۆزەکانیان، زۆربەی ئەو هەڵوێستانەیان لە گفتوگۆوە دەستی پێ دەکرد و پاشان دەچووە قۆناغی کردەوەوە، وەك ئەوەی بەسەر خۆڕاگرەکانی (بنی سلیم) هات کە لە سەرەتاوە هۆزەکەیان ئاگادار کردەوە پاشان بوون بە دوو تاقم: خۆڕاگرەکان دووەم پاشگەزبووەکان.

کۆمەڵێ خۆگران لەسەر بیروباوەڕ بەرامبەری هەڵگەڕاوانی هۆزەکەیان دەوەستان، و کۆمەڵێ لاو لە یەمەن نەخشەی کوشتنی (اسود العنسی) یان داڕشت - وەك لە مەولا باسی دەکەین- دوای ئەوەی کە هەڵوێستی پێچەوانەیان نواند لە دژی سەر کەشی (اسود العنسی).

هەروەها مەسعود یان مەسروق (القیسی بن عابس الکندی) هەستا بە ئامۆژگاری کردنی ئەشعەسی کوڕی قەیس تا پاشگەز نەبێتەوە و لەو بوارەدا وتووێژ و ڕاگۆڕینەوەی دوور و درێژ کەوتە نێوانیان.[1]

[1] دراسات فی العهد النبوة والخلافة الراشدة، للشجاع (لا: ٣١٣، ١١٤).

ئا بەو شێوەیە هەندێ هەڵوێست بوونە هۆی ئەوەی نەیانهێشت هۆزەکانیان پاشگەز ببنەوە یان کار ئاسانی باشیان کرد بۆ سوپای ئیسلام کە دواتر هات بۆ سەرکوت کردنی هەڵگەڕانەوە.[1]

صدیق (ﷺ) لە پاش خوا- لە سیاسەتەکانیدا لەپێناو قەڵاچۆکردنی دیاردەی پاشگەز بوونەوەدا پشتی بەست بەو ڕاوەستاوانەی ناو هۆزەکان لە سەرۆك هۆز و فەرماندە و تاکەکان کە لە هەموو قوژبنێکی کەنداوی عەرەبدا هەبوون، و لەسەر ئیسلام مابوونەوە، هەستان بە بینینی ڕۆڵی گرنگ بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئاشووبی هەڵگەڕانەوەدا، و هەندێ نووسەر کەوتوونەتە ناو هەڵەوە کاتێك مەسەلەی پاشگەز بوونەوەیان بە گشتی داوەتە قەڵەم یان لەبەر نەبوونی ورد بینیان یان نەبوونی بابەتیانە یان گریمانی هەڵە و تەسك بینی.[2]

یەکێ لە ڕاستی یە بنەڕەتی یەکان لە مەسەلە ئاشووبی هەڵگەڕانەوەدا ئەوەیە کە گشتگیر و هەمووانی نەبووە وەك لایەنی جوگرافی، بەڵکو کۆمەڵێ لەسەر کردە و هۆز و تاك و دەستە هەبوون لە هەموو ئەو ناوچانەی پاشگەز بوونەوەی تیا سەری هەڵداوە کە سوور بوون لەسەر بیروباوەڕ و ئاینەکەیان.[3]

دکتۆر مهدی رزق الله احمد لەم مەسەلەیەدا بە قووڵی بۆی دابەزیوە و وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە کە دەڵێت: ئایا پاشگەز بوونەوە لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق دا (ﷺ) گشتی بووە و ناوچەیەکی بە تەواوەتی گرتۆتەوە کە پێشتر موسڵمان بوون؟ یان هەر لە ناو هەندێ هۆزدا سەری هەڵدا و هەندێ سەرەك هۆز و تاکە کەس و لە هەندێ ناوچەی جیا جیادا ڕووی دا؟ پاش لێکۆڵینەوە دەڵێ: یەکێ لەو ڕاستیانەی کە لە هەموو ئەو سەرچاوانەوەی کە پێشتر ئاماژەم بۆ کرد ئەوەیە کە شتێکم بەرچاو نەکەوتووە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە هۆزەکان و هەموو کەسەکان بە گشتی لە ئیسلام هەڵگەڕابنەوە، هەر وەك چۆن ئەو کەسانەی کە

---

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[2] الثابتون علی الاسلام ایام الردة (لا: ٤).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا: ١٩).**

بە نموونە هێنامنەوە باسیان کردوە،[1] بەڵکو دەبینم دەوڵەتی ئیسلامی بە پلەی یەکەم بەو کەس و هۆز و سەرکردانە بەستبوو کە لە ئیسلام بە ڕاوەستاوی مابوونەوە و لە هەموو کون و قوژبنێکی کەنداوی عەرەبدا هەبوون، کەبووە پشت و پەنایەکی بەهێز بۆ ئیسلام و دەوڵەتەکەی لەپێناو سەرکوت کردنی بزوتنەوەی پاشگەز بواندا.[2]

یەکەم: ڕووبەڕوو بوونەوەی یاسایی لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامەوە:

أ- هۆکاری کوژاندنەوەی لەناو خۆدا:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم هۆکارەی بەکارهێنا، هەستا بەناردنی نامەو نوێنەر بۆ ناو ئەو هۆزانەی پێغەمبەرانی درۆی تیا هەڵکەوتبوو، بەهیوای کۆبونەوەی هەموو ئەوانەی لەسەر ئیسلام جێ گیربوون تا دەستەیەکیان لێ پێك بهێنێت لەگەڵ پاشگەزبونەوەدا ڕوو بە ڕوو ببنەوە، صدیقیش (رضي الله عنه) لەسەر هەمان نەخشە دەڕۆیشت، هەوڵی دا کە مەسەلەکە سنووردار بکات و ئەوەی ئاسانە و دەکرێت قەڵاچۆ بکرێت لە ناوچە پاشگەز بووە نزیکەکان بیکات، هەستا بە وشیارکردنەوەی خەڵکی لە دژیان، قێزەونکردنی لەبەر چاویان، توانی پەیوەندی بکات بەوانەوە لەسەر ئیسلام ڕاوەستابوون و توانی بیانکاتە پشتیوان بۆ سوپای گەورەی ئیسلام، لە پاش گەڕانەوەی سوپای ئوسامە هەوڵی دا نەتەوە ساز بکات بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕێك و پێك لەگەڵ پاشگەز بوواندا.

بۆ ئەوەی کات بەسەر بەرێت تا سوپاکەی ئوسامە دێتەوە دەستی کرد بە ناردنی نامە بۆ سەرانی پاشگەز بووان و بۆ جێگیر بووان لەسەر ئیسلام و ئەویش نامەی نووسی بۆ هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی نامەی بۆ ناردن و کەسانی تریش لە یەمەن.[3]

---

[1] التاريخ السياسى للدولة الغربية، د. عبدالمنعم ماجد (لا: ١٤٦). التاريخ الاسلامس العام: الجاهلية الدولة العربية، الدولة العباسية، علي ابراهيم حسن (لا: ٢١٩). تاريخ الدواة العربية، عبدالعزيز سالم (لا: ٤٣٢). جولة تاريخية في عصر الخلفاء الراشدون، د. محمد سيد الوكيل (لا: ١٢). الخلفاء الراشدون محمد اسعد طلس (لا: ٢٠)، الصديق ابو بكر — محمد حسين الهيكل (لا: ١٧٣). ظاهرة الردة المجتمع الاسلامي الاول محمد بريغس (لا: ١٠٠-١٠١)، ابو بكر الصديق. علي الطنطاوي (لا:١٦). **کۆمەڵێك نووسراوی تر....**

[2] الثابتون على الاسلام ايام فتنة الردة (لا: ١٩).

[3] دراسات في العهد النبوة، للشجاع (لا: ٣١٩).

تا هەوڵ و تێکۆشان بدەن لە پێناو بانگەوازی ئەوانەی لەسەر موسوڵمانەتی ماونەتەوە، داوای لە جێگیر بووان کرد کە هەوڵ بدەن لە جێیەکدا بە کۆمەڵی بژین تا دێم بە دەمتانەوە، ئەم کارانەی ڕێکخست وەك پێشەکیەك بۆ نەخشە سەربازیەکەی داهاتووی.[1]

خۆشبەختانە هەندێ لەو کەسانەی لەسەر ئیسلام جێگیر بوون توانیان خۆیان بگەیەننە مەدینە و هەرچی زەکاتیشیان هەبوو هێنایان لەگەڵ خۆیان وەك (عدي کوری حاتم ی تائی) و (زبرقان بن بدر التميمي).[2]

هەر ئەو موسوڵمانە جێگیر بووانە توانیان جووڵانەوەکەی قەیسی مەکشوح المرادی شکست پێ بهێنن و هەندێ کۆبوونەوەی هۆزەکان بڵاوە پێ بکەن لە تیهامە و سەرات و نەجران، ئەم هۆکارانەش ئەم ئامانجانەیان بەدەست هێنا لەوانە:

أ- سەرکەوتنی صدیق (ﷺ) لە نەخشەکەیدا کە بە دەستهێنانی هەلمەتێکی هۆشیار کردنەوە و بانگەشە کردن و پشتگیری کردنی موسوڵمانەکان، سەرشۆڕکردنی هێزە هەڵگەڕاوەکان، ئەمەش وەك پێشەکیەك بۆ گرتنەبەری هۆکارێکی دیکە بە پێی بوون و توانا، کە ئەوەش هۆکاری دەستی هەموو سوپا ڕێکخراویەکانە.

ب- ئامانجی خۆی پێکا لە پەروەردەکردن و ئامادە کردنی ئەوانەی لەسەر ئیسلام مابوونەوە تا لە داهاتوودا ببنە سەرکردەی سوپا لە بزاڤی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی داهاتوودا، وە: (عدي کوری حاتم التائی) کە دواتر لە ڕزگار کردنی عێراق سەرکردەی سوپا بوو.)

ج- دروستکردنی هەندێ هێزی موسوڵمان بۆ خۆ ڕاگری لەو ناوچانەدا تا دواتر تێکەڵ بکرێت لەگەڵ سوپای گەورەی ئیسلامدا کە دێتە ناوچەکەوە.

د- دەست گرتن بەسەر هەندێ پاشگەز بووەکاندا هەرچەندە کەم و سنووردار بوو وەك ئەوەی لە خوارووی کەنداوی عەرەبیەوە ڕوویدا.

٢- ناردنی سوپای ڕێکخراو:

---

[1] **هەمان سەرچاوە.**

[2] **هەمان سەرچاوە.**

لە پاش دوو مانگ (دەشڵێن چل ڕۆژ) لە دەرچوونیان سوپاکەی ئوسامە (رضي الله عنه) گەیشتەوە شاری مەدینە و حەوانەوە و ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) لەگەڵ سوپاکەیدا دەرچوون بەرەو (ذي القصة) کە قۆناغێك لە مەدینەوە دوورە، ئەمەش بە مەبەستی جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوە و سەرکەشەکاندا، هاوەڵان پێشنیاریان بۆ کرد کە کەسێك لە باتی خۆی بکات بە سەرکردەی سوپا و خۆی بۆ مەدینە بگەڕێتەوە، زۆر داوایان لێ کردتا ئەم کاروبارەکانی دەوڵەت بەڕێوە بەرێت.

لەم بارەیەوە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باوکم سواری وڵاخەکەی بوو شمشێرەکەی لە کێلان دەرهێنا بوو بە نیاز بوو بەرەو (ذي القصة) بەڕێ بکەوێت، عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) هات و ڕەشۆی وڵاخەکەی گرت و پێی وت: بۆ کوێ جێنشینی پێغەمبەری خوا؟ ئەوەت پێ دەڵێم کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحود فەرمووی[1]: «شمشێرەکەت بخەرەوە کێلان بە مردنت کارەساتبارمان مەکە، سوێند بە خوا ئەگەر تۆمان لە دەست دەربچێت ئیسلام یاساو دەوڵەتی نامێنێت هەرگیز، ئەویش گەڕایەوە».[2]

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) سوپای ئیسلامی کرد بە (١١) لیواوە و هەموو لیوایەکیش سەرکردەیەکی بۆ دانا.[3] فەرمانی دا بە هەموو ئەمیرێکی ئەو لیوایانە کە دایان بە هەر ناوچەیەکدا موسوڵمانانی ئەو ناوچانە بخەنە ناو سوپاکانیانەوە، لەوانە:

١- سوپای خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) ناردی بۆ (بنی ئەسەد) و (تیم) پاشان بۆ ناوچەی یەمامە.

٢- سوپای عکرمەی کوڕی ئەبو جەهل (رضي الله عنه) ناردی بۆ مسیلمە لە (بنی حنیفە) و پاشان بۆ عومان و ماهرە و پاشان حەزرەمەوت، وە پاشتر یەمەن.

٣- سوپای شەرحەبیلی کوڕی ابن حەسەنە (رضي الله عنه) بۆ یەمامە و پاشان بۆ لای عەکریمە و پاشتر بۆ حەزرەمەوت.

---

[1] **مەبەستی ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئوحوددا بە ئەبو بەکری فەرموو کاتێك ویستی لەگەڵ عبدالرحمنی کوڕیدا بجەنگێت.**

[2] التأريخ الاسلامي (٩/٤٩).

٤- سوپای طریفه ی کوڕی حاجز (رضي الله عنه) بۆ (بنی سلیم) له هوازن.

٥- سوپای عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) بۆ (قضاعة).

٦- سوپای خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص بۆ نزیکی شام.

٧- سوپای عەلائی کوڕی حەزرەمی (رضي الله عنه) بۆ بەحرەین.

٨- سوپای حوزەیفەی کوڕی محصن غەلەفانی (رضي الله عنه) بۆ عومان

٩- سوپای عەرفەجەی کوڕی هەرسەمە (رضي الله عنه) بۆ مەهرە.

١٠- سوپای موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە (رضي الله عنه) بۆ یەمەن و پاشان بۆ حەزرەمەوت.

١١- سوپای موقرین (رضي الله عنه) بۆ تیهامەی یەمەن.[١]

ئا بەم جۆرە (ذي القصة) بوو بە خاڵی دەرچوونی سوپا و بنکەیەکی جموجۆڵی سوپا ڕێکخراوەکەی ئیسلام کە دواتر بەرەو ناوچەی پاشگەزبووەکان دەڕوات بە مەبەستی قەڵاچۆ کردنیان، ئەم نەخشەیەی صدیق (رضي الله عنه) مانای لێهاتوویەکی بێ وێنەیە، شارەزایەکی جوغرافی ناوچەکەیە.[٢]

لە ڕێگەی دابەشکردنی سوپاکەی بۆ چەند لیوایەك و دیاری کردنی ئاراستەکانیان ڕوون دەبێتەوە کە تا چ ئاستێك شارەزایی وردی هەبوو لە جوغرافیا و ئاو و هەوای ناوچەکە و شوێنە نیشتە جێیەکاندا و هێڵەکانی گەیاندنی کەنداوی عەرەبدا.

هەموو کەنداوی عەرەبی بە شێوەیەکی جوان کەوتە بەر چاوی لە ژووری داڕشتنی نەخشەی جەنگ (غرفه العملیات) کە لە پێشکەوتووترین ژووردا و بە هەموو هۆکارێکی پێشکەوتنەوە ئەوەندەی ئەو ورد ناوچەکانی نەبینی.

ئەوەی ورد بێتەوە لە ڕێڕەوی سوپاکە و ڕۆیشتنیان و کۆ بوونەوەیان دوای جیابوونەوەیان، جیابوونەوەیان لەم سوپایە و دووبارە گەڕانەوەیان بۆ لای، بۆی دەردەکەوێت کە هەموو قوژبنێکی ناوچەی پان و پۆڕی کەنداوی لەبەر چاودا بووە، لەگەڵ بوونی پەیوەندی بەردەوامی ورد لەگەڵ هەنگاو بە هەنگاوی سوپاکەدا، ئەبو بەکر سات بە سات دەیزانی

[١] التأريخ الطبري (٦٨/٤)، دراسات في عصر النبوة (لا: ٣٢١).
[٢] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدين (لا: ٣٢١١).

سوپاکەی گەیشتۆتە کوێ و وردەکاریەکانیشی پێ دەگەیشت، سەرکەوتنەکانی و دەستکەوتەکانی و کارەکانی سبەینێ یان، نامەکان زۆر بە وردی و بە پەلە و بەردەوام ورد دەگەیشت.

هەواڵی بەرەکانی جەنگ کە دەگەیشتە مەقەڕی سەرەکی لە مەدینەی پایتەخت و صدیق (ﷺ) پەیوەندی بەردەوام بوو بە هەموو سوپاکانیەوە و لە ناو نامە بەرە سەربازیە بەناوبانگەکانی هاوەڵاندا کە هێڵی پەیوەندی بوون لە نێوان سوپاکان و مەقەڕی سەرکردایەتی لەوانە: (ابو حیثمة البخاري) و (سەلمەی کوڕی سەلام) و (ابو برزه الاسلمی) و (سلمەی کوڕی وەقش).[1]

ئەو سوپایەی صدیق (ﷺ) ناردی بۆ ئەو ناوچانە زۆر پەیوەست بوون بەیەکەوە کە ئەمەش یەکێکە لە دەسکەوتە مەزنەکانی دەوڵەت، ئەو سوپایە لێهاتووەی سەرکردایەتی و شارەزایی ڕێکخستنی لە خۆ گرتبوو ئەمە جگە لە جەنگاوەریی بێ وێنە — کە ئەو هەمووە سریە و غەزایانەی سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو بوارەدا ڕایهێنابوون، لەو کاتەدا دەزگای سەربازی صدیق (ﷺ) بەهێزترین و تۆکمەترین دەزگای سەربازی هەموو کەنداوی عەرەبی بوو.[2]

سەرکردەی گشتی ئەم سوپایانە شمشێری خوا بوو خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) خاوەنی لێهاتوویی بێ وێنە لە جەنگی دژی هەڵگەڕاوەکاندا، ئەم شێوە دابەشکردنەی سوپاکە لە لایەن ئەبو بەکرەوە (ﷺ) بە پێی نەخشەیەکی ستراتیژی ورد داڕێژرابوو، چونکە تا ئەو ساتەوەختە هەڵگەڕاوەکان لە شوێنی جیا جیا بوون و یەکیان نەگرتبوو دژی موسوڵمانەکان، بە هۆی گەورەیی و دووری هۆزەکان بوو لە یەکتری و کاتی دەویست تا یەك بگرن چونکە سێ مانگ زیاتر تێنەپەڕی بوو بەسەر هەڵگەڕانەوەیاندا، لە لایەکی تریشەوە لە سەرەتاوە هەستیان بە مەترسی موسوڵمانەکان نەکردبوو، وایان دەزانی دەتوانن لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەدەن بەسەریاندا و ڕایان دەماڵن، بۆیە صدیق (ﷺ) ویستی بە هێرشی کتوپڕ چارەسەری ئەو

---

[1] في التأريخ الاسلامي، شوقي ابو خليل (لا: ٢٢٦-٢٢٧).
[2] من دولة عمر الى دولة عبدالملك، ابراهيم بيضوت (لا: ٢٨).

کێشەیە بکات و دەسەڵات و شەوکەتیان بشکێنێت پێش ئەوەی لەو کارە ناڕەوایانەدا یەك بگرن،[1] بە پەلە دای بەسەریاندا تا ئاشووبیان گەورە نەبێت و هەوڵی پێ نەدەن تا لە کون سەر دەر بهێنن، بدەن بە جەستەی ئیسلامەوە، لەو بارەیەشەوە شاعیر دەڵێت:

لا تقطعنّ ذنب الافعى وترسلها

ان كنت شهما فاتبع رأسها الذنبا

واتا: کلکی مار مەبڕە و بهێلێت ڕا بکا

ئەگەر پیاو پیاوە سەری پان ئەکا

گەورەیی ڕووداوەکەی هەست پێ کردبوو، لەگەڵ ترسناکیەکەیدا، دەیزانی ئەگەر وا نەکات نزیك بوو پشکۆکە لە ژێر خۆڵە مێشەوە دەربکەوێت و تەڕ و وشك بەیەکەوە بسوتێنێت، وەك شاعیری یەکەم دەڵێت:

ارى تحت الرماد وميض نار ويوشك أن يكون له ضرام

بەڕاستی ئەو (ﷺ) سیاسیەکی لێهاتووی و سەربازیەکی بە ئەزموون بوو، کە کارەکانی بە جوانی هەڵئەسەنگاند و نەخشەی ڕاستەوخۆی بۆ دەکێشا.

هەموو ئەو لیوایانە کەوتنە ڕێ کە صدیق (ﷺ) ڕێکی خستبوون و ئاڵای (لا الله الا الله محمد رسول الله) بە سەریانەوە دەشەکایەوە و لەگەڵ دوعای خێری دڵسۆزانەی ئەو دڵانەی کە خوای گەورە بە مەزن دەگرن و مانای ڕاستەقینەی باوەڕ لە دڵیاندا چەقیوە، خوای گەورەش ئەم دوعایانەی گیرا کرد و سەرکەوتنی خۆی پێ بەخشین و بە هۆی ئەوانەوە وشەی خۆی بەرز ڕاگرت و ئاینەکەشی پاراست، تاوای لێ هات لە ماوەی چەند مانگێکدا هەموو کەنداوی عەرەب سەریان بۆ ئیسلام نەواندەوە و باوەڕیان دامەزرایەوە.[2]

ئەمە و ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) تەنها یەك نامەی بۆ هۆزە عەرەبەکان ئەوانەی پاشگەز بوونەوە و یاخی بوو بوون، بانگی کردنەوە بۆ گەڕانەوە بۆ لای ئیسلام و جێبەجێ کردنی بە تەواوی و بەو جۆرەی کە لای خواوە هاتووە، پاشان ئاگاداری کردنەوە لە ئاکام و سەرەنجامی خراپی ئەو کارەیان لە دونیا و لە دوا ڕۆژیشدا ئەگەر بشێ و بەردەوام بن لەسەری، زۆر لە هێز و

[1] التأريخ الاسلامي (٩/٥١).
[2] التأريخ الاسلامي (٩/٥١).

دەسەڵاتەوە ئاگاداری کردنەوە، ئەوەش هەقی خۆی بوو چونکە لادانەکەیان زۆر گەورە بوو، زۆریش توند دەستیان بەو کارە نارەوایەیانەوە گرتبوو، ئاگادار کردنەوەیەکی توند و پاشان بە دوایدا کردەوەکی بوێرانەی دەویێت بۆ لابردنی ئەو سەرکەشیەی کە لە بیر و هۆشی ئەو سەرۆك هۆزانەدا هێلانەی کردبوو، نەژاد پەرستیەکی کوێرانە زاڵبووبوو بەسەر بیر و هۆش و شوێن کەوتوانیاندا.[1]

٣- دەقی ئەو نامەیەی کە بۆ پاشگەزبووانی نارد،ئەو پەیمانەی بۆ سەرکردەکانی نووسی:

دوای ڕێکخستنی ورد و جوانی ئامادەکردنی سوپای ئیسلامی و دابەشکردنی کۆمەڵە لیوایەك لە لایەن صدیقەوە (رضي الله عنه) دەبینین بانگەوازی دەمی و ڕوونکردنەوەی درێژ و تیر و تەسەل دینێتە گۆڕەپانەکەوە تا — پێش جەنگ — ڕۆڵی خۆی ببینێت و کاری خۆی بکات.

سەرەتا نامەیەکی گشتی نووسی، کە ناوەڕۆکێکی تایبەتی سنووورداری لە خۆ گرتبوو، هەوڵی دا بە جوانی بگاتە دەستی ئەوانەی لەسەر ئیسلام بە دامەزراوی ماوبوونەوە و ئەوانەشی پاشگەز بووبوونەوە، ئەمە پێش ئەوەی سوپا بخاتە ڕێ بۆ جەنگ دژی هەڵگەڕاوەکان، بە کۆمەڵێك پیاودا ناردی و پێی وتن لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا خۆتان بۆیان بخوێننەوە، داواشی کردبوو کە هەر کەسێك گوێ بیستی دەبێت با بیگەیەنێتە ئەوانەی نەیانبیستووە، دیاری کردبوو کە بۆ کێیە: بۆ سەرۆك و فەرماندە تایبەتیەکان و بۆ خەڵکیش بە گشتی، بۆ ئەوانەی لەسەر ئیسلامەتی ماون و ئەوانەشی وازیان لێ هێناوە.[2]

ئەمەش دەقی نامەکەیەتی:

بسم الله الحمن الرحيم: لە ئەبو بەکر جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەمو ئەوانەی ئەم نامەیەی پێ دەگات لە کەسانی تایبەت و گشتی کە لەسەر موسوڵمانەتی مابنەوە یان وازیان لێ هێنابێت، سەلامی خوا لەسەر ئەو کەسانەی کە ڕێگای هیدایەتیان گرتۆتە بەر و لە پاش هیدایەت نەگەڕاونەتەوە سەر گومڕایی و کوێرایی، من سوپاسی ئەو خوایەتان بۆ دەکەم

[1] التأريخ الاسلامي (٩/٥٥).
[2] الدور السياسي للصفوة في الاسلام، السيد عمر (لا: ٢٦٢).

بێجگە لەو کەس شایەنی پەرستن نیە، شایەدی دەدەم کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی تر نیە و تەنهایە و بێ هاوەڵە، شایەتیش دەدەم کە محمد بەندە و پێغەمبەری ئەوە و باوەڕمان بە هەموو شتێك هەیە کە ئەو بۆی هێناوین، بێباوەڕیشین بە هەر کەسێك پشتی لێ هەڵبکات و لەگەڵیشیدا دەجەنگین.

پاشان، خوای گەورە محمدی بە ڕاستیەوە ناردووە بۆ هەموو دروستکراوەکانی بە ترسێنەر و مژدەدەر، تا دڵە زیندووەکان ڕابچڵە کێنێت، هەڕەشەی خۆی بەرامبەر بێباوەڕان بێنێتە دی، خوا هیدایەتی ئەوانەی دا کە هاتن بە دەمیەوە، پێغەمبەری خوایش (ﷺ) بە فەرمانی خوا دای لەو کەسانەی شوێن هەق ناکەون تا وای لێهات بە خۆشی یان بە ناخۆشی خەڵکی ڕوویان کردە ئیسلام، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد پاش ئەوەی فەرمانی خوای بەجێ هێناو ئامۆژگاری گەلەکەی کرد، ئەوەی لەسەری بوو گەیاندی، خوای گەورە هەموو ئەمانەی بۆ ئەویش و موسوڵمانانیش لە قورئانەکەیدا ڕوون کردۆتەوە و دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (الزمر: ٣٠)، واتا: تۆ ئەمریت و ئەوانیش ئەمرن، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾﴾ (الانبياء: ٣٩)، واتا: ئەی محمد ئێمە نەمریمان بۆ کەسانی پێش تۆ دانەناوە و ئایا تۆ بمریت و ئەوان نەمرن؟!.

وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ (ال عمران:١٤٤)، واتا: محمدیش یەکێکە لە پێغەمبەرانی پێش خۆی و ئەگەر بمرێت یان بکوژرێت پاشگەز دەبنەوە، هەر کەسێك پاشگەز ببێتەوە خوا هیچ زیانێ ناکات و پاداشتی سوپاس گوزارانیش دەداتەوە.

هەر کەسێك محمدی دەپەرست، محمد مرد، هەر کەسێکیش خوای گەورە و تاکانە و بێ هاوەڵی دەپەرست، ئەوا خوای گەورە هەردەم ئامادەیە و لە کەمیندایە و هەمیشە زیندووە و نامرێت، نە خەونچوکە دەیباتەوە و نە دەشخەوێت، ئاینەکەی خۆی دەپارێزێت و تۆڵە و سزایش لە دوژمنان دەکاتەوە.

من ئامۆژگاریتان دەکەم بە لە خواترسان و خۆتان بێ بەش و بێ شەنس مەکەن لە لای خوا و خۆتان لەو ڕێنموونیە جوانانە مەکەن کە پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی، وە بەو ڕێنمونیانە ڕێنموونی وەربگرن، دەست بگرن بە ئاینی خواوە، هەر کەسێك خوا ڕێنموونی نەکات گومڕایە، هەر کەسێك ئەو بێ وەی نەکات هەمیشە بیمارە، هەر کەسێك خوا یارمەتی دەری نەبێت تێك شکاوە، هەر کەسێك خوا ڕێنموونی بکات ئەوا ڕێنموونی کراوە و هەر کەسیش خوا گومڕای بکات ئەوە گومڕایە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾﴾ (الكهف: ١٧).

لە دنیا هیچ کردەوەیەکی لێ وەرناگیرێت تا دان بە بیروباوەڕی دا نەنێت، لە دوا ڕۆژیشدا هیچی لێ قبووڵ ناکرێت، من بیستومە هەندێکتان لە ئیسلام پاشگەز بوونەتەوە پاش ئەوە موسوڵمان بوون کردەوەشتان پێ کردووە ئەمەش بە هۆی غەڕڕابوونیان بە خوا تێنەگەیشتنیان لە بەرنامەکەی و گوێڕایەڵی کردنی شەیتانە، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّـٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾] (الكهف: ٥٠).

لە جێیەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾﴾ (فاگر:٦).

واتا: شەیتان دوژمنتانە و ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی بزانن، چونکە ئەو شوێن کەوتووانی بۆ ناو ئاگر بانگ دەکات.

وە من فلان کەسم بۆ ناردوون لەگەڵ سوپایەکدا کە لە کۆچەریان و پشتیوانان پێکهاتوون وە پێم ڕاگەیاندوون کە شەڕ لەگەڵ کەسدا نەکەن تا بۆ لای خوای گەورەی بانگ نەکەنەوە، هەر کەسێك بێت بە دەمیانەوە و دان بە بیروباوەڕدا بنێتەوە و واز بهێنێت و کردەوەی چاك بکات ئەوە لێی قبوڵ دەکرێت و هاوکاریش دەکرێت، هەر کەسێش سەرپێچی کرد فەرمانم داوە لەگەڵی بجەنگن، کەسیان بە دەسەڵاتدار نەهێڵن و تەنانەت بشیان سوتێنن و بە هەموو شێوازێك بیانکوژن، ژن و منداڵەکانیشیان بگرن و بیانکەن بە کەنیزەك، هیچ لە کەس قبوڵ نەکرێت جگە لە موسوڵمان بوونەوە و هەر کەسێك وای کرد ئەوە خۆی قازانجی لێ دەکات و هەر کەسیش وانەکات ئەوە با بزانێت خوای گەورە دەسەوسان ناوەستێت.

بە نێردراوەکانی خۆمم وتووە کە ئەم نامەیەم لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا بۆ خەڵکی بخوێننەوە، نیشانەی موسوڵمان بوونەوەش بانگ دانە، هەر کاتێك موسوڵمانەکان بانگیان دا ئەوانیش بە دوایاندا بانگیان دا وازیان لێ بهێنن بەڵام ئەگەر بانگیان نەدا بە پەلە بدەن بە سەریاندا، ئەگەر بانگیان دا پرسیاریان لێ بکەن لە بیروباوەڕیان و ئەرکەکانیان پێ بڵێن ئەگەر نەیان کرد بدەن بە سەریاندا ئەگەر قبووڵیان کرد ئێوەش وازیان لێ بهێنن و چی پێویستە بدەن بە سەریاندا.[1]

ئەم بەیاننامەیەی ئەبو بەکر لە دەوری دوو خولگە دەسوڕێتەوە:

یەکەم: بەیاننامەی بنەڕەتی کە داواکردنە لە پاشگەزبووەکان بگەڕێنەوە بۆ لای ئیسلام.

دووەم: بەیانی سەرەنجامی سوور بوون لەسەر پاشگەزبوونەوەکەیان.

نامەکە چەند ڕایەکی دووپات کردۆتەوە:

١- بەیاننامەکە گشتیە و بۆ هەموو لایەکە کە بانگەوازی خوا ببیستنەوە.

---

[1] تاريخ الطبري (٧١/٧٠/٦٩/٤).

٢- بەیانی ئەوە کە خوا محمدی بە ڕاستی ناردووە وهەر کەس باوەڕی پێ بهێنێت ئەوە باوەڕدارە و هەر کەس ملەجەڕێی تیا بکات ئەوە بێ باوەڕە و دەبێت لەگەڵیدا جەنگ و جیهاد بکرێت.

٣- بەیانی ئەوەی کە محمدیش مرۆڤە و وتەی خوای بەسەردا دەبڕێت کە دەفەرمووێت تۆش دەمرێت و ئەوانیش دەمرن و باوەڕدار محمد (ﷺ) ناپەرستێت بەڵکو ئەو خوایە دەپەرستێت کە هەمیشە زیندووە و هەر دەمێنێت و مردنی بەسەردا نایەت، بۆیە پاشگەزبووەوە هیچ بەهانەیەکی بەدەست نیە.

٤- لە ئیسلام پاشگەزبوونەوە تێنەگەیشتنە لە ڕاستی و گوێڕایەڵی کردنی شەیتانە، ئەمەش مانای وایە دوژمن بکەیت بە هاوڕێی خۆت، ئەوەش ستەمێکی گەورەیە و مرۆڤ لە خۆی دەکات، بەو کارە خاوەنەکەشی بەرەو ئاگر دەبات بە ئارەزووی خۆی.

٥- پوختەیەکی هەڵبژارد لە موسوڵمانە پشتیوان و کۆچەریەکان هەڵدەستن بە جەنگ دژی هەڵگەڕاوەکان و ئەمەش لە غیرەتیانەوەیە بۆ ئاینەکەیان و لە سوکایەتی دە بپارێزن.

٦- ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای ئیسلام و دان بە گومڕایەکیدا بنێت و واز لە شەڕ لەگەڵ موسوڵمانان بهێنێت و هەموو ئەو کارانە ئەنجام بدات کە دینی خوا داوای دەکات، ئەوە یەکێکە لە موسوڵمانان ئەوەی لەسەر ئەوانە لەسەر ئەویشە ئەوەی بۆ ئەوانە بۆ ئەویشە.

٧- هەر کەسێك بڵێ ناگەڕێمەوە سەر ڕێگەی موسوڵمانان، لەسەر پاشگەزبوونەوەکەی سوور بێت، ئەوە شەڕەنگیزە و دەبێت برێت بەسەریدا یان بکوژرێت یان بسوتێنرێت یان ژن و منداڵی بە دیل بگیرێت، بە هیچ جۆرێك لە دەستی خوا قوتار نابن چونکە بۆ هەر کوێ بڕۆن موڵکی ئەوە.

٨- ئەو نیشانەیەی کە بابای پاشگز بوو بەهۆیەوە لە شەڕ و پەلامار ڕزگاری دەبێت (بانگدانە) کە بە ئاشکرا بانگ بدەن، ئەگەر وا نەکەن تەنها چارەسەر ئەوەیە جەنگی لەگەڵ بکرێت، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا خەلیفە ئەم مەسەلەیە نەخاتە ئارەزووی فەرمانڕەواکانی سوپا و سەربازەکانی بەبێ ڕێکخستن، بۆ هەموو فەرمانڕەواکان یەك

نامەی نووسی و تیایدا داوای لێکردن پابەند بن بە ناوەڕۆکی نامەکەی پێشوویەوە و تیایدا نووسی:

«..... ئەمە پەیمانێکە لە ئەبو بەکرەوە خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ فلان کەس، کە ناردوویەتی بۆ جەنگ دژی ئەوانەی لە ئیسلام پاشگەز بوونەتەوە، داوای لێ کردبوو کە چەندێ پێی دەکرێت لە خوا بترسێت لە هەموو کارەکانیدا لە نهێنی و لە ئاشکرادا، فەرمانی پێ دەدا کە فەرمانەکانی خوا بە هەند وەربگرێــت، جیهادی ئەوانە بکات پشتیان لێ هەڵکردووە، و لە ئیسلام پاشگەز بوونەتەوە و ئاواتی شەیتانی هێناوەتە دی، و پاش ئەوەی بیانوویان دەبڕێت و بانگیان دەکاتەوە بۆ موسوڵمان بوونەوە، ئەگەر بە گوێیان کرد، ئەوە دەستیان بۆ نابات، وە ئەگەر بە دەمیەوە نەهاتن ئەوە دەدات بە سەریاندا هەتا دێنەوە سەر قسەکەی ئەو و پاشان چیان بۆ هەیە و چیان لەسەرە ئاگاداریان دەکاتەوە، چەن و چوونیان لەگەڵ نەکات و ڕێگەی جەنگیان لەگەڵ دوژمناندا لێ نەگرێت».

هەر کەسێك هات بە دەم فەرمانی خواوە ئەوە لێی قبووڵ دەکرێت و هاوکاریشی دەکەین، ئەوەی بێباوەڕ بوو بە خوا لێی قبووڵ ناکرێت تا باوەڕ بە خوا نەهێنێتەوە و ئەگەر بەمە ڕازی بوو کەسێك بۆی نیە دەستی بۆ بەرێت، خوا خۆی لێپرسینەوەی هەیە لەگەڵی لەسەر ئەوەی ئایا لە دڵیشەوەیە یان نا.

هەر کەس بە دەم بانگەوازەکەی خواوە نەهات، دەکوژرێت و هەرچی بێت هەر دەکوژرێت و لە هەر کوێ بێت، هیچ شتێك لە کەس قبووڵ ناکرێت ئیسلام بوون نەبێت، ئەگەر قبووڵی کرد ئەوە لە ئیسلام حاڵی دەکرێتەوە و هەر کەسیش قبووڵی نەبێت دەکوژرێت، ئەگەر دەستتان بەسەریاندا ڕۆیشت بە هەموو شێوازێکی کوشتن بیانکوژن — بە چەك، بە ئاگر، پاشان ماڵ و سامانەکەیان بەسەر سەربازەکاندا دابەش بکات جگە لە (١/٥)ی کە دەگەڕێتەوە بۆ خەزێنە (بیت المال).

نەهێڵێ سەربازەکانی ناوچەکە پەلەپەل بکەن و ناوچەکە تێك بدەن بەسەریەکدا، نەهێڵن کەس دزە بکاتە ناوتان تا نەیان ناسن و نەزانن کێن و چین، جاسووسی نەکەن تا لەو جێگایانەوە هێرش نەکرێت بۆ موسوڵمانان و هەڵسوکەوتی مامناوەند بێت لەگەڵ

موسوڵمانەکان و نەرم و نیان بێت لەگەڵیان لە ڕۆیشتن، لە حەوانەوە و هەمیشە بە سەریان بکاتەوە، پەلە بە هەندێکیان نەکات و بە هەندێکی تریان نا، بە قسەی نەرم و هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵیان هاوڕێیەتی بکات.[1]

لەم بەیاننامەیەدا کە خستبوویە ئەستۆی سەرکردەکانی بە ڕوونی سووربوونی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) دەردەکەوێت کە ویستوویەتی هیچ فەرماندەیەك لە خۆیەوە ئیش نەکات و لەسەر بنەمایەکی نووسراو هەنگاو هەڵبنێن، کە بە ئاشکرا هەڵگیرسانی شەڕ قەدەغە دەکات پێش بانگ کردنەوەیان بۆ لای ئیسلام، واز هێنان لە شەڕ دژی ئەوانەی دێن بە دەم داواکاریەکەیانەوە، وە سوور بوون لەسەر چاکسازی کردنیان و قەدەغەکردنی بەردەوام بوونی جەنگ لەگەڵیان ئەگەر دانیان نا بە ئیسلام بوونی خۆیاندا، لەم خاڵەشدا واز لە جەنگ بهێنرێت و دەست بکرێت بە شارەزاکردنەوەیان لە ڕێنموویەکانی ئیسلام و ئاگادار کردنەوەیان لەسەر هەموو ئەو ماف و ئەرکانەی لەسەریانە و بۆیانە، ڕێك نەکەوتن و هودنە نەکردن بە هیچ جۆرێك لەگەڵیاندا تا بە جوانی ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

پابەند بوونی سوپای ئیسلامی بە جێبەجێ کردنی بنەمای بانگەواز پێش شەڕ و جەنگ، دەبێت کۆڵ بدرێت لە جەنگ تەنها بە بیستنی ئەوەی کە وەڵامی بانگەوازیان داوەتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە تەنها مەبەست لە جەنگ و هەرا دژیان ئەوەیە لەو سەرکەشی و هەڵگەڕانەوەیە واز بهێنن و ئەو ئاواتەش وا هاتۆتە دی.

صدیق (رضي الله عنه) ئەم بەڵێننامەیەی بەسەر هەموو سەرکردەکاندا فەرز کردووە، کە ڕەوشت و هەڵسوکەوتیان باشترین شێوازی بانگەواز بێت لەو کارە سەربازیەی کە پێی سپێردراوە و لەگەڵ ئەو ئامانجەدا یەك بگرێتەوە کە بەرگری کردنە لە ئیسلام.[2]

شوێن پێ هەڵگرتنی صدیق (رضي الله عنه) بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فێری هونەری سەرکردایەتی کردبوو، سەرکەوتنی سەرکردەش لەسەر ئەوە وەستاوە کە قۆناغی سەربازیەتی بە جوانی جێبەجێ کردبێت، ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) باشترین سەربازی سوپای موسوڵمانان بوو کاتی

---

[1] تأريخ الطبري (١/٧١/٧٢).
[2] الدور السياسي للصفوة (لا: ٢٦٣).

خۆی، وە دڵسۆز بووە لە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرچی لێ داوا بکرایە پیت بە پیت جێبەجێی دەکرد و لەو پێناوەدا قوربانی دەدا و لە هیچ جەنگێکدا هەڵنەهاتووە، ئەتوانن وردی و دانایی بڕیارە سەرکردایەتیەکانی و دوور بینی لە دووتوێی ئامۆژگاریەکانیدا بۆ سەرکردە و فەرماندەکانی سوپاکەی و نەخشە گشتیەکانی بۆی دەکێشان لە کاتی جموجۆڵیاندا بۆ لێدانی دوژمنان.[1]

کە یەکەمین وەسیەت نامەی بۆیان لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

- خۆیان ڕابهێنن لەسەر تەقوا و لە خواترسان، و چاودێری ئەو بەسەریانەوە لە نهێنی و ئاشکرادا، ئەمەش ئەوپەڕی دروستی و پێکانە لەم سیاسەتە ژیرانەیەدا، چونکە ئەگەر سەرکردە خۆی ڕاهێنا لەسەر لە خواترسان ئەو کاتە خوایش لەگەڵی دەبێت، چونکە خوای گەورە لەگەڵ لە خواترسان و چاکەکاران لەگەڵی دەبێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ۝١٢٨﴾ (النحل:١٢٨).
- کردنی کارەکان زۆر بە چاکی و ئەوپەڕی خۆماندووکردن و دڵسۆزی نواندن لە پێناوی خوای (عز وجل)دا، ئەوەش ڕەوشتی سەرکەوتوان و براوانە: ﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٦٩﴾ (العنكبوت: ٦٩).
- لە پاشگەزبووەکان قبووڵ ناکرێت جگە لە موسوڵمان بوونەوە یان کوشتنیان.
- دابەشکردنی دەسکەوتەکان بەسەر سەربازەکاندا لەگەڵ پاراستنی یەك لەسەر پێنج بۆ خەزێنەی موسوڵمانان (بيت المال).
- پەلەپەل نەکردن لە دەرکردنی بڕیاردا لەمەڕ ئەو کێشانەی دێنە پێشەوە، تا چاسەرەکانیان بە پێچەوانەوە نەبێت و کەلێنی تێ نەکەوێت.
- ئاگادار بن نەهێڵن کەسێك دزە بکاتە ناویان نەوەك جاسوس و هەواڵ دز بێت.

[1] حركة الردة للعتوم (لا: ١٧٩).

- دەبێت نەرم و نیان بن لەگەڵ سەربازەکانیان و لە کاتی ڕۆیشتن و دابەزیندا چاویان لێیان بێت، کەسیان ئەوانی تر پشت گوێ نەخەن.
- دەبێت جوان هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ سەربازەکانی هاوڕێیان.

لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە ئەتوانن نەخشەیەکی گشتی لە دانانی لیوا و فەرماندە بۆیان وەربگرین، کە لەم خاڵانەدا خۆیان دەبیننەوە:

أ- نەخشەکە فەرمانی هاوکاریکردن لە نێوان سەرجەم سوپاکاندا دیاری دەکات، بە جۆرێك کار نەکات بە جیا لە لیواکانی تر و وەك ئەوەی لەسەر خۆ بێت، بەڵکو با ناوچەکانیشیان لە یەکەوە دوور بن دەبێت وەك یەك دەزگا وابن، هەندێکیان بەیەك دەگەن و هەندێکی تریان لەیەك جیا دەبنەوە تا بگەن بە لیوایەکی تر، ئەمانە و خەلیفەی موسوڵمانانیش لە مەدینەوە خۆی سەرپەرشتی گشتی شەڕەکانی دەکرد.

ب- ئەبو بەکر (ﷺ) کۆمەڵێك لە گەورە هاوەڵانی لە پایتەخت هێشتەوە بۆ پارێزگاری مەدینە و هاوکاریشی بن لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتدا.

ج- صدیق (ﷺ) هەستی بەوە کرد کە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پاشگەزبواندا سوپایەك سەربازی موسوڵمان هەیە و زۆر خەمی ئەوە بوو کە بکەونە بەر خەشم و قینی بێباوەڕەکان، بۆیە داوای لە فەرماندەی سوپاکان دەکرد کە ئەگەر بە هەر جێیەکدا تێپەڕین با ئەو موسوڵمانانەش بخەنە ناو سوپاکانتان و پاش ڕزگارکردنی ناوچەکەش کۆمەڵێك جەنگاوەر لەو شوێنانەدا بەجێ بهێڵن تا پارێزگاری بن لە دوژمنان.

د- خەلیفە بنەمای (جەنگ فێڵە)ی بەکار هێنا لە جەنگی دژی هەڵگەڕاوەکان، کە بە شێوەیەك پیشانیدا کە سوپاکەی نیازی شتێکیەتی، بەڵام لە ڕاستیدا نیازێکی تری هەبوو، تا زیاتر ئاگادار بن نەوەك نەخشەکەی ئاشکرا ببێت.[1]

ئەمەش مانای قاڵ بوونیەتی لە سیاسەتدا، وە ئەزموونی پراکتیکی و زانستی قووڵ و هاوکاری خوایی لە سەرکردایەتی صدیقدا(ﷺ).

---

[1] الابعاد لمفهوم الامن في الاسلام، مصطفى محمود (لا: ١٦٩).

دووەم: قەلاچۆکردنی ئاژاوەی (الاسود العنسی) و (طلیحة الاسدي) و کوژرانی مالیکی کوڕی نوێرە:

أ- قەلاچۆکردنی ئاژاوەی ئەسوەدی عەنەسی و دووبارە پاشگەزبوونەوەی یەمەن:

ئەم پیاوە ناوی عابهەی کوڕی کەعبی کوڕی (غوث)ە، شورەتی (ذي خمار)ی هەبووە، چونکە هەمیشە بە چەفتەیەك دەم و چاوی بەستبوو،[1] بە (ڕەشەی عەنەسی) ناوی دەرکردبوو چونکە دەم و چاوی زۆر ڕەش بوو، توانایی (ڕەشە) لەوەدا بوو کە لاشەیەکی زەبەلاحی پێوە بوو، ئازا و بە غیرەت بوو، سوودی لە فالچی و سیحربازەکان وەردەگرت و وتار بێژێکی ڕەوان بوو،خۆیشی فالچیەکی دەست بڕ بوو، شتی سەر سوورهێنەری پیشانی هۆزەکەی دەدا، ئەوانەی گوێیان لێ دەگرت کەمەندکێشی دەبوون، پارە و سامانی تەرخان کردبوو بۆ ڕاکێشانی خەڵکی.[2]

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایی گەڕایەوە و دەنگ و باسی ئێش و ئازار و نەخۆشیەکەی بڵاو بوویەوە لەو کاتەدا (ڕەشە) پاگەندەی پێغەمبەرایەتی خۆی دەکرد، و دەڵێن خۆی ناو نابوو (رحمان اليمن)، هەروەك چۆن (موسەیلەمە) بە خۆی دەوت (رحمان اليمامه).[3]

(ڕەشەی عەنەسی) کاتێك بانگەشەی بۆ پێغەمبەرایەتی خۆی دەکرد لاحی لە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) نەبوو، وای پێشان دەدا کە دوو فریشتە دێنە لای بە ناوی (سحيق و شقيق يان شريف).[4]

ئەم پیاوە پێش ئەوەی ئاشکرا ببێت، کەسانێکی تایبەتی هەڵدەبژارد و لە خۆی نزیکی دەکردنەوە، تا ئەوە بوو لە کت و پڕدا کەوتە بەر چاوی خەڵکی،[5] لە سەرەتاوە خەڵکی

---

[1] الكامل في التأريخ (١٧/٢).
[2] عصر الخلافة الراشدة للعمري (٣٦٤).
[3] اليمن في العصر الاسلام، للشجاع (لا: ٢٥٦).
[4] البدء والتأريخ (١٥٤/٥).
[5] اليمن في صدر الاسلام (٢٥٧).

هۆزەکەی خۆی (عنس) شوێنی کەوت،[1] پاشان نامەی نووسی بۆ سەرۆك هۆزەکانی (مەزجیح) و خەڵکانێکی گشتی باوەڕیان پێ کردلەگەڵ هەنێك لە پلەوپایە ویستانی هۆزەکان و پاشان هەوڵی دا ڕەگەزپەرستی هۆزایەتی زیندوو بکاتەوە، چونکە خۆی لە (عنس) بوو کە ناوجەرگەی هۆزی مەزجیح بوو، لە خەڵکی نەجران لە بەنو حارس ی کوڕی کەعب بە بیانووی ئەوەی کە بە خۆشی خۆیان موسوڵمان نەبوو بوون نامەیان نارد بۆ (ڕەشەی عەنەسی) کە سەردانێکیان بکات و ئەویش سەردانی کردن و باوەڕیان پێ هێنا، هەندێ کەسیش لە (زبید) و (اود) و (مسلیه) و (حکم بن سعد العشیره) شوێنی کەوتن، پاش ماوەیەك لە نەجران مایەوە، لەو کاتەوە بە هێزبوو کەکەسانی وەك عەمری کوڕی مەعد یکرب الزبیدی و قەیسی کوڕی مەکشوح المرادی، شوێنی کەوتن، وە توانی فەروەی کوڕی مەسیك و عەمری کوڕی عەزم لە نەجران دەرنەکران و پاشان بیری گرتنی (صنعا) کەوتە مێشکی بۆیە بە (٦٠٠ تا ٧٠٠) چەکدارەوە کە زۆربەیان لە (بەنی حارس و عەنەس) بوون دایان بەسەر ئەو شارەدا.[2]

بۆیە لە شوێنێك کە (شەعەب)ی پێ دەڵێن لەگەڵ سوپای (شەهری کوڕی بازان)ی فارسی بوویەوە کە خۆی و باوکی پێشتر موسوڵمان بوو بوون، بەیەك گەیشتن و شەڕێکی زۆر توندیان پێکەوە کرد و لە ئاکامدا شەهر شەهید بوو خەڵکی (صنعا) یش شکان و هەڵاتن و (ڕەشە) سەرکەوت و لە پاش (٢٥) ڕۆژ خۆ ئاشکراکردن توانی کۆشکی غەمدان بگرێت و لەوێ حوکم بکات.[3]

کۆمەڵێك هەڵوێستی ترسناك و قێزەونی هەبوو سەبارەت بە ئەشکەنجەدانی ئەو کەسانەی بە موسوڵمانەتی مابوونەوە، یەکێك لە موسوڵمانەکان بە ناوی — نوعمان — ی گرت و پارچە پارچەی کرد،[4] بۆیە موسوڵمانەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو ناچار بوون خواپەرستی پەنهانی (توقیە) ئەنجام بدەن.[5]

---

[1] فتوح البلدان بلادي (١٢٥/١).
[2] تأريخ الردة، (لا: ١٥١-١٥٢).
[3] البدء والتأريخ (٢٢٩/٥).
[4] ابن سعد لە (طبقات)دا (١٤٥/٥).
[5] اليمن في صدر الاسلام، للشجاع (لا: ٢٥٨).

هەردوو گەورە هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو موسای ئەشعەری و مەعازی کوڕی جەبەل (خوا لێیان ڕازی بێت) خۆیان گەیاندە حەزرەمەوت و لە ژێر سایەی (السكاك والسكن)دا گیرسانەوە.[1]

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) نامەی نارد بۆ ئەوانەی لەسەر ئیسلام جێگیر مابوونەوە، کە تیایدا هانی دەدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی (ڕەشەی عەنسی) و داوای لێ دەکردن کە هەوڵی لە ناوبردنی بدەن چ بە شەڕ ڕووبەڕووی ببنەوە یان بە تیرۆرکردنی.

هەروەها نوێنەر و نامەی نارد بۆ سەرۆك هۆزەکانی (حمير) و (همدان) کە یەك بگرن و دەست بدەنە دەستی یەك و پشتی یەك بگرن و یارمەتی کوڕانی بدەن لە دژی (اسود العنسی) و (وەبری کوڕی یەحنەسی) نارد بۆ لای فەیرۆزی دەیلەمی و جەشمیش الدیلمی و زادوەیهی ئەستەرخی و جەریری بەجەلی نارد بۆ (ذي الكلاع) و (ذي ظليم الحميريين)، و ئەقرەعی کوڕی عبدالحمیدی نارد بۆ (ذي زود) و (زی مەرانی هەمەدانی).

هەروەها نامەی بۆ عەرەبە دەشتەکیەکانی ئەهلی نەجران.

ماوەیەکیش پێش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حارس ی کوڕی عبدالله المهني (ﷺ)نارد بۆ یەمەن و ئەو لە یەمەن بوو هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوایان پێ گەیشت،[2] وە ڕوون نیە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هاوەڵەی بۆ لای کێ ناردووە بەڵام لەوانەیە نامەی بۆ مەعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) کە پیاوان بنێرێت بۆ جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی (ڕەشەی عەنەسی).[3]

هەروەك ئەبو موسای ئەشعەری تاهری کوڕی ئەبی هالە (خوایان لێ ڕازی بێت) نامەی پێغەمبەری خوایان پێ گەیشت تا ڕووبەڕووی (اسود العنسی) ببنەوە چ بە جەنگ یان بە تیرۆرکردنی.[4]

[1] البدء والتأريخ (١٤٥/٥).
[2] اليمن في صدر الاسلام (لا:٢٧١).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[4] تأريخ الطبري (٥١/٤).

ئەم کارەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئەوانەی کە نامەی بۆ ناردن و نەبیستراوە یەکێك لەوانە پاشگەزبووبێتەوە، سەرۆك هۆزەکانی حیرە و سەرۆکەکانی هەمەدان نامەیان نارد بۆ کوڕانی جەنگاوەر و پەیمانی هەموو کۆمەکی و هاوکاریەکیان پێدان، هەروەك لە هەمان کاتدا موسوڵمانەکانی خەڵکی نەجران لە جێیەکدا کۆ بوونەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەست درێژیەك لە لایەن (ڕەشەی عەنەسی)ەوە و لەو کاتەوە (ڕەشە) لەوە دڵنیا بوو کە لەناوچوونی لە کات و ساتدایە.[1]

بەردەوام نامە و نامەکاری بوو لە نێوان هەمەدانیەکان و حمیریەکان و نێوان (معاز بن جبل) (ﷺ) و هەندێ لە سەرۆك هۆزەکانی یەمەن، و گومانی ئەوە زۆرە کە یەکێك لەو نامانە بۆ فەروەی کوڕی مەسیك نێردرابێت لە لایەن کوڕانەوە چونکە ئەو ڕۆڵی هەبوو لە کوشتنی (ڕەشەی عەنەسی)دا، بەڵام یەکەم کەس کە لە (ڕەشە) هەڵگەڕایەوە و ڕەخنەی لێ گرت (عامری کوڕی شەهری هەمەدانی) بوو.

ئا بەم شێوەیە هەموو هێزە موسوڵمانەکان یەکیان گرت بۆ لەناوبردنی (اسود العنسی)دا، دیاریشە کە بە مەبەستی کوشتنی یەکیان گرتبوو،چونکە دەیانزانی بە کوشتنی ئەو شوێنکەوتوانی بوونیان نامێنێت و ئاسانە دەست بگیرێت بە سەریاندا، بۆ لەبەر نەخشە (کوڕەکان) ڕێك کەوتن کە کەس هیچ نەکات تا لە ناوخۆ کاری خۆیان ئەنجام دەدەن.

کوڕەکان فەیرۆز و دازویە توانیان لەگەڵ (قەیسی کوڕی مەکشوح)دا ڕێك بکەون کە سەرکردەی سەربازەکانی(ڕەشەی عەنەسی) بوو، لەسەر کوشتنی (ڕەشە) چونکە ئەو و ڕەشە شتێك کەوتبووە نێوانیان و ئەترسا ڕۆژێك پێی بڕێژێت.[2]

خێزانی (ڕەشەی عەنەسی) کە ناوی (ئازادی فارس) بوو کە خێزانی شەهری کوڕی بازان بوو، وە ئامۆزای فەیرۆزی فارسی بوو، کە (ڕەشەی درۆزنی یەمەن) بە زۆر لە خۆی مارە کرد پاش ئەوەی مێردەکەی کوشت، ئەو خانمە ویستی ئایینەکەی ڕزگار بکات لە نێوان کەڵبە و دڕندەی نەمامی (ڕەشە) و نەخشەیەکی ڕێکخست بۆ کوشتنی بە هاوکاری نەیارانی ڕەشە بۆ لە

[1] تأريخ الطبري (٤/٥١).
[2] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٧٢-٢٧٣).

ناو بردنی ئەم سەرکەشە مل وڕە،[1] و نەخشیەکی وای بۆ داڕشتن کە هاتنە سەری و لەسەر جێگەکەلای‌خۆیدا بە خەنجەر شڕیان کرد،[2] سەرەکەیان هەڵدایە ناو هاوڕێکانی ئەوانیش لە ترساندا تۆقین و هەریەکە بە لایەکدا ڕای کرد.[3]

ئەو شەوەی (ڕەشەی عەنەسی) تیا کوژرا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئاسمانەوە ئاگادار کرا تا مژدە بە موسوڵمانان بدات و فەرمووی: «قتل العنسي البارحة، قتله رجل مبارك من اهل بيت مباركين، قيل: ومن هو؟ قال: فيروز، فاز فيروز»،[4] واتا: شەوی ڕابردوو (ڕەشەی عەنەسی) کوژرا، پیاوێکی پیرۆز لە خانەوادەیەکی پیرۆز کوشتی، وتیان: کێیە؟ فەرمووی: فەیرۆز، بردیەوە فەیرۆز.

د. صلاح الخالدی لە کتێبەکەیدا — صور من جهاد الصحابه — نەخشەی تیرۆرکردنی (ڕەشە) بە جوانی و بە درێژی باس دەکات، کە لە چالاکییەکی تایبەتیدا کۆمەڵێکی تایبەتی لە هاوەڵان پێی هەستان.[5]

کاروباری (صنعا) بە هاوبەشی بەڕێوە دەچوو لە نێوان فەیرۆز و دازویە و قەیسی کوڕی مەکشوحدا، بەڵام کاتێك مەعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) گەیشتە یەمەن خێرا هەرسێکیان بە ئەمیری ئەو ڕازی بوون، بەڵام هێندەی نەبرد پاش سێ ڕۆژ هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە یەمەن.

بەم شێوەیە هەواڵی تەواوی کوشتنی (ڕەشە) گەیشتە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) پاش ئەوەی سوپای ئوسامە لە شار دەرچوو، کە ئەمەش یەکەمین فەتح و سەرکەوتن بوو بۆ ئەبو بەکر (ﷺ) لە مەدینە.[6]

[1] حركة الردة للعتوم (لا:٣٠٩).
[2] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٧٣).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[4] تأريخ الطبري (٥٥/٤).
[5] صور من جهاد الصحابة – خالدي (لا: ٢١١ تا ٢٢٨).
[6] البلارزي فتوح البلدان (١٢٧/١).

ئەبو بەکریش (ﷺ) فەیرۆز الدیلمی دەستنیشان کرد بۆ والی یەمەن و بەلاّم قەیسی نەکرد بە والی چونکە ئەو هاوکاری عەنسی بووە ئەو لە دۆستە زۆر دڵسۆزەکانی بوو کاتی خۆی ئیتر لەبەر ڕەگەز پەرستی و خێلایەتی یان کورسی ویستی بوویێت و بەرنامەی ئەبو بەکریش (ﷺ) ئەمە بوو کە کار نەداتە دەستی هەڵگەڕاوە.[1]

دازویە و حشیمش و قەیسی کوڕی مەکشوحی کرد بە وەزیری، بەم شێوەیە قەیس پێی ناخۆش بوو بۆیە پیلانی دارشت بۆ کوشتنی هەر سێ کوڕە فارسەکان توانی دازویە شەهید بکات، فەیرۆزیش هەستی بەم مەترسیە کرد بۆیە هەر ئەوەندەی پێ کرا هەڵهات بۆ (خولان) بۆ ناو ماڵە خاڵوانی.[2]

قەیس هەر بەوەوە نەوەستا بەڵکو تیرە پەرستی وای لێکرد کە داوا لە هەندێ لە سەرۆك هۆزەکان بکات کە هەستن دژی ئەم کوڕە فارسانەی کە حوکمیان دەکەن، بەلاّم سەرۆك هۆزەکان هەڵوێستی بێ لایەنیان هەڵبژارد و نە پشتی ئەویان گرت و نە پشتی کوڕان، وە پێیان وت: تۆ هاوڕێی ئەوانی و ئەوانیش هاوڕێی تۆن، پاش ئەوەی لەوان بێ هیوا بوو نامەی نارد بۆ پاشماوەکانی (ڕەشەی عەنەسی) و داوای لێ کردن کە بیانبینێت تا هەموو لەسەر ئەوە ڕێك بکەون کە (کوڕەکان) دوور بخەنەوە و خەڵکی صەنعا ئاگایان لەم کەین و بەینە نەبوو لە ناکاودا بینیان دەوریان گیراوە بەو پاشماوانە و (قەیس) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە (کوڕەکان) کۆ بکاتەوە تا دواتر دووریان بخاتەوە و شار بەدەریان بکات.[3]

کاتێك فەیرۆز الدیلمی گەیشتە خەولان لای خاڵوانی و نامەی نارد بۆ ئەبو بەکر (ﷺ) هەواڵەکەی پێدا و ئەویش هەر ئەوەندەی پێکرا دەستی کرد بە نامە ناردن بۆ ئەو سەرۆك و هۆزانەی ئەو ناوچانە وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) جاران دەیکرد — ئەمەش دەقی نامەکە بوو:

«هاوکاری کوڕەکان بکەن و دەوریان لێ بدەن وەگوێڕایەڵی فەیرۆز بن و لەگەڵی بن چونکە من کردوومە بە گەورەتان».[4]

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٧٥).
[2] تاريخ الطبري (٤/١٤٠).
[3] تاريخ الطبري (٤/١٤٠).
[4] تاريخ الطبري (٤/١٤١).

ئەبو بەکر (ﷺ) لەم کارەیدا دوو مەبەستی پێکەوە گرێ دراوی هەبوو:

- وەك نەخشەیەکی سەربازی لێکرد، بە جۆرێك کە سوپای ئوسامە بەرەو شام دەرچووبوو، وە صدیق (ﷺ) چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەکرد تا بتوانێت بەرەنگاری دژوارترین شەپۆلی پاشگەزبوونەوەی پێ بکات لە یەمامە و بەحرەین و عوام وتمیم کە زۆر ترسناك و توندتر بوو لە تەوژمی پاشگەزبوونەوەکەی یەمەن کەتوانی لە ڕێگەی نامە و نوێنەرەوە چارەی بکات.
- مەبەستی دووەمی ئەوە بوو کە هەلْ بڕەخسێنێت بۆ ئەو کەسانەی لەسەر ئیسلام مابوونەوە تا ڕاستی و دروستی موسوڵمانیەتیەکەیان بسەلمێنن، و زیاتر و پتەوتر بن لەسەر ئاینەکەیان، مادەم ئەوان خاوەن بەرپرسیارێتین لەسەر ئەو مانەوەیان لەسەر ئیسلام بۆ ڕزگار کردنی خەڵکانی چوار دەوریان، بە تایبەت ئەوانەی کە ئەبو بەکر (ﷺ) نامەی بۆ دەناردن هەر ئەوانە بوون کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نامەی بۆ دەناردن، کە لەسەر ئیسلام جێگیر بوون و گوێڕایەڵیش بوون بۆ هەر کارێك بووایە بەسەریاندا.[1]

فەیرۆز دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە هەندێ هۆزەکان و داوای کۆمەکی و پشتگیری لێ دەرکردن، لە سەرووی ئەوانەوە (بەنو عەقیل کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عامری کوڕی صعصعە، و پاشان بۆ هەمان مەبەست نامەی نارد بۆ هۆزی (عك)، ئەبو بەکریش نامەی نارد بۆ (تاهری کوڕی ئەبی هالە)،[2] وە بۆ مەسروق (العکی) کە لە نێوان عکە و ئەشعەریەکاندا بوون تا هاوکاری کوڕەکان بکەن.

هەر کەسە و لەلای لا خۆیەوە دەرچوو و پێکەوە کاریان کرد تا نەهێڵن قەیس ئیشی خۆی بکات کە دەرکردنی کوڕەکان بوو لە یەمەن، وە ڕزگاری کردن، پاشان هەموو یەکیان گرت و بەرەو (صنعا) کەوتنە ڕێ و لەگەڵیدا ڕووبەڕوو بوونەوە و ناچاریان کرد سەنعا بەجێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە (ڕەشەی عەنەسی) لێ هاتبوو، کە توانەوە لە نێوان نەجران و

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٧٥).
[2] تاريخ الطبري (١٤٤/٤).

صەنعا و لحدا، لەوێشەوە ئەو خۆی گەیاندە عامری کوڕی مەعد یەکروب الزبیدی، و ئا بەو چەشنە بۆ جاری دووەم ئارامی ئاسایشی بۆ گەڕایەوە لە ڕێگەی نوێنەر و نامەکانەوە.[1]

ئەبو بەکر (ﷺ) بەردەوام لەسەر سیاسەتی کپ کردنەوە لە ناوخۆوە ئەنجام دەدا کە مێژوو نووسەکان بەم شێوەیە دەریان بڕیوە: «ركوب من ارتد بمن لم يرتد وثبت على الاسلام»، واتا: سەرکۆنکردنی پاشگەزبووان بە دامەزراوانی ناو خۆیان لەسەر ئیسلام.[2]

پاشگەزبووەکانی (تهامەی یەمەن) سەرکوت کرا بەبێ ئەرك و ماندووبونێکی وا لە لایەن خەلیفەوە کە شایانی باس بێت، بەڵکو موسوڵمانانی جێگیری ناوچەی تهامە خۆی ئەو کارەیان گرتە ئەستۆ، لەوانە: (مەسروقی عەککی) کە خۆی و هۆزەکەی بە قورسی لەگەڵیان جەنگا، یەکێك لەوانەی کاری بەرەنگاری پاشگەز بوونەوەی تهامەی گرتە ئەستۆ (تاهری کوڕی ئەبی هالە) بوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردبووی بە والی بەشێکی زۆری تهامە کە ناوچەی (عەك و ئەشعەریەکانە).[3]

پاشان ئەبو بەکر (ﷺ) فەرمانی دا بەسەر (عەکاشەی کوڕی سەور)دا کە لە تهامە بمێنێتەوە و خەڵکەکە لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە تا فەرمانی نوێی بۆ دەنێرێت.[4]

ناوچەی بجیلە ئەبو بەکر (ﷺ) جریری کوڕی عبداللە ی ڕاسپارد و فەرمانی پێدا هەموو ئەوانەی لەسەر ئیسلام ماون ئامادەیان بکات و بڕۆن بەگژ پاشگەزبووەکاندا و بڕوات بۆ خەشعەم و جەنگ بکات لەگەڵ پاشگەزبووەکانی ئەوانیشدا و جەریریش بەفەرمانەکانی صدیق (ﷺ) هەستا و بەڵام کەسێکی وا ڕووبەڕووی نەبوویەوە جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت کە سەرکەوت بە سەریاندا.[5]

(بنی حارس کوڕی کەعب) لە نەجران، کاتێك خۆی شوێنی (ڕەشەی عەنەسی) کەوتبوون و پاش مردنی پێغەمبەری خوا پاشگەز بوونەوە، (مەسروق العکی) بە سوپاکەیەوە بە

---

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[2] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٧٧).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[4] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[5] الثابتون على الاسلام في ايام الردة (لا: ٤٢).

نیازی شەڕکردن لە گەڵیاندا دەرچوو، هەر کە بانگی کردنەوە بۆ لای ئیسلام، هەموویان بەبێ شەڕ موسوڵمان بوونەوە و ئەویش ماوەیەك لە ناویاندا مایەوە تا مەسەلەکە بە جوانی هێور بوویەوە، کاتێك موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە گەیشتە نەجران بە جوانی موسوڵمان بوو بوونەوە.[1]

پاش ئەوەی سیاسەتی شکست پێهێنانی ناوەخۆی بەبێ پشت بەستن بە سوپای ڕەسمی دەوڵەت کارەکە سەرکەوتوو بوو، ئەوجا صدیق (رضي الله عنه) دەستی کرد بە ناردنی سوپا پاش گەڕانەوەی سوپاکەی ئوسامە (رضي الله عنه).

* سوپای عەکریمە:

پاش ئەوەی کە بەشداری کرد لە سەرکوت کردنی پاشگەز بوونەوەکەی خەڵکی عوماندا، عەکریمە لەسەر فەرمانی ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە (٧٠٠) موجاهیدەوە خۆی گەیاندە مەهەرە.[2]

ئەو کاتە بە سوپاکەی و بە بەشداری جەنگاوەرانی عومان، ڕۆیشتن بەرەو مەهەرە، مەهەرەش لەو کاتەدا دابەش بوو بوو بەسەر دوو سەر لەشکری دژبەیەکدا، یەکەمیان شەخریتی ناو بوو لە دەشتەکانی کەنار دەریا بوو ژمارەیەکی کەمی لەگەڵدا بوو، دووەم ناوی مصبح بوو هەموو شوێنە بەرزەکانی بە دەستەوە بوو، تاقمەکەشی زۆر گەورە بوو.

عەکریمە (رضي الله عنه) بانگی کردنەوە بۆ لای ئیسلام و شەخریت ڕازی بوو بەڵام مصبح زۆر لە خۆبایی بوو بە شوێن و سەربازی زۆریدا دەینازی بۆیە عەکریمە لەگەڵ شەخریتدا پێکەوە دایان بەسەریاندا و پاش ئەوەی تێك شکان و کۆمەڵێکی زۆر لە سەربازەکانیان کوژران، پاش ئەوە هەموویان تەوبەیان کرد و لەسەر موسوڵمانەتی بەردەوام بوون عەکریمەش ماوەیەك لە ناویان مایەوە ئیش و کارەکانی بۆ ڕادەپەڕاندن و لەسەر ئیسلام کۆی کردنەوە.[3]

---

[1] تأريخ الردة كلاعي (لا: ١٥٦).

[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو. (لا: ١٧٧).**

[3] تأريخ الردة، كلاعي (لا: ١٥٥).

پاشان له ئەبو بەکری صدیقەوە (رضي الله عنه) نامەیەکی پێ گەیشت کـە داوای لێ کردبـوو لەگەڵ موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییەدا کە لە صەنعاوە دێـت، یـەك بگـرن و پێکـەوە بـەرەو (کینده) بکەونەڕێ، لە مەهرەوە دەرچـوو تـا گەیـشتە (ئەبیـەن) و لـەوێ مایـەوە چـاوەڕوانی موهاجیری دەکرد و هەستا بـە کۆکردنـەوەی (نەخـەع، حـەمیر) و لەسـەر ئیـسلام ڕاوەسـتاوی دەکردن.[1]

گەیشتنی سوپای عەکریمە بەو ناوچەیە ڕۆڵێکی گرنگـی هـەبوو لەسـەر پاشماوەکـانی سوپاکەی (ڕەشەی عەنەسی) و لە سەروویانەوە (قەیسی کوڕی مەکشوح و عەمری کـوڕی معـد یکروب)، پاش ئەوەی قەیس لە صەنعاوە ڕای کرد و لە نێوان صەنعا و نەجراندا بە یاخی بوویی مایەوە، عەمریش پەیوەندی کردبوو بەو پاشماوانەوە کە پێیان دەوت (پاشمـاوەی لەحجیـەکان) و کاتێك عەکریمە (رضي الله عنه) گەیشتە ئەو ناوچەیە یەکسەر ئـەو دووانـە یـەکیان گـرت بـۆ بـەرەنگار بوونەوەی سوپای ئیسلام، بەڵام کەمی نەخایاند بەینیان تێك چوو، دەستیان کرد بە قسە وتن بە یەکتری و لە یەك جیابوونەوە.

کاتێك موهاجیر گەیـشتە ئـەوێ عـەمر خـۆی تەسـلیم کـرد و قـەیس بـە دوایـدا، موهاجیریش کۆتی کردن و بە ئەسیری ناردنی بـۆ مەدینـە بـۆ لای ئـەبو بـەکر، پـاش ئـەوەی سەرزەنشتی کردن و قسەی پێ وتن، ئەوانیش داوای لێبووردنیان کرد و ئەویش پاش ئەوەی چاك بوون و تەوبەی یەکجاریان کرد، بەخشینی و ناردنیەوە بۆ ناو ماڵ و حاڵی خۆیان.[2]

ئا بەم جۆرە هاتنی عەکریمـە (رضي الله عنه) لـە ڕۆژهەڵاتـەوە ڕۆڵێکـی گرنگـی هـەبوو لـە دەستگرتن بەسەر پاشماوەی هەڵگەڕاوەکاندا لە ناوچەی لوحەج بە جەنگ یان هـەر بـە بیـستنی هەواڵی هاتنی سـوپاکە، لـە کاتێکـدا کـە ئـەوان ڕووبـەڕووی سـوپایەکی تـر دەبوونـەوە. بـە فەرماندەیی موهاجیر.[3]

* سوپاکەی موهاجیر و لە ناوبردنی هەڵگەڕانەوەی (حضرموت) و ( کینده):

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٨١).
[2] طبقات لابن سعد (٥/٥٣٤ـ٥٣٥).
[3] اليمن في صدر الاسلام (٢٨٢).

کۆتا سوپا کە لیوای یازدەهەم دەکات سوپای موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە بوو لە شاری مەدینە دەرچوو، کە بریتی بوو لە پەلێك لە کۆچەریان و پشتیوانان بە لای شاری مەککەدا تێپەڕی و خالیدی کوڕی ئەسەد کە برای عتاب کوڕی ئەسەد ئەمیری مەککە بوو هاتە ڕیزی سوپاکەوە و دای بەلای تائفدا، عبدالرحمنی کوڕی ئەبی عاص و کۆمەڵەکەی هاتنە ناو سوپاکەیەوە و لە نەجرانیش گەیشت بە جابری کوڕی عبداللە و هێنایە ڕیزی خۆیەوە و پاشان عەکاشەی کوڕی ثور کە کۆمەڵێك لە خەڵکی توهامەی لەگەڵدا بوو هاتنە ڕیزیەوە پاشان کۆمەڵی فەروەی مەسیك المرادی لە (موزحەج) هاتنە ناوی و دای بەلای (بەنی حارس کوڕی کەعب)دا لە نەجران کە (مەشوق العکی) سەرۆکاری دەکردن هێنانیە ناو سوپاکەیەوە.[1]

لە نەجران سوپاکەی کرد بە دوو بەشەوە: بەشی یەکەم کاری لە ناوبردنی پاشماوەکانی (اسود العنسی) بوو کە لە نێوان صەنعا و نەجراندا بڵاوبووبوونەوە و موهاجیر خۆی سەرپەرشتی ئەم بەشەی دەکرد، بەشەکەی تریش (عبداللە)ی برای فەرماندەیی دەکرد و ئامانجیشی پاککردنەوەی ناوچەکانی توهامەی یەمەن بوو لە پاشماوەکانی هەڵگەڕاوەکان.[2]

کاتێك موهاجیر گەیشتە صەنعا و جێگیر بوو نامەی نارد بۆ ئەبو بەکر (رضي الله عنه) و ئاگاداری کرد لە هەموو کارەکانیان و پاشان وتی چاوەڕوانی فەرمانی جەنابتین، هەر لەم کاتەدا (معازی کوڕی جەبەل) و بەرپرسەکانی تری یەمەن کە لە کاتی سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانرا بوون جگە لە زیادی کوڕی لەبید نامەیان نارد بۆ خەلیفە داوایان لێ دەکرد ڕێگەیان پێ بدات بگەڕێنەوە بۆ مەدینە.

وەڵامی ئەبو بەکر گەیشت کە تیایدا سەربەستی کردن لە نێوان مانەوە یان هاتنەوە یان جێ گرتنەوەی ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە، هەموویان گەڕانەوە.[3]

بەڵام موهاجیر فەرمانی پێدرا خۆی بگەیەنێتە عەکرمە و پێکەوە لەشکر بەرن بۆ هاوکاری زیادی کوڕی لەبید وە لە شوێنی خۆیدا بیهێڵنەوە و ئەوانەی لەگەڵیدان کە لە نێوان

---

[1] تأريخ الردة، كلاعي (١٥٤-١٥٨
[2] طبقات فقهاء اليمن (لا: ٣٦).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

مەککە و یەمەندا جەنگاون، ڕێگەیان پێبدەن با بگەڕێنەوە بۆ ماڵی خۆیان مەگەر کەسانێك نەبێت کە خۆی پێی خۆش بێت جیهاد بکات.[1]

زیادی کوڕی لەبید ئەنصاری، پێغەمبەری خوا (ﷺ) کردبووی بە والی (حضرموت و كندة) و ئەبو بەکریش (ﷺ) لە جێگای خۆی هێشتیەوە پیاوێکی زۆرگیر بوو- و ئەم سووربوون و دانەبەزینە لە ڕای خۆی هۆیەکی گەورە بوو لە هۆکارەکانی یاخیبوونی (حارسەی کوڕی سوراقە) لێی، کورتەکەی ئەوەیە کە کولاعی دەڵێت: زیاد لە حوشترەکانی (بیت المال) حوشترێکی بە هەڵە دا بە لاوێکی کیندە کاتێك لاوەکە ویستی بیکوژێتەوە، زیاد نەیهێشت، گەنجەکە پەنای برد بۆ سەرۆك هۆزەکەیان (کندە) و ئەویش داوای لە زیاد کرد بۆی بگۆڕێتەوە، بەڵام ئەو هەر لەسەر ڕای خۆی سوور بوو، بۆیە (حارثة) زۆر توڕە بوون بە توندی حوشترەکەی بەرەلا کرد و ئیتر ئاژاوە کەوتە نێوان لایەنگرانی زیاد و لایەنگرانی (حارثة)وە، جەنگ هەڵگیرسا و (ابن سراقە) شکا و ڕای کرد و هەر چوار پادشاکەی کیندە کوژران و زیادیش کۆمەڵێکی لە لایەنگرانی (ابن سراقە) دەستگیر کرد و لە ڕێگە کە دەیبردن بۆ مەدینە دیلەکان پەنایان برد بۆ (اشعث کوری قیس) وە ڕەگەزپەرستی وای کرد کە ئەشعەس گرتیە خۆی و بە هەموویانەوە سوپایەکیان دروست کرد و هاتن گەمارۆیان خستە سەر موسوڵمانەکان.[2]

زیادیش جوابی نارد بۆ عەکریمە و موهاجیر و هاواری بۆ بردن کە لە (ئارب) یەکیان گرتبوو، موهاجیر بە پەلە سوپاکەی بەجێهێشت لای عکرمە و خێرا لە ناو سوپاکەیدا خێراترین سواری هەڵبژارد و خۆی گەیاندە یارمەتی زیاد، وە توانی ئەو گەمارۆیەی سەریان بشکێنێت و (کندە)یش ڕای کرد بۆ یەکێك لە قەڵاکانی کە پێی دەڵێن: (نەجیر) وە ئەم قەڵایە چوار دەرگای هەبوو، زیاد دەرگایەکیانی گرت و موهاجیریش دەرگایەکیانی داخست و سێیەمیش لە ژێر کۆنترۆڵی کندە مابوویەوە و هاتوچۆیان لێ دەکردن عکرمەیش هات و دەرگاکەی تری کۆنترۆڵ کرد و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دران پاشان خۆی دەستە دەستە خەڵکی دەنارد بۆ ناو هۆزەکانی کندە کە لە ناو دۆڵ و کەژەکاندا خۆیان حەشار دابوو، بانگیان دەکردنەوە بۆ لای

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (٢٨٣

[2] الكامل في التأريخ (٤٩/٢)، الثابتون على الاسلام (لا: ٦٦).

ئیسلام و هەر کەسێك قبوولّی نەکردایەتەوە دەیانکوشت و جگە لەوانەی ناو قەلاّ گەمارۆدراوەکە کەسی تر نەما نەکەوێت بە لایەکدا.[1]

سوپاکەی زیاد و موهاجیر لە پێنج هەزار کەس زیاتر بوو کە پێکهاتبوون لە کۆچەریەکان و پشتیوانان و هەندێ لە هۆزەکان تەنگیان هەلّچنی بە کەسانی ناو قەلاّکە تا وایان لێهات لە برساندا پەنایان برد بۆ فەرماندە خۆنەگرەکان و وتیان بە شمشێر بکوژرێین نەك لە برساندا، لە ناو خۆیاندا رێك کەوتن لەسەر ئەوەی کە (اشعس ی کوری قەیس) داوای ئەمان بکات و رازیە بە حوکمی موسولّمانەکان.[2]

کاتێك لە باتی هۆزەکەی کەوتە رێککەوتنەوە و سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، چونکە ریوایەتەکان وای دەگێرنەوە داوای ئەمانی بۆ هەموو ئەندامانی ناو قەلاّکە نەکرد، و داکۆکیشی لەسەر نەکردن، بەلّکو بۆ چەند کەسێکی زۆر کەمی کرد کە لە حەوت تا دە کەس بوون، مەرجەکەشی ئەوە بوو دەرگای بۆ (نوجەیر) بکاتەوە بۆیان بۆیە بەو بۆنەیەوە شەر دەستی پێکرد نزیکەی (٧٠٠) کەس لە خەلّکی کندە لە ناو قەلاّکەدا کوژران کە رێك وەك رووداوی (بني قريضة)ی لیّ هات.[3]

توانرا هەلّگەرانەوەی کندە سەرکوت بکرێت و عکرمەی کوری ئەبو جەهل گەرایەوە بۆ مەدینە و هەموو کەنیزەك (١/٥)ی دەستکەوتەکانی هێنایەوە ئەشعەسی کوری قەیسیشیان لەگەلّدا بوو، کە هۆزەکەی زۆر رقیان لیّ هەلّگرت بە تایبەت ئافرەتانیان چونکە دوژمنیان بوو سەرشۆری کردبوون، چونکە کاتێك رێککەوتنی ئاشتی لەگەلّ سوپای ئیسلامدا یەکەم کەس ناوی خۆی نووسی بۆیە ئافرەتانی هۆزەکەی پێیان دەوت (عرف النار) واتا بە زمانی ئەوان ناپاك.[4]

کاتێك ئەشعەس گەیشتە لای ئەبو بەکر پێی وت: تۆ وا دەزانی چیت لیّ دەکەم کە تۆ ئەمە و ئەوەت کرد؟! پیاوەتیم لەگەلّ بکە و لەم کۆت و زنجیرە رزگارم بکە و خوشکەکەشتم

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٨٤).
[2] تأريخ الطبري (١٥٢/٣).
[3] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٨٦).
[4] حركة الردة عتوم (لا: ١٠٧).

لێ مارە بکە، چونکە من گەڕاومەتەوە و موسوڵمان بووم، ئەبو بەکر (ﷺ) وتی: باشە وا دەکەم و (أم فروە)ی خوشکی لێ مارە کرد و لە مەدینە مایەوە تا عێراق ئازاد کرا، لە ڕیوایەتێکی تردا ترسا شتێکی بەسەر بهێنێت، وتی: ئایا گومانت وایە کە من چاك بووم، دەی لە دیلی ڕزگارم بکە و لە کەم و کورتیم ببوورە و موسوڵمان بوونەوەکەم لێ قبووڵ بکە، وا مامەڵەم لەگەڵدا بکە کە لەگەڵ هاوچەشنانم مامەڵە دەکەیت و خێزانەکەم پێ بدەرەوە چونکە زووتر سەردانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای (أم فروەی) خوشکی ئەبو بەکری کردبوو، ئەویش پێی دا بوو ئەویش دوای خستبوو بۆ جارێکی تر کە هاتەوە بیگوێزێتەوە.

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دونیا دەرچوو، ئەشعەسیش ئەوەی کردی کردی بۆیە دەترسا خوشکەکەی لێ بسەنێتەوە و نەیداتێ بە ئەبو بەکری وت:باشترین کەسی وڵاتەکەم دەبم بۆ خزمەتکردنی ئاینەکەی خوا! ئەویش نەیکوشت و لێی بوورا و قبووڵی موسوڵمانەتیەکەی کرد و خێزانەکەی پێدایەوە و پێی وت:

دەی بڕۆرەوە وزوو باچاکەت ببیستم و لە هۆزەکەشی خۆش بوو و بەرەڵای کردن و پاشان (١/٥)ەکەی دەستکەوتەکانی دابەش کرد بەسەر خەڵکەکەدا.[١]

کۆمەڵێك پەند و وانە و ئامۆژگاری

* یەکەم ئافرەت لە نێوان ڕوخاندن و بنیاتناندا:

لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا لە یەمەن دوو وێنەی جیاوازی ئافرەت دەردەکەوێت، وێنەی ئافرەتێکی پاك داوێن لە پشتی ئیسلام دەبێت و دژی داوێن پیسی دەوەستێتەوە، پشتی موسوڵمانەکان دەگرێت لە کپکردنەوەی کڵپەی شەیتانەکانی ئینسان و جنۆکە، ئەمە (ئازاد)ی فارسیە خێزانی شەهری کوڕی بازانە و کچی مامی فەیرۆز الفارسي و لەگەڵ ڕیزی موسوڵماناندا دەبێت بە هەموو ویست و نەستێکیەوە، لەگەڵ موسوڵماناندا نەخشەداڕێژی لە پێناو کوشتنی (ڕەشەی عەنەسی) درۆزنی یەمەن.

موسوڵمان لە هەموو سەردەمێکدا غیرەتی ئەو خوشکە مەزنانەی بەرز دەنرخێنێت لە پێناو ئاینەکەیدا، بە قێزەوەن سەیری ئەو نووسینە دەکات کە محمد حسين هيكل نووسیویەتی

---
[١] تأريخ الطبري (٤/١٥٥).

کاتێك باسی ئازادی فارسی دەکات و هەڵوێستی سەبارەت بە (ڕەشەی عەنەسی) درۆزنی یەمەن.

هەوڵی داوە کاری ئەو خوشکە بڕواداره (ئازاد) بگێڕێتەوه بۆ حەزێکی نەتەوەپەرستی، ئەمەش لە قسەکەیدا دەردەکەوێت کە دەربارەی عەنەسی دەیکات و دەڵێت: کاتێك دەسەڵاتی پەیدا کرد و دەوڵەتەکەی گەورە بوو، لە خۆ بایی بوو و نرخی بۆ قەیس و فەیرۆزی دانەنا و بە جۆرێك سەیری هەردووکیان و هەموو فارسەکانیشی دەکرد کە ترسی هەڵگەڕانەوه و باشقوول لێدانیان هەبوو.

ئازاد خانیش بەمەی زانی و خوێنی ڕەگەز پەرستی بە ڕەگەکانیا کەوتە جوولە، هەموو ڕقەکانی خۆی خستە بەرامبەر ئەم فاڵچیە پیسە، کە مێردە جوانە گەنجەکەی کە زۆری خۆش دەویست لە ناو برد،بەڵام بە لێهاتووی ئافرەتانەوه ئاوانە لیّ شاردبوویەوه بگرە زۆر لە ڕاددە بەدەر خۆشەویستی بۆ دەردەبڕی و خۆی دەبردە دڵیەوه بە جۆرێك کە (ڕەشە) تەواو پشتی پیّ بەستبوو و بە وەفای دەبینی.[1]

ئەمەش شێوازێکە لە نووسیندا ئاماژەیەکی تیایە بۆ خاتوو ئازادی فارسی وەك ئەوەی بڵێت لەبەر فرس نەژادیەکەی ناپاکی کرد لەگەڵ (ڕەشە)ی عەرەبی، وە ئەمەی بە تانە لەسەر دادەنێت کە ئەو خانمە بە ڕواڵەت جۆرێك بوو لەگەڵ (ڕەشەدا) و لە ژێرەوه جۆرێکی تر، ئەمەش لادانی ڕووداوه لە ڕێڕەوی ڕاستی خۆی و بردنی بە لایەکی تردا.[2]

ئەم ئافرەتە موسوڵمانە چاکە هەستا بە کوشتنی ئەو مێردەی کە مێردە موسوڵمانەکەی کوشتووه و بە زۆر مارەی کردووه و خۆی وەسفی (ڕەشەی درۆزنمان) بۆ دەکات و دەڵێت: (سوێند بە خوا خوا کەسی دروست نەکردووه ئەوەندەی ڕەشە کە من ڕقم لیّی بێت، هەرگیز فەرمانی خوای بەجیّ نەهێناوه و لە حەرامی خوایش خۆی لا نەداوه).[3]

---

[1] الصديق ابو بكر (لا: ٧٩).
[2] الكامل في التأريخ (٢/٣١٠).
[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**

هەر ئەو ئافرەتە بوو خوای گەورە کردی بە هۆی لـە ناوچـوونی (ڕەشـەی عەنەسـی) سەرگەش، ئەگەر – دوای خوا – هەوڵی دڵسۆزانەی ئەو نەبووایە هەرگیز فـەیرۆز و هاوکـارانی نەیان دەتوانی ڕەشە بکوژن لە ناو ئەو هەموو پاسەوانانەدا.[1]

دەی ئەوەی پاڵی پێوە نا بۆ ئەم کارە گەورەیە کە لە ناوچوون و مردنـی ڕەشـە بـوو، خۆشەویستی ئاین و بیروباوەڕ و ئیسلامەکەی و ڕقی زۆری لـە (ڕەشـەی عەنەسـی) بـوو، ئـەو کەسەی کە ویستی ئیسلام بە یەکجاری لە یەمەندا نەیەڵێت، ئەمـەش وێنەیـەکی پڕشـنگداری جیهاد و خەباتی ئافرەتی موسوڵمانی یەمەنە لە بەرزی ئیسلامی بێگەرد دا.

بەڵام وێنەی تەڵخ و تاریکی ئەو کچە یەمەنیانەی کە جوولەکـە بـوون یـان کەسـانی چڵکاو خۆری جوولەکە لە حەزرەمەوت، کە لـە خۆشەویـستی مردنـی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) خەریك بوو بفڕن و شەوە ئاهەنگیە سورەکانیان بۆ ڕەوشت نزم و گوناهباران دەڕازاندەوە و هـانی خەڵکیان دەدا بۆ داوێن پیسی و گاڵتەیان بە داوێن پاکی دەکرد، کە بێگومـان شەیتانی نـەفرەت لێکراویش لە خۆشیاندا لەگەڵیان سەمای دەکرد بۆ وازهێنـانی خـەڵکی یەمـەن لـە ئیـسلام و هەڵگەڕانەوە لێی و جەنگ دژی.[2]

ئەو ئافرەتە پیسانە گۆرانیان بەسەردەمی نەفامیدا دەوت و خراپە و بۆگەنیەکانیان لە لای خەڵکی جوان دەکردەوە و خەڵکانیان بۆ بانگەشە دەکردەوە وەك چۆن مێش لە دەوری زبڵـی بۆگەناوی کۆدەبنەوە، لە سەردەمی نەفامیدا داوێن پیسی و بەدڕەوشتی ئاسـایی بـوو لـەلایان، هەر کە ئیسلام هات خاوێنی کردن و نەیهێشت نزیکی ببنەوە، وا هەستیان دەکرد لە زیندانێکی تەنگ و ترش دان و خەریکە دەخنکێن.

بۆیە هەر کە هەواڵی مردنیان بیست (ﷺ) خێرا شـاکامیان دەربـڕی و دەسـتەکانیان گرتە خەنە و دەفیان لێ دەدا و گۆرانی خۆشیان دەوت، ئەوەی لە دەستیان چووبوو لـەم کابینـە نوێیەی (ڕەشەی عەنەسی) دا دەستیان دەکەوێتەوە و زۆربەی ئەو ئافرەتانە ئافرەتـانی نـاودار و جوولەکە بوون.

---

[1] حركة الردة (لا: ٣٠٨).
[2] حركة الردة للعتوم (لا: ١١٩).

هەرد وو لا چ ناودارەکان و چ جوولەکەکان بەرژەوەندیان لەوەدا بوو کە خەڵکی واز لە ئیسلام بهێنن و دەسەڵاتیشی نەمێنێت، ئەم بزووتنەوەیە لە مێژوودا بە بزووتنەوەی (بەدڕەوشتان) ناوبانگی دەرکردووە، کە نزیکەی (٢٥) ئافرەتی بەدڕەوشت و سست و لەش فرۆش بوون کە لە ناوچەکانی حەزرەمەوتدا بڵاو بووبوونەوە بە ناوبانگترینیان (هەڕی کچی یامن)ی جوولەکە بوو کە لە کاری زینادا بە نموونە و پەند ئەهێنرایەوە و ئەوترا (هەڕ زیناکەرە)!!

مێژوو دەگێڕێتەوە کە گەنجە پیس و بێ ڕەوشتەکان لە سەردەمی نەفامیدا بۆ مەبەستی قێزەونیان سەردانیان دەکرد، بەڵام ئەو کەسە داوێن پیسانە لە ئیسلامدا بواریان نەدرا کە بە ئارەزووی خۆیان کۆمەڵگە بۆگەن بکەن.[1]

ئەو هەواڵە گەیشتە صدیق (﵁)، پیاوێك لە یەمەن ئەم چەند دێرە شعرەی بۆ نارد:

ابلغ ابا بكر إذا جئنته ... ان البقايا من أيّ حرامِ
اظهرك من موت النبي شماتة ... وخضبن أيديهن بالعلّام
فاقطع هديت اكفهنّ بصارم ... كالبرق امضى من حتون غمامِ[2]

واتا: هەواڵ بدە بە ئەبو بەکر ئەگەر گەیشتیتە لای، کە ئافرەتانی داوێن پیس داویانە لە هەموو شتێك، بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شاکامیان دەربڕی و خەنە گرتە دەستەکانیان، ئەو دەستانەیان بە شمشێری تیژ ببڕە ئەی خوا هیدایەتت بدات، هەروەك هەورە بروسکە لە ناو کرۆکی هەورەکاندا.

ئەبو بەکریش (﵁) نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکەی (موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە) کە نامەیەکی زۆر توند و تیژ بوو تیایدا نووسی: «لەگەڵ گەیشتنی نامەکەدا ئەسپ و جەنگاوەرانت بخە ڕێ و بڕۆ تا دەستی هەموویان نەبڕیت نەگەڕێیتەوە هەر کەسیش ڕێی لێ گرتی هۆکارەکەی بۆ باس بکە و تێیان بگەیەنە کە چ گوناه و خراپەیەکیان ئەنجام داوە و بیانوویان ببڕە، ئەگەر وازیان هێنا باشە وەگەر نادەستیش لەوان مەپارێزە چونکە خوا ناپاکانی خۆش ناوێت».

[1] حركة الردة، عتوم (لا: ١١٩).
[2] عيون الاخبار (١٣٣/٣).

هەر کە نامەکە گەیشتە دەستی موهاجیر بەو شێوەیەی ئەبو بەکر پێی وتبوو کە سوپای بۆ دەرکردبوو کۆمەڵێك لە پیاوانی کندە و حەزرەمەوت هاتنە ڕێگەی و ئەویش هۆکارەکەی بۆ باس کردن بەڵام ئەوان قەناعەتیان نەکرد و شەڕیان دەرکرد، بەڵام خەڵکە گشتیەکە ڕۆیشتنە دواوە و (موهاجیر) شەڕی لەگەڵدا کردن و شکاندنی و ئافرەتەکانی گرت و دەستی هەموویانی بڕی، زۆربەیان مردن و ئەوانەشیان مان ڕایانکرد بۆ کوفە.[1]

لە دادگای ئیسلامی پڕ لە دادپەروەریدا پاداشتی گونجاوی خۆیانیان وەرگرت و فەرمانڕەوای ئەو شوێنانەش گرتنیان و سزای ڕێگری بەسەردا جێبەجێ کردن — حد الحرابە-.[2]

هەواڵ گەیەنرا بە خەلیفە کە دوو ژن لە ناوچەی حەزرەمەوت بە گۆرانیەوە قسەیان بە پێغەمبەری خوا و موسوڵمانان وتووە، موهاجیریش کە والی و فەرمانڕەوای ئەو وڵاتە بوو سزای دا بەسەریاندا بە بڕینی دەستیان و شکاندنی چوار دانی پێشەوەیان، بەڵام ئەبو بەکر (ﷺ) بەو سزایە ڕازی نەبوو فەرمووی سزایەکی سووکی ئەو دوو تاوانبارەی داوە بەم بۆنەیەوە نامەیەکی بۆ نووسی:

دەربارەی ئەو دوو ئافرەتەی کە هۆڵاندوویانە و تیایدا جنێویان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوە، هەواڵم پێ گەیشتووە کە چ سزایەکت دەرکردووە بۆ ئەو ژنەی کە گۆرانی وتووە و تیایدا قسەی سووکی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتووە و ئەگەر پێش من سزات نەدانایە من فەرمانم پێ دەدایت کە بتکوشتنایە چونکە سزای دەم کوتان بۆ پێغەمبەران وەك سزای ئاسایی خەڵکی نیە، هەر کەسێك شتی وای لێ وەشایەوە یان پاشگەز بوویەوە ئەگەر موسوڵمان بوویێت، ئەگەر هاوپەیمان بێت ئەوە دەبێت بە شەڕکەر و ناپاك.[3]

دەربارەی ئەوی تریش نووسی: دەربارەی ئەو ئافرەتە هەواڵم پێ گەیشت کە بە گۆرانیەوە سوکایەتی بە موسوڵمانان کردووە، تۆ دانەکانی پێشەوەیت شکاندووە، ئەگەر ئەو کەسە خۆی بە موسوڵمان بزانێت، ئەوە سزای بدە و عاقڵی بکە بەڵام جەستەی کەس

---

[1] حروب الردة، للعتوم (لا: ١٨٤).
[2] **هەمان سەرچاوەی پێشوو.**
[3] تأريخ الطبري (١٥٧/٤).

نەشێوێنیت، ئەگەر (ذمیة) بوو ئەوا ئەگەر لێی خۆش بیت ئەو لە هاوبەش پەیدا کردن گەورە ترە، ئەگەر شتێکی واش هاتە بەر دەستت و گەڕایەوە ئەوە لێی قبووڵ بکە، دەخیلت بم لووت و گوێ نەکەیت و جەستەی کەس نەشێوێنیت ئەوە گوناهە و خەڵکیشت لێ دوور دەخاتەوە ئەگەر لە تۆڵە سەندنەوەدا — قصاص.[1]

**وتارێژە ئیمانیەکان:**

هەندێ لە یەمەنیەکان هەڵوێستی مەزنیان هەبوو لەوەی موسوڵمانان لەسەر بیروباوەڕیان جێگیر بکەن و خەڵکی بانگ بکەنەوە بۆ لای ئیسلام و ئاگاداریان بکەن لە ترسناکی پاشگەز بوونەوە، لەوانە: مەروانی کوڕی زی عومەیری همدانی کە یەکێك بوو لە شازادەکانی یەمەن و کاتی خۆی لەگەڵ یەمەنیەکان موسوڵمان بوو، کاتێکیش خەڵکی پاشگەز بوونەوە و هەرزە و گێلەکانیان هەندێ وشەی ناشایستەیان لەدەم دەردەچوو ئەو هەڵدەستایەوە و وتاری دەدا و دەیووت: ئەی کۆمەڵی هەمەدان، ئێوە نە شەڕتان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کردووە و نە ئەویش شەڕی لەگەڵ ئێوەدا کردووە، بەختێکی باشتان هەبووە و بێ وەیی پێ بەخشیوون، نەفرەت نەیگرتوونە کە ئابڕووی پێشووەکانتان بەرێت و بنەبڕیان بکات، کەسانێك پێش ئێوە موسوڵمان بوون و ئێوەش لە کەسانێکی ترن ئەگەر دەستی پێوە بگرن ئەوە دەگەنە کەسانی پێش خۆتان و ئەگەر بیفەوتێنن ئەوانەی دوای خۆتان پێشتان دەکەون.

ئەوانیش هاتن بە دەم داواکەیەوە و پاشان هەندێ دێرە هۆنراوەی لە شێوەنی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خوێندەوە:

ان حزني على الرسول طويل ذاك مني على الرسول قليل
بكت الارض والسماء عليه وبكاه خديمه جبريل

واتا: بەکۆچی پێغەمبەر خەفەتم زۆر دوور و درێژە و ئەوەش بۆ ئەو هەر زۆر کەمە

زەوی و ئاسمان بۆ ئەو گریا جوبرەئیلی خزمەتچیشی گریا

عبداللە کوڕی مالك ئەرحەبی (ﷺ) هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو خاوەنی کۆچ و چاکەیە لە ئاینەکەیدا، خەڵکی هەمادان لێی کۆبوونەوە ئەویش وتی: ئەی خەڵکی هەمادان،

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو (٤/١٥٧).

خۆ ئێوە محمدتان نەپەرستووە، ئێوە خوای محمدتان پەرستووە کـە خوایـەکی زینـدووە و نـەمرە، ئەوەندە هەیە ئێوە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بوون لە گوێڕایەڵی خوادا، وە بزانن ئەمە لە ئـاگر دەتانپارێزێت، خوایش هاوڕێکانی لەسەر گومڕایی کۆ ناکاتەوە پاشان ئەم دێرە شیعرەی وت:

لعمري لئن مات النبي محمد　　　لما مات يا ابن القيل رب محمدِ

دعاه ربه فاجابه　　　يا خير الورى و يا خير منجد

واتا: بە خوا ئەگەر پێغەمبەر محمد مردبێت، ئەوا خوای محمد نامرێت.

خوا بانگی کرد ئەو چوو بە دەمیەوە، ئەی چاکترینی توهامە و نەجد.

شەرحەبیلی کوڕی سمط و کوڕەکـەی لـە نـاو (بـەنی معاویـە)ی کندیـەکان کاتێـك بەگشتی ڕایان هاتە سەر ئـەوەی زەکـات نـەدەن ڕوویـان تێکـردن و وتیـان: «زۆر ناشـرینە بـۆ ئازادەکان گوێزانەوە، ڕێزداران پەیوەست دەبن بە شتی لاوازەوە و خۆیان بە دوور دەگـرن لـەوەی بڕۆن بەرەو شتێك لەو ڕوونتر بێت، ئەمەش لە ترسی عەیبە و حەیاچوون، ئەی چ جای گوێزانەوە لە شتێکی چاك و جوان ڕاستیەوە بۆ نارەوایی بۆگەن، خوایە تۆ ئاگـاداری ئێمـە نایەینـە سـەر قسەی هۆزەکەمان لەو مەسەلەیەدا و بۆیـە لەگـەڵ زەیـد و ئومرولقەیـسدا هۆزەکـەیان بـەجێ هێشت، ئەو دوانە پێیان وت ئەمشەو مەیەڵە خەڵکی هۆزەکەت بخەون چونکە لەم لاو لـەو لاوە خڵتە و خاشی هۆزەکان و هەندێ لار و لۆری حەزرەمەوت یەکیان گرتـووە و ئەگـەر وا نەکـەیت خەڵکانی هۆزەکەت دەڕۆنە ناویان و لە ئێمە جیادەبنەوە، ئەویش بە قسەی کردن و ئـەو شـەوە شەوخونی بە هۆزەکەی کرد تا بەیانی».

کۆبوونەوە و چوون بۆیان دەبینن بە دەوری ئاگرێکدا دانیـشتوون، و ئـەوانیش دایـان بەسەر بەنی عەمر و بەنی معاویەدا کە ژمارەیان و تفاقیشیان زۆر بـوو، لـە پێـنج لاوە بۆیـان چوون و هەر چوار پاشاکەی کیندە و خوشکەکەشـیان عەمـەردە – کوشـت و ژمارەیـەکی زۆری خەڵکیان کوشت و ئەوی تری تا پێیان کرا ڕایان کرد و زیادی کوڕی لەبید بە ماڵ و دەستکەوت و کەنیزەکێکی زۆر و سەرکەوتوانە گەڕایەوە.[1]

*** کەرامەتی دۆستانی خودا:**

---

[1] الكامل في التأريخ (٢/٤٨).

کاتێك (ڕەشەی عەنەسی) دەستی ڕۆیشت لەسەر یەمەندا و پاگەندەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، ناردی بەدوای (ابو مسلم خولانی) خوای لێ ڕازی بێت و کاتێك هاتە لای پێی وت: ئایا شایەتی دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟ وتی: نایبستم، پێی وت: ئەی شایەتی ئەدەیت محمد پێغەمبەری خوا بێت؟ وتی: بەڵێ، چەند جارێك ئەمەی لێ دووبارە کردەوە و ئەو هەر قسەکەی یەکەمجاری دەکردەوە، ئەویش فەرمانی دا ئاگرێکی گەورەیان بۆ کردەوە و خستیانە ناویەوە، بەڵام نەسوتا!!.

بۆیە جەماعەتەکەی پێیان وت: بەرەڵای بکە، ئەمە سەر لە شوێنکەوتوەکانی تۆ تێك ئەدات و (ڕەشەیش) بەرەڵای کرد و پێی وت ئەم ناوچەیە بەجێ بهێڵە و ئەویش ڕۆیشت بۆ مەدینە و لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی دوایی کردبوو، و ئەبو بەکر (رضي الله عنه) کرابوو بە جێنشینی، حوشترەکەی نەواند و چووە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی دابەست و عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) چاوی پێی کەوت، و چوو بۆلای، پێی وت: خەڵکی کوێیت؟ وتی: یەمەن، وتی: ئەو پیاوەی کە (ڕەشەی درۆزن)خستیە ناو ئاگرەوە چی بەسەر هات؟ وتی: ئەوە (عبدالله کوڕی سوب) بوو، عومەر وتی: بۆ خاتری خوا خۆ ئەو کەسە تۆیت وانیە؟ وتی: بەو خوایە ئەو کەسە منم، عومەر باوەشی پیاکرد و گوشاردی بە خۆیەوە و دەستی کرد بە گریان.

پاشان بردی و لە نێوان خۆی و ئەبو بەکردا داینیشاند وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی نەیمراندم تا لە ناو ئومەتی محمد (ﷺ)کەسێك هەڵکەوت وەك ئیبراهیم پێغەمبەری خوا.[1]

ئەمەش کەرامەتێك بوو لە کەرامەتی بەندەیەکی پیاو چاك، کە سنووری خوای پاراست و لەبەر خوا خەڵکی خۆش دەویست و لەبەر ئەویش ڕقی لە خەڵك دەبوو، لە هەموو کارێکیدا پشتی تەنها بەو دەبەست بۆیە خوای گەورە یارمەتی دا لە قسە و کرداریدا و ئاسایش و دڵ ئارامی پێ بەخشیوە، خوای گەورە ئەم ڕێز و کەرامەتەی لەسەر دەستی نواندووە و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي

[1] اسد الغابة (٣٠٤/٦)، الاستعاب (١٧٥٨/٤).

ﭐلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ (يونس: ٦٢-٦٤).

*** لێبووردەیە لە لای ئەبو بەکری الصدیق (رضي الله عنه):**

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) زۆر دووربین بوو، بیریکی تیژی هەبوو، تێڕوانینی هەبوو بۆ سەرەنجامی کارەکان، بۆیە توند و تیژی لە شوێنی خۆیدا بەکار هێناوە، لێبووردنیش لە کاتی پێویستدا، سوور بوو لەسەر ئەوەی هۆزە پەرش و بڵاوەکان لە ژێر ئاڵای ئیسلام کۆ بکاتەوە.

لە سیاسەتە ژیرانەکانی لەگەڵ سەرۆك هۆزە سەرکەشەکانی ناو پاشگەز بووەکاندا بە کاری هێنا کەی لێیان خۆش بوو، دوای ئەوەی گەڕانەوە سەر ڕاستی کاتێك هۆزە هەڵگەڕاوەکانی یەمەنی خستەوە ژێر ڕکێفی ئیسلام، هێز و دەسەڵاتی ئیسلامی پیشان دانەوە و هۆزەکان دانیان بە هەموو ئەو شتانەدا نایەوە کە لێی پاشگەز بوونەوە، سەریان شۆڕ کرد بۆ دەوڵەتی ئیسلام، گوێڕایەڵی خەلیفەی پێغەمبەری خوایان کردەوە.

لەم کاتەدا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وای بە باش زانیسیاسەتی دڵ ڕاگیرکردن بەکاربێنێت و بەکارهێنانی هێزی لەگەڵیاندا خستە ئەو لاوە، بەڵکو نەرم و نیانی سۆز و بەزەیی نواند بەرامبەریان، هەموو سزایەکی لەسەر هەڵگرتن، بە نرمی لەگەڵیان دوا، کەسایەتی و دەسەڵاتی کەی بە ئەو پیاوانەی بەکارهێنایەوە لە ناو هۆزەکانیاندا بۆ خزمەتکردنی ئیسلام و موسوڵمانان.[1]

لە هەڵەکانیان خۆش بوو، چاوپۆشی لێ کردن ، ئەمەی کرد لەگەڵ قەیسی کوڕی یەغوسی مرادی و عەمری کوڕی مەعدی یەکرب، کە ئەوانە لە سوارچاك و کەڵە پیاوانی ناو عەرەب بوون، ئازا و دلێری ناویان بوو،.

پێی ناخۆش بوو پیاوانی وای لە دەست دەربچێت و ویستی بیانکاتەوە خزمەتکاری ئیسلام و لە ڕاڕایی نێوان ئیسلام و پاشگەز بوونەوە نەجاتیان بدات، بۆیە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) بە عەمری وت: ئایا شورەیی نیە بۆت هەموو ڕۆژێك یان شکاویت یان یەخسیریت؟ ئەگەر پشتی

---

[1] تأريخ الدعوة ال الاسلام (لا: ٢٥١).

ئەم ئاینە بگریت خوای گەورە بەرزت دەکاتەوە، عەمریش وتی: ئەوەی ڕوویدا ڕۆیشت، لەمەو لا وا دەکەم و ناگەڕێمەوە سەر ڕێگەی هەڵگەڕاوە، ئەبو بەکریش بەرەڵای کرد، عەمریش تا مردن پاشگەز بوونەوەی بەسەردا نەهات بەڵکە موسوڵمان بوویەوە و بە موسوڵمان بوونەوەیەکی زۆر باش، خوایش سەری خست و ڕۆڵێکی گرنگی هەبوولەجەنگە ڕزگاریخوازەکاندا — الفتوحات — قەیسیش پەشیمان بوویەوە لەسەر ئەو کارەی کردبووی و ئەبو بەکریش (ﷺ) ئازادی کرد.

ئازادکردنی و لێبووردنی صدیق (ﷺ) لەم دوو پاڵەوانەی عەرەب لە یەمەن کاریگەریەکی قووڵ و گەورەی هەبوو، کە بە هۆیەوە ئەبو بەکر (ﷺ) دڵی کەسانێکی زۆری پاشگەز بووانی هۆزەکانیان بهێنێتەوە ئیتر لەبەر خوا بووبێت یان لە ترساندا، لە ئەشعەسیش خۆش بوو،[1] تا بەو جۆرە صدیق (ﷺ) توانی دڵیان کەمەند کێش بکات و لە داهاتوودا بوونە هۆی سەرکەوتنی ئیسلام و هێزی موسوڵمانان و لەم بوارەدا دەستێکی گەورەیان هەبوو.[2]

**ئامۆژگاری صدیق (ﷺ) بۆ عەکریمە و لێپرسینەوەی مەعاز:**

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) کاتێك عەکریمەی بە سوپاکەیەوە نارد بۆ سەر موسەیلەمە و دوابەدوایشی سوپای شەرحەبیلی کوڕی حەسەنەی نارد بۆ هەمان شوێن، عەکریمە پەلەی کرد، هۆزی بەنو حەنیفەیش بەرەنگاری بوونەوە و تێکیان شکاند، عەکریمە نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە هەواڵی شکستیەکەی خۆی پێیدا....

ئەبو بەکریش بۆی نووسی: ئەی کوڕی دایکی عەکریمە، نە ببینە و نە ئەمەوێت بتبینم و نەیەیتەوە بەو حاڵەوە موسوڵمانان بتۆقێنیت، خۆت بگەیەنە سوپای حوزەیفە و عەفرەجە و بەیەکەوە بجەنگن لەگەڵ خەڵکی عومان و مەهەرە، ئەگەر پێویستیان پێت نەما تۆ بکەوەرە ڕێ بە خۆت و سەربازەکانتەوە و داتان بە هەر ناوچەیەکدا داوای موسوڵمان بوونیان لێ بکەن تا دێیتە لای موهاجیری کوڕی ئەبی ئومەییە لە یەمەن و حەزرەمەوت.[3]

ئەوەی تێبینی دەکەین ئەوەیە کە کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) سوپای نارد بۆ جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا و بە تایبەت لەگەڵ موسەیلەمە دوو سوپای نارد یەکەمیان بە

---

[1] تأريخ اول الخلفاء، شرقاوي (لا: ١١٥-١١٦).
[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٥١).
[3] الكامل في التأريخ (٣٤/٢)، البداية والنهاية (٣٣٤/٦).

سەرکردایەتی عەکریمە (ﷺ) و دووەمیان بە سەرکردایەتی شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە (ﷺ) ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شارەزایی وردی صدیق (ﷺ) دربارەی هێرشی دوژمنان و ڕادەی بەرەنگاری خۆ گرتنیان، کاتێك عەکریمە پەلەی کرد لە شەڕکردن لەگەڵ موسویلەمەدا و بەو جۆرە تێکشکا و ئەبو بەکر (ﷺ) نامەی بۆ نارد و تیایدا پێی وت: نەتبینم و نەمبینی بەو حاڵەتەوە نەگەڕێیتەوە تا ترس نەکەوێتە دڵی خەڵکی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شارەزایی و لێهاتوویی صدیق (ﷺ) لە بارەی جەنگدا، چونکە پاراستنی ورەی سوپا کاریگەری گەورەی هەیە لەسەرەنجامی جەنگ، ئەگەر ئەو سەربازە تێك شکاوانە بگەنە سوپاکانی تر کە بۆ جەنگ بەڕێ کەوتبوون، بەتایبەتی ئەگەر هەواڵی شکانەکەیان و بە هێزی و جەربەزەیی سوپای دوژمنانیان پێ بدەن،[1] و بەم جۆرە دووربینی صدیق لە بواری جەنگدا بە ڕوونی دیارە و عەکریمە و سوپاکەی بە پەلە نارد بۆ جێیەکی تر و لەوێ سەرکەوتنی چاکیان بەدەست هێنا و ورەی خۆ و سوپاکەشی بەرز بوویەوە.

کاتێك مەعاز لە یەمەن گەڕایەوە بۆ مەدینە و صدیق (ﷺ) چووە پێشوازی و عادەتیشی وا بوو چاودێری لێپرسینەوەی فەرمانڕەواکانی خۆی دەکرد پاش تەواوبوونی کارەکانیان و گەڕانەوەیان، بە مەعازی وت: ئامادەی لێپرسینەوەت لەگەڵدا بکەین؟ مەعازیش وتی: دوو لێپرسینەوە هەیە، لێپرسینەوەی خوا و لێپرسینەوەی ئێوە؟ دەی سا سوێند بە خوا ئیتر هیچ پۆستێکتان بۆ بەڕێوە نابەم.[2]

## یەکگرتنەووەی یەمەن و ڕوون بوونەوەی ئیسلام لە لای دانیشتوانی و گوێڕایەڵیان بۆ خەلیفە:

پاش تەواو بوونی جەنگی هەڵگەڕاوەکان و یەمەن هەمووی یەکی گرتەوە لە ژێر یەك سەرکردایەتی مەرکەزی مەدینەی پایتەختدا، یەمەنیان دابەشکرد بۆ چەند بەشێکی ئیداری نەك دابەشکردنی خێڵایەتی و کرا بە سێ بەشی ئیداریەوە: صەنعا، جوند، حەزرەمەوت.

---

[1] التأريخ الاسلامي للحميدي (٨٣/٩).
[2] عيون الاخبار (١٢٥/١).

ئیتر وەك جاران خێڵایەتی دەمارگیری پێوە دیار نەبوو لەدیاریکردنی سەرکردە و فەرمانڕەواکاندا، تەنها خێڵایەتی و هۆزەکان وەك بنکەیەکی سەربازی وا بوون نەك بنکەی سیاسی، ئیتر پێوەری قبووڵ کراو پێوەری ئیمانی بوو: کە لە خواترسان، دڵسۆزی، کردەوەی چاك بوو.[1]

یەمەن یەکجاری لە دیمەن و دیاردەی پاشماوەکانی هاوەڵ پەیداکردن (الشرك) پاك بوویەوە، هاوەڵ پەیداکردن لە وتەدا، لە کرداردا و لە بیرەباوەڕدا، و هەستیان بەوە کرد کە پلە و پایەی پێغەمبەرایەتی زۆر لەوە گەورەترەکە هەر کەسێك لە خۆیەوە و بۆ مەبەستی خۆی، خۆی بە پێغەمبەر بزانێت.[2]

لەوەش دڵنیابوون کە بیر و باوەڕ لەگەڵ تەماح کاریدا یەك ناگرێتەوە، ئیسلام و سەردەمی نەفامی یەك ناگرنەوە، ئەوەیان بۆ دەرکەوت لە ڕێگەی خوێن ڕشتن و ئێش و ئازار و پەشیمانیەوە، لە هەردوو لا خەڵکێکی زۆر کوژرا و لەوانەوە پەندی باش وەرگیرا.[3]

ئەوانەی لەوە و پێش پاشگەز بووبوونەوە گەڕانەوە بۆ لای ئیسلام و هیوایان وا بوو خوا لێیان خۆش بێت و لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا ڕێگەیان پێدرا لە ڕیزەکانی سوپای ئیسلامدا جیهاد بکەن و کۆمەڵێك سەرکردەی یەمەنی دەرکەوتن لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلامدا کە لە ڕووداوەکانی پاشگەز بوونەوەدا گۆش بوون و پێی گەیشتن و لەسەر ئیسلام جێگیر بوون وەك جەریری کوڕی عبداللە ی زی کلاعی حمیری و مەسعودی کوڕی عەکی و کەسانی تریش.

ئەم سەرکردانە ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لە جەگنە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلامدا و هەروەها لە ئاوەدان کردنەوەی شارە نوێیەکان وەك بەصرە و کوفە لە عێراق و فەستات لە میصر، هەروەها کەسایەتی یەمەنی ناودار هەڵکەوتن کە لە یەمەن و دەرەوەی یەمەنیش دەکران بە

---

[1] الیمن فس صدر الاسلام (لا: ٢٩٠).
[2] الخلافة الراشدة والخلفاء الراشدون، یوسف علي (لا: ٣٩).
[3] ظاهرة الردة، محمد بریغس (١٥٩).

والی و قازی وەك حەشكی كوڕی عبدالملك و سەعیدی كوڕی عبدالله الاعرج و شەرحەبیلی كوڕی سەمت ی كیندی و كەسانی تریش.[1]

یەمەن بە تەواوی لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا جۆش درایەوە ئیتر لەگەڵ فەرمانڕەواكانی ناو خۆیانیان ڕاستەوخۆ لەگەڵ پایتەختدا لە مەدینە، بۆیە هەر كە خەلیفە بانگی كردن بۆ بەشداری جیهاد بە خێرایی لە هەموو دڵێكیانەوە هاتن بە دەم داواكەیەوە (هەروەك لە لاپەڕەكانی داهاتوودا پشت بە خوا بە درێژی باسیان لێوە دەكەین) لە ناو ڕووداوە دڵتەزێنەكانی پاشگەز بوونەوەدا گەورە بوو بوون و هەر ئەو وای لێ كردبوون زۆر پەیوەست بوون بە سەركردایەتیەوە، لەبەر ئەوە ئاسایش تەواو بەرقەرار بوو لە ناویاندا و بوون بە باشترین پشت و پەنا بۆ ئیسلام و موسوڵمانان.

٢- قەڵاچۆكردنی ئاشووبی (طليحة الاسدي):

(تولەیحە) سێیەمین پێغەمبەری درۆ بوو كە لە سەردەمی ئیسلامدا و لە دوا ساتەكانی ژیانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) سەری هەڵدا و ناوی تولەیحەی كوڕی خویلدی كوڕی نەوفەلی كوڕی نەزلەی ئەسەدی یە لە ساڵی نۆیەمی كۆچی كە بە وەفدەكان نازناوی دەركردووە لەگەڵ شاندەكەی هۆزەكەیدا هاتن بۆ مەدینە و لەبەردەمی پێغەمبەری خوا موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، بەڵام منەتیان بەسەر پێغەمبەردا كرد وتیان: كەست نەناردووە بە دواماندا و ئێمە خۆمان هاتووین و موسوڵمان بوونی خۆمان ڕادەگەیەنین!

خوای گەورە لە وەڵامیاندا ئایەتی دابەزاند و وتیایدا فەرمووی: ﴿يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُواۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسْلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝١٧﴾ (الحجرات: ١٧)، واتا: ئەیانەوێت منتبارت بكەن بەوەی موسوڵمان بوون؟! پێیان بڵێ ئەی محمدكە منەتی موسوڵمان بوونی خۆتان مەكەن بەسەرمدا بەڵكو خوای گەورە منەت دەكات بەسەرتاندا كە ڕێگەی ئیمانی پێ پیشان داون ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن.

---

[1] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٢٩١).

بەڵام هەر شاندەكەی بەنی ئەسەد گەڕانەوە (تولەیحەی ئەسەدی) پاشكەز بوویەوە و پاگەندەی پێغەمبەرایەتیشی دەكرد،[1] و لە سەمرا كە ناوچەیەك بوو لەو وڵاتە سەربازگەی دروست كرد و خەڵكێكی سادە شوێنی كەوتن و یەكەم شت كە خەڵكی گومڕاكرد شوێنی كەون ئەوە بوو جارێكیان لە سەفەرێكدا دەبن و ئاویان لێ دەبڕێت و خەڵكەكەی چوار دەوری زۆر تێنویان دەبێـت، ئەویش پێیان دەڵێت سواری ئەعلال[2] بن، چەندان میل ببڕن بە ئاوی زوڵاڵ دەگەن،[3] كە بەو شێوەیەیان كرد ئاویان دەست كەوت و ئەوەش وای لە عەرەبە دەشتەكیەكان كرد كە دووچاری ئەو ئاشوویە بن.

یەكێك لە خەڵەفاویەكانی ئەوە بوو سوژدەی لابرد لە ناو نوێژدا و وای بە خەڵكی دەگەیاند كە وەحی لە ئاسمانەوە بۆ دێت، یەكێك لەو قسانەی ڕێكی خستبوو كە گوایە لە ئاسمانەوە بۆی دابەزیووە: (الحمام واليمام، والصرد والصوام، قد صمن قلبكم باعوام، ليبلغن ملكنا العراق والشام).[4]

لە خۆی بایی بوو، دەسەڵاتی گەورە بوو، زۆری پەیدا كرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چراری كوڕی الازور الاسدی (رضي الله عنه) بە سوپایەكەوە نارد بۆ سەركوت كردنی بەڵام (چرار) لە ئاستی ئەوەدا نەبوو سەركەوێت بەسەریدا، بۆیە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژاندا دەسەڵاتی زیاتر دەبوو بەتایبەت پاش ئەوەی هەردوو هۆزی هاوپەیمان — ئەسەد و غتفان — باوەڕیان پێ هێنا تەواو بەهێزتر بوو.[5]

(دائره المعارف الاسلاميه) دەڵێت: دەگێڕتەوە كە شیعری ڕێكخستووە و لە ناو جەرگەی شەڕ و كوشتاردا وتاری بۆ هاتووە، وا دیار بوو، كە بەڕاستی سەركردەیەكی خێڵەكی

[1] أسد الغابة (٣/٩٥).
[2] إعلال: **ناوی ئەسپەكەیەتی.**
[3] اركبوا اعلالا واضربوا أميالا تجدوا بلالاز
[4] البداية والنهاية (٦/٢٢٦).
[5] أسد الغابة (٣/٩٥).

سەردەمی نەفامی سەرکەوتوو بوو، ئەم ڕەوشتە تایبەتمەندیانەی تیا کۆ بووبوویەوە: (فاڵچی، شاعیر، وتاربێژ، جەنگاوەر).[1]

لەم دەقەوە بۆنی پیاهەڵدان و وەسفی شاراوەی (تایحە) دێت لە لایەن گەورەترین کەشکۆڵەوە، لە ڕوانگەی ئەوە سەرکردەیەکی خێڵەکی نموونەییە کە بە ئاسایی شیعری بۆ هاتووە وتاربێژیش بووە، ئەو دوو شتەش گرنگترین شت بووە کە عەرەب لەو کاتەدا هەوڵیان بۆ داوە، ئەمەش شتێکی سەیر نیە بۆ ئەم کەشکۆڵە گەورەیە کە ژێر بە ژێر (بلۆك دان لە ئیسلام) ڕەوشتی بووە، ئیتر زانینی (تولەیحە) موسوڵمان بووەتەوە یان نەیزانیبێت.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە دونیا دەرچوو بەڵام تولەیحە نەکەوت بە لایەکدا،[2] و ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) کاروباری خەلافەتی گرتە دەست و دەستی کرد بە سازکردن و ناردنی لیوا سەربازیەکان بۆ جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان یەکێك لەوانەش تولەیحە بوو، صدیق (رضي الله عنه)بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) سوپایەکی بۆ خستە ڕێ، ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی دەکات کە کاتێك ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) خالیدی ڕاسپارد کە سوپا بخاتە ڕێ دژی پاشگەز بووان وتی: لە پێغەمبەری خوام بیستووە کە فەرموویەتی: «نعم عبدالله واخوالعشيرة خالد بن الوليد، سيف من سيوف الله سله الله على الكفار والمنافقين».[3]

واتا: چەند باشە بەندەی خوا و برای باڵڕاستی هۆز — خالیدی کوڕی وەلید — ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا کە لە دژی بێ باوەڕ و دوو ڕووەکان هەڵیکێشاوە.

خالید گەیشتە (ذي القصة) و لەوێ صدیق ماڵئاوایی لێ کرد و پەیمانی پێدا کە خۆت و فەرماندەکانت لە خەیبەر دەبینمەوە، ئەمەی بۆیە دەرخست تا عەرەبە دەشتەکیەکان بترسێنێت، فەرمانی پێدا یەکەم جار لە (تولەیحەی ئەسەدی)ەوە دەست پێبکات و پاشان بڕوات بۆ بەنی تەمیم.

---

[1] دائرة المعارف الاسلامية مادة (طليحة).
[2] حركة الردة، عتوم (لا: ٧٨).
[3] مستدرك امام احمد (١٧٣/١)، **شێخ احمد شاكر دەڵێ (إسناده صحيح).**

(تولەیحە) لە ناو هۆزەکەی خۆیدا (اسد) و (غتفان)دا بوو، هۆزی عەبس و زوبیانیش هاتنە ڕیزیانەوە، ناردیشی بە دوای بەنی جەدیلە و هاناشی بۆ هۆزی (تەی) و ئەوانیش هەرچی سواریان لەبەر دەستدا بوو بە خێرایی بۆیان نارد.

ئەبو بەکریش (ﷺ) پێش خالید عەدی کوڕی حاتەمی تەی ناردبۆ ناو هۆزەکەی و پێی وت: فریای هۆزەکەت بکەوە تا شوێن (تولەیحە) نەکەون و خۆیان لە ناو نەبەن، عەدی خۆی گەیاندە ناو هۆزەکەی و داوای لێ کردن پەیمان بە ئەبو بەکری صدیق ببەستن[1] و بگەڕێنەوە بە لای خوا، ئەوانیش بێ شەرمانە وتیان: ئێمە هەرگیز بەیعەت و بەڵێن بە بەچکەی حوشتر نادەین، مەبەستیان ئەبو بەکر بوو (ﷺ)، ئەمیش لە وەڵامدا پێی وتن: سوێند بە خوا بە سوپایەکی واوە دەدات بە سەرتاندا واتان لێ دەکات کە بزانن کە ئەو گەورەترین کەڵە پیاوە.

بەڵام عەدی کۆڵی نەدا و هەر هەوڵی لەگەڵدان و شێر و ڕێوی زۆری بۆ باسکردن تا نەرم بوون، خالیدیش بە خۆی و سەربازەکانیەوە گەیشتنە ئەوێ لە پێشەوەی پشتیوانان ئەم پیاوانەی لەگەڵدا بوو: (سابت بن قیس بن شماس) و هەردوو سوار چاك (سابت کوڕی اقزم) و (عەکاشەی کوڕی محصن)ی خستە پێشەوە.

تولەیحە خۆی و براکەی سەلمەی ناو بوو هاتنە دەرەوە لە ڕیزەکان بۆیان دەست نیشان کرد بە شەڕە شمشێر و عەکاشە حیبالی کوڕی تولەیحەی کوشت و تولەیحەیش پەلاماری عەکاشەی داو شەهیدی کرد، سابتیش لەسەر دەستی سەلەمەی برای تولەیحە شەهید بوو.

خالیدی کوڕی وەلید و سەربازەکانی هاتنە سەر تەرمەکانیان دەبینن شەهید کراون و موسوڵمانان بەو کارە زۆر دڵ گران بوون، خالیدی کوڕی وەلید لای کردەوە بە لای هۆزی (تەی)دا بەڵام عەدی کوڕی حاتەم هاتە ڕێگەی و وتی: تەنها سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە چونکە بەڵێنیان پێ داوم وەختێك سەربازەکانیان لای تولەیحە گەڕانەوە دێنە ڕیزی سوپای ئیسلام چونکە ئەترسن ئەگەر تولەیحە بزانێت ئەمان موسوڵمان بوونەتەوە سوارچاکەکانی (تەی) کە لەبەر دەستیدان دەکوژێت، ئەوە بوو پاش سێ ڕۆژ بە (٥٠٠) جەنگاوەرەوە هاتنەوە و پەیوەندیان کرد بە سوپاکەی خالیدەوە.

---

[1] الترهيب والتهذيب البداية والنهاية، خلافة ابي بكرن د. محمد صامل السلمي (لا: ١٠١).

پاشان ویستی سەرکوتی بەنی جەدیلە بکات دیسان عەدی پێی وت: ئەی خالید چەند ڕۆژێك مۆڵەتم بدە با بچمە ناویانەوە بەڵکو خوا ئەوانیش بپارێزێت وەك (تەی) پاراست، عەدی هاتە ناویانەوە و بەردەوام قسەی بۆ کردن تا شوێنی کەوتن و هەواڵی موسوڵمان بوونەوەی بۆ هێنایەوە و هەزار چەکداریان هاتە ناو سوپای ئیسلامەوە بەو شێوەیە (عەدی کوڕی حاتەم) باشترین ڕۆڵە و پیرۆزترین کەس دەرچوو بۆ هۆزەکەی (رضي الله عنه).[1]

أ- جەنگی بوزاخە و سەرکەوتن بەسەر (بەنی ئەسەد)دا:

خالیدی کوڕی وەلید کەوتە ڕێ تا گەیشتە ناوچەی (ئەجەد و سلمی) لەوێ لە شوێنێکدا کە بوزاخەیان پێ دەوت لەگەڵ سوپای (تولەیحە)دا بە یەك گەیشتن، کۆمەڵێکی زۆر لە عەرەبە دەشتەکیەکان بە دەوریاندا وەستابوون تا بزانن سەرکەوتن بۆ کێیە، و (تولەیحە) یش بە خۆی و چەکدارەکانی و ئەوانەشی لەم لا و لەو لاوە هاتبوونە ناویانەوە ئامادە بوو، (عیینەی کوڕی حیصن)یش بە خۆی و حەوت سەد جەنگاوەری هۆزەکەیەوە — بنی فزارە — وە لە پشتی تولەیحە وە ئامادە بوو و خەڵکەکە ڕیز بوو، (تولەیحە) یش عەباکەی دابوو بەسەر خۆیدا و دانیشتبوو گوایە وەحی بۆ دێت!! چاوەڕوانی وەحی دەکرا! عیینە دەستی کرد بە جەنگ لەگەڵ سوپای موسڵمانان تا بێتاقەت بوو و هاتەوە بۆ لای تولەیحە و ئەو هەر خۆی داپۆشیبوو لێی پرسی: جوبرەئیل نەهات بۆ لات؟ ئەویش دەیوت نەخێر، ئەو دەستی دەکردەوە بە شەڕ و دووبارە دەهاتەوە و دەیپرسی و بۆ جاری سێیەم پێی وت: جوبرەئیل دانەبەزی بۆ لات؟ وتی: بەڵێ، وتی: ئەی چی پێ وتی؟ وا

ووتی: پێی وتم: «ان لك رحى كرحاه، وحديثا لا تنساه» و عەیینەیش تورە بوو وتی: وایە خوای گەورە دەزانێت تۆ قسەیەکت هەیە بیرت ناچێتەوە! پاشان ڕووی کردە بەنی فەزارە و پێیانی وت: بڕۆنەوە و هەموویان ڕایان کردەوە و خەڵکەکەش پشتی تولەیحەیان بەردا، هەر کە موسوڵمانەکان گەیشتن خێرا سواری ئەسپەکەی بوو ژنەکەشی کە ناوی (نەوار) بوو بە

[1] البداية والنهاية (٦/٣٢٢).

سواری حوشترێکەوە بەرەو شام هەڵاتن و تاقمەکەشی بڵاوەیان کرد و خوای گەورە کۆمەڵێکی لە تاقمەکەی بە کوشت گەیاند.[1]

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) کاتێك هەواڵی سەرکەوتنی خالید و سوپای ئیسلام و شکانی تاقمەکەی (تولەیحە) و دار و دەستەکەی پێ گەیشت نامەیەکی بۆ خالید نووسی و پێی وت: ئەم بەخششە چاکانەی خوا زیاتر بێت بەسەرتەوە، و لە خوا بترسە و لە ئیش و کارەکانتدا چونکە خوای گەورە لەگەڵ چاکەکاران و لە خوا ترساندایە، کارەکانت بە هەند بگرە و نەرمی و خاوی نەنوێنیت، گەیشتیە هەر بێ باوەڕێك کە دەستی چووبووە خوێنی هەر موسوڵمانێك بەو جۆرەی پێ بکەرەوە و لەوانەی گرتووتن هەر کامیان دەزانیت وا باشترە بیکوژیت بیکوژە.

خالیدیش (رضي الله عنه) بۆ ماوەی مانگێك لە بوزاخە مایەوە و هەر بەم لاوبەو لادا بە سوپاکەیەوە دەگەڕا تا ئەو کەسانە بگرێت کە صدیق لە نامەکەیدا داوای لێ کردبوو،وە بۆ ماوەی یەك مانگ بەردەوام دەگەڕا بەدوای ئەوانەی کە ئەو موسڵمانانەیان شەهید کردبوو کاتی خۆی لە کە ناویاندا بە موسڵمانەتی مابوونەوە، هەندێکیان بە ئاگر سوتاند و هەندێ تریش بە بەرد پانکردنەوە و هەندێکیشیانی بە کێوی بەرزەوە فڕێ دەدایە خوارەوە، ئەمانەشی بۆیە کرد ئەو عەرەبانەی لە دوورەوە پاشگەز بوونەتەوە پەند وەربگرن و واز بهێنن.[2]

ب- شاندی (بەنی ئەسەد و غطفان) بۆ لای ئەبو بەکر (رضي الله عنه) و فەرمانی صدیق دەربارەیان:

شاندی بوزاخە کە لە نوێنەرانی (ئەسەد و غطفان) پێك هاتبوون، هاتن بۆ لای خەلیفە و داوای ئاشتیان لەگەڵ کرد، ئەبو بەکریش لە نێوان دوو بڕیاردا سەرپشکی کردن وتی: یان شەڕی ماڵ وێرانکەر یان پلانی سەر شۆڕ کەر، وتیان ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شەڕی ماڵ وێرانکەرمان زانی ئەی پلانی سەر شۆڕکەر چیە؟ وتی: لە چەکەکانتان و وڵاخەکانتان داتان بڕنین و سەر کز بکەن و دوای حوشترەکانتان بکەون، تا بەو شێوەیەی خوای گەورە شتێکتان پیشانی خەلیفە و موسوڵمانان بدات تا بە هۆیەوە لێتان ببوورن، ئەوەی لێتان داگیر

[1] البداية والنهاية (٦/٣٢٢).
[2] **هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.**

کردووین بماندەنەوە و ئەوەشی لێمان گرتوون ناتان دەینەوە، شایانی بدەن کوژراومان لە بەهەشتدایە و کوژراوتان لە ئاگری دۆزەخدان، ئێوەش خوێنی کوژراومان ببژێرن و ئێمەش هی ئێوە نابژێرین، لەوێدا عمر وتی: کە دەڵێی خوێنی کوژراومان بدەن! کوژراوی ئێمە خوێنیان نیە چونکە لە پێناوی خوادا کوژراون، بۆیە عمر نەیهێشت خوێن بدەن و لە جاری دووەمدا پاش قسەکانی صدیق (ﷺ) وتی: ڕایەکانت زۆر جوان و شیاون.

ئەبو بەکریش (ﷺ) بە قسەی عومەری کرد و ئا بەو جۆرە بەنی ئەسەد و غەطفان بە مەرجەکانی خەلیفە ڕازی بوون.

ج- بەسەرهاتی (ئوم زیمەل) — (ام زمل):

کۆمەڵێکی زۆر لە گومڕاکانی دەستەی (تولەیحە) لە هۆزی غوطفان، لە دەوری ژنێك کۆبوونەوە کە ناوی (سەلمای کچی مالکی کوڕی حذیفە) و لە شوێنێك پێیان دەوت (زەفەر) و یەکێك بوو لە خانمە ناودارەکانی عەرەب هەروەك دایکی بەناوبانگ بوو کە ناوی (دایکی قیرفە) بوو، کە بە نموونە باسی دەکرا دایکی لە نەجیب زادەییدا و لەبەر زۆری کوڕەکانی و ناوداری هۆزەکەی و بنەماڵەکەی.

کاتێك لێی کۆبوونەوە هانی دان بۆ شەڕ لەگەڵ خالیددا، هەموویان کەوتنە خرۆش بۆ جەنگ و هەندێ خەڵکی تریان پێوە نوسا لە (بنی سولەیم و طی و هەوازن) تا بوون بە سوپایەکی چڕ و پڕ، دەنگ و باسی ئەم ژنە بڵاوبوویەوە تا گەیشتە لای خالید و ئەویش بە سوپاکەیەوە خۆی پێ گەیاند و لە جەنگێکی ناهەمواردا بەیەك گەیشتن و ئەو ژنەش بە سواری حوشترەکەی دایکیەوە بوو کە دەیان وت: هەر کەسێك ئەو حوشترە بنەوێنێت سەد حوشتری پێ دەدرێت — ئەمەش لەبەر کەم وێنەیی و خالید سوپاکەی تێك شکاندن و حوشترەکەشی سەر بڕی و خۆیشی کوشت، هەواڵی ئەو سەرکەوتنەشی بۆ ئەبو بەکر ناردەوە.[1]

د- پەند و ئاکۆژگاری و وانە:

* متمانەی ئەبو بەکر (ﷺ) بە خوای گەورە و شارەزایی لە بواری سەربازیدا:

---

[1] البداية والنهاية (لا: ٣٢٣).

وتەکەی ئەبو بەکر (ﷺ) کە بە عەدی کوڕی حاتەمی وت: «فریای هۆزەکەت بکەوە با شوێنی تولەیحە نەکەون و بە هۆیەوە لە ناو نەچن»، مانای نموونەی متمانەی تەواوی ئەو پیاوە دەگەیەنێت و بڕوای تەواوی بە سەرکەوتنی خوایی دەسەلمێنێت، ئەنجامی جەنگی موسوڵمانان لەگەڵ هۆزی (طي) بە سەرکەوتن دووپات دەکاتەوە پێش ئەوەی ڕوویدات.

وە لەوەی کە بە خالیدی کوڕی وەلیدی وت: بڕۆ لە هۆزی طی دەست پێ بکە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دوورتر بوو لە ناوچەکەی (تولەیحە) کە ئەمەش پلانێکی جەنگی سەرکەوتووە، بۆ ئەوەی نەهێڵێت هۆزی (طي) خۆیان بگەیەننە هێزەکانی (تولەیحە) و ئەوانەشی ڕۆیشتوون بۆ لای ناچاریان بکات بگەڕێنەوە تا واز لەو بهێنن و بۆ بەرگری لە هۆزەکەیان ئەوێ بەجێ بهێڵن، لەوەشدا کە بە خالیدی وت کە من دەڕۆم و لە خەیبەرەوە بەرەو (طي) تا بگەم بە خالید، ئەمەش نەخشەی سەربازی سەرکەوتوی تێدایە چونکە نەك (طي) بەڵکو هۆزەکانی ئەو چوار دەورەیشی پێ چاوترسێن کرد.

لێهاتوویی صدیق (ﷺ) لەوەدا دەردەکەوێت کە پیاوی گونجاو و شیاوی وەك (ئەبو سلیمان) — خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ)ی هەڵبژارد بۆ ئەم کارە قورس و گرانە و خالیدیش هەرگیز لە هیچ شەڕێکدا نەشکاوە.[1]

لە وتەکانی صدیق (ﷺ) بۆ خالید دوای کۆتایی جەنگی بوزاخەدا کۆمەڵێك سوود وەردەگیرێت:

نزاکردنی بۆ خالید کە تیایدا وەسفکردنی بە چاکەی لە خۆ گرتووە و هەروەك فەرمان پێدانی بە لە خواترسان چونکە مرۆڤ دەپارێزێت لە کەوتنە ناو گوناه و هەڵخلیسکان و شوێن ئارەزوات کەوتن، هەروەك فەرمان پێدان بەوەی توند و تۆڵ و بە هەند بێت لەگەڵ دوژمناندا چونکە هێشتا لە تافی سەرکەشیدان، ئەمەش خۆی بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی صدیق (ﷺ) خۆی زۆر توند و تۆڵ و خاوەنی بینایییەکی تیژ بووە، چونکە هێشتا کۆمەڵێك هۆز و تیرە مابوون کە دوو دڵ و ڕاڕا بوون لە نێوان ڕەوا و ناڕەوادا و نێوان هیدایەت و گومڕاییدا و نێوان خێر و شەڕدا و نێوان و باوەڕ و بێ باوەڕیدان و پێویستیان بەوە هەیە تەمێ و چاوترسێن بکرێن

---

[1] التأريخ الاسلامي، حميدي (٩/٦٠-٦٣).

تا لەو سەرکەشیەیان واز بهێنن، هەڵوێستی ئەبو بەکر پێویستی بە ئەوپەڕی پلەی هێز نواندن و توند و تۆڵی و خێرایی بوو، بەڕاستی ئەو پیاوە بەرزە توند و تیژ بوو لە جێیەکدا توند و تیژی پێویست بێت و نەرم و نیان بوو لە جێیەکدا نەرم و نیانی پێویست بێت.

هەڵوێستی جوامێرانەی صدیق (ﷺ) لەوەی کە قبووڵی خۆ بەدەستەوەدانی ئەو پاشگەز بووانەی نەکرد و ئاشتەوایی لەگەڵ نەکردن وتی: یان شەڕ یان پلانێکی سەرشۆڕانی تا بەرزی ئیسلام و هەیبەتی دەوڵەتەکەی دەربخات.

مەرجەکانی لە ڕێککەوتنەکەیدا بەهێز بوون، توندترین و بە ئێش ترینیان ئەوەبوو کە چەك و تفاق و ولآخیان تەسلیم بکەن بە سوپای ئیسلام، ئەم مەرجەش کاتیی بوو تا ئەو کاتەی کە بزانێت تەوبە و گەڕانەوەیان لە دڵەوەیە و گوێڕایەڵی دەوڵەتی ئیسلام دەبنەوە، ئەوەش زۆر پێویست بوو بکرایە بۆ زامن کردنی نەگەڕانەوەیان بۆ سەرکەشی و یاخی بوون.[1]

* ئامۆژگاری عەدی کوڕی حاتەم بۆ هۆزەکەی و جەنگی دەروونی لەگەڵیاندا:

عەدی ڕۆیشت بۆ ناو هۆزەکەی خۆی و بانگی کردن بۆ گەڕانەوە بۆ لای ئیسلام، بەڵام ئەوان وتیان ئێمە بەیعەت بە بەچکە حوشتر نادەین،[2] ئەویش پێی وتن: گەلێکی وا هاتوون بۆتان کە حەرەم و سەراکانتان حەڵاڵ دەکەن و پێشی دەڵێن گەورەترین کەڵە پیاو، ئیتر ئێوە و ئەو، ئەوانیش وتیان: تۆ بڕۆ ڕێگای سوپاکەی و مەهێڵە بێتە سەرمان تا ئەو کەسانەمان چوون بۆ بوزاخە بێنەوە، چونکە ئەگەر ئێمە لە (تولەیحە) هەڵگەڕێینەوە ئەترسین ئەو جەنگاوەرانەمان بکوژێت یان بیانکاتە بارمتە.

عەدیش لە ناوچەی سونەح گەیشت بە خالیدی کوڕی وەلید و پێی وت: خالید تەنها سێ ڕۆژ لێم بوەستە (٥٠٠) جەنگاوەری (طي)یت پێشکەش دەکەم کە جەنگیان پێ بکەیت لەگەڵ دوژمنەکانت، ئەو باشترە تا بە پەلە بیاننێریت بۆ ئاگری دۆزەخ و یان خۆتیان پێوە خەریك بکەیت، ئا بەو جۆرە عەدی هەواڵی موسوڵمان بوونەوەیانی دا بە خالید.[3]

---

[1] التاريخ الاسلامي (٩/٦٦).

[2] مەبەستیان ئەبو بەکر بوو، دەمیان بشکێت.

[3] التاريخ الاسلامي (٩/٥٧).

ئا بەم جۆرە عەدی کوڕی حاتەم توانی هۆزەکەی بە هەردوو باڵەکەیەوە (بەنی جەدیلە و بەنی عوش) ڕازی بکات واز لە سەربازگەی (تولەیحە) بێنن و ببنە سەربازی سوپاکەی خالید و ئەمە دووەم هەڵوێستی مەزنە بۆ عەدی کە نواندی و یەکەمیان ئەوە بوو توانی زەکاتی خێڵەکەی کۆ بکاتەوە و بیهێنێت بۆ مەدینە لە کاتێکدا کە موسوڵمانەکان زۆر پێویستیان بەو ماڵ و سامانە هەبوو، هەر موسوڵمان بوونیشی لە یەکەم ڕۆژەوە موسوڵمان بوونی پیاوێکی زانا و تێگەیشتوو بوو، لە هەموو قەناعەت و دڵێکەوە.

زۆر دڵنیا بوو لە سەرکەوتنی ئیسلام و موسوڵمانان لە دوا ڕۆژدا هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە یەکەمین ڕۆژی موسوڵمان بوونیدا و ئەو باوەڕە بەهێزەشی بوو کە بە هۆیەوە توانی هۆزەکەی بکات واز لە پیشتگیری کردنی دوژمنانی ئیسلام بهێنن ، وای لێ کردن نەوەستن تا بزانن کێ سەرکەوتن بەدەست دینێتن بەڵکو لەگەڵ گەڕانەوەیاندا (١٥٠٠) جەنگاوەریشیان پێشکەش بە ئیسلام کرد کە ئەمە ئەوپەڕی کایگەری عەدی بوو لە سەریان.[١]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: کە هۆزەکەی داوایان لە خالید کرد کە جەنگ لەگەڵ قەیسدا بکەن چونکە بەنی ئەسەد هاوپەیمانیان نیە، خالیدیش پێی وتن: سوێند بەخوا قەیس ئاسانترینی ئەو دوو دڕکە نیە بەڵام خۆتان بگرن بۆ هەر هۆزێکیان کە خۆتان پێتان خۆشە، عەدی وتی: ئەگەر نزیکترین کەسی هۆزەکەم واز لەم ئاینە بهێنێت لەگەڵی دەجەنگم، بەڵام من شەڕ لەگەڵ بەنی ئەسەد ناکەم! نا بە ئەو خوایە شتی وا ناکەم، خالیدیش پێی وت: جەنگ و جیهاد لەگەڵ هەر کامیاندا بێت هەر جیهادە ئیتر پێچەوانەی ڕای هاوەڵەکانت مەبە، لەگەڵ لایەکیاندا بجەنگە و لەگەڵ ئەو لایەنەدا بجەنگە کە هۆزەکەت پێیان خۆشە و چالاکن.[٢]

لەوەی کە عەدی بەرامبەر هۆزەکەی وەستا و ئەو بۆچوونەیانی پێ ڕاست نەبوو، بەڵگەیە لەسەر تێگەیشتن و شارەزایی زۆری عەدی دەربارەی ئەوەی دۆستایەتی دۆستانی خوا

---

[١] التاريخ الاسلامي (٦١/٩).

[٢] التاريخ الطبري (٧٥/٢).

دەكات ئیتر با دوورترین خزمیشی بن و لە دوژمنانی خوا تەبەڕا دەكات ئیتر با نزیكترین خزمیشی بن.[1]

ئەو ڕۆڵەی عەدی بینی لە بانگەواز كردنەوەی هۆزەكەی بۆ لای ئیسلام و هێنانەوەیان بۆ ناو سوپاكەی خالید ڕۆڵێكی زۆر گەورە بوو، چونكە هاتنی (طي) بۆ ناو ئیسلام یەكەمین ترس و بیم بوو چووە دڵی دوژمنانەوە، چونكە هۆزی (طي) بە هێزترین هۆز بوو لە ناو هەموو كەنداوی عەرەبدا، و لەو هۆزانە بوو كە هۆزەكانی تر هەزار حیسابیان بۆ دەكرد، بەشێوەیەك بۆیان دەڕوانی كە هەیبەتێكی هەبوو، زۆر بەڕێز بوون لە ولاتیاندا، هۆزەكانی دراوسێ هاوپەیمانیان لەگەڵ دەبەست تا بێ خەم بوونایە.

هەردوو سوپا گەیشتن بەیەك دوای ئەوەی كە ترس و بیم چوو بووە دڵی دوژمنان، خوای گەورە سەركەوتنی كردە بەشی سوپای موسوڵمانان و هەر ئەوەندەت زانی دەست كرا بە كوشتن و بە دیل گرتن و فڕاندنی دوژمنان و سەركردەكەیان (تولەیحە) بە ئەسپەكەی بۆی قوچاند و كەسیان دەرنەچوون مەگەر ئەوانەی خۆیان دا بە دەستەوە یان هەڵاتن، دوای ئەم ڕووداوە ئیتر لاوازی و مەترسی كەوتە دڵی هەموو هۆزە پاشگەز بووەكانی كەنداو، تا وای لێهات سوپای ئیسلام زۆر بە ئاسانی ئەیدا بەسەر هەر كۆمەڵێكدا و لە هەر جێیەك بووبن و سەر دەكەوت بە سەریاندا.[2]

هۆكارەكانی شكانی (طليحة الاسدي):

كۆمەڵێك هۆكار كۆ بوونەوە كە بوونە هۆی شكان لەوانە:

* موسوڵمانەكان كاتێك دەجەنگان بیروباوەڕی جێگیری ناو دڵ پاڵی پێوە دەنان دڵنیاییان بە سەركەوتنی خوایی و شەیدایی شەهید بوون، حەزكردن لە مردن لە پێناوی خوا جەنگێكی زۆر كاریگەر و كوشندەیە، خالید ئەم پەند و وشە كورتانەی دەنارد بۆ پاشگەز

---

[1] التأريخ الاسلامي (٦١/٩).

[2] الحرب النفسية في المنظور الاسلامي، د. احمد نوفل (١٤٣/٢-١٤٤).

بووکان: (سوپایەکم بۆ هێناون، ئێوە چەندێ حەزتان لە ژیانە ئەوانیش ئەوەندە حەزیان لە مردنە).[1]

دوژمنانیش لە ڕووبەڕوو بوونەوەکانیاندا لەگەڵ سوپای موسوڵمانان ڕاستی ئەم بنەمایەیان بۆ دەرکەوتبوو، ئەبوو (تولەیحەی ئەسەدی) بە سەرسووڕمانەوە پرسیاری لێ کرد لە هۆکاری تێك شکاندنی سوپاکەیان لە بوزاخە کە سوپایەکی زۆر گەورەش بوو و وتی: «لەناو چن هۆی چی بوو تێك شکان؟ پیاوێك وتی: من پێتان دەڵێم، هەموو سەربازێکی ئێمە حەزی دەکرد هاوڕێکەی بکوژرێت پێش خۆی، ئێمە لەگەڵ کەسانێك شەڕمان دەکرد کە هەر هەموویان حەزیان دەکرد پێش هاوڕێکەی بکوژرێت».[2]

* هۆکارێکی تری سەرکەوتن هۆزی (طي) بوو کە هاتنە ناو سوپای باوەڕ و دوژمنانیان لاواز کرد.

* هەروەك شەهیدکردنی دوو هاوەڵی بەڕێز – عەکاشەی کوڕی محصن و ثابتی کوڕی ئەقرەم – خوایان لێ ڕازی بێت – زیاتر موسوڵمانەکانی ڕق ئەستوورتر کرد و بەرەو جەنگ بردنی.

* هەروەك ئەو شێوازی سەر لە دوژمن تێکدانەی صدیق (ﷺ) کردی ڕۆڵی گرنگی هەبوو لە سەرکەوتنی سوپای موسوڵمانان، کە وای حاڵی کردن ئەو بەرەو خەیبەر سوپا دەخاتە ڕێ و ئەوان دڵنیا بوون کە بۆ ئەوان ناچێت.

* هەروەك ڕێپێدانی هۆزی (طي) کە لەگەڵ (فیتس) بجەنگێت، بواری باشتری جەنگی بۆ ڕەخساندن و خۆ ئەگەر خالید (ﷺ) فەرمانی بدایە بە سەریاندا کە هەر دەبێت لەگەڵ بەنی ئەسەددا شەڕ بکەین هەروەك عەدی کوڕی حاتەم وای بۆ دەچوو، ئەو کاتە (طي) بە سارد و سڕی شەڕی دەکرد و لێ نەدەنەوی،[3] ئەمە و چەندان هۆی تریش.

---

[1] حركة الردة (لا: ٢٨٩).

[2] تاريخ الخمسين – ديار الكبرى (٢/٢٠٧)، ئەویش لە (حركة الردة)ی عتوم (لا: ٢٨٩) وەرطیراوە.

[3] خالد بن وليد – محمود خطاب (لا: ٩٦).

ئەمەش وانەیەکی گەورەیە بۆ ئومەتی ئیسلام کە متمانە و باوەڕی خۆیان نەبەخشنە کەسانێك کە پێشینەی بێ باوەڕیان هەیە و پاشتر گەڕاونەتەوە بۆ پابەند بوون بە ئیسلامەوە.

چونکە متمانەی تەواو پێیان و دانە دەستی سەرکردایەتی کردن بەو جۆرە کەسانە چەندان بەڵا و نەگبەتیان بەسەر ئومەت دا هێناوە و بەرەو هەڵدێر و تەنگەڵان بردوونیان، بەڵام ئاگاداری و متمانە نەکردن نەگاتە ئاستی تۆمەتبار کردنیان لە بواری بیروباوەڕ و لێسەندنەوەی متمانەی تەواو پێیان و ئەمەش لە سیاسەتی حەکیمانەی صدیقەوە (ﷺ) وەریدەگرین لە کاتی هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ وێنەی ئەو جۆرە کەسانەدا دەینواند.[1]

ئەمەو (طلیحة) بە جوانی موسوڵمان بوویەوە و لە سەردەمی عومەردا (ﷺ) هات بۆ مەدینە و بەیعەتی پێ دا لە کاتی هەڵبژاردنەکەیدا، و عومەر پێی وت: تۆ عەکاشە و ثابیتت کوشت؟ وەڵاهی هەرگیز خۆشم ناوێیت!، ئەویش وتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان، گوێ مەدە بە دوو پیاو کە خوای گەورە لەسەر دەستی من ڕێزدار و پایەداری کردن و لەسەر دەشتی ئەوان منی سەرشۆڕ و بێ نرخ کرد!

پاشان عومەر (ﷺ) بەیعەتی لێ وەرگرت و پێی وت: ئەی فێڵ باز، لە فاڵچیەتی جارانت پێ ماوە؟ وتی: کەمێك فوویەك دوو فوو، پاشان گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و لە ناویاندا مایەوە تا ئەو دەمەی گواستیەوە بۆ عێراق.

موسوڵمان بوونەوەکەی زۆر جوان و ڕاست و دروست بووە و کەسێك هیچی لەسەر نەوتووە.

لە هۆنراوەیەکدا پەشیمانی دەردەبڕێت لەو سەردەمە گومڕاییەی کە تێی کەوتبوو دەڵێت:

ندمت على ماكان من قتل ثابت — وعكاشة الغنمي ثم ابـــن معبد
واعظم من هاتـين عندي مصيبة — رجوعي عن الاسـلام فعل التعمدِ
وترك بـــلادي والحـــوادث جمة — طريداً، وقد ما كـنت غير مطرد
فـهل يـقبل الصديق اني مــراجع — ومعط بما أحدثت من حدث يدي

---

[1] هەمان سەرچوەی پێشوو.

واني من بعد الضلالة شاهد    شهادة الحق لست فيها بملحد
بان اله الناس ربـــي وانـني    ذلـيـــل وان الدين دين محمد

هـ- بەسەرهاتی (الفجاءة):

ناوی ئەیاسی کوڕی عبداللە کوڕی عەبد یالیل کوڕی عومەیری کوڕی خفافە لە (بني سُليم)، ئیبن ئیسحاق: ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە بەقیع سوتاندی، و هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە هات بۆ مەدینە و وای پێشاندا کە موسوڵمان بووەتەوە و داواشی کرد لە ئەبو بەکر کە سوپایەکی بداتە دەست تا شەڕی پێ بکات لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا، ئەویش سوپایەکی بۆ ڕێکخست، ئیتر بە سوپاکەیەوە بیدایە بە لای موسوڵمانانندا یان هەڵگەڕاوەدا دەیکوشت و پارە وماڵەکەشی دەبرد، هەر کە صدیق ئەم هەواڵەی بیست خێرا ناردی بە دواییدا بە سوپاکەوە و خوا کردی گرتیان و هێنایانەوە بۆ مەدینە و ئەویش ناردی بۆ بەقیع و لەوێ کۆت و زنجیری کرد و هەڵی دایە ناو ئاگرێکەوە و بە گرمۆڵەیی سوتاندی،[1]

ئەوەی کە گرتی و هێنایەوە ناوی (طریفەی کوڕی حاجز) بوو کە لە (سولەیم) بوو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕۆڵی گرنگی (بنی سلیم) لە بەرەنگار بوونەوەی خراپەکاران و پاشگەز بوواندا.[2]

ئەم سزا گەورەیەش لەبەر گەورەیی غەدر و ناپاکیەکەی فەجائە بوو، یان لەبەر ئەوە بوو کە لە کوژراوەکانی ناو موسوڵمانەکاندا هەندێکیانی بە ئاگر سوتاندووە.[3]

٣- سەجاج و بەنی تەمیم و کوشتنی مالیکی کوڕی نوێرەی یەربووعی:

لە ڕۆژانی پاشگەز بوونەوەدا بەنو تەمیم بۆچوونیان جیا جیا بوو، هەندێکیان پاشگەز بوونەوە و زەکاتشی نەدا، هەندێکیان زەکاتەکانیان کۆ کردەوە و ناردیان بۆ ئەبو بەکر، هەندێکیان لەو ناوەندەدا سەرسام بوون و چاوەڕزانیان دەکرد لەو کاتەدا سەجاج کچی حارث ی

[1] ترتیب وتهذیب البدایة والنهایة (لا: ١٠٦).
[2] الثابتون على الاسلام (لا: ٢٧).
[3] حرکة الردة/ عتوم (لا: ١٨٥).

تەغلیبیە هات بۆ ئەوێ لەگەڵ کۆمەڵێك سەربازی هۆزەکەی و ئەوانەشی خۆیان پیا هەڵواسی بوو.

ئەم ئافرەتە لە گاورەکانی عەرەب بوو، پاگەندەی پێغەمبەرایەتی خۆی دەکرد و نیازیان دەکرد بدەن بەسەر ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە مەدینە.

کاتێك دایان بە لای هۆزی بەنی تەمیمدا و بانگی کردن بۆ لای خۆی و ئەوانیش زۆربەیان شوێنی کەوتن، لەوانەی باوەڕی پێ هێنا مالیکی کوڕی نوێرە تەمیمی و عطاردی کوڕی حاجب و کۆمەڵێك لە سەرانی هۆزی تەمیم و کۆمەڵێکیشیان شوێنی نەکەوتن، هۆزەکە لەگەڵ سەجاج ڕێککەوتن کە پێکەوە شەڕ نەکەن، بەڵام مالیکی کوڕی نوێرە پێی وت: کە نەگەڕێتەوە و هانی دا کە بدات بەسەر بەنی یەربوعدا، پاشان هەموو پێکەوە ڕازی بوون بدەن بەسەر خەڵکدا، وتیان: لە کێوە دەست پێ بکەین؟

سەجاجیش بە شێوەیەکی لاسایی قورئانی پێی وتن: «اعدوا الرکاب، واستعدوا للنهاب، ثم اغیوا علی ارباب، فلیس دونها حجاب»، واتا: سوارەکان بەڕێ بخەن و خۆتان ئامادە بکەن بۆ فەرهود، بدەن بەسەر ڕەباب[1]، چونکە کەس نیە بیپارێزێت لێمان.

بەڵام بەنی تەمیم توانیان نەهێڵن بدات بەسەر (رباب)دا و پێشنیاریان کرد بدەن بەسەر یەمامەدا، تا لە ژێر چنگی موسەیلەمەی کوڕی حەبیبی درۆزن دەری بێنن، هۆزەکەی سەجاج ترسان لە موسەیلەمە و وتیان: بەهێز و بازووە و کەس ناچاری ناکات، ئەویش پێی وتن: (علیکم بالیمامة، دفو دفیف الحمامة، فانها غزوة صرامة، لا تلحقکم ملامة).

واتا: (بدەن بەسەر یەمامەدا، وەك گەلە کۆتر لە ناویان بەرن، وەوە جەنگێکی زۆر توندە و پاش ئەوە هیچتان لەسەر نامێنێت)، خۆیان حازر کرد بۆ جەنگ لەگەڵ موسەیلەمە.

کاتێك موسەیلەمە هەواڵی لەشکر کێشی ئەم ئافرەتەی زانی ترسی لە دەست چوونی دەسەڵاتەکەی لێ نیشت، چونکە ئەو لە لایەکی تر، تێی گیرا بوو خەریکی جەنگ بوو لەگەڵ سەرکردەی موسوڵمان (ثمامەی کوڕی ئاثال) و عکرمەی کوڕی ئەبو جەهلیش بە سەربازەکانیەوە هاتبوو بۆ کۆمەکی ثمامە و لەوێ سەربازگەیان کردبوو چاوەڕوانی خالیدیان دەکرد، بۆیە نامەی

---

[1] رباب/ بەشێك بوو لە بەنی تەمیم.

بۆ ئەو ئافرەتە نارد و تیایدا ئەمانی پێدا و پەیمانی ئەوەشی پێدا کە نیوەی ئەو موڵکانەی قورەیشی پێ بدات ئەگەر بێ شەڕ بگەڕێتەوە، چونکە بەبێ وەی و خۆشحاڵانە ئەو موڵکانە خوا گەڕاندیەوە بۆ لات، جوابیشی بۆ نارد کە حەز دەکەم پێکەوە دانیشتنێك بکەین بە ئامادەیی نوێنەری هەردوو لا، سەجاجیش بە چل پیاوەوە ڕۆیشت بۆ بینینی موسەیلەمە، لە چادرێکدا پێکەوە دیدارێکیان سازدا، کاتێك خۆی و خۆی مانەوە و نیوەی موڵکەکەی بۆ پێشنیار کرد، ئەویش قبووڵی کرد.

موسەیلەمەیش پێی وت: «(سمع الله لمن سمع، واطعمه بالخير اذا طمع، ولا يزال امره في كل ما يسر مجتمع، هل لي ان اتزوجكِ واكل بقومي وقومك العرب؟)»، واتا: خوا کاری ئاسان کردووین و ئایا دەتوانم بتخوازم و پێکەوە خێر و بێری عەرەب بخۆین؟ ئەویش وتی: بەڵێ، سێ ڕۆژ لە لای مایەوە و پاشان گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و وتیان مارەییەکەت چەند بوو؟ وتی: هیچ نەبوو، ئەوانیش وتیان: ناشرینە بۆ وێنەی تۆ بەبێ مارەیی شوو بکات، ئەویش جوابی بۆ نارد کە مارەییم بۆ دیاری بکەن وتی: کوا نوێنەرەکەت بنێرە با بەودا بۆتان بنێرم و ئەویش شەبەتی کوڕی ڕەبعی ڕیاحی نارد بۆ لای، ئەویش پێی وت: لە ناو هۆزەکەتدا هاوار بکە و بڵێ: ( موسەیلەمەی کوڕی حەبیبی پێغەمبەری خوا!! ئەو دوو نوێژەی محمد بۆی هێنا بوون لە سەرتان لای برد کە مەبەستی نوێژی بەیانی و عیشا بوو، ئەمە مارەییەکەیەتی نەفرەتی لێ بێت، پاشان سەجاج وازی هێنا لە شەڕ و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی، چونکە بیستبووی خالید (رضي الله عنه) بە سوپایەکەوە لە ناوچەی یەمامە نزیك بۆتەوە و بە ڕاکردن گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی دوای ئەوەی نیوەی موڵکی موسەیلەمەی لەگەڵ خۆی برد، تا سەردەمی معاویەش (رضي الله عنه) هەر لەناو هۆزەکەی خۆی بەنی تەغلیب مایەوە، ئەو لە ساڵی (جەماعە)دا بە یەکجاری لەو ناوچەیە هەڵی کەندن.[1]

مالیکی کوڕی نوێرە لەگەڵ سەجاجدا دەستی تێکەڵ کرد، بەڵام کاتێك سەجاج پەیوەندی کرد بە موسەیلەمەی درۆزنەوە – نەفرەتی خوا لە هەردووکیان بێت – پاشانیش بێباکانە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، بۆیە مالیك زۆر پەشیمان بوو لەو کارەی کردبووی و

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٢٤-٣٢٥).

لەسەر ئەوە سەرزەنشت دەکرا - ڕۆیشتە جێگایەك پێیان دەووت: (البطاح) کە شوێنێکە لە نێوان بەنی ئەسەد و نەجددایە - خالیدیش بە سەربازەکانیەوە ڕووی لەو شوێنە نا و پشتیوانان لەگەڵی نەڕۆیشتن و دەیان ووت: ئێمە ئەوەی خەلیفەی موسوڵمانان پێی وتبووین جێبەجێمان کرد و تەواو، خالیدیش پێی وتن: ئەم کارەش پێویستە بیکەن و هەلێکیشە نابێت لە دەست خۆمانی دەربکەین، ئێ هیچ نامەیەکیشم لەو بارەیەوە پێ نەگەیشتووە و منیش لێرە ئەمیرم و نامە بۆ من دێت و زۆریشتان لێ ناکەم کە دەبێت لەگەڵمدا بێن، بەڵام من دەڕۆم بۆ (بطاح).

دوو ڕۆژ ڕێگەی بڕی و پاشان نوێنەری پشتیوانەکان هات بۆ لای و وتی: پشتیوانان داوا دەکەن چاوەڕێیان بکات بەڕێوەن بۆ لای و گەیشتن پێی و ڕۆیشتن بۆ (بطاح) و مالیکی کوڕی نوێرە لەوێ بوو، خالید (ﷺ) پەلە سەربازەکانی بەو ناوەدا بەش کرد و بانگی پاشگەز بووانی دەکردەوە و سەرکردەکانی بەنی تەمیم هاتن بەرەو ڕوویان و گوێڕایەڵی خۆیانیان بۆ دووپات کردەوە و زەکاتیان بۆ کۆ کردەوە، تەنها مالیك نەبێت کە سەرسام مابوو لە کاری خۆی و نەیدەزانی چی بکات و خۆی بە دوورە پەرێز گرت لە خەڵکی و پەلە سەربازیەکان هاتن و خۆی و سەربازەکانیشیان قۆڵ بەست کرد و سەربازەکانی خالید تیا ڕامابوون نەیان دەزانی چین، هەندێ دەیان وت بانگ نادەن و نوێژیش ناکەن، بەڵام ئەبو قەتادە - حارث کوڕی ربعی ئەنصاری شایەتی بۆ دان کە نوێژ بەرپا دەکەن، دەڵێن دیلەکان لە ناو کۆت و زنجیردا بوون لە شەوێکی زۆر ساردا بوو، بانگ کەری خالید هاواری کرد: دیلەکانتان گەرم بکەنەوە، ضراری کوڕی ئازور (ﷺ) مالیکی کوڕی نوێرەی کوشت، کاتێك خالید بە پەلە لە چادرەکەی دەرچوو دەبینێت کار لە کار ترازاوە و هەموو لێ بوونەتەوە، بۆیە وتی: ئەگەر خوا شتێکی بووێت بیکات دەیکات.

خالیدیش خێزانەکەی مالیکی کوڕی نوێرەی خواست کە ناوی (ام تمیم)ی کچی مەنهال بوو زۆر جوان و شۆخ و شەنگ بوو، پاش ئەوەی ئازادی کرد هاوسەرگیری لەگەڵدا کرد.

دەڵێن (لە ریوایەتێکی تردا هاتووە) کە خالید مالیك دەگرێت و سەرزەنشتی دەکات لەبەر ئەو یاخی بوون و شوێن سەجاح کەوتنەی و زەکات نەدانی پێی دەڵێت: ئایا نازانیت وەك نوێژ واجبە و لەگەڵ ئەودا ناوی هاتووە؟ و مالیك وتی: هاوڕێکەتان وای دانابوو، خالیدیش وتی:

هاوڕێی ئێمەیە و تۆ بە هاوڕێی خۆتی نازانیت؟! ضرار ئا دەی لە گەردنی بدە و ئەویش دای لە گەردنی، لەسەر ئەو مەسەلەیە خالید و ئەبو قوتادە دەمیان تێك گیرا، تا ئەوە بوو ئەبو قوتادە گەیاندیە لای خەلیفە و عومەریش لەگەڵ ئەبو قوتادەدا لەسەر خالید قسەیان دەکرد و بە ئەبو بەکری وت: لە فەرماندەیی لایبە شمشێرەکەی خوێن ڕێژە، ئەبو بەکریش فەرمووی: شمشێرێك لانابەم کە خوا بۆ سەر گەردنی بێباوەڕان هەڵیکێشاوە، پاشان حوتیمی کوڕی نوێرە هات و سکاڵای خالیدی لە لای ئەبو بەکری صدیق دەکرد و عومەریش پشتگیری لێ کرد و ئەبو بەکریش ئەوە شیعرەی دەوتەوە کە موتیم لە شیوەنی مالیکی برایدا وتبووی و ئەبو بەکر دڵی هێنایەوە و ڕازی کرد.[1]

**کۆمەڵێك پەند و ئامۆژگاری و وانە:**

١- موسوڵمانە جێگیرەکانی ناو (بەنی تەمیم):

هەموو تیرەکانی بەنی تەمیم یان هەموو سەرکردەکانی یان هەموو تاکەکانی لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە هەروەك چۆن هەندێك لە مێژوو نووسەکانی هاوچەرخ بۆی چوون، بەڵکو لەبەر بەهێزی موسوڵمانەتی و ڕاوەستاوی هەندێ لە تیرەکانی بەنی تەمیم وای کرد لە مالیکی کوڕی نوێرە کە قەناعەت بە سەجاج بکات کە جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا بکات پێش ئەوەی بیر لە شاری مەدینە بکاتەوە، کاتێك ئەو ژنە لەگەڵ موسوڵمانەکانی بەنی تەمیمدا ڕووبەڕوو بوویەوە شکستیەکی پیسی خوارد لەسەر دەستیان و ئیتر لەو ڕۆژە بە دوا بیری لەوە نەکردەوە بدات بەسەر شاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بڕیاری گرتنی یەمامەی دا.

هەموو ڕیوایەتە مێژووییەکان ئەم ڕاستیە دەچەسپێنێت کە باسمان کرد،[2] بەڵکو بەدواداچوونی ورد ئەوە دەسەلمێنێت کە ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەر بیروباوەڕی ئیسلام مابوونەوە لە بەنی تەمیم زیاتر بوون لە هەڵگەڕاوەکان، هەندێ لە ڕیوایەتەکان ئەو ڕۆڵە گرنگەی تیرەی ڕەباب دەسەلمێنن کە لە بەرەنگار بوونەوەی بێباوەڕان و پاشگەزبوواندا نواندیان و دەڵێن هەر ئەوە بوو کە سەجاج و پیرەکەی وایان پێ باش بوو لە ڕەبابەوە دەست پێ بکەن،

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٢٦).

[2] الثابتون على الاسلام (لا: ٤٤).

ڕیوایەتەکان باسی ئەو شەڕە گەورە و ترسناکە دەکەن کە لە نێوان سوپای سەجاج و تیرەی ڕەبابدا ڕوویدا و دوایی بە ڕێککەوتننامەی ئاشتی کۆتایی پێ هات و هەر کە سەجاج زانی ناتوانێت موسوڵمانەکانی بەنی تەمیم ژێر بار بکات و وا قەیسی کوڕی عاصیم پەشیمان بوویەوە و زەکاتی ماڵ و سامانی خۆی و هۆزەکەی برد بۆ مەدینە، لەو کاتەوە سەجاج و کۆمەڵەکەی بۆیان دەرکەوت سەرناکەون.[1]

٢- خالید و کوشتنی مالکی کوڕی نوێرە:

ڕایەکان جیاوازن سەبارەت بە کوژرانی مالکی کوڕی نوێرە لەوەدا کە ئایا شایستەی کوشتن بوو یان بە ستەم کوژرا، واتا: موسوڵمان بوو یان بێباوەڕ؟ دکتۆر (علی العتوم) لێکۆڵینەوەیکی ئەم مەسەلەیەی کردووە و لە کتێبی (حركة الردة)، شێخ محمدی کوڕی طاهری کوڕی عاشوور لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ڕەخنەی زانستی لە نووسراوی ( كتاب الاسلام واصول الحكم)دا ئەم باسەی کردووە و شێخ محمد زاهد الكوثری بەرگری لە خالید کردووە لە کتێبی (مقالات الكوثري) و کەسانی تریش کە لەسەر ئەم بابەتە نووسینیان هەیە و منیش لە ناو هەموویاندا بۆچوونی دکتۆر عەلی العتومم هەڵبژاردووە چونکە مەسەلەکەی بە شێوازێکی زۆر جوان و زانستیانە هەڵسەنگاندووە و گرنگیەکی وردی وای داوە بە مەسەلەی (پاشگەزبوونەوە) کە بە پێی خوێندنەوەی من نەمدیوە هیچ نووسەرێکی هاوچەرخ ئەو گرنگیەی پێدابێت و بە ئامانجێکی وا گەیشتووە کە من لەگەڵیدام لەو مەسەلەیەدا ئەویش ئەوەیە:

کە مالك خۆبەزل زانین و ڕاڕایی لەناو بیروباوەڕیدا وخەوش و خاڵی نەفامی لە دڵیدا مابوو، ئەگەر وانیە ئەی ئەو دەستی دەستیە چی بوو کە هەر خۆی دوا دەخست لە شوێنکەوتن و بەیعەتدانی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بەجێهێنانی ئەرکی زەکات بۆ خەزێنەی موسوڵمانان.

بە ڕای من ئەو پیاوە دەیویست پلە و پایەکەی لە دەست نەچێت، و لە هەمان کاتیشدا دەیویست لە خزمە گەورەکانی هۆزەکەی دوورە پەرێز بێت لەوەی کە ملکەچی دەوڵەتی ئیسلامی بوون و ئەرکی سەر شانیان جێبەجێ دەکرد، گوتار و کرداری ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن،

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا: ٤٨).

هەر لە پاشگەزبوونەوە و شوێنکەوتنی سەجاج و بەشکردنی حوشترەکانی زەکات بەسەر هۆزەکەیدا و بەڵکو ڕێگرتنی لەوەی کە زەکاتەکان نەگاتە ئەبو بەکر و گوێ نەگرتن بۆ خزمە موسوڵمانەکانی لە کاتی یاخیبوونەکەیدا، هەموو ئەمانە تاوانباری دەکەن و وای لێ دەکەن کە پیاوێك بێت نزیك بێت لە بێباوەڕی زیاتر لە نزیك بوونی لە ئیسلام.

ئەگەر مالیك هیچ تاوانێکی نەبێت جگە لە زەکات نەدانەکەی بەسە ئەوە تاوانباری بکات و ئەم زەکات نەدانەشی لە لای هەموو پێشینەکان ڕوون بوو، لە کێبی (محول الشعراء)ی (ئبن سەلام)دا هاتووە، دەڵێت: «هەموو لەسەر ئەوەن کە: خالید (ﷺ) لەم بارەیەوە گفت و گۆی لەگەڵدا کردووە و مالیك بە نوێژ ڕازی بووە و لە زەکات خۆی دزیوەتەوە».[1]

لە (شرح النووي لصحيح المسلم)دا هاتووە سەبارەت بە پاشگەزبووەکان:

هەندێ لەوانە کە ڕێگەیان لە زەکات نەدەگرت بەڵام سەرگەورەکانیان بەرگریان لێ دەکردن و دەستیان دەگرت بە سەریاندا وەك (بەنی یەربوع) کە زەکاتی خۆیانیان دەرکرد و ویستیان بۆ ئەبو بەکری بنێرن کەچی ئەو گەورانە نەیانهێشت لەوانە مالیکی کوڕی نوێرە لێی سەندن بەسەر هۆزەکەیدا دابەشی کرد.[2]

٣- خواستنی (ئوم تەمیم) لە لایەن خالیدەوە:

ئوم تەمیم ناوی لەیلای کچی سەنانی مونهالە و خێزانی مالیکی کوڕی نوێرە بوو، ئەم ژن خواستنەی خالید قسە و قسەلۆکی زۆری لەسەرە، هەر یەکە و لەبەر مەبەستێکی خۆی بە کۆمەڵێك تۆمەت خالیدیان تۆمەتبار کرد و کە هیچ یەکێك لەو تۆمەتانە لەبەر دەم لێکۆڵینەوەی زانستیانەدا ساغ نەبۆتەوە.

بە کورتی هەندێکیان دەڵێن خالید مارەی کردووە لەگەڵ یەکەم چاو پێکەوتنیدا لەبەر جوانیەکەی و لەبەر ئەوین داریی پێشوو، - بەو بۆنەوە — واتا خوانەخواستە گوایە خالید خوێنڕێژ بووە! ئەم قسەیەش تازەیە و پشتی پێ نابەسترێت، چونکە سەرچاوە کۆنەکان شتی وای تێدا نیە، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەمەی لەخۆ گرتووە و زۆر ڕاشکاوانەش، (ماوردی) دەڵێت:

---

[1] طبقات مخول الشعراء، لێکۆڵینەوەی محمود شاكر (لا ١٧٢).

[2] شرح النووی علی صحيح المسلم (٢٠٣/١).

ئەوەی وای لە خالید کرد مالیك بکوژێت لەبەر ئەوە بوو کە زەکاتی نەدەدا کە بەوەش خوێنی حەڵاڵ کرد هەر لەبەر ئەوەش پەیمانی (نکاح)یش نەما لە نێوان مالیك و خێزانەکەی (ئوم تەمیم)دا، وە حوکمی ئەو ئافرەتانەی کە هاوسەرەکانیان هەڵگەڕاونەتەوە لە ناو (دار الحرب)دا ماونەتەوە ئەوەیە ناکوژرێت بەڵام بە کەنیزەك دەکرێت هەروەك ئیمامی سەرخەسی ئاماژەی بۆ دەکات،[1] وە هەر (ئوم تەمیم) بە دیلی دەگیرێت و خالید هەڵی دەبژێرێت بۆ خۆی و دەیشی خوازێت.[2]

شێخ احمد شاکریش لەسەر ئەم مەسەلیە دەڕوات و دەڵێت: خالید ئوم تەمیمی بردە لای خۆی و لەبەر ئەوەی کەنیزەك بوون بە شێوەی (ملك یمین) دەبێتە خێزان، بەڵکو ئەگەر سکی پڕ بێت بە شێوەیەکی کاتی حەرامە نزیکی ببێتەوە تا سکەکەی دادەنێت و (ئوم تەمیم)یش سکی پڕ نەبووە و ئەگەریش پڕ نەبێت لێی دەوەستێت تا یەك جار دەکەوێتە (سووڕی مانگانەوە) و پاشان دەچێتە لای و شتێکی شەرعیە و هیچ عەیبێك و هیچ قسەیەکی تێدا نیە، بەڵام دوژمنان و ئەوانەی پێچەوانەی ئەون ئەم کارەیان بە هەڵ زانی تا بیقۆزنەوە و وا گومان بەرن کە مالیکی کوڕی نوێرە موسوڵمان بووە و خالید لەبەر ژنەکەی کوشتوویەتی.[3]

هەروەها خالید بەوە تۆمەتبار کراوە کە گوایە بەم ژنهێنانەی پێچەوانەی خو و نەریتی عەرەب کردووە، ئەوەتا عەقاد دەڵێت: خالید مالیکی کوڕی نوێرەی کوشت و ژنەکەشی خواست لە ناو گۆڕەپانی جەنگدا بە پێچەوانەی خو و ڕەوشتی عەرەب چ لە سەردەمی نەفامی و چ لە سەردەمی ئیسلامدا، بەڵکو ئەوە ڕەوشتی موسوڵمانانیش نەبوو، وە شەریعەتیش شتی وای نەوتووە.[4]

---

[1] شرح النووي على صحيح المسلم (٢٠٣/١).

[2] الاحكام السلطانية (لا: ٤٧)، له (حركة الردة) وەرگیراوە.

[3] حركة الردة (لا: ٢٣٠).

[4] عبقرية الصيق (لا: ٧٠).

ئەم قسەیەی عەقادیش زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە شتی وا زۆر زۆر ڕوویداوە لە پێش ئیسلامدا و لە پاش هەموو جەنگ و سەرکەوتنەکانیاندا هەستاون بە خواستنی ژنە کەنیزەکەکانیان و شانازیشیان بەوەوە کردووە وەك عەدەی کوڕی حاتەم لە شیعرەکەیدا دەڵێت:

وما انكحونا طائعين بناتهم ولكن خطبناها باسيافنا قسرا

واتا: کچەکانیان بە خۆشی خۆیان پێ نەدایین بەڵکو بە زۆری نوکی شمشێر خواستمانن.

لە لایەنە شەرعیەکەشیەوە، خالید کارێکی حەڵاڵی کردووە و بە شێوەیەکی شەرعی هەستاوە پێی و وای کردووە کە کەسێ لەو باشتریش بەو کارە هەستاوە، لە ناو غەزاکەدا یان کەمێك پاش ئەو ژنی کەنیزەکی خواستووە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایکی ئیمانداران جویریەی کچی حارث مصطلقی ی خواست دوا بە دوای جەنگی (مورەیسیع) کە یەکێ بوو لە کەنیزەکەکانی (بنی مصطلق) و لە کەنیزەکی ڕزگار کردوو خواستی و بوو بە خێر و بەرەکەت بۆ هۆزەکەی کە بە هۆی ئەو هاوسەرگیریەوە موسوڵمانان (١٠٠) پیاویان لێ ئازاد کردن چونکە بوون بە خەزوورانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە ئاکامەکانیشی موسوڵمان بوونی باوکی لێ کەوتەوە (حارث کوڕی ضرار).[1]

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) صفیەی کچی حی کوڕی أخطب ی یەهوودی مارە کرد پاش غەزای خەیبەر، هەر لە خیبەر یان لە ڕێگەش گواستیەوە،[2] ئەگەر پێغەمبەری خوا سەر مەشقی چاکە بێت ئیتر سەرزەنشت و لۆمە ناکرێت کەسێك چاو لەو بکات.[3]

د. محمد حسن هیکل بەرگریەکی ناشنایستەی ناشەرعی لە خالید دەکات کە بێ بەرنامەیی پێوە دیارە، چونکە نابێت لەسەر حیسابی ئیسلام چاو لە سەرپێچیەکانی خالید داخەین و خالیدیش و کەسانی تریش بە شەرع هەڵسەنگێنرێن و کەسیان لە سەرووی شەرعەوە نین، بە پاك ڕاگرتنی ژیانی تاکەکان یەکسان نیە بە شێواندنی بەرنامەکە لە هیچ حاڵەتێکدا، ئەوەتە د. هیکل دەڵێت:

---

[1] سیرة ان هشام (٢/٢٩٠-٢٩٥).

[2] هەمان سەرچاوە (٢/٣٣٩).

[3] حرکة الردة (لا: ٢٣٧).

(ژن هێنانی خالید بە پێچەوانەی نەریتی عەرەب و بەلکو چوونە لایشی پێش پاك بوونەوەی، ئەگەر لە کەسێکی ڕزگاریخوازی وەك خالیدەوە بێت بۆیان هەیە کەنیزەك بۆ خۆیان هەلبژێرن!! پابەند بوون بە شەریعەتەوە نابێت سەرکردە مەزنە هەلکەوتووەکان بگرێتەوە کە خالید یەکێك بوو لەوانە بە تایبەت ئەگەر زیان بە دەولەت بگەیەنێت یان بیخاتە مەترسیەوە).[1]

شێخ احمد شاکریش بەرپەرچی ئەم ڕایەی داوەتەوە و دەلێت: ( ئەوەی زۆر لێی دەترسم ئەوەیە نووسەرەکە کاریگەری ژیاننامەی ناپلیۆنی لەسەر بێت کە زۆر خوێندوویەتیەوە یان سەرکردە ئەورووپیەکانی تریش، لە لایەنی ئیسراف و زیادە ڕەوی و کارە نەنگەکانیانەوە، یان ئەو نووسینانەی لەسەر سەرکردەکانی ئەفرەنجە نوسراون لەبەر خاتری لێهاتوویی و ڕزگارکردنی ناوچەکان و کۆمەکیان بۆ گەلان، پۆزشیان هێناوەتەوە بۆ هەلە و تاوانە زەبەلاحەکانیان تا خەلکی وا بزانێت موسولمانە پێشینەکانیش وەك ئەوان وا بوون، دەلێت: ( پابەند بوون بە شەریعەتەوە نابێت سەرکردە مەزنە هەلکەوتووەکان بگرێتەوە وێنەی خالید)، کە ئەم قسەیەش دەبێتە هۆی ڕمانی هەموو ئاین و ڕەوشتێك.[2]

٤- هاوکاری (صدیق) بۆ سەرکردەکانی بەرەکانی جەنگ:

هەندێ لە سەربازەکانی سوپاکەی خالید شایەتیان دا کە ئەو هۆزە بانگیان داوە لەگەل بانگەکەی موسولمانەکاندا، وە بەو هۆیەوە کوشتنیان نارەوایە و خوێن ڕشتنیان حەرامە، یەکێك لەو کەسانە (ابی قوتادە) بوو (ﷺ) مەسەلەکەی گەورە کرد، و لەوەش زیاتر پێی ناخۆش بوو خالید هەستابوو بە مارەکردنی خێزانەکەی مالیکی کوڕی نوێرە، بەو هۆیەوە (ئەبی قوتادە) وازی لە سوپاکەی خالید هێناو گەڕایەوە بۆ مەدینە بۆ لای ئەبو بەکر و شکاتی خالیدی گەیاندە خەلیفە، ئەبو بەکر (ﷺ) ئەم جیابوونەوەی ئەو قوتادەی لە خالید بە هەلەیەکی گەورە دایە قەلەم و نابێت نە لە ئەو و نە لە کەسی تریش قبوول بکرێت، چونکە دەبێتە هۆی شکست هێنان و سوپایش هێشتا لە ناو جەرگەی زەوی دوژمنان دایە و بە توندی لەگەل ئەبی قوتادە جولایەوە

[1] الصدیق ابو بکر (لا: ١٤٠).

[2] حرکة الردة (لا:٢٣٢).

و گەڕاندیەوە بۆ ناو سوپا، ڕازی نەبوو تا نەبینێت چووەتەوە ژێر بەیداغی خالیدی کوڕی وەلید،[1] وە ئەم کارەی ئەبوبەکریش بە هێزترین سیاسەتی جەنگیە.

(صدیق) .. هەستا بە لێکۆڵینەوە لەمەسەلەی کوشتنی (ابن نویره) و لەئاکامدا بۆی دەرکەوت خالید لەو مەسەلەدا بێ تاوانە[2] . لەم بوارەدا ئەو (صدیقه) زۆر شارەزا بوو لەڕاستی مەسەلەکان ، لەهەموو هاوەڵان زیاتر تاوتوێی دەکرد چونکە ئەو خەلیفە بوو، هەموو هەواڵەکان دەهاتنەوە بەردەستی و لەلایەکی تریشەوە باوەڕی لەهەموویان گەورەتربوو ، ئەو لەم کارەیدا لەگەڵ خالید (خوای لێ رازی بێت) شوێن پێ ی پێغەمبەری خوای ﷺ هەڵگرت بۆیە خالیدی لانەبردو بەسەرکردەیی هێشتی یەوە لەکاتێکدا کەهەندێ کاری لێ دەوەشایەوە کە پێی خۆشحاڵ نەبوو ، هەرکاتێ داوای لیبوردن و چاوپۆشی بکردایە لێی دەبووری و دەیووت : ﴿ ئازاری خالید نەدەن ، چونکە ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خواو بۆ گەردنی کافرانی هەڵکێشاوە ﴾[3] .

لەتەواوی کارەکانی صدیق (خوای لێ رازی بێت) بەکارهێنانی خالید و پشت بەستنی پێی ، چونکە زۆر توندوتیژ بوو ئەم ئێوری دەکردەوە ، و توندوتیژی و نەرم و نیانی تێکەڵ کردبوو ، و چونکە نەرم و نیانی بەتەنیا دیفەوتاند ، و توندوتیژی بەتەنیا هەروەها دەیفەوتاند ، بۆیە ڕاوێژی بە عمر دەکردو کاریشی دەدایە دەستی خالید ، ئەمەش لەتەواویەتی و بە تەواوی شایانی ئەوەیە خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت و بۆیە لەمەسەلەی جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا لە عمر زۆر توندوتیژتربوو ، خوای گەورە توندوتیژیەکی وای تێدا دروست کرد کەپێشتر تیانەبوو ، و عمریش زۆر توندوتیژبوو لەدەروونی خۆیدا بۆ ئەوەی خەلافەتەکەی تەواوبێت پەنا دەبرد بۆ بەکارهێنانی نەرم ونیانەکانی ناو هاوەڵان تا توندوتیژی خۆی پێ ئێووربکاتەوە ، بۆپشتی دەبەست بە (ئەبوعوبەیدەی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبی عوبەیدەی پهقەفی و نوعمانی کوڕی موقرین و سەعیدی کوڕی عامیر و هاو وێنەکانی ئەوان لە کەسانی چاکەخوازو دنیا نەویست کە هەموویان لە خالید زیاتر چاکەخوازو دنیا نەویست بوون ، و خوای گەورە سۆزو بەزەیی یەکی

---

[1] حركة الردة (لا: ٢٣١).

[2] . الخلافة والخلفاء الراشدون – بهنساوي لا ٦١٢ .

[3] . فتح الباري (٦٠١/٧) .

وای له عمردا دروست کرد ك پێشتر تیانەبوو تا خەلافەتەکەی بەکەمالی بەرێتە سەر ، وتـا وای لێهات بەڕاستی (أمیر المؤمنین) بوو[1] . (إبن تیمیه) لـەو بارەیـەوە ووتەیـەکی بـەنرخی هەیـەو دەڵێت : ( ئابەو جۆرە ئەبوبەکر جێ نشینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەجـەنگی هەڵگەڕاوەکانـدا هەر خالیدی بەکاردەهێنا و سەرەڕای ڕزگارکردنی عێراق و شام و هەندێ هەڵەی لێ دەوەشـایەوە بەڵام ئەو پاساوی بۆ دەهێنایەوە ، و پێی دەووت کە هەندێ هەواو ئـارەزووت تێدایـە و هەنـدێ کارت پێ دەکەن بـەڵام لای نـەدەبرد بـەڵکو سەرسەنـشتی دەکـرد ، ئەمـەش لەبـەر گـەورەیی بەرژەوەندیی لەچاو خراپی زیانی لابردنی دا ، و کەسی تر ئەو ڕۆڵەی ئـەوی نـەدەبینی چـونکە فەرمانڕەوای گەورە ئەگەر ڕەوشتی بەلای نەرمیـدا بـوو ، دەبێـت ڕەوشـتی جێگرەکـەی بـەلای توندوتیژیدابێت ، تاکارەکەرێك ببێتەوە ، لەبەر ئەم هۆیە بوو ئـەبوبکر (خـوای لـێ ڕازی بێـت) خالیدی بەکاردەهێنا ، بەڵام عمر (خوای لێ ڕازی بێت) وای بەجوان زانی خالیـد لابـات و ئـەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح (خوای لێ ڕازی بێـت) بخاتە شوێنەکەی ، چونکە خالیـد توندوتیـژبوو ، وەك عمری کوڕی خەتاب وابوو ، بەڵام ئەبوعوبەیدە نەرم بوو وەك ئەبوبکر ، بۆ هەریەکەیان ئەوە باش و گونجاو بوو کەدایان نـابوو تـا کارەکانیـان ڕێـك بێـتەوە تـا بەڕاسـتی ببنـە خەلیفـەی پێغەمبەری خوای ﷺ ڕێك و مام ناوەندبن ) ، تا پێغەمبەری خوای ﷺ فەرمووی : (( انـا نـبي الرحمة ، انا نبي الملحمة)) واتـە مـن پێغەمبـەرێکی سـۆزو میهرەبـانیم و مـن پێغەمبـەرێکی داستانەکانم ) .

(٤) هەڵگەڕانەوەی دانیشتوانی عومان و بەحرەین :

أ. هەڵگەڕانەوەی خەڵکی عومان :

خەڵکی عومان هاتن بەدەم بانگەوازی ئیـسلامەوە و پێغەمبـەری خـوایش ﷺ عـەمری کـوڕی عاصی نارده ناویان ، بەڵام پاش وەفـاتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پیاوێکیـان تیـا هەڵکـەوت (خاوەن تاج) یان پێ دەووت ، کەناوی لقیگ کوڕی مالکی ئەزدی بوو ، لەسـەردەمی نەفامیـدا (جەلەندی) پاشای عومان بوو ، بانگەشەی پێغەمبەرایـەتی خـۆی دەکـرد ، و هەنـدێ گێـل و نەفامی عومان باوەڕیان پێ کرد ، دەستی گرت بەسەر عومـان و خـەڵکی بـەنی جەلەنـدی دا و

[1] . ابوبکرالصدیق افضل الصحابة واحقهم بالخلافه لا ١٩٣ــ١٩٤.

خەڵکەکەشی بەرەو چیاکان و کەناری دەریاکان فڕاند ، و جەیفـەر هـەواڵی نـارد بـۆ ئـەبوبکر و هەواڵەکەی بۆ باس کردو تیایدا غیرەتی خستە بەری ، ئەبوبەکریش بەناردنی دووئـەمیر وەڵامـی دایەوە ، یەکەمیان خزیفەی کوڕی محصن غەلەفانی لەبەنی حیمیر نارد و دووەمیان : عەرفەجەش بۆ مەهەرە ، و فەرمانی پێدان کۆببنەوەو پێکەوە هێرش بەرن بۆ عومان ، لەعمان حزیفە ئـەمیر بێت و ئەگەر بەرەو مەهەرە ڕۆشتن ئەوا عەرفەجە ئەمیربێـت ، دوابـەدوایان عەکریمـەی کـوڕی ئەبوجەهلی نارد بۆ کۆمەکیان ، و بۆیشی نووسین کەهەردووکیان پـاش ئـەوەی لـەکاری عومـان بونەوەو تیا جێگیربوون لەسەر ڕای عەکریمە بن . هەرکە لەعومان نزیك بوونەوە نامەیان نارد بـۆ جەیفـەر و لـەقیتی کـوڕی مـالیکیش هـەواڵی هـاتنی سـوپاکەی بیـست و لەگـەڵ کۆمـەڵی لەسەربازەکانیدا دەرچوون و لەشوێنی لە (دەبا) یان پێ دەووت جێگیربوو ، کـە قـەرەباڵغ تـرین شاری ئەو وولاتەو گەورەترین بازاری بوو ، و ژن و منداڵ و پارە و سـامانیان لـەدوای خۆیانـەوە دانابوو تا بەغیرەتەوە شەڕ بکەن ، و جەیفەر و عوبادیش لەشوێنی کۆبونەوە کە (صحار) یان پێ دەگوت ، و لەوێ سەربازەگەیان دروست کرد و جوابیشیان نارد بۆ فەرماندەکانی ئەبوبکر (خوای لێ ڕازی بێت) کەهاوکاریان بکەن ، و لـەوێ هـەردوو سـوپا ڕووبەڕووبونـەوە ، جـەنگێکی زۆر دژواریان کرد پێکەوە ، و موسڵمانان زۆر شپرزبوون و خەریك بوو هەڵبێن ، و لەوکاتـەدا خـوای گەورە بەڕەحم و بەزەیی خۆی فریای ئەو وەزعە ناهەموارەیان هات و کۆمەکیان بۆهات لەلایـەن (بنی ناجیە) و (عبدالقیس) کە کۆمەڵی فەرماندەبوون ، و هەرکـە گەیـشتە ئـەوێ سـەرکەوتن بووبە بەشی موسڵمانان و بێ باوەڕانیش هەڵاتن ، و موسڵمانەکانیش شوێنیان کەوتن و تا (١٠) هەزاریان کوشتن ، و ژن و منداڵەکانیان گرتن ، و هەموو پارەو پول و بازارەکانیان بەتەواوی لـێ سەندن و (١/٥) یان ناردەوە بۆ ئەبوبکر (خوای لێ ڕازی بێـت ) لەگەڵ یـەکێ لەفەرمانـدەکانی عەرقەجە . هۆی سەرەکی سەرکەوتنی موسڵمانان لەم جەنگەدا ڕاوەسـتانی کۆمـەڵی ئیـسلامی بوو لەپشتی ئەمیرەکەیانەوە (جەیفە) و (عوباد)ی بـرای دژی (خـاوەن تـاج) لـە قیگـی کـوڕی مالیکی ئەزدی و جێگیربوونی لەشوێنە بەرزەکان تا موسڵمانان دەستیان پێی گەیشت و هەروەك هەڵوێستی (بنی جزیز) و (بنی عبدالقیس) و دامەزراویان لەسـەرە ئیـسلام و فریاکـەوتنیان بـۆ سوپای ئیسلام لەکاتی گونجاودا ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەسەرکەوتنی موسڵمانان دا .

**ب / پاشگەزبوونەوەی خەڵکی بەحرەین : خەڵکی بەحرەین کاتێ موسڵمان بوون کە پێغەمبەری** خوای ﷺ عەلائی کوری حەزرەمی (خوا لێ رازی بێت ) نارد بۆ لای پاشاکەیان (مـنـذری کـوری ساوی العبـد) و ئەویش خۆی و هۆزەکەی موسـڵمان بـوون ئیـسلام و دادپـەروەری یـان لـەناودا بەرقـەرارکرد . وەڵامـی (منـذر الـساوي) بـۆ پێغەمبـەری خـوای ﷺ ئەمـەبوو : (سـەیری مەسەلەکەم کرد دەبینم ئەم وەزعەی ئێستام – پاشایی – بۆ دنیایەو بەشی قیامەتی تیانی یە ، و بۆ دینەکەی ئێوەشم ڕوانی دەبینم بۆ دنیاو قیامەتە ، هیچ شتێك ڕێـم لـێ ناگرێـت کـەئاینێ هەڵبژێرم ئاواتی ژیان و حەوانەوەی پاش مردنی تیا بێت بۆم ، تا دوێنی سەرم سـوڕ دەمـا لـەو کەسانەی موسڵمان دەبوون بەڵام ئەمڕۆ سەرم سوڕ دەمێنێ لەو کەسانەی موسڵمان نابن ، لەبـەر گەورەیی ئەو بەرنامەیەی پێی هاتووە پێویستە بەگەورە رابگیرێت ) . بەڵام کاتێ منـذر کۆچـی دوایی دەکات ، پاش ماوەیەکی کورت خەڵکی بەحرەین لەئیسلام پاشگەزدبنەوە و (منزری کوڕی نوعمان) دەکەنە سەر گەورەیی خۆیان. زەوی بەحرین لەکوێدایە ؟ پارچـەزەوی یـەکی تەنگەڵانـە هاوکەنارە لەگەڵ (هجری کەنداوی عەرەب) و لە قەتیفەوە تا عومان درێژ دەبێتەوە ، بیابانەکانی درێژ دەبێتەوە تا خەریکە بگاتە کەنداو ، و لە ڕووی سەرویشەوە لکاوە بە یەماوەو لەنێوان ئـەو و خۆیدا هەندێ گردۆڵکەی نزم کە ئاسانە بڕینیان . بەم شێوەیە میرنشینەکانی کەنداوی عەرەبی و بەشی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی سعودیە دەگرێتەوە جگە لـە کوەیـت ئەمـەو ئـەو کەسـانەی لەسـەر ئیسلام بەڕاوەستاوی مابوونەوە لە بـەحرەین دا ڕۆڵێکـی گرنگیـان هـەبوو لەکوژاندنـەوەی ئـەو ئاشوبەدا . و (جارودی کوڕی موعلی) ڕۆڵێکی زۆر جیاوازی هـەبوو ، ئـەو پیـاوە کـاتی خـۆی هاوڕێ یەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کردبوو ، و لەسەر دەستی ئەو لە ئیسلام شارەزا بـوو بـوو ، و پاشان گەڕابوویەوە ناو هۆزەکەی و بانگی کردبوون بۆ لای ئیسلام ، و هەر هەموویان موسـڵمان بوون ، پاش ماوەیەکی کەم پێغەمبەری خوا ﷺ لەدنیا دەرچوو ، و عبـدالقیس ووتـی : ئەگـەر محمد پێغەمبەر بوایە نەدەبوایە بمردایـە ! ، هـەموویان پاشـگەز بوونـەوە ، کـاتی جـارود ئـەم هەواڵەی بیست کۆی کردنەوەو پاشان هەستایەوە و ووتارێکی بۆدان ووتی : ئەی هۆزی عبدالقیس ، من یەك پرسیارتان لێ دەکەم ئەگەر دەبزانن بەڕاستی وەڵامم بدەنەوە و ئەگەر ناشی زانن وەڵام مەدەنەوە ، ووتیان چـی دەپرسـیت بپرسـە ، ووتـی : ئایـا دەزانـن خـوای گـەورە پـێش محمد

پێغەمبەرانی تری هەبووە ؟ وتیان بەڵێ . ووتی : ئەزانن یان دیوتانە ؟ ووتیان بەڵکو دەیزانین .
ووتی : ئەی چیان بەسەرهات ؟ ووتیان : مردن ووتی : دەی محمدیش هەروەك ئەوان مردووە و منیش شاهیدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە (الله) و محمدیش پێغەمبەری خوایە .
ووتیان : ئێمەش شایەتی ئەوە ئەدەین کە هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە (الله) و محمدیش پێغەمبەری خوایە ، و وەشایەتیش دەدەین کەتۆ باشترینمان و گەورەمانیت و لەسەر ئیسلامەتی خۆیان ڕاوەستاو بوون . ئەمە هەڵوێستێکی مەزنی جارودی کوڕی مەعلی یە (خوای لێ ڕازی بێت) و بەهۆیەوە توانی عبدالقیسی هۆزەکەی لەسەر ئیسلام راوەستاو بکات و خوای گەورە ئەوەی هێنا بەخەیاڵیدا کە نموونە بە پێغەمبەرانی پێشتر بهێنێتەوە کە کۆتایی هەریەکەیان مردن بوو ، و پێغەمبەری خواش ﷺ هەروا دەبێت ، و ئابەوجۆرە هۆزەکەی ڕازی کردو گومانی لەدڵیاندا ڕەواندەوە ، ئەمەش یەکێکە لە چاکییەکانی لە ئیسلام تێگەیشتن و کاریگەری لەسەر پاراستنی بیرو باوەڕ بەتایبەت لە کاتی هەڵگیرسانی ئاژاوەدا. دانیشتوانی (جواثا) لەسەر ئیسلام ڕاوەستابوون ، یەکەم لادێ بوو کە پاش هەڵگەرانەوە (نوێژی هەینی) تێدا بەرپا بکرێت .
لەبوخاریدا هاتووە لە (ابن عباس) ەوە دەگێڕێتەوە کە هەڵگەراوەکان گەمارۆیان دان و تەنگیان پێ هەڵچنین و تاوایان لێکردن خواردنیان لێ گرتنەوە ، تا زۆر زۆر برسیان کردن و پاشان خوای گەورە هات بەهانایانەوە . ئەمەش یەکێکە لە هەڵوێستە مەزنەکانی وەستان لەسەر بیروباوەڕ و خۆگرتن لەژێر گەمارۆی دوژمناندا وەك چۆن (جواثا) خەریك بوو لەبرساندا بمرن بەڵام بەپشت بەستن بەخوای گەورە و سوربوون لەسەر بیروباوەڕ لەو نەهامەتی یە خوای گەورە ڕزگاری کردن.
ئەبوبکر صدیق (خوای لێ ڕازی بێت) سوپایەکی بەفەرماندەیەکی (عەلای کوری حەزرەمی (خوای لێ ڕازی بێت) نارد و کاتێ لە بەحرەین نزیك بوویەوە (ثمامة کوري اثال) بە هەموو هۆزەکەیەوە ڕۆشتە ناو سوپای ئیسلام و لەوناوچەیە دا موسڵمانەکان دەسەڵاتیان پەیداکردەوە و جارودی کوڕی مەعلیش بە کۆمەڵێ پیاوی جەنگاوەری ناوهۆزەکەیەوە پشتگیری سوپاکەی عەلای کرد و بوو بە سوپایەکی زۆر گەورەوە چوون بەگژی هەڵگەراوەکاندا و خوایش سەرکەوتنی خۆی بەخشی یە موسڵمانان و جگە لەوانیش کەسانی وەك (قیس کوري عاصم المنقري) و(عفیف کوري المنذر) و(مثنی کوري حارثه الشیباني) پشتی سوپاکەی عەلایان گرت کەرامەتێکی (علاء کوری

الحضرمي) : عەلا یەكێ بوو لەهاوەڵە مەزنەكان و زانایی و خواناسی و دووعـا گیرابـوونی تێـدا بووە ، هەموو لەسەر ئەوەن كەلەم جەنگەدا لەشوێنێكدا سوپاكە بـۆ حەوانـەوە بـەرین و تـەواو خەڵكەكە جێ گیرنـەبوون هـەر ئەوەنـدەیان حوشـترەكانیان بـەكۆڵ و بارەكانیانـەوە هـەڵاتن ، و خەڵكەكە بەبێ نان و ئاو و چەك و تفاق لـەوێ مابوونـەوە ، لـەو شـەوەدا یـەك حوشـتریان بـۆ نەمایەوە ، و موسڵمانەكان بەجۆری غەمباربوون كەباس ناكرێت ، و تاوایان لێهات هەنـدێكیان وەسیەت نامەیان بۆ یەكتری دەكرد ، و بانگ كەری عـەلا خەڵكەكـەی بـانگ كـرد و ئـەوانیش كۆبوونەوە و پێی ووتن : (ئەی خەڵكینە ئایا ئێوە موسڵمان نـین ؟ ئایـا لـەپێناوی خـوا لـەماڵ دەرنەچوون ؟ ئایا پشتیوانی خوانین ؟ ووتیان : بەڵێ و ئەویش ووتی : دەی مژدەتان بدەمێ خوای گەورە كەسانێ ئاوا نیەتیان بێـت نایـان فـەوتێنێ و فـەرمانی دا بـانگی بـەیانی دراو نوێـژیان دابەست ، پاش تەواو بوونی نوێژەكەی ، عەلا لەسەر ئەژنۆ ڕووەو قیبلەكەوت و خەڵكەكەش بەو چەشنە لەسەر چۆك دانیشتن ، دەستی بەرزكردەوە بۆ لای خواو خۆی و خەڵكەكە دەست یان كـرد بەنزاو پاڕانەوە ، بەردەوام بوون تا خۆركەوت و خەڵكەكە خۆریان دەبینی خـەریك بـوو لەهاتنـە دەرەوە دا بوو لەدەم كەل ، و هەر بەردەوام لەدوعاكردندا بوون و تا ئەوە بوو قۆنـاغێكی تـریش لەخۆركەوتن تێپەری و خوای گەورە هات و بەهانایانەوەو لەتەنیشتیانەوە كانی یەكی هەڵقوڵانـد و خەڵكە تینوەكەش پەلاماریان داو تێروپڕ ئاویان لێ خواردەوەو خۆیشیان لێ شـۆرد ، و كـاتێ خۆریش بەرزبوویەوە بینیان حوشترەكانیان لەهەموو لایەكەوە بەرەو ڕوویان هاتنەوە ، یەك شـتی سەرپشتیان وون نەبوو بوو و ئەوانیش حوشترەكانیان لەسەر چەشمەكە تێر ئاوكرد و ئەمەش یەكێ بوو لە بەڵگە گەورەكانی خوای گەورە بوو كەخەڵكی بەچاوی خۆی بینی لەم غەزایەدا.

- شكست هێنانی پاشگەزبووان : سوپای موسـڵمانەكان لەسـوپای پاشـگەزبوەكان نزیـك بوویەوە ، و دەبینن خەڵكێكی زۆریان كۆكردوتەوە ، و لەنزیك یەكەوە هەردوولاچادریان داكوتا ، موسڵمانەكان لەشەودا دەنگێكی زۆر بەرزیان گوێ لێ بوو لەسوپای بێ باوەڕانەوە بەرزدەبوویەوە ، بۆیە عەلا ووتی : ئەوە كەسێك نی یە بڕوات ئەو دەنگەمان بۆ ئاشكرا بكات ؟ عبدالله ی كـوری حذف ڕۆشتە ناویانەوە دەبینێ فول سەرخۆش و تەواو لەهۆش خۆ چوون ، سوك گەڕایـەوە دواوە و هەواڵەكەی بەعەلا گەیاندەوە ، عەلایش خێرا خۆی خستە ڕێ و دای بەسـەریاندا و ژمارەیـەكی

زۆری لێ کوشتن و کەمێکیان توانیان هەڵبێن ، و دەستی گرت بەسەر هەموو پارەو سامان و نەختینەکیاندا – کە دەستکەوتێکی زۆر گەورە بوو . حگم ی کوری پعلبھ کە برای بەنی قەیسی کوڕی پعلبھ و یەکێ لەگەورە پیاوانی ناو هۆزەکەبوو خەوتبوو ، کاتێ بەخەبەرهات هەرتێك چوو کە دەبینێ سوپای موسڵمانان دای بەسەریاندا و بەپەلە سواری ئەسپەکەی بوو زینەکەی بچرا هاواری کرد ئەوە کەسێ نی یە بۆم تن کاتەوە ؟ پیاوێك لەموسڵمانەکان بەوشەوە تاریکە ووتی من بۆت تن دەکەمەوە ، قاچت بەرز بکەرەوە کاتێ قاچی بەرزکردەوە ، دای لەقاچی و قرتاندی ، ووتی : دەی تەواو بمکوژە ؟ ووتی : شتی واناکەم ، ئەویش بەدەما کەوتە سەر زەوی و هەرکەس بیدایە بەلایدا پێی دەووت : بمکوژە و ئەویش نەیدەکوشت ، تا ئەوەبوو قەیسی کوڕی عاصم دای بەلایدا پێی ووت : من کوتەرەم بمکوژە ئەویش کوشتی ، کاتێ زانی قاچێکی نەماوە پەشیمان بوو لە کارەکەی ووتی : قوڕبەسەرم ، ئەگەر ئەم زانی ئاوایت دەستم بۆ نەدەبردی . پاشان موسڵمانەکان شوێن پاشگەزبووەکان کەوتن و لەهەرکوێدا دەیان بینین دەیان کوشتن و ئەوانەشی کە هەڵاتن زۆربوون و خۆیان گەیاندە ناوچەی (الدارین) – دورگەیەکی بچکۆلەبوو – بەکەشتی خۆیان گەیاندە ئەوێ . پاش ئەوەی عەلا (خوای لێ رازی بێت) دەستی کرد بە دابەشکردنی دەستکەوتەکان و گواستنەوەی ئەو سامانانەی بێ سەردەستی کەوتن ، و بەموسڵمانەکانی ووت : با پێکەوە بەرەو دارین بڕۆین تا بدەین بەسەر دوژمنانی خوادا و سوپاکەیش خێرا ئامادەیی یان دەربڕی و کەوتنە رێ تا کەناری دەریاو دەبینێ زۆر دوورن و دەبێ بەکەشتی بگەنە ئەوێ و کەشتیش مەحاڵ بوو دەست بکەوێت . بۆیە با ئەسپەکەی دای لەئاوەکەو فەرمووی : (( یا ارحم الراحمين ، ياحكيم ياكريم ، ياأحد ياصمد ، ياحي ياقيوم ، يا ذا الجلال والاكرام لا الة إلا أنت يا ربنا )). و فەرمانی دا بەسوپا ئەم دوعایەی لەگەڵدا بلێنەوە و پێکەوە بدەن لە دەریاکە هەموویان وایان کرد و بەیارمەتی خوا کەنداوەکەیان بڕی و وەك ئەوەی بەسەر چەوە ڕێزەدا بڕۆن ، ئاوەکە لە قاچی وڵاخەکانیان زیاتر بەرزنەبووبوویەوە ، ڕێگاکە بەکەشتی شەو و ڕۆژێك دەبوو ئەمانە یەك ڕۆژ چوونە ئەو بەر و گەڕایشنەوەو ئاسەواری دوژمنانی خوایان نەهێشت و بەسەلامەتی و بەدەستکەوت و دیلێکی زۆرەوە گەڕانەوە ، و لەو دەریا گەورەیەدا هیچ شتێك گوم نەبوو لە موسڵمانان جگە لە قەمچی یەکی یەکێ لە موسڵمانەکان نەبێت ، و کەچی عەلا

گەڕایەوە و ئەوەشی هێنایەوە و پاشان دەستی کرد بەدابەش کردنی دەستکەوتەکان و هەموو سوارێك شەش هەزار و پیادەیش دووهەزاری پێدا ، جوابی نارد بۆ ئەبوبکر (خوای لێ رازی بێت) لەو هەواڵە خۆشە ئاگاداری کرد ، و ئەبوبەکریش سوپاسنامەی بۆنارد لەسەر ئەو کارەچاکەی ، یەکێ لە سەربازە موسڵمانەکان دەربارەی بڕینی دەریاکە بەپێ و بەبێ کەشتی بە شیعرەوە عفیف ی کوڕی منژر دەڵێت :

الم تر ان الله ذلَّ بحره وانزل بالكفار احدى الحلائل

دعونا الى شق البحار فجاءنا باعجب من فلق البحار الاوائل

واتە : ئایا نابینن خوای گەورە چۆن دەریای بەکارهێنا و بەموعجیزەیەکی گەورە کافرانی لەناوبرد ... پێیان وتین بدەین لە دەریاو ئێمەش لێمان دا .. و بەحرەکە بۆمان تەخت بوو سەرسوڕهێنەرتر لەلەت بوونەکەی کاتی خۆی — لەسەردەمی موسی پێغەمبەردا — علیه وعلى نبينا السلام - . موسڵمانەکان زیاتر لەکەرامەتێك لەعلا ءوە دەگێرنەوە کە خوای گەورە لەسەر دەستی نواندوویەتی لەوانە : کابرایەکی خەڵکی (هجر) ڕاهیبێکی گاورەکان بوو لەوکاتە موسڵمان بوو ، لێیان پرسی : چۆن موسڵمان بوویت ؟ ووتی : ترسام ئەگەر موسڵمان نەبم خوای گەورە لەمرۆڤی بمسرێتەوە چونکە بەڵگەی زۆرم بەچاوی خۆم بینی و دەڵێ : گوێم لێ بوو لەهەواداو لە بەرەبەیاندا دوعایەکم بەرگوێ کەوت کە دەیووت : ﴿ اللهم انت الرحمن الرحيم ، لا اله غيرك والبديع ليس قبلك شيءٌ ، والدائم غير غافل ، والذي لايموت ، وخالق كل ما يرى وما لا يُرى ، وكل يوم أنت في شأن ، فعلمت اللهم كل شيء علماً ))

واتە : ئەی خوای من ، تۆ بەسۆزو بەبەزەییت ، هیچ خوایەك نی یە جگە لە تۆ ، داهێنەری و پێش تۆ هیچی تر نەبووە ، هەمیشەییت و هەرگیز بێ ئاگایی نایەت بەسەرتدا ، وهەرگیز نامرێت ، دروست کەری هەموو شتێکی بینراو نەبینراوی ، و هەموو ڕۆژی تۆ ئیش وکاری خۆت بەرێوە دەبەیت و زانست هەموو شتێکی گرتۆتەوە ) . ئەو پیاوە دەڵێت : بۆم دەرکەوت ئەم خەڵکانە هەرگیز فریشتە یارمەتیان نادات ئەگەر لەگەڵ خواڕاست نەکەن ، و زۆر بەجوانی موسڵمان بوو ، و هاوەڵانیش گوێیان بۆ دەگرت . پاش تێك شکاندنی پاشگەزبووەکان عەلای کوری حەزرەمی (خوای لێ رازی بێت ) گەڕایەوە بۆ بەحرەین ، و ئیسلامی بەرپاکردەوە و

ئیسلام و موسڵمانان سەربەرزبوونەوە و بێ باوەڕی شوێن کەوتوانیشی سەرشۆڕبوون . و ئەگەر دەست تێوەردانی هێزەکانی بێگانە نەبوایە ، هەرگیز هەڵگەڕاوەکان غیرەتی ئەوەیان نەبوو بەو جۆرە لەبەردەم سوپای باوەڕدا خۆیان بگرن بۆ ماوەیەکی زۆر ، ئەوەبوو فارسەکان بە نۆ هەزار جەنگاوەرەوە هاوکاری هەڵگەڕاوەکانیان دەکرد کە ژمارەی هەڵگەڕاوە عەرەبەکان لەسێ هەزار پتر نەبوو ، و ژمارەی موسڵمانەکان چوار هەزار بوو ، (مثنی کوري حارثە الشیبان) ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پشتگیری کردنی عەلای کوری حەزرەمی دا لە کوژانەوەی ئاشوبی بەحرەین ، و بەسەربازەکانی یەوە و لەڕووی باکورەوە دەستی گرت بەسەر (قطیف و هجر) و تا گەیشتە سەرچەشمەی دیجلە و لەو ڕێگەیەشدا هێزەکانی فارس و هاوکارە هەڵگەڕاوەکانیان لەعەرەبی لەناوبرد و بەخۆی هەموو ئەوانەی لەسەر ئیسلام مابوونەوە خۆی کرد بەناو سوپاکەی عەلادا و بەردەوامیش لە باکوری کەنار دەریاوە خۆی گەیاندە ئەو هۆزانەی کەلە نێوان هەردوو ڕووبارەکەدا دەژیان و قسەی لەگەڵ کردن و پەیمانی لێ وەرگرتن . کاتێ صدیق (خوای لێ رازی بێت) لە قەیسی کوری عاصم ی پرسی دەربارەی موسەنناى کوری حارسەی شەیبانی ، لەوەڵامدا ووتی : ئەمە پیاوێکە ناوی وون نابێت ، نەژادی نادیار نی یەو پشتی لاواز نی یە ئەمە (مثنی کوری حارثە الشیبانی)یە. ئەبوبکر (خوای لێ رازی بێت) هەلی لەکیس خۆنەدەدا و دەروونەکانی هەڵدەنا تا کارەکان باشترین و بەرزترین بەرهەمیان هەبێت ، و هەوڵی دەدا هەموو توانا شاراوەکانی پیاوان بخاتە کار بۆ نەهێشتنی ئەو سەرکەشی یەی کە لەمێشکی هەندێ لەسەرۆك هۆزەکاندا کە بێباوەڕبوون هێلانەی کردبوو .

## جێ باسی چوارەم

## موسەیلەمەی درۆزن و بەنو حەنیفە

یەکەم : پێشەکی و پێناسەیەکی ئەو پیاوە : ناوی موسەیلەمەی کوری پهمامەی کوری کەبیری کوری حبیب ی حەنەفی ئەبوشامەیە ، یەکێکە لەو پیرانەی کە خۆی بە پێغەمبەر دەزانی و لە پەندی پێشینیاندا هاتووە دەڵێت ( لەموسەیلەمە درۆزن ترە ! ) . لە یەمامە لەدایك بووە و هەر لەوێش گەورە بووە لەلادێ یەك کەئەمرۆ پێی دەڵێن (جەبیلە) ی نزیك (عینیة) لەدۆڵی حەنیفە لەناوچەی نەجد ، و لەسەردەمی نەفامیدا پێیان ووتووە (ڕەحمان) و دواتریش ناوی نراوە (ڕەحمانی

یەمامە) !. دەستی کرد بەگەڕان بەناو عەرەبەکان و فارسەکاندا و هەوڵی فێربوونی هەموو ئەو هۆکارانەی دەدا کە لەڕێگەیەوە بتوانێت خەڵکی بخاڵەتێنێت و بۆلای خۆی ڕایان بکێشێت ، وەك سەردانی خێڵەکانی (کێوی سیدنە) و (حەوا) و کتێب گرەوەو ناولەپ خوێندنەوەو فالچی و جادوگەرەکانی بەسەردەکردەوە ، و ئەوانەی کە پەیوەندیان بە جنۆکەوە هەبوو و هەندێ درۆ و دەلەسەیان ڕێك دەخست لە وانە گوایە دەتوانێت باڵی قرتاوی کۆتر بگەیەنێتەوە ، و هەروەك هێلکە بەساقی بخانە ناو شوشەوە . موسەیلەمە پێغەمبەرایەتی خۆی ڕادەگەیاند لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەککە بوو ، خەڵکی دەنارد یان خۆی گوێی بۆ دەگرت کاتێ ئایەتی بۆ خەڵکی دەخوێندەوە تا ئەویش لەسەر هەمان شێوە ئایەتی لەو چەشنە هەڵبەستێت و بڵێت لەلای خواوە بۆم هاتووە . لەساڵی نۆیەمی کۆچیدا کە ئیسلام بەتەواوەتی باڵی کێشابوو بەسەر کەنداوی عەرەبیدا ، خێڵی ئەبو حەنیفە شاندێکیان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند و موسەیلەمەش یەکێك بوو لەو شاندە . (ابن اسحاق) دەڵێت : موسەیلەمە یەکێك بوو لەو شاندەی کەهاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بەجل و پۆشاك دایان پۆشیبوو ، کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەگەڵدا کرد پێ ی ووت : ئەم پەلە دارخورمایەی بەدەستمەوەیە ، داوام لێ بکەیت ناتدەمێ ((لو سألتني هذا العسيب ما أعطيتكم)) ، کەوا دیارە لەو دانیشتنەدا داوای لێ کردووە لە پێغەمبەرایەتی یان لەجێ نشینی دوای خۆیدا بەشداری بکات . لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە موسەیلەمە لەگەڵ وەفدەکەدا بوو بەڵام لەلای شت ومەکەکانیان هێشتیانەوە و نەهات لەگەڵیان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ یارمەتی بەسەردا دابەش کردن بەشی موسەیلەمەشی داناو فەرمووی : (( إنه ليس بشرّكم مكانا)) واتە : ئەو خراپترینتان نی یە لە پلەوپایەدا ، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە کاری پارێزگاری کردنی شت و مەکەکانیانی گرتبووە ئەستۆ . لە ڕیوایەتەکەی یەکەمدا وا دیارە ئەم موسەیلەمەیە کەسێکی گومان لێکراوبووە کە بەجل و عەبا خۆی داپۆشتووە وەك بڵێ ی شتێکی لەناوخۆدا حەشاردراوەو لەناوچاویدا شت بەدی دەکرا ، ئەو پیاوە لە ژیانیدا هەروابووە ، و مەبەست لە ووشەی (ليس شركم)) مانای ئەوە نییە کە باشترینیانە بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئەوان هەموو خراپن بەڵام ئەو لەهەموویان خراپتر نییە بەڵکو ئەویش خراپێکە وەك ئەوان ،

لەڕاستیشدا ڕۆژگار دەری خست کەبەنی حەنیفە زۆربەیان خراپ بوون و ئەو گەورە کردنی ئەم خراپەکاریەی خستە ئەستۆ .

١. گەرانەوەی شاندی (ابوحەنیفە) :

هەر کەوەفدەکەی بەنی حەنیفە گەڕانەوە بۆ یەمامە ، موسەیلەمەی درۆزن پێغەمبەرایەتی بۆ خۆی ڕاگەیاند و ئەوەشی ڕاگەیاند کە لە پێغەمبەرایەتیدا هاوبەشی پێغەمبەری خوایە ﷺ : و ئەم فەرموودەیەی گرتبوو بە دەستی یەوە (إنه ليس بشركم) . ئیترلەناو هۆزەکەیدا بلاوی کردەوە کە پێغەمبەرەو هەندێ ڕستەی لەسەر هاوشێوەی قورئانی پیرۆز دادەنا و بەئارەزووی خۆی حەلاڵ و حەرامی دیاری دەکرد . یەکێ لەو ووتانەی کە حاشا لله دەیووت قورئانە و لەلای خواوە بۆی هاتووە ئەمەبوو (( لقد انعم الله على الحبلى ، أخرج منها نسمة تسمى ، من بين صفا و حشا ، منهم من يموت ويدس في الثرى ، ومنهم من يبقى الى أجل مسمى ، والله يعلم السر واخفى )). و جارێ تر دەڵێت (( يا ضفدع بنت ضفدعين ، نفى ما تتقين ، راسك في الماء وذنبك في الطين ، لا الشارب تمنعين ، ولا الماء تكدرين )) موسەیلەمەی درۆزن ویستوویەتی شێوازی قورئانی بدزێت و ماناکەی تێك بدات و بەشێوەیەکی نارێك و شێواو پیشانی بدات وەك دەڵێت : (( سبحان الله اذا جاءت الحياة كيف تحيوك ؟ والى ملك السماء ترقون ، فلو انها حبة خردلة ، لقام عليها شهيد يعلم مافى الصدور ، ولاكثر الناس فيها ثبور )) پروپوچی ووتەکانی موسەیلەمە لەکەس شاراوە نەبوو ، تەنانەت لەخۆیشیان ، و (ابن كثير) دەڵێ عەمری کوری عاص - پێش موسڵمان بوونی — گەیشت بە موسەیلەمەو لێ پرسیبوو : ئایا چ ئایەتێك دابەزیوەتە سەر محمد ؟ عەمر پێ ی ووت : (خوا سورەتی (العصر) ی بۆناردووە . موسەیلەمەش ووتی : ڕێك وەك ئەوەش بۆسەر من دابەزیوە کە دەڵێ : (( ياوبر ، ياوبر ، انما انت اذنان وصدر ، وسائرك صفر نقر، عەمریش پێ ی ووت : بەخوا خۆت چاك دەزانیت من ئەزانم تۆ درۆزنیت. (ابن كثير) لەسەر ئەم وەلامەی عەمر بۆ موسەیلەمە دەڵێت : موسەیلەمە بەم قسە گێلانەیەی دەیوویست بەرامبەرکێ ی قورئان بکات ، بەلام لە بت پەرستێکی ئەو سەردەمەش شاراوە نەبوو کە پروچ و گێلانەیە . ئەبوبکر الباقلانی لەسەر ئەم ووتانەی موسەیلەمە دەلێت : ئەم ووشانە زۆر لەوە کەمترو پوچ ترن کە خۆمانی پێوە خەریك بکەین ، بەلام ئەو چەند ووشەیەمان بۆیە هێنا تا

ئەم نەگبەتە کردی لەوکارەی موسەیلەمەکردی ترسناکترو گومڕاکەرتر بوو. پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە رەجال ئاخر شەڕ دەبێت ، ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێت) دەگێڕێتەوە و دەڵێت : ( کۆمەڵێ کەس لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دانیشتبووین کە رەجالی کوری عنفوەشمان لەگەڵ بوو ، فەرمووی ( ان فیکم لرجلاً ضرسه في النار اعظم من اُحد ) واتە : پیاوێك لەناوتانایە لە ئاگری دۆزەخدا دانی لە کێوی ئوحد زلترە ، ئەبو هریرە دەڵێت : ئەو کۆمەڵە هەموو تیاچوون تەنها من و رجال نەبێت ، من زۆر ئەترسام ئەو کەسە من بم ! ، تا ئەوەبوو رەجال شوێن موسەیلەمەکەوت و شایەتی پێغەمبەرایەتی بۆداو ئەو ئاشوبەی رەجال هەڵیگیرساند لە ئاشوبی موسەیلەمە خۆی گەورەتر بوو .

دووەم / لەسەر ئیسلام دامەزراوەکانی ناوبەنی حەنیفە :

هەواڵی موسەیلەمە و پاشگەزروونەوەی زۆری لەهۆزەکەی زاڵ بووە بەسەر باسکردنی ئەو کەسانەدا کە لەسەر ئیسلام دامەزراو بوون ، و زۆری لەسەر نووسەرەکان خۆیان نەداوە لەباس کردنی ئەو کەسانەی کە بەپاکی و موسڵمانەتی مانەوەو لەڕووی موسەیلەمە دا وەستان و پشتگیری سوپای خەلیفەیان کرد لە کاتی هەوڵی لەناوبردنی ئەو ئاژاوەیەدا ، وەمن هەندێ ریوایاتی باوەڕ پێکراوم بەرچاوکەوتووە کە تیشك دەخاتە سەر ئەم ڕاستی یەی کە لە زۆری لەخەڵکی بەدی ناکرێت . (ابن اعثم) باس دەکات کە لەوانەی لەسەر ئیسلام ڕاوەستاوبوون لە یەمامە (ثمامە کوری أثال) بوو ، کە لە بەناوبانگەکانی ناو ئەبو حەنیفە بوو ، بۆ کاتێ خالید کوری وەلید (خوای لێ رازی بێت) ویستی بەرەو ئەوی بڕوات خەڵکەکە لە (ثمامە) کۆبوونەوە چونکە گەورەو دەمڕاست بوو ، خاوەنی ژیری و تێگەیشتن و ڕای دروست بوو ، دژی موسەیلەمەبوو لەمەسەلەی هەڵگەڕانەوەکەیدا ، و بەوکەسانەی شوێن موسەیلەمە کەوتبوون ووتی : ( وای بەحاڵتان ئەی (بنی حنیفە) گوێ بۆ قسەکانم بگرن رێ پێشندراو دەبن ، و گوێڕایەڵیم بکەن بەئاگادەبن ، و بزانن کەمحمد نێردراو و پێغەمبەری خوا بووە بەبێ شك ، و موسەیلەمەش پیاوێکی درۆزنە ، بە قسەو درۆکانی مەخەڵەتێن ، خۆ ئێوە ووتەی خوای گەورەتان بیستووە کەمحمد هێناویەتی لەخواوە کە دەفەرموێت (( حم * تنزيل الكتاب من الله العزيز العليم * غافر الذنب وقابل التوب * شديد العقاب ذي الطول لا اله الا هو اليه المصير ))

. ئەم ووتە جوانانە لە کویْ و ووتەکانی موسەیلەمەی درۆزن لـە کـویْ ؟ بڕواننـە کارەکانتـان و ئەمەتان لەبیرنەچێت ، وەمن ئەم شـەو خـۆم دەگەیەنمـە خالیـد و داوای ئـەمانی بۆخـۆم ومـالْ ومندالْم لیْ دەکەم ، .... ) . وەلاّمی ژێرو ڕێنموونی کراوانـی هۆزەکـەی ئەمـەبوو : (ئێمـەش لەگەلْتاین ئەی (ابو عامر) و ئەمەش چـاك بزانـە) . و (ثمامـە) یـش لـەنیوەی شـەودا خـۆی و کۆمەلْیْ لەهۆزی بەنو حنیفە خۆیان گەیاندە خالیـدی کـوری وەلیـد و داوای ئـەمانی لیْکـرد و ئەویش ئەمانی خۆی و هاوڕێکانی دا ، و لەریوایەتدا هاتووە کە (ثمامە) ڕۆلێکی گرنگی هەبوو لە جەنگ دژی موسەیلەمە و یارمەتی باشی عەکریمەی کوری ئەبوجەهلی دا وە لەم کارەگرانەیدا . هەروەها (ثمامە) کۆمەکی باشی (علاء بـن الحضرمي) کـرد لـە جـەنگی دژی پاشـگەزبوانی بـەحرەین ، و موسـلْمانەکانی بـەنی حەنیفـەی بـەدواوە بـوو و ئـەو یـەکیْ بـوو لەوسـەرکردە خۆمالْیانەی کە دژی هەلگەراوەکانی ناو هۆزەکەی لەپشتی عەلای کوری حەزرەمی (خـوای لـیْ رازی بێـت) وەسـتا و . یـەکیْ تـر لەوکەسـانەی لەسـەر ئیـسلام ڕاوەسـتاوبوون لـە یەمامـە (موعەمەری کوری کیلابی رومانی بوو ، ئامۆژگـاری موسـەیلەمەو هـۆزی بـەنی حنیفەیـشی دەکرد کە ڕێگەی پاشگەزبوونەوە نەگرن و دراوسیْ ی (ثمامە ی کوری ئە ثـال ) بـوو و بەشـداری شەری یەمامەی کرد لەگەلْ خالیدی کوری وەلید دا . هەروەها لەگەورە پیاوانی یەمامە ئەوانەی لە ژێرەوە بەموسلْمانەتی مابوونەوە : ئیبن عەمری یە شکوری کە یەکیْ بوو لە هاوڕێکانی رەجال ی کوری عەنفوە ، هۆنراوەی زۆریشی لەناو یەمامەیەکاندا بلاّودەکردەوە لەسەر سووربوون لەسەر بیروباوەری ئیسلامەتی . لەو هۆنراوانە :

| | |
|---|---|
| ان ديني دين النبي وفي القوم | رجال على الهدى امثالي |
| اهلك القوم محكم بن طفيل | و رجال ليسوا لنا برجال |
| ان تكن ميتتي على فطرة | الله حنيفا فانني لا أُبالي |

ئەم هۆنراوانە گەیشتنەوە دەمی موسەیلەمەو محکم و گەورە پیاوانی یەمامە چـوون بـۆی بـەلاّم لەدەستیان دەرچوو ، خۆی گەیاندە خالیدی کوری وەلید و هەوالْی وردی یەمامەی پیْ گەیاندە و خالْی لاوازی دایە دەستی . یەکیْ تر لەو ڕاوەستاوانە لەسەر بیروباوەری ئیـسلام لـە یەمامـە : عامری کوری موسەیلەمەو تاقمەکەی. ئەبوبەکریش (خوای لیْ رازی بێت) رێزی تایبـەتی گـرت

لەوکەسەناودارانەی نـاوهۆزی بـەنی حەنیفـە کـە لەسـەر ئیـسلام دامـەزراو بـوون و ئەمـەش خزمەکانیشی دەگرتنەوە لەوانە : دامەزراندنی مگرفی کوری نوعمان کە برازای (ثمامـە ی کـوری ئە ثال ) و (عـامری کوری موسەیلەمە) بوو کە ئەو دوانە لە ئاژاوەی هەڵگەڕانـەوەی یەمامـەدا بەموسڵمانەتی مانەوە و پشتگیری سوپای ئیسلامیان کرد بەوالی لەسەر شاری یەمامە

سێیەم / خالیدی کوری وەلید و سوپاکەی بەرەو موسەیلەمەی درۆزن :

ئەبوبکر (خوای لێ رازی بێت) فەرمانی بەخالید کردبوو کە کاتێ لە پاکسازی ئەسەد و غطفان و مالیکی کوری نوێرە بوویەوە ، بەرەو یەمامـە بکەوێتـە رێ و ئەمـەی لـێ دووپـات کـردەوە . شەریك العزاری — ئەوهاوەڵەی کەنامەبەربوو لە نێوان ئەبوبکر و خالیدا دەڵێت : (( مـن یـەکێ بووم لەوانەی لە نوزاخە بەشـداریم کـردو هـاتم بـۆ لای ئـەبوبکر ، و فـەرمانی پـێ دام کـەخۆم بگەیەنمە خالید و ئەم نامەیەشی پێدا ناردم بۆی : ( پاشان بە نامەکەتـدا کـە بـە نێردراوەکـەدا ناردت بۆم بۆم دەرکەوت کەخوای گەورە لە بوزاخە دا زاڵـی کـردن بەسـەر هەڵگەڕاوەکانـدا ، و ئەوەشی بەئەسەد و یەمامەت کرد ، و تۆ بەردەوام بەرەو یەمامە بەڕێ بکـەوەو ئەمـەو زمـانی منە بۆتۆ لەو خوایە بترسە کە تەنهایەو هاوبەشی نی یە ، و نەرم و نیان بـە لەگـەڵ جـەنگاوەرە موسڵمانەکانی هاوڕێت ، و ببە بە باوك بۆیان ، دەخیلت بم ئەی خالیدی کـوری وەلیـد نەتـەوێ لێیان غیرەتی بەنی موغیرەت بۆ بەکاربێنن ، و من بەهۆی تۆوە تاوانباربووم کە بـەهۆی کەسـی ترەوە ئەوەم بەسەر نەهاتووە ، ئاگاداری بەنی حەنیفە بە کاتێ دەگەیت پێیان - انشاء الله — تا ئێستا لەگەڵ کەسدا بەجەنگ نەهاتوویت چەشنی ئـەوان ، و ئەوانـە هـەموویان شـەڕت لەگـەڵ دەکەن و ناوچەکەشیان پان و پۆڕە ، کە ڕۆشتیتە ئەوێ لەخۆتەوە دەست پێ بکـەو جـەنگاوەرێك بخە لای ڕاستت و دانەیەکی تر بخە لای چەپت و یەکێ تریش بخە سەر وڵاخەکەی خـۆت ، تـابۆت ئەکرێ ڕاوێژ بکە بە گەورە پیاوانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە پـشتیوانان و کۆچـەریان ، ناوداری و گەورەیی یان پێ بزانە ، و ئەگەر گەیشتنە دوژمنان و ئەوان ڕیزبوون ، ئێـوەش هـەر ڕیزەو هاوشێوەی خۆی بۆ دانێ ڕم بۆ ڕم و شمشێر بۆ شمشێر و تیر بۆ تیر ، و بدە لەملی دیلیـان و کوشتارێکی خەسیان بکەو بەئاگر بیانسوتێنە ، و نەکەی پێچەوانەی فەرمانەکانی من بکەیت ، و سڵاوت لەسەر بێت کاتێ خالید نامەکـەی خوێنـدەوە وتـی : گـوێگر و گوێرایـەڵیش دەبم .

خالیـد بـەرەو جـەنگی ئـەبو حەنیفـە کەوتـەڕێ لەیەمامـەو موسڵمانانیـشی بـۆ خـستە ڕێ و فەرماندەی پشتیوانان (ثابت کوری قە یس) بوو ، کە دەیداڵلای هـەر پاشـگەزبووەیەکدا تـێ ی دەکوتا ، ئەبوبکریش (خوای لیّ رازی بیّت) سوپایەکی چاکی پرچەکی مەشق پیّ کراوی خستەڕێ تا پشتگیر بیّت بۆ سوپاکەی خالید و کەس لە دواوە زەبریان پیّ نەدات .لە ڕیّگای سوپای خالید گەیشت بەهەندێ تیرەی عەرەبی کە پاشگەزبووبوونەوە ، جەنگا لەگەڵیاندا و موسڵمانی کردنەوە ، و لەویّش گەیشت بە پاشماوەکانی سوپا تیّك شکاوەکەی سـەجاح و دای بەسـەریاندا و لـەناوی بردن و لەویّوە بەرەو یەمامە کشا . هەر کـە موسـەیلەمە هـەواڵی سـوپای خالیـدی بیـست و بەخۆی و سوپاکەیەوە لەناوچەیەکدا بەزی و سەربازگەی دروست کرد پیّ ی دەوتریّـت (عقربـاء). لەنزیکی یەمامە و خەڵکی هاندەدا بۆ بەرەنگاربوونەوەی خالید و هەموو خەڵکی یەمامە هـاتن بەدەمی یەوە و ئەویش لایەکی سوپاکەی دایە دەستی موحکەم کوری توفەیل و لاکـەی تریـشی دایە دەستی رجال ی کوری عـەنفەوە - شایەتی درۆ - خالید گەیشت بەعەکەریمە و شەرحەبیل و پیّشەوەی بەرەکانی سوپای دایە دەستی شەرحەبیل و ئەم لاولاکەشی دایە دەستی زەیـدی کـوری خەتاب و عوتبەی کوری ڕەبیعە.

أ — مەجەعای کوری مەرارەی حەنەفی دەبیّتە دیلی موسڵمانان :

پیّش سوپاکەی موسەیلەمە نزیکی ٤٠-٦٠ چەکدار بوون و مەجاعەی کوری مەرارە فەرماندەی بوو — کەڕۆشتبوون بـۆ تۆڵەسـەندنەوە لەبـەنی تـەمیم و بـەنی عـامیر و لـەکاتی گەڕانەوەیـدا موسڵمانەکان گرتنیان و هیّنانیان بۆ لای خالید و داوای لیّبوردنیان لیّکرد و ئەویش متمانەی پیّ نەکردن و فەرمانی دەرکرد هەموویان بکوژن جگە لە مەجاعە نەبیّت . و لـەناوکۆت و زنجـیرەدا هیّشتیەوە چونکە شارەزایی یەکی باشی هەبوو لەفیّڵ و تەڵەکەی جەنگی دا ، و یـەکیّ بـوو لـە گەورە پیاوانی بەنی حەنیفە و پیاوماقۆلیّکی و قسە ڕۆیشتووبوو . دەڵیّن : کاتیّ خالیـد گـرتنی لیّ ی پرسین : ئەی بەنی حەنیفە ئیّوە بۆ چوونتان چۆنە ؟ ووتیان : ئیّمە دەڵیّین : پیّغەمبەری خوا ﷺ لە ئیّوەو پیّغەمبەریّك لە ئیّمە ، و ئەویش هەموویانی کوشت . لەڕیوایەتیّکی تردا خالیـد لیّی پرسیبوون : کەی بەئیّمەتان زانیوە ؟ ووتیان : پیّمان نـەزانیوویت ، بـەڵکو بۆتۆڵەسـەندنەوە دەرچووین لەبەنی تەمیم و بەنی عامیری چواردەورمان ، بەڵام خالید باوەڕی پیّ نەکردن بەڵکو بە

جاسوسی موسەیلەمەی زانین و فەرمانی کوشتنی هەموویانی دەرکرد ، و ئەوانیش ووتیان : سبەینێ تۆ بەچاك یان بە خراپ لەگەڵ یەمامەدا بەجەنگ دێیت ، ئەم پیاوە بهێڵەوە مەبەستیان مەجاعە بوو کەگەورەیان بوو ، ئەویش ئەوی هێشتەوەو ئەوانی کوشت. لەبەر ئەوەی مەجاعە ناودار و سەرگەورەیەکی بەنی حەنیفە بوو ، خالید لەهەرکوێ ببەزینایە ڕێزی لێ دەگرت و لەگەڵی نانی دەخواردو قسەی لەگەڵیدا دەکرد ، ڕۆژێکیان لێی پرسی : باسی هاوڕێکەتام بۆ بکە - مەبەستی موسەیلەمە بوو - چیتان بۆ دەخوێنێتەوە ؟ و ئایا هیچت لەوبارەیەوە لەبەرە ؟ ووتی : بەڵێ ، و هەندێ قسە ڕیزکراوەکانی بۆ ووت ، خالیدیش دەستەکانی خۆی کێشا بەیەکدا و هاواری کرد : ئەی موسڵمانان گوێ بگرن بۆ دوژمنی خوا چۆن دەیەوێت بەرامبەرکێ ی قورئان بکات ، پاشان ووتی : ئەی مەجاعە من تۆ بەپیاوێکی ژیرو سەرگەورە دەزانم گوێ بگرە بۆ قورئان و پاشان خۆت حوکم بدە ئەو دوژمنەی خوا چۆن نەیاری ی قورئان دەکات ؟ و خالید سورەتی (سبح اسم ربك الاعلى) ی بۆ خوێندو مەجاعەیش ووتی : کابرایەکی خەڵکی بەحرەین خوێندەواری هەموو ، موسەیلەمە نزیکی کردەوە لە خۆی بەڕادەیەك کەس وەك ئەو لێی نزیك نەبوو ، و پاشان هاتە ناومان ووتی : ئەوە چیتانە خەڵکی یەمامە ئەم هاوڕێ یەتان وەڵڵاهی درۆزنە ، و واش نازانم ئێوە من بە دوژمنی ئەو بزانن خۆ ئێوە پلەو پایەی من چاك دەزانن لەلای ئەو ، ئەو وەڵڵاهی دروتان لەگەڵ دەکات و لەسەر ناڕەوایی پەیمانتان لێ وەردەگرێت ، خالید ووتی : ئێ ئەم بەحرانی یە چی بەسەر هات ؟ ووتی : هەڵات لە دەستی ، و بەردەوام دروکانی موسەیلەمەی ئاشکرا دەکرد تاوای لێهات لەخۆی ترسا کە بیکوژن بۆیە رای کردەوە بۆ بەحرەین . خالید ووتی : ئێ کەمێکی ترمان بۆ باس کە لە دروکانی ئەو بۆگەنەو مەجاعەیش هەندێ ڕستەی تری بۆ ووت - و خالیدیش ووتی : ئەی ئەم قسانەی لەلای ئێوە ڕاست بوون ؟ باوەڕتان پێی هەبوو ؟ مەجاعەیش ووتی ئەی ئەگەر باوەڕمان پێ ی نەبێت چۆن سبەینێ دە هەزار جەنگاوەر لە پشت سەریەوە لەگەڵ تۆ دەکەن و تا مردن شمشێربازیت لەگەڵ دەکەن . خالیدیش ووتی : دەی کەوایە ئێمە خوامان بەسە بدەین بەگژتاندا و ئاینەکەی سەر بەرزبکات ، ئێوە لەگەڵ خوا دەجەنگێن و مەبەستان ئاینەکەیەتی ئەم وەڵامە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی باوەڕی دامەزراوی خالیدو متمانەی تەواوی بەخوای (عزوجل) . ئەم باوەڕە مەزنە و متمانە بێ

سنوورەی خالید بە سەرکەوتنی خوای گەورە وای لیّ کردوە کە کانی زیرەکی بواری جەنگی تیّدا بتەقیّت و هونەری سەرکردایەتی لیّ هاتوویی فیّرببیّت ، لەبوزاخەدا بەدوو شمشیّر دەجەنگا تا لەدەستیدا هەردووکیان قرتان ، باوەڕ دڵی پڕکردبوو ، شانازی تەنها بەخواوە دەکرد ، و ئەوەش بەس بوو کە هەیبەتی دوژمنانی لەدڵیدا بشکیّت و هەیبەتی خۆی بەریّتە دڵی دوژمنەکانی ، و ئەوەش یەکەمین ڕیّگابوو بۆ گەیشتن بەسەرکەوتنی یەکلاکەرەوە و تیّك شکاندنی قورسی دوژمنان .

ب- جەنگی دەروونی پیّش جەنگەکە :

خالید نەخشەیەکی وای دارشتبوو کە پیّش ئەوەی شمشیّرکاری خۆی بکات جەنگی دەروونی بەرپا بکات ، زیادی کوری لەبیدی نارد بۆلای مەحکەمی کوری توفەیل کە هاوریّی یەکتری بوون ، و بەمەبەستی ئەوەی بۆلای خۆیانی ڕابکیّشیّت ، و خالید ووتی : بەزیاد شتیّك بنیّرە بۆ مەحکەم بەڵکو دەروونی بشکیّنی ، زیادیش نامەیەکی بۆ نووسی و ئەم چەند دیّرە شیعرەی تیا بوو :

ويل اليمامة ويلاً لا فراق له ان جالت الخيل فيها بالقنا الهادي

والله لا تثني عنكم اعنتها حتى تكونوا كاهل الحجر او عادِ

هەروەها خالید عومەیری کوری صالح ی بەشکوری نارد بۆ ناو هۆزەکەی کە لەژیّرەوە بەموسڵمانەتی مابوویەوە — پیّی ووت : بڕۆ بۆ ناو هۆزەکەت ، ئەویش ڕۆشتە ناویان ووتی : خالید بە پشتیوانان و کۆچەریان دەوریان داوون ، ئەوانە گەلیّکن چەندی خۆتان بگرن لە بەردەمیاندا ، هەرسەکەوتن بۆ ئەوانە ، ئەگەر ئیّوە لەوان زۆرتر بن ، ئەوان

کۆمەکی پشتەوەیان لەهی ئیّوە زیاترە ، ئیّوەو ئەوان نابن بەیەکیّ ؟! ئیسلام وەرگیرا وە بەلاّم بیّ باوەڕی لە لەناوچووندایە ، هاوریّکەیان بەراستی پیّغەمبەرە بەلاّم هاوریّ کەی ئیّوە درۆزنە ، ئەوان خۆشحاڵن ، بەلاّم ئیّوە مەغروورن ، ئیّستا هەلە بۆتان شمشیّر لەکیّلاندایە و تیر نەهاویّژراوە ، پاشان خالید هەمان کاریشی لەگەڵ (ثمامە کوري أثال) یشدا کردو ڕۆشت بۆ ناو هۆزەکەی — ابو حەنیفە- داوای لیّکردن کە خۆیان بدەن بەدەستەوە و وورەی دەڕووخاندن و ووتی : هەرگیز لە یەك کاتدا دوو پیّغەمبەر نایەت ، و محمد پیّغەمبەرە و هیچ پیّغەمبەریّکی تر لەدوای ئەو نایەت ، ئەبو بکر سەرکردەیەکی وای بۆ ناردوون کە بەناوی خۆی و باوکی یەوە بانگ ناکریّت بەڵکو

پێی دەڵێن : (شمشێری خوا) ! ، و شمشێر گەلێکی زۆری لەگەڵدایە ، و دەی ئیتر ئێوەش خەمی خۆتان بخۆن. خالید زۆر گرنگی دەدا بە دارشتنی پلانی توندو تۆڵ و هەرگیز دوژمنەکانی خۆی بەکەم نەدەزانی ، و هەمیشە لەگۆڕەپانی جەنگدا لەئەو پەڕی ئامادەب باشیدا بوو لەترسی ئەوەی نەوەك دوژمنان لەناکاودا و ناپاکانە بدەن بەسەریاندا ، و بەجۆری وەسفی دەکەن کەهەرگیز لە گۆڕەپانی جەنگدا نەخەوتووە مەگەر بەچەك وتفاقی تەواوەوە و هەردەم لە دوژمنەکانی بێ ئاگانەبووە . لەجەنگی لەگەڵ موسەیلەمەدا — پێش جەنگی غفرباو — موکنەفی کوری زەید و حەریسی برای دانا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری تەواو و پێویست دەربارەی جەنگەکە و کاتی ئەوەش هاتبوو کە کاروباری سوپاکەی رێك بخات ، چونکە هەڵوێستەکە زۆر ترسناك بوو ، زۆر پێویستی بەوە بوو کاروباری بۆ رێك بخرێت . عبدالله ی کوری حفص ی کوری غانمی کرد بە هەڵگری ئاڵاو پاشان درا سالم مەولا ئەبی حوزەیفەو دیاریشە خەڵکی بە ئاڵاکانیانەوە دەناسران — وەك عەرەب دەڵێن — ئەگەر ئەو تیابچێت ئەوانیش تیا دەچن ، ولەم جەنگەدا شەرحەبێلی کوری حەسەنەی خستە پێشەوەو سوپاکەی کرد بە پێنج بەشەوە . لەپێشەوە خالید الخزومی و لەڕاستەوە ئەبو حوزەیفە ، و لەلای چەپەوە شوجاع ، و لەناوەڕاستیشدا زەیدی کوری خەتاب ، و ئوسامەی کوری زەیدیش گەورەی ئەسپ سوارەکان (طعن) یش لەدواوە و چادر و ئافرەتانیش لەدواوەی سوپاکەوە ، ئەم کارانەی پێش جەنگەکە ئەنجام دا .

چوارەم : جەنگی یەکلاکەرەوە : کاتی هەردوو سوپا بەرامبەری یەك وەستان موسەیلەمەی درۆزن بەهۆزەکەی خۆی ووت : ئەمرۆ رۆژی غیرەتە ، ئەگەر ئەمرۆ بشکێین ئەوە خێزانەکانتان مارەدەکرێن وەك کەنیزەك و بەشودەدرێن لەسەر ویستی خۆیان نان ، دەی بجەنگێن لەپێناوی نەژادتانداو پارێزگاری لەخێزانەکانتان بکەن. خالید سوپاکەی بردە پێشەوە تاگەیاندیە جێگەیەك بەرزایی یەك بوو دەیڕوانی بەسەر یەمامەدا ، لەویا سەربازگەی داکوتا ، و برایەتی کۆچەریان بەسالم بوو مەولای ئەبی حوزەیفە ، و ڕایەتی پشتیوانانیش بە پثابتی کوری قیس بوو و عەرەبەکانی تریش هەرکەسەو ڕایەتی خۆی هەبوو . مەجاعەی کوری مەرارە لە خەیمەکەی خالیدا کۆت و زنجیر کرابوو لەگەڵ (ئوم تەمیم) دابوو خێزانەکەی خالید ، و موسڵمان و بێ باوەڕان تێك هەڵ ڕژان و جەولەیەك بوو کە عەرەبە دەشتەکی یەکانی ناو موسڵمانان تێك شکان

و ڕایان کـرد ، تـاوای لێهـات بەنوحەنیفـە خۆیـان گەیانـدە نـاو چـادرەکەی خالیـد وویـستیان خێزانەکەی بکوژن بەڵام مەجاعە ووتی : بیکەن بەخاتری من ، ژنێکی سەربەستی چاکە ، و لەو جەولەیەدا رجال ی کوری عەنمەوە — نەفرەتی خوای لیّ بیّ — لەسەر دەستی زەیدی کوری خەتاب کوژرا ، پاشان هاوەڵان لۆمەی یەکتریان دەکرد و ثابتی کوری قیس ووتی : بـەخوا بەرامبـەریان هیچ نەبوون ، لەهەموولایەکەوە هاواردەکرا : خالید لێمـان هەڵبـژاردو بـەرائی کـوری مـەعرور ڕەنگی سورهەڵگەڕابوو ، ئەو پیاوە هەرکاتی بدیایە ئەچووە بەرزایی یەك و دائەنیـشت و پاشـان وەکو شێر هێرشی دەبردو ئەبو حەنیفەیش جەنگێکی بیّ وێنەیان دەکرد . هاوەڵانیش — خوایـان لیّ رازی بێـت — ئامۆژگاری یەکترییان دەکرد و هاواریان دەکرد : ئەی پیاوانی سورەتی (البقرە) ، وا ئەمڕۆ سیحرو جادو بەتاڵ دەبێتەوە ، و (ثابتی کـوری قـیس) یـش تـا چـاڵێکی تـاخواری ئەژنۆی بۆ خۆی هەڵکەندبوو ، و چووبووە ناوی لیوای پشتیوانانی هەڵگرتبوو پـاش ئـەوەی کـە بەکفن و بۆنی خۆشەوە خۆی بۆ مردن سازکردبوو ، لەو شوێنەدا ڕاوەسـتاو نـەجولاّ تاشـەهیدیان کرد (خوای لیّ رازی بێـت) . کۆچەریانیش بـە سـالم ی مـەولای ئـەبی حوزەیفـە یـان دەووت : ناترسی لەلای تۆ وە بێن ؟ ئەویش دەیووت : کەواتە هەڵگری ڕاستەقینەی قورئان نیم ئەگەر وابم ، دەی بۆ پێشەوە هێرش بەرن ، و دەیووت : وەڵلاهی ئیتر قسەناکەم تاخوای گەورە دەیانشکێنی و یان دەگەم بەخوا و لەوی قسەی خۆم دەکەم ، و شەهیدیش بوو (خوای لیّ رازی بێـت) . ئـەبو حوزەیفە دەیووت : ئەی دەستەو تاقمی قورئان ، قورئان جوان و ڕازاوە بکەن بەکردەوەکانتان ، و هاشاولّی بۆ بردن و ماوەیەك دووری خستنەوە تا برینـداریان کـرد (خـوای لـیّ رازی بێـت) . و خالیدیش بەرەو ڕوویان ڕۆیشت بردنی یە دوا تا لەو شوێنە تێی پەڕاندن و بەردەوام بوو تا خـۆی گەیاندە سەر ئەو کێوەی کە موسەیلەمەی بەسەرەوە بـوو تـا دەرکـەوێت و بیکوژێـت ، پاشـان گەڕایەوە و لەنێوان هەردوو ڕیزەکەدا وەستاو (بەراز) بانگ کـرد ووتـی : مـن کـوری وەلیـدم و گەڕاوەم ، من کوری ئیبن عامرو زەیدم ، پاشان دروشمی موسڵمانەکانی دەوتەوە کە لەو جەنگەدا (( یا محمداه )) بوو ، هەرکەس ئەهاتە ڕێی خێرا دەیکووشت و هەرشتیّ لێی نزیـك ببوایەتـەوە هەر ئەیخوارد ، جەنگ گەرم بوو . پاشان خالید لەموسـەیلەمە نزیـك بوویـەوەو نیـوە بـەنیوەی خستە بەردەمی بەمەرجیّ بگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست ، بەڵام شەیتانەکەی موسـەیلەمە ملـی

پێ پادەدا و ڕازی نەدەبوو ، و هەرکاتێ موسەیلەمە دەیویست لەو داواکاریە بکۆڵێتەوە خێرا شەیتانە نەفرینەکەی ڕێگەی پێ نەدەداو خالیدیش بەجێی هێشت و پشت گوێی خست . خالید هەستا بەجیاکردنەوەی پشتیوانان لەکۆچەریان ، و لەعەرەبە دەشتەکی یەکان و هەریەکەو بە ڕایەتی خۆیەوەو لەلایەکەوە جەنگ بکات تا بزانرێت لەلای کێوە بێ باوەڕان دزە دەکەنە ناو ڕیزی موسڵمانەکانەوە . هاوەڵان — خوایان لێ ڕازی بێت — بەشێوەیەك بەئارام و خۆگربوون لەوەو بەر شتی وایان لێ بەدی نەکراوە ، و هەر بۆپێشەوەو بەرەو ناوجەرگەی دوژمنان دەچوون تا خوای گەورە دەرگای سەرکەوتنی بۆ خستنە سەرپشت ، و بێ باوەڕان پشت و پشت ڕایان کردەوە ، ئەمانیش شوێنیان کەوتن و شمشێریان لەسەر گەردنیان هەڵنەدەگرت ، تا ناچاریان کردن خۆیان بکەن بە (باخچەی مەرگ) دا . کەموحەکەمی کوری توفەیل — نەفرەتی خوای لێ بێ — فەرمانی دەرکرد هەموویان بچنە ناو باخچەکەوە کە موسەیلەمەی لێبوو — نەفرەتی خوای لێ بێ — و عبدالرحمن ی کوری ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) خۆی گەیاندە موحکەم کە وتاری دەدا و کوشتی ، و بەڵام بەنو حەنیفە دەرگای باخچەکەیان لەسەر داخستن و هاوەڵانیش چواردەوریان لەباخەکە گرتبوو .

پێنجەم / پاڵەوانێتی کەم وێنە :-

١. بەرائی کوری مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) ووتی : ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بەرزم کەنەوە و بمخەنە ئەو دیوو من دەرگاکەتان بۆ دەکەمەوە و ئەوانیش خستیانە سەر قەڵغانێك و بە ڕمەکانیان بەرزیان کردەوە و خستیانە ئەودیوو ، و بەدەم شەرکردنەوە خۆی گەیاندە دەرگاکەو کردیەوە ، و موسڵمانەکانیش بەهاشاوڵ خۆیان کرد بە ژورداو ئەوانی تریش دەرگاکانی تریان کردەوەو هەڵگەڕاوەکان گەمارۆ دران و بۆیان دەرکەوت تیاچوون و وا ڕاستی هاتەوەو نارەوا تیاچوو .

٢. کوژرانی موسەیلەمەی درۆزن :- موسڵمانەکان خۆیان گەیاندە موسەیلەمەی — نەفرەت لێکراو — لەتەنیشتی دیوارێك دا وەستابوو ئەوگو حوشتری مل بەرزە و پاڵی دابوویەوە بەدیوارەکەوەو لە توڕەیی دا ئاگای لەخۆی نەبوو ، و شەیتانەکەی وای لێکردبوو کەفی ئەچەراند — کە هەر کاتێ تورە ببوایە بەم لاولای دەمیدا کەفی سپی دەچەراند (وەحشی

کوری حەرب بەندەی جوبەیری کوری موطعیم — بکوژی حەمزە (خوای لیّ رازی بیّـت) بـۆی ڕۆیشتە پیّشەوەو ڕمیّکی کرد بەسکیدا کە لەو دیوەوە دەرچووە دەرەوە ، و ئەبو دوجانـەیش کەناوی سەماکی کوری خۆرشە بوو پەلاماری داو یەك شمشیّری لیّداو خستی یە سەر زەویەکە ، خانمی ناوکۆشك هاواری کرد : ئای ئەمیری دەم و چاو درەوشاوەکان ڕۆ !! بەندەیەکی قولـە ڕەش کوشتی . لەناو باخەکەو دەوروبەریدا — کوژراوەکانی پاشـگەزبووان خـۆی دەدا لـە دە هـەزار جـەنگاوەر ، هەنـدیّك سەرچـاوەیش دەڵیّـت : بیـسـت و یـەك هـەزار ، و لـە موسڵمانەکانیش شەش سەد یان پیّنج سەد کەس شەهیدبوون خوا باشتری لـیّ دەزانیّـت — و ناودارانی هاوەڵانیشیان تیابوو کە لەمەولا ناویان دەهیّنین . خالید (خوای لـیّ رازی بیّـت) لەگەڵ مەجاعەی کوری مـەرارەدا کەهـەرکۆت وزنجیر بـوو گـەڕان بـەناو کوژراوەکانـدا تـا ناوەکانیانی پیّ بلیّ و موسەیلەمەی پیّ پیشان بدات ، دایان بەلای ڕەجالی کوری عەنفەوەدا و خالید ووتی : ئەمە عەنفەوەیە ، سەیفی کوری عومەر دەڵیّ : پاشان دایان بەلای پیاویّکی ڕەنگ زەردی گولەکەداو ووتـی : ئەمەیـە هاوڕیّکـەتان ، خالیـدیش ووتـی : دەك خـوا ڕوو ڕەشتان بکات لەسەر شویّنکەوتنی ئا ئەمە ، وپاشان خالید کۆمەڵیّ ئەسپ سواری نارد بـۆ دەوروبەری یەمامە و قەڵاکانی چواردەور تا پارەو سامان و کەنیزەکەکان کۆبکەنەوە .

٣. ئەبو عوقەیل : عبدالرحمن ی کوری عبـدالله ی بەلـەوی ئەنـصاری ئەوسـی ئەبوعوقـەیل ، یەکەم کەس بوو لەشەری یەمامەدا بریندار بوو ، تیریّکیان تیّ گـرت بـەری ناوشـان و دڵـی کەوتبوو ، بریندار بوو بەڵام برینەکەی کوشندەنەبوو ، تیرەکەیان دەرهیّنا و شانی داکەوتبوو و بردیانەوە بۆ سەربازگەی موسڵمانەکان کاتیّ شەڕەکە گەرم بوو ، موسڵمانەکان پاشەکشەیان کردەوە بەرەو مەنزڵ و مەعەسکەرەکەیان و ئەبوعوقەیل بەبرینداری کەوتبوو گویّی لـیّ بـوو مەعسنی کوری عەدی هاواری کرد : ئەی پشتیوانان ، الله ، الله ، دووبارە هیّـرش بەرنـەوە سەر دوژمنانتان ، و مەعن خـۆی پـیّش خەڵکـە کـە کـەوت ، و ئـەبو عـەقیلیش ویـستی هەڵسیّتەوە و لەگەڵ هۆزەکەیدا هیّرش بەریّتەوە . هەندیّ لەموسڵمانەکان پیّیان ووت : ئـەی ئەبوعوقەیل تۆ توانای جەنگت تیانەماوە . ئەویش ووتی : ئاخر ئاماژەی بـۆ مـن کـرد کـە بڕۆم ، وتیان مەبەستی لە پشتیوانان برینـدارەکان نـی یـە ... ئەبوعـەقیلیش ووتـی : دەی

منیش له پشتیوانانم ، و من دەڕۆم بەدەمی یەوە با بەگاگۆلکێش بێت ، و خۆی کۆکردەوە و شمشێرەکەی هەڵکێشا و هاواری دەکرد : ئای بۆ پشتیوانان ، هێرشێك ببەین وەك هێرشی جەنگی حونەین ، هەر هەموو پشتیوانان کۆبوونەوەو بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە بەرەوپێش چوون و بەهیوای سەرکەوتن یان شەهیدی ، لەم هێرشەدا باڵێکی ئەبوعەقیل لە بنا قرتاو چواردە برینیشی پێوەبوو کە هەر هەموویان ترسناك و کوشندە بوون ، و (ئیبن عومەر) — خوای لێ رازی بێت — دای بەلایدا کەلە دواساتەکانی ژیاندا بوو پێی ووت : ئەبوعەقیل ، ئەویش ووت : (لبیك) واتە بەڵێ گیانەکەم بێگومان زۆر نارەحەت ئەمەی ووت ) پاشان ووتی : چ لایەك سەرکەوتووە ؟ (ئیبن عومەر) ووتی : مژدەت بەمێ ، دوژمنی خوا کوژرا ، و ئەبوعەقیلیش پەنجەی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان سوپاسی خوای کرد ، عمر (خوای لێ رازی بێت) دەربارەی عەقیل دەڵێت : رەحمەتی خوای لێ بێت ، هەر داوای شەهیدی دەکرد و هەوڵی بۆ دەدا ، و ئەو یەکێکە لە هاوەڵە چاکەکانی پێغەمبەرمان ﷺ .

٤. نوسەیبەی کچی کەعب ی مازنی ئەنصاری :

لەگەڵ سوپاکەی خالید دا بەرەو یەمامە کەوتە رێ ، و بەشداری شەڕەکانی کرد و سوێندی خوارد کە چەك دانەنێت تا دەجالی بەنی حەنیفە نەکوژێت . بەیارمەتی خوا سوێندەکەی هێنایەدی و مسویلەمەی درۆزن کوژراو گەڕایەوە بۆ مەدینەو دوانزە جار برینداركرابوو لە نێوان رم و شمشێردا . وهەربرینێکیان خەلاتی شەرەف بوون بۆ ئەو خانمە هاوەڵە تێکۆشەرەی کە نموونەیەکی جوانی ئافرەتانی هاوەڕەگەزی خۆی پێش کەش کرد لەبەرگری کردن لە ئاین و بیروباوەڕ ، و ئیتر با لەورێگەیەشدا شتی وای بەسەردابێت کەلەتوانای ئافرەتانی هاوشێوەیدا نەبێت ، ئەوانەی کە ناسکۆڵەن. خالیدی کوری وەلید (خوای لێ رازی بێت) لەپاش ئەم جەنگە چاودێری و ئاگاداری ئەم ئافرەتە دەبوو ، نوسەیبە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت : کاتێ جەنگ تەواو بوو گەڕامەوە ماڵی خۆم و خالید دوکتۆرێکی بۆ هێنام بە رۆنی قرچاو تە داوی کردم و سوێند بەخوا ئێشەکەی لەباڵ بڕین خراپتر بوو ، و خالید زۆر لێی دەپرسیمەوە ، هاورێ یەکی چاك بوو بۆمان ، ئاگای لە مافەکانمان بوو ، و ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ سەبارەت بە ئێمە دەپاراست .

شەشەم : لەشەهیدەکانی جەنگی یەمامە :

١. ثابتی کوری قیسی کوری شەماس (خوای لیّ رازی بیّت) : نازناوی (ئەبو محمد) ووتاربیّژی پشتیوانەکان بوو ، پیّشی دەڵیّن : ووتاربیّژی پیّغەمبەر ﷺ ، و لەفەرموودەی صحیحدا هاتووە کە مژدەی شەهیدبوونی پیّدراوە ، لەرۆژی یەمامەدا کاتیّ شەهیدبوو ڕایەتی پشتیوانانی بەدەستەوە بوو . یەکیّ لەموسڵمانەکان لەخەودا ثابتی بینی و پیّی ووت : من کە دویّنیّ کوژرام یەکیّ لە موسڵمانان دای بەلامدا و قەڵغانە چاکەکەی لیّکردومەوەو بردیماڵەکەشی لە ئەوپەڕی سەربازگەکەیەو لەمالیّشەوە ئەسپیّکی باڵابەرزی هەیەو لەناو قەڵغانەکەدا دروستکراوە لەسەر ئەویشەوە پیاویّك ، برۆ بۆ لای خالید پیّی بڵیّ باقەڵغانەکەم بۆ وەربگریّتەوە ، و ئەگەر گەڕاشیتەوە بۆ مەدینە بەجیّ نشینی پیّغەمبەری خوا ﷺ بڵیّ کە : من ئەوەندە قەرزارم و ئەوەندەش سامانم هەیە ، و فلانیش کە بەندەی منە ئازاد بیّت ، و نەکەیت بڵیّیت ئەمەخەوە هیچ نی یەو بیفەوتیّنیّت . پیاوەکەش سبەینیّ چوو بۆلای خالیدو ئەویش ناردی بەدوای قەڵغانەکەدا دەبینیّ لەو شویّنەیە ، و کاتیّکیش هاتەوە بۆ مەدینە بۆ ئەبوبەکری گیّرایەوە و ئەبوبەکریش وەسیەتەکەی جیّ بەجیّکرد ، و تا ئیّستایش پیّ بزانین تا ئیّستا جگە لە ثابتی کوری قیسی شتی وا ڕووی نەداوە کەکەس دوای مردن وەسیەت بکات و بۆی جیّ بەجیّ بکریّت [1]

.

٢. زەیدی کوری خەتاب (خوای لیّ رازی بیّت) :

برای عمری کوری خەتابە (خوای لیّ رازی بیّت) لەباوکەوە ، و لەعمر گەورەتربوو ، لە کۆنەوە موسڵمان بوو بوو، بەشداربووانی بەدربوو ، لەهەموو غەزاکاندا بەشداری کردبوو ، لە مەدینە پیّغەمبەری خواﷺ کردی بەبرای مەعن ی کوری عدی ئەنصاری و هەردووکیان لەیەمامە کوژران ، و ئاڵای کۆچەریان بە دەستی ئەوەوە بوو تا کوژراو ئاڵاکە کەوتە زەوی و سالم ی مەولاوی ئەبی حوزەیفە هەڵی گرت ، زەید لەو شەڕەدا ، ڕەجالی کوری عەنفوەی کوشت کە موسڵمان بوو بوو ، سورەتی (البقرة) یشی لەبەرکردبوو ، پاشان پاشگەزبوویەوە و گەڕایەوە بۆ لای موسەیلەمە و باوەڕی پیّکرد و شایەتی پیّغەمبەرایەتی (بەدرۆ) بۆدا ، و بەو کارەی

---

[5] البداية والنهاية (٦/٣٣٩)

ئاشوبێکی گەورەی نایەوە ، و لەسەر دەستی زەیدی کوڕی خەتاب (خوای لیٚ رازی بێت) کوژرا . زەیدیش لەسەر دەستی پیاوێـك شـەهیدبوو کـەناوی (ئـەبو مەریـەم ی حەنـەفی) بـوو ، پاشـتر موسڵمان بوو ، بە عمری دەووت : ئەی گەورەی موسڵمانان خوای گەورە بە دەستی مـن زەیـدی بەڕێزکردو بەدەستی ئەو منی ڕسوا نەکرد . و کاتیٚ هەواڵی شـەهیدبوونی گەیـشت وە "عمـر" ووتی : لە دووچاکەدا پێـشی مـنی دایـەوە ، یەکـەم پـێش مـن موسـڵمان ، دووەم پـێش مـن شەهیدبوو ، کاتیٚ موتەمیم ی کوری نوێر بە شیعرەوە شیوەنی بۆ مالیك ی برای دەکـرد ، عمـر (خوای لیٚ رازی بێت) پیٚ ووت : ئەگەر منـیش شـیعرم بزانیایـە وام دەووت بـۆ زەیـدی بـرام ، موتەمیمیش پێی ووت : ئەگەر براکەم من لەسەر ئـەو بەرنامەیـەی بـرای تـۆی لەسـەر کـوژرا بکوژرایە هەرگیز خەفەتم بۆ نەدەخوارد ، و عمـریش پێـی ووت : کـەس تائێـستا بـەم شـێوەیە سەرەخۆشی لیٚ نەکردووم ، و لەگەڵ ئەوەشدا عمر هەردەم دەیووت : هیچ کات شنەبای بـەیانیان هەڵی نەکردووەو زەیدم نەخاتەوە بیر (خوای لیٚ رازی بێت) .. .

٣. مەعن ی کوری عەدی بەلەوی :

کوری جەعدی کوری عەجلانی کوری چیعە ی بەلەوی یـە ، و هاوپـەیمانی بـەنی عـەمری بـەنی عەوف بوون وبرای عاصم ی کوری عەدی یەو بـەدر و ئوحـودو خەنـدەق و هـەموو جەنگـەکانی تریشی بینیوە ، و پێغەمبـەری خـواﷺ کـردی بـە بـرای زەیـدی کـوری خـەتاب و لەجـەنگی یەمامەدا هەردووکیان شەهیدبوون . مەعن هەڵوێستێکی زۆر جـوان و بـەرزی هـەبوو لـەکاتی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کاتیٚ خەڵکی دەبیان ووت : سوێند بەخوا حـەزمان دەکـرد پـێش ئەو بمردینایەو دوای ئەو ئەم نەهامەتی یەمان نەدیایە . بەڵام (مـەعن) شـتێکی تـری دەووت و دەیووت : بەڵام من حەزم نەکردووە پێش ئەو بمرم ، تا چۆن بەزیندوویی باوەڕم پێکردووە ئاوایش بە مردوویی باوەڕی پیٚ بکەم .

٤. عبداللە ی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر :

کوڕی ئیبن شەمس ی کوڕی عەبد وەدی قورەیشی عامریە لە موسڵمانە پێـشینەکانەو کۆچیـشی کردووەو پاشان لەمەککەیش ئەشکەنجەدراوە ، و لەکاتی جەنگی بەدر دا لەگەڵ سوپای قورەیشدا دەرچوو ، کاتیٚ هەردوو سوپا ڕوویەڕوو بوونەوە ئـەو ڕای کـردە نـاو موسـڵمانەکان و بەشـداری

جەنگەکەی لەگەڵداکردن ، لەڕۆژی یەمامەدا شەهید بوو ، و کاتێ ئەبوبکر (خوای لێ رازی بێت) بۆ حەج کردن چوو بۆ مەککە لەوێ سەرەخۆشی لەباوکی کرد ، و سوهەیلیش ووتی پێم گەیشتووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی شەهید شەفاعەت بۆ حەفتا کەس لەخزمەکانی دەکات. تکام وایە لەمنەوە دەست پێ بکات. سوهەیلی کوری عەمر ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەبوو لەکاتی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ و کەهەموو خەڵکی مەککە دەیان ویست لە ئیسلام پاشگەزببنەوە و تاوا ترسناك بوون والی مەککە عتابی کوری ئوسەید لەخۆی ترسا و خۆی حەشاردا ، و سوهەیل هەستاو سوپاسی خوای کردو ستاییشی کرد وپاشان باسی لەدونیا دەرچوونی پێغەمبەری خوای ﷺ کردو ووتی : ئەو مەسەلەیە هیچ زیانێکی نی یە بۆ ئیسلام بگرە هێریشە بۆی ، هەرکەسێ ئەدەین لەگەردنی ، و خەڵکەکەش وازیان هێنا لەو نیازەی کردبوویان و ئەوکات عیتابیش خۆی دەرخستەوە . ئەم هەڵوێستە بەرزەیە کەئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ دەکات کاتی عمری کوری خەتاب (خوای لێ رازی بێت) ئاماژەی بۆئەوە کرد کە دانەکانی پێشەوەی دەربهێنین ئەمە لەکاتێکدا بوو کەسوهەیل لەناو دیلەکانی جەنگی بەدر دابوو ، فەرمووی : (( إنه عسى ان يقوم مقاماً لا تذمَّنَّه )) واتە : لەوانەیە ئەو پیاوە لە شوێنێکدا ڕۆڵێکی وا گرنگ ببینێ کە بەخراپ باسی نەکەیت .

٥. ابو دوجانە – سەماکی کوڕی خەرشە :

لە جەنگی بەدردا پەڕۆیەکی سوری لەناوچاوی بەستبوو ، و دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل عەتبەی کوری غەزواندا کردی بەبرا ، و لەجەنگی ئوحودا ڕای نەکرد و خۆگرانە وەستاو پەیمانی مردنی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و یەکێکە لەوکەسانەی بەشداری کرد لەکوشتنی موسەیلەمەی درۆزندا و هەر لەوێش شەهیدبوو . زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت : جارێکیان ئەبو دوجانە هات بۆ لای و نەخۆش بوو بەڵام دەمووچاوی زۆر جوان و کراوەبوو ، منیش لێم پرسی چی یە ئەوەندە ڕووت خۆشە ؟ ووتی : هیچ کردەوەیەکم نی یە ئەوەندەی دووکردەوەم دڵم پێی خۆش بێت : یەکەم : خۆم هەڵناقورتێنمە شتێك کە پەیوەندی پێمەوە نەبێت ، دووەم : دڵم پاکە بەرامبەر موسڵمانان و هیچی تێدانی یە بەرامبەرین، ئەبو دوجانە لەجەنگی یەمامەدا یەکێك بوو لەپاڵەوانەکانی ناو موسڵمانەکان ، کە ئەویش بە چەشنی بەراو لەسەر دیوارەکەوە خۆی هاوێشتە

ناو باخچەی مەرگەوە و قاچێکیشی شکا ، کە ئەو هەموو شەرەی دەکرد بە قاچێکی شکاوەوە بوو تا شەهید بوو — خوای لێ رازی بێت- ...

٦. عوبادی کوری بشیر : یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی و چاکەکانیان ، چل و پێنج ساڵ ژیاوە ، عوبادە ئەو کەسەبوو ئەوشەوەی تادرەنگێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو کاتێ ڕۆشتەوە بۆ ماڵ دارەکەی دەستی وەك گلۆپ داگرسابوو شەوقی هەبوو ، لەسەر دەستی خصعب ی کوری عومەیر (خوای لێ رازی بێت) موسڵمان بوو ، یەکێ بوو لەوکەسانەی کەعب ی کوری ئەشرەفیان لەناوبرد . پێغەمبەری خوا ﷺ بەکاری هێنا بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی مە(ینە مەدینە و بەنی سەلیم ن کردی بەسەرۆکی پاسەوانەکانی لەجەنگی تەبوکدا ، و لەرۆژی یەمامەدا نەبەردی چاکی نواند ، و لەپاڵەوانە ئازاکان بوو ، عائیشە (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت : سێ کەس لە پشتیوانەکان لە چاکیدا کەس پێیان ناگاتەوە کەهەموویان لەتیرەی (بەنی عبدالاشهل)ن : سەعدی کوری موعاز ، و ئوسەیدی کوری حوچەیر ، وعوبادی کوری بشیر . هەر لەعائیشەوە دەگێرنەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەکەی مندا خەریکی شەونوێژبوو ، گوێی لەدەنگی عوبادەی کوری بشیر بوو ، پرسی : ئەی عائیشە ئەوە دەنگی عوبادەنی یە ؟ ووتم : بەڵێ . فەرمووی : (( اللهم اغفرله )) خوایە لێی خۆش ببە. و لەیەمامە شەهید بوو . ئەبوسەعیدی خودری (خوای لێ رازی بێت) دەڵێت : لەعوبادم بیست کەپاش تەواو بوونی جەنگی بوزاخە پێی ووتم ، ئەی ئەبو سەعید : ئەم شەو لەخەومدا ئاسمانم بینی دەمی کردەوە بۆم و کەچووم تێی داخرایەوە ، هەرچی ورد دەبمەوە — انشاو الله — شەهیدبوومە ، منیش پێم ووت : وەڵلاهی خەوێکی خێرت دیوە. لە جەنگی یەمامەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو ، چووە سەربەرزایی یەك و بەهەموو دەنگی هاواری کرد : من عوبادەی کوری بشیرم ، ئای بۆ پشتیوانان ، ئای بۆ پشتیوانان ، وەرن بۆلام ، وەرن بۆ لام ، هەر هەموویان بە یەك سات گەشتنە لای ووتیان — لبیك ، لبیك — ئەوا هاتین بەدەمتەوە و پاشان کێلانی شمشێرەکەی خۆی شکاند و فرێی دا و ئەوانیش دوا بەدوای ئەو کێلانەکانی خۆیانیان شکاند ، ئەویش پێی ووتن : هەڵمەتێکی ڕاستگۆیانە و پاشان چوون بۆیان تا بەنی حەنیفەیان پاشەکشە پێکرد بەرەوناوباخچەکەو دەرگاکەیان لەسەر داخستن. وکاتێ موسڵمانەکان دەرگای باخچەکەیان کردەوە ئەو قەڵغانەکەی خۆی کرد بەدەرگاکەوە و بەبێ قەڵغان دەستی کرد

بەشەرکردن تاشەهید کرا لە تەمەنی چل و پێنج ساڵیدا ، ئەوەندە برینی پێوەبوو بەنیشانەیەکدا نەبوایە نەدەناسرایەوە (خوای لێ رازی بێت). هەڵویستی جوامێرانەی عوباد لەناو یەمامەیی یەکاندا دەنگی دابوویەوەو بەنموونە دەهێنرایەوە . بەنوحەنیفە تاماوەیەکی زۆریش هەریادەوەری نەبەردی عوبادیان لەلا مابوو ، هەرکاتێ برینێکیان بەپیاوێکەوە بدیایە دەیان ووت : ئەمە لیدراوی دەستی بە ئەزموونەکەی ناو خەڵکە عوبادی کوری بشیر . پشتیوانەکان هەڵوێستی نەبەردییان زۆر بوو ، و هێرش بردنی بێ وێنە ، لەجەنگی هەڵگەڕاوەکاندا بەتایبەتی لەیەمامەدا ، مەجاعەی کوری میرارە بەچاوی خۆی ئەو ئارامی وخۆگری و هێرشەمەردانەکەی پشتیوانانی بینی ، لە لای ئەبوبکردا باسی دەکرد و دەیووت : ئەی جێ نشینی پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئێستا هیچ هۆزێکم نەدیوە لەشەڕە شمشێروپەلاماری ڕاستگۆیانەدا بەوێنەی پشتیوانەکان بن ، من لەگەڵ خالیدی کوری وەلید دا بەناو کوژراوەکانی بەنی حەنیفەدا دەگەڕاین و ناوەکانیانم پێ دەناساند ، سەیری پشتیوانانم دەکرد لەو ناوەدا کوژرابوون ، ئەبوبکر (خوای لێ رازی بێت) ئەوەندە گریان تاڕیشی تەڕبوو.

٧. طوفیلی کوری عەمری ئەزدی دوسی :

لەیەمامە شەهید بوو ، پیاوێکی ناوداری ، شاعیری بەتوانابوو ، خەوی بینی بوو پێش شەهیدبوونی کە : لەخەویدا لەماڵ دەرچووم و عەمری کوڕم لەگەڵدابوو ، سەرم تاشراو باڵندەیەك لەناو دەممەوە هەڵفری و ئافرەتێکیش کردمی بەناو داوێنی دا ، جا من سەرتاشینەکە بەسەربڕینم و باڵندەکەش بەدەرچوونی گیانم وئافرەتەکەش بەزەوی کە دەخرێمە ناویەوە لێك دەدەمەوە و لەرۆژی یەمامەدا شەهیدبوو . ژمارەیەکی زۆر لەکۆچەریان و پشتیوانان لەم جەنگەیەکلاکەرەوەدا شەهیدبوون ، شاری مەدینە لەگەڵ خۆشی و سروری سەرکەوتندا بەسەر هەڵگەڕاواندا ، دەنگی گریان و فرمێسك ڕشتن بۆ شەهیدەکانی ناو شاری داگرتبوو ، بەس لە جەنگی یەمامەدا (١٢٠٠) موسڵمان شەهیدبوو کەزۆربەیان لە گەورە هاوەڵان بوو ، وتیایاندا زۆرێك لەقورئان لەبەرەکانی تێدابوو کە ژمارەیان نزیکەی (٤٠) قورئان خوێن بوو ، خەفەت و پەژارە دڵی خەڵکی مەدینەی گوشیبوو ، لێشاوی فرمێسکەکان خۆشی سەرکەوتنیان شاردبوویەوە ، و دڵەکانیان تەنگ کردبوو ، و نەهامەتی یەکە زۆر گەورەبوو لەسەر دڵەکانیان ،

و لەبەرامبەردا سەرکەوتنەکان دڵەکانیان ڕۆشن کردبویەوەو و بیروباوەڕیان پتەوترکرد ومتمانـەی زیاتریان بەکارەکانیان تیا دروست بوو .

حەوتەم / فێڵەکەی مەجاعە و خواستنی کچەکەی لەلایان خالیدەوە :

١. فێڵەکەی مجاعە :

پاش سەرکەوتنەکانی موسـڵمانەکان لەباخـچەی مەرگـدا ، خالیـد سـوارەکانی خـۆی نـارد تـا دەوروبەری یەمامەش پاك بکەنەوەو هەرچی سامان و دەستکەوتەکانە کۆی بکەنەوە ، و پاشـان نیازی کرد قەڵاکانیش بگرێت ، بەڵام لەناوقەڵاکاندا جگە لەئافرەت و منداڵ و پیرو پەککەوتەکان نەبێت کەسی تیدا نەبوو ، بەڵام مەجاعە فێڵێکی لەخالید کرد و پێی ووت : ئەو قەڵایانـە پـڕن لەچەکداری جەنگاوەر ولێم گەڕێ با سوڵحیان لەگەڵدا بکەم بۆت . خالیـدیش ڕازی بـوو چـونکە بینی بووی موسڵمانەکان بینراو و بێتاقەت بوو بوون ئەوەندە جەنگیان کردبوو ، بۆیە ووتی پێ ، وازم لێ بهێنە بابچمەناویان و قسەیان لەگەڵدا بکەم تابەسوڵح رازیان بکەم . خالیـد پـێ ووت : باشە بڕۆ ، ئەویش ڕۆیشتە ناویان و فەرمانی دابەژنەکان جل و بەرگی جەنگی بپۆشـن و لەسـەر قەڵاکانەوە خۆتان پیشان بدەن ، ئەوانیش وایان کرد و خالیدیش بۆی دەرکەوت مەجاعـە راسـت دەکات و ڕێککەوتن نامەی لەگەڵ مۆرکردن و بانگی کردنەوە بۆ لای موسڵمان بوون و هەموویان موسڵمان بوون ، و گەڕانەوە سەر ڕێگای ڕاست ، و خالیدیش هەندێ لەو دیل و ئافرەتـە دەسـت بەسەردا گیراوەکانی بۆ گێرانەوەو ئەوانی تری هێنایەوە بۆ مەدینە . و علی کـوری ئـەبو طالـب (خوای لێ رازی بێت) یەکێ لەو کەنیزەکانەی خواست و کوڕێکی لێ بوو ناوی نـا (عمـر) و بـە (محمد بنی حەنیفە) ناوی دەرکردبوو . ڕوداوی یەمامە لە (١١) ی کۆچـیدا ڕوویـداو واقیـدی و کەسانی تریش دەڵێن لە (١٢)ی کۆچیدا ڕوویدا ، بەڵام هەردووکی ڕاستە چونکە لە نیوەی سـاڵ (١١) دەستی پێکرد ولەمانگی (١٢) دا کۆنترۆڵ کرا

١- خواستنی کچەکەی مەجاعە لەلایەن خالیدەوە :

پاش ئەو ڕێکەوتنەی کە مەجاعە سازی کرد ، خالید داوای لە مەجاعەکرد کچەکەی پێ بدات ، و مەجاعـەش ووتی : لەسەرخۆبە ، تۆبەم کـارەت پـشتی مـنـیش و خۆیـشت دەشـکێنی لـەلای خەلیفە . خالیدیش ووتی : ئەی پیاو پێت دەڵێم کچەکەتم پێ بدە ، ئەویش کچەکەی خـۆی لـێ

مارەکرد . ئەبوبکر صدیق (خوای لیّ رازی بیّت) سەلەمەی کوڕی قرشی نارد بۆ لای خالیدو بۆی نووسیبوو کە ئەگەر خوای گەورە سەری خستی بەسەریاندا ، هەرکامیان لە پیاوان گەشتۆتە تەمەنیّ موس بەکاربهیّنیّ بیکوژە ، بەلاّم بۆی دەرکەوت کە خالید ریّککەوتنی ئاشتی لەگەلّدا کردوون و جیّ بەجیّشی کردوە ، ڕازی بوو . ئەبوبکر (خوای لیّ رازی بیّت) هەموو بەیانی یەك لەگەلّ کۆمەلیّ لەکۆچەریان و پشتیوانانداا لەشاردەردەچوو بۆ ئەوەی هەوالیّکی یەمامە بزانیّت ، و چاوەڕوانی تیراوی خالیدی دەکرد ، تا ئیّوارەیەکیان دەرچووبوو بوو( حەڕڕە) و لەگەلّ کۆمەلیّ لەهاوەلاّنی دا و گەیشت بە ئەبا خەیپەمەی نەجاری (خوای لیّ رازی بیّت) کە خالید ناردبوویەوە ، کاتیّ خالید بینی ووتی : ها چ هەوالیّکت پیّ یە ئەی ئەبوخەیپهمە ؟ ووتی : هەوالی خۆش ، ئەی نیّرراوی پیّغەمبەری خواﷺ خوای گەورە یەمامەی بۆ ڕزگارکردین و ئەمەش نامەی خالیدە ، ئەبوبکریش (خوای لیّ رازی بیّت) سوژدەیەکی سوپاسی برد بۆ خوای گەورە ، وپاشان ووتی : ئیّ باسی جەنگەکەم بۆ بکە چۆن بوو ؟ ئەبوخەیپهمەش باسی ئازایی و نەبەردی خالیدی بۆکرد کەچۆن جەنگاوەرەکانی ریّزدەکرد ، وناوی ئەوانەشی پیّ ووت کەشەهیدبوون . ئەبوخەیپهمە پیّی ووت : ئەی جیّ نشینی پیّغەمبەری خواﷺ لەلای عەرەبە دەشتەکیەکانەوە دەشکاین و ئەوان دەیان شکاندین وتووشی گیّجەلّی وایان دەکردین کەباش نەمان دەزای چی بکەین. هەرکە ئەبوبکر (خوای لیّ رازی بیّت) هەوالّی ژنهیّنانی خالیدی زانی نووسی : ئەی کوری دایکی خالید ، تۆ ئەوەندە بەتالّی ژن دەهیّنی ؟ لەتەنیشتی مالّەکەتدا خویّنی (١٢٠٠) موسلّمان هیّشتا ووشك نەبۆتەوە ؟ ئیّ پاشان مەجاعە فیّلّی لیّکردوویت و لەباتی هۆزەکەی سولّحی لەگەلّ کردوویت لەکاتیّکدا تۆ سەرکەوتوو بوویت . بەرامبەر ئەم نامە ڕەق وتوندوتیژەی صدیق (خوای لیّ رازی بیّت) کە بۆ خالیدی ناردبوو ، خالید وەلاّمیّکی بەلّگەدار وژیرانەی نارد بۆی و تیایدا بەرگری کردبوو لەسولّحەکەی مەجاعە وخواستنی کچەکەی ، و بە (ئەبو بەرەزەی ئەسلەمی) دا ناردیەوە ، تیایدا دەلّیّت : پاشان : لە تەمەنمدا هەرگیز بیرم لەژنهیّنان نەکردۆتەوە تا بەتەواوی دلّخۆش بووم بەسەرکەوتن ، ئارام بوومەتەوە لە مالّی خۆمدا ، و من ژنی پیاویّکم مارەکردووە کە ئەگەر بزانیانە لەمەدینە کەسیّك هەیە بەتەمای بیّ ئەم دەخواست ، و ئەگەر تۆ لەبەر مەسەلەیەکی ئاینی یان دنیایی ئەمەت پیّ ناخۆشە ئەوا

ڕەخنەکەت وەردەگرم وئەو هاوسەرگیرییە هەڵدەوەشێنمەوە . وە بۆ مەسەلەی سەرخۆشی و دڵخۆشی خۆم بەوە دەدەمەوە لە سەر کوژرانی موسڵمانان و ئەگەر خەفەت زیندووی بهێشتایەتەوە مردووی بگێڕایەتەوە ئەوا من هەمیشە خەفەت باردەبووم ، ومن تووشی نەهامەتی وا هاتووم لەوجەنگەدا کەلەژیان بێ هیوابووم و دڵنیابووم لەمردنی خۆم ، بەڵام بۆ مەسەلەی فێڵەکەی مەجاعە لەمن ئەو ڕای خۆم بوو ، وەمن هیچ ڕۆژێ لەڕۆژان ڕام بەهەڵەدا نەچووە ، ئی من خۆ زانستی غەیبم پێ نی یە ، و خوای گەورە چاکی بۆ ئیمان داران کردو زەوی دایەوە دەستیان و ئێ پاشەڕۆژیش بۆ لەخوا ترسەکانە . کاتێ ئەم نامەیەگەیشتە ئەبوبکر (خوای لێ ڕازی بێت) هەندێ هێور بوویەوە ، کۆمەڵێ لە پیاوانی قورەیش کە ئەبوبەرەزەی ئەسلەمی شیان لەگەڵ بوو هاتنەلای و بەهانەیان بۆ خالید هێنایەوە. ئەبو بەرەزە ووتی : ئەی جێ نشینی پێغەمبەری خواﷺ خالید هەرگیز بەترسنۆك و ناپاك نازناوی دەرنەکردوە ، تەواو خۆی ڕەنجاندوە بۆ دەستکەوتنی پلەی شەهیدی تاوای لێهاتووە هیچی پێ ناوترێت ، و ئارام و خۆگربووە تا سەرکەوتن و ڕێککەوتنەکەشی بەئارەزووی خۆی بووەو ڕایەکی هەڵەش نەبووە ئەورێك کەوتنەی لەگەڵیان ، چونکە ئەو نەیزانیبوو ئەوانەی ناو قەڵاکە ئافرەتن و وای زانی پیاون . ئەبوبکر پێی ووت : ڕاستەکەیت قسەکانی تۆ جوانتربوون بۆ بەهانە هێنانەوە بۆ خالید لەنامەکەی خالید خۆی . لەنامەکەی خالیدا کە بۆ ئەبوبکری نوسیبوو کۆمەڵێ خاڵ تێبینی دەکەین لە بەرگری کردنەکەی لەخۆی لەوانە :

١. ژنی نەخواستووە تا بەتەواوی لەسەرکەوتن دڵنیابووە .

٢. ژنی لەکەسێك خواستووە کەیەکێکە کە گەورە پیاوانی ناو هۆزەکەی .

٣. هیچ نارەحەتی و تێچوونێکی نەبووە ئەم ژن خواستنەی .

٤. ئەم کارەی هیچ سەرپێچی یەکی نە ئاینی و نەدنیایی تێدا نییە .

٥.ئەم کارە نەکرایە بەهۆی خەفەت خواردن بۆ شەهیدانی موسڵمانان کارێکی بێ سوودە چونکە زیندو بەزیندوویی دێنێتەوەو نەمردویش دەگەڕێنێتەوە .

٦. هیچ شتێکی نەخستۆتە پێش جیهاد ، و ئەوپەڕی توانا بەجۆری ڕۆڵی بینیوە کەلەنێوان ئەو مردندا هیچ بەربەستێك نەبووە .

٧. لە ڕێککەوتنی لەگەڵ مەجاعەدا بۆ هاتنەدی خێری موسڵمانان بوو ، و ئەگەر مەجاعە وێنەی هۆزەکەی وەك خۆی پێ پیشان نەدا ، ئەم هیچی لەسەر نی یە چونکە مرۆڤ لە شتی غەیب ونادیار هیچ نازانێت ، خۆ هەرچۆنی بێت لەبەرژەوەندی موسڵمانان تەواوبوو ، کە دەستیان گرت بەسەر زەویەکانی بەنوحەنیفەداو ئەوانی تریشیان کەمابوونەوە بەبێ شەڕ هاتنەوە ناوئیسلام ، لەبەرئەوە ژن خواستنی لە مجاعە شتێکی زۆر سروشتی بوو ، و هیچ لەسەر خالید ناکەوێت ، و ڕاستیش نی یە گوایە لەبەر ئازایەتی و بەغیرەتیی مەجاعە ئەو کارەی کردبێت و گوایە حەزی کردووە ژن و ژنخوازی بکات لەگەڵی تا پەیوەندی یەکەی لەگەڵ مەجاعە بەهێز تربکات و لەگەڵ پەیوەندی ئایینی دا پەیوەندی خزمایەتیشی لەگەڵ دروست بکات هەروەك (عەقاد) بۆی چووە ، چونکە خالید نەیویستووە لەگەڵ پەیوەندی ئاینی دا پەیوەندیەکی تریش دروست بکات لەگەڵ خەڵکیدا . ئەمما شێوازی دوکتۆر محمد حسن هیکل لەبەهانە هێنانەوەکەیدا بۆ خالید شتێکی وەرنەگیراوە ، چونکە لەگەڵ فەرمانەکانی ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە ... و هیکل دەڵێت : کچی مەجاعەکێ یە تالە جەژنی سەرکەوتنی خالید دا کە دەبێت بگێڕرێت ؟! ئەوەش یەکێکە لەو قوربانیانەی لەبەر پێی سەرکردەیەکی ڕزگاریخوازی عەبقەری دا سەربڕرێت کە زەوی یەمامەی بەخوێن ئاودا بەوهیوایەی لەو پیسی یەی پاك بێتەوە

ئەم وشانە واخالید نیشان دەدات — ئەوهاوەڵە بەڕێزە — وەك بلێ ی ئەخیەل یان هکتور یان ئاغا ممنون ە لەسەرکردەکانی جەنگی تەراودەی بتپەرستی یۆنانی یە ، ئەوانەی نا جەنگن تا بەدەست ئامادژەیان بۆ نەکرێت یان ماچباران نەکرێن ، چونکە تەنها لەبەر پلەوپایەو ناو دەرکردن دەچوونە گۆرەپانی جەنگەوە. یان کردویەتی بەشێوەی بتێکی عەرەب کەجاران لەم دیو دیوی یەوە قوربانیان بۆسەر دەبری ، یان وەك خوای نیل کە میسریە کۆنەکان بڕوایان وابوو کە ئاوەکەی زیادناکات و خێروخێراتی نابێت تا ساڵانە کچێکی جوان نەکەنە قوربانی و نەیدەن بەئاوەکەدا ، دەی (حاشاللە) کە ئەناسولەیمان ئابەوجۆرە بێت ، کەسێك کەخاوەنی ئەو دەروون و ئەو ڕەوشتانەبێت ، خالد باوەڕێکی یەکتاپەرست بوو ، ناجەنگێت مەگەر لەگەڵ کەسانێك کەسەنگەریان لەخوای گەورە گرتووە ، بەتەمای پاداشت و سوپاس و پێزانینی کەس نی یە ،

ئەوەش ڕەد دەکەینەوە کە جەنراڵ ئەکرەم بـۆی چـووە لـەکاتی شـی کردنـەوەی ئـەو ڕەخنانـەی دراونەتە پاڵ خالید لەسەر ژنهێنانەکەی لـە جـەنگی هەڵگەڕاوەکانـدا ، و دەڵێـت هۆکارەکـەی دەگەڕێتەوە بۆ پێ کەوتەیی و جوانخاسی لەشی خالید !! کـەزۆری کێـشەی بـۆ ئافرەتـە شـۆخ و شەنگەکانی دوورگەی عـەرەب دروست دەکرد !

ئەمە بە بۆچوونی جەنراڵ! وەك بلێی خالید شەیدای ئافرەتـان یـان مـەجنوونی زەمانـە بووە، کە ئەو کەسێك بووە جگە لە جیهاد حەزی لە هیچ شتێکی تر نەکردووە، بەلاّم چی دەڵێیت لەگەڵ بۆچوونی ناڕەوا کە مەسەلە مێژووییەکان بە شـێوەیك شـی دەکاتـەوە کـە زۆر دوورن لـە بەروبوومی بیروباوەڕ و بەڵگەنامە مێژوویەکان.[1]

خالید (ﷺ) بۆ بەرگری لە ئایین و دەستکەوتنی پاداشتی خوایی جەنگاوە و خـۆی بـە خۆی چەند جار چووەتە ناوجەرگەی مردن و بە شێوەیەك وەسفی دەکەن کە نەرم و نیانی پشیلە و پەلاماری شێری لە خۆی کۆکردوەتەوە، هیچ ڕۆژێك خۆی لە سەربازێکی جیا نەکردۆتەوە، بەڵکو لە هەموو جەنگەکاندا لە پێشی خۆیانەوە دەیـانبینی، لـە جـەنگی بوزاخـەدا دڕانـە جـەنگا و ئەسپەکەی تاو دەدا.

تا پێیان دەوت: خوایە، خوایە! تـۆ گـەورەی هـەمووانی، نابێـت زۆر بڕۆیتـە پێـشەوە، ئەویش لە وەلاّمدا دەیوت: ئەزانم مەبەستتان چیە، بەلاّم من خۆم نـاگرم و ئەترسـم لـە شـکانی سوپای باوەڕداران![2]

لە جەنگی یەمامەشدا کاتێك جەنگەکە گەرم بوو، بەنو حەنیفەییەکان تا بهاتایە زیـاتر و دلڕەقتر هێرشیان دەبرد و دەجەنگان و خالیدیش خۆی بۆ دەرخستن و چووە پێشی ڕیزەکانەوە و هەرچی دەهاتە بەر دەمی دەیکوشت و بە هەر شتێك دەگەیشت دەیخوارد و هاواری دەکـرد کـێ پیاوە بێتە پێشەوە شەڕە شمشێر بکەین و دروشمەکەی خۆیانی دەوتەوە کە (یا محمدا) بوو.[3]

---

[1] حركة الردة، عتوم (٢٣٦).

[2] خالید بن ولید، صادق عرجون (لا: ٧٤٤).

[3] البداية والنهاية (٦/٣٢٩).

هەوڵی سەرکەوتن و بە دوای شەهید بووندا دەگەڕا، با واز لە خالید بێنین و خۆی باسی ئەو شەڕە شمشێرەمان بۆ بکات کە لەگەڵ یەکێك لە سەربازەکانی موسەیلەمەدا و لە ناو باخچەی مەرگدا، دەڵێت: لە باخچەکەدا دەبینم پیاوێك خۆی بۆ هەڵدام و باوەشی پێدا کردم و هەردووکمان بە سواری ئەسپەوە بووین، هەردووکمان لەسەر ئەسپەکەمان کەوتینە خوار و باوەشمان کرد بە یەکدا لەسەر زەویەکە و من بە خەنجەرەکەمەوە دەمویست هەڵیتلیشێنم و ئەویش بە خەنجەرەکەیەوە دایگرتمەوە و لە حەوت شوێندا بریندارى کردم و منیش ئەوم خەست بریندار کردبوو تا وای لێهاتبوو لەبەر دەستمدا ڕاکشابوو، منیش لە تاو ئازاری برینەکانم توانای جووڵەم نەبوو، بەردەوام خوێنم لێ دەڕۆیشت بەڵام ئەوەی تێدا بوو ئەو پێش من گیانی دەرچوو سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەوە.[1]

خالید خۆی شایەدی ئازایەتی و بە جەرگی کوڕانی بەنی حەنیفە دەدات و دەڵێت: بیست لەشکر کێشیم کردووە، بەڵام نەمدیوە هیچ هۆزێك خۆگر و جەنگاوەرتر و هێرش بەرتربن لە بەنی حەنیفە لە ڕۆژی یەمامەدا..... من لە تاو برینداری جووڵەم لێ بڕابوون وام لێهات لە ژیان بێ هیوا بووم و لە مردنی خۆم دڵنیا بووم.[2]

**هەشتەم: هەوڵی کوشتنی خالید و هاتنی شاندی بەنی حەنیفە بۆ لای صدیق (ﷺ):**

أ- هەوڵی کوشتنی خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ):

لەگەڵ ئەوەی کە ناڕەوایی نەفامی شتێکی ئاشکرایە و بێ بنەمایە کەچی بە ئاسانی دەست بەرداری نابن، چونکە ژیانیان بەوەوە بەندە، بۆیە هەر کە بەرامبەر ڕاستی ڕووبەڕوو دەبێتەوە لە هەموو هێزێکەوە لەگەڵی دەجەنگێت و شمشێر دانانێت تا بە زۆر پێی دانەنرێت.[3]

پاش ئەوە هەوڵی ناپاکی نواندن دەدات بە هەر شێوەیەك بۆی بلوێت، ئەوە سەلەمەی کوڕی حەنەفیە و بە کردە و ڕاستی ئەم قسانەی ئێمە دەسەلمێنێت، کە هەوڵی تیرۆرکردنی خالیدی کوڕی وەلیدی دا پاش ڕێککەوتنیش لەگەڵ بەنی حەنیفەدا بە شێوەیەکی گشتی کە

[1] خالید بن ولید، صادق عرجون (لا: ١٨٠).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[3] حرکة الردة، عتوم (٢٩٢).

تەواو بووبوو، کەچی لەبەر ڕق ئەستووری لە موسوڵمانان وەك نیشانەیەکیش بۆ ڕازی نەبوونی بە ئاشتی نامەکە هەستا بە پلانێك بۆ تیرۆرکردنی خالیدی کوڕی وەلید.

کە یەکەمجار گرتیان پەیمانی دا بە بەنی حەنیفەییەکان کە شتی وا دووبارە نەکاتەوە و کەچی شەو کە لە زینداندا بەسترابوویەوە، خۆی کردەوە و ڕای کرد و خۆی کرد بە سەربازگەکەی خالیددا و پاسەوانەکان هاواریان لێ کرد و بنی حەنیفە تۆقین و کەوتنە دوای لە ناو باخێکدا گرتیان بەڵام ئەو بە شمشێر بەرگری لە خۆی دەکرد بەڵام ئەوان لە دوورەوە بە بەرد دایان گرتەوە و پاشان شمشێرێکیان دا لە ملی و ڕەقی لاملی گرتبوو، بۆیە بە سەردا کەوتە ناو بیرێك و مرد،[1] ئەمەش نموونەیەك بوو لەسەر سووربوونی نەفامی لەسەر بەرگری کردن لە نارەواییەکەیان.[2]

٢- هاتنی شاندی بەنو حەنیفە بۆ لای ئەبو بەکر (رضي الله عنه):

هەر کە وەفدەکەی بەنو حەنیفە گەیشتە لای صدیق پێی وتن: کەمێکم لە قورئانەکەی موسەیلەمە بۆ بخوێنن؟ ئەوانیش وتیان: ئەکرێت ئەو داوایەمان لێ نەکەیت ئەی جێگری پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ ئەویش وتی: ئەبێت هەر بیڵێن.

ئەوانیش وتیان: «ئەی بۆقی کچی دوو بۆق، پاکیت بەڵام پاك کەرەوە نیت، نە ئاو لێڵ دەکەیت، نە ڕێگری لە ئاو خۆران دەکەیت، سەرت لە ئاودایە و کلکت لە ناو قوڕ».

یان وتیان: «المبذرات زرعاً، والحاصدات حصداً، والذاريات قمحاً، والطاحنات طحناً، والخابزات خبزاً، والثاردات ثرداً، واللاقمات لقماً، إهالة وسحناً».

ئەمە و هەندێ قسەی پڕوپوچ و خورافیاتی تر کە مەگەر منداڵان بۆ گەمەکردنی یاریەکان بەکاری بێنن و بیڵێن، دەڵێت: ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) پێی وتن: ئەی خوا چیتان لێ بکات، ئەوە عەقڵ و ژیریتان بۆ کوێ چووبوو، قەد قسەی وا لە خواوە دێتە خوارەوە؟!.[3]

مێژوو نووسەکان دەگێڕنەوە لە زۆر شت خۆیان بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چواندووە، بیستبووی پێغەمبەری خوا تفی پیرۆزی خۆی کردبوویە ناو بیرێك و ئاوی تێ هاتبوویەوە، کەچی

---

[1] تأريخ الطبري، (٤/١١٧-١١٨).

[2] حركة الردة عنوم (لا: ٢٩٢-٢٩٥).

[3] تأريخ الطبري، (٤/١٠٢-١٠٣).

ئەو موسەیلەمەی درۆزنە تفی کردبووە ناو بیرێکەوە، قەترە ئاو لە بیرەکەدا نەما، تفی کردبووە بیرێکی تر بیرەکە بووبوو بە ئاوە سوێرە، دەست نوێژی گرتبوو ئاوەکەی کردبووە نبی دار خومایەك وشکی کردبوو، هەندێ منداڵی کۆپەیان بۆ هێنابوو دەستی هێنابوو بەسەریاندا کەچی هەندێکیان کەچەڵ دەرچوون و هەندێکی تریان زمانیان دەیگرت، دەڵێن: پیاوێك هاتە لای و چاوی ئێشی دەکرد، دەستی بە چاویدا هێنا هەر لەوێدا کوێربوو.[1]

### نۆیەم: کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز:

زۆرێك لەو کەسانەی لە جەنگی یەمامەدا شەهید کران ئەو هاوەڵانە بوون کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو، لە ئاکامی ئەوەدا ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بە ڕاوێژی بە عومەری کوڕی خەتاب هەستان قورئان کۆ بکەنەوە، کە پرش و بڵاو بووبوو لەسەر پێست و ئێسقان و پەلی دارخورمادا نووسرابوویەوە یان لەناو دڵی هاوەڵاندا بوو، ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) ئەم پڕۆژە مەزنە و ئەم کارە شارستانیە گەورەیەی دایە دەستی هاوەڵی بە ڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەیدی کوڕی ثابتی ئەنصاری (رضي الله عنه).

زەید خۆی دەگێڕێتەوە بۆمان و دەڵێت: دوا بە دوای کوژرانی هاوەڵان لە یەمامەدا ناردی بە دوامدا،[2] عومەری کوڕی خەتابیشی لە لادا بوو، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێی وتم: عمر هاتۆتە لام و پێی وتووم: جەنگی یەمامە زۆر گەرم بووە و قورئان لەبەرەکانی هەموو لە ناو برد، من دەترسم ئەوانەشیان کە ماون لە جەنگەکانی تردا تیا بچن، زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ون بن و بفەوتێن، من لەبەر ئەم هۆیە وا دەبینم کە چاکتر وایە هەستن بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز، منیش بە عومەرم وت: چۆن دەبێت شتێك بکەین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەیکردووە؟! عومەریش وتی: وەڵاهی کارێکی خێری زۆر گەورەیە، ئیتر عومەر هەر کۆڵی لێ نەدام و هەر ئەو داوایەی لێ دەکردم تا ئەوە بوو خوای گەورە دڵی منیشی بۆ ئەو کارە کردەوە، وەك چۆن دڵی عومەری کردبوویەوە، منیش وەك عومەر ئەو کارەم بە چاك زانی.

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٣١).

[2] واتا: لەوەی لای منە و لای تۆیە و لای کەسانی تریش.

زەید دەڵێت: ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وتم: تۆ پیاوێکی گەنجیت و خاوەنی ژیریت، هیچ شتێمان لەسەرت نیە، تۆ کاتی خۆی کە قورئان دەهاتە خوارەوە تۆ دەتنووسیەوە، بڕۆ بە دوای قورئاندا هەمووی کۆ بکەرەوە.

زەید دەڵێت: سوێند بە خوا بیانووتایە کەژێك بگوێزەرەوە لە جێیەك بۆ جێیەکی تر ئاسانتر بوو لە لام لەو ئەرکەی دایان بە سەرمدا کە کۆکردنەوەی قورئان بوو، منیش دەستم کرد بە کۆکردنەوەی قورئان لە پەلی دارخورما و بەردی پان و سنگی پیاوان و لەسەر پێستە و ئێسقانی ناو شانی حوشتر.

تا دەڵێت: تا گەیشتمە کۆتایی سورەتی (التوبة) کە لە لای ئەبی حوزەیمەی ئەنصاری بوو (ﷺ) و لە لای کەسی تر نەبوو کە ئایەتەکەش ئەمە بوو: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ (التوبة: ١٢٨)، تا کۆتایی سورەتەکە.

پاشان ئەبو بەکر (ﷺ) ئەو قورئانە کۆکراوەیەی لە لای خۆی دانا و لە پاش خۆیشی دایە دەستی عومەری کوڕی خەتاب و ئەویش لە دوای خۆی دایە دەستی دایکی باوەڕداران حەفصەی کچی خۆی.

بەغەوی لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کە هاوەڵان – خوایان لێ ڕازی بێت – قورئانیان لە نێوان دوو بەرگدا کۆکردۆتەوە، ئەو قورئانەی کە خوای گەورە ناردیە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەبێ ئەوەی شتێکی لێ زیاد بکەن یان کەمی بکەن، ئەوەی کە وای لێکردن وەك لە فەرموودەکەدا هاتووە لەسەر پەلی دارخورما و پێستە و ئێسقان و ئەوەی لە ناو دڵی هاوەڵانیشدا لەبەریان بوو، ترسان بە مردنی ئەو کەسانە هەندێ لە قورئان لە ناو بچێت، بۆیە خۆیان گەیاندە جێنشینی پێغەمبەری خوا و داوایان لێ کرد قورئان کۆبکاتەوە و ئەویش کە بینی ئەوە ڕای هەموانە هەستا بە کۆکردنەوەی قورئان و دانانی لە شوێنێکی تایبەتیدا، نووسیانەوە وەك ئەو شێوەیەی کە لە پێغەمبەری خوایان بیستبوو (ﷺ)، بەبێ ئەوەی پێش و پاشێکی تێدا بکەن، یان بە جۆرێك ڕیزی بکەن کە لە پێغەمبەری خوایان

نەبیستبێت، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگەیشت بە هاورێکانی و بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ لە قورئانەکاندا هەیە قورئانی فێر دەکردن و بۆی دەخوێندنەوە و ئەویش بەو جۆرەی کە جوبرەئیل سەلامی خوای لەسەر بێت پێی وتبوو.

کە بۆی دیاری کردبوو هەموو ئایەتێك لە دوای فلاّن ئایەت و لە فلاّن سورەتدا بنووسرێتەوە.[1]

بەم شێوەی بۆ خوێنەر ئاشکرا دەبێت کە لە کارە بنەڕەتیەکانی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) ئەوەیە کە یەکەم کەس بوو هەستا بە کۆکرنەوەی قورئان، صعصعەی کوڕی صوحان دەڵێت: یەکەمین کەس کە قورئانی لەناو دوو توێی دوو بەرگدا کۆکردەوە و هەروەها میراتیشی بۆ (کەلالە) دیاریکرد.[2]

عەلی کوڕی ئەبو تالیب: (ڕەحمەتی خوا بڕژێت بەسەر ئەبو بەکردا، یەکەمین کەس بوو، قورئانی لە نێو دوو بەرگدا کۆکردەوە).[3]

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) زەیدی کوڕی ثابتی هەڵبژارد بۆ ئەم ئەرکە گرانە، چونکە ئەو خالاّنەی تێدا بەدی دەکرد کە بە هۆیانەوە بتوانێت بەو کارە هەستێت، لەوانە:

١- گەنج بوو: تەمەنی (٢١) ساڵ بوو، کە مرۆڤ لەم تەمەنەدا زۆر چالاّك و پڕ جووڵەیە.

٢- ئامادەیی چاکی تێدا بوو، بەو شێوەیە باشتر حاڵی دەبوو، چونکە هەر کەسێك خوای گەورە ژیریەکی وردی پێبدات ئەوە ڕێگەی خۆی بۆ ئاسان کردووە.

٣- خاوەنی متمانە بوو، کەس بچووکترین تۆمەتی لەسەر نەبوو، بەو جۆرە کارەکەی قبووڵ کراو دەبێت، دەروونەکان پێی خۆشحاڵ دەبن، دڵەکان دڵنیا دەبن لێی.

٤- نووسەری وەحی بوو، بەو کارەی واتا شارەزایی پێشتری بە کارەکە هەبوون کەواتە کارەکە پێشتر کاری خۆی بووە و پێی نامۆ نیە، بێ پەیوەندیش نیە پێوەی.

---

[1] شرح السنة (٤/٢٢٢)،بغوي.

[2] کەلالە ئەو کەسەیە نە کوڕی هەیە و نە باوکی هەیە.

[3] ابن ابي شيبة (٧/١٩٦).

ئەم ڕەوشتە بەرزانە بوون کە وایان کرد لە صدیق (ﷺ) هەڵیبژێرێت بۆ ئەرکی کۆکردنەوەی قورئان، هەر شایانی ئەویش بوو، شارەزایش بوو بە کردنی.

٥- لە سەرووی ئەمانەشەوە یەکێك بوو لەو چوار کەسەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) قورئانیان کۆکردەوە، قەتادە دەڵێت: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی (ﷺ) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا کێ بوون ئەوانەی قورئانیان کۆکردەوە؟ وتی: چوار کەس کە هەر چواریان ئەنصاری بوون، ئوبەی کوڕی کەعب، مەعاذی کوڕی جەبەل، زەیدی کوڕی ثابت، ئەبو زەید.[1]

ئەو ڕێڕەو و شێوازەی زەید گرتیەبەر لە کاری کۆکردنەوەی قورئاندا ئەوەبوو هیچ ئایەتێکیان نەدەنووسیەوە تا دڵنیا نەبووایە لەوەی هاوەڵان لەبەریان بوو، لە خزمەت پێغەمبەری خوایشدا (ﷺ) نووسرابووبێتەوە، کەواتە تەنها بە یەکێك لەوان ڕازی نەدەبوون، لە ترسی ئەوەی نەوەك لە لەبەرکردنەکەدا هەڵەیەك یان لێ تێکچوونێك ڕوویدابێت، هەر کەسێك هەر ئایەتێکی لەبەر بووایە، لێی وەرنەدەگرت تا دوو شایەتی نەبووایە کە ئەو ئایەتە لە حزووری پێغەمبەری خوادا نووسراوەتەوە، هەروەك دەبووایە یەکێك بوایە لەو شێوازانەی قورئانی پێ هاتۆتە خوارەوە.[2]

لەسەر ئەم شێوازە زەید بەردەوام بوو زۆر وردەکاری و چوونە بنج و بناوانی بەکاردەهێنا لە کاری کۆکردنەوەی قورئاندا، هەروەك زەید پێشڕەفتەیەك بوو لەناو ئەو کەسانەدا کە عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دیاری کردن بۆ نووسینەوەی قورئان کە (انشاء الله) لەمەولا بە درێژی لەسوری دەدوێین.

جێ باسی پێنجەم

گرنگترین پەند و ئامۆژگاری لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا:

**یەکەم: سەرکەوتن و هۆکارەکانی، شوێنەواری یاسای پەروەردگار، ڕەوشتی جەنگاوەرانی ئیسلام:**

---

[1] سیر اعلام النبلاء (٤٣٧٢).

[2] التفوق والبخابة علی نهج الصحابة (لا: ٧٤).

١- هاتنەدی مەرجەکانی سەرکەوتن:

زەوی دانە دەست، و سەرکەوتنی ئاینی خوا، و دڵنیا بوون لە پاش ترس، پەیمانێکی خوایە و دێنێتیە دی بۆ ئەو کەسانەی بە مەرجەکانی هەڵدەستن، قورئانی پیرۆزیش زۆر بە ڕوونی و بە جوانی ئاماژەی کردووە بۆ مەرجەکانی سەرکەوتن و وڵات دانە دەست و بەردەوامی لەسەری.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾﴾ (النور: ٥٥-٥٦).

کە ئەم ئایەتانەی پێشوو زۆر بەڕوونی ئاماژە بۆ هۆیەکانی سەرکەوتن دەکەن لەوانە:

- باوەڕی تەواو بە هەموو مانا و ئەرکەکانیەوە.
- کردەوەی چاك ئەنجامدان بە هەموو شێوازەکانیەوە و سووربوون لەسەر هەموو جۆرەکانی خێرکردن دیار و نادیار.
- بەرپاکردنی بەندایەتیەکی دروست و هەمەلایەنە.
- جەنگان دژی هاوبەش پەیداکردن بە هەموو شێواز و جۆر و ماناکانیەوە، بەڵام پێویستیەکانی سەرکەوتن ئەمانەن:
- بەرپاکردنی نوێژ.
- بەخشینی ماڵ و زەکات.

• گوێڕایەڵی تەواوی پێغەمبەری خوا (ﷺ).[1]

دەی لە سەردەمی صدیق (ﷺ) و جێنشینە ڕاشیدەکاندا ئەم مەرج و پێداویستیانەی سەرکەوتن هاتبوونەدی، ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) دوای خوا هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی ئەم مەرجانە لەناو نەتەوەی ئیسلامدا بێنێتەدی، هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە لە عەرەبە دەشتەکیەکانی قبووڵ نەدەکرد کە زەکات نەدەن، سووربوو لەسەر ناردنی سوپاکەی ئوسامە و بە تەواوەتی دەستی گرتبوو بە شەرع و یاسای خوای گەورەوە و لە بچووکترین شت تا گەورەترین شت دانەبەزیووە.

عبدالله کوڕی مەسعود (ﷺ) دەڵێت: لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کارێکمان بەسەردا هات، خەریك بوو لەناو بچین بەڵام باش بوو خوای گەورە خەڵاتی کردین بە ئەبو بەکری صدیق، ئەو پیاوە کۆی کردینەوە لەسەر ئەوەی کە لەسەر حوشترێك نەجەنگین و خواردنی ساکاری عەرەبی بخۆین و خواناسی بە جۆرێك بکەین تا یەقینمان بۆ دێت، خوا ئەبو بەکری وا لێکرد کە بجەنگێت لە پێناویدا، سوێند بە خوا بە هیچ ڕازی نەبوو لێیان بە دوو خاڵ نەبێت، یان پلانی سەرشۆڕکەر یان جەنگی ماڵ کاولکەر.[2]

٢- گرتنەبەری هۆیەکانی سەرکەوتن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ۝٦٠﴾ (الانفال: ٦٠).

---

[1] فقه التمكين في القران الكريم – صلابي (لا: ١٥٧).

[2] الكامل في التأريخ (٢/٢١).

تێبینی دەکرێت کە ئەبو بەکر (ﷺ) بە شێوەیەکی گشتی قۆناغەکانی ئامادەسازی جێبەجێکرد، چ مادی چ دەروونی، ئامادەکردنی سوپا و دیاریکردنی لیواکان و هەڵبژاردنی فەرماندەکان بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان، نامە ناردنی بۆ سەرانی هەڵگەڕاوەکان و هانی هاوەڵانی دا بۆ جەنگ دژیان و کۆکردنەوەی چەك و وڵاخ و حوشتر و خستنە ڕێی جەنگاوەران، و دژایەتی بیدعە و نەفامی و ئارەزووکاری کرد، و حوکمی شریعەتی چەسپاند، و بنەماکانی یەکێتی و یەکگرتن و کۆبوونەوەی جێبەجێ دەکرد، و لەسەر بنەمای خۆیەکلایی کردنەوە کاری دەکرد، ڕێڕەوی هەر کەسە و کار و تایبەتمەندی خۆی زیندووکردەوە، ئەوە خالیدە بۆ سەرکردایەتی سوپا و ئەوەش زید بۆ کۆکردنەوەی قورئان، و ئەوەش ئەبو بەرەزەی ئەسلەمیە بۆ نامە هێنان و بردن، گرنگیشی دەدا بەلایەنی ئاسایش و ڕاگەیاندن و لایەنەکانی تریش و هۆکارەکانی دیکەش.

٣- شوێنەواری کارکردن بە شەرعی خوا:

لە سەردەمی ئەبو بەکری صدیق-دا (ﷺ) بە ئاشکرا شوێنەواری ئیش کردن بە شەرعی خوا دیار بوو پێیانەوە، بەوەی خوا سەری خستن، زۆر سووربوون لەسەر بەرپاکردنی یاساکانی خوا بەسەر خۆیاندا و بەسەر ماڵ و منداڵیاندا، زۆر دڵسۆزانە شەریعەتی خوایان حوکم پێ دەکرد، دەی خوای -سبحانە وتعالی- لە بەرامبەردا بەهێز و بازووی کردن و سەری خستن بەسەر دوژمناندا، و ئەمن و ئاسایش و دامەزراوی تێدا بەرقەرارکردن، و خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾﴾ (الانعام:٨٢).

واتە ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و باوەڕەکەشیان بەستەم و تاوان لەکەدار نەکردووە ئەوانە ژیانی پڕ ئاسایش و ڕێنموونیان پێ دەبەخشین.

سوننەتی خوایان تێدا هاتەدی کە هەر کەسێ ئەو سەر بخات ئەویش ئەو کەسە سەر دەخات، چونکە خوای گەورە چووەتە زەمانەتی ئەو کەسانەی لەسەر بەرنامەکەی دامەزراو دەبن لە دنیا سەربەرزی و سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێ وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن

يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾ (الحج:٤٠-٤١).

واته خوا ئەو كەسانە سەردەخات كە دەيانەوێت ئەو سەربخەن، خوای گەورە بەهێز و زاڵە* ئەوانەی کە ئەگەر دەستەڵاتی سەر زەوییان پێ بدەیت نوێژ بەرپا دەکەن و زەکات دەبەخشن و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەکەن، و پاشەڕۆژی هەموو کارێکیش بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.

هەرگیز ڕووی نەداوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کۆمەڵێك لەسەر ڕێنمایی خوایی کۆببنەوە مەگەر لەسەرەنجامدا هێز و دەسەڵات و گەورەییان پێ دەبەخشێت.[1]

لە سەردەمی صدیق-دا (ﷺ) ڕەوشتی جوان تەشەنەی کرد و ڕەوشتی بەدیش گرمۆڵە بوو.

٤- ڕەوشتەکانی بەرەی سەرکەوتوو:

خوا دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾﴾ (المائدة:٥٤).

واتا: ئەی باوەڕداران هەر کەسێك لە ئێوە لە ئیسلام پاشگەزببێتەوە ئەوا خوا گەلێکی تر دێنێتە کایەوە — خوا خۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت و لە ئاستی

---

[1] في ظلال القران (٤/٢٧٠).

باوەڕداراندا سەر نزمن و لە ئاستی بێ باوەڕاندا سەر بەرزن و لە پێناوی خوادا جیهاد و کوشتار دەکەن و لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسن، ئەمەش بەخششی خوایە دەیبەخشێت بە هەر کەسێك بیەوێت و خوایش فراوان و زانایە.

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) یەکەمین کەس بوو ئەم ڕەوشتانەی تێدا هاتبووە دی و ئامۆژگاری سوپاکانیشی دەکرد کە بەو چەشنە بن و ئەمەش ڕوونکردنەوەی ئەو خاڵانەیە یەك یەك:

١- يحبهم ويحبونه:

ڕێڕەوی پێشینەی — السلف — دەربارەی خۆشویستن — لە خواوە — وا پێناسە دەکەن کە سیفاتێکی خوایە بەبێ چۆنیەتی و تەئویل کردن و بەبێ ئەوەی هاوشێوەی بکەیت لەگەڵ کرداری دروستکراوەکاندا خوای گەورە ئەو بەرەیەی خۆش دەویست لەبەر خاتری ئەو هەمووە هەوڵ و تێکۆشانەیان لە پێناو ئاینەکەیاندا و بەو هەمووە خۆبەخشیەی کە فەرز نەبووە لەسەریان بەو قورسیە، ئەمەش لەبەر ڕەزامەندی خوا و خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی، جێبەجێکردنی سونەت و شتە وردەکان وەك بڵێی فەرز بێت لە سەریان هەر دەبێت بیکەن.[1]

ئەم بەرەیە وا وەسف کراون کە چاکەکاری و لە خواترسان و خۆگریان لە ڕادە بەدەر بووە و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٣٤﴾ (ال عمران:١٣٤).

هاوەڵانیش خوایان لێ ڕازی بێت خوایان زۆر زۆر خۆش دەویست و بە هیچ شتێك نەیاندەگۆڕیەوە و ڕقیشیان بوو لە هەر شتێك ئەو ڕقی لێ بووایە، دۆستایەتی ئەوانەیان دەکرد کە دۆستی ئەو بوون و دوژمنایەتی ئەوانەیان دەکرد کە دوژمنایەتی خوا دەکەن، و شوێن پێغەمبەرەکەی دەکەوتن و لەسەر ڕەوشتی ئەو دەڕۆیشتن، هاوەڵان خوای خۆیان خۆش دەویست،

---

[1] کیف نکتب التأريخ — محمد قطب (لا:٩٠).

پەروەردگار و ڕۆزی دەریانە، خۆ دەروونەکانیش وا ڕا هاتوون ئەوەیان خۆش دەوێت کە چاکەیان لەگەڵ دەکەن.

چ چاکەیەکیش لەوە گەورەترە کە دروستی کردوون بە جوانترین شێوە و یاسایەکی ئاسانی بۆ هێناونەتە کایەوە و مرۆڤی لە جوانترین شێوەدا دروست کردووە، سەرەڕای ئەمەش بەهەشتی هەتا هەتایی بۆ ئامادەکردووە ئەگەر گوێڕایەڵی بێت، بەهەشتێك کە شتی وای تێدایە نە چاو دیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی و نە بە دڵی کەسیشدا هاتووە، لەبەر ئەمانە و لەبەر زۆر شتی تر، ئەو بەرە ناوازەیە خوای خۆیانیان بە جۆرێك خۆش دەویست کە بێ وێنە بوو خۆیان و سامان و کەس و کاریان خستە پێناوی خواوە، نە ڕاڕا بوون نە منەتیشیان دەنواند، بەڵکو ئەمەشیان بە بەخششێکی خوای گەورە سەیر دەکرد، کە دەرگای جیهاد و گیانبازی و شەهید بوونی لێ ئاوەڵا کردوون و هۆکارەکانی بۆ ئاسان کردوون، ئەوانیش بە باشترین شێوە هەستان بە ئەنجامدانی.[1]

٢- «اذلة على المؤمنين أعزة على الكافرين»:

ئەمەش لە ڕەوشتە بەرزەکانی باوەڕدارانە کە نەرم و نیان و خۆ بە کەم بزانن بەرامبەر برا موسوڵمانەکانیان، خۆیشیان زۆر بە گەورە بزانن بەرامبەر دوژمن و نەیارانیان.[2]

لەبەر ئەوە بوو کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لەگەڵ سەربازە گیان لەسەر دەستەکانیدا هەستان بە یارمەتیدانی باوەڕداران و خۆیشی لەگەڵیان دەرچوو بۆ جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا و یانزە لیوای بۆ ئەو مەبەستە خستە ڕێ، دەسەڵاتی هەڵگەڕاوەکانی لەناوبرد، بە هیچ جۆرێك قبووڵی نەکرد لەو هەڵگەڕاوانەی کە باوەڕدارەکانی ناو خۆیانیان بە سزای سەخت شەهید کردبوو کە لێیان خۆش بێت جگە لەوەی کە هەمان سزایان بەسەردا بێنێتەوە و هەموو فەرماندەکانیشی فێر کردبوو هەر ئاوا بن و زۆریش سوور بوو لەسەر سەرپەرشتی کردنی هاوڵاتیانی کۆمەڵگەکەی و پێشتر باسمان کرد کە چۆن هەڵسوکەوتی نەرم و نیانی لەگەڵ پیر و

---

[1] الايمان واثره في الحياة، قرضاوي (لا: ٥-١٢

[2] التفسير القاسمي (٢٥٥/٦).

کەنیزەك و بەساڵاچووەکان دەرکرد، تا وای لێ هات ئەم ڕەوشتە بەرزانە باڵی هێنا بەسەر کۆمەڵگەدا لەسەردەمی ئەبو بەکری صدیقدا (ﷺ).

٣- ((یجاهدون في سبیل الله ولایخافون لومة لائم)):

ڕەوشتی جیهاد و کوشتاری دوژمنانی خوا لەسەردەمی صدیقدا (ﷺ) لەوەدا بەرجەستە بوو کە دژی هەڵگەڕاوەکان جەنگان و هێزیان پساندن، بەردەوامیش ئەم کارە پیرۆزە لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانی داهاتوودا.

هاوەڵان لەگەل دوژمناندا جەنگان ئەمەش لە پێناو بەرز ڕاگرتنی ناوی خوا و هێنانە کایەی بەندایەتی تەواو بۆ پەروەردگار و بنیاتنانی حوکمی ئیسلامی جێبەجێکردنی بەرنامەکەی خوا لەسەر زەویدا و لە پێناوی دوور خستنەوەی ترسی هێرشی هەڵگەڕاوەکان و نەهێشتنی ستەم لە ناو خەڵکدا.

تەنها بە جیهادیش سەربەرزی ئیمانداران و سەرشۆڕی هەڵگەڕاوەکان هاتەوە دی، خەڵکیش بەرەو ئاینە پاکەکەی خوا گەڕانەوە، سەرکردایەتی ئیسلامی بە فەرماندەیی صدیق (ﷺ) توانی کەنداوی عەرەب بگێڕێتەوە باوەشی ئیسلام و بیشی کات بە بنکەیەکی سەربازی بۆ جەنگە ڕزگاریخوازەکانی جیهان بە گشتی.

کەنداو بوویەوە بە کانیاوێکی ساف و زوڵاڵ کە لێیەوە ئیسلامی بێگەرد ڕووناکیەکەی دەبەخشی بە هەموو بەشەکانی سەر زەوی ئەمە بە هۆی کۆمەڵێك پیاوی جوان شێراوی ژیان، بوونە دەستەی خێرخواز لە بوارەکانی پەروەردە و فێرکردن و جیهاد و بەرپاکردنی شەرعی خوا بە شێوەیەکی گشتی بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤەکان لە هەر کوێ بن.[1]

ئەو جیهاد و ڕووبەڕووبوونەوانەی هاوەڵان لەگەڵ تاقمی هەڵگەڕاوەکاندا، ئامادەکاریەکی خوایی بوو تا دوا ڕۆژ بیانکاتە سەربازی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام، چونکە لەو جەنگەدا تواناکان دەرکەوتن و وزەکان تەقینەوە، کۆمەڵێك فەرماندەی جەنگی تازە دەرکەوتن و فەرماندەکان لە هەموو هونەرەکانی جەنگیان لەو جەنگەدا تاقی کردبوویەوە.

---

[1] فقه التمکین في القران الکریم (لا: ٤٩١).

کۆمەڵێك ڕەوشتی سەربازی ڕاستەقینە دەرکەوت، وەك ڕاستگۆیی و گوێڕایەڵی و ڕێك و پێکی و تێگەیشتوویی کە بزانێت بۆچی و لە پێناوی چیدا دەجەنگێت، و هەموو شتێك دەخاتە خزمەت ئەو ئامانجەی کە لە پێناویدا قوربانی دەدات، بۆیە کارەکەی سەرکەوتوو بوو، ئیشەکانی دروست بوون.[1]

نیوە دوورگەی عەرەب بە یارمەتی خوا یەکی گرت و پاشان هاوەڵان لە دوای صدیقەوە (ﷺ) دەستیان دایە جیهاد و بۆ یەکەمجار پاش وەفاتی پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) کۆمەڵێك سەرانی هەڵگەڕاوەیان لە ناو برد و کۆمەڵێکی تریان بەکارهێنایەوە لە ناو لەشکری ئیسلامدا.

پایتەختی ئیسلام دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو کەنداوی عەرەبدا درێژ کرد، وای لێهات هەموو ئومەتی ئیسلام پێکەوە لە دوای یەك سەرکردە، یەك فیکرە، سەرکەوتنەکان سەرکەوتن بوون بۆ بانگەوازی ئیسلامی و یەکبوونی ئومەتی ئیسلام و بە هاوکاری و زاڵبوون بەسەر هۆکارەکان و پەرتەوازەیی و دەمارگیری، هەروەك بەڵگە بوو لەسەر ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلام بە سەرکردایەتی صدیق (ﷺ) توانای هەبوو زاڵ بێت بەسەر ناهەموارترین قەیراندا.[2]

ئا بەم شێوەیە هاوەڵان جیهادیان لە پێناوی خوادا دەکرد و لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسان و لەبەر بەهێزی دینداریان گوێیان بە ڕەخنە و نەیاران نەداوە، ئێ چونکە هەموو هەوڵێکیان بۆ سەرکەوتنی هەق و پوچەڵ کردنەوەی ناڕەوا.[3]

٤- «ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء»:

ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خۆشەویستان بۆ خوا و خۆشەویستی خوا بۆ ئەوان و جیهادیان لەپێناوی خوادا و گوێ نەدانیان بە لۆمەی لۆمەکاران، هەر هەمووی بەخششی خوایی یە دەیدات بە دۆستەکانی خۆی، واتە دەیدات بە هەر کەسانێك وەك زیادە ڕێزێك لە

---

[1] تأريخ صدر الاسلام – شجاع (لا: ١٤٢-١٤٣).

[2] التأريخ الدعوة الاسلامية د. جميل المصري (لا: ٢٥٦).

[3] تفسير المنير (٦/٢٣٣).

بەخشندەیی خۆیەوەیە و خوای گەورەیش خاوەنی چاکە و بەخششی زۆرە.[1] و خوایش (جل جلاله) خۆی باش دەزانێت بەکێی بدات و لە کێی بگرێتەوە.[2]

**دووەم: وەسفێکی کۆمەڵگە لەسەردەمی صدیق دا(ﷺ):**

کاتێ لە کۆمەڵگەی ئیسلامی جێنشینە ڕاشیدەکان دەکۆڵینەوە هەندێ ڕەوشتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لەوانە:

١- بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگەیەکی موسڵمان بوو بە هەموو مانای وشە، باوەڕێکی بتەو بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی، جێ بەجێ کەری هەموو ڕێنماییەکانی ئیسلام بە لێبڕانێکی ئاشکراوە، پابەند بوونێکی ڕوون، بە کەمترین ئاستی گوناه و تاوان کردن- کە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا و لە مێژوودا ڕووی داوە.

ئاین لەلای ئەوان هەموو ژیان بوو، نەك وەك هەموو شتێکی هامیشی کە جارِ بە خەڵکی بکەوێتەوە و بچێت بە لایدا، بەڵکو ژیان خەڵکی و گیانیان بوو، خۆ ئەمەش تەنها جێبەجێکردنی هەندێ بەندایەتی نەبوو هەرچەندە بە جوانترین شێوە جێبەجێیان دەکرد، بەڵکو لە ڕەوشتیاندا، لە بیرکردنەوەیاندا، لە بۆچوونیاندا، لە بەها بەرزەکانیاندا، لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیاندا، لە ژیانی خێزانی و پەیوەندی دراوسێیەتیاندا، لە کڕین و فرۆشتنیاندا، لە بازرگانی و کاسبیەکانیاندا، یەکتری تەواو کردن و وەزع باشەکانیان دەچوونە کەفالەتی هەژار و نەدارەکان، فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپەیان.

چاودێری کردنی بەرپرس و کاربەدەستەکان، هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەموو تاکێکی ئەو کۆمەڵگەیە ئەم ڕەوشتانەی تێدا بووە، چونکە ئەمە مەحاڵە لە هیچ کۆمەڵگەیەك بەشەریدا ڕوویدات، ئەوەتا کۆمەڵگەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ) دووڕووی تێدابوو کە بەسەر زارەکی موسوڵمان بووبوون و لە ژێرەوە کوفریان حەشار دابوو، هەروەك باوەڕ لاواز و ناتوانا و تەمەڵ و خاو و خلیچك و ناپاکیان تێدا بووە، بەڵام هیچێك لەو کەسانە ناویان نەبوو، نرخیان نەبوو لەو کۆمەڵگەیەدا، ڕۆڵی لادانی کۆمەڵگەکەشیان نەبوو، چونکە لایەنی بەهێز و بە گوڕ،

---

[1] تفسير القاسمي (لا: ٦/٢٥٨).

[2] تفسير المنير (٦/٢٣٣).

لایەنی ئەو کەسانە بوو کە بە ڕاستی لەگەڵ باوەڕدا بوون و لە پێناوی خوادا بە سەر و ماڵ تێدەکۆشان و جیهادیان دەکرد و پابەندبوو بوون بە ڕێنماییەکانی ئەم ئیسلامەوە.[1]

٢- کۆمەڵگەیەك بوو لە بەرزترین ئاستا مانای (ئومەت)ی تێدا هاتبووە دی، خۆ ئومەت تەنها ئەوە نیە کۆمەڵێك کەس یەك زمان و یەك خاك و یەك بەرژەوەندی کۆی کردبنەوە، ئەوە پەیوەندیەك بوو لە سەردەمی نەفامیشدا هەبووە، ئەگەر ئومەتێکیشیان پێك هێنابێت نەتەوەیەکی نەفامی بووە.

بەڵام نەتەوە — ئومەت — بە مانا خواییەکەی — پەیوەندیەکە بە هۆی بیر و باوەڕەوە، بەبێ گوێ دانە یەك زمان و ڕەنگ و ڕەگەز، و پەیوەندی بەرژەوەندیە لە یەك نزیکەکان، ئەم جۆرە ئومەتەش لەهەموو مێژوودا تەنها لە ئیسلامدا هاتووەتە دی.

ئومەتی ئیسلامی توانی مانای وشەی (ئومەت) بەتەواوەتی و بۆ ماوەیەکی بێنێتە دی، ئومەتێك زمان و نەژاد و ڕەنگ و بەرژەوەندی یەکانی سەر زەوی یەکی پێنەگرتوون، بەڵکو بیروباوەڕ لکاندوونی پێکەوە و دەبینی عەرەبیەك و فارسیەك و حەبەشیەك و ڕۆمیەکی کردبووە برا، و پەیوەندی دروستکردبوو لە نێوان گەلە ڕزگار کراوەکان و گەلە ڕزگارکەرەکان لەسەر بناغەی برایەتی ئاینی ڕاستەقینە، ئەگەر مانای (ئومەت) بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لەسەر زەویدا هاتبێتە دی، ئەوە ماوەی حوکمی ئیسلام پڕشنگدارترین ماوە بوو کە ئیسلامی تیا بەرپا کرابوو بە هەموو ماناکانیەوە، لە ناو ئەو مانایانەدا مانای (ئومەت) بە جۆرێك کە پێشتر شتی نەبوو.[2]

٣- کۆمەڵگەیەکی بە ڕەوشت بووە، کە لەسەر بنەمایەکی ڕەوشتی ئاشکرا و ڕوون بەرپاکرابوو لەسەر بناغەی فەرمان و ڕێنمایەکانی ئاین، کە ئەوەش بنەمایەکی تەنها پەیوەندی نێوان ژن و پیاو ناگرێتەوە، هەرچەندە ئەمە دیارترین نیشانەی ئەم کۆمەڵگەیەیە، بەرەڵایی تێدا نیە، تێکەڵی ژن و پیاوی تێدا نیە، خاڵیە لە هەموو وتەیەك یان ئاماژەیەك یان کردەوەیەك کە شەرمی تێدا بشکێت.

---

[1] کیف نکتب التأریخ الاسلامي؟ (لا: ١٠٠).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا:١٠١).

لە خراپەکاری بە دوورە و داوێن پاکە مەگەر تاق و ترایەك کە لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەیە، بەڵام بنەمای ڕەوشت لەوە گەورەترە کە پەیوەندی نێوان دوو ڕەگەزەکە بێت و بەس، بەڵکو لایەنی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و هزری ڕادەربڕین دەگرێتەوە دەسەڵات لەسەر ڕەوشتی ئیسلامی بنیات دەنرێت، پەیوەندی خەڵکی لە ناو کۆمەڵگەدا لەسەر بنەمای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و دڵسۆزی و هاوکاری و خۆشەویستی لەگەڵ یەکتریدا هەڵسوکەوت دەکەن، کەس لاقرتێ و دوو زمانی و دەم کوتان بۆ ناموسی خەڵکی ناکات لەگەڵ خەڵکیدا.[1]

٤- کۆمەڵگەیەکی (جدی)یە:

خەریکی کارە مەزنەکانە و خۆی لە هەموو کارە بچووك و بێ بایەخەکان لا دەدات، خۆ — جدی — ئەوە ناگەیەنێت وشك و ئیداری ڕووت بێت!، بەڵکو گیانێکە بۆ بەرز کردنەوەی ورە و هانی چاك بوون و کار کردن و جووڵە دەدات.

هەروەك کاری خەڵکی و خۆ خەریك کردنیان بە شتانێکی بەرز و بایەخدار و واقیعیەوە دەبێت، ئەمەش لە کۆمەڵگەی گێل و بێکاردا نیە، کە لە ماڵ و جادەکاندا بۆ هۆکارێك دەگەڕێت کاتەکانیانی پێ بکوژن.[2]

٥- کۆمەڵگەیەك کە یەك پارچە کارکردنە، لە هەموو ڕوویەکەوە گیانی سەربازی تێدا بەدی دەکرێت نەك تەنها لە کاتی جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا و بەس هەرچەندە جەنگ و جیهاد گۆشەیەکی گەورەی ئەم کۆمەڵگەیەی پڕ کردۆتەوە، بەڵکو لە هەموو ڕوویەکەوە، هەمووشی لە ئامادەباشیدایە کەی کارێکی بدرێت بە سەردا و ئەو جێبەجێی بکات، ئیتر وابێت هیچ پێویست بەوە ناکات سەرباز بگیرێت و میللەت سەغڵەت بکرێت، هەر هەموویان هەمیشە حازرن بۆ بەرگری لە بیروباوەڕ و ئەو کاریگەریەی کە بیروباوەڕ تێدا دروستی کردووە کە ئامادەی چالاکی نواندن بێت لە هەموو ڕوویەکەوە.

---

[1] کیف نکتب التأريخ الاسلامي؟ (لا: ١٠٢).

[2] کیف نکتب التأريخ الاسلامي؟ (لا: ١٠٢).

٦- کۆمەڵگەیەکی خوا پەرستە، گیانی بەندایەتی بە ئاشکرا بەدی دەکرێت تیایدا، نەك تەنها لە جێبەجێکردنی فەرزەکاندا، وە کردنی سونەتەکان لەبەر ڕەزامەندی خوا، بەڵکو لە هەموو کار و کردەوەیەکدا، کارکردن لە هەستیدا بەندایەتیە، ئەگەر بە گیانی بەندایەتیەوە بە جێی بهێنێت، حاکم فەرمانڕەوایی گەلەکەی دەکات بە گیانی بەندایەتیەوە مامۆستا خەڵکی فێری قورئان دەکات بە گیانی بەندایەتیەوە، بازرگان کە لە کارەکەیدا بە گیانی لە خواترسانەوە کڕین و فرۆشتن دەکات، پیاو ماڵەکەی بەڕێوە دەبات بە گیانی بەندایەتیەوە، ژن خزمەتی منداڵەکانی دەکات بە گیانی بەندایەتیەوە، ئەمەش بۆ هاتنە دی فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرموویەتی: «کلکم راعٍ وکلکم مسؤلٌ عن رعیته».[1]

ئەمە لە نیشانە ڕوون و دیارەکانی سەردەمی خەلافەتی صدیق بوو (رضي الله عنه) ئەم نیشانانەش وایان لێ کردبوو کە کردبوویانە کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان لە بەرزترین ئاستدا و ئەمەش وای کرد لەو ماوەیە کە دابنرێت بە ماوەی نموونەیی لە مێژووی ئیسلامدا.

هەر کاریگەری ئەو ماوەیەش بوو کە وای کرد لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە شێوەیەکی خێرا و سەرسووڕ هێنەر بڵاوبێتەوە، بزاڤی ڕزگاریخوازیەکانی ئیسلام (نهوضان) خێراترین بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی بوو لە هەموو مێژوودا، کە لە ماوەی کەمتر لە (٥٠) ساڵدا توانی درێژ ببێتەوە لە خۆرهەڵاتەوە بگاتە دەریا و لە خۆرئاواشەوە بگاتە هیندستان کە ئەمەش دیاردەیەکی شایانی ئەوەیە تۆمار بکرێت و بخرێتە بەر چاو.

هەروەها موسوڵمان بوونی ئەو گەلانەی کە ڕزگار دەکران بەبێ هیچ زۆر و ترساندنێك، ئەو ڕەوشتانەی کە ئەم کۆمەڵگەیەی پێ ناسرابوون بەهای ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیە بوون، خەڵکی خۆشەویستی ئیسلام دەچووە دڵیان کە بەم ڕەوشتە بەرزانەوە دەیانبینی بە شێوازێکی سەرسووڕهێنەری پڕشنگدار و ئیتر خۆشحاڵ دەبوون یەکێك بن لە شوێنکەوتووانی.

## سێیەم: سیاسەتی صدیق (رضي الله عنه) لە جەنگی دژی دەست تێوەردانی بێگانە:

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەو جمو جۆڵەی دەوڵەتی ئیسلامی بە سوپاکەیەوە لەناو کەنداوی عەرەبیدا سەرکەوتووانە دەهات و دەچوو، وای کرد لە زۆری لەو هۆزانەی کە هاوسنور بوون لەگەڵ ڕۆم و فارسەکاندا خۆیان بدەنەوە دەستی دەوڵەتی ئیسلام، هەر کە هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوایان بیست (ﷺ) ئیتر هەوڵیان دابوو خۆیان لەو دوو دەوڵەتە نزیك بکەنەوە، فارس و ڕۆمەکانیش ئەمەیان بەهەل زانی و هانی ئەو هۆزانەیان دەدا کە ڕووبەڕووی دەوڵەتی ئیسلامی ببنەوە.[1]

سیاسەتی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بۆ بەرگرتن لەم دەست تێوەردانە دەرەکیە، ئەوە بوو دوا بەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپای ئوسامەی نارد بەرەو شام و ئەو کارەی بوو بەزامنی ئەوەی کە ئەو هۆزانە بیر لە هێرش کردن نەکەنەوە بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی.

هەروەها خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصی بەسوپایەکەوە نارد بۆ (حەمقەتەین) کە دەیڕوانی بەسەر شامدا، عەمری کوڕی عاصی نارد بۆ تەبوك و دەمەت جەندەل، عەلای کوڕی حەزرەمی نارد بۆ بەحرەین، پاشان بەدوایدا (مثنی کوڕی حاریثەی شەیبانی) نارد بۆ خواروی عێراق پاش ئەوەی کە زاڵبوو بەسەر هەڵگەڕانەوەی بەحرەیندا.

سەجاجی تەمیمیشیان ناچار کرد کە ئەو ژنە گاورە بوو لە عێراق داوای پێغەمبەرایەتی دەکرد کە بشکێت و پاشەکشە بکاتەوە بۆ عێراق کاتێك سوپای ئیسلامی بەو هێزە گەورەیەوە بینی.

سوپای موسڵمانەکان بەسەرکردایەتی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لە ئاستێکی بەرزی هۆشیاری و هەڵست بە بەرپرسیارێتیدا بوون، سنووری باکووریان زۆر بە وردی دەپاراست، لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوا بە درێژایی هاوسنووریان لەگەڵ فارس و ڕۆمەکاندا پیاوانی وەك عەلای حەزرەمی و خالیدی کوڕی وەلید لە سەرووی نەجدەوە و عەمری کوڕی عاص لە دەوت جەندەلەوە و خالیدی کوڕی سەعید لە کەنارەکانی شام و ئەمەش جگە لە سوپاکەی ئوسامە.[2]

فاریەکان لە کەمیندا بوون بۆ دەست وەشاندن لە ئیسلام، بەڵام خۆیان وەك ئەژدیها حەشار دابوو، بە تایبەت کە دەیانبینی کشانی دەوڵەتی ئیسلامی دەوڵەتەگچکە گەندەڵەکانی

---

[1] دراسات في العهد النبوة والخلافة الراشدة (لا:٣١١).

[2] حروب الرد، (لا: ١٧٤-١٧٥).

مێژوو ڕادەماڵێت و هەموو هێزی خراپە و سەرکەشان تێك دەشکێنێت، هەر هەلی لە ئیسلام پاشگەز بوونەوە بۆ هۆزەکان ڕەخسا یەکسەر هۆزی بەکری کوڕی وائیل خۆیان گەیاندە کیسرا و پاش مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوای حوکمڕانی بەحرێنیان لە فارسەکان کرد و ئەوانیش پەسەندیان کرد و لەگەڵیان سوپایەکیان نارد بە سەرکردایەتی مونذیری کوڕی نوعمان کە حەوت هەزار چەکداری لەگەڵدا بوو،[1] کە نزیکەی (١٠٠) سواریان لەگەڵدا بوو وەك پاڵپشتی بەرامبەر هێزی موسوڵمانەکان کە کۆمەڵێ ناتوانا بوون جێگەی مەترسی نەبوون هەروەك کولاعی دەڵێت.

موسەیلەمەی درۆزنیش جێگەی ئومێدی فارسەکان بوو، د. محمد حسین هیکل دەڵێت: سەجاح لە باکووری عێراقەوە بەرەو نیمچە دوورگەی عەرەب نەدەڕۆیشت بەو هەمووە جەنگاوەرەوە ئەگەر بە هاندانی فارسەکان نەبووایە، لە ڕێگەی کارمەندەکانیانەوە لە عێراق دەیانوویست زیاتر بڵێسەی بێت ئەو شۆڕشە هەڵگەڕاوەیەی ناو عەرەب.[2]

ئەمە ڕۆڵی فارسەکان بوو، بەڵام ڕۆڵی ڕۆمەکان ئاشکراتر و ترسناکتر بوو چونکە هەڵوێستی ڕۆم دەربارەی ئیسلام زۆر ڕەق و گیرتر بوو، چونکە ئەوان گەلێکی خاوەن بیروباوەڕ و فیکر بوون، خاوەنی یاسا و دەستووری ڕێك و پێك کرابوون، خاوەنی جەنگاوەر و چەك و تفاقێکی زۆر بوون و هاوپەیمانیەتی و شوێن کەوتە بوون، لەبەر ئەم هۆیانە هەمیشە پەیوەندی نێوان ئەوان و موسوڵمانەکان لە بەرزترین ئاستی خراپیدا بوو.[3]

هەر لە سەرەتاوە لەو کاتەی نامەی پێغەمبەری خوایان پێ گەیشت هەوڵیان دا لە ڕووی موسوڵماناندا بوەستنەوە، بەو هۆیەوە دوو جەنگ بەرپا بوو، کە (مؤتە و تەبووك) بوو، کە موسوڵمانەکان سەلماندیان بۆ ڕۆم کە دەوڵەتی ئیسلامی پارویەکی ئاسان نیە و نە قوت دەدرێت و نە دەشکرێت.

---

[1] الاکتفاء في التأریخ المصطفی وثلاثة الخلفاء (٣/٣١٨-٣١٩).

[2] الرد، غیذاء خزانة کاتیي (لا: ٤٩)، لە (حرکة الرد) وەرگیراوە (لا: ١٤٦).

[3] حرکة الردة — عتوم (لا: ١٤٦).

هەروەها سەلما بۆ موسوڵمانەکان کە چۆن هۆزەکانی شام دڵسۆزانە لە پێناو ئاینەکیدا دەجەنگن و بۆ ڕۆمەکان بەو جۆرە دڵسۆز نین، لەگەڵ ئەو ڕێککەوتننامانەدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ خۆی لەگەڵ ئەو هۆزانەدا بەستی کە ژێر دەستەی ڕۆم بوون ئەوەش پاش جەنگی تەبووك بوو.

ڕۆمەکان بەردەوام لەوەدا بوون بدەن لە دەوڵەتی ئیسلام و هەوڵی پەڕ و باڵ کردنیان دەدا و دواتریش بتوانن بەتەواوەتی لە ناوی بەرن ئەبو بەکریش (ﷺ) زۆر چاك لەم لایەنەوە ئاگادار بوو، هەر بۆیەش زۆر سووربوو لەسەر دەرکردنی سوپای ئوسامە بۆ تەمێ کردنی ڕۆمەکان، ئەوە بوو هۆزەکانی- لەخم و غەسان و جوزام و بەلی و قوضاعة و عوذرە و کەلب- هەستان بە جێ بەجێ کردن و دەستگرتن بەو پەیمانانەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مۆریان کردبوو.

ئەی جگە لە ڕۆم کێ سوتەمەنی جەنگی بۆ ئامادە دەکردن لە چەك و تفاق و سەرباز و پلانی جەنگی؟! بەم کارەی صدیق (ﷺ) دەیویست بە زمانی حاڵ بە ڕۆمەکان بڵێت: ئێمە لەگەڵ ئەو پەرتەوازە ناوخۆییەماندا، هیچ لە بازوومان کەم نابێتەوە و ئێمەی موسڵمان دەتوانین گەورەترین هێرش و لە گەورەترین دەوڵەتەوە بکرێتە سەرمان بەر پەرچی بدەینەوە ئیتر با لەلای ئێوەشەوە بێت.[1]

پشت هەڵکردنی دورگەی عەرەب لە ئیسلام، هیوایەکی لە دڵی فارس و ڕۆمەکاندا دروست کردەوە، کە هەوڵ بدەن ئیسلام لەناو بەرن، هەردوو دەوڵەتەکە هەموو هاوکاری و کۆمەکیەکیان پێشکەش کرد بەو وڵاتانەی کە وازیان لە ئیسلام هێنابوو، هەڵاتووەکانیان داڵدە دەدان، هەر بۆیەش هەر کە موسوڵمانەکان دوورگەی عەرەبیان کۆنترۆڵ کردەوە و دەوڵەتی ئیسلامیان کردەوە بەیەك، یەکسەر بەرەو باکوور سوپایان خستە ڕێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو دوو دوژمنە زلهێزەی کە لە کەمیندا بوون بۆ ئیسلام.[2]

---

[1] حركة الرد للمتوم (لا: ١٥٠)

[2] موسوعة التأريخ الاسلامي، د. احمد شلبي (١/٣٨٨).

صدیق (ﷺ) شاری سەقامگیر و ئاشتیەوە — مەدینە — دەستی کرد بە جوولانەوەی سوپا و بە هەموو شێوەیەك هاوکاری ئەو سوپایەی کرد تا لە چاوی دوژمنان گرنگ بێت و ترس بەرێتە دڵیانەوە.

ئەبو بەکر (ﷺ) توانی خێر و خۆشی بنکەی دەوڵەتەکەی بگەیەنێتە هەموو کون و قوژبنێکی دوورگەی عەرەب، چۆن دەیتوانی ناوچەکانی شام و عێراق ڕزگار بکات ئەگەر بنکەیەکی گەورەی لە دوورگەی عەرەبیدا مسۆگەر نەکردبێت کە دۆستی ئیسلام بن و بە ئیسلامیش یەك بگرن.

مسۆگەر کردنی ئاسایشی ناوچەکە لە سێ خاڵدا خۆی دەبینیەوە:

یەکەم: سووربوونی خەلیفە لەسەر بەردەوامی جیهاد و باوەڕی پتەوی بە شیاویی و بەرزی و ناوازەیی فیکرەکەی.

دووەم: خاوێن کردنەوەی کۆمەڵگە بچکۆلەکە کە پێکهاتبوو لە پشتیوانان و کۆچەریان لە مەدینەی پڕ نوور.

سێیەم: خاوێن کردنەوەی کۆمەڵگە گەورەکە کە کۆمەڵگەی عەرەبی بوو لە هەموو خەوشێکی هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا و زۆنگاوی هەڵگەڕانەوە.

ئەم ئاستانە خرانە سەریەك تا لە ئاکامدا کۆشکێکی مەزنی لێ پێکهات، توانی بەو هێزە گەورەیەوە هەموو خاڵە سنووریەکانی وڵاتی ئیسلام توند و قایم بکات بە جۆرێك کە بوون و کەیانی فارس و ڕۆمی خستە لەرزە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە سوپایەکی یەك ڕیز، یەك بیروباوەڕ و یەك ئاڵا، پشت ئەستوور و دڵنیا لە هەموو کۆمەکیەك لە دوورگەی عەبەریەوە دەرچوو بەرەو دنیا.[1]

**چوارەم: لە ئاکامەکانی ڕووداوی پاشگەزبوونەوە:**

جەنگ دژی هەڵگەڕاوەکان ئەنجام و ئاکامی زۆری لێ کەوتەوە کە بەکات و شوێن دیاری ناکرێت، بەڵکو بۆ ماوەیەکی درێژ و نەوەیەکی بێ شمار و کۆمەڵێکی زۆر لە بیرۆکە و ئەحکامی فیقهی کە بەرەکانی داهاتوو زۆر کەڵکیان لێ وەرگرت لەوانە:

---

[1] حرکة الردة (لا: ٢٢٣).

١- جیاکردنەوەی ئیسلام لە هەموو بیرۆکە و بۆ چوونەکان:

دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتەکان هەموو تێك چوون بەسەریەکدا و عەرەبە دەشتەکیەکان بە پلە بەرەو پاشگەز ڕۆیشتن، کە هەندێکیان لەوانە بوون دڵیان ڕاگیر کرابوو، هەندێکیشیان لە دووڕووەکان بوون، یان ئەوانە بوون لەم دواییانەدا بە ناچاری موسڵمان بوو بوون، یان لەوانە بوون کە لەڕاستیدا هەر موسڵمان نەبوو بوون.

لە دوو جۆرەکەی یەکەم، موسڵمان بوونەکەی (عیینەی کوڕی حصنی فەزاری) کە موسوڵمانە بوونەکەی خەوشی زۆری تێدا بوو، تا ئەوەبوو هەر کە ئاشوبی هەڵگەڕانەوە هەڵگیرسا خێرا چوو بە دەمیەوە، وە ئاینەکەی خۆی فرۆشت بە (تولەیحەی ئەسەدی) ئەوەبوو کاتێك بە دیلی گیرا و برا بۆ مەدینە بۆ لای ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) بە کۆت و زنجیرەوە هێنایان و هەر کە منداڵانی صەحابی دەیاندا بە لایدا تێیان دەکوتا و پێیان دەگووت: ئەی دوژمنی خوا پاش موسوڵمان بوون کافر بوویتەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەیووت: سوێند بە خوا هەرگیز باوەڕم بە خوا نەبووە.[1]

وە لەوانەی کە هەرگیز موسوڵمان نەبووبوون وەك هۆزی عەنەس لە یەمەن، کە هۆزی ئەو سەرکەشە بوو کە ناوی ڕەشەی عەنەسی بوو پاگەندەی پێغەمبەرایەتی خۆی دەکرد، لە وڵاتی یەمەندا ئەوەی کردی کردی و ئەشکەنجەی موسوڵمانەکانی دەدا.

نموونەی ئەوانەی کە بە خراپ لە ئایەتەکانی قورئان تێگەیشتبوون کە وای لێکردن کافر بوون، بۆ نموونە زەکاتیان نەدەدا و دەیانووت: قورئان دەفەرموێت: ئەی محمد تۆ زەکاتیان لێ کۆبکەرەوە واتا بە ڕای ئەو کەسانە بۆ کەسی تر نیە زەکات کۆبکاتەوە وەك دەفەرموێت:

﴿خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ (التوبة:١٠٣).

---

[1] التأريخ الطبري (لا: ٣/٢٦٠).

(ابن كثير) به ڕەحمەت بێت لەسەر ئەم ئایەتە دەڵێت: هەندێك لە هۆزەكانی عەرەب زەكاتیان نەدەدا بە بەڵگەی ئەوەی كە شتێك بووە تایبەت بووە بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ئیمام نیە دوای ئەو كۆی بكاتەوە، ئەوە نیە خوا دەفرموویت: (خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً) كە ئەبو بەكر و هاوەڵان - خوایان لێ ڕازی بێت — بەرپەرچی ئەم جۆرە تەفسیرە ناتەواوە هەڵەیەیان دایەوە و جەنگیان لەگەڵ كردن تا ئەوە بوو زەكاتی خۆیانیان دا هەروەك لە كاتی پێغەمبەردا (ﷺ) دەیاندا.[1]

یان دەمارگیری خێڵایەتی زۆر بە توندی دەركەوت، ئەمە موسەیلەمەی درۆزنە ڕوو دەكاتە هۆزەكەی بۆ ئەوەی هەڵیان بنێت تا شوێن ئەو بكەون و واز لە قورەیش بهێنن، پێیان دەڵێت: ئەمەوێت پێم بڵێن ئایا قورەیش بەچی وای لێ هاتووە تا شایسەی پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی بێت لە ئێوە زیاتر؟ وەڵلاهی نە زۆری و نە دەستەڵاتیان لە ئێوە زۆرتر نی یە، و وڵاتی ئێوەش پان و پۆڕترە و سامانی ئێوەش زیاترە.[2]

ئەوەش ڕەجالی كوڕی عەنفەوەیی حەنەفی یە كە خوا لەسەر شارەزایش گومڕای كرد، پاش ئەوەی قورئانی پیرۆزی خوێند و لە ئیسلام تێ گەیشت، دەربارەی ڕاستی نێوان پێغەمبەرایەتی محمد و موسەیلەمە دەڵێت: (دوو بەرانن و شەڕە قۆچ دەكەن، خۆشەویست ترینیان لای ئێمە بەرانەكەی خۆمانە).[3]

ئەوەش (طلحة النمري)یە كە كاتێك گوێی گرت بۆ قسەكانی موسەیلەمە و دەبینێت گشتی درۆیە، وتی: من شایەتی ئەدەم تۆ درۆ دەكەیت، و محمد ڕاست دەكات، بەڵام درۆزنی ڕەبیعە باشترە لە لامان لە ڕاستگۆیی (مضر).[4]

---

[1] تفسير ابن كثير (٢/٣٨٦).

[2] حركة الردة عتوم (لا:١٢٤)

[3] الاصابة لابن حجر (ژمارە: ٢٧٦١).

[4] تأريخ الطبري (٤/١٠٤).

بەڵکو موسیلەمەش دەیزانی خۆیشی درۆزنە، ئەوەبوو لە جەنگی یەمامەدا موسوڵمانەکان خەریك بوو سەردەکەوتن، هاوڕێکانی پێیان وت: کوا ئەو هەموو بەڵێن و ئایەتی سەرکەوتنەکانت؟

ئەویش وتی: لە پێناو حەسب و نەسەبتاندا بجەنگن، بۆ مەسەلەی ئاین ئەوە ئاین لە ئارادا نیە.[1]

ئەو خەڵکە بیر و بۆچوونەکانیان تێکەڵی کردبوو، ڕەوشت و ئاوات و هیوا و کردەوەیان هەموو بۆ ئەوە بوو ئیسلام بە یەکجاری نەهێڵن، هەموو هێزی خەراپەکاران بۆ ئەو مەبەستە کۆ بووبوونەوە، بەڵام هەموو هەوڵەکانیان شکستی خوارد و لە ناو چوو، بە هۆی یەك ڕیزی موسوڵمانان و قوڵ کردنیان بە قوڵی یەکدا و کۆبوونەوەیان لە دەوری ئەو بنکە بەهێزەی کۆمەڵگەی ئیسلامی کە لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا پەروەردە کرابوو.

کە وەك موغناتیسێکی لێهات — بە سروشتی کێشکردنی — وای کرد لە هەموو ئەوانەی کە شایەنی کێشکردن بوون — بۆ لای ئیسلامی کێش کردنەوە، کە بە ڕاستی کێشکردنێکی موغناتیسێکی کارای مەزن بوو، کە بوو بە هۆی کۆبوونەوەی موسوڵمانان و یەکگرتنەوەیان، خۆ بە زۆری ژمارە و چەك و تفاق نا، بەڵکو بە هۆی ئەو تایبەتمەندیەی لە بواری بیریاری و فیکر و بۆچوون و ڕەوشتەوە بوو، کە بە هۆیەوە کۆمەڵێ خشتی جوانی لەسەر یەك ڕیز کرد، وە بوو بە هێزێکی کارامە کە بە ڕاشکاوانە لەگەڵ ڕووداوەکاندا مامەڵە بکات و دوور بێت لە خۆگێل کردن و چاو نوقان لە ئاستی ڕووداوەکاندا، بەڵکو زۆر ڕوون و ئاشکرابوون وەك ڕوونی وتەکەی ئەبو بەکر (ﷺ) بۆ هەموو موسوڵمانان کە فەرمووی: «هەر کەسێك محمدی دەپەرست، محمد مرد بەڵام هەر کەسێك خوای دەپەرست، ئەوا خوا زیندووە و هەرگیز نامرێت».[2]

لە ئاکامەکانی جەنگی پاشگەزبوونەوە پاراستنی تێڕوانینی ئیسلامی لە هەموو لادان و شێواندنێك، یەکلاکردنەوەی ئاڵای ئیسلام لە دەمارگیری سەردەمی نەفامی، یان

---

[1] هەمان سەرچاوە (٤/١١٢).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (لا: ٣٢٣).

دۆستایەتی تێکەڵ و پێکەڵ، وە پاك بوویەوە لە هەموو خەوشی و گەردێك، و تێڕوانینی ئیسلامی هەرگیز چەورەیی و لالۆ حەمەیی قبووڵ ناکات لە هیچ بار و دۆخێکدا، وە هێزی ئیسلامی پەیوەندی نیە بە زۆری سوپا و پڕچەك بوون، بەڵکو پەیوەندی هەیە بە هێزی باوەڕ و دەروون بەرزی و کاری سەرەکی ئیسلام بانگکردنی خەڵکیە بۆ لای ئیسلام، نەك کوشتنیان، بەڵکو دەبێت بانگەواز یەکەم مەبەست بێت، سووربوون لەسەر ڕزگارکردنی خەڵکی زۆر لە هەموو شتێکی تر لە پێشترە.[1]

٢- پێویستی بوونی بنکەیەکی ئەستوور لە ناو کۆمەڵگەدا:

ڕووداوەکانی پاشگەزبوونەوە بوو بە هۆی دەرخستنی کانزا خاوەکان کە بوونە خشتی سەرەکی ناو کۆشکی دەوڵەتی ئیسلام و کۆمەڵێك کەسایەتی ئازا دەرکەوت، کە تاکە تاکەیەکی پەرش و بڵاو نەبوون بەڵکو بووبوونە بنکەی سەرەکی کۆمەڵگاکە، دەوڵەتەکەش، ئەمانە بنکەیەکی بۆش و بێ بناغە و بێ بایەخ نەبوو، بەڵکو بنکەیەکی ئەستووری تێگەیشتوو بوون و خویان و دوژمنەکانیشیان باش دەناسی، چاك حاڵی بوون لەو ترسناکیانەی لە چوار دەوریاندا بوو، بە وریایی و بە ئاگایی تەواوەوە پلانیان دادەڕشت و ڕووبەڕووی ناهەمواریەکان دەبوونەوە.

ئەو کەسانە لەگەڵ ئەمانەشدا پابەند بوون بە خوای بەهێز و دەسەڵاتدارەوە و بەسەر هەموو دوژمنەکانیاندا سەرکەوتن و هەموو بەربەستەکانی ڕێگایان لادا، ئەم کەسانە بوونە هۆکاری پاراستنی ئیسلام و دەوڵەتەکەی و لە هەموو لەشکرکێشیەکدا ئامادەبوون تا سام و هیبەتی هێزی پاشگەزبووان بشکێنن، و خەڵکی لە دەوری ئیسلام خڕ بکەنەوە و بە یارمەتی خوا و هەوڵی ئەو بنکە بە هێزە توانرا بوونی قەوارەی ئومەتی ئیسلام و مانەوەی و گەشەپێدانی بپارێزن.[2]

٣- ئامادەکردنی دوورگەی عەرەب وەك بنکەیەك بۆ هێرشە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام:

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا: ٣٢٤).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (لا: ٣٢٥).

بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو کۆمەڵەکان پەرش و بڵاو بوونەوە زۆرێك لە هۆزە عەرەبەکان لە خەلیفە هەڵگەڕانەوە، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لەگەڵ هاوەڵاندا توانیان ئەو هۆزانە بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت کە ئەوەش کارێکی زۆر قورس بوو، صدیق خۆی سەرپەرشتی جێبەجێکردنی پلانەکانی پەروەردەیی و زانستی و سەربازی و ئیداری دەکرد، سەرکەوت بەسەر سەرکەوتنێکی مەزن، و هۆزەکانی عەرەب بە دەوڵەتی ئیسلامەوە پەیوەست کرانەوە، پاش ئەوە وڵاتانی دوورگەی عەرەبی بە دانیشتوانەکانیەوە بوو بە بنکەیەك بۆ هێرشە ڕزگاریخوازەکان — فتوحات — تا وای لێهات بوو بە کانیاوێك و لەوێوە ئیسلام دەگەیەنرایە هەموو بەشەکانی سەر زەوی بە ڕزگاریخوازی و بە مامۆستایی و پەروەردەکاریەوە.[1]

دوورگەی عەرەبی بوو بە بنکەی ڕزگاریخوازی، چونکە هێرشی ڕزگاریخوازی چۆن دەکرێت بە بێ بنکە، یان ئەگەر بنکەکە لەرزۆك بێت یان دانەمەزراو؟! بەڵام وا ئێستا دوورگەی عەرەبی ئامادەیە کە هەموو وزە و تواناکانی بخرێتە کار بخرێتە ڕێ بۆ ئیش و کاری سەربازی کە لەمەو دوا دێت.[2]

٤- ئامادەکردنی فەرماندە بۆ بزاڤی ڕزگاریخوازی ئیسلامی:

لە ڕووداوەکانی پاشگەزبوونەوەدا ڕیزەکان جیابوونەوە، وزە و تواناکان تاقی کرانەوە، ئەو چینە دەرکەوت کە کانزاکانی ئومەتیان داپۆشتبوو، لە بەرامبەریشدا کانزا خراپەکان ئاشکرابوون، دەسەڵات درایە دەست کانزا بەنرخەکان کە کاری سەرکردایەتی کردنی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام بگرنە ئەستۆ.

سەرچاوە مێژوویەکان دەربارەی هەندێ سەرکردە بۆمان دەدوێن کە نە لە پشتیوانان بوون و نە لە کۆچەریان و نە هاوەڵانیش بوون، بەڵام ڕاستەوخۆ لە کانیاوی قورئانی پیرۆز پەروەردە بوون، پاشان ڕووداوەکانی هەڵگەڕانەوە پێی گەیاندن، لە خەڵکانی تریش جیای کردنەوە و وای لێ کردن بگەنە پلەی سەرکردایەتی سوپا ڕزگاریخوازیەکانی ئیسلام، هەموو لایەك شایەتی ژێریەتی و کاری لێبڕاوە ئەو باوەڕداری ڕاستەقینەی بۆ داون.

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا: ٣٢٦).

[2] طريق الى المدائن، احمد عادل كمال (لا: ١٨٢).

ئەمە و بوونی سەرکردایەتیەکی لە مەدینە و گۆڕەپانەکانی جەنگدا کە سەرپەرشتی جەنگەکانیان دەکرد، لە ئەوپەڕی تێگەیشتوویی و گیانی هاوکاری و خۆشەویستیدا بوون، لەگەڵ دووری بەرەکانی جەنگ لە ناوەندەوە کەچی بوونی پەیوەندی و هاوسەنگیەکی جوان و بە تین لە نێوان سەرکردایەتی ناوەند و فەرماندەکانی بەرەکانی جەنگدا بە ئاشکرا هەستی پێ دەکرا.[1]

٥- فیقهی بەرجەستە (الواقعی) لە ڕووداوی پاشگەزبوونەوەدا:

زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە کە باس لە پاشگەزبوونەوە دەکەن کە حاڵەتێکە و بەسەر هەندێ لە مرۆڤەکاندا دێت، بەڵام هەموو ئەو دەقانە لە شێوازێکی تیۆریدا مابوونەوە، بە شێوازی ڕووداو و کردەوە شتی وا ڕووی نەدابوو، هەر کە پاشگەزبوونەوە ڕوویدا و موسوڵمانەکان لە ناو ڕووداوەکەدا ژیان و بە چاوی خۆیان بینیان، لەو دەقە شەرعیانەوە کۆمەڵێك حوکمیان لەسەر مەسەلەی پاشگەزبوونەوە لێ دەرهێنا و لە لایان گەلاڵە بوو، کە ئەو هەڵگوزینە فقهیایە بوونە مەشخەڵێك بۆ تێگەیشتن لە فقهی ئەو ئایەت و فەرموودانە، ئەمەش لە ڕێگای گفت و گۆی نێوان هاوەڵان و دەربڕینی هەڵوێستیان لە پاشگەزبووەکان و گەڕانەوەیان بۆ بەڵگەکانی قورئان و سونەت لەو بارەیەوە پێکەوە بە ڕاگۆڕینەوە و لێدوان هەڵیان دەسەنگاندن، لە ئاکامدا لەسەر یەك شێواز و وەسف یەکیان گرت سەبارەت بە هەڵسەنگاندن و وەسفکردنیان و شێوازی مامەڵە کردن لەگەڵیان.

ئەم تێڕوانینە کردەوەییانە لەبەر دەم ڕووداو و دەقدا کۆمەڵێك بەشی تری بۆ فیقهی ئیسلامی لێ دروست بوو کە هەندێ ڕوون کردنەوە و درێژ کردنەوەی وردی، سەبارەت بە مەسەلەکانی پاشگەزبوونەوە هاتە کایەوە، تا وای لێهات کردەوەی هاوەڵان لەو بوارەدا بە چاوێکی گەورەوە سەیر دەکرا و ئیشیان لەسەر دەکرد لە کاتی هەڵگوزینی مەسەلە فیقهیەکاندا.[2]

٦- ولا يحيق المكر السيء الا بأهله:

[1] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (لا: ٣٢٨).

[2] دراسات في عهد النبوة والخلافة الراشدة (لا: ٣٢٩).

هەر هەوڵێك بدرێت ئیتر با لە لایەن کەسێکەوە یان کۆمەڵ و حیزبێکەوە یان لە لایەن دەوڵەتێکەوە بێت بۆ یاخی بوون لە ئیسلام، ئەو هەوڵە هەوڵێکی سەرنەکەوتووی تێکشکاوی بێ هیوایە چونکە ئەوە مانای یاخی بوونە لە خوا و لە قورئانەکەی خوا — کە خۆی پەیمانی داوە بە پاراستنی و پاراستنی ئەو دەستە و تاقمەی کە لە دەوری کۆ دەبنەوە و لە ناو خۆی و کۆمەڵگەکەیاندا بەردەوام بەرپای دەکەن، خوایش خۆی بڕیاری داوە سەرەنجام بۆ لە خوا ترس و تەقوادارانە، منەتیش دەخاتە سەر چینی چەوساوە بەوەی کە هەقیان لە زۆردارەکان بۆ دەسێنێتەوە، ناکامی ئەوانە فێڵ و تەڵەکە بۆ ئیسلام و موسوڵمان دەنێتەوە لەناوچوونە لە دونیا و لە دوارۆژیشدا، چەند جوانە وتەی ئەو شاعیرەی کە دەڵێت:

كناطح صخرة يوماً ليوهمنا فلم يضرها وأوهي قرنه الوعل.[1]

واتا: ئەوانە وەك گا کێویەك وان شاخی گیر کات لە کێوێك و بیەوێت لە بن دەری بێنێت، بەڵام وەك نەشی توانی بەڵکو شاخەکانی لە ناو قوڕەکەدا جێما.

٧- سەقامگیری ڕێکخستنی ئیداری لە دوورگەی عەرەبیدا:

بە شێوەیەکی جوان پاش سەرکەوتنەکان بەسەر هەڵگەڕاوەکاندا ناوچەکانی دوورگەی عەرەب دابەشکرا بەسەر چەند یەکەیەکی ئیداریدا لەوانە: مەککە کە ئەمیرکەی عتابی کوڕی ئوسەید و (طائف) کە ئەمیرەکەی عوسمانی کوڕی عاص بوو و (صنعاء) ئەمیرکەی موهاجیری کوڕی بەبی ئومەییە بوو، (حضرموت) ئەمیرەکەی زیادی کوڕی لەبید بوو، (خولان) ئەمیرەکەی یەعلای کوڕی ئومەییە بوو، زبید و رفع کە والیەکەی ئەبو موسای ئەشعەری بوو، جەنەدی یەمەن ئەمیرکەی (معاذی کوڕی جەبەل) بوو، نەجران کە والیەکەی جەدیری کوڕی عبداللە بوو، (جرش) والیەکەی عبداللە کوڕی نوور بوو، (بەحرەین) والیەکەی عەلائی کوڕی حەزرەمی و (عمان) والیەکەی حوزەیفەی غەلەفانی، (یەمامە) والیەکەی سەلیتی کوڕی قەیس.[2]

[1] حركة الردة الاعتوم (لا: ٣٣٤).

[2] الدولة العربية الاسلاميتن منصور احمد عرابي (لا: ٩٧).

# بەشی چوارەم

## جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئەبو بەکر (ﷺ)

## و

## دانانی عومەر (ﷺ) بە جێنشینی خۆی

## و

## کۆچی دوایی کردنی

پێشەکی

مەبەست لە بوونی ئومەتی ئیسلام لەم دونیایەدا بۆ هاتنەدی یەکتاپەرستی خوایە، و هێنانەدی بەندایەتی کردنی خوا بە شێوەیەکی هەمەلایەنە لە ژیاندا وەك خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿وما خلقتُ الجنَّ والانسَ الّا ليعبدون﴾، واتا: من جنۆکە و مرۆڤم تەنها لەبەر پەرستنی خۆم دروست کردووە، کەواتە ئەگەر مەبەست لە دروستکردنی مرۆڤ و جنۆکە بەندایەتی بێت و بەس، دەی کەواتە کاری سەر شانی ئومەتی ئیسلامی هەوڵی بەدەست هێنانی ئەم ئامانجە بدات و ئەم سپاردە گەورەیە هەڵبگرێت و کۆشش بکات لە پێناو گەیاندنی بە هەموو خەڵکی، بە بانگەواز کردن بۆ لای خوا و فێرکردن و پەروەردەکردنی خەڵکی لەسەر پرۆگرامی خوای گەورە و کارکردن بۆ لابردنی هەموو بەربەستەکانی ئەو ڕێگایە، ئەو بەربەستانەی دەبنە هۆکاری نەگەیشتنی ئەو سپاردە گەورەیە بە هەموو خەڵکی، تا بەو کارە شەرعی خوا بە تەواوەتی باڵ دەکێشێت بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا، وای لێ دێت هەموو مرۆڤەکان دان بە حاکمیەتی خوای گەورەدا دەنێن ئەوەش بە گوێڕایەڵی و سەرنەواندن بۆ شەرعی خوای تەعالا.[1]

بۆ ئەم مەبەستەیش خوای گەورە جیهادی داناوە تا بە هۆیەوە بەربەست و بنبەستەکانی ڕێگا لادات کە ناهێڵن ئاینی پاکی خوا بگاتە مرۆڤەکان.

---

[1] صفات من تأريخ ليبيا الاسلامي – صلابي (لا: ١٦٧).

(ابن تيمية) دەڵێت: (ئەسڵی فەرزبوونی جیهاد بۆ ئەوەیە کە ئاین و ئایینداری تەنها بۆ خوا بێت و بەس، تەنها وشەی خوایش بەرز بشەکێتەوە، هەر کەسێك لەم ڕێیەدا بەربەست بێت دەبێت بکوژێت لەسەر ڕای هەموو موسڵمانان).[1]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا بە گەیاندنی بانگەوازی ڕێگەی خوا، دەستی کرد بە ناردنی نامە و نوێنەر بۆ هەموو پاشا و سەرکردەکان و گەورەی هۆزەکان و سوپایشی بەڕێ دەکرد لە پێناو لابردنی بەربەستەکانی ڕێگا، لە مرۆڤەکان، لە باوەکانی سەردەمی نەفامی، لە ڕەقەبەرە تاکە کەسیەکان و لە بەربەستە مادیەکان، هەموو ئەوانەی دەبوونە هۆی ئەوە نەبیستنی دەنگی ئیسلام و تێگەیشتن لێی.

بەڵکو هەر بە خۆی (ﷺ) سەرۆکایەتی هەندێ لە جەنگەکانیشی دەکرد، کە دواترینیان جەنگی تەبوك لە ساڵی (٩)ی کۆچیدا، خەڵکیش لەبەر دەم ئەم سوپایانەدا سێ شتیان بۆ هەبوو:

یەکەم: موسوڵمان بن و ببنە برای موسوڵمانەکانی تر.

دووەم: لەسەر ئاین و پرۆگرامی خۆیان بمێننەوە و سەرانە بدەن.

سێیەم: ئەگەر بەم دوانەی پێشوو ڕازی نەبوون شمشێر و جەنگ سێیەم دەبێت.[2]

ئەبو بەکریش (ﷺ) لەسەر ئەم ڕێڕەوە هەنگاوی دەنا، وە دەستی کرد بە سوپا بەڕێکردن بە هیوای هاتنەدی مژدەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەیدا بە هاوەڵان کە هەموو وڵاتانی عێراق و ناوچەکانی تریش ڕزگار دەکەن، ئەوەبوو بە عەدی کوڕی حاتەمی وت: «فوالذي نفسي بيده ليتمنّ الله هذا الامر، حتى تخرج الضعينة من الحيرة حتى تطوف البيت في غير جوار أحد ولتفتحنّ كنوز كسرى بن هرمز».[3]

---

[1] السياسة الشرعية لابن تيمية (لا: ١٨).

[2] صفات من تأريخ ليبيا الاسلامي – صلابي (لا: ١٦٧).

[3] صحيح السيرة النبوية (لا: ٥٨٠).

واتا: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە خوا ئەم بانگەوازە ئەگەیەنێتە ئـەنجام، تـا وای لێ دێت ئافرەت لە حیرەوە دەکەوێتە ڕێ بۆ حەج بەبێ ئەوەی کـەس بیپارێزێـت، ئـاڵتون و زێڕی کیسرای کوڕی هورمز دەبێتە هی ئێوە.

پێغەمبەری خوا بە پان و پۆڕی نەخشەی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی کێشا، ئـەو مـژدە جوانانەشی وەك گرەنتیەکی مـادی و دەروونـی دا بـە ئومـەت، ڕۆژهـەڵات ناسـەکان و شـوێن کەوتەکانیان و دوژمنانی ئیسلام ویستوویانە ئەو جەنگە ڕزگاریخوازیانە لە پاڵنەری دەعـوەت و بانگەواز ڕووت بکەنەوە و لە ئامانجە خواییەکان و مەبەستە بەرزەکان دووری بخەنەوە، کۆمەڵێك تۆمەتی نارەوایان لکاندووە پێوەی کە دوورە لە هەموو بەڵگە و ڕاستیەك.

ئامانجی بەرز و مەبەستی سەرەکی بزووتنەوەی جەنگە ڕزگاریخوازەکان کە ئەبو بەکر (ﷺ) سەرکردایەتی دەکرد بڵاوکردنەوەی ئاینی خوا بوو لە ناو خەڵکیدا، لابردنی هەموو دکتاتۆرەکان لەسەر گەردنی گەلان، ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) و هەموو موسڵمانان دڵنیایی تەواویان هەبوو بە هاتنەدی هەموو ئەو مژدە و هەواڵانەی سەربارەت بە سەرکەوتن و دەست ڕۆیشتن دابوویان، ئەم یەقین و دڵنیاییەش ڕەوشی بەرەی یەکەمی ئەم ئیسلامە بووە و زۆر دڵنیا بوون بۆ وتەی خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾﴾ (الصف: ٩).

واتا: خوا ئەو خوایەیە کە پێغەمبەری ناردۆتە ناوتان بۆ هیدایەت و ڕێبازی ڕاست و دروست و سەری دەخات بەسەر هەموو ئاینەکاندا ئیتر با بت پەرستان پێیان ناخۆشیش بێت.

یان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴿٥١﴾﴾ (غافر: ٥١).

واتا: ئێمه پێغەمبەرەكەمان و باوەڕداران سەردەخەین لە دنیا و ڕۆژی دواییدا، دەی ئیتر با واز بێنن لە جەنگە ڕزگاریخوازیەكانی خۆیان هەوڵی ڕاستیەكان و ڕوون كردنەوەی ڕێگاكان بۆ نەوە دڵسۆزەكانی ئەم ئومەتە.

## جێ باسی یەكەم

## ڕزگاركردنی عێراق

### یەكەم: پلانی صدیق (ﷺ) بۆ ڕزگاركردنی عێراق:

هەر كە جەنگی پاشـگەزبووان كۆتـایی پێهـات، ئاشـتی و ئاسـایش گەڕایـەوە بـۆ دوورگەی عـەرەبی كـە سەرچـاوەی پاشـگەزی بـوو، یەكـسەر صـدیق (ﷺ) دەسـتی كـرد بـە جێبەجێكردنی نەخشە و پلانەكانی ئەو جەنگی ڕزگاریخوازیانەی كـە پێـشتر پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ كردبوو، بۆ ئەم مەبەستە دوو سـوپای خـستە ڕێ و خالیـدی كـوڕی وەلیـدی بەهێزكرد بە (مثنى كوری حارثة) لە عێراق:

١- سوپایەك بە سەركردایەتی خالیدی كوڕی وەلید كـە ئـەو كاتـە لـە یەمامـەبوو، لـە نامەیەكدا فەرمانی پێدا كە عێراق ڕزگار بكات لە خواروی خۆرهەڵاتیـەوە، و پێـی وت: بەرەو عێراق بكەوە ڕێ و برۆ ناویەوە، لە كـەلێنی ئەبلـەوە[1] بـڕۆ نـاوەوە و لـە سەرەوە تێی بچۆ، لەگەڵ دانیشتوانیدا خۆت بگونجێنە، وە بانگیان بكـە بـۆ ڕێگـای خوای (عز وجل)، ئەگەر بە قسەیان كردی باشە وەگەرنا سـەرانەیان لەسـەر دابنـێ، ئەگەر ئەوەشیان نەدا جەنگیان لەگەڵدا بكـە، فەرمانیـشی پێـدا كـە زۆر لـە هـیچ سەربازێك نەكات بۆ بەشداری لەو جەنگـەدا، كۆمـەكی نـەوێت لـەو كەسـانەی لـە ئیسلام پاشگەزبوونەوە ئیتر با موسوڵمانیش بووبنەوە، وە فەرمانیشی پێدا كە هـەر موسوڵمانێكی پێدەگات لە ڕێگە بیخاتە ناو سوپاكەیەوە، ئەبو بەكر خۆیشی دەستی

[1] ابلة: واتا لە لای شط العربیەوە.

کرد بە ئامادەکردنی سریە و پەل و هێزەکان تا بیان نێرێت بۆ کۆمەکی سوپاکەی خالید (رضي الله عنه).[1]

٢- سوپایەکی تر بە فەرمانده‌یی - عیاض کوڕی غەنم - کە ئەو کاتە لە دێیەك بوو لە نێوان شاری مەککە و بەسرەدا بوو، فەرمانی پێدا کە بەرەو ڕزگارکردنی عێراق بکەوێتە ڕێ، بەڵام لە سەرووی ڕۆژهەڵاتیەوە و لە (مصيخ) و لەوێوە دەست پێ بکە، پاشان لە ڕووی سەریەوە بچۆرە ناو عێراق تا دەگەیتە خالید و لەوێوە شان بە شانی یەك دەست پێ بکەن، وە هەر سەربازێکیش ویستی بگەڕێتەوە زۆری لێ مەکە و بە زۆر کەس بەشداری جەنگەکە مەکە.[2]

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) نامەیەکی نارد بۆ هەردوو سەرکردە و نووسی بۆیان: «هەردووکتان بەرەو حیرە بکشێن و هەر کامتان زوو گەیشتنە ئەوێ، ئەوە دەبێتە ئەمیر بەسەر ئەوی ترەوە، وە ئەگەر لە حیرە گەیشتن بە یەك، دەستان خاڵی بوو لە چەکدارە فارسەکان دڵنیا بوون لەوەی کە لە دواوە لە سوپای موسوڵمانان نادرێت، با یەکێکتان لە دواوە سوپای موسوڵمانەکان بپارێزێت و ئاگای لە سوپاکەی هاوڕێکەی بێت لە حیرە، با ئەوی ترتان هەڵکوتێتە سەر دوژمنانی خوا، فارسەکان و لە سەرکردایەتیەکەیان بدات کە (مەدائن)ە.[3]

٣- (مثنی کوڕی حارثة) هات بۆ لای ئەبو بەکر و هانی صدیقی دا بۆ جەنگ لەگەڵ فارسەکان، وە پێی وت: بمکە بە فەرماندەی هۆزەکەم و بمنێرە بۆ شەڕی فارسەکان و ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) ناردی، (مثنی) گەڕایەوە و خۆی سازدا بۆ جەنگی عێراق، پاشان مەسعودی برای نارد بۆ لای صدیق تا کۆمەکی تری پێ بگەیەنێت، ئەبو بەکریش نامەیەکی بۆ (مثنی) نووسی و پێی وت: پاشان ئەوا خالیدی کوڕی وەلیدم نارد بۆ لاتان بۆ عێراق جا خۆت و هۆزەکەت پێشوازی لێ بکەن، پاشان هاوکاری بکە و پشتی بگرە و باڵ ڕاستی بە، لە قسەی دەرمەچۆ و پێچەوانەی بۆچوونەکانی

---

[1] البداية والنهاية (٣٤٧/٦).

[2] الفن العسكري الاسلامي، د. ياسين سويد (لا: ٨٣).

[3] تأريخ الطبري (١٦٣/٤).

مەکە، چونکە یەکێکە لەو کەسانەی کە خوای (عز و جل) دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ﴾ (الفتح:٢٩)، واتا: محمد پێغەمبەری خوایە و ئەوانەشی لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توند و تیژن و بەرامبەر باوەڕداران نەرم و نیان و بە سۆزن، وە هەتا لەوێ بێت ئەو ئەمیرە و ئەگەر لەوێ نەما تۆ هەر ئەمیرەکەی جارانیت.[1]

لە ناو هۆزەکەی (مثنی)دا پیاوێك هەبوو ناوی (مذعور کوڕی عدي) بوو، لە ژێر ڕکێفی (مثنی) دەرچوو، نامەشی نارد بۆ ئەبو بەکر (رضي الله عنه) و پێی وت: من پیرێکی بەنی عەجلانم و سوارچاکی شەوانم و هێرشبەری ڕۆژیم، کۆمەڵێك لە پیاوانی هۆزەکەمم لەگەڵدایە، کە هەر یەکەیان لە هەزار جەنگاوەر باشترن، چاك شارەزای ناوچەکەم، لە جەنگدا قاڵ بووم، بست بە بستی زەویەکان ئاشنام، گرتنی سەواد (واتا: عێراق) بسپێرە بە من (انشاء الله) بۆت ئەگرم.[2]

(مثنی)یش سەبارەت بە ئەم (مذعور)ە نامەیەکی بۆ نووسی بۆ صدیق (رضي الله عنه) تیایدا وتی: هەواڵ دەدەم بە جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە پیاوێك لە ناو هۆزەکەمدا هەڵکەوتووە بە ناوی (مذعور کوڕی عدي) و لە بەنی عەجلانە، ژمارەیەکی کەمی لەگەڵدایە، شانەخزەم لەگەڵ دەکات و بەرامبەرکێم لەگەڵ دەکات، حەزم کرد ئاگادارت بکەم لێی، تا تۆش ڕای خۆتم پێ بڵێیت.[3]

ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وەڵامی (مذعور)ی دایەوە و بۆی نووسی: «پاشان... نامەکەتم پێ گەیشت، تێگەیشتم چی دەڵێیت، تۆ بەو جۆرەی کە باسی خۆت کرد، هۆزەکەشت باشترین

---

[1] الوثائق السياسية، حميد الله (لا: ٣٧١).

[2] مجموعه الوپائق السياسيه (لا: ٣٧٢).

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هۆزە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە بچیتە ژێر ڕکیفی خالیدی کوڕی وەلید، لەگەڵ ئەودا بیت تا لە عێراقدایە بەردەوام لەگەڵیدا بە، کوێی دیاری کرد تۆش دیاری بکە».[1]

نامەیەکیشی نارد بۆ (مثنى) و پێی وت: هاوڕێ عەجەلانیەك نامەیەکی بۆ ناردووم داوای هەندێ کارم لێ دەکات، منیش بۆم نووسیوە کە لەگەڵ خالیددا بێت تا ڕایەکی تر دەبینم، ئەمەش نامەی منە بۆ تۆ کە لە عێراقدا هیچ هەنگاوێك لە خۆتەوە مەنێ تا خالیدی کوڕی وەلید عێراق بە جێ دەهێڵێت، ئەگەر خالید بەجێی هێشت تۆ سەرکردەی خۆت دەبیت و تۆش شایەنی زۆر لەوەش زیاتریت و چاکە هەر لە خۆت دێت.[2]

لەم ڕوداوەی پێشووەوە کۆمەڵێك پەند و ئامۆژگاری لێ وەردەگرین لەوانە:

١- مێژووی ناردنی خالیدی کوڕی وەلید بۆ عێراق لە مانگی ڕەجەبدا بوو، وە هەندێ تر دەڵێن لە (محرم)ی ساڵی دوانزەهەمدا بووە.

٢- هەستی درێژخایەن (ستراتیجی) لە صدیقدا:

ئەو فەرمانانەی کە ئەبو بەکر (ﷺ) بۆ هەردوو فەرماندەکەی خۆی دەرکرد خالید و عیاض، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو پیاوە بەرزە خاوەنی هەستی ستراتیژی بووە، کۆمەڵێك فەرمانی دەرکرد هەندێکیان درێژخایەن و هەندێکی تریان تەکنیکی و کاتی بوون، ناوچەیەکی جوگرافی بۆ هەر یەکەیان دیاری دەکات، کە لێیەوە سوپاکەیان بەرنە ژوورەوە وەك بڵێی لە ژووری مەیدانی (غرفة العمليات)دا لە حیجازەوە کار دەکات، وە نەخشەیەکی هەمە لایەنەی عێراقی لەبەر دەستدایە، هەر لە ئاو و هەوا و ڕێگاوبان و چاڵ و چۆڵەکانی لەبەر چاوی بوو، فەرمانی دەدا بە یەکێکیان لە خوارووی عێراقەوە هێرشەکانیان دەست پێ بکەن.

فەرمان بە (عیاض)یش دەدات کە لە سەرووی عێراقەوە سوپاکەی بەرێتە ژوورەوە و پێشیان دەڵێت هەردووکتان لە ناوەڕاستی عێراقدا یەك بگرنەوە، خەلیفە ئەوەشی لە بیر نەچوو

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] مجموعه الوثائق السياسيه (لا: ٣٧٣).

کە پێیان بڵێت زۆر لە هیچ موجاهیدێك مەکەن کە بەشداری گرتنی عێراق بکات، وە سەربازی کردن لە تێڕوانینی صدیقدا (ﷺ) بە زۆر نەبوو بەڵکو بە ئارەزووی حەزی خۆیان دەبێت.[1]

٣- دیاریکردنی (حیرە) وەك شوێنێکی ستراتیژی:

جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) حیرەی دیاریکرد کە هەردوو فەرماندە بیکەنە ئامانجی هێرشەکانی خۆیان، ئەمەش لەبەر گرنگی بواری سەربازی ئەو شوێنە، چونکە (حیرە) سێ میل لە کوفەوە دوور بوو، نەجەفیش ڕۆژی ڕێگەی ئەسپ سوار لێوەی دوور بوو، ئەوەی تەماشای نەخشە بکات یەکسەر بۆی ڕوون دەبێتەوە کە چ ناوچەیەکی سەربازی گرنگە.

حیرە خاڵی پەیوەندی بوو لە نێوان هەموو لاکاندا، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە ڕێگەی فوراتەوە بەستراوە بە مەدائینەوە، وە لە باکووریشەوە بە (هیت)ەوە بەستراوە، وە بە هۆی پردی ئەنبارەوە لە ڕومادیەوە بەستراوە، وە لە ڕۆژئاوایشەوە بە شامەوە بەستراوە، هەروەك لە لای بەسرەشەوە بە (ئەبلە)وە بەستراوە، وە لەسەر ڕووباری دیجلەش بەستراوە بە هەر یەکە لە (کەسکەر) و (نوعمانیە) بەستراوە، کە بەمانەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چ گرنگیەکی هەیە ئەو شارە (حیرە).

کەواتە صدیق (ﷺ) باش پێکابووی کە کردبووی بە ئامانجی هەردوو سوپاکە (مەدائین)ەوە کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی فارسەکان بوو، کە ئەوانیش هەستیان بە گرنگی ئەم حیرەیە دەکرد بۆیە بەردەوام سوپایان بەرێ دەخست بۆ گرتنەوەی، چونکە ئەوەی حیرەی بگرتایە زۆر ئاسان دەبوو لەلای گرتنی ڕۆژئاوای فورات بە گشتی، وە جگە لەمانەش زۆر گرنگ بوو بۆ سوپای ئیسلامی کە لێیەوە هێرش بەرێت بۆ سەر ڕۆمەکان لە شام.[2]

ئەم نەخشە و پلانەی صدیق (ﷺ) بۆ گرتنی حیرە لە جەنگە ڕزگاریخوازەکانیان دا لە نەخشە سەربازیەکانی هاوچەرخدا بە (خستنە ناو بەرداش) ناسراوە، یان کرداری بازنەیی بە زیاتر لە سوپایەك، ئەمەش ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ڕزگار کردنی عێراق و ناوچەکانی کەنداوی

---

[1] الفن العسكري الاسلامي (لا: ٨٣-٨٤).

[2] معارك حالد بن اليد ضد الالفرس، عباالجبار السامرائي (لا: ٣٥

عەرەبی لە ڕێگەی جیهادەوە هەروا بە ڕێکەوت و هەوەنتە نەبووە کە کارەکان خۆیان وا هاتبنە پێش.[1]

بۆ لێکۆڵەرەوان لە شارەزایی صدیق (ﷺ) دەردەکەوێت لە ڕوانگەی نەخشە سەربازیەکانیەوە کە تا چ ڕاددەیەك پێی لەسەر ئەوە ڕاگرتووە کە بڕیاری ڕێك خستنی سوپاو ئاراستە کردنیان و دیاری کردنی ئەرك و کارەکانیان ئەنجام بدات، دروست کردنی هاوسەنگی لە نێوان بەرەکانی جەنگدا، هەرچەندە سەربەستیشی بە فەرماندەکانی دەدا کە چۆن بیانەوێت و شیاوی بزانن ئیدارەی جەنگەکان بدەن و هەر جۆرێ بێتە پێشەوە ئەمان بە جۆری گونجاوی خۆی لەگەڵ بکەن.[2]

٤- خۆنەویستی لە لای (مثنى کوڕی حارثة):

لەو هەڵوێستانەی کە لە جیهادی ڕزگار کردنی عێراقدا لە ژیانی (مثنى) دا تۆمار کراوە، ئەوەیە کە تەنها بە هۆزەکەی خۆی دژی دوژمنان جەنگاوە لە عێراقدا، کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) بەو هەواڵەی زانی زۆر دڵخۆش بوو، بۆیە کردی بە فەرماندەی سوپاکە، وە ئەمەش پێش ناردنی خالیدی کوڕی وەلید بۆ عێراق، بەڵام هەر کە ویستی بەرەو ڕووی فارسەکان ببێتەوە، بە باشی زانی خالید بکاتە فەرماندەی گشتی سوپای ڕزگاریخوازی عێرق، بۆیە نامەیەکی نارد بۆ (مثنى) و تیایدا داوای لێ کرد کە بچێتە ژێر ڕکێف و گوێڕایەڵی خالیدەوە، هەر کە نامەکەی پێ گەیشت یەکسەر گوێڕایەڵی نواند و خۆی و سوپاکەی خستە بەر دەستی خالید.

ئەم هەڵوێستە بەرزەیش بۆ (مثنى) جێگەی سەربەرزیە، چونکە بە بۆنەی زۆری سوپاکەی و کۆنی خۆی، خۆی لێ نەگۆڕا و خۆی بە شایانتر نەزانی لە خالید.[3]

٥- صدیق جیهادی ڕێی خوا بە خاوێنی دەهێڵێتەوە:

لە نامەکەی ئەبو بەکری صدیق و عیاض کوڕی غەنەمدا هاتووە کە دەڵێت: هەموو ئەوانەی دژی هەڵگەڕاوەکان جیهادیان کردووە لە جەنگی عێراقدا بەشداریان بکەن، لەگەڵ

---

[1] ابو بكر الصديق، نزار الحديثي وخالد الجنابي (لا:٤٥).

[2] مشاهير الامراء والخلفاء، الصديق، بسام العسلي (لا: ١٢٧).

[3] التأريخ الاسلامي (٩/١٣٠).

ئەوانەشدا کە لەسەر ئیسلام ڕاوەستاو بوون و هیچ کەس لە پاشگەزبووان نەهێڵێت بەشداری سوپاکانتان بکەن تا ڕای خۆمتان بۆ دێت، یەك پاشگەزبووە لە ڕزگاری عێراقدا بەشداری پیّ نەکرا، هەڵبەت ئەمە لە سەرەتای جەنگەکانەوە، چونکە دواتر کە دەرکەوت بە پاکی و لە دڵەوە گەڕاونەتەوە پشت بە خوا بەشداری غەزاکانیان پیّ کرا.[1]

ئەم هەڵوێستەی ئەبو بەکریش بۆ پاراستنی وشەی بەرزی جیهاد لە پێناوی خوادا بوو، تا بەشداری تێدا نەکات هیچ دنیا پەرست و هەڵ پەرست و باوەڕ لاوازەکان تا نەبنە هۆکاری تێکشکاندنی سوپای باوەڕ و لاوازکردنی ڕیزەکان.

ئەمەش وانەیەکی پەروەردەیی ئەبو بەکرە لەوانە پەروەردە پێغەمبەرایەتیە بە نرخەکانە وەریگرتووە، ئەمەش لەبەر پاککردنەوەی ڕیزەکانی موسوڵمانان لە سوس و خەوشی، وە بە یەك ئامانجی و دڵسۆزانە بۆ خوای گەورە کار بکەن و بەس، ئیتر بەو کارە بیّ خەم دەبن لە شکستیە ترسناکەکان کە بە هۆی فرە ئامانجیەوە تووشی سوپا دەبێت.

ئەبو بەکر (ﷺ) لەو کاتەدا کە بۆ چەکدارێك بە دارا دەڕۆیشت کەچی لەو پرۆگرامە بەرزە لا نادات کە پوخت ڕاگرتنی ڕیزی سوپای ئیسلامە، کە ئەمەش باوەڕی تەواوی ئەبو بەکر دەردەخات بەوەی کە گرنگ ئامانج بەرزی و دڵسۆزیە نەك زۆری چەکدار.[2]

٦- بە نەرمی جوڵانەوە لەگەڵ خەڵکی و بە تایبەت لەگەڵ جوتیارەکانی عێراق:

لە وتەی صدیق (ﷺ) بۆ خالید (ﷺ) کە پێی وت: «لەگەڵ فارسەکاندا ئاڵ و کەیف بە و لەگەڵ ئەوانەشدا کە لە ژێر دەستی ئەواندان لە گەلانی تر».[3]

ئەم وتەیە بە جوانی ئامانج لە جیهاد و کوشتاری ئیسلامی لە دەرەوەی وڵاتی ئیسلام دەردەخاتن کە بانگەوازێکە بۆ بانگکردنی خەڵکی بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە، وە هەروەك دەنگی بانگەواز مەحاڵ بوو بگاتە ئەو گەلانە تا ئەو حکومەتانە لا نەبراناتیە و دواتر بە ئاسانی گەلان سەربەستانە ئاینی بەرزی ئیسلامیان هەڵبژاردایە، ئەم ئامانجانەش زۆر بە ئاشکرا دیار بوو لە

---

[1] التاريخ الطبري (٤/١٦٣).

[2] التأريخ الاسلامي (٩/١٣١).

[3] ئەم ئامۆژگارییەی صدیق (ﷺ) بۆ کوردستان بوو چونکە ئەوکات لە ژێر دەستی فارسدا بوون.

هەموو ئەو جەنگانەی کە هاوەڵان ئەنجامیان دەدا، دوژمنەکانیان بانگ دەکرد بۆ لای ئیسلام و ئەگەر قبووڵیان کرد چی بۆ موسوڵمانە بۆ ئەوانیشە و چیش لەسەر موسوڵمانە لەسەر ئەوانیشە، ئەگەر واشیان نەکردایە دەبوایە خۆیان بدایە بە دەستەوە و پاشان لە بەرامبەری پاراستنیاندا (جزیە)یە یەکی ساڵانەیان لەسەر دادەنان، ئەگەر ئەو خاڵەشیان قبووڵ نەکردایە ئیتر دەبوایە لەگەڵیان بجەنگانایە تا وشەی خوا بەرز بشەکێتەوە و بەس.[1]

ئەبو بەکر (ﷺ) ئامۆژگاری فەرماندەی سوپاکانی دەکرد کە لەگەڵ جوتیارە عێراقیەکاندا نەرم و نیان بن چونکە زۆر سوور بوو لەسەر هیدایەت دانیان، پاراستنی کانگەی سامان، چونکە دەیزانی بە بێ ئاوەدانی دەوڵەت نارِوات بە ڕێوە، هەروەك کشتوکاڵیش سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی سامان، پەیوەستە بە ژیان و بژێوی ڕۆژانەی خەڵکیەوە.[2]

٧- سوپا پیاوی وای تێدا بێت هەرگیز ناشکێت:

کاتێك خالید (ﷺ) بەرەو عێراق کەوتە ڕێ داوای کۆمەکی لە ئەبو بەکر کرد، ئەویش (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) بۆ نارد! پێی وترا: تۆ بە پیاوێك کۆمەکی دەکەیت کە یەك جەنگاوەری خۆی لە پشتەوە نەماوە؟! ئەویش فەرمووی: (سوپا پیاوێکی وای تێدا بێت هەرگیز ناشکێت).[3]

ئەمەش فیراسەت و دوور بینی ئەبو بەکر دەردەخات کە پاشتر لە دوای شەڕەکانی عێراق دەرکەوت، کە ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) زاناترین کەس بووە بە ناسینی پیاوان و لەگەڵ ڕەوشت و وزە و توانا جیاجیاکانیاندا.[4]

**دووەم: جەنگەکانی خالید لە عێراق:**

کاتێك خالید (ﷺ) بەرەو عێراق کەوتە ڕێ بە دوو هەزار جەنگاوەرەوە کە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان بووبوونەوە و لە هۆزە عەرەبەکانیش هەشت هەزار موجاهیدی پێوە نووسا،

---

[1] التأريخ الاسلامي (٩/١٣٠).

[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٤٢).

[3] تأريخ الطبري (٤/١٦٣).

[4] التأريخ الاسلامي (٩/١٢٩).

نامەشی نارد بۆ فەرماندەکانی عێراق ئەوانە جەنگاوەریان بە چوار دەورەدا بوو بۆ جیهاد خۆیان ساز کردبوو، وەك (مذعور کوڕی عدی العجلی) و (سلمی کوڕی قەیس تەمیمی) و (حرملە کوڕی مەربەتە تەمیمی) و داوای لێ کردن پەیوەندی بکەن بە سوپاکەیەوە و هەموویان هاتن بە دەم داواکاریەکەیەوە و سوپاکانیان کە هەشت جەنگاوەر بوو تێکەڵی سوپاکەی خالید کرد، بەو جۆرە ژمارە سوپای ئیسلام گەیشتە هەژدە هەزار جەنگاوەر.[1]

کە سوپاکان لە ناوچەی (ابلة) یەك بگرن.

خالید پێش ئەوی بەرەو عێراق هەنگاو بنێت نامەی نارد بۆ هورمز کە ئەو کاتە حاکمی ناوچەی ئەبلە بوو، تیایدا هەڕەشەی لێکرد و پێ ی ووت: پاشان... موسڵمان ببە بێوەی دەبیت، یان خۆت و گەلەکەت قبووڵی جزیە و ژێردەستەیی بکەن، ئەگەر ئەوەش ناکەن ئیتر لۆمەی خۆتان بکەن، چونکە گەلێکم هێناوەتە سەرتان ئێوە چەندە حەزتان لە ژیانە ئەوان ئەوەندە حەزیان لە مردنە.[2]

خالیدیش (ﷺ) بۆیە ئەم شێوازەی لەگەڵ هورمز بەکارهێنا چونکە یەکێکە لە شێوازەکانی جەنگی دەروونی و ترساندنی بەرامبەر، تا هێزیان نەمێنێت و ورەیان بڕوخێت.

کاتێك خالید لە سوپای دوژمنان نزیك بوویەوە سوپای کرد بە سێ بەشەوە، داوای کرد هەر بەشە لە لایەکەوە بچنە ناوەوە و نەیهێشت لە یەك ڕێگەوە بڕۆن، ئەوەش نەخشەیەکی سەربازیە بۆ دابینکردنی ئاسایشی کەرتەکان، (مثنی)ی کردە فەرماندەی بەشی پێشەوە و بە دوایدا بەشی عەدی کوڕی حاتەمی طائي بڕوات و خالیدیش بە بەشەکەی سێیەمەوە بە دوایاندا بڕوات و پەیمانی پێدان لە (حضير) یەك بگرنەوە و بەرامبەر دوژمن خۆگر بن.[3]

١- جەنگی (ذات السلاسل):

هورمز هەواڵی هاتنی خالیدی بیست، زانی موسوڵمانەکان بە نیازن لە (حضير) یەك بگرنەوە، بۆیەو زووتر خۆی گەیاندە ئەوێ و سوپاکەی کرد بە دوو بەشەوە و دای بە دەستی دوو

---

[1] تأريخ الطبري (٤/١٦٣).

[2] هەمان سەرچاوە (٤/١٦٤).

[3] ابو بكر الصديق – خالد الجنابي (لا: ٤٦).

فەرماندە کە (قوباذ و ئانوشجان) بوون، هەر کە خالیدیش ئەو هەواڵەی بیستەوە و ڕێڕەوی خۆی گۆڕی بۆ ناوچەی کاظمة کە لەسەر ئاوەکە بوو بەڵام هورمز بەوەشی زانی و ئەوێشی گرت و شوێنێکی زۆر گونجاوی بۆ سوپاکەی دۆزیەوە، وە خالیدیش لەو لایانەوە و لە شوێنێکی بێ ئاودا سوپاکەی جێگیر کرد، وە بە هاوڕێکانی وت: «چی شتی قورستان پێیە دای بنێن و بۆ گەیشتن بە ئاو شەڕی دەستە و یەخەیان لەگەڵدا بکەن، و بە خوا قەسەم ئەو ناوچە ئاویە بۆ ئەو لایەنە دەبێت کە زۆر خۆگرانە بجەنگێت و بەرێزترین سەربازیش بن»[1].

موسوڵمانەکانیش هەچی شتی قورسیان پێ بوو دایان نا و جەنگاوەرە پیادەکان کەوتنە ڕێ و بەرەو ڕووی بێ باوەڕەکان ڕۆیشتن، خوای گەورەش بەخشش و نازی خۆی بەخشی بە سوپای باوەڕ و هەورێکی هەڵکرد و بارانێکی باراندا بەسەریاندا و تێر و پڕ ئاویان گرت، بەم بەخششەیەیش ئەوەندەی تر وورەیان بەرز بوویەوە، ئەمەش نموونەیەکە لەو نموونە زۆرانەی کە یارمەتی و هاوکاری خوای گەورە دەردەخات بۆ سوپای باوەڕ و دۆستانی خۆی.

موسوڵمانەکان ڕووبەڕووی هورمز بوونەوە کە پیاوێکی لە ئەندازە بەدەر پیس و هیچ و پوچ بووە تەنانەت ئەو بە نموونە دەهاتەوە لە پیسی و ناپاکیدا، بۆیە ویستی فێڵێك لە خالید بکات، لە ژێرەوە بە پاسەوانەکانی خۆی وتبوو، هەر کاتێك من و خالید بۆ شمشێر بازی گەیشتینە یەك، ئێوەش هێرشی بۆ بکەن و بیکوژن، بۆیە لە ڕیزەکان هاتە دەرەوە و بە خالیدی وت: وەرە دەرەوە شمشێربازیم لەگەڵ بکە، و ئەویش هاتە دەرەوە بۆی، دەستیان کرد بە شمشێر بازی و خالید باوەشی پێدا کرد و خەریك بوو بیکوژێت بەڵام وازی لێهێنا چونکە لە هەموو لایەکەوە چوار دەورەیان دا و خەریك بوو بیکوژن، بەڵام سەرکردەی بە توانا و تێکۆشەری ئیسلام (قەعقاعی کوڕی عەمر) (ﷺ) لەو پیلانە گڵاوە تێگەیشت بۆیە بە کۆمەڵێك جەنگاوەرەوە هێرشیان کردە سەر پاسەوانە ناپاکەکان و لە ناویان بردن،[2] بە دوای قەعقاعیشدا موسوڵمانەکان هێرشیان کرد بۆ فارسەکان.

---

[1] الكامل لابن كثير (٢/٥١)، تأريخ الطبري (٤/١٦٥).

[2] تأريخ الطبري (٤/١٦٥).

ئەمە یەکەمین ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای موسوڵمانەکان بوو لەگەڵ فارسەکاندا و فیراسەت و دوور بینی صدیق (ﷺ) دەرکەوت کە فەرمووی: «سوپایە وێنەی ئەم پیاوە لە خۆ بگرێت هەرگیز ناشکێت».

خالیدیش (ﷺ) بە جوانترین نموونەی پاڵەوانێتی و خۆگریەوە دەجەنگا، و خۆی گەیاندە سەرکردەکەیان و پاسەوانەکانی نەیانتوانی نەهێڵن بگات پێی، و بەردەوام بە کۆمەڵ دەهاتن بۆی تا ئەوە بوو (قەعقاع) خۆی پێگەیاند بۆ هاوکاری کردنی و پێکەوە لە ناویان بردن، لەم جەنگەدا فارسەکان بە زنجیرە خۆیان بەستبوویەوە تا ڕانەکەن، بەڵام ئەم کارەشیان دادی نەدان لەبەر دەم شمشێرە نەبەردەکاندا، بەم هۆیەوە ئەم جەنگە ناوی لێ نرابوو (ذات السلاسل) واتا خاوەن زنجیرەکان.[1]

لەو جەنگەدا موسوڵمانەکان هەزار حوشتریان دەستکەوت، و خالیدیش کۆمەڵێك سریە و پەلی نارد بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵی قەڵاکە بە دەوری حیرەدا بوون، سامانێکی زۆریان کەوتە دەست، وە خالیدیش بە هیچ جۆرێك پەلاماری جوتیارەکانی نەدا — کە بەشداری جەنگەکان نەبوون — وە بە جوانی لەگەڵیان هەڵسوکەوتی کرد هەروەك ئەبو بەکر (ﷺ) ئامۆژگاری کردبوو، وە لەسەر زەویەکانی خۆیان هێشتنیەوە، بواری دان تا بە کاری بهێننەوە و سوود لە بەروبوومی خۆیان وەربگرن، هەر کەسێکیان موسوڵمان ببوایە تەنها زەکاتی دەخستە سەری، ئەوەشی موسوڵمان نەبووایە جزیە و سەرانەی لەسەر دادەنا، کە ئەوەش زۆر لەوە کەمتر بوو کە فارسەکان لە سەریان دایان نابوو، وە زەویەکانیان لە فارسەکان نەسەندەوە بەڵکو بە ئینصافەوە مامەڵەیان لەگەڵ کردن، وە هەستیان بەوە کرد کە شتێکی نوێ لە برایەتی و دادپەروەری مرۆڤایەتیان لەگەڵ خۆدا هێناوە لەم ڕزگارکردنە پڕ خێرەدا.

خالیدیش ٥\١ ی دەستکەوتەکانی ناردەوە بۆ ئەبو بەکر (ﷺ) و ئەوی کەشی بەسەر جەنگاوەرەکاندا دابەش کرد، یەکێك لەو شتانەی ناردبوویەوە بۆ ئەبو بەکر — کڵاوەکەی هورمز بوو ، ئەویش خەڵاتی کردەوە بە خالید،[2] لەبەر ئەو نەبەردیانەی لەو جەنگانەدا نواندی — کە

---

[1] التأريخ الاسلامي (١٣٣/٩).

[2] الصديق اول الخلفاء (لا: ١٣١).

نرخی ئەو کڵاوە سەد هەزار دینار بوو، و دەوروپشتی بە گەوهەر چنرابوو، و خەڵکی فارس بە پێی بەرزی ئاستی کۆمەڵایەتیان نرخی کڵاوەکەیان زیاتر بوو، وە هەر کەسێك بگەیشتایەتە لوتکەی بەرزی ئەوە کڵاوەکەی (١٠٠) هەزاری دەکرد و هرمزیش لە هەموویان بەڕێزتر بوو بۆیە کڵاوەکەی وا گران بوو.[1]

٢- جەنگی (المذار):

هورمز لە پێش دەست پێکردنی جەنگی – ذات السلاسل – کە باسمان کرد نامەیەکی بۆ کیسرا نوسی و داوای کۆمەکی سەربازی کردبوو، ئەویش سوپایەکی بۆ نارد بە سەرکردایەتی (قارن)، بەڵام ئەوو هورمزە نەگبەتە سوپای مەسلمانەکانی بە سوك و کەم هاتە پێش چاو بۆیە پەلەی کرد و نەیهێشت سوپاکەی قارن بگات خۆی تووشی جەنگی دۆڕاو کرد و کاتێك شکان و ڕایان کرد لە ڕێگە گەیشتن بە سوپاکەی قارن و پێکەوە یەکیان گرت و خۆیان سازدایەوە بۆ جەنگ، لە جێیەکدا سەربازگەیان دروست کرد پێی دەوترا – المذار – وە خالیدیش (مثنی کوڕی حارثة) و براکەی ناردبوو بە دوای هەڵاتووەکانیان داو هەندێ قەڵاو بەرزاییان ڕزگار کرد، بەڵام هەواڵی سوپاکە قارونیان پێ گەیشت و ئەوانیش خالیدیان لێ ئاگادار کردەوە، خالیدیش ئەبو بکری ئاگادار کردەوە لە ڕۆیشتن بۆیان، و چاك خۆی ئامادەکردبوو بۆ جەنگ تا فارسەکان لە ناکاودا نەدەن بەسەریان دا.

ئەوەبوو لە مەزار سوپای موسڵمانەکان گەیشت بەسوپای فارسەکان و شەڕێکی گەورە کەوتە نێوانیان و فارسەکان زۆر دڵ ڕەقانە دەجەنگان لە داخی شکستییەکەی پێشویان، (قارن) ی سەرکردەیان هاتە دەرەوە و داوای شمشێر بازی کرد لە خالید و خالیدیش ڕۆیشتە دەرەوە و بەڵام مەعقەلی کوڕی ئەعمەش خۆی پێ گەیاند و کوشتی.

(قارن) هەردوو سەرکردەی تێکشکاوی جەنگی (ذات السلاسل) خستبووە ئەم و لای خۆی کە (قباذ) و (ئەنوشجان) بوون، وە قوباد لەسەر دەستی عاصمی کوڕی عەمری تەمیمیدا کوژرا و جەنگ گەرم بوو، لە نێوان هەردوو لادا و بەڵام لە ئاکامدا فارسەکان شکان و پاش کوژرانی سەرکردەکانیان ڕایان کرد، و (٣٠) هەزار کەسیان لێ کوژرا و ئەوانەی تریان بە کەشتی

---

[1] تأريخ الطبري (٤/١٦٨).

له ڕێگەی دەریاوە بۆی هەڵاتن و موسوڵمانەکان نەیانتوانی لە دەریاوە بکەونە شوێنیان، وە خالید لە (مذار) مایەوە، دەستکەوتە کەسیەکانی – سلب – دایەوە بە خاوەنەکانیان و غەنیمە و دەستەوتەکانی تری دابەشکرد بەسەر سوپادا و پێنج یەکەکەی تری ناردەوە بۆ مەدینە.[1]

③ جەنگی (الولجة):

هەواڵی تێکشکانی فارسەکان لە مەزار گەیشتە کیسرا و ئەویش سوپایەکی گەورەی خستە ڕێ بە فەرماندەیی (ئەندەر زەغر) و هاوشانی ئەویش سوپایەکی تریشی نارد بە فەرماندەیی (بەهمەنی جازویە) و (ئەندەر زەغر) لە مەدائینەوە کەوتە ڕێ تا گەیشتە (کەسکەر) و لەوێشەوە بەرەو (وەلجە) و بەهمەنیش بەرەو ناوەڕاستی عێراق کشا تا بتوانێت سوپای موسوڵمانەکان لە دواوە گەمارۆ بدات، لە ڕێگا توانی کۆمەڵێك هاوکار و پشتگیری تر کۆ بکەنەوە و بیانگرنە خۆیان و سەرجەم چەکدارەکانی فارس لە وەلجە کۆبوونەوە.

کاتێك ئەندەر زەغر هەستی بەوە کرد سوپای زۆر گەورە بووە، بڕیاری دا هێرش بەرێتە سەر موسوڵمانەکان، هەر کە خالید (ﷺ) ئەو هەواڵەی بیست لە (الثني) بوو ناوچەیەکی نزیك بەسرە و ڕای هاتە سەر ئەوەی کە بۆ موسوڵمانان وا باشە هێرش بەرنە سەر فارسەکان لە سێ قۆڵەوە، تا پەرتەوازەیان بکەن و شتێکی چاوەڕوان نەکراویش بێت و فارسەکان تێك بدات، دەستی کرد بە خۆ سازدان بۆ ئەو هێرشە، بۆ ئەوەی لە بەرەکانی دواوە دڵنیا بێت سویدی کوڕی موقرمی لە (حضير) دانا و خۆیشی سوپاکەی بەرەو وەلجە کەوتە ڕێ، لەوێ هەستا بە ڕوانین و ورد بوونەوە لە ناوچەکە و دەبینێت زەویەکی فراوان و لە بارە بۆ جەنگ، شیاوە بۆ جموجۆڵی سوپا.

پاش ئەوەی بڕیاری دا هێرش بکاتە سەریان لەسەر ئەو نەخشەیەی کە لە سێ قۆڵەوە ڕیزەکانیان تێك بدات، فەرمانی دەرکرد لە دواوە و لە هەردوو لاوە هێرشیان بگرێتە سەر، جەنگ گەرم بوو لە نێوان هەردوو لادا و خالیدیش خۆی لە پێشەوە هاشاوڵی بۆ بردن و لە کاتی

---

[1] تأريخ الطبري (١٦٨/٤).

گونجاودا دوو سوپاکە لە دواوە و لە لایەکانیەوە دایان بەسەر دوژمناندا و تووشی شکستیەکی قورسیان کرد، ئەندەر زەغر لە گەڵ کۆمەڵێك چەکدار هەڵاتن بەڵام لە بیابان لە تینواندا مردن.[1]

خالید وتارێکی بۆ سوپای ئیسلام دا و تیایدا هانی دان کە دەست بگرن بەسەر وڵاتی عەجەمدا و هەر بە ژیانی نەبوونی وڵاتی عەرەبی خۆیان ڕازی نەبن، وتی: «نابینن لە هەمە جۆر خواردەمەنی؟ وەڵاهی ئەگەر جیهادی ڕێگەی خوا و بانگەواز بۆ لای ئیسلامیش کارمان نەبووایە و ئەگەر لەبەر ئەم هەموو دەستکەوت و شتە دنیاییانەش بویە ڕام وا بوو هەر هەقی خۆی بوو بجەنگاینایە، چونکە ئێمە شایانترین بەم ناز و نیعمەتانە و تاماڵئاواییمان بکردایە لە نەبوونی و ژیانی سەخت کە بەسەر شانی هەر یەکەمانەوەیە».

پاشان دەستکەوتەکانی دابەشکرد بە شێوەی ٥\٤ و ١\٥یشی نارد بۆ مەدینە.[2]

بەم وتانەی خالید دەردەکەوێت کە عەرەب لە سەردەمی نەفامیاندا، هەروەك قیامەتیان لەدەست دابوو لەبەر دووبەرەکی و برا کوژی دونیاشیان لە دەست چوو بوو.

خالید دەڵێت: «ئیتر پیاوی ڕۆژی دوایین و ئامانجێکی بەرزمان هەیە و هەوڵی دەستکەوتنی دەدەین و خەڵکی بۆ بانگ دەکەین، گریمان ئەم ئامانجە بەرزەشمان نەبووایە و لە پێناویدا قوربانیمان نەدایە، دەی ژیریمان پێمان دەڵێت دەبێت شێرانە بجەنگین بۆ خۆشکردنی گوزەرانمان».

خالید کاتێك کە وا دەڵێت، مەبەستی ئەوە نیە کە لەگەڵ ئامانجی جیهاد و ڕەزامەندی خوادا — مەبەستێکی دونیایشیان بووبێت، بەڵکو تەنها گریمانێك دادەنێت و دەڵێت ئەگەر ئامانجێکی ئاوا گەورەشمان نەبوایە هەر دەبوایە بۆ دونیاش بوایە ئەمەمان بکردایە، وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر ئێمە شایان بێت لەسەر شتێکی دنیایی ڕووبەڕوویان ببینەوە ئەی چۆن لە پێناوی ئامانجی قیامەت و ڕەزامەندی خوادا لەگەڵیان نەجەنگین؟!

---

[1] الكامل لابن كثير (٢/٥٢)، ابو بكر الصديق، خالد الجنابي (لا: ٤٨).

[2] البداية والنهاية (٦/٣٥٠).

ئەم وتانەی خالید ورە بەرز دەکەنەوە و گوڕ و تین دروست دەکەن، دڵ زیندوو دەکاتەوە و وزەکان دەتەقێنێتەوە، ئەو کاتە مرۆڤە باوەڕدارەکان بە هەموو هێز و پێز و توانا و وزەیەکیانەوە لە پێناوی خوادا دەجولێن.[1]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە لە جەنگی وەلجەدا خالید ڕووبەڕووی پالەوانێکی فارسی بوویەوە کە (١٠٠٠) کەس پێیان نەیوێرابوون بەڵام ئەو کوشتی، کاتێك لێ بوویەوە، شانی لەسەر تەرمەکەی داهێلا و داوای خواردنی لێ کرد،[2] ئەم کارە گەورەیەشی تەنها لەبەر سەرشۆڕکردنی فارسەکان و شکاندنی لووتیان و دابەزاندنی ورەیان بوو.[3]

٤- جەنگی ئەلیس و ڕزگار کردنی ئیمغیشیا:

لەم جەنگەدا هەندێ لە گاورە عەرەبەکان پشتی فارسەکانیان گرت دژی موسوڵمانەکان، کە گاورەکان (عبدالاسد العجلي) و فارسەکانیش جابان فەرماندەیی دەکردن، بەڵام بەهمەنی جازویە فەرمانی پێدابوو کە نەدات بەسەر موسوڵمانەکاندا تا ئەوان نەدەن بە سەریاندا.

کاتێك خالید (ﷺ) زانی کە گاورەکانی عەرەب و هەندێ لە عەرەبەکانی دەوروبەری حیرە کۆبەنەتەوە دژی موسوڵمانان، ڕۆیشتن بۆیان و ئەو بەوەی زانیبوو کە فارسەکانیشان لەگەڵدایە، جابان داوای کرد لە سەربازەکانی کە ڕووبەڕووی ببنەوە و ئەوانیش خالیدیان بە شتێکی گرنگ سەیر نەکرد و سستیان نواند بەرامبەری و بانگی سفرە و خوانیان کرد، بەڵام خالید نەیهێشت بە خۆشی نانەکەیان بخۆن و دەستی کرد بە جەنگێکی توند لەگەڵیان و دوژمنەکانی زیاتر شەڕانی و بە غیرەت بوون کاتێك کە بەهمەنی جازویە بە سوپا و کۆمەکیەکی گەورەوە خۆی پێ گەیاند، موسوڵمانەکانیش زۆر بە ئارامی و خۆگریەوە جەنگی خۆیانیان دەکرد و خالیدیش وتی: ئەگەر زاڵ بووین بە سەریاندا یەك کەسیان ناهێڵین و دەریایەکی خوێنیان لێ پێك دێنین.

---

[1] التأريخ الاسلامي (١٣٩/٩).

[2] البداية والنهاية (٣٥٠/٦).

[3] التأريخ الاسلامي (١٣٨/٩).

هەر کە خوای گەورە فارسەکانی شکاند و پشتیان لە موسوڵمانەکان هەڵکرد، خالیدیش هاواری کرد: دیلیان کەن دیلیان کەن، مەگەر یەکێك نەهێڵێت دیلی کەن، کۆمەڵ کۆمەڵ دانیانە بەر و کۆمەڵێك پیاویان تایبەت کرد بۆ کوشتنیان و فڕێیان بدەنە دەریاکەوە و شەو و ڕۆژێك بەردەوام خەریکیان بوون و دوو ڕۆژیش دوای ئەوە هەر بەردەوام بوون تا خەریك لە پاڵ ڕووباری ئەلیسدا ڕووبارێکی تر دروست دەبوو.

بۆیە قەعقاع و هەندێ فەرماندەی تر بە خالیدیان وت: ئەگەر هەموو سەر زەویش بکوژیت خوێنیان وەك دەریا فوارە ناکات چونکە دوای مردن خوێن لە لاشە دەوەستێەوە و زەویش بەشی هەڵدەمژێت، ئاو بەر بدەنەوە سەر ئەو دۆڵە با سوێندەکەت نەکەوێت و ئاوی بەردایەوە سەر دەریایەکە و لەگەڵ خوێندا سوور بووبوو، بۆیە ناوی لێ نرابوو — دەریای خوێن.[1]

پاش ئەوەی فارسەکان شکان و سەربازگەکەیان بەجێهێشت و موسوڵمانەکانیش وازیان هێنا لە ڕاونانیان، خالید بەسەر چێشت و خواردنەکانیانەوە وەستا و وتی: ئەی موسوڵمانەکان ئەوەش بۆ ئێوە و دام بە ئێوە، وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر چێشتێکی دروستکراوی بۆ بهاتایە موسوڵمانانی بۆ بانگ دەکرد، ئیتر موسوڵمانەکان لە خواردنی فارسەکان کۆبوونەوە بۆ نانی ئێوارەیان و ئەوانەیان کە خواردن و چێشتی بە لەزەتیان نەدیبوو دەیان پرسی: ئای ئەم نانە ناسکە سپیە جوانانە چین؟ ئەوانەیان کە پێشتر دیبوویان وەڵامیان دەدانەوە و بە شۆخیەوە پێیان دەوتن: ژیانی ناسك و خۆشتان بیستووە؟ دەیانووت: بەڵێ، دەیانووت: ئەمەیە ژیانی ناسکۆڵە — بەنازپەروەردە — کە عەرەب پێیان دەوت: (قری).[2]

هەر کە خالید لە (ئەلیس) لێ بوویەوە تا (ئیمغیشیا) نەوەستا دەبینێت خەڵکەکەی چۆڵیان کردووە و هەموو شتێکیان بەجێ هێشتووە، فەرمانی دەرکرد ئەو قەڵایە بڕوخێنن بەسەر شتەکانیشیدا، ئەوەندەیان لەوێ دەستکەوت کە پێشتر شتی وایان دەست نەکەوتبوو، کە بەشی هەر سوارێك (١٥٠٠) درهەم بوو جگە لە شتی تریش.

---

[1] التأريخ الطبري (١٧٣/٤).

[2] التأريخ الطبري (١٧٣/٤).

کاتی ١/٥ و هەواڵی سەرکەوتنەکان گەیشتە شاری مەدینە و نەبەردی خالید پێ گەیشت ووتی: ئەی قورەیشەکان شێرەکەی ئێوە – خالید – پەلاماری شێرەکەی ئەوانی دا و گۆشتەکەی ئەنجن ئەنجن کرد، ئافرەتان نەیان توانیوە ڕۆڵەی وەك خالیدیان ببێت.[1]

کاتێك خالید بە پیاوێکدا کە جەندەلی ناو بوو لە بەنی عەجل بوو هەواڵەکەی ناردەوە بۆ ئەبو بەکر ئەو پیاوە دەلیلێکی ڕێگەی بە هێز بوو، وە هەواڵی ڕزگارکردنی ئەلیس و زۆری دەستکەوتەکانی کەنیزەکەکان و دابەشکردنی غەنیمەکان و خەڵاتکردنی جەنگاوەرە نەبەردەکانی پێدا و کاتێك ئەبو بەکر بینی وا بە جوانی هەواڵە خۆشەکانی بەڕێز بۆ باس دەکات پێی وت: ناوت چیە؟ وتی: جەندەل، و ئەویش لەوێدا شعرێکی بۆ خوێندەوە و وتی:

ویهاً جندل –

نفس عصام سودت عصاماً وعودته الكرُّ والاقداما

پاشان فەرمانی دا یەکێك لەو کەنیزەکانەی پێ خەڵات بکەن و کۆرپەیەکیشی لێ بوو.[2]

وتەی ئەبو بەکر سەبارەت بە خالید: ( عدا أسدكم على الاسد فغلبه على خراذيله، اعجزت النساء ان ينسلن مثل خالد!).

ئەمە گەورەترین نۆتی ئازایەتی و خەڵاتی نەبەردیە بۆ خالید و دان نانە بە شتی جوان و شیاودا، بەرزکردنەوەی نرخی خۆ ماندووکاران و ورە بەرزانە، هەروەها هۆکاریشە بۆ بەرزکردنەوەی ورەی نزمەکان و لاوازەکانە تا هەوڵی خۆیان چەند جارە بکەنەوە بگەنە ئەوان.[3]

ئەم وشەیەی صدیق (ﷺ) گەورەترین شایەدیە و جوانترین ڕێزلێنانە کە لە مێژووی ئیسلامدا پیاوێك دەستی کەوتبێت، صدیق (ﷺ) کە جێنشینی پێغەمبەر و (ﷺ) گەورەی

[1] هەمان سەرچاوە (٤/١٧٥).
[2] التأريخ الطبري (٤/١٧٤).
[3] التأريخ الاسلامي (٩/١٤٢).

موسوڵمانانە وا نازانێت لە ناو هەموو خەڵکیدا لە خالید باشتر و ئازاتر و عەبقەری تر هەبێت و بێ وێنەیە لە ئازایەتی و نەبەردی و ئەم شایەتیەش بەسە بۆ خالیدی کوڕی وەلید.[1]

٥- ڕزگارکردنی (حیرە):

مەرزبانی حیرە هەواڵی سەرکەوتنەکانی خالیدی لە ئیمغیشیا پێ گەیشت و دڵنیا بوو کە سەرەی ئەویش دێت و خۆی بۆ ساز کرد و سوپایەکی بە سەرکردایەتی کوڕەکەی خۆی نارد و فەرمانیشی پێدا کە فورات بگرێتەوە تا کەشتی موسوڵمانەکان نەتوانن بێن بۆیان، ئەمە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو لای موسوڵمانەکان و غەمباربوون و جوتیارەکانیان کۆکردەوە و تێیان گەیاندن کە دەبێت ئاوەکە بڕوات، ئەی خالید چی کرد؟

خالید لەگەڵ چەند سوارێك بە مەبەستی گەیشتن بە کوڕەکەی مەرزەبان دەرچوو، کت و پڕی کوڕەکەی پێ گەیشت لە ناو چەند سوارێکدا بوو، هەر لەوێدا هەموویانی کوشت و پێش ئەوەی هەواڵ بگاتەوە مەرزەبان ڕۆیشت بۆ لای دەریاچەی فورات و لەوێ کۆمەڵێك چەکداری مەرزەبان پاسەوانی ئاوەکەیان دەکرد و شەڕی لەگەڵ کردن و سەرکەوت بە سەریاندا و ئاوەکەی بەردایەوە بە شوێنی ئاسایی جارانیدا جۆگەی گرتەوە، پاشان داوای کرد لە سوپاکەی بەرەو حیرە هێرش بەرن و مەرزەبان هەواڵی کوشتنی کوڕەکەی بیست و کوژرانی ئەزدەشێر مەسەلەکەی زۆر ترسناك بوو، بۆیە بەبێ شەڕ هەڵهات و ڕایکرد و خالیدیش لە شوێنێکدا سەربازگەی داکوتا و خەڵکی حیرە لە ناو قەڵاکاندا خۆیان قایم کردبوو، خالیدیش نەخشەی گەمارۆدانی قەڵاکەی بەم شێوەیەی خوارەوە داڕشت:

١- (ضرار کوڕی ئەزور) بۆ گەمارۆی کۆشکی سپی کە ئیساسی کوڕی قوبەیسەی طائي تێدا بوو.

٢- (ضرار کوڕی خطاب) بۆ گەمارۆی کۆشکی عەدەسیین کە عەدی کوڕی عەدی عوبادی تێدا بوو.

٣- (ضرار کوڕی مقرن) بۆ گەمارۆدانی کۆشکی بەنی مازن کە ئیبن ئاکالی تێدا بوو.

---

[1] خالد بن الولید، صادق العرجون (لا: ٢١٦).

٤- (مثنی کوڕی حارثة) بۆ گەمارۆدانی کۆشکی ئیبن بەقیلە کە عەمری کوڕی عبدالمسیحی تێدا بوو.

خالید (ﷺ) بەهەموو فەرماندەکانی خۆی وتبوو کە پێش هەموو شتێك بانگیان بکەن بۆ لای ئیسلام، ئەگەر قبوولّیان کرد لێیان وەربگرن، ئەگەر واشیان نەکرد ڕۆژێك مۆڵەتیان بدەن، فەرمانیان پێ بکەن کە دوژمنایەتیان نەکەن و ڕێگریش نەبن لە جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنەکانتاندا، بەڵام ئەوان جەنگیان هەڵبژارد و دەستیان کرد بە بەرد بارانکردنی موسوڵمانەکان و موسوڵمانەکانیش تیربارانیان دەکردن و دەهاتنە دەرەوە لە قەڵاکان و هێرشیان دەهێنایە سەر موسوڵمانەکان و دەرگای ماڵەکانیان خستە سەر پشت.

قەسیسەکان هاواریان کرد: ئەی دانیشتوانی کۆشکەکان، ئێوە دەبنە هۆی کوشتنی ئێمە.

خەڵکی کۆشکەکانیش هاواریان کرد: ئەی عەرەبەکان یەکێك لەو سێ مەرجەتان قبووڵ دەکەین دەی ئیتر واز بێنن لێمان، سەرکردەی قەسرەکان هاتە دەرەوە و خالیدیش هەر سەرکردە و بە جیا دانیشتنی لەگەڵ دەکرد و سەرزەنشتی دەکردن لەسەر ئەو کارەیان، و لەگەڵیان ڕێك کەوت کە (جزیة) بدەن، کە (١٩٠) هەزار دینار بوو، وە خالیدیش هەموو دەستکەوتوو خەڵاتەکانی نارد بۆ ئەبو بکر، ئەبو بکریش خەڵاتەکانی وەرگرت بەڵام وتی دەیخەینە بڕی (جزیة)، تا ئەو بارە قێزەونەی فارسەکان نەهێڵێ کە لەگەڵ شەرعدا یەك ناگرێت و خواردنی پارەی خەڵکی بەناڕەوا.[1]

ڕێککەوتن نامەکەی خالید بۆ خەڵکی حیرە بەم شێوەیە بوو: «بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە ئەو ڕێککەوتن نامەیەیەی خالیدە لەگەڵ عەدی و عەمری کوڕی عەدی و عەمری کوڕی عبدالمسیح و ئیسیاسی کوڕی قوبەیسە و حیرەی کوڕی ئاکال، کە ئەوانە دەمڕاستی خەڵکی حیرەن و ئەهلی حیرەیش پێی ڕازین، لەگەڵیان ڕێککەوتن لەسەر (١٩٠) هەزار کە ساڵانە دەست ڕۆیشت و کاسبەکانیان بیدەن و هەژار و کەم دەستەکانی لێ ببەخشرێت ئەمەش بەرامبەر بە پاراستنیان و ئەگەر ڕۆژێ نەتوانن بیان پارێزن هیچیان لێ ناسەنن، ئەگەر بەکارێك یان

---

[1] التاريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٤٨).

بەوتەیەك ناپاکی بکەن ژێر سایەیان نامێنێ -(الذمة)- و ئەم ڕێککەوتن نامەیە لەمانگی ڕەبیعول ئەوەل ساڵی (١٢)ی کۆچی نوسراوە».[1]

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە: کە خالید یەکێك لەم سێ خاڵەی خستە بەر دەستی خەڵکی حیرە: بێنە ناو ئاینەکەمانەوە چی بۆ ئێمەیە بۆ ئێوەش دەبێت و چیش لەسەرمانە لەسەر ئێوەش دەبێت، یان بۆ خۆتان دانیشن و (جزیە) بدەن، یان وەرنە پێشەوە و جەنگمان لەگەڵدا بکەن، سوێند بە خوا کۆمەڵێك پێشمەرگەم هێناوەتە سەرتان ئێوە چەندە حەزتان لە ژیانە ئەوان ئەوەندە حەزیان لە مردنە، وتیان: باشە (جزیە) سەرانە دەدەین، خالیدیش پێی وتن: دەك لە ناوچن، ئەوە چیتانە، بێ باوەڕی دەشتێکی گومڕاییە، گەوجترین عەرەب ئەو دەستە دەگرێتەبەر.[2]

لە وتەکانی خالیددا هەندێ ڕەوشتی بیروباوەڕ بەدی دەکرێت کە لە سوپای ڕزگاری عێراقدا بەدی دەکرا، ئەم سوپایە لە پێناو ئاماجێکی بەرزدا هەنگاوی دەنا کە ئەوەش بانگەوازی خەڵکی بوو بۆ لای ئیسلام و ڕێنموونی کردنی مرۆڤایەتی، نەك فراوانکردنی سنووری دەسەڵات و خۆ نواندن و دنیا ویستی.

هەروەك گرنگترین خاڵ و مەرجەکانی سەرکەوتنی موسوڵمانانی ڕوون کردەوە کە ئەوەش سووربوونی تەواوە لەسەر حەزکردن لە شەهیدی لە پێناوی دەستکەوتنی بەهەشتی خوا لە دوا ڕۆژدا، هەروەك بڕگەی کۆتایی وتەکانی خالید سووربوونی هاوەڵان دەگەیەنێت لەسەر جێبەجێکردنی سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و لە هەموو دڵێکەوە حەزکردنیان لە هیدایەتدانی مرۆڤەکان، ئەمەش لە وتەکەی خالیددا بەدی دەکرێت کە سەرزەنشتی کردن لەسەر ئەوەی کە موسوڵمان نەبوون و قبوڵی سەرانە دانیان کرد، کە لەگەڵ ئەوەشدا لە لایەنی مادیەوە قازانجی زیاتر بوو بۆیان کە (جزیە بدەن)، بەڵام خالید لەو کەسانە بوو کە دنیا و دەستکەوتی دنیا لەلایان بێ نرخ بوو، هەموو ڕوانینێکیان بۆ پاداشت و ڕەزامەندی خوای — عز و جل — بوو، کە ئەمەش سونەتێکە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی دیاری کردوون وەك دەفەرموویت: «لإن يهدي

---

[1] التأريخ الطبري (٤/١٨١).

[2] التأريخ الطبري (٤/١٧٨).

الله بك رجلاً واحداً خير لك من حمر النعم»»[1] واتا: ئەگەر خوا لەسەر دەستی تۆ هیدایەتی یەك کەس بدات، بۆ تۆ باشترە لە کۆمەڵێك حوشتری سوور.

لە وەرگرتنی دیاریەکانی حیرە لە لایەن ئەبو بەکرەوە و بە ئارەزووی خۆیان پێشکەشیان کرد، کەچی بە حیسابی (جزیە) قبوولّی کرد کە ئەمەش لەبەر هێنانەدی دادپەروەری ئیسلام و نەخواردنی ماڵی خەڵکی بە ناڕەوا و ترسانی لەوەی نەوەك ستەمێك بێت لە ژێردەستەکان — الذمة — کە ئەمەش وانەیەکی گەورەیە لە بەرپاکردنی دادپەروەری لە ناو خەڵکیدا.

شێخ علی طنطاوي بەراوردێکی جوانی کردووە لە نێوان هێرشە داگیرکاریەکانی ڕۆژئاوا بۆ وڵاتانی ئیسلام و هێرشە ڕزگاریخوازە پڕ لە دادەکانی موسوڵمانان لە سەردەمی جەنگە ڕزگاریخوازیەکاندا، هۆنراوەی شاعیریش دێنێت بە نموونە و دەڵێت:

ملكنا فكان العفو منا سجية — فلما مـــلكتم سال بالدم أبطح

وحـــللتم قتـــل الاسارى وطالما — غدونا على الاسرى نمن ونصـفح

فحســبكم هـــذا الـتـفــاوت — فـكل إنـــاء بالذي فيه ينضـح

* (حیرە) وەك بنکەیەکی سەربازی سوپاکانی ئیسلام:

ڕزگارکردنی حیرە دەستکەوتێکی گرنگ بوو، هیوای ڕزگار کردنی وڵاتی فارسی تیادا زۆر کردن، ئەمەش لەبەر گەورەیی ئەم شارە لە لایەنی جوگرافی و ئەدەبی یەوە لەلای عێراق و وڵاتی فارس، ڕابەری گشتی وڵاتی ئیسلام بنکەی سەرەکی خۆی لەوێ دانا، و لەوێوە سوپاکانی ئیسلام هەموو فەرمانێکی هێرش و بەرگری و کۆمەکی و پلانسازی لەوێوە دەردەچوو، و هەروەها بوو بەبنکەیەکی گشتی بۆ ئیدارە دان و بەڕێوە بردنی کاروباری ناوچە ئازادکراوەکانی چوار دەوری، خالید فەرمانبەرانی خۆی نارد بە ولایەتەکاندا بۆ کۆکردنەوەی سەرانە و زەویانە (خراج)، فەرماندەکانی نارده خاڵەکانی سنوور بۆ پارێزگاری و خۆیشی مایەوە تا ئەو کاتەی ئاسایش بە تەواوی بەرقەرار دەبێت لەو ناوچانەدا، هەواڵیشی گەیشتە فەرمانڕەوا و سەرۆك هۆزەکانی چوار دەور و هاتن بۆ لای و ڕێککەوتن نامەیان لەگەڵدا بەست، تا وای لێهات

---

[1] البخري كتاب المغازي (ژمارە: ٤٢١).

لایەکی عێراق نەبوو کە سەر بە موسوڵمانەکان نەبن یان ژێر پارێزگاری – ذمة – موسوڵمانەکان نەبن.

لە فەرمانڕەواکانی خالید بەسەر ناوچەکانەوە:

١- (عبداللە کوڕی وثیمة) بەرپرسی (فەلایج) بوو.

٢- جەدیری کوڕی عبداللە بەرپرسی (بانقیا).

٣- (بەشیری کوڕی إبن خصاصیة) بەرپرسی (النهرین).

٤- سوید کوڕی مقرنی حزنی بەرپرسی (ننستی).

٥- (أط کوڕی ابي أط) بەرپرسی (ڕوزستان).

لە فەرماندەکانی پارێزگای سنوور:

١- ضراری کوڕی الازور.

٢- ضراری کوڕی خطاب.

٣- ضراری کوڕی مقرن.

٤- قعقاع کوڕی عەمر.

٥- بسری کوڕی ئەبی رهم.

٦- قتیبەی کوڕی نەهاس.[1]

* ئەو نامانەی کە خالید ناردوونی بۆ فەرمانڕەواکان و میللەتی فارس:

خالید پاش ئەوەی کە عێراقی بۆ یەکلایی بوویەوە بڕیاری هاتە سەر ئەوەی لەگەڵ فارسدا و لە وڵاتی خۆیاندا ڕووبەڕوو بێتەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی دەستی فارسەکانی لە عێراق پچڕاند و پشتەوەی خۆی بێ خەم کردبوویەوە و گەلی فارس لەم ماوەیەدا ناکۆکیەکی زۆر کەوتبوویە نێوانیان لەسەر ئەوەی کە کێ دابنێن بە پاشای خۆیان پاش مردنی ئەزدەشیر، بۆیە خالید ئەم هەلەی قۆستەوە و نامەی نووسی بۆ سەرکردەکانیان و وتی پێیان: لە خالیدی کوڕی وەلید بۆ پاشاکانی فارس: پاشان... سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕژێمەکەی لە ناو بردن و فێڵ و تەڵەکەی لە ناو بردن و ناکۆکی خستە نێوانتان، هەیبەتی نەهێشتن و سامانی لێ

[1] ابو بكر الصديق، خالد الجنابي، نزار حديثي (لا: ٥١-٥٢).

سەندنەوە و لووتی شکاندن و ئەگەر ئەم نامەیەم گەیشتە دەستتان موسوڵمان بن و تا وا بێ وەی بن یان وەرنە ژێر دەسەلاتمان و جزیە بدەن، ئەگەر وانەکەن سوێند لەو خوایەی کە جگە لەو خوای تر نیە، گەلێکم هێناوەتە سەرتان ئێوە چەندێ حەزتان لە ژیانە، ئەوانیش ئەوەندە حەزیان لە مردنە، وە ئێوە چەندێ هەڵپەی دنیا دەکەن ئەوان ئەوەندە هەڵپەی ڕۆژی دواییانە.[1]

بۆ میللەتەکەشیانی بەم جۆرە نووسی:

لە خالیدی کوڕی وەلید بۆ دانیشتوانی فارس، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کردوون لە خزمەتکاری و ناکۆکی تێ خستوون و ترسی شکاندوون و سامانی لێ سەندوونەتەوە و گەورەیی شکاندن، ئەگەر نامەکەم گەیشتە دەستتان موسوڵمان بن، بێ وەی دەبن، یان وەرنە ژێر دەسەلاتی ئیسلام و سەرانە بدەن، ئەگەر وانەکەن سوێند لەو خوایەی کە جگە لەو خوای تر نیە، گەلێك دێنمە سەرتان ئێوە چەندێ حەزتان لە ژیانە ، ئەوان ئەوەندە حەزیان لە مردنە، و ئێوە چەندە کوشتەی دونیان ئەوان ئەوەندە شەیدای دوا ڕۆژن.[2]

ڕزگارکردنی حیرە بەشێك لە ئاواتەکانی ئەبو بەکریان هێنایەدی لە ڕزگارکردنی عێراق، وە ڕێگە خۆشکەریشە بۆ گرتنی ولاتی فارس، خالید بە شێوەیەکی زۆر جوان بە کارەکانی خۆی هەستا و لە کاتێکی دیاریکراودا گەیشتە حیرە، بە جۆرێك کە لە مانگی موحەڕەمی ساڵی (١٢)ی کۆچی یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دوژمناندا لە کاظمة دەست پێکرد و لە (١٢)ی ربیع الاول هەمان ساڵدا بە ڕزگارکردنی حیرە کۆتایی پێ هات.[3]

* کەرامەتێکی خالیدی کوڕی وەلید لە کاتی ڕزگارکردنی حیرەدا:

ئیمام (طبري) بە ئیسنادی خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (......«ابن بقیله» خزمەتکارێکی لەگەڵدا بوو کیسەیەکی هەڵواسی بوو بە ملیدا، خالید کیسەکەی لێ وەرگرت و کردیە دەفرێکی خۆیەوە، وتی ئەمە چیە ئەی عەمر؟ عەمر وتی: ئەمە توخوا هیچم لێ مەکە ئەوە زەهری کوشندەیە، خالید پێی وت: ئەی ژەهرت بۆ چیە؟ عەمر وتی: ئەترسم ئێوە ئەوە

[1] التأریخ الطبري (٤/١٨٤).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.

[3] التأریخ الاسلامي (٩/١٥٠).

نەبن کە من دەیناسم، و مردنم نزیك بۆتەوە، مردنیشم پێ خۆشترە لەوەی هۆزەکەم بخەمە سەر بیروباوەڕێك کە زیانیان پێ بگەیەنێت و ڕاست نەبێت، خالیدیش وتی: ئەمە هیچ زیانی نیە بە ویستی خوا نەبێت و ئەجەل بە دەستی ئەوە، و وتی: (بسم الله خير الاسماء، رب الارض ورب السماء، الذي ليس يضر مع إسمه داء الرحمن الرحيم، فأهووا إليه يمنعوه منه) ئەمەی خوێند و پاشان ژەهرەکەی قوتدا.

عەمریش چاوی ئەبڵەق بوو و وتی: ئەی کۆمەڵی عەرەب هەرچیتان بوێت دەستتان دەکەوێت مادەم پیاوی ئاواتان تیایە هەڵگی بیروباوەڕی نوێ، پاشان ڕووی کردە خەڵکەکە و پێی وتن: نەمدیوە تا ئەمڕۆ بیروباوەڕێك ئاوا ڕوون و ڕاست بێت.[1]

(ابن كثير) ئەم ڕیوایەتەی باس کردووە و نەڕیوایەتێکی لاوازیشی دانەناوە،[2] (حافظ ابن حجر) باسی کردووە و دەڵێت (ابو يعلى) و (ابن سعد) هەریەکە ولە ڕێگەیەکەوە ڕیوایەتی کردووە و لاوازیشیان نەکردووە،[3] (ابن تيمية) وەك نموونەیەکی کەرامەتی خالید (ﷺ) باسی کردووە.[4]

هەندێ لە نووسەرە هاوچەرخەکان ئەم ڕایە ڕەت دەکەنەوە و بە شتێکی خەیاڵی هەڵبەستراوی هەندێ لە ڕاویەکانی دەزانن کە لەسەر گەورەکردنی خالید هێناویانەتەوە، خۆ ئەم ڕیوایەتە لە ڕێگەی ئیسنادەوە ڕاستە و (طبري) پێی ڕازیە و هەروەها ابن سعد و ابن كثير و ابن حجر و ابن تيمية هێناویانە و لاوازیشیان نەکردووە، کە ئەوانە زاناترین و بە ئینصافترین کەس بوون لە مێژووی ئیسلامدا لە چاو نووسەرە هاوچەرخەکانی ئەمڕۆدا.

خالید (ﷺ) کاتێك دەستی برد ژەهرەکە بخواتەوە لە لوتکەی باوەڕ بە خوای – عز وجل – دڵنیایی تەواودا بوو، یەقینی ئەوەی هەبوو کە ئەو هەموو شتێکی دروست کردووە و هەر ئەویش دەتوانێت کار و تایبەتمەندیەکانی تێدا نەهێڵێت، فەرمانی پێبدات کاریگەریەکەی

---

[1] التأريخ الطبري (٤/ ١٨٠).

[2] البداية والنهاية (٦/ ٢٥١).

[3] الاصابة لابن حجر (٢/ ٢١٨)، ژمارە ٢٢٠٦ز

[4] الفتاوی (١١/ ١٥٤).

نەمێنێت، ئەمەش لەبەر حیکمەتێکی مەزن و ئامانجێکی بزورگ، هەروەك چۆن کاریگەری سوتانی لەو ئاگرەدا هەڵگرت کە ئیبراهیم پێغەمبەریان تێخست بۆ شنە بایەکی فێنك، هەروەك بۆ کەسانی تریش ڕوویداوە کە پێغەمبەریش نەبوون وەك (ابي مسلم الخولاني) کاتێك (أسود العنسي) داوای لێکرد شایەتی بدات کە ئەویش پێغەمبەرە و ئەویش وتی تۆ پێغەمبەر نیت و (اسود)یش خستیە ناو ئاگرەوە و کاتێك ئاگرەکە دامرکایەوە دەبینن نەسوتاوە و نوێژی سونەت دەکات.[1]

هەروەك خالید کاتێك ئەو کارەی کرد بچووکترین حەز و ویستی دونیا پاڵی پێوە نەنا بۆ خۆ دەرخستن و ناو دەرکردن و شۆرەت ئەم کارەی نەکرد، چونکە دەیزانی ئەگەر لەبەر ئەو کارانە بیکردایە خوای گەورە وازی لێ دەهێنا، خۆ ئەگەر خوایش وازی لێ بهێنێت، خالید کەی دەتوانێت کاری ژەهر بیوەستێنێت و نەیکوژێت.

ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی شازە و نابێت هەموو موسوڵمانێك بڵێت با منیش تاقی بکەمەوە بزانم ئەمکوژێت یان نا؟ ئیتر با مەبەستیشی بەرز و شیاو بێت، چونکە زۆر کەمە کەسێك لەم ڕۆژەدا باوەڕ و یەقینی بگاتە باوەڕی دامەزراوی خالید (ﷺ)،[2] ئەمە و کاتێك شاری حیرەی ڕزگار کرد هەشت رکات نوێژی کرد بە یەك سڵاو دانەوە.[3]

٦- ڕزگارکردنی شاری ئەنبار (ذات العیون):

پاش ئەوەی لەم لایەناوە خالید (ﷺ) بە تەواوی دڵنیا بوو (قەعقاعی کوڕی عەمری تەمیمی) کرد بە بەرپرسی (حیرە)، بەرەو لای (عیاض کوڕی غنم) ڕۆیشت بۆ کۆمەکی کردنی لە بەرەی باکوورەوە کە کاتی خۆی صدیق (ﷺ) ئەوی لە وێوە ناردبوو، کاتێك خالید گەیشتە ئەنبار دەبینێت وا سوپای بێ باوەڕان خۆیان تۆکمە کردووە لە ناو قەڵاکانیاندا و خەندەقیشیان بە چوار دەوردا هەڵکەندووە و چوونەتە ناوی.[4]

---

[1] التأریخ الدعوة الاسلامي (٩/١٥٩).

[2] هەمان سەرچاوە (٩/١٥٤).

[3] البداية والنهاية (٤/٣٥٢).

[4] التأریخ الدعوة الاسلامیة (لا: ٣٥٠).

موسوڵمانەکان گەمارۆیان خستە سەریان و خالید فەرمانیشی دا بە کوشتنی جاسووسەکانیان – عین – لە چوار دەوردا و لە کاتی جەنگدا لەگەڵیان (١٠٠٠) جاسوس لەو ناوەدا کوژرا و بۆیە ناونراوە (ذات العیون)[١]

خالید بە ژیرانەی سەربازی خۆی توانی ئەو خەندەقانە ببەزێنێت، بۆ ئەم کارە هات هەموو حوشترە لاوازەکانی هێنا و سەری برین و فرێی دانە ناو چاڵەکەوە تا توانیان بەسەر لاشەکاندا بچنە ناو چاڵەکان و دەستیان کرد بە شمشێربازی لەگەڵ فارسەکاندا و فارسەکانیان ناچار کرد پاشەکشە بکەن بۆ ناو قەڵاکان.

لە ئاکامدا سەرکردەی فارسەکان شیرازی ناو بوو، ناچار بوو رێك بکەوێت و بە مەرجەکانی خالید رازی بێت بە مەرجێك رێگەی بدەن لەگەڵ چەند سوارێکیدا بە بێ وەی لە ئەنبار دەرچن، خالیدیش ئەوەی لێ قبوولّ کرد بە مەرجێك هیچ ماڵ و سامانێك لەگەڵ خۆی نەبات.

٧- (عین التمر):

پاش رزگارکردنی ئەنبار، خالید (ﷺ) زوبرقنانی کوری بەدری کرد بە بەرپرسی ئەوێ، بەرەو (عین التمر) کەوتەرێ کە مەهرانی کوری بارام جوبین کۆمەڵێکی زۆر چەکداری عەرەبی لەگەڵدا بوو، بە دەوری ئەوانیشدا کۆمەڵێ هۆزی دەشتەکی هەبوون وەك (التمر، تغلب، ایاد، و کەسانی تریش کە (عقەی کوری ابی عقە) سەرۆکیان بوو.

کاتێ سوپای ئیسلام نزیك بویەوە، (عقە) بە مەهرانی ووت: ئەوانە عەرەبن و لێیان گەرێ بۆ ئێمەی عەرەب، ئەزانین چۆن جەنگیان لەگەڵ دەکەین، مەهرانیش ووتی: ئەوە تۆ و ئەوەش ئەوان، و ئەگەر پێویستان پێمان کەوت دێین بەهاناتانەوە، فارسەکان سەرزنشتی ئەمیرەکەی خۆیان کرد لەسەر ئەو کارە، مەهرانیش پێی ووتن: وازیان لێ بهێنن ئەگەر ئێمە سەرکەوتین بەسەریاندا ئەوە سەرکەوتنە بۆ ئێوە و ئەگەر شکایشین ئەوە ئێمە دەچین بۆیان و ئەو کاتە ئەوان سوپایەکی ماندوون، خەڵکەکەشی دانیان نا بە زیرەکی مەهرانی گەورەیاندا.

---

[١] البدایة والنهایة (٦/٣٥٣).

کاتێك خالید نزیك بوویەوە و (عقە) خەریکی ڕێك و پێك کردنی ڕیزەکانی سوپاکەی بوو، خالید ڕووی کردە چوار دەورەکەی و وتی: من ئەمەوێت بدەم بە سەریاندا ئێوە لە دواوە پارێزگاریم لێ بکەن و بە خێرایی خۆی گەیاندە (عقە) و باوەشی پێدا کرد و بە دیلی گرتی و باقی سوپاکەشی بەبێ شەڕ ڕایانکرد و زۆربەیان لێ دیل کران.

خالیدیش بەرەو (عین التمر) کەوتەڕێ، کاتێك مەهران هەواڵی تێك شکانی (عقە)ی بیست لە قەڵاکەی هاتە دەرەوە و بۆی هەڵهات، گاورە عەرەبەکان بینیان وا دەرگای قەڵاکە کراوەتەوە خۆیانیان پێدا کرد و لەوێ خۆیان قایم کرد، خالیدیش گەمارۆی دان بە شێوەیەکی زۆر توند، کاتێك ئەوەیان بینی داوای ڕێککەوتنیان لێ کرد، ئەویش وتی نایکەم بە مەرجێك نەبێت کە بە خاڵەکانی من ڕازی بن، ئەوانیش ڕازی بوون و قەڵاکەیان دا بە دەستەوە و ئەویش فەرمانی دا (عەقە) بکوژرێت و دیلەکانی تریش لەناو ببرێن، پاشان دەستکەوتی زۆریان دەستکەوت لە ناو قەڵاکەدا.

خالید لە کەنیسەی ناو قەڵاکەدا (٤٠) منداڵی بینی ئینجیلیان و دەرگایان لەسەر خۆیان داخستبوو، دەرگاکەی شکاند و هەموویانی هێنا و دابەشی کردن بەسەر سەرکردە و دەنگ خۆشەکانی ناو سوپادا، یەکێك لەوانە (حمران) بوو خزمەتکاری عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) و لەوانە — سیرین — کە باوکی محمدی کوڕی سیرین — خەو پەرژین کەر — کە بوو بە بەشی مالیکی کوڕی ئەنەس و کۆمەڵێکی تریش لە خزمەتکاران کە دواتر بوون بە باوکی زۆرێك لە ناوادارانی ئیسلام و ئەم گیرانە بوو بە خێر بۆیان.

کاتێك (وەلیدی کوڕی عقە) پێنج یەکەیانی گەیاندەوە مەدینە و بردنی بۆ صدیق (ﷺ) ئەویش گەڕاندیەوە بۆ (عیاض کوڕی غنم) کە لە (دومة الجندل) و دەبینن وا (عیاض) گەمارۆی سوپای بێ باوەڕانی داوە و ئەوانیش لە دواوە گەمارۆی ئەویان دابوو، بۆیە (عیاض) بە وەلیدی وت: هەندێ کات ڕایەکی جوان لە سوپایەکی چڕ باشترە تۆ دەڵێیت چی بکەین باشترە؟ وەلیدیش وتی: نامە بنێرە بۆ خالید با بە سوپاکەیەوە بگاتە لات و هاوکاریت بکات، (عیاض)یش نامەی بۆ خالید نارد و خالیدیش بەم چەند وتەیە وەڵامی دایەوە:

«له خالیدەوە بۆ (عیاض) دەگەمە لات، کەمێك خۆت بگرە وا کۆمەڵێك ئەسپت بۆ دەنێرم کە بەسەر پشتیانەوە شێرسوارە و ژەهرینیشیان پێیە بۆ دوژمنان، پەل لە دوای پەل بۆت دەنێرم». [1]

٨- (دومة الجندل):

کاتێك خالید لە جەنگی (عین التمر) بوویەوە و (عویمەری کوڕی کاهنی ئەسلەمی) لەوێ بەرپرس دانا و خۆی گەیاندە ئەوێ، کاتێك خەڵکی (دومة الجندل) هەواڵی هاتنی خالیدیان بیست، ناردیان بە دوای هەموو دۆستەکانیان لە بەهراء و تەنوخ و کلب و غەسان و ضجاعم، سەرۆکی عنان و تەنوخ پیاوێك بوو بە ناوی (إبن الایهم) و سەرۆکی (ضجاعم) (ابن الحدرجان) بوو.

هەموو لە (دومة الجندل) کۆبوونەوە بە سەرپەرشتی دوو پیاو یەکەمیان (اکیدری کوڕی عبدالملك) و (جودی کوڕی ڕەبیعە) و جیاوازی کەوتە نێوانیان و ئەکیدەر وتی: من لە هەموو کەسێك باشتر خالید دەناسم، کەس وەك ئەو بەخت یاوەری نیە، کەس لەگەڵی ناجەنگێت یان نایبینێت ئیتر کەم بن یان زۆر تێك دەشکێن و ڕادەکەن، بە گوێی من بکەن سوڵحیان لەگەڵدا بکەن، ئەوانیش بە قسەیان نەکرد، ئەویش وتی: دەی من هاوکاریتان ناکەم لە جەنگ لەگەڵ خالیددا و جیابوویەوە لێیان. [2]

ئەمە شایەتی دوژمنە بۆ خالید و باشترین شایەتیش ئەوەیە دوژمن و ناحەزان شایەتی چاکی بۆ بدەن، ئەم پیاوە پێشتر خالید بە دیلی گرتبووی، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە جەنگی تەبووکدا ناردی بۆی و ئەویش گرتی و بۆی هێنا و پێغەمبەریش (ﷺ) چاکەی لەگەڵ کرد و پەیمانی لێ وەرگرت بەرامبەریان نەوەستێ و ئازادی کرد، بەڵام ناپاکی کرد و ئەو بەڵێنەی شکاند.

ئیتر لەو ڕۆژە بە دواوە ترسی خالید چووبووە دڵی، ئەمە سەرەڕای ئەو شۆرەتە ئازاییەی خالید لە جەنگەکاندا هەیبوو، (ئەکیدەر) لە هۆزەکەی جیابوویەوە و لە ڕێگەی (دوقة)

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٥٤).

[2] البداية والنهاية (٦/٣٥٥).

خالید بە هەواڵەکەی زانی و (عاصمی کوری عەمر)ی نارد بە دوایدا و گرتی وتی: هاتووم بگەمە خالید، بەڵام خیانەت و ناپاکی پێشووی وای لە خالید کرد یەکسەر حوکمی لە سێدارەدانی دەربکات و ئا بەو شێوەیە خوای گەورە ئەو ناپاك و بەڵێن شکێنەی لە ناو برد و خۆ پاراستن لە قەزا و قەدەر نەیپاراست.[1]

خالید گەیشتە (دومة الجندل) و لەوێ دابەزی و هەموو خەڵکەکەی لە (بەهراء و کەلب و تەنوخ) خستە نێوان بەرداشی خۆی و سەربازەکانی (عیاض کوری غەنەم).[2]

جودی کوری رەبیعە بە سەربازەکانیەوە بەرەو خالید هات (ابن حدرجان و ابن أیهم)یش بەرەو لای سوپاکەی (عیاض) کەوتە رێ، جەنگ دەستی پێکرد و خالید (جودی) و سەربازەکانی تێك شکاند و (عیاض)یش سەرکەوت بەسەر (ابن حدرجان) بەڵام زۆر بە نارەحەتی، هەڵاتووە تێك شکاوەکان ویستیان خۆیان بخزێننە ناو قەڵاکان، بەڵام خۆی لە ناوەوە پر بوو، بۆیە دایانخست بە روویاندا و ئەوانیش لەو دەشتەدا بڵاوەیان لێ کردبوو، خالیدیش هێرشی کرد بۆ سەر قەڵاکە و دەرگاکەی لە بن دەرهێنا و خەڵکێکی زۆر لێ کوشتن.[3]

بە رزگارکردنی (دومة الجندل) شوێنێکی ستراتیژی سەربازی بۆ موسوڵمانەکان دروست بوو، چونکە (دومة الجندل) کەوتبووە سەر سێ رایەك لە خوارەوە نیمچە دوورگەی عەرەب و لە باکووری رۆژهەڵاتەوە عێراق و لە باکووری رۆژهەڵاتیشەوە شام، شتێکی سروشتیە کە ئەبو بەکر و سوپای ئیسلام لە عێراقدا دەجەنگان و دەیانویست ئەو شوێنە ئازاد بکرێت، چونکە بەسەر شامدا دەیروانی و هەر لەبەر ئەو گرنگیەش بوو کە (عیاض) لەوێ مایەوە و بەجێی نەهێشت تا لە ئاکامدا لەگەڵ خالیدا ئازادی کرد، ئەگەر (دومة الجندل) خۆیان نەدایە بە دەستەوە سوپای ئیسلام لە عێراق دەرنەدەچوو و بەرەو دەرەوە و چوونیان مەحاڵ دەبوو.[4]

---

[1] التأریخ الاسلامي (٩/١٩٣).

[2] خالد بن الولید، صادق عرجون (لا: ٢٣١).

[3] تأریخ الطبري (٤/١٩٦).

[4] ابو بکر الصدیق — نزار الحدیثي و خالد الجنابي (لا: ٥٤).

ئا بەو شێوەیە خالید کۆمەکی (عیاض)ی کرد لە ڕزگارکردنی (دومة الجندل)دا ئەگەر جەنگەکانی خالید لە خوارووی عێراق نموونەی جەنگاوەری ئازا و هێرشبەری سەرکەتوو و سەرکردەی هەڵقۆزەرەوە و ترس دروستکەر لە دڵی دوژمناندا بووبێت، ئەوا خۆڕاگری و نەبەردی (عیاض) (ﷺ) لەبەر دەم ئەو هەموو دوژمنانەدا و لە ناو ئەو گەمارۆیەدا بەڵگەیە لەسەر ئارامی و خۆڕاگری سوپای ئیسلام و هیواداری بە سەرکەوتنی خوایی لە کۆتاییدا.

(عیاض) یەکێك لە باشترینی کۆچەریەکان و لە گەورە پیاوانی قورەیش بوو، کەسێکی دەست و دڵ جوان و لێبووردە بووە و دوای ئەوە هەموو خەلیفەکان متمانەی تەواویان بە سەرکردایەتیەکەی هەبوو، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی جەنگی (یەرمووك)، لە ڕیزەکانی پێشەوەی سوپاکەی ئەبو عوبەیدە بووە، پاشان بە تەواوی دوورگەی ڕزگار کرد، پاشتریش عومەر (ﷺ) بەسەر شامەوە داینا و دواتر کە کاری پێی بوو لە بەرەکانی جەنگی ڕزگاریخوازی ئیسلامی ناردی بۆ فەرماندەی ئەوێ.[1]

٩- ڕووداوی (الحصيد):

(الحصيد) ناوچەیەکە لە کەناری عێراق بوو لە ڕووری دوورگەوە، خالید فەرمانی دا بە ئوقرەغی کوڕی حابس (ﷺ) کە بگەڕێتەوە بۆ ئەنبار و خۆی لە (دومة الجندل) مایەوە لەبەر چاوچنۆکی فارسەکان و گومانی خراپ کردنیان، بۆیە عەرەبی ناوچەکە گومانی ئەوەیان کرد کە بیگرنەوە بۆیە نامەیان بۆ فارسەکان نارد تا هاوکاریان بکەن و پێکەوە سوپای خالید بشکێنن وەك تۆڵەیەك بۆ (عقه) کە هێشتا کوشتنەکەیان بیر نەچووبوویەوە.

بۆ ئەو مەبەستە (رزمهر) لە بەغدادەوە و لەگەڵ ئەویشدا ڕوزبە کەوتنە ڕێ بۆ گرتنەوەی ئەنبار و بەڵێنی ئەوەیان دا کە بگەنە (حصيد و خنامنس) بکەن، هەواڵیان گەیشتە – ربزقانی کوڕی بەدر کە بەرپرسی ئەنبار بوو، داوای کۆمەکی لە قەعقاع کرد کە جێگری خالید بوو بەسەر حیرەوە و ئەویش (اعبدی کوڕی فدکی سەعدی) بۆ نارد و پێی وت: تۆ بڕۆ بۆ (حصيد) بکە و بە (عروەی کوڕی جەعدی بارقی) وت تۆش بۆ (خنامنس).

---

[1] التأريخ الاسلامي (٩/١٦٤).

کاتێك خالید (ﷺ) هەواڵی زانی کە هەندێ لە هۆزە عەرەبەکان بە نیازن بچنە ناو سوپاکەی روزبە لە (حصید)، خێرا (قەعقاع)ی کرد بە ئەمیری خەڵکی لە (حصید) پاش ئەوەی کە (عیاض) ی کوڕی غەنەمی لە حیرە لە شوێنی خۆی دانا و کاتێك روزبە زانی قەعقاع ڕۆیشتووە داوای کۆمەکی لە روزمهر کرد و لەوێ سوپای موسوڵمانان و سوپای بێ باوەڕان گەیشتن بە یەك و جەنگێکی زۆر گەورە لە نێوانیاندا بەرپا بوو کە روزمهر و روزبە کوژران و غەنیمە و دەستکەوتی باش دەستی موسوڵمانان کەوت.[1]

١٠- ڕووداوی (المصیخ):

کاتێك هەواڵی سوپای ئیسلام لە (حصید) گەیشتەوە خالید و سەرکردەکانی سوپاکەی کۆکردەوە لە شەوێکدا لە کاتی دیاریکراودا لە (مصیخ)ی نزیك حوران هەموویان گەیشتن بە یەك و پێکەوە دایان بەسەر هەندێ هۆزدا و زیانێکی گەورەیان لێ دان.[2]

پاشان خالید زانی کە هەندێ لە هۆزەکان لە (مثنی) لە شوێنێکە لە نزیك رقە و زمیل لە (دیار بەکر) کۆبوونەوە و خۆیان بۆ جەنگ لەگەڵ موسوڵمانەکان ساز کردووە، ئەو کت و پڕی لە (مثنی) دای بە سەریاندا لە هەموو لایەکەوە و کۆمەڵەکەی بڵاوە پێ کردن[3] و هەروەها هێرشیشی کرد بۆ ئەوانەی لە زمیل کۆبووبوونەوە و زیانێکی گەورەی پێ گەیاندن.[4]

عەدی کوڕی حاتەم (ﷺ) دەڵێت: «لەم جەنگەدا گەیشتین بە پیاوێك ناوی (صرقوصی کوڕی نعمان) بوو، کە کوڕەکانی و کچەکانی و ژنەکەی بە چوار دەوریدا بوون و گۆزەیەك عەرەقی دانابوو بۆیان تا بیخۆنەوە و ئەوانیش دەیانووت: کەس لەم کاتەدا عەرەقی بۆ دەخورێتەوە کە سوپای خالید بە ڕێوەیە؟ ئەویش دەیووت: بخۆنەوە خواردنەوەی ماڵئاواییی چونکە

---

[1] البداية والنهاية (٦/٣٥٥).

[2] الكامل في التأريخ (٢/٥٩).

[3] ابو بكر الصديق، خالد الجنابي (لا: ٥٥).

[4] التأريخ الطبري (٤/١٩٩-٢٠٠).

وا نازانم دوای ئەمە بتوانن بخۆنەوە و دەڵێت من خۆم پێگەیاند و کوشتم و کوڕەکانیام کوشت و کچەکانیمان هێنایەوە)).[١]

لەم جەنگەدا دوو کەس کوژران کە موسوڵمان بووبوون و ئەبو بەکری صدیق نامەی ئەمانی بۆ نووسیبوون کە موسوڵمانەکان نەیانزانی و بێ ئاگا بوون لەو نامەیە، یەکەمیان ناوی (عبدالعزی بن ابی رهم) کە (جەدیری کوڕی عبدالله البجلی) کوشتی و دووەمیان ناوی (لەبیدی کوڕی جەدیر) بوو یەکێك لە موسوڵمانان کوشتبووی و کاتێك صدیق بەو هەواڵەی زانی و خوێنەکەی دان و بە فەرماندەکانیشی وت کە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیان چاك بن، پاشان وتی: ئەمە چارەنووسی هەر کەسێکە لە بەرەکانی جەنگەوە نزیك بێت و لە ناویاندا بیەوێت بژی، واتا تامانی خۆیشیانی تێدا بوو کە لە ناو کافراندا بۆچی دەژیان.[٢]

١١- ڕووداوی (الفراض):

پاش ئەوەی خالید (رضي الله عنه) ئاڵای ئیسلامی بەسەر هەموو عێراق هەڵکرد، هۆزە عەرەبەکان خۆیان دا بە دەستەوە، نیازی (فراض)ی کرد کی ناوچەیەکی نێوان شام و عێراق و کەنداوی عەرەب بوو تا پشتەوەی خۆی پێ بێ خەم بکات کاتێك بەرەو ڕزگارکردنی وڵاتی فارس دەڕوات.

کاتێك موسوڵمانەکان لە (الفراض) کۆبوونەوە (ڕۆمەکان) زۆر توڕەبوون و پەنایان بردە بەر چەکدارەکانی فارس و ئەوانیش خێرا چوون بە دەمیانەوە، چونکە زۆر قین لە دڵ بوون بۆ موسوڵمانان کە پێشتر لووتیان شکاندبوون و ڕێزیان نەهێشتبوون و داوای کۆمەکیشیان کرد لە لە هۆزە عەرەبەکانی وەك ئەیاد و نەمر و تغلب و ئەوانیش هاوکاریان بۆ ناردن، چونکە کوژرانی سەرکردەکانیان لە بیر نەچووبوویەوە.

ئا بەو شێوەیە سوپای فارس و ڕۆم و عەرەب یەکیان گرت دژی سوپای باوەڕ کاتێك گەیشتنە سەر ڕووباری فوڕات بە موسوڵمانەکانیان وت: یان ئێوە وەرنە ئەمبەر بۆمان، یان ئێمە بێینە ئەو بەر، خالید وتی: نا خۆمان لێ نادەین ئێوەش وەرنە خواری ئێمەوە.

---

[١] هەمان سەرچاوەی پێشوو (٤/١٩٩).

[٢] البداية والنهاية (٦/٣٥٦).

ئەمەش لە نێوەی مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی (١٢)ی کۆچیدا بوو، ڕۆم و فارسەکان بە یەکتریان وت: دەستەڵاتتان بپارێزن، ئەمە پیاوێکە لە پێناو ئاییندا دەجەنگێت، خاوەنی ژیری و زانیاریە، وەڵاهی ئەو سەردەکەوێت و ئێمەش دەشکێین، ئەوەش سوودی نەبوو بۆیان.

هاتنە ئەم بەرەوە و هاتنە خواری خالیدەوە، کاتێك بە تەواوی پەڕینەوە، ڕۆمەکانیان وتیان: بە جیا شەڕ بکەن تا پاك و پیس لە یەك جیا ببنەوە و لە لای کامانەوە دێنە ناوەوە!

بەو شێوەیەیان کرد و جەنگێکی زۆر دژواریان کرد و پاشان خوای — عز و جل — شکاندنی، خالید بە موسوڵمانەکانی وت: بکوتنە سەریان و لێیان لامەدەن، ئەسپ سوارێکی موسوڵمان کۆمەڵێکی زۆر بەرمەکەی کۆکردەوە پاشان دەیانکوشتن و دەیان هەزار لە سواری بێ باوەڕان کوژران و خالیدی سەرکەوتوویش بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ لە (الفراض) مایەوە و پاشان گەڕایەوە بۆ حیرە.[1]

تا بەم جۆرە موسوڵمانەکان بۆ یەکەمجار ڕووبەڕووی سوپایەکی زۆر گەورە بوونەوە کە فارس ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەڵات و ڕۆم ئیمپراتۆریەتی ڕۆژئاوا بوو لەگەڵ عەرەبەکانی دۆستانیاندا پێکەوە لە یەك بەرەدا دژی موسوڵمانان وەستانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمانەکان سەرکەوتن بە سەرکەوتنێکی مەزن.

گومانی تێدا نیە کە ئەم جەنگە یەکێك بووە لە جەنگە مێژووییە یەکلاییکەرەوەکان، ئیتر با وەك جەنگەکانی تر ناوبانگێکی تایبەتی وەرنەگرتبێت، چونکە ورەی بێ باوەڕانی ڕووخاند بە هەموو لایەکیانەوە و ئەم جەنگەش وەك کۆتا جەنگی خالید وایە کە (سیف الله المسلول) لە عێراقدا ئەنجامی داوە (رضي الله عنه).[2]

ئیتر پاش ئەوە فارس دەسەڵاتی لەو ناوەدا نەما و دوای ئەوە توانایەکی سەربازی وای نەما کە سوپای باوەڕ لێی بترسێت و حیسابی بۆ بکات.[3]

---

[1] تأريخ الطبري (٢٠١/٤).

[2] التأريخ الاسلامي (١٧٣/٩).

[3] خالد بن الوليد — عرجون (لا: ٣٦).

**سێیەم: حەجی خالید، صدیق فەرمانی پێ دەدات بۆ شام، مثنی دەبێتە سەرکردەی سوپای باوەڕ لە عێراق:**

١- حەج کردنی خالید – (١٢)ی کۆچی & فەرمانی صدیق بۆی بۆ ڕۆیشتن بەرە وشام:

خالید لە (فراض) بۆ ماوەی دە ڕۆژ مایەوە، پاشان وتی قافڵە بگرن بەرەو حیرە، ئەمە لە (٢٥)ی (ذي القعدة)دا بوو، فەرمانی دا بە (عاصمەی کوڕی عەمر) کە لە پێشی سوپاوە بڕوات و فەرمانیشی دا بە (شحرة کوڕی الاعز) لە ناوەڕاستەوە بێت، پاشان خالید وای پێشاندا کە لە ناوەڕاستی سوپاکەوە دەڕوات.

پاشان لەگەڵ پۆلێك لە هاوڕێکانی نیازی کەعبەی ماڵی خوای کرد، بەرەو مەککە کەوتە ڕێ بە ڕێگەیەك کە هەرگیز کەس لەوێوە نەچووە بەرەو مەککە، ئەوەی بۆ ئەو گونجا بۆ کەسی تر نەگونجا و بەڕێگەیەکی تردا کەوتەڕێ تا لە (١٢)ی کۆچیدا خۆی کرد بە مەککەدا و فریای حەجی ئەو ساڵە کەوت و بە خێرایش گەڕایەوە هێشتا سوپا نەگەیشتبوویەوە حیرە.

ئەبو بەکر (ﷺ) بەو کارەی خالیدی نەزانی تا خەڵکی لە حەجکردن گەڕانەوە و بۆیان باس کرد، نامەی بۆ نارد و سەرزەنشتی کرد لەسەر ئەوەی ڕیزەکانی سوپای بەجێهێشتووە بەبێ پرس[1] و فەرمانیشی پێدا کە بەرەو شام بکەوێتە ڕێ.

هەندێ لە نامەکەی صدیق (ﷺ) بۆ خالید: «بڕۆ خۆت بگەیەنە سوپای موسوڵمانان لە یەرمووك و ئەوان تاڵاویان چەشتووە و بەڵام تاڵاوی سەختیان بە دوژمنان داوە، تۆ بە هۆی زۆرسوپاکەتەوە دوژمنانت نەشکاندووە، بەڵکو بە یارمەتی خوای عز و جل بووە، ئەگەر لە جێیەکیشدا ناڕەحەت بووبن خەتای تۆ نەبووە، جارێکی تر شتی وا نەکەیت،[2] با نیەتی پاك و بەختی چاك یاوەرت بێت ئەی ئەبا سولەیمان، بەردەوام بە تەواوی بکە خوای گەورە بۆت تەواو دەکات، فیز و خۆ بە گەورە زانین – عجب – نەیەت بە لاتدا و ئەو کاتە دەشکێیت و سەرشۆڕ

---

[1] البداية والنهاية (٣٥٧/٦).

[2] واتا بێ پرس چووی بۆ حەج و ڕیزی سوپای باوەڕت بەجێهێشتووە.

دەبێت، وە نەکەیت بە کردەوەی خۆت بنازیت، خوا شایانی هەموو منەت و ئەویش خاوەنی پاداشت».[1]

ئەمە وتەیەکی زۆر مەزنە و لە خەلیفەیەکی ژیرەوە بۆ یەکێك لە سەرکردە سەرکەوتووەکانی و تیایدا دەردەکەوێت کە ئەبو بەکر (ﷺ) چەندێ سوورە لەسەر ئەوەی بە ڕاوێژە ئامۆژگاری جوان بە سەریان بکاتەوە و دەستیان بگرێت بەرەو سەرکەوتن و زاڵ بوون بە یارمەتی خوای عز وجل، لەوانە:

١- فەرمانی پێدەکات ئیتر عێراق بەجێ بهێڵێت و بەرەو شام بڕوات بەڵکو خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو ئەوێش ڕزگار بکات.

٢- ئامۆژگاری دەکات کە جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر ئەو کارەی کە بێ پرس بۆ ئەنجامدانی حەج ڕیزەکانی سوپای بەجێهێشت.

٣- فەرمانی پێدا کە ئەوپەڕی هەوڵ بدات نیەتی پاك و نزیك کردن و پێکان بەشی بێت.

٤- ئامۆژگاری دەکات بە خۆیدا نەنازێت و شانازی بە پاڵەوانێتی خۆیەوە نەکات، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی وەرنەگیرانی کردەوەکانی و ڕەدکردنەوەیان، هەروەك ئاگاداری دەکاتەوە لەوەی بە هیچ کارێکیەوە منەت نەکات بەسەر خوادا بەڵکو خوا ئەهلی ئەوەیە منەت بکاتە سەر بەندەکانی و سەرکەوتنیش لە لایەن ئەوەوەیە.[2]

ئەمەو جەنگەکانی عێراق تواناو وزەی ئیسلامی دەرخست کە بنەماکانی جەنگی تیا جێ بەجێ کراوە کتوپڕی هەڵمەت بردن و بەپەرچی هێرش دانەوە و ڕاوەستان بەرامبەر دوژمنان و کۆکردنەوەی هێز و بەرز ڕاگرتنی ورەکان و کۆکردنەوەی زانیاری و نەخشە دانان و جێ بەجێ کردنی بە هەموو وردی و هێز و (احتیاط) کردێکی بێ وێنەوە.

ئەو نەڕۆیشت بۆ شام تا دوای وەرگرتنی شارەزایی و کارامەیی جەنگێ لە جەنگەکانی عێراقدا، ئەو کەسەشی هەڵبژاردبوو بۆ سەرکردایەتی کردنی بەرەکانی عێراق لەپاش خالید

---

[1] تأريخ الطبري (٤/٢٠٢).

[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٩٥).

(مثنى کوڕی حارثةی الشیبانی) بوو لەبەر شارەزایی تەواوی بە زەویەکانی عێراق و کارامەیی تەواوی لە جەنگ لەگەڵ فارسەکاندا.

بۆ ئەو کەسەی کە لە جەنگەکانی خالید دەکۆڵێتەوە لە عیراق بۆی دەردەکەوێت کە نەخشەکانی پاش خوا دادەڕشت بە پشت بەست بە کۆکردنەوەی زانیاری ورد کە بەڵگەیە لەسەر زیرەکی ئاسایش و هەواڵ گرەکانی، وە دیارە ئەو هەواڵ گریانەش (مثنى کوڕی حارثة) ڕێکی دەخست، نە تەنها لەبەر ئەوەی کە توانای ڕێکخستنی بەهێز بووە، بەڵکو زیاتر لەبەر ئەوە بووە کە خۆی خەڵکی ناوچەکە بوو و ئەو خەڵکی بەنی شەیبان بوو، لە (بەکری کوڕی وائیل) کە ماڵەکانیان نووسابوو بە عێراقەوە و لە لای باکوورەوە پەیوەست بوو بە (هیت)ەوە، لەبەر ئەوە نزیکیەیان لەوانەوە، وای لێ کردبوون کە شایەنی هەواڵ گۆڕکردنەوە بن و تا وایان لێ هاتبوو سوپای فارسەکان لە شوێنی خۆی نەدەجولان، پێش ئەوە هەواڵەکەی دەگەیشتە (مثنى)، هیچ کەس لە وڵاتی فارس دەرنەدەچوو یان نەدەهات مەگەر ئەمان پێیان دەزانی.[1]

لە وتەکانی صدیق (ﷺ) بۆ خالید ئەمە بوو: «واز لە عێراق بهێنە و خاوەنەکانی خۆی بکەرەوە بەسەرپەرشتیاری و پاشان بە نهێنی و لەگەڵ ئەو جەنگاوەرانەی کە کاتی خۆی لە جەنگی یەمامەوە ڕۆیشتن بۆ عێراق، کە لە ڕێگە هاوکار و پاڵپشت بوون و لە حیجازەوە هاتبوون، پێکەوە بەرەو وڵاتی شام بڕۆ و بگەرە (ئەبا عوبەیدەی جەڕاج) و جەنگاوەرە موسوڵمانەکانی چوار دەوری، ئەگەر گەیشتیتە ئەویٚ تۆ دەبیتە ئەمیری هەموان، والسلام علیك ورحمة الله وبرکاتە.[2]

خالید خۆی ئامادە کرد بۆ ڕۆیشتن بۆ شام، سەربازەکانی کرد بە دوو بەشەوە، نیوەی لەگەڵ خۆی برد بۆ شام و نیوەکەی تری بۆ (مثنى) بەجێهێشت، بەڵام هەموو هاوەڵانی پێغەمبەری خوای خستە ناو سوپاکەی خۆی و (مثنى)یش وتی بە خالید: وەڵاهی من ڕازی نابم مەگەر بە فەرمانی ئەبو بەکر (ﷺ) کە ئەوەیە نیوەی هاوەڵانم لەگەڵدا بێت و نیوەکەی تریان بمێنێتەوە، سوێند بە خوا وا نازانم سەربکەوم بە بوونی ئەوانە نەبێت، دەی تۆ ڕووت کردمەوە

---

[1] معارك خالد بن الوليد ضد الفرس (لا: ١٤٣

[2] الصديق اول الخلفاء (لا: ١٦٩).

لەوان، نامەی صدیق (ﷺ) گەیشتە خالید پێش ئەوەی سەفەر بکات کە پێی وت چەندێ لە هاوەڵان بەرێت و چەندێ بەجێ بهێڵێت بۆ (مثنی).

پێی وتبوو: ئەی خالید نەبەردێکیان هەڵبژێرە و نەبەردێکیان بەجێ بهێڵە، ئەگەر خوای گەورە لەوێ سەری خستی هەموویان بگێڕەوە بۆ عێراق لەگەڵ خۆتدا و تۆش وەرەوە سەر کارەکەی خۆت.[1]

خالید بەردەوام هەوڵی دەدا دڵی (مثنی) ڕاگیر بکات و لە باتی هاوەڵان گەورە جەنگاوەرانی لە ناو هۆزەکانی بۆ هەڵدەبژارد، کوڕانی ڕۆژی تەنگانە، ئەوانەی بە ئازا و نەبەرد و خۆگر ناویان دەرکردبوو، (مثنی)یش لە دواییدا ڕازی بوو بە کاری خالید.[2]

خالید سوپای کۆکردەوە و خۆی خستە ڕێ بۆ بڕینی بیابانی کاکی بە کاکی ترسناک تا بگاتە وڵاتی شام، چۆڵەوانی و پان و فراوان، وەك دەریای بێ سەروبن، بە شارەزاکانی ڕێی وت: چۆن ڕێگەیەك بدۆزمەوە کە لە پشتی سوپای ڕۆمانەوە دەرچم، چونکە ئەترسم ئەگەر بەرەو ڕوویان بچم دەستم لە یارمەتیدانی موسوڵمانان بپچڕێت! خەریك بم بە (حامیە)کانەوە.

وتیان: هیچ ڕێگەیەك شك نابەین جگە لە یەك ڕێگە نەبێت کە کەس لێی نادات، چونکە سوێند بە خوا سواریش ناوێرێت لێی بدات! تۆ بەم هەموو وڵاخ و چەك و تفاقەوە ناتوانی لێی بدەیت، چونکە پێنج ڕۆژ ڕێگە دەبڕیت تکێك ئاو نابینیت.

خالید وتی: ناچارم ئەو ڕێگەیە بگرمە بەر تا لە سوپاکانی ڕۆم ڕەت ببم، خالید سوور بوو لەسەر بڕینی ئەم ڕێگەیە، لەگەڵ ئەو هەموو ترسناکیانەیدا، ئای کە بەغیرەتەکان زۆر جار گەیشتوون بە چێژ و خۆشی، ڕافیعی کوڕی عومەیر ئامۆژگاری کرد بە هەڵگرتنی ئاو، چونکە ئیتر ئاو نیە تا ئەو ڕێگەیە نەبڕێت، خالیدیش فەرمانی دەرکرد کە هەموو حوشترە تینووەکان تێر ئاو بکەن و دەمیشیان ببەستن با بە کاوێژکردن ئاوەکە تەواو نەکات.[3]

---

[1] هەمان سەرچاوە (لا: ١٧٠).

[2] الصدیق اول الخلفاء (لا: ١٧٠).

[3] هەمان سەرچاوە (لا: ١٧١).

پاشان بە پیاوەکانی وت موسوڵمانان دەبێت گوێ نەدات بە هیچ ترسناکیەك کە مادەم خوای لەگەڵدایە.[1]

ڕێ پیشاندەر — ڕافیعی کوڕی عومەیر — لە ڕێگەیەکەوە بردنی کە هەمووی لێژگایی و بەرز و نزمی و چاڵ و چۆڵ و وشك و بێ ئاو بوو، بە دەگمەن کەسی تێدا دەژیا، بە تایبەتی لە نێوان (قراقر) و (سەوا) کە هەردووکیان لە بیابانی سەماوە بوون، بەڵام ئەوە کورتترین ڕێگا بوو، خالید بۆ سەربازەکانی خۆی ڕوون دەکردەوە هۆکاری گرتنە بەری ئەم ڕێگە سەختە تا خێراتر و بە نهێنی تر و دەست وەشاندنی کت و پڕی لە دوا بێت.

ڕافیع داوای لە خالید کردبوو کە (٢٠) حوشتر ئامادە بکات کە چەند ڕۆژێك ئاویان لێ بگرێتەوە تا بە تەواوی تینوویان دەبێت و پاشان ئاوی چاکیان بخاتە بەردەست تا تێر ئاو دەبن و پاشان دەمیان ببەستن تا بە کاوێژکردن ئاوەکە تەواو نەکات.

پاشان بە خالیدی وت: هەر ماوەیەك جارێك لەو حوشترانە سەربڕن سوپا ئاوەکەی بخۆنەوە و سوپا گەیشتە (قراقر) کە کۆتا دێی عێراق بوو، پێیان نایە (سەوا) کە یەکەمین دێی شام بوو.

ئەو ماوەیە بە (٥) ڕۆژ دەبڕرا و بە شەو دەڕۆیشتن و ڕۆژ بۆ حەوانەوە دەبەزین، خالید بە تەواوی پشتی بەستبوو بە ڕافیع وەك ڕێ پیشاندەر و متمانەی تەواوی پێی هەبوو، لە زیرەکی ڕافیع هەڵبژاردنی (محرز المحاربی) بوو بۆ ڕێ پیشاندەری شەو لە ڕێگەی ئەستێرەکانەوە، بۆیە تەنها بە شەو و سەر لە بەیانیان ڕێیان دەکرد و نیوەڕوان دەحەوانەوە.

خالید زۆر بە سۆز بوو لەگەڵ سەربازەکانیدا بۆیە نەیدەهێشت کەسیان بە پێ ڕێ بکەن و سواری حوشترەکانی دەکردن تا هێزی لەشیان لە دەست نەدەن، خالید کەوتە ڕێ و هەر قۆناغێکیان دەبڕی هەندێ حوشتری سەردەبڕی بە ئاوەکەی لەشیان حوشترەکانی تری ئاو دەدا و موسوڵمانەکانیش ئەو ئاوەی پێیان بوو دەیانخواردەوە، بۆ ڕۆژی پێنجەم ئاو نەما، خالید زۆر ترسا لە تینوویەتی سوپاکەی، بە ڕافیعی وت کە چاوی دەئێشا: تۆ چیت پێیە؟ ڕافیعیش داوای کرد لە خەڵکەکە کە بەدوای درەختی — عەوسەج — دا بگەڕێن و زۆر گەڕان تا بچکۆلەیەکیان

---

[1] الحرب النفسية، د. احمد نوفل (٢/٦٥٥).

دۆزیەوە، ڕافیع فەرمانی دەرکرد کە لەو شوێنەدا زەوی هەڵبکەنن ئاوی لێیە، وە دەستیان کرد بە چاڵ هەڵکەندن و کانیەکی ئاو دەرکەوت و هەموو خەڵکەکە ئاویان خواردەوە و پاش ئەوە گەیشتنە دەوارنشین و ئاوەدانی.[1]

هەندێ عەرەب لەو گەشتەدا بە خالیدیان وت: ئەگەر بگەیتە فلان درەخت ئەوە خۆشت و سوپاکەشت ڕزگاریان دەبێت و ئەگەر نەگەن هەموو تیا دەچن، خالید و سەربازەکانی کەوتنە ڕێ تا ئەوەبوو بەیانیەکەی گەیشتنە ئاوەدانی و خالید وتە بە ناوبانگەکەی وت: لە بەیانیاندا خەڵکی سوپاسی — سەرا — دەکات، وە ئەم وتەیە دوای ئەوە بوو بە پەندی پێشینان و دەوترایەوە.

ئەم بەسەرهاتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەرکردەی بە ئەزموون و زیرەك گوێ بە مەترسیەکانی نادات و چەندان فێڵ و پلانی بە کارهێنا بۆ بەدەست هێنانی ئاو لەو بیابانەدا تا گەیشتە مەرامی خۆی.

بۆ ڕۆژی پێنجەم خالید گەیشتە سەوا کە هەموو قەڵا و حامیە سەربازیەکانی ڕۆمی خستبووە دوای خۆیەوە کە بۆ عێراقیان دەڕوانی و ئاگایان لە دوای خۆیان نەبوو، بڕینی خالید ئەو ڕێگا بیبانە کاکی بەکاکیە لەماوەی (٥) ڕۆژدا شتێکی زۆر سەر سووڕهینەر بوو، زۆر زۆر ترسناك بوو بەڵام ئەم سەرکردەیە تەخت و ئاسانی کرد بەهۆی ئیرادەی مەزنی و باوەڕی پتەوی و بەرەو پێش چوونی.[2]

خالید گەیشتە (ئەدەك) کە یەکەمین سنووری شام بوو، دای بەسەر خەڵکە کەی داو گەمارۆی دا پاشان لە ڕێگەی ڕێککەوتنەوە ڕزگاری کرد، پاشان گەیشتە (تەدمور) خەڵکەکەی خۆیان نەدا بەدەستەوە و خۆیان لەناو قەڵاکاندا قایم کرد، پاشان داوای ئەمانیان کرد و ئەویش سوڵحی لەگەڵ کردن، بەرامبەر دەڕیشت تا گەیشتە (قریتین) و خەڵکەکەی جەنگیان لەگەڵدا کرد و زاڵ بوو بە سەریاندا.

---

[1] ابو بکر الصدیق — نزار الحدیثي — خالد الجنابي (لا: ٦٨).

[2] هەمان سەرچاوەی پیشوو (لا: ٦٨).

پاشان نیازی (حوارین)ی کرد و گەیشتە شوێنێك کە پێیان دەوت (ثنیة) و ئاڵاکەی تیا هەڵکرد کە ئاڵاکەی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ناوی (عقاب) بوو، دوای ئەوە ئەو شوێنە ناوی نرا (ثنیة العقاب).[1]

دای بە لای (عذراء)دا و حەلاڵی کرد بۆ موسوڵمانان و لە (عنسان)یش سامانێکی زۆریان دەستگیر بوو و لە خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە دەرچوو، پاشان بەردەوام بوو تا گەیشتە (قناة البصری) دەبینێت وا هاوەڵان لەگەڵ خەڵکەکەیدا دەجەنگن و صوڵحی لەگەڵ کردن و لێی وەرگرتن و ئەویش بوو بە یەکەمین شاری وڵاتی شام — سوریا و ئەردەن — کە ڕزگار بکرێت سوپاس بۆ خوا.

خالیدیش ١\٥ ی دەستکەوتەکانی عنسانی بە (بلالی کوڕی حارثی مزني)دا ناردەوە بۆ صدیق، پاشان خالید بە ئەبو عوبەیدە و مرثد و شەرحەبیل خۆیان گەیاندە عەمری کوڕی عاص (ﷺ) کە ڕۆمەکان دەیانویست پەلاماران بدەن لە (عربا)ی مەعموور، ڕووداوی (أجنادین)ی لێ کەوتەوە.[2]

ئا بەم جۆرە خالید (ﷺ) توانی خۆی بگەیەنێتە شام بۆ پشتگیری سوپای ئیسلام لەوێ پاش ئەوەی پاڵەوانێتی و کت و پڕ کاریەکی بێ وێنەی لە مێژووی سەربازی مرۆڤەکاندا تۆمار کرد.

لیوا رکن — محمد شیت خطاب — لەو بارەیەوە دەڵێت: «..... بە پەڕینەوەی بیابان لە ڕێگەی زۆر ترسناکەوە و کت و پڕکاری — مباغتة — ی بێ وێنەی خالید لە هەموو مێژووی سەربازیدا وێنەیم نەدیووە، وە لەو باوەڕەشدا نیم پەڕینەوەی (هانیباڵ) لە چیای ئەلب و بڕینی چیای ئەلب لە لایەن ناپلیۆنەوە و هەروەها بڕینی بیابانی سینا لە لایەن ناپلیۆنەوە یان بڕینی ئەم بیابانە لە لایەن سوپای بەریتانیەوە لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە چاو ئەو کارە مەزنەی خالیددا هیچ ئەرزشێکیان هەبێت».

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو و لاپەڕە.

[2] البدایة والنهایة (٧/٥٦).

چونکە پەڕینەوەی چیا ئاسانترە لە بڕینی بیابان ئەمەش لەبەر بوونی ئاو لە چیاکان و نەبوونی لە بیابانەکان، وە هەروەك بیابانی سینا زۆریٚ لە بیر و ناوچەی نیشتەجێی تیایە، وە ئەمەش لە بیابانەکانی ڕێگەکەی خالیددا نەبوو، وە سەرکەوتنی خالید لەوەدا بوو کە بڕینی ئەو بیابانە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو لە لایەن ڕۆمەکانەوە.[١]

ئەمەش وای لێکرد کە هەموو حامیە و شوێنە سەربازیەکانی ڕۆمیان بەبێ جەنگ یان بە سووکە جەنگێك خۆیان بدەن بە دەستەوە، چونکە لەو باوەڕەدا نەبوون هێزێکی ئاوا گەورەی موسوڵمانەکان و لە ئاوا ڕێگەیەکەوە لە ئاوا کاتێك بێت بۆیان.[٢]

بە درێژایی مێژوو سەرکردە سەربازیەکان کاریگەری خالیدیان لەسەر بوو و زۆر سەرسام بوون بە لێهاتوویی سەربازی خالید، تەنانەت جەنراڵی ئەڵمانی (فوت درغولتیس) کە دانەری کتێبی (گەلێکی چەکدار) و سەرکردەی یەکێك لە بەرەکانی جەنگی تورکی و ئەڵمانی بوو لە جەنگی جیهانی یەکەمدا دەڵێت «خالید مامۆستای منە لە هونەری جەنگیدا».[٣]

٢- هەواڵی (مثنی کوڕی حارثة) لە عێراق پاش ڕۆیشتنی خالید:

(مثنی) پیاوێکی ئازا و دلێر بووە، هەڵبژاردە بووە لە ڕەوشتدا، خاوەن ڕا و مشورەتی جوان بووە، باوەڕی زۆر پتەو بووە و متمانەی تەواوی بە خودا هەبووە، دووربین بووە، بەرژەوەندی گشتی دانابوو بەسەر بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیدا، لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشداری هاوڕێکانی دەکرد.

خاوەنی بەخششی بۆهاتنی بڕیاری دروست و خێرا بووە، خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێز بووە، هەموو بەرپرسیارێتیەکی هەڵدەگرت لە ناڕەحەتی ترین کات و زروفدا، زۆر متمانەی بە سوپاکەی هەبوو، سوپاکەشی متمانەی تەواویان بەو هەبوو، زۆر خۆشی دەویستن و ئەوانیش ئەویان زۆر خۆش دەویست، خاوەنی کەسایەتیەکی گرنگ بوو، ئەو بەو جۆرە بوو کە عومەری

---

[١] قادة فتح العيراق والجزيرة (لا: ١٩٣). لە کتێبی (حرب النفسية).

[٢] حرب النفسية، د. احمد نوفل (٢/١٦٢).

[٣] معارك خالد بن الوليد ضد الفرس (لا: ١٦٧).

کوڕی خطاب (ﷺ) دەربارەی (مثنی) دەفەرمووێت (مؤمر نفسە) واتا خۆی لە خۆیدا سەرکردەیە.[1]

توانا و لێهاتوویەکی تایبەتی تێدا بووە کە بە هۆیەوە ناڕەحەتیەکانی بەرەکانی جەنگی قبووڵ دەکرد و پێشینەیەکی جوان و لێهاتووی هەبوو، هەمیشە یەکەمین هێرشبەر بوو، دواییەمین کەسی کشانەوە بوو، زۆر شارەزای ناوچەکانی عێراق بوو، بە غیرەت بوو بەرامبەر بە فارسەکان و زۆر بزووت بوو، لە جەنگدا فێڵزان بوو، یەکەمین کەسیش بوو لە ئیسلامدا بوێرێت بە فارس و غیرەتیشی خستە بەر موسوڵمان، لە جەنگەکانی عێراقدا نەبەردی وای نواندوە بێ وێنە بووە و هەر ئەویش بوو ورەی موسوڵمانەکانی بەرزکردەوە و ورەی فارسەکانی شکاند.[2]

(مثنی) وەسفی سەربازەکانی فارس دەکات و دەڵێت: جەنگم لەگەڵ عەرەب و عەجەمدا کردووە لە سەردەمی نەفامی و ئیسلامیشدا، وەڵاهی سەد کەسی عەجەم لە هەزار کەسی عەرەب ئازاتر بوون لە لام، بەڵام ئەمڕۆ سەد عەرەب لە (١٠٠٠) عەجەم ئازاترن لە لام، خوای گەورە هەیبەتی لە ناو دڵەکاندا دەرهێناون و فڕوفێڵی بڕیبوون، نەترسن لە زۆرییان و کڵاوەی قوچەکەیان و ڕمە درێژەکەیان، چونکە هەرکاتێ ئەوانەیان نەما وەك ئاژەڵ وان بۆ هەرکوێت بوێت ئەیان دەیتە بەر.[3]

هەڵبژاردنی (مثنی) لەلایەن ئەبو بەکرەوە (ﷺ) بۆ سەرۆکایەتی کاری سەربازی عێراق لە شوێنی خۆیدا بوو، بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئەبو بکر بەڕاستی پیاوانی هەڵسەنگاندوە و ناسیونی، کاتێ خوا حافیزی کرد لە خالید و بەرەو شام ڕۆشت و عێراقی بۆ ئەو بەجێ هێشت خالید پێی ووت: «دەی ئیتر بگەڕێوە ڕەحمەتی خوات لێ بێت بۆ سەرکردایەتی کردنەکەی خۆت و بەبێ کەم تەرخەمی و بەبێ سارد و سڕی».[4]

---

[1] حرب النفسية (٢/١٦٤).

[2] حرب النفسية (٢/١٦٤).

[3] من ذي قار الى القادسية – صالح عماش (لا: ١٢٤).

[4] عصرالصبحانة عبدالمنعم الهاشمي (لا: ١٨٩).

لەپاش خالید (مثنی) سەرکردایەتی عێراقی گرتە دەست، کیسرا بەم هەواڵەی زانی و هەزاران چەکداری سازکرد بە سەرکردایەتی (هرمز جازویە) و نامەیەکی هەڕەشە ئامێزیشی بۆ (مثنی) نووسی و پێی ووت:

«کۆمەڵێ سەربازم بۆ ناردوون کە لە دڕندەکانی فارسن، ئەوانە جوجەڵە و بەراز بەخێو کەرەکان، بەوان نەبێت شەڕتان لەگەڵ ناکەم»[1]

(مثنی)یش بە ژیری و لێزانانە وەڵامی دانەوە، ئازایەتیەکەی ئەوەی بیر نەبردەوە کە وەڵامی ئەم ئاگر پەرستە بداتەوە، نامەیەکی بۆ کیسرا نووسی و پێی وت: «تۆ یەکێکی لەم دوو پیاوە یان یاخی و سەرکەشی ئەوە بۆ خۆت خراپە و بۆ ئێمەش باشە، یان درۆزنی، گەورەترین سزاش لای خوا و ئابڕوچوونی ناو خەڵکی بۆ پاشا درۆزنەکانە، ئەوەش کە ئەتەوەێ پێمان بترسێنیت، ئەوە ئێوە ناچارن و کارتان کەوتۆتە ئەوانە، دەی سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە وای کردوون کە ئیشتان بکەوێتە جوجەڵەوان و بەرازوان».[2]

خەڵکی فارس زۆر نارەحەت بوون و سەرزەنشتی پاشاکەیان کرد لەسەر ناردنی ئەو نامەیە، وە ڕایەکەیان لا قێزەون بوو، (مثنی) سوپاکەی لە حیرەوە بەرەو (بابل) برد، لەوێ لە (عدوة الصراة) لەگەڵ سوپای فارسەکان گەیشتن بەیەك، وە جەنگێکی دژواریان پێکەوە کرد، فارسەکان فیلێکیان نارده ناو ڕیزەکانی ئەسپەکانی موسوڵمانەکان تا بیانترسێنێت و ڕیزەکان تێك بدات، بەڵام (مثنی) شێرانە پەلاماری داو کوشتی، داوای لە موسوڵمانەکانیش هێرشیان بۆ بکەن، فارسەکان بە پیسترین شێوە تێك شکان و زۆریان لێ کوژرا و غەنیمە و دەستکەوتی باشیشیان بە جێ هێشت، فارسەکان بە وەزعێکی شپرزەوە ڕایان کردەوە تا مەدائین نەوەستان و لەوێ دەبینن پاشاکەیان مردووە.[3]

پشێوی ڕووی کردەوە وڵاتی فارس، (مثنی) دوژمنانی ڕێی خوای ڕاونا تا بەر دەرگاکانی مەدائین، پاشان نامەی نووسی بۆ ئەبو بەکر و مژدەی سەرکەوتنی بەسەر فارسەکاندا

---

[1] الكامل لابن الاثير (٢/٧٣)

[2] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[3] البداية والنهاية (٧/١٨).

پێدا و داواشی لێکرد ڕێگەی بدات کە پاشگەزبووە تۆبەکارەکان بەشداری غەزاکانی بکات، بەڵام زۆر زۆر چاوەڕوان بوو وەڵامی نەدرایەوە، چونکە صدیق (رضي الله عنه) زۆر سەرقاڵ بوو بە شامەوە و چاودێری و سەرپەرشتی دوور بە دووری شەڕەکانی ئەوێی دەکرد.

بۆیە (مثنى) خۆی هەستا و سەردانی ئەبو بەکری صدیقی کرد (رضي الله عنه) و لە بابەتی خۆی (بەشیری کوڕی حضاصية) دانا و لە بەرەکانی جەنگیشدا (سەعیدی کوڕی مره العجلي) دانا.[1]

کاتێك گەیشتە شاری مەدینە دەبینێت جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر جێگە کەوتووە و لە حاڵەتی مردن نزیك بۆتەوە، وە ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێشوازی لێ کرد و بە وردی گوێی بۆ گرت وە بە بۆچوونەکانی (مثنى) ڕازی بوو، پاشان داوای عومەری کوڕی خەتابی کرد (رضي الله عنه) و ئەویش هات بۆ لای و پێی وت: «ئەی عومەر، گوێ بگرە چیت پێ دەڵێم و پاشان کاریشیی پێ بکە، من ڕجام وایە هەر ئەمڕۆ بمرم، ئەگەر مردم ئێوارە نەکەیتەوە تا خەڵکی نەخەیتە ڕێ لەگەڵ (مثنى)دا، وە با هیچ ناڕەحەتی و (مصيبة)تێك کاری ئاینی و داواکاریەکانی خواتان لە بیر نەباتەوە، خۆ تۆ منت دی کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی فەرموو چیم کرد؟ لە کاتێکدا چ ناڕەحەتیەکیش لەوەی ئەو ڕۆژە گەورەتر بوو؟!... ئەگەر خوای (عز وجل) سەرکەوتنی کردە خەڵاتی فەرماندەکانی شام، ئەوا خالید و هاوڕێکانی بهێنەوە بۆ عێراق، چونکە ئەوان شایستەی ئەوێن و ئەوان سەرکردەی کارەکانی ئەوێن و ئەوان ئەهلی جەنگ و ئەهلی غیرەتن.[2]

## جێ باسی دووەم

## جەنگە ڕزگاریخوازیەکانی صدیق لە شام:

گرنگی موسوڵمانەکان بە شام هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ەوە دەستی پێکرد کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نامەی نارد بۆ هەرقلی گەورەی ڕۆم و تیایدا بانگی کرد بۆ موسوڵمان بوون، نامەشی نارد بۆ (الحارث کوڕی ابي کوڕی شمر الفساني) کە پادشای غەسان

[1] البداية والنهاية (١٨/٧).

[2] الكامل لابن الاثير (٧٤/٢).

بوو لە بەلقان، لەسەر زەوی شام و فەرمانڕەوایی قەیسەر بوو بەسەر عەرەبەکانەوە و بانگی کرد بۆ سەر ڕێگەی ئیسلام، بەڵام لووت بەرزی ڕووی تێکرد، نیازی کرد بە سوپایەکەوە بدات بەسەر موسوڵمانەکان لە مەدینە، بەڵام قەیسەری ڕۆم نەیهێشت ئەو کارە بکات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) سوپایەکی خستە ڕێ بە فەرمانداریی (زەیدی کوڕی حارثة) و لە جەنگی (مؤتة)دا شەهید بوو، پاش ئەو (جەعفەری کوڕی ئەبی تالب) بوو بە فەرمانڕەوا و ئەویش شەهید بوو پاش ئەویش (عبداللە کوڕی رواحه) و ئەویش شەهید بوو، پاشان خالید بوو بە فەرماندە توانی بە مانۆڕێکی جوان کە ئاسەواری لە دڵی خەڵکی ئەو ناوچانەدا جێهێشتبوو توانی سوپای ئیسلام بگەڕێنێتەوە بۆ مەدینە.

دەتوانین بڵێین: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو غەزایە توانی بەردی بناغەی هەنگاو بەرەو لەناوبردنی یەکجارەکی دەسەڵاتی ڕۆم لە وڵاتی شامدا و هەیبەتی شکاند لەی دڵی عەرەبەکاندا و موسوڵمانانی سوور کرد لەسەر خۆ سازدان بۆ ئەو هەنگاوە پیرۆزە، بەڵکو هەر بە خۆی فەرماندەیی جەنگی تەبووکی کرد، لە ڕێگەی ئەو پێکادانەدا موسوڵمانەکان توانیان ئاستی توانای جەنگی ڕۆم و شێوازی بەرەنگار بوونەوەیان فێر بن، ئەو جەنگانە توانیان هەلێك دروست بکەن بۆ خەڵکی شام تا زیاتر لە نزیکەوە لە ئاینی پاکی ئیسلام شارەزا بن و بیناسن، زۆرێ لە خەڵکی ئەو ناوچانە هاتنە ناو ئیسلامەوە، صدیق (رضي الله عنه) بەردەوام لەسەر ئەو بەرنامانە دەڕۆیشت کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دایڕشتبوو، هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە زۆر پێی دادەگرت لەسەر ناردنی سوپاکەی ئوسامە.

کاتێك لە (ذي القصة) ئەبو بەکر (رضي الله عنه) گەیشت بە سوپای ئیسلام، لیوایەکی تەرخان کرد بۆ خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص، وە ناردنی بۆ کەنارەکانی شام و فەرمانی پێدا کە پاڵپشت بێت بۆ سوپای موسوڵمانان لە (تەیماء) و لەوێ نەجوڵێت بەفەرمانی ئەو نەبێت و جەنگ لەگەڵ کەس نەکات مەگەر جەنگی لەگەڵ بکەن، هەواڵەکەی گەیشتە پاشای ڕۆمەکان و ئەویش سوپایەکی لە عەرەبەکانی سەر بەخۆیان سازکرد لە هۆزەکانی (بهراء، سليح، كلب، لخم، جذام، عنسان) خالیدی کوڕی سەعید چوو بۆیان و چووە سەر ماڵەکانیان و بڵاوەی پێ کردن،

هەواڵیشی ناردەوە بۆ صدیق (ﷺ) ئەویش بۆی نووسی و داوای لێ کرد بەرەو پێشەوە بڕوات،[1] پێی وت: بەرەو ڕۆمەکان بڕۆ پێش ئەوەی ڕیزەکانیان ڕێك بخەنەوە و وتی: ئاگات لە هێڵی پاشەکشە بێت و زۆریش نەڕواتە ناو وڵاتی ڕۆمەوە، لە وەڵامی جێنشینیدا پێی وت: بەرەو پێش بڕۆ و داوای سەرکەوتن لە خوای (عز و جل)یش بکە.

خالید ڕۆیشتە ناوەوە تا گەیشتە (قسطل) لە نزیك ڕووباری مردوو (بحر الميت) سوپایەکی ڕۆمەکان لەسەر ڕووبارەکە شکاند و پاشان بەردەوام بوو لەسەر بەرەو پێش چوون، ئا بەو جۆرە ڕۆمەکان ئاگریان گرت و تێك چوون، بۆیە سوپایەکی زۆر لە سوپاکەی (تیماد) یان زیاتر بوو کۆکردەوە، خالید کۆمەڵەکەیانی بینی خێرا نامەی نارد بۆ خەلیفە و داوای کۆمەکی سەربازی لێکرد تا بتوانێت بەردەوام بێت لە بەرەو پێش چوون، خەلیفەیش عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهلی بۆ نارد بە سوپایەکەوە، (وەلیدی کوڕی عوقبە)یشی بۆ نارد بە کۆمەڵێك جەنگاوەرەوە و کاتێك ئەم سوپایانە گەیشتنە لای خالیدی کوڕی سەعید، فەرمانی دەرکرد بە هێرشکردن بۆ ڕۆمەکان و ڕێگەی (مرج الصفر)یان گرتەبەر.

سەرکردەی ڕۆمەکان – هامان –ی ناو بوو، فێڵێکی لە سوپای ئیسلام کرد و پاشەکشەی بە سوپاکەی کرد تا سوپای خالید بێتە ناوە و ئەم کاتە گەیشتە (مرج الصفر) لای (طبرية)وە، ڕۆمەکان ئەو هەلەیان قۆستەوە و موسوڵمانەکانیان شکاند و (باهان) خۆی ڕووبەڕووی سەعید بوویەوە کە کوڕی خالیدی کوڕی سەعیدی بوو، وە سەعیدی شەهید کرد و ئەوانەشی لەگەڵیدا بوو..

خالید هەواڵی شەهید بوونی کوڕەکەی خۆی زانی، سەیری کرد وا خۆشی چوار دەوری گیراوە، بە خۆی و کەتیبەی چوار دەوریەوە هەر ئەوەندەیان پێ کرا پاشەکشەیان کرد و عەکریمەش توانی سوپای ئیسلام بە لێهاتوانە پاشەکشە پێ بکاتەوە بۆ سنوورەکانی شام.[2]

**یەکەم: نیازکردنی غەزوی ڕۆم لە لایەن صدیقەوە (ﷺ) مژدە خۆشەکانی ڕێگا:**

---

[1] تمام الوفاء (لا: ٥٤).

[2] ابو بكر الصديق – نزار الحديثي و خالد الجنابي (لا: ٥٨).

ئەبو بەکر (ﷺ) هەمیشە لە بیری ڕزگارکردنی شامدا بوو، وە هەردەم ورد دەبوویەوە و ڕای تاوتوێ دەکرد لەو لایەنەوە، لە کاتێکدا ئەو مێشکی لە لای ئەو کارە دەبوو (شەرحەبیلی کوڕی ابن حسنه) هات بۆ لای — کە یەکێك بوو لە سەرکردە موسوڵمانەکان لە جەنگی پاشگەز بووەکاندا — وتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا هاتووە بە خەیاڵتدا ڕۆژێك لە ڕۆژان سوپا دەربکەیت بەرەو شام؟ ئەبو بەکریش (ﷺ)وتی: بەڵێ، هاتووە بە خەیاڵمدا بەلاّم لای کەس باسم نەکردووە، دیارە لەبەر شتێك ئەم پرسیارە دەکەیت، وتی: بەڵێ، من لە خەونمدا بینیم تۆ بە کەژێکی سەختدا دەڕۆیشتیت لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا، تا گەیشتیتە لوتکەیەکی بەرز و خەڵکەکەش لە خوارتەوە بوو، پاشان تۆ بازت دایە خوارەوە کە شوێنێکی زۆر نەرمایی و پڕ بوو لە کشتوکاڵ و دێهات و قەلاّ.

تۆ لەو کاتەدا بە موسوڵمانانت وت: هێرش بەرنە سەر دوژمنانی خوا و من زامنی سەرکەوتن و غەنیمە و دەستکەوتی زۆرتان بۆ دەکەم، منیش لە ناو خەڵکەکە دا بووم و ئالاّیەکم بە دەستەوە بوو، بردنم بۆ ناو دێیەکە، ئەوانیش داوای ئەمانیان لێ کردم و منیش پێم دان و پاشان هاتمەوە دەبینم تۆ چویتە سەر قەلاّیەکی بەرز و ڕزگارت کردووە و خەڵکەکەش خۆیان داوە بە دەستەوە، شوێنێکی جوانیان بۆ دانابوویت و لێی دانیشتبوویت، پاشان پێت وترا خوا شوێنی زۆرت بۆ ڕزگار دەکات و سەرت دەخات، تۆش سوپاسی پەروەردگاری خۆت بکە و گوێڕایەڵیشی بکە، پاشان سورەتی (الفتح)ی خویند:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾، پاشان بە خەبەر هاتم.

ئەبو بەکریش پێی وت: چاوت هەر خۆش بێت، خەوێکی خێرت دیوە و خێر دەبێت (انشاء الله)، پاشان وتی: مژدەی سەرکەوتنت هێنا، هەواڵی مردنی منیش، پاشان چاوەکانی ئەبو بەکر پڕبوون لە ئاو و وتی: ئەو کەژە لێژەی کە دیوتە و من بە سەریدا ڕۆیشتم و دەمڕوانی بۆ خەڵکەکە، ئەوەیە کە سەربازەکانمان دەکەونە ناڕەحەتی زۆرەوە، بەلاّم لە ئاکامدا بەرزدەبنەوە

و سەردەکەون بۆ لوتکە، دابەزینەکەشمان بۆ سەر زەویە سەوز و پڕ ئاوەدانیەکە، مانای ئەوەیە ئێمە ژیانمان دەگوێزرێتەوە بۆ حالەتێکی زۆر خۆشتر لەم ژیانەی ئێستامان.

وتەکەشم بۆ موسوڵمانان: هێرش بەرنە سەر دوژمنانی خوا و منیش زامنی سەرکەوتن و دەستکەوتی باشتان بۆ دەکەم، ئەوە نزیك بوونەوەی موسوڵمانانە لە وڵاتی بێ باوەڕەکان و منیش هانیان دەدەم بۆ جیهاد و غەزا و دەستکەوت و دابەشکردنی و قبووڵ کردنیان بۆی، ئەو ئاڵایەی بە دەستی تۆوە بوو، ئەوە تۆ یەکێك دەبیت لە سەرکردەکانی ئەو جەنگانە و لەسەر دەستی تۆدا خوای گەورە زۆر شوێن ڕزگار دەکات، ئەو قەڵایەش من ڕزگارم کرد و تیایدا دانیشتبووم ئەوە ئەو سەرکەوتنانەیە و ئەو عەرشەیش من لەسەری دانیشتبووم ئەوە خوا من بەرز دەکاتەوە و بێ باوەڕان تێك دەشکێنێت، وەك دەربارەی دایك و باوکی یوسف – علیه السلام – دەفەرمووێت: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾.

بەڵام ئەوەی فەرمانم پێ درا بە گوێڕایەڵی خوا و سوڕەتەکەشی بە سەردا خوێندم ئەوە هەواڵی مردنمە، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێك ئەو سوڕەتەی بۆ هاتە خوارەوە سەرەخۆشی خۆی کرد و زانی ئەجەلی نزیك بۆتەوە.

پاشان چاوەکانی پڕ بوون لە گریان و وتی: فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەکەم، جیهادی هەموو ئەوانە دەکەم کە واز لە فەرمانی خوا دێنن و سەرباز دەردەکەم بۆ هەموو لە خوا یاخی بووان – واتا بێ باوەڕان – لە ئەم پەڕ و ئەو پەڕی دونیا، تا هەموویان دەڵێن: خوا یەکە و هاوەڵی نیە، یان دەبێت سەرشۆڕبکەن بۆ ئیسلام و ساڵانە – جزیە – بدەن، ئەمەش فەرمانی خوایە و سونەتی پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) مەگەر خوا گیانم بکێشێت ئەگینا ساتێك سستی و ناتوانایی و چروکی بەرامبەر گیان بازان – مجاهدین – نانوێنم.[1]

ئەم خەوە چاکانەش لەو مژدە دەرانەیە کە پێغەمبەری خوا دەربارەیان دەفەرمووێت: «لم یبق من النبوة الّا المبشرات»، واتا: پێغەمبەریەتی تەواو بوو بەڵام مژدەدەرەکان دەمێنن، وتیان: مژدەدەرەکان چین؟ فەرمووی: «الرؤیا الصالحة»، واتا خەوی خۆش و چاك.[2]

---

[1] تأریخ دمسق لابن العساکر (٢/٦١-٦٢).

[2] البخاري کتاب التعبیر (ژمارە: ٦٩٩).

ئەم خەوەش بۆ ئەوە هات کە صدیق بەرەو ئیشکردن و جێبەجێکردنی ئەو نیازانەی ناو دڵی بڕوات، ئەنجوومەنی شورای بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی شام کۆکردەوە و لەو بارەیەوە سوور بوونی خۆی و کارکردن و پشت بەستنی بە خوای گەورە و دڵخۆشی دەربڕینی بەو خەوە پێ ڕاگەیاندن.

**دووەم: ڕاوێژی ئەبو بەکر دەربارەی جیهاد کردنی ڕۆم و هاندانی خەڵکی یەمەن بۆ غەزا کردن:**

١- ڕاوێژ کردنی دەربارەی غەزاکردنی ڕۆم:

کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) ویستی سوپا ڕێك بخات بۆ ڕزگار کردنی شام، عومەر و عوسمان و عەلی و (طلحة) و زبێر و عبدالرحمن کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئەبا عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و سەرجەم ناودارانی کۆچەریان و پشتیوانانی ئەهلی بەدر و کەسانی تریشی کۆ کردەوە، ئەوانیش هاتن بۆ لای.

وتی پێیان: خوای گەورە بەخششەکانی لە ژمارە نایەن، کردەوەش ناتوانێت پاداشتیان بداتەوە، سوپاسیش بۆ ئەو کە وشەی ئێوەی یەك خست و نێوانی چاك کردن و هیدایەتی داون بۆ سەر ڕێگەی ئیسلام و شەیتانی لێ دوور خستنەوە، تا هیوای بەوە نەماوە کە هاوەڵ بۆ خوا پەیدا بکەن، یان خوایەکی تر بپەرستن، عەرەب هەمووی یەك ئومەتن، لە یەك دایك و باوکن، ئەمەوێ هەمووتان بەرێ بخەم بۆ ڕزگار کردنی شام، ئەوەی لەو ڕێیە تیا بچێت شەهیدە و پاداشتی لای خوای گەورەیە و ئەوەشی بژی لە پێناوی ئاینی ئیسلامدا دەژی، پاداشتی موجاهیدانی بۆ هەیە، ئەمە ڕای منە جا ئێوەش هەر یەکە و ڕای خۆتانم بۆ دەرببڕن.

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) هەستایە سەر پێ و سوپاسی خوای کرد و صلواتی لەسەر پێغەمبەرەکەی دا و پاشان وتی: سوپاس بۆ خوا، ئەو خوایەی هەر کەسێکی پێ خۆش بێت تووشی خێری دەکات، وەڵاهی ویستبێتمان هەر کارێکی خێر بکەین تۆ پێشمان کەوتوویت، ئەوەش فەزڵی خوایە و دەیدات بە هەر کەسێك کە خۆی پێی خۆش بێت، سوێند بە خوا پێشتر دەمویست لەم بارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەم، ئیتر خوا ڕێکی نەخست تا ئێستا خۆت باست کرد، چاك پێکاوتە خوای گەورە بەهۆی تۆوە ڕێگەی ڕاست پیشاندەر بێت، دەستە لە دوای دەستە ئەسپ سوارەکان بخە ڕێ، پیاوان لە دوای پیاوان بنێرە، سەرباز لە دوای سەرباز، خوای گەورە

ئاینی خۆی سەر دەخات و ئیسلام و شوێن کەوتووانی سەر بەرز دەکات و بەڵێنەکانی دێنێتە دی کە داویەتی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

پاشان عبدالرحمن کوڕی عەوف هەستایە سەر پێ و وتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوانە ڕۆمن، موزەردەکانن، ئاسنن لە شەڕدا، زۆر ترسناکن، وەڵاهی من وا نازانم تۆ سوپا بنێریت و بدات بە سەریاندا، بەڵام ئەتوانیت سوپا بنێریت لەسەر سنوورەکانیانەوە دەست پێ بکەیت، پاشان جارێکی تر بدەن بەسەر شوێنێکی تردا، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای خۆت، ئەگەر چەند جارێك ئەمە دووبارە بکەنەوە زیان بە دوژمنان دەگەیەنن، زەویەکانیان دەکەوێتە دەستی ئەمان، ئەو کاتە توانای جەنگیان زیاتر دەبێت لەگەڵیان، پاشان جواب بنێرە بۆ ئەوپەڕی یەمەن و بۆ هۆزەکانی (ربیعە و مضر) و کۆیان بکەرەوە و بە فەرماندەیی خۆت یان کەسێك خۆت دیاری بکەیت جەنگیان پێ بکە.

پاشان ئەو دانیشتەوە و خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتی: ئەی ئێوە چی دەڵێن ڕەحمەتی خواتان لێ بێت؟

عوسمانی کوڕی عەففان هەستایە سەر پێ و ستایشی خوا و سەلات و سەلام لەسەر گیانی محمد (ﷺ) وتی: بە ڕای من تۆ زۆر دڵسۆزی ئەم ئیسلامەی، زۆر بە سۆزی بۆ شوێن کەوتووانی هەر کاتێك ڕایەکت بوویێت لە زانست و ژیری و بەرژەوەندیەوە بووە، دەی جێبەجێی بکە کەس گومانی لە دڵسۆزی و کەمتەرخەمی نواندنت نیە.

(طلحة) و زبیر و ابو عبیدە و سەعید و هەموو ئامادە بووانی دانیشتنەکە لە پشتیوانان و کۆچەریان بە گشتی وتیان: عوسمان لەوەی دەیڵێت ڕاست دەکات، هەر ڕایەکت هەبوو جێبەجێی بکە، ئێمە گوێت بۆ دەگرین و بە گوێشت دەکەین، سەرپێچیت ناکەین و ڕایەکانت بۆ خزمەتی بانگەواز تۆمەتبار ناکەین و هەندێ شتی تا لەم چەشنە وترا.

لەم کاتە عەلی کوڕی ئەبی طالب (رضي الله عنه) بێ دەنگ بوو، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێی وت: ئەی تۆ چی دەڵێیت ئەی (أبا حسن)؟ عەلی (رضي الله عنه) وتی: من هەموو کارەکانی تۆ بە پیرۆز دەبینم، ڕاوێژت بەرز و بڵند، تۆ خۆت بیانبەیت یان کەسێکی تر بکەیتە فەرماندەیان هەر خوای (عز وجل) سەرت دەخات (ان شاء الله).

ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: خۆش مژدە بیت بە چیا دەزانیت؟ وتی: لە پێغەمبەری خوام بسیتووە (ﷺ) کە فەرموویەتی: «لایزال هذا الدين ظاهرا، على كل من ناوه حتى يقوم الدين واهله ظاهرون»[1] واتا: ئەم دینە هەر سەرکەوتوو دەبێت بەسەر نەیاراندا تا خۆی و شوێن کەوتووانیشی سەر دەکەون.

ئەبو بەکر (ﷺ) وتی: سبحان الله، چەند فەرموودەیەکی جوانە! بەڕاستی دڵخۆشت کردم، خوای گەورە لە دونیا و ئاخیرەت بتپۆشێت.

پاشان ئەبو بەکر (ﷺ) هەستایە سەر پێ و سوپاسی خوای کرد بەو جۆرەی شایانیەتی، سەلامی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کرد و پاشان وتی: «ئەی خەڵکینە، خوای گەورە بە ئیسلام بەخششی خۆی بەخشیوە پێتان ، بە جیهاد کردن سەر بەرزی کردوون، بەم ئاینە پاکەوە بەرزی کردوونەتەوە بەسەر هەموو ئاینەکاندا، دەی بەندەکانی خوا خۆتان ساز بدەن بۆ ڕزگار کردنی وڵاتی شام، وە من فەرماندەتان لە ناودا دیاری دەکەم و ئەیانکەم بە سەرگەورەی ئێوە گوێڕایەڵی خوا بکەن و سەرپێچی ئەمیرەکانتان نەکەن، با نیەتەکان و نهێنیەکان و خواردنەکانتان پاك بێت چونکە خوا لەگەڵ لە خواترسان و چاکەکاران دایە».[2]

پاشان فەرمانی بە بیلال دا کە جاڕ بدات تا هەموو خەڵکی خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ لەگەڵ ڕۆم لە وڵاتی شام.[3]

لەم ڕاوێژ پێکردنەی ئەبو بەکرەوە (ﷺ) بۆمان دەردەکەوێت کە خاوەنی چ پرۆگرامێکی مەزن بووە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی مەسەلە هەنووکەییە گەورەکان، هەرگیز خۆی شتی تاکڕەوانەی یەکلایی نەکردۆتەوە، بەڵکو عاقڵ مەند و زانا و گەورە پیاوان و لێهاتووەکانی کۆ دەکردەوە کە پێیان دەوترێت «أهل الحل والعقد» و پرس و ڕای پێ کردن و پاش ئەوە ڕایەکی هەڵبژێردراوی پەسەندی هەموانی پەسەند دەکرد.

---

[1] البخاري كتاب الاعتصام (ژمارە: ٧٣١١).

[2] تاريخ دمشق لابن عساكر (٢/٦٣-٦٥).

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەرە.

ئەمەش سونەتی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) هەروەك چۆن لە ژیانە مەزنەكەیدا بە جوانی بەدی دەكرێت، ئەگەر بە جوانی لە وردەكاریەكانی ئەم وت و وێژە ورد بینەوە بۆمان دەردەكەوێت كە هاوەڵان بە گشتی چوونە سەر ڕایەكەی ئەبو بەكر و ڕازی بوون بە غەزووی ڕۆمەكان لە شام، بەڵام بۆچوونەكەیان لە چۆنیەتی ئەو غەزایەدا جیاواز بوو، ڕای عمر (ﷺ) ئەوە بوو كە سوپا لە دوای سوپا ڕەوانەی ئەویَ بكرێت تا لە شام كۆ ببنەوە و هێزێكی گەورە پێك بهێنن، كە لە بەردەم ڕۆمەكاندا خۆی پیَ بگیرێت.

بەڵام ڕای عبدالرحمن كوڕی عەوف (ﷺ) ئەوە بوو كە دەست بكرێت بە غەزو بەڵام بە هێزی بچووك بچووك و بدات بەسەر ناوچە سنووریەكاندا و ڕۆمەكان وەڕەس بكات و پاشتریش بگەڕێنەوە بۆ مەدینە، تا كاتێك دوژمنان بترسێنرێت، ئەو كاتە سوپای گەورەش بەڕیَ بخرێت، بەڵام ئەبو بەكر بە ڕایەكەی عمری كرد و سوودیشی لە ڕایەكەی عبدالرحمن وەرگرت بە داواكردنی كۆمەكی سوپا و پەلی بچووك لە هۆزە عەرەبەكان، بە تایبەت خەڵكی یەمەن.[1]

٢- سازكردنی سوپایەك لە خەڵكی یەمەن:

صدیق (ﷺ) نامەی نارد بۆ دانیشتوانی یەمەن بانگی كردن بۆ جیهاد و غەزا لە ڕێگەی خوادا و ئەمەش دەقی ئەو نامەیە بوو:

«بسم الله الرحمن الرحيم، لە جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ هەموو ئەو كەسانەی ئەم نامەیەم دەگاتە لایان و بۆیان دەخوێنرێتەوە لە موسوڵمانانی دانیشتووی یەمەن: سەلامی خواتان لیَ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەتان بۆ دەكەم كە تەنهایە و جگە لەو هیچ خوایەكی تر نیە.

پاشان... خوا – عز وجل – جیهادی لەسەر باوەڕداران پێویست كردووە، و فەرمانی پێداوین گەورە و بچووكیان بۆی دەربچن، بە ماڵ و گیانیان لە پێناوی خوادا تیَ بكۆشن، جیهاد پێویستە فەرز كراوە و پاداشتەكەشی لە لای خوا زۆر گەورەیە... و موسوڵمانانمان بانگ كرد بۆ جیهاد و غەزای ڕۆمەكان لە وڵاتی شام، زۆر بە خێرایی هاتن بە دەممانەوە، بەوەش نیەتیان پاك بوویەوە، دەی ئێوەش ئەی بەندەكانی خوا پەلە بكەن وەرن بە دەم بانگی جیهادەوە وەك خەڵكی

[1] التأريخ الاسلامي – حميدي (١٨٨/٩).

تر پەلەیان کرد، با نیەتتان پاك بکەنەوە و بۆی و بە نیازی یەکێك لە دوو خۆشیەوە بیکەن کە یان شەهیدی یان سەرکەوتن و غەنیمەت، خوای گەورە قسە لە بەندەکانی وەرناگرێت ئەگەر کردەوەی لەگەڵدا نەبێت.

بەردەوام جیهادی داناوە لەگەڵ دوژمنانیدا تا لە ئاکامدا ئەوانیش بێنە سەر ڕێگەی ڕاست و بە حوکمی قورئان ڕازی بن، خوا ئاینەکەتان بپارێزێت و هیدایەتی دڵەکانتان بدات و کردەوەکانتان خاوێن بکات و پاداشتی موجاهیدە خۆگرەکانتان پێ ببەخشێت»).[1]

نامەکەشی بە ئەنەسی کوڕی مالیکدا نارد، لەم نامەیەشەوە دەردەکەوێت کە ئەبو بەکر (ﷺ) ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە هاندانی موسوڵمانان بۆ (جیهاد)ی ڕێی خوا، بە جۆرێك کە دەتوانین ناوی بنێین سازدانی گشتی.

لە نامەکەی صدیقەوە (ﷺ) دەردەکەوێت کە جیهاد فەرزکراوە بۆ هێنانەدی دوو ئامانج، یەکەم: موسوڵمانەتی کردنی باوەڕداران، چونکە خوا — عز وجل — تەنها بە قسەی دەم ڕازی نابێت و کردەوەی دەوێت، و دەبێت جەنگ بکەن لەگەڵ ناموسوڵمانەکاندا تا دێنە سەر ئاینی ڕاست و دروست و ڕازی دەبن بە حوکمی قورئان، ئەم هۆیەش بوو وای لە سەرتاپای خەڵکی یەمەن کرد کە بە لێشاو خۆیان کرد بە ناو سوپای ئیسلامدا و تا ئێستا نەبیستراوە یەك کەسیان زۆری لێ کرابێت، بەڵکو لە هەموو دڵێکیانەوە بوو، تەنانەت ژن و منداڵەکانیشیان هاتن بە دەم بانگی جیهادەوە، بە خێراترین شێوە هاتن بە دەم بانگی جیهادەوە، ئەمەش لەبەر خۆشەویستیان بۆ جیهادکردن.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) ئەم خۆشیەیان دەردەبڕێت و باسی دەکات کە خۆی هۆز بە هۆز دەگەڕا بە ناویاندا و نامەکەی ئەبو بەکری بۆ دەخوێندنەوە و هانی دەدان بۆ پەلە کردن بۆ جیهاد.

ئەنەس دەڵێت: نامەکەم بۆ هەر کەس دەخوێندەوە و گوێی بۆ دەگرتم و پاشان بە جوانی دەهات بە دەممەوە و دەیوت: ئەوا هاتین دابنێ کردوومانە.

---

[1] تاريخ فتوح الشام للازدي (لا: ٤٨).

تا گەیشتنە (ذي الكلاع) و كاتێك نامەكەم بۆ خوێندەوە و قسەكانم بۆ كرد، داوای ئەسپەكەی و شمشێرەكەی كرد و هەر ئەو ساتە هەستا چووە ناو هۆزەكەی و ئەو كارەی دوانەخست و فەرمانی دا وەرن بۆ سەربازی و هاتن و هاتن تا بوونە كۆمەڵێكی زۆر گەورە لە خەڵكی یەمەن، ئەویش هەستایە سەر پێ و وتارێكی بۆ دان: «...... پاشان وا برا موسوڵمانە صالحەكانتان بانگتان دەكەن بۆ جیهاد و گیان بازی لەگەڵ بێ باوەڕاندا و پاداشتی گەورە دەستی خۆتان بخەن، دەی با كێ حەز دەكات هەر ئێستا لەگەڵم بێت».[1]

لە (١١)ی سالّی (١٢)ی كۆچیدا ئەنەس گەڕایەوە بۆ مەدینە، مژدەی هاتنی هۆزەكانی یەمەنی دا بە ئەبو بەكر (ﷺ) و پێی وت: هەموویان بە قژی گژ و تۆزاویەوە هەموو پاڵەوانانی یەمەن و نەبەردەكانیان هاتوون بە دەمتەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵ و سامانیاندا.[2]

پاش چەند ڕۆژێكی كەمیش (ذي الكلاع)ی هۆزی (حمیر) لە ١٦ ی ڕەجەبی ساڵی ١٢ی كۆچیدا و لەگەڵ هەموو هۆزەكەیدا گەیشتنە مەدینە، ئەم بە دەمەوە هاتنە خێرایە تایبەت نەبوو بە (حمیر)ەوە بەڵكو لە هەموو لایەكی وڵاتی یەمەنەوە دەهات، بۆ نموونە هۆزی هەمەدان (٢٠٠٠) جەنگاوەریان نارد بۆ مەدینە بە سەرۆكایەتی حەمزەی كوڕی مالیكی هەمەدان.[3]

كاتێك خەڵكی یەمەن گەیشتنە شاری مەدینە و چوونە مزگەوتەكەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو بەكریان بینی، كاتێك گوێیان لە دەنگی قورئان بوو، ترسی خوایان لێ نیشت و دڵیان پڕ بوو، بە سەركزیەوە دەستیان كرد بە گریان و ئەبو بەكریش دەستی كرد بە گریان لەگەڵیاندا وتی: ئێمەش ئاوا بووین جاران بەڵام داخەكەم دڵەكان ڕەق بوون.[4]

كاتێك (ذي الكلاع) سەیری ئەبو بەكری كرد، دەبینێت پیاوێكی لاواز، دەم و چاو ڕەق، جلێكی زبری لەبەردا بوو، هیچی لە جل و بەرگەكەی بریسكەی نەدەدایەوە، جگە لە ئاسەواری خواناسی وای لێ كردبوو ناوچەوانی بریسكەی لێ دەهات، بەڵام (ذي الكلاع) بە شێوەیەك خۆی

---

[1] الكامل لابن الاثير (٢/٦٤٨).

[2] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٣٠٢).

[3] اليمن في صدر الاسلام (لا: ٣٠٢).

[4] الصديق اول الخلفاء (لا: ١١٤).

کرد بە ناو مەدینەدا کە (١٠٠٠) بەس خزمەتکاری لە چوار دەورە بوو، تاجی شاهانەشی بەسەر سەریەوە بوو، بە جل و بەرگیەوە جۆرەها گەوهەر و مەرجان بریسکەی دەهات، بوردەکەی سەر شانیشی بریسکەی ئاڵتونی دەدرەوشایەوە و بە یاقوت و مەرجان ڕازابوویەوە، کاتێك بینی وا صدیق (ﷺ) لە جل و بەرگی زبر و سادە و بێ فیز و بەندایەتیدا بوو، کەچی خاوەنی ویقار و هەیبەت بوو، کاری کردە سەر دەروونی (ذي الكلاع) و جل و بەرگەکەی داکەند و جل و بەرگی وەك ئەبو بەکری پۆشی، هەموو سەرکردەکانیشی جل و بەرگی سادەیان پۆشی و جل و بەرگەکانی خۆیانیان داکەند.[1]

(ذي الكلاع) ژیانی سەردەمەکانی صدیق زۆر کاری تێکرد و وای لێ هات ئەبو بەکر چی لەبەر بکردایە ئەمیش لەبەری دەکرد و تا جارێکیان هۆزەکەی لە بازاڕ چاویان پێ کەوت پێستێکی حەیوانی داوە بەسەر شانیدا، هەموو هەر تێکچوون و پێیان وت: لە ناو پشتیوانان و کۆچەراندا ئابڕۆت بردین! ئەویش وتی: ئەتانەوێت لە سەردەمی نەفامیدا ملهوڕ بووم، لە ئیسلامیشدا ملهوڕ بم؟ نە بە خوا شتی وا ناکەم، گوێڕایەڵی خوا بە خۆ بە کەم زانین و دونیا نەویستی نەبێت نابێت.[2]

دوا بە دوای ئەو هەموو پاشاکانی تری یەمەن وەك (ذي الكلاع)ی حەمیریان کرد و وازیان لە تاج و زێڕ و زیو هێنا و جل و بەرگی چنراو بە دەزووی زێڕ و زیو و گەوهەر و مەرجان، لە بازاڕی مەدینە هەموو جل و بەرگی سادە و زبریان کڕی و ئەبو بەکریش (ﷺ) هەموو جل و بەرگە بە نرخەکانیانی خستە (خەزێنەی موسوڵمانان).[3]

ئەبو بەکر (ﷺ) لە دوای پێغەمبەری خوا باشترین کەس بوو کە نموونەی موسوڵمانەتی ڕاستەقینەی لێ بەدی دەکرا و زمان حاڵی بانگەواز بوو بۆ لای ئیسلام، باشترین ئامۆژگاریش ئەوەیە کە خەڵکی بە کردەوە و لە ڕێگەی چاوەوە ببیینن، نەك لە ڕێگەی گوێوە، باشترین ئامۆژگاران ئەوانەن بە قسە و بە کردەوە دەیکەن.

---

[1] مروج الذهب – مسعودي (٢/٣٠٥).

[2] مروج الذهب – مسعودي (٢/٣٠٥).

[3] الصديق اول الخلفاء (لا: ١٣٧–١٣٨).

بۆیە کاتێك پاشاکانی یەمەن خەلیفەی پێغەمبەری خوایان بینی کە هەموو فەرمان و بەرگریەك بە دەستی ئەوە لە هەموو دوورگەی عەرەبیدا کەچی لە بازاڕ دەگەڕێت بە عەبا و جلی سادەوە، بۆیان دەرکەوت کە شتێك هەیە زۆر لە جلی جوان و گران بەها و ڕازاوە بە گەوهەر و مەرجان گرنگترە کە ئەویش دەروون بەرزیە، حەزیان کرد چاو لە ئەبو بەکر بکەن و شەرمیان کرد لە خوا کە بەو جلوبەرگە شاهانەوە بچنە خزمەت جێنشینی خەلیفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەو عەبایەکی سادەی لەبەردا بوو، خۆیانیان لە لا بچووك و بێ نرخ بوو، لە قولەی بەرزیان دابەزین و کوژانەوە، وەك چۆن ئەستێرە بچووکەکان لەبەردەمی خۆردا دەکوژێنەوە و شەوقیان نامێنێت! خوای گەورە ڕەحم بە ئەبو بەکر بکات بەڕاستی لەو گەورەییەدا خۆی بە بچووك دەزانی، لە بچووکیشیدا خۆی بە گەورە دەزانی وەك علی طنطاوی دەڵێت: «کان عظیما في توضعه، ومتواضعاً في عظمته».[1]

سێیەم: دیاریکردنی لیواکان و فەرماندەکانیان لە لایەن صدیقەوە (ﷺ):

ئەبو بەکر دەستی کرد ئامادەکردنی سوپا بۆ ڕزگارکردنی وڵاتی شام و خەڵکی بۆ جیهاد بانگ دەکرد، سوپاکەی کرد بە چوار لیواوە و ناردی بۆ وڵاتی شام، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- سوپای یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان:**

یەکەمین سوپا بوو کە بەڕێکەوت بەرەو وڵاتی شام و کاری ئەو سوپایە ئەوە بوو بگاتە دیمەشق و ڕزگاری بکات و پاشان بە پێی پێویست هاوکاری هەر چوار سوپاکە بکات، لە سەرەتاوە سوپاکەی یەزید سێ هەزار کەس بوو بەڵام ئەبو بەکر بەردەوام پشتیوانی بۆ دەنارد تا لە ئاکامدا گەیشتە (٧) هەزار جەنگاوەر و پێش بەڕێکەوتنی سوپاکە، خەلیفە ئامۆژگاریەکی گرنگی کرد کە لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بوو لە ئاستی جەنگ و ئاشتیدا.

بە پێ ڕەوانەی کرد و ئەم ئامۆژگاریانەی کرد: من تۆم کردووە بە سەرکردەی سوپا بۆ ئەوەی تاقیت بکەمەوە و دەرت چێنم، ئەگەر چاك بوویت لە فەرمانڕەواییەکەتدا ئەوا بەردەوام لەسەر ئەو کارەت دەتهێڵمەوە، بەڵام ئەگەر باش نەبوویت لات دەبەم، تا بۆت دەکرێت لە خوا بترسە چونکە خوای گەورە وەك چۆن ئاشکرا دەبینێت ئاواش ناو دڵ و پەیمانت دەبینێت،

---

[1] ابو بکر الصدیق – علي طنطاوي (لا: ٢١٩).

شایانترین کەسیش بە خوا ئەوانەن زیاتر دۆستایەتی ئەو دەکەن، نزیك ترین کەس لە خوا ئەوانەن کە بە کردەوە خۆیانی لێ نزیك دەکەنەوە، من فەرماندەیی خالیدم داوەتە دەستی تۆ دەخیلت بم دوور بە لە دەمارگیری سەردەمی نەفامی، چونکە خوا زۆر قینی لێیەتی و ئەوەشی دەیکات، ئەگەر لەگەڵ سەربازەکانتدا کەوتیتە ڕێ، بە چاکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە، لە کاری چاکەدا پێشیان بکەوە هانیشیان بدە بۆی، ئەگەر ئامۆژگاریت کردن با زۆر کورت بێت، چونکە قسەی زۆر هەندێکیان هەندێکیان لەبیر دەباتەوە، هەوڵ بدە خۆت چاك بکە، خەڵکیش چاك دەبن، نوێژکان بە جوانی و لەسەرخۆ و بە تەواوی لە شوێنی خۆیاندا ئەنجامیان بدە، ئەگەر نوێنەرانی دوژمنان هاتنە لات ڕێزیان لێ بگرە، کەم بیانهێڵەوە لە ناو سەربازگەکەتدا با لە زۆر نهێنی شارەزا نەبن، شتی زۆریان پیشان مەدە با ناتەواویەکانت نەزانن و ئاستی زانیاریت نەزانن، لە لای چڕ وپڕی سوپاکەتەوە بیانگەڕێنە و مەهێڵە کەس لەگەڵیان بدوێت و تەنها خۆت سەرپەرشتی وتو وێژ کردن لەگەڵیان بگرە ئەستۆ، نهێنیەکانت مەبە ناو ئاشکراییەکانت تا کارەکانت تێکەڵ و پێکەڵ نەبێت، ئەگەر ڕاوێژێکت پێ کرا وتەی ڕاست پێشکەش بکە تا باوەڕ بە ڕاوێژیەکانت بکەن، هەواڵی خۆت مەشارەوە لەو کەسانەی ڕاوێژت پێ دەکەن تا لە خۆتەوە شت نەڵێیت، شەوانە لە ناو هاوەڵەکانتدا دانیشتن و قسە و باس بکەن، تا هەموو هەواڵێکت لە لا بێت و هەموو شتە شاراوەکانت بۆ ئاشکرا دەبێت، با پاسەوانت زۆر بێت و لە ناو سەربازگە بڵاویان بکەرەوە، زۆرجار کت و پڕی خۆت بکە بە ناو خاڵی پاسەوانیەکاندا بەبێ ئاگایی خۆیانن ئەگەر کەسێکت بینی کەمتەرخەمی دەکات لە پاسەوانیەکەیدا جوانترین ئەدەبی دابدە، سزای بدە سزای گەورە نا، شەو سەرەیان بۆ دابنێ بۆ پاسەوانی، با یەکەم کەسەکان ماوەی پاسەوانیان درێژ بێت لە پاسەوانەکانی درەنگان، چونکە کاتەکەی ئەوان ئاسانە و لە ڕۆژەوە نزیکە، کەسێك شایستەی سزا بێت سزاکەی سووك مەکە، زۆر قووڵیش بۆی دا مەچۆ، پەلەیشی تێدا مەکە و مەهێڵە کەس بەرگری لێ بکەن.

لە سەربازەکانت بێ ئاگا نەبیت، بە دزیەوە چاودێریان مەکە — تجسس — تا ئابڕوویان نەچێت، خەڵکی ئاگادار نەکەیت لە نهێنیەکانیان و ڕازی بە بە کارە ئاشکراکانیان، لەگەڵ هیچ و پوچ و بێ بایەخاندا دامەنیشە، لەگەڵ ڕاستگۆیان و وەفادارانا هەڵسوکەوت بکە، بە ڕاستی و

بێ ترسانە بەرامبەر دوژمن بوەستەوە و نەترسی تا خەڵکیش بە هۆی تۆوە نەترسن، لە دەستکەوت خستنە لا خۆت بە دوور بگرە چونکە هەژاری لە دوایە و سەرکەوتن ناهێڵێت و دەگەن بە کەسانێك کە لە ناو پەرستگاکانیان خۆیان بە دوور گرتووە لە هەموو شتێك، وازیان لێ بهێنن با خەریکی خواناسی خۆیان بن.

(ابن الاثیر) دەڵێت: ئەم وتانەی صدیق (ﷺ) لە باشترین ئامۆژگاریەکانە و سوودمەندترینیانە بۆ فەرماندە و کار بەدەستان. لە سوودەکانی ئەم ئامۆژگاریە:

١- پلەوپایە و بەرپرسیارێتی مافێکی هەمیشەیی نیە بۆ خاوەنەکەی، بەڵکو مانەوەیان بەستراوە بە شیاوی و چاکی و سەرکەوتنیان لە کارەکانیاندا، پێویستە لەسەر بەرپرسی گەورە کە ئەگەر شیاو نەبوو لایباتن ئەم هەستەیش وا لە کاربەدەست دەکات کە هەوڵ و توانای چەند جارە بکاتەوە تا بگاتە ئاستێکی باش لە سەرکەوتن لەو کارەدا، بەڵام ئەگەر زانی کورسیەکەی هەمیشەیی و کەس لای نابات، ئەو کاتە پاڵی لێ دەداتەوە و تەمەڵ دەبێت، بەرپرسیارێتیەکەی بۆگەنی ڕووی تێدەکات و لە ژێر دەستەکانی دووچاری جۆرەها فەوتان و گەندەڵی و شبرزەیی دەکات.

٢- لە خوا ترسان گەورەترین هۆکاری سەرکەوتنە لە هەموو کاتێکدا، چونکە خوای گەورە ئاگای لە کردەوەی ئاشکرا و نهێنی خەڵکیە، ئەگەر لە دڵەوە و لە پەنهانی لێی بترسن ئەوە زۆر شیاوتر و شایانترە کە لە ناو خەڵکدا و لە ئاشکراشدا لەگەڵ بەندەکانی باش دەبن، لەبەر ئەوە دوور دەکەوێتەوە لە کەمترین دیاردەی گەندەڵی و گەندەڵی کردن، کە زۆر جار پیشەی ئەو کەسانەیە کە لە خوا ناترسن و پابەند نین بە (تقوی) وە و زۆر بە ئاسانی دەبنە گوێڕایەڵی نەفس و ئارەزووەکانی خۆیان.

٣- ئاگادارکردن لەوەی لە دەمارگیری بۆ با و باپیر و هۆز بە دوور کەوێت، چونکە دەمارگیری وا لە بەرپرس دەکات لە ڕاستی دووربکەوێتەوە، ئەگەر با و باپیر و هۆزەکەی لەسەر هەق نەبن، لە لایەکی تریشەوە ئەم پەیوەندیە هۆکارێکە بۆ لاوازکردنی پەیوەندیە ئیسلامیەکە کە پەیوەندی برایەتیە لەبەر خاتری خوا.

٤- ئامۆژگاری بە کورتی، قسەی زۆر هەندێکیان لەبیر دەباتەوە، مەبەستەکە تیا دەچێت، گوێگرەکان لە باتی ئەوەی سوود لــە وتــە و ئامۆژگاریــەکانی وەربگــرن کەچی گوێگرەکان سەرسام دەبن بە ڕەوانبێژی و هێزی ئــەدەبی وتاربێژەکــە و ئەگــەر واش نــەبێت ئــەوە بێتاقــەتی ڕوو لــە گوێگرەکــان و هۆشــیاری بــە لای وتەکانیــەوە نامێنێت.

٥- ئەگەر بەرپرس عەیب و ناتەواویەکانی خۆی دەپشکنی و هەوڵی چارەسەریانی دەدا و دەشبێتە پێشبڕکێیەکی چاك بۆ چاککردنی خەڵکانی تر.

٦- گرنگیدان بە بەرپاکردنی نوێژ لە لایەنی ڕواڵەت و ناوکڕکیەوە، ڕواڵەت واتا لە کات و شوێنی خۆیدا و وتە و رکوع و سجودی تەواو بێــت، نــاو و کــڕۆکیش واتــا خــشوع و گەردن کەچی تێدا بێت و هۆشی لە لای بێت بزانێت چی دەڵێت، ئــا ئــەم نوێــژە بــەم تەواویە و لەبەر یادی خوا لەسەر زەویدا و ڕاست کردنــەوەی ڕەوشــت و بــەهێزکردنی دڵەکان و دەروونەکان بحەوێنێتەوە، ئەوە ئەو نوێژە بە ڕاســتی دەبێتــە جــێ ژوانگــەی موسوڵمان و لە کاتە نارەحەتەکاندا پەنای بۆ دەبات.

٧- ڕێزگرتنی نوێنەرانی دوژمن کاتێك دێنــە لای، لەگــەڵ ئاگــاداری لێیــان و نــەهێڵێت شارەزایی تەواوی سوپای ئیسلام ببێت، چــونکە ڕێزگرتنیــان جۆرێکــە لــە بانگــەواز کردنیــان بــۆ لای ئیــسلام و شــارەزابوونیانە لــەوەی ئیــسلام هــەڵگری گــەورەترین بنەماکانی ڕەوشت بەرزیە، بەڵام ئەم ڕێزگرتنە نەگاتە ڕادەیــەك کــە بــە تــەواوی لــە هەموو نهێنیەکی موسوڵمانەکان ئاگادار بن، بەڵکو دەبێت لە گەورەیی هێزی سوپای موسوڵمانەکان ئاگادار بکرێت تا ترس و بیمــی بــچێتە دڵیانــەوە و هۆزەکانیــانی لێ بترسێنن.[1]

٨- پاراستنی نهێنی و کەمتەرخەمی نەنواندن لە بڵاوبوونەوەیدا و بەتایبەتی ئەگەر ئــەو کارە تایبــەت بێــت بــە ئــیش و کــاری هــەموو موســوڵمانانەوە، کەســی عاقڵمەنــد ئەتوانێت کارەکان ئەنجام بدات ئیتر با شێوازەکانیشی بگۆڕدرێن مادەم لە دەروونیــدا

---

[1] التأريخ الاسلامي (٩/١٩٤).

نهێنیەکانی هێشتۆتەوە، ئەگەر بڵاوی کردەوە ئەو کاتە کارەکانی لێ تێك دەچێت و ناتوانێت بە شێوەیەکی حەکیمانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

٩- ڕاوێژکردنی ژیرانە لە تێڕوانینی ئاکامەکەی گرنگترە، وە ڕاوێژکار هەرچەندە لێزان و بیر تیژ بێت ناتوانێت سوود لە ڕاوێژەکان وەربگرێت تا کارەکانی بە جوانی لە لا ڕوون نەبێتەوە، ڕاوێژکار ئەگەر هەندێ لە وردەکاریەکانی کێشە بشارێتەوە، ئەوە ستەمی لە خۆی کردووە و بەم ڕاوێژە زیان دەکات.

١٠- لەسەر سەرکردەیە یان هەر بەرپرسێکی تر کە هەوڵ بدات لەگەڵ گەلەکەیدا پردی پەیوەندی دروست بکات تا بە وردی لە کێشەکانیان شارەزا بێت، ئەمەش گەورەترین هاوکاریە بۆی تا زیاتر لە کێشەکانیان بگات و خێرا هەوڵی چارەسەری بدات.

بەڵام ئەو بەرپرسەی لە کونجێك ژوورەکەی خۆی ئاخنیوە و تێکەڵی کەس ناکات و لەگەڵ کەسدا ڕاگۆڕینەوە ناکات مەگەر لەگەڵ گەورە یاریدەدەرانی نەبێت کە لە ڕێگەی ئەوانەوە دەستی دەکەوێت، واش دەبێت هەموو مەسەلەکانی بۆ ئاشکرا نەکەن، یان لەوانەیە مەسەلەکانی بە جۆرێك بۆ شی بکەنەوە کە وا نەبێت.

١١- گرنگیدان بە مەسەلەی ئێشك گران و پاسەوانانی سوپای ئیسلام بە تایبەتی لە شوێنە پڕ ترسناکەکاندا، هەڵبژاردنی پاسەوانی وریا و جەربەزە و متمانەی تەواو پێ کردنیان، بەڵکو دەبێت لە ژێر چاودێری بەردەوامدا بن تا لە لای ئەوانەوە کەس دزە نەکاتە ناو موسوڵمانان.

١٢- دەبێت بەرپرس لە مەسەلەی سزاداندا ڕێڕەوێکی مامناوەند گرێتەبەر، نە کەمتەرخەم بێت و سستی بنوێنێت لە مەسەلەی سزاداندا، چونکە ئەوە غیرەت دروست دەکات کە زیاتر سەرپێچی دەکات، غیرەتیش ئەدات بە خەڵکی تر لەسەر سەرپێچی زیاتر، ئەو کاتە ئاژاوە دروست دەبێت و کارەکان تێك دەچن، لە هەمان کاتیشدا ڕەق نەبێت لە سزاداندا، بە هۆیەوە میللەت لوتی لێ دەکەن، وایان لێ دێ توڕە ببن و لە دژی حیزب و کۆمەڵ دروست بکەن، بەڵکو دەبێت سزادان بە شێوەیەکی ژیرانە و مامناوەند و دوای بیر لێ کردنەوە و هەڵسەنگاندن بێت، تا ئامانجی پەروەردەیی خۆی

بپێکێت بە بێ دەنگە دەنگ دروست ببێت و بەبێ ئەوەی توشی ڕەخنە و زویر بوونی خەڵکی ببێت.[1]

١٣- دەبێت بەرپرس جۆرە وریاییەکی تێدا بێت تا ئاگادار بێت لە هەر شتێك ڕوو دەدات لە سنووری کاری پێسپێردراودا، تا یەکەیەکەی خەڵکەکەی لە ژێر دەستی هەست بکەن کەسێك هەیە گرنگی بە کارەکانیان دەدات، ئەو کاتە باشکاران باشتر کار دەکەن و خراپکارانیش لە خراپەکانیان کەم دەکەنەوە، بەڵام ئەمە بەبێ سیخوڕی کردنی کارەکانیان، چونکە ئەوە ئابڕوو بردنیانی تێدایە و دەبێتە هۆی پچڕانی حەبلی پەیوەدنی نێوان بەرپرس و ژێردەستەکانی، وەك سۆز و دەربڕینی سەرسامی و سوپاس کردن لەسەر چاکە.

ئەم پەیوەندیەش بوونی باشە، چونکە دەبێتە هۆی بەرگری لە کردنی هەڵە و سەرپێچی یەك کە کۆمەڵگە تێك بدات و ئاژاوە دروست بکات، ئەگەر ئەم پەیوەندیە پچڕا و ئەما ئەو کاتە — لە خواترسانێکیش نەبوو بیانگێڕێتەوە — ئەوا گوناه و خراپەکاری و ئارەزوو پەرستی باڵ دەکێشێت، پاش ئەوە چارەسەر زۆر ناڕەحەتە، چونکە ئەو کاتە دەبێت هێز بخرێتە کار بۆ نەهێشتنی و ئەمەش لایەنی خراپیەکەی ئاشکرایە.

١٤- بەرپرس دەبێت سوور بێت لەسەر هاوڕێیەتی کردن و تێکەڵی کردنی کەسانی بە وەفا و خاوەن ژیری، ئیتر با جار بە جاریش دڵی ناخۆش بکەن بە ڕەخنە و ئاراستەکاری، ئێ ئەوەش چاکەی خۆی و ژێر دەستەکانیشی تێدایە، نابێت هاوڕێیەتی و تێکەڵی ئەهلی گاڵتە و گەپ و دنیا ویستان بکات، چونکە ئەوانە بەڵێ تێکەڵ کردنیان خۆشی و ڕابواردنێکی تێدایە بەڵام لەو لاوە دەبنە هۆی ئەوەی توانای بیرکردنەوەی نەمێنێت لە کارە گرنگەکاندا، بە ئاگایش نایەتەوە مەگەر دوای شکستی و تێك شکانی خۆی و ژێر دەستەکانیشی.

١٥- سەرکردە بەڕاستی پاڵەوانانە بەرەو ڕووی دوژمنان ببێتەوە و نەترسێت، چونکە ترسنۆکیەکەی ئەو دەمێنێت بۆ ناو سەربازەکانی و دەکەونە نشوستی و تێك شکان،

---

[1] التاريخ الاسلامي (١٩٥/٩).

جگە لە مەیدانی جەنگیش بەرپرس هەر دەبێت ئازا بێت لە ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشهاتەکاندا، دەسەوسان نەبێت تا ئەو دەسەوسانیەشی نەڕواتە خوارەوە بۆ ناو ئەندامەکانی ژێر دەستی، ئەو کاتە ئیش وەك پێویست بە ڕێوە نەچێت و بەرهەمیش کەم ببێتەوە.

١٦- سەرکردە دەبێت خۆی بە دوور بگرێت (غلول) واتا دەستکاری کردنی دەستکەوت و غەنیمەکان پێش دابەشکردنی، ئەمە لە ناو جەنگدا بەڵام لە کاتی ئاشتیدا بەرپرس هەر دەبێت خۆی بە دوور بگرێت لە کەڵك وەرگرتنی دنیایی لە پلە و پایە و شوێنەکەی، ئەوە لە ئیسلامدا ڕەوا نیە، وەك وەرگرتنی دیاری کە بە مەبەستی ئەوە پێی دەدەن کە هندێ ناهەقیان بۆ بکات و ئەمەش دەچێتە خانەی — غلول — ەوە وە غلولیش وەك لە ئامۆژگاریەکەی صدیقدا هاتووە مرۆڤ بەرەو هەژاری دەبات و سەرکەوتنیش ناهێڵێت.

١٧- لەم هەمووە سوودەی پێشەوە کە باسمان کرد بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم ئامۆژگاریەی صدیق (ﷺ) بۆ یەکێك لە فەرماندەکانی جەنگ گرنگ بووە، ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو پیاوە مەزنە تا چ ڕادەیەك گرنگی بە ئیش و کاری موسوڵمانان داوە، لەبەر چاوی بووە چی بەسەر فەرمانەکانی دا دێت و پڕچەکی کردوون بە شتانێك کە دووریان بخاتەوە لەو کێشانە، چارەسەریشی بۆ داناون ئەگەر ڕوویدا، ئەم ئامۆژگاریانە دەخرێنە خانەی هەڵوێستە بەرزەکانی تری صدیق (ﷺ).[1]

ئەگەر لە شێوازی بەڕێوەبردنی حوکمڕانیەکەی ورد بیتەوە، پیاوێکی لێهاتوو دەبینی لە بواری سیاسەتدا، ئەگەر لەو ئامۆژگاری و ئاراستانەی ورد ببیتەوە کە بۆ فەرماندەکانی دەکرد ئەوا پیاوێکی لێهاتوو دەبینی لە بواری جەنگدا، وەك بڵێی هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ سەربازەکانیدایە لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا، لە هەمان کاتیشدا ئەگەر بڕوانیتە سۆز و میهرەبانی و دڵڕاگیر کردنەکانی ئەوا پیاوێکی بانگخوازی ڕێگەی خوات بۆ دەردەکەوێت، پیاوێك بوو زۆر بە بەزەیی بوو لەگەڵ باوەڕداراندا، بەرزکردنەوەی جێ دەستیان دیار بوو، ڕاستیان دەکرد لەگەڵ

[1] التأريخ الاسلامي (١٩٦/٩).

کارەکانیاندا، شارەزای کەسانی شیاو و شایستە بوو، زۆر بە غیرەت و ئازا بوو بەرامبەر دوژمنانی ئاینەکەی خوا کە بێ باوەڕ و دووڕووەکان بوون.[1]

### ٢- سوپای شەرحەبیلی کوڕی ئیبن حەسەنە:

ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه) داینا کە ئەم سوپایە سێ ڕۆژ دوای بایەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان بەڕێ بکەوێت، پاش تێپەڕبوونی ئەو سێ ڕۆژە بە شەرحەبیلی وت: خۆ گوێت لێ بوو، چ ئامۆژگاریەکی بایەزیدم کرد؟ وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: دەی هەمان ئامۆژگاری تۆش دەکەم.

لەوانە ئاگات لە نوێژەکانت بێت لە کاتەکانی خۆیدا و لە گەرمەی جەنگیشدا ئارام و خۆگر بە تا سەردەکەویت یان دەکوژرێیت، سەردانی نەخۆش و بریندارەکان بکە، لەگەڵ جەنازەدا بڕۆ بۆ سەر قەبران، بەردەوام یادی خوا بکە بە شێوەیەکی زۆر، شەرحەبیلیش وتی: خوا کۆمەك بێت و خواش چی دانابێت هەر ئەوە دێتە دی.[2]

ئەم سوپایەی شەرحەبیلیش لە نێوان (٣) تا (٤) هەزار جەنگاوەر بوو، فەرمانی پێدا بەرەو تەبوك و بەلقاء بڕوات و لەوێشەوە بەرەو بوسرا (بصری) بڕوات کە ئەوە دوا قۆناغی بەرەو پێش چوونی سوپای شەرحەبیل دەبێت، بەو جۆرە کەوتەڕێ بە ئاسانی و بەبێ بەرگریەکی بەرچاو گەیشتە بەلقاء، کە سوپاکە کەوتبووە لای چەپی سوپای ئەبی عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و لای ڕاستی سوپاکەی عەمری کوڕی عاص لە فەلەستین و بەلقائەوە پێشڕەوی کرد تا گەیشتە بوسرا و دەستی کرد بە گەمارۆدانی بەڵام نەیتوانی ڕزگاری بکات، چونکە یەکێك بوو لە شوێنە هەرە قایمەکان.[3]

### ٣- سوپای ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاج:

کاتێك صدیق (رضي الله عنه) ویستی خوا حافیزی لە سوپاکەی ئەبا عوبەیدە بکات پێی وت: گوێ بگرە، گوێگرتنی کەسێك کە بیەوێت تێبگات، پاشان کاری لەسەر بکات، تۆ ناودارانی خەڵکی و بنەماڵەکانی عەرەبدا و دەردەچێت کە هەموویان پیاوی سوڵح و سوارچاکی سەردەمی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[2] فتوح الشام – ئەزدی (لا:١٥).

[3] ابو بکر الصدیق – نزار الحدیثي (لا: ٦٢).

نەفامی بوون، ئەو کاتە لەسەر هۆز و دەمارگیری دەجەنگان، بەڵام ئەمڕۆ لەبەر پاداشتی خـوا و نیەتی پاك دەجەنگن، بە چاکی هاوڕێیەتی ئەوانە بکە کە دەبنە هاوڕێت، با خەڵکی لە لات لـە یاسادا وەك یەك بن و پشت بە خوا ببەستە و خوایش بەسە بۆ کۆمەکی، داوای یارمەتی لە خوا بکە و خوایش بەسە بە یارمەتی دەر، سبەینێ — انشاء الله — سوپاکەت دەر بکە و بڕۆ.[1]

سوپاکەی ئەویش لە نێوان (٣) تا (٤) هەزار جەنگاوەر بوو و ئامانجی ڕزگار کردنـی (حمص) بوو، ئەبو عوبەیدە لە مەدینە دەرچـوو دای بـە لای (وادی القـری)دا و پاشـان بـە لای (الحجر) کە وڵاتی صالح پێغەمبەر بوو، پاشان گەیشتە (ذات منار) و لەوێشەوە بۆ — زیـزا — و لەوێشەوە بۆ — مەئموئاب — و لەوێشەوە ڕووبەڕووی دوژمنان بوویەوە و جـەنگێکی ناهـەموار دروست بوو لە نێوانیاندا و پاشان سوڵحیان لەگەڵ کرد و ئەوە یەکەمین سوڵح بوو لە وڵاتی شـام ڕوویدا، پاشان بەرەو پێش چوو بەرەو (الجابیە).[2]

ئەم سوپایە باڵی چەپی سوپای یەکەم باڵی ڕاستی سوپای دووەم بوو، لە ئەم سوپایەدا سوارچاکێکی عەرەبی ناودار هەبوو، کە ئەویش قەیسی کوڕی هەبیرەی کوڕی مەسعود مـورادی بوو، ئەبو بەکر (رضي الله عنه) پێش دەرکردنی ئەبو عوبەیدە ڕووی تێکرد و پێی وت:

«پیاوێك هاوڕێیەتیت دەکات زۆر گەورە و شەرەفمەندە، یەکێکە لـە سوارچـاکەکانی عەرەب، موسوڵمانان بەبێ ڕا و تەگبیری ئەو کاریان ناڕوات، لە جەنگدا بێ ئەو کار ناڕوات، لە خۆتی نزیك بکەرەوە و سۆزی لەگەڵدا بنوێنە، پێی نیشان بدە کە بێ ئەو نات کرێت و بە کەمی نەزانیت، چونکە تۆ بەوە ئامۆژگاری و کۆششی و لێهاتوویی بەسـەر دوژمنـانی ئـەوت دەسـت دەکەوێت».

هەروەها قەیسی کوڕی هەبیرەش بانگی کرد و پێی وت:

«من تۆم لەگەڵ ئەبو عوبەیدەی ئەمیندا ناردووە، کە کەسـێکە سـتەمی لێ بکرێـت سـتەم ناکـات، خراپـەی لەگەڵـدا بکرێـت لێبووردەیـە، ئەگـەر پەیوەنـدی لێ بپـچڕێنیت ئـەو دەیبەستێتەوە (إذا قطع وصل)، لەگەڵ باوەڕداراندا زۆر بە بەزەییە، لەگەڵ دوژمناندا زۆر توند و

---

[1] **فتوح الشام — ئەزدی (لا: ١٧).**

[2] **الکامل لابن الاثیر (٢/٦٦).**

تیژە، سەرپێچی مەکە، دژی ڕایەکانی مەوەستەوە، ئەو بە چاکە نەبێت فەرمانت پێ نادات، فەرمانم پێ داوە کە گوێت بۆ بگرێت، دەی تۆش بە تەقوای خوا نەبێت فەرمانی پێ مەکە، ئێمە وامان بیستووە کە تۆ شەریف و بە غیرەت و سەرگەورەیەکی بە ئەزموونی سەردەمی نەفامی نەفامان بوویت، کە ئەو کاتە جگە لە گوناھ هیچی تر نەبووە، دەی ئەو ئازایەتی و هێز و فریادڕەسیەت دژی بێ باوەڕان بخەکار، لەگەڵ ئەوانەی کە باوەڕیان بە خوا نیە و لەگەڵ ئەو خودای تر دەپەرستن و لەو کارەشدا مەبەستت پاداشتی گەورە و بێ ئەندازە و سەر بەرزی موسوڵمانان بێت».

قەیسی کوڕی هەبیرەیش پێی وت: ئەگەر بمێنێت — خوا بیهێڵێت — دەبینیت کە چۆن پشتی موسوڵمانان دەگرم و بێ باوەڕان دەکێشم بە زەویدا، بەو هەواڵانەش خۆشحاڵت دەکەم و ڕازیشت دەکەم، ئەبو بەکر (ﷺ) پێی وت: بەو شێوەیە بکە ڕەحمەتی خوات لێ بکە، دەڵێت کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) هەواڵی زانی کە قەیسی کوڕی هەبیرە (ﷺ) لە جابیە بە مەبەستی شمشێر بازی چووە گۆڕەپان بۆ (هەردوو ئەترەق) و لە ئاکامدا هەدووکیانی کوشت، ئەبو بەکریش وتی: بەڕاستی قەیس ڕاستی کرد و بە وەفا بوو.[1]

تێبینی ئەوە دەکەین کە چۆن صدیق (ﷺ) ورە و هیمەتی قەیس بەرز دەکاتەوە و وزە و توانا شاراوەکەی دەتەقێنێتەوە و لە پێناوی ئیسلامدا بە کاری دێنێت، گومانی تێدا نیە کە وەسفکردن و پیاهەڵدانی گەورە پیاو و نەجیب زادەکان و باسی چاکی و لێهاتووییان، ورەیان بەرز دەکاتەوە، هێزێکی گەورەیان دەکات بە بەردا و بەرەو قوربانیدان و گیان فیدایی دەیانبات.[2]

### ٤- سوپای عەمری کوڕی عاص (ﷺ):

ئەبو بەکر (ﷺ) بە سوپایەکەوە عەمری کوڕی عاصی نارد بەرەو فەلەستین، کە پێشتر ئەبو بەکر (ﷺ) سەرپشکی کردبوو لە نێوان بەردەوامی لەسەر فەرماندەیی سوپاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی داینابوو، وە لە نێوان هەر کارێکی تر کە خۆی پێی خۆشە و

---

[1] فتوح الشام – ئەزدی (لا: ٢٦-٢٧).

[2] التاریخ الاسلام (٩/٢٠٦).

خێری دنیا و ئاخیرەتی تێدا بێت، عەمری کوڕی عاصیش نامەیەکی بۆ نووسی و پێی وت: من تیرێکم لە تیرەکانی ئیسلام و تۆش دوای خوا وەشێنەری ئەو تیرەیت، دەی سەیرکە کامیان بەهێزتر و ترسناکتر و چاکترە بۆم بموەشێنە.[1]

کاتێك گەیشتەوە شاری مەدینەی پیرۆز، ئەبو بەکر فەرمانی پێدا بڕواتە دەرەوەی شار و سەربازگەیەك دروست بکات و خەڵکیش خۆی پێ بگەیەنێت، کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی قورەیشی لەگەڵدا ڕۆیشتن، لەوانە عەمری کوڕی هشام و سوهەیلی کوڕی عەمر و عکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، کاتێك ویستی سوپاکە بخاتە ڕێ ئەبو بەکر ڕەوانەی کرد و پێی وت:

ئەی عەمر تۆ خاوەنی ئەزموون و بۆچوونی جوانیت لە هەموو کارەکانتدا، لە جەنگدا زۆر شارەزایت، وا تۆ لەگەڵ پیاو ماقوڵانی هۆزەکەت و پیاوچاکانی ناو موسوڵماناندا دەردەچیت، لە ئامۆژگاری کردنی ئەو برایانەت ماندوو مەبە و پرس و ڕا و ڕاوێژی جوانیان لێ مەشارەوە، لەوانەیە ڕایەکی تۆ جوان بێت لە جەنگدا و پیرۆز بێت بە سەرەنجامی کارەکان.

عەمری کوڕی عاصیش وەڵامی دایەوە و وتی: چەند جێگای خۆیەتی ئەو گومانەت بەرمە سەر، ئەو تێڕوانینەت بۆ من بە درۆ نەخەمەوە.[2]

عەمر بە سوپایەکەوە کەوتە ڕێ کە ژمارەیان (٦) تا (٧) هەزار موجاهید بوو و بەرەو وڵاتی فەلەستین، بە کەناری دەریای سووردا کەوتە ڕێ تا گەیشتە (وادی العربە) لە لای دەریای مردوو.

عەمر هەستا بە ئامادەکردنی سوپایەکی (١٠٠) کەسی کە کاریان ئەوە بێت هەواڵی دوژمنان بهێننەوە بەرەو ڕووبەڕووی ڕۆم ناردنی بە فەرماندەیی عبداللە کوڕی عمر کوڕی خطاب (ﷺ) ئەم هێزە لەگەڵ هێزەکانی ڕۆمدا تێ هەڵکشا و توانی سەرکەوتن بە دەست بێنێت و ڕیزەکانی دوژمن بشێوێنێت و بە کۆمەڵێك دیلیشەوە گەڕایەوە کە عەمری کوڕی عاص قسەی پێ دەرهێنان و پێیانی وت سوپای ڕۆم بە نیازن لە ناکاودا بدەن بەسەر موسوڵماناندا، لەسەر ئەو زانیاریە نوێیانە سوپاکەی ڕێکخستن ڕۆمەکانیش هێرشەکەی خۆیانیان کرد و

---

[1] اتمام الوفاء بسيرة الخلفاء (لا: ٥٥).

[2] فتوح الشام – ئەزدی (لا: ٤٨-٥١).

موسولمانەکانیش ئازایانە تێکیان شکاند و سەرکەوتن لە گەڕانەوەی سوپای ڕۆمەکان و دوای ئەوە ئەمان بەرپەرچە هێرشیان بۆ کردنەوە و هێزی دوژمنانیان بە تەواوی تێك شکاند، ناچاریان کردن هەڵبێن و گۆڕەپانی جەنگیان پێ بەجێ بهێڵن و سوارەکانیش کەوتنە دوایان و جەنگەکە کۆتایی پێ هات بە کوشتنی هەزاران کەس چەکدارەکانی سوپای ڕۆم.[1]

ئەبو بەکر (ﷺ) فەرمانی پێدان کە هەر فەرماندەیەك لە ڕێگەیەکی جیا لە فەرماندەکانی هاوڕێیەوە ڕێگە ببڕێت و لەو کارەیدا تێبینی زۆر لە بەرژەوەندیەکانی دەکرد، لەم کارەشیدا صدیق (ﷺ) چاوی لە یەعقوب پێغەمبەر (علیه السلام) کرد کە بە کوڕەکانی وت پێکەوە خۆتان مەکەن بە ناو میسردا بە جیا جیا بڕۆنە ژوورەوە وەك فەرمووی:

﴿يَـٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ۖ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾﴾ (يوسف:٦).

چوارەم: ئاستەنگی لە وڵاتی شامدا:

ئەم سوپایانەی کە ئەرکی ڕزگارکردنی وڵاتی شامیان پێ سپێردرابوو، ڕووبەڕووی ناڕەحەتیەکی زۆر بوونەوە لە جێبەجێ کردنی ئەو کارەیاندا، چونکە سوپای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بە ژمارەی زۆر و هێزی لە بن نەهاتوو دەناسرا، ژمارەیەکی زۆر قەڵای تۆکمە و بەرزی بۆ بەرگری لە شارەکان دروست کردبوو، شێوازی کەرادیسیان بەکاردەهێنا لە ڕێکخستنی سوپاکانیاندا، ڕۆم دوو سوپای زۆر گەورەیان هەبوو، یەکەمیان لە فەلەستین بوو، دووەمیان لە ئەنتاکیە و ئەم دوو سوپایە لە شەش شوێندا خۆیان قایم کردبوو، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١- ئینتاکیە: کە پایتەختی شام بوو لە سەردەمی ڕۆمەکاندا.

٢- قەنسەرین: ئەکەوێتە نێوان حەما و حەلەبەوە و (٢٥) کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای حەلەبەوە دوور بوو، کە هاوسنوور بوو لەگەڵ وڵاتی فارسدا لە باکووری ڕۆژئاواوە.

[1] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٤٣).

٣- حیمس: دەسەڵاتی سەربازی دەگەیشتە تەدمور و بیابانی شام، کە هاوسنوور بوو لەگەڵ فارسەکاندا لە باکووری ڕۆژئاواوە.

٤- عومان: کە بنکەی بەلقاء بوو، خاوەنی قەڵایەکی زۆر قایم بوو.

٥- ئەجنادین: بنکەی سەربازی ڕۆمەکان بوو لە خوارووی فەلەستین، هاوسنووریش بوو لەگەڵ وڵاتی عەرەبی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و وڵاتی میسر.

٦- قیساریە: لە باکووری فەلەستیندا بوو، (١٣) کیلۆمەتر لە حەیفاوە دوور بوو، تا ئێستایش پاشماوەکانی ماوە، بەڵام بنکەی سەرەکی سەربازی لە حیمس یان ئینتاکیە بوو، کاتێك سەرکردەی ڕۆمەکان چوو بۆ (ئیلیا) و هەرقەلی بینی لەو کاتەدا سوپای موسوڵمانەکان پێشڕەویان دەکرد بۆ ناوجەرگەی زەوی ڕۆمەکان، ئەویش فەرمانی دا بە سەرکردەکانی سوپا کە دەرچن بەرەو سوپای موسوڵمانەکان و تێکیان بشکێنن، و پلانی ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ئیسلام بەم چەشنە بوو:

١- ڕۆمەکان پاشە کشە بکەن لە بەردەم سوپای موسوڵماندا و سنووری شام و حیجازیان بۆ چۆڵ بکەن.

٢- سوپای یەکەم بە سەرکردایەتی — سەرجون — لە فەلەستین کۆ دەبێتەوە.

٣- سوپای دووەمیش بە سەرکردایەتی — تیدور — لە ئەنتاکیە کۆ دەبێتەوە.

٤- ئەم سوپایانە دەجووڵێن هێرش دەبەن بۆ ئەمیرەکانی سوپای موسوڵمانەکان، کە چوار بوون یەك لە دوای یەك، ئەمەش کاری پاکتاوکردنی سوپای موسوڵمانەکان ئاسان دەکات کە یەك یەك لە ناویان بەرن، لەسەر ئەم نەخشەیەی کە هەرقەل دایڕشت بۆ سوپاکانی بەم ڕیزبەندیەی خوارەوە[1]:

١- ناردنی براکەی خۆی — تەزارووق — بە حەفتا هەزار چەکدارەوە بۆ لەناوبردنی سوپای عەمری کوڕی عاص (ﷺ).

٢- ناردنی (ئیبن تەوزەر) بۆ یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان (ﷺ).

---

[1] معارك خالد بن الوليد — العميد ياسين سويد (لا: ٧٧-٧٨).

٣- ناردنی قەبقاڕی کوڕی نەنتوس لەگەڵ (٦٠) هەزار چەکداردا بۆ سوپای ئەبو عوبەیدە (رضي الله عنه).

٤- ناردنی (دارقس) بۆ شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە (رضي الله عنه).[1]

موسوڵمانەکانیش توانیان زانیاری ورد و تەواو دەربارەی هەموو ئەم سوپایانە و مەبەستەکانیان کۆ بکەنەوە، هەروەها سەبارەت بەو پلانەیش کە هەرقەل دای ڕشتبوو بۆ قەڵاچۆکردنی سوپاکانی ئیسلام زانیاریان وەرگرتبوو، سەرکردەکانیش هەریەکەیان نامەیان نارد بۆ خەلیفە لە شاری مەدینە، ئەبو عوبەیدە (رضي الله عنه) لە نامەکەیدا باسی ئەو کۆمەڵە زەبەلاحە دەکات کە بۆ لەناوبردنی سوپای ئیسلام ئامادە کراوە لە لایەن ڕۆمەکانەوە، ئەمەش دەقی نامەکەی دەست پاکی ئومەتی ئیسلام ئەبو عوبەیدەیە (رضي الله عنه) بۆ جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

بسم الله الرحمن الرحيم – بۆ بەندەی خوا ئەبو بەکر جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحەوە، سەلامی خوات لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەت بۆ دەکەم کە جگە لەو هیچ خوای تر نیە، پاشان داوا لە خوا دەکەین ئیسلام سەربەرز بکات و موسوڵمانان سەرکەوتوو بن، گەلانیان لەسەر دەست ڕزگار بکات، هەواڵم پێ گەیشتووە کە هەرقەل هاتووەتە شاری (ئەنتاکیە) و جوابی ناردووە بۆ هەموو مەملەکەتەکەی و هەموویانی کۆکردۆتەوە، هەموویان بە گەورە و بچووکەوە هاتوون بە دەمیەوە، منیش وام پێ باش بوو ئێوە ئاگادار بکەم تا ڕای خۆتانمان پێ بڵێن، والسلام عليك ورحمة الله وبركاته.

ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) وەڵامی نامەکەی بۆ ناردەوە بەم چەشنە:

بسم الله الرحمن الرحيم، نامەکەتم پێ گەیشت و لە مەسەلەی هەرقەل گەیشتم، بەڵام بۆ دابەزینی لە ئەنتاکیە ئەوە نیشانەی تێکشکانی خۆی و سەربازەکانیەتی، وە خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ و موسوڵماناندا ڕزگاری دەهێنێت، بەڵام باسی ئەوەت کردووە کە گوایە گەورە و بچووکی وڵاتەکەی کۆکردۆتەوە بۆتان، ئەوە ئێمەش و ئێوەش دەتانزانی وا دەکات، هیچ دەسەڵاتدارێك وازی لە دەسەڵات نەهێناوە و بەبێ شەڕ هەڵنەهاتوون، تۆ زانیوتە –

[1] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٤٧).

سوپاس بۆ خوا – پیاوانێکی زۆر لە موسوڵمانان جەنگیان لەگەڵدا کردوون کە مردنیان پێ خۆشترە لە ژیان، بەو جەنگ و غەزایەیان بە تەمای پاداشتی گەورەن لە خوای (عز وجل)، جیهاد لە پێناو خوا خۆشترە لە لایان لە خێزانە شۆخ و شەنگ و سامانە بە نرخەکانیان، یەك کەس لەوان لە جەنگی ڕزگاریدا لە پێناو خوا باشترە لە هەزار بێ باوەڕ، سەربازەکانت بەرامبەریان بوەستە، نەترسی لەوەی کە هەموو موسوڵمانانت لەگەڵدا نیە، تۆ خوات لەگەڵدایە، منیش لەگەڵ ئەوەشدا بە ناردنی پیاوان پشتگیریت دەکەم تا بەست بێت و داوای زیاتر نەکەیت – انشاء اللە – والسلام علیکم ورحمة اللە وبرکاتە.[1]

یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیانیش نامەیەکی بۆ صدیق نارد کە هەمان ناوەڕۆکی وتەکانی ئەبو عوبەیدەی بوو، و ئەبو بەکریش (ﷺ) بە نامەیەك وەڵامی یەزیدیشی دایەوە بەم چەشنەی خوارەوە:

«بسم اللە الرحمن الرحیم، پاشان، نامەکەتم پێ گەیشت کە باسی پاشای ڕۆمەکانت کردبوو کە بە خۆی دابەزیوەتە شاری ئەنتاکیە، خوای گەورە ترسی موسوڵمانەکانی خستۆتە ناو دڵی هەرقل، خوای گەورە سوپاس بۆ خوا – ئێمەی بە ترس سەرخستبوو کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین، و بە فریشتە بەرێزەکانی کۆمەکی کردین، ئەو ئاینەی کە بە ترس بردنە دڵی بێ باوەڕان سەری دەخستین، هەمان ئاینە کە ئەمڕۆ خەڵکی بۆ بانگ دەکەین، سوێند بە خوای تۆ خوا بە یەك چاودێری موسوڵمانەکان و تاوانبارەکان ناکات، بە یەك چاویش سەیری ئەوانەی کە دەڵێن لا الە الا اللە محمد رسول اللە، و ئەوانەی کە لەگەڵ ئەودا خوایەکی تریش دەپەرستن و زۆر شت دەپەرستن، ئەگەر گەیشتی پێیان بە خۆت و سەربازەکانتەوە ئەنجر ئەنجریان بکە، بجەنگە لەگەڵیاندا، خوای گەورە سەرشۆڕت ناکات، خوای خۆی هەواڵی پێداوین کە ژمارەی کەم بە ویستی خوا سەردەکەوێت بەسەر ژمارەیەکی زۆردا، من لەگەڵ ئەوەشدا پیاوان لە دوای پیاوان دەیانێرم بۆ هاوکاریت تا دەڵێن بەسە و پێویستیتان بە تاقە مرۆڤێك نەمێنێت – انشاء اللە – والسلام علیکم ورحمة اللە وبرکاتە».

---

[1] التأریخ الاسلامي (٢١٣/٩)

ئەبو بەکر (ﷺ) ئەم نامەیەی بە عبداللە کوڕی قەرنی ثمالیدا نارد بۆ یەزید و کاتێك نامەکەی بۆ موسوڵمانان خوێندەوە زۆر دڵخۆش بوون پێی.[1]

نامەی عەمری کوڕی (ﷺ) سەبارەت بە سوپای ڕۆم گەیشتە صدیق و بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: سەلامت لەسەر بێت، پاشان... نامەکەتم پێگەیشت کە باسی کە کۆبونەوەی سەرتاسەری ڕۆمەکان دەکات، خۆ خوای گەورە سەری نەخستین لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) کاتێ خۆی لەبەر زۆری سەرباز و جەنگاوەر، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا جیهادمان دەکرد، دوو ئەسپمان پێ بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا حوشتریان ڕاو دەنا، ئێمە لە جەنگی ئوحوددا یەك وڵاخمان پێ بوو، کە پێغەمبەری (ﷺ) سواری بووبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا سەری دەخستین بەسەر نەیارانماندا.

عەمر، بزانە گونجاترین کەسی خوا ئەوانەن کە لە هەمووان زیاتر ڕقیان لە گوناهە، دەی گوێڕایەڵی خوا بکە و فەرمانیش بدە بە هاوڕێکانت کە گوێڕایەڵی خوا بکەن.[2]

ئەبو بەکر (ﷺ) دەستی کرد بە کۆمەکی کردنی سەرکردەکانی سوپاکانی شام هەر بە سەرباز، بە چەك، بە وڵاخ، و هەموو پێداویستیەکی تر، و هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاصی بانگ کرد و پێی وت: ئەی هاشم، لە بەختەوەری باپیرانتە و شەنشی چاکی خۆتە کە بوویت بە یەکێك لەو کەسانەی کە کۆمەکی ئومەتی ئیسلام بکەیت دژی دوژمنە بێ باوەڕەکانی و کردوویتی بەو کەسانەشی کە ئەمیر متمانەی تەواوی بە ئامۆژگاری و بە وەفایی و بێ تەماحی و جەرگ قایمیت هەبێت، موسوڵمانەکان نامەیان بۆ ناردووم و داوای هاوکاری و کۆمەکی دەکەن تا سەرکەون بەسەر دوژمنە بێ باوەڕەکانیاندا، دەی خۆت و ئەوانەشی لەگەڵتا دێن خۆتانیان پێ بگەیەنن، من خەڵکی هان دەدەم لەگەڵت بێن، بڕۆ بۆ هاوکاری ئەبو عوبەیدە یان یەزید، هاشمیش وتی:

نا، بۆ لای ئەبو عوبەیدە دەچم، وتی: زۆر چاکە بڕۆ بۆ لای ئەبو عوبەیدە.

---

[1] **فتوح الشام، ئەزدی (لا: ٣٣٣٠).**

[2] **خطب ابي بكر الدصيق – محمد احمد عاشور (لا: ٩٢).**

ئەبو بەکریش (ﷺ) هەستایە سەر پێی و وتارێکی بۆ خەڵکەکە دا و بە سوپاس و ستایشی خوا دەستی پێکرد، پاشان وتی: پاشان.... برا موسوڵمانەکانتان بێ وەیین، دوژمنانیان لێ دوورە، سەرکەوتنیان دروست کردووە، خوا ترسی بردنە دڵی دوژمنانیانەوە، لە ناو قەڵاکانیاندا خۆیان شاردەوە، دەرگاکانیان داخست لەسەر خۆیان، نێرراویان گەیشتە لام و ئاگاداری کردم کە هەرقل لە دەستیان ڕای کرد و لە ئەو پەڕی شامدا گیرساوەتەوە، هەواڵیان داومەتێ کە هەرقل لەوێوە سەربازەکانی خڕکردۆتەوە بۆ موسوڵمانەکان.

منیش وا بەباش دەزانم کە کۆمەکیان بکەم بە سەربازێکی ناو ئێوە، کە خوا پشتیان ئەستوور بکات پێیان، و دوژمنەکانیانی پێ بشکێنێت و ترسیان بەرێتە دڵی بێ باوەڕان، دەی لەگەڵ هاشمی کوڕی عوتبەدا بکەونە ڕێ — ڕەحمەتی خواتان لێ بێت — لەو کارەشدا بە تەمای پاداشتی گەورە و خێر بن، چونکە ئەگەر سەرکەوتن ئەوە ڕزگارکردن و غەنیمە دەستکەوتنتان بۆ هەیە و ئەگەر کوژرایشن ئەوە پلەی شەهیدی و ڕێز چاوەڕوانتان دەکات.

پاشان ئەبو بەکر گەڕایەوە بۆماڵەوە، خەڵکی داباریین بەسەر هاشمدا و ژمارەیان زۆر بوو، تا گەیشتن بە هەزار کەس، ئەو کاتە ئەبو بەکر (ﷺ) هات بۆ لای و فەرمانی دەرچوونی پێدا و سڵاوی لێ کرد و ماڵئاوایشی لێ کرد و پێی وت:

(ئەی هاشم، ئێمە کاتی خۆی سوودمان لە پیر و بەساڵاچووەکان وەردەگرت و ڕا و مشورەتمان پێ دەکرد، هەروەك سوودمان لە گەنجەکان وەردەگرت، لە لایەنی خوێن گەرمی و ئازایەتی و خۆگرییەکەوە، خوای گەورە هەموو ڕەوشتەکانی لە تۆدا کۆکردۆتەوە، تۆ تازە پێگەیشتوویت، بەرەو خێر و چاکە دەڕۆیت، ئەگەر گەیشتی بە دوژمن خۆگر بە و خۆگریش دروست بکە، وە بشزانە تۆ هەنگاوێك هەڵناگریت و شتێك سەرف ناکەیت و تینوویەتی و ناڕەحەتی و چەرمەسەریت لە پێناوی خوادا بەسەر نابەیت مەگەر بە چاکە بۆت دەنووسرێت و خوایش پاداشتی چاکەکاران ون ناکات.

هاشمیش وتی: ئەگەر خوا نیازی چاکەی پێم بێت و بەو جۆرەم لێ دەکات و منیش پشت بە خوا وا دەکەم، وە من تکام وایە ئەگەر نەکوژرێم تا بتوانم لێیان بکوژم پاشان بکوژرێم انشاء الله.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) کە مامەی بوو – پێی وت: ئەی برازاکەم یەك ڕم مەوەشێنە، یەك شمشێر مەدە لە کەس، مەگەر مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێت، بزانە وا سەربەرزانە خەریکە لە دنیا دەردەچیت و نزیکە بگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و دەی با کردەوەی چاکە و چاکەکاری هاوەڵت بێت لەو گەشتەدا.

ئەویش وتی: مامە، نەترسی جگە لەمە مەبەستی ترم نیە، ئەگەر وا نەبم لە زەرەرمەندانم، وەگەر کێو بە کێو و بەرد بە بەرد و بڕینی بیابانەکان و شمشێر بازیەکانم بۆ جگە لە خوا بێت و بۆ ڕیا بازی بێت.

پاشان سوپاکەی دەرکرد و خۆی گەیاندە ئەبو عوبەیدە و موسوڵمانەکان مژدەی هاتنیان بە یەکتری دەدا و بەو کارە خۆشحاڵ دەبوون.[1]

ماوەیەك پاش ڕۆیشتنی هاشم، ئەبو بەکر (ﷺ) چویەوە ناو خەڵکەکە و بە بیلالی ووت جاڕ بدات و خەڵکی لەدەوری سەعیدی کوڕی عامیری کوڕی حوزەیم کۆ ببنەوە و بەرەو جیهاد بکەونە ڕێ، لە ڕۆژانێکی کەمدا (٧٠٠) جەنگاوەر لێی کۆبوونەوە، کاتێ سەعیدی کوڕی عامیر ویستی خەڵکەکە سازبکات بیلال (ﷺ) ڕۆشت بۆ لای ئەبوبکر (ﷺ) و پێی ووت:

«ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر تۆ بۆیە کاتی خۆی منت ئازاد کردوە لە بەندایەتی تا لەگەڵ خۆتدا بم و نەهێڵی هەستم بەهیچ کارێك خێری منی تیادابێت، ئەوە لەگەڵتدا دەمێنمەوە، بەڵام ئەگەر لەبەر خوا منت ئازاد کردووە تا سەربەستانە بەدوای ئەو شتانەدا بڕۆم کە سوودی هەیە بۆم، دەی وازم لێ بهێنە تا لە پێناوی پەروەردگارەکەمدا جیهاد بکەم، چونکە جیهاد خۆشەویست ترە، لە لام تا مانەوەم لێرە...».

ئەبو بەکریش پێی وت: ئەگەر خۆت حەزت بە جیهاد کردنە، من فەرمانت پێ نادەم کە هەر دەبێت لای خۆم بمێنیتەوە بەڵام من بەبێ تۆ خۆم پێ ناگیرێت و ئەگەر هەر دەڕۆیت و دەتەوێت تا قیامەت یەکتری نەبینینەوە ئەوە کردەوەی چاك بکە بە توێشووی خۆت تا لە دنیا خوا بەردەوام باست بهێڵێتەوە و ئەگەر مردیشیت پاداشتی تەواوت پێ بدات.

---

[1] **فتوح الشام – ئەزدی (لا: ٣٥٢٣).**

بیلالیش پێی وت: خوا پاداشتت بداتەوە چ بەخشندەیەك و چ برایەكی موسوڵمانی باشمی، سوێند بە خوا ئەم هاندان و ئەمركردن بە خۆگری و ئارامی و لەسەر هەق و لەسەر كردەوەی جوان بەردەوام بوونەت شتێكی نویٚ نیە، منیش ڕاستیەكەی نامەوێت پاش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگ بۆ كەسی تر بدەم و پاشان لەگەڵ سەعیدی كوڕی عامردا دەرچوون و ئەبو بەكر فەرمانی پێدابوون كە بڕۆن بە هانای یەزیدی كوڕی ئەبو سوفیانەوە و ئەوانیش گەیشتن پێی و جەنگی عەرەبە و داشینەیان لەگەڵدا ئەنجامدا.[1]

پاش ئەوە كۆمەڵ كۆمەڵ و دەستە دەستە خەڵكی بۆ ڕۆیشتن بۆ جیهاد دەهاتن بۆ مەدینە و ئەبو بەكریش بەرەو گۆڕەپانەكانی جیهاد دەیخستنە ڕێ، هەندیٚ لەو كەسانە لە لادیٚ دوورەكانەوە هاتبوون و هەندیٚ تێنەگەیشتن و لاریان تێدا بەدی دەكرا بۆیە هاوەڵەكان شكاتیان بردنە لای خەلیفە و بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بچووكترین ناكۆكی لە نێوان ئەوان و هاوەڵاندا ڕووی نەداوە.

﴿ ئەبو بەكر (رضي الله عنه) ڕووی دەكردە كۆمەڵگەی مەدەنی و تێگەیشتوو پێی دەوتن: هەر كەسێك گوێی لەم تكایەمە پێی دەڵێم با واز لەو كەسانە بهێنن و سەر مەخەنە سەریان و با لەبەر دەم قسە ڕەقەكانیاندا خۆگر بن، یان هەر شتێكی پەلە كە ئەمان بە دڵیان نەبێت لێیان و لە سنووریش دەرنەچووبێت پشت گوێی بخەن، چونكە خوا بەم كەسانە هەرقل و ڕۆم لەناو دەبات و ئەمانەش براتانن، ئەگەر شتێكتان لیٚ ببینن خۆتان بگرن و هەڵمەشاخێن بە سەریاندا، دەی ئایا بۆ دنیا و ئاخیرەت ئەمە باشتر نیە لە تۆڵە لیٚ سەندنەوەیان؟ موسوڵمانەكان هەموو بە یەك دەنگ وتیان: بەڵیٚ، پاشان فەرمووی: ئەوانە برای موسوڵمانتانن و پشتیوانتانن لە دژی دوژمنان و مافیان هەیە بەسەرتانەوە و ئەو شتانەیان لیٚ قبووڵ بكەن، پاشان لەسەر مینبەرەكەی هاتە خوارەوە.[2]

پێنجەم: ناردنی خالید بۆ شام و جەنگی ئەجنادین و یەرمووك:

---

[1] **فتوح الشام – ئەزدی (لا: ٣٨٣٥)، بە دەستكاریەوە.**

[2] **التأريخ الاسلامي – للحميدي (٢٢٣/٩).**

سەرکردەکانی سوپای ئیسلام لە وڵاتی شام بە وردی چاودێری جموجۆڵی سوپاکانی ڕۆمیان دەکرد و هەستیان بە ترسناکی بارودۆخەکە کرد، لە ناوچەی (جۆلان) کۆنگرەیان بەست و ئەبو عوبەیدە نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە و بارودۆخەکەی تێگەیاند، لە هەمان کاتدا هەموویان بڕیاریان دا کە لەو ناوچانەی پێشتر ڕزگاریان کردبوو پاشگەز ببنەوە و لە یەك شوێندا کۆ بوونەوە تا بتوانن پلانەکەی ڕۆمەکان پوچەڵ بکەنەوە و ناچاریان بکەن کە بێنە ناو جەنگێکەوە لەگەڵ هەموو موسوڵمانەکاندا.

(عەمری کوڕی عاص) (ﷺ) ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە لە یەرمووك کۆ ببنەوە و ڕای ئەبو بەکریش کە هات بۆیان لەگەڵ ڕایەکەی عەمردا یەکی گرتەوە،[1] کە دیاریکردنی یەرمووك بوو بۆ خاڵی کۆبوونەوەی هێزەکانی ئیسلام، بڕیاریاندا کشانەوەکان دوور بێت لە پێکدادانی دوژمنان.

ئەبو عوبەیدە (ﷺ) لە (حمص) کشایەوە، شەرحەبیل لە ئەردەن و بایەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان لە دیمەشق کشایەوە، عەمری کوڕی عاصیش وردە وردە فەلەستینی بەجێهێشت،[2] بەڵام نەیتوانی تا خالیدی کوڕی وەلید فریای کەوت و لە (بئر السبع) دا سوپای ڕۆمەکانی خەریك کرد و بەهۆیەوە جەنگی ئەجنادینیش هاتە کایەوە.[3]

کاتێ نامەکەی ئەبوعوبەیدە گەیشتە لای ئەبو بەکر (ﷺ) و بارو دۆخەکەی بۆ ڕوون کردەوە و ئەویش فەرمانی دەرکرد کە بکشێنەوە بۆ یەرموك و پێی ووت سوارەکانتان لەناو لادێ و باخەکاندا بڵاو بکەرەوە و دوژمنان تاستەنگ بکەن لەو شوێنانە و گەمارۆی شارەکان نەدەن تا خۆم پێتان نەڵێم بەڵام ئەگەر لێتان هەستان، ئێوەش لێیان هەستن و پشت ببەستن بە خوا و بزانن ئەوان چ کۆمەکیەکیان پێ بگات منیش بەو چەشنە پێتان دەگەیەنم و فریاتانی دەخەم.[4]

---

[1] العمليان التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٤٨).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو و هەمان لاپەڕە.

[3] حروب الاسلام في الشام (لا: ٤٥).

[4] العمليان التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٤٨).

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە دەڵێت: نموونەی ئێوە لەبەر کەمی ژمارەیان لێیان نادرێت، بەڵکە دە هەزار جەنگاوەر لێیان دەدرێت بە هۆی گوناە کردنیانەوە، خۆتان لە گوناە بپارێزن، لە یەرمووك خڕ ببنەوە و پێکەوە بنووسێن و هەر یەکە لە پاڵ هاوڕێکەیدا بێت.[1]

ئامۆژگاری صدیق بۆ سوپای ئیسلام ئەوە بوو کە کۆ ببنەوە و ببن بە یەك سەرباز و بەرپەرچی هێرش و پەلامارەکانی بێباوەڕان بدەنەوە بە هێرشکردن و پێی وتن: ئێوە هاوکارانی خودان و خودایش هاوکاری هاوکارانی دەکات و شکستیش بەسەر ئەوانەدا دێنێت کە شکستی بەرنامەکەی ئەویان دەوێت.[2]

لە نامەکانی صدیق (رضي الله عنه) بۆ فەرماندەکانی سوپای ئیسلامدا تێبینی ئەوە دەکەین بناغەی سەرکەوتن بۆ موسوڵمانان دادەڕێژێت بە گوێڕایەڵی کردنی خوا یەکەمجار، شکستیش دەبەستێت بە سەرپێچی و گوناهەوە.

یان بڕیاری کۆبوونەوەی سوپاکانی ئیسلام لە یەك جێگادا بۆ ئەوە بوو تا دوژمنانی ئیسلام پەرش و بڵاوی سوپاکان بە هەل نەزانن و هەر یەکە لە لایەکەوە ماندوو نەکەن و دواتر لە ناویان نەبەن، هەروەك دیاریکردنی یەرمووك بەڵگەیە لەسەر دیراسەرکردنی صدیق بۆ بوارەکانی جوغرافیای ناوچەکان، ئەمەش تێگەیشتنی جەنگی صدیقە و خوای گەورە خستوویەتیە سەری.

بڕیاریشی دا کە خالید بە خۆی و سوپاکەیەوە خۆیان بگەیەننە شام و ببێتە فەرماندەی گشتی سوپاکانی ئیسلام، چونکە کاری شام زۆر گران بوو پێویستی بە سەرکردەیەکی وا هەبوو کە توانای ئەبو عوبەیدە و زیرەکی عەمر و ئەزموونی عەکریمە و پەلامارەکانی یەزیدی تێدا بێت، هەروەك خاوەنی توانای سەربازی سەرکەوتوو بێت بۆ یەکلاییکردنەوەی کارەکان، ئەزمونێکی دوور و درێژی هەبێت لە چارەسەرکردن و یەکلاییکردنەوەی جەنگەکان و هێرش و پەلاماردا.[3]

---

[1] التاريخ الطبري (٤/٢١١).

[2] هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[3] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٥٩-٣٦٠).

بۆیە بڕیاری صدیق هاتە سەر هەڵبژاردنی خالید و نامەی بۆ نارد بۆ عێراق و ئەویش بە وردی گوێڕایەڵی صدیقی کرد، سوپاکەی گەیاندە ناوجەرگەی شام پاش ئەو گەشتە سەربازیە قورسەی بە ناو بیابانی وشك و بێ ئاودا کردی کە لە مێژوودا بێ وێنە بوو وەك پێشتر باسمان کرد.

بەردەوام کۆمەکیەکانی صدیق (ﷺ) لەگەڵ پلانە جەنگیە پێشکەوتووەکانیدا دەگەیشتە شام و بەرپەرچی شێوازە تەکنیکی و وردەییەکانی دوژمنانی دەدایەوە کە دەیانویست بۆ هۆیەوە لە ئامانجەکانی لای بدەن، تەنانەت سەرکردەکانی ڕۆم دەیانووت: وەڵاهی دەبێت ئەبو بەکر بە جۆرێك خەریك بکەین کە بیر لەوە نەکاتەوە سوپا بنێرێت بۆ سەر زەوی ئێمە و ئەبو بەکریش وەڵامی دەدانەوە و دەیووت: وەڵاهی گاورەکان خەریك دەکەین تا نەیان پەرژێت بە قسەی وەسوەسەی شەیتان بکەن بە خالیدی کوڕی وەلید.[1]

ئەو کۆمەڵە ئاراستە و بڕیارانەی صدیق (ﷺ) کۆمەڵێك ئامانجی پێکا لەوانە: کۆکردنەوەی سوپاکانی ئیسلام لە شام، لەژێر فەرمانده‌یی خالیدی کوڕی وەلیددا کردنی بە یەك، وە شوێنی کۆبوونەوەکەشیانی دیاری کرد، ئەمەش بەرچاو ڕوونی ئەبو بەکر دەردەخات لە بواری جوڵانی سوپاکاندا، کاتێك لە مەدینە ناردنی بە جیاجیا ناردنی و دوور بوون لە یەکەوە و لەسەر شێوەی سەرە ڕم یان شێوەی پانکەیی دانیان کە لە زاراوەی سەربازی هاوچەرخدا پێی دەڵێن – جوڵانی سوپا – ئەو کاتەی کاتی پێکدادان و گەیشتن بە دوژمنان هاتە پێشەوە هەموویانی لە یەکتر نزیك کردەوە لە جێگەیەکدا کە خۆی بۆی دیاری کردن، کە ئەمەش توانای سەرکەوتوویی ئەو پیاوە دەردەخات لە بەکارهێنانی سوپادا کە ئەمڕۆ لە زاراوەی سەربازیدا بە (ستراتیژی) ناوی هاتووە.[2]

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) وەك ڕابەری گشتی جەنگاوەرانی ئیسلام هەوڵی ئەوەی دەدا کە ئامادەیی دەروونی – معنوی – هەبێت لەناو جەنگەکاندا، ئەمەش بە فەرمانەکانی،

---

[1] البداية والنهاية (٢/٥).

[2] الفن العسكري الاسلامي (لا: ٨٩).

کە ناسرابوون بە فەرمانی ژیرانە و وردبینی و زیرەکی نابینایی و خێرا تیگەیشتن لە بارودۆخی سەربازی جەنگەکان، بە دوایدا جولآنی سوپا پڕاوپڕ بەو شێوەیەی بارودۆخەکە دەیخوازێت.

یان زیرەکی لە هەڵبژاردنی فەرماندەکاندا کە بەڕاستی متمانەیەکی تەواو لە نێوان ئەو و ئەواندا دروست بووبوو، کە بیر و بۆچوون و حەز و ئارەزوو نیازەکانی ئەویان جێ بەجێ دەکردبە جۆرێك کە وەك بڵێی خەلیفە خۆی لەوێیە، بە جۆرێك کە سوپاکە و سەرکردەکانیش وا هەستیان دەکرد کە لە گەرمەی جەنگەکاندا ئەبو بەکریان لەگەڵدایە، سەرکردایەتیان دەکات و فەرمان دەردەکات بۆیان، بۆیە هەموو کارەکانیان پڕاوپڕ لەگەڵ نیازەکانیدا یەکیان دەگرتەوە.[1]

کاتێك صدیق (رضي الله عنه) نامەی نارد بۆ خالید پێی ڕاگەیاند کە دەبێت سەرۆکایەتی سوپای ئیسلام بکات بە گشتی لەوێ، لە هەمان کاتدا نامەیەکیشی ناردبۆ ئەبو عوبەیدە (رضي الله عنه) هەواڵی ئەوەی پێدا کە خالیدی کردۆتە فەرماندەیان و دەبێت لەمەو لا گوێڕایەڵی بن و سەرپێچی نەکەن و هۆکاری دەست نیشانکردنی خالیدیشی بۆ ڕوون کردنەوە وتی:

«.... من خالیدم کردۆتە فەرماندەی سوپا لە جەنگ دژی ڕۆمەکان، لە قسەی دەرمەچۆ و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکە، من کردوومە بە بەرپرس بەسەر تۆوە بەڵام دەشزانم تۆ لەو چاکتریت، بەڵام جۆرە هونەر و لێزانینێکی جەنگی لەودا بەدی دەکەم کە بەو جۆرە لە تۆدا بەدی ناکەم، خوای گەورە ڕێگەی سەرفرازی بە ئێمەش و ئێمەش نیشان بدات، والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته».[2]

نامەکەی خالیدیش بۆ ئەبو عوبەیدەی برای و ڕێگەی بڕی لە عێراقەوە بەرەو شام و لە دوو توێی دا باوەڕیلا بتەو و دنیا نەویستی لە خۆ گرتبوو، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

بۆ ئەبو عوبەیدەی جەڕاح لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە: (سلام عليكم) من سوپاسی ئەو خودایەت دەکەم کە جگە لە ئەو خوایەکی تر نیە، پاشان: داوای دڵنیلیی و دڵئارامی بۆ خۆمان و تۆش دەکەم لە ڕۆژە پڕ لە ترسەکانی ژیانی دنیادا، نامەی (خەلیفە)م بۆ هاتووە کە تیایدا فەرمانم بەسەردا دەدات کە بەرەو شام بڕۆم و ببمە سەرکردەی سوپاکانی و بەرپرسی

---

[1] الفن العسكري الاسلامي (لا:٩٨).

[2] مجموعة الوثائق السياسية (لا: ٣٩٢-٣٩٣).

کارەکان، سا سوێند بەخوا نەداوەم کردووە و نە ویستوومە، و نە لەو بارەیەوە شتێکم نوسیووە بۆی، و تۆ - ڕەحمەتی خوات لێ بێت - لەسەر ئەو حاڵەتەی خۆت دەمێنیتەوە، و نا فەرمانی و نە یاریت ناکرێت، و بەبێ تۆ هیچ کارێك ناکەین، تۆ گەورەیەکیت لە سەرگەورەکانی ئیسلام، و چاکە و لێهاتوویت نکۆڵی لێ ناکرێت، بەبێ ڕاوبۆ چوونی تۆ کار ناڕوات، خوای گەورە ئەو نیعمەت و بەخشانە تەواو بکات کە داویەتی بەسەر ئێمە و تۆشدا، و ڕەحم و بەزەیشی بە ئێمە و تۆشدا بێتەوە و لە سزای ئاگر بمانپارێزێت، والسلام عليكم و رحمة الله وبركاته).[1]

لەگەڵ پەیام نێرەکەدا پەیامێکیشی ناردبوو بۆ خەڵکی شام تیایدا پێ ی وتن: پاشان، من داوا دەکەم لەو خوایەی کە بەهۆی ئیسلامەوە عیزەتی پێ بەخشیوین و بە ئایینەکەی شەرەف مەندی کردووین، بە پێغەمبەرەکەشی ڕێزداری کردووین، بە باوەڕ بەرزی کردووینەتەوە، ئەمەش لە ڕەحمەت و سۆزی فراوانی پەروەردگارمانەوەیە، زیاتر بەخششەکانی ببارێنێت بەسەرماندا و تەواوی بکات، ئەی بەندەکانی خوا سوپاسگوزاری خوا بن بۆتان زیاد دەکات، بەرەو ڕووی بڕۆن لە کاتی بێ وەی و خۆشیاندا تا بەردەوامی کات لەسەرتان، هەردەم لە سوپاسگوزاران بن لەسەر بەخششەکانی.

تانەی خەلیفەم بۆ هاتۆتەوە کە فەرمانم پێ دەدات خۆم و سوپاکەم بگەیەنمە شام و بێم بۆ لاتان، و منیش خۆم کۆکردۆتەوە و وابزانن ولاخەکەم لەلاتانە، مژدە بدەن کە خوا پەیمانی خۆی دەباتە سەر پاداشتیتان پێ دەدات، خوای گەورە ئێمەش و ئێوەش بەم بیروباوەڕە بپارێزێت و ئێمەش و ئێوەش لەسەر ئیسلام ڕاوەستاو بکات، و جوانترین پاداشتی جیهاد کاران بە ئێمەش و ئێوەش ببەخشێت، والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته).[2]

کاتێ عەمری کوڕی طفیل ئەزدی هەردوو نامەکەی گەیاند و خوێندیەوە بۆ موسوڵمانان و پاشان دایە دەستی ئەبوعوبەیدە (رضي الله عنه) و ئەویش نامەکەی خوێندەوە و وتی:(بارك الله) بۆ خەلیفەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەم ڕایەی و سلاوی خوایش لە خالید.[3]

---

[1] مجموعة الوثائق السياسية لا٣٩٢.

[2] فتوح الشام، ئەزدی، لا ٦٨.

[3] هەمان سەرچاوە لا٦٨-٧٢.

ئەم هەڵسوکەوتەی ئەم دوو پیاوە مەزنە، مانای برایەتی موسوڵمانانمان بۆ دەردەخات کە لە یەکتاپەرستی ڕاستەقینە هەڵقوڵاوە و دەور دراوە بە پەرژینی ڕەوشتی جوان کە هاوەڵانی پێغەمەری خوای لەسەر بووە، و خالید هیچ خۆی لێ نەگۆڕاوە یان هەست بە بەرزی بکات بەسەر براکانیدا بەهۆی ئەو هەمووە سەرکەوتنانەی لە عێراق و متمانەی تەواوی خەلیفە پێ ی.

نەخێر، بەڵکو دان بە چاکەی چاکاندا دەنێت و گوێ ڕایەڵی خۆی بۆ ئەبوعوبەیدە دووپات دەکاتەوە کە لە جێ ی ئەو دەبێتە ئەمیر، لە بەرامبەر ئەمەشدا ئەباعوبەیدە دەبینین کە چۆن پیرۆزبایی ئەم کارە نوێیە لە خالید دەکات و سلاوی بۆ دەنێرێت.

ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە خالید و ئەبوعوبەیدە لە بەرژەوەندی تاکە کەسی خۆیان دارنیووە لە پێناو بەرژەوەندی ئوممەتی ئیسلامدا، و مەبەستیان لە هەموو کارەکانیاندا ڕەزامەندی خوا بووە و بەس.[1]

لەمەشدا وانەیەکی مەزن هەیە بۆ ڕۆڵەکانی ئەم ئوممەتە لە حوکمڕایان، و بزوتنەوە لایەنەکان، و مامۆستا و بانگخوازەکان، سەرکردە و سەرۆك خێڵەکان لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتری دا لەکاتی دانان یان لابردن، یان دوورخستنەوە.

١-جەنگی ئەجنادین:

خالید گەیشتە شام و (بصری) ی ڕزگارکرد و لەگەڵ فەرماندەکانی ئیسلامدا کۆبوویەوە کە (ئەبوعوبەیدە و شەرحەبیل و یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان) بوون و بارودۆخە سەربازیەکەی هەڵسەنگاند، و شارەزای وردەکاریەکانی بوو، و هەروەك ئاگاداری ڕای عەمری کوڕی عاص- بوو کە دەیویست بە کەناری دەریای ئەردەندا بکێشێتەوە و بگاتەوە ناو سوپاکانی تری ئیسلام، خۆیشی لابدات لە پێکادان لەگەڵ ڕۆمەکاندا، کە سەرکردەی سوپای ڕۆمەکان هەوڵی دەدا سوپاکەی عەمر ڕاکێشێتەوە ناو جەنگی یەکلاکەرەوە و بەلام عەمر زۆر وریاتر بوو و دەیزانی لە بەرژەوەندی ئەو نی یە جەنگ و پێکادان لەم کاتەدا، چونکە سوپاکەی لە (٧) هەزار کەس تێنەدەپەڕی بەلام سوپای ڕۆم زۆر لەو ژمارەیە زیاتر بوون.

---

[1] التاريخ الاسلام-حميدي (٩\٢٣١).

پاش ئەوەی خالید - بارودۆخەکەی هەڵسەنگاند، بینی دوو کاری لەبەردەمدایە دەبێت یەکێکیان هەڵبژێرێت، یەکەمیان: یان دەبێت خۆی بگەیەنێتە سوپاکەی عەمر و پێکەوە جەنگی یەکلاکەرەوە ئەنجام بدەن لە فەڵەستین، و سوپای مەزنی ڕۆم لەناو بەرن.

دووەمیان: لەشوێنی خۆی بمێنێ و چاوەڕوان بکات تا عەمر پاشەکشەکەی تەواو دەکات و دێتەوە بۆ لایان و پاشتر پێکەوە و چاوەڕوانی سوپای ڕۆم بکەن کە لە دیمەشقەوە بەرەو ڕوویان دەهاتن، بەڵام خالید (ﷺ) وای بەباش زانی ڕای یەکەم هەڵبژێرێت، چونکە سەرکەوتن بەسەر ڕۆمەکاندا لە فەڵەستین و پەرش و بڵاو کردنەوەی ڕێگە بۆ موسوڵمانەکان ئاسان دەکات کە پاشەکشە بکەنەوە و جێگەکانیان تۆکمە بکەن، و بگەنە ئاستێك بتوانن ببنە جێگای هەڕەشە و ترس بۆ سوپای ڕۆمەکان و وای لێکەن لە دواوەی خۆیشی بترسێت و هەوڵی ئەوە بدات کە لەدواوە لێ ی نەدرێت و ناچار ببێت هەوڵی بەرگری بدات دوای ئەوەی کە پێشتر هێرش بەر بوو.

لە یەرموکەوە خواربوویەوە بەرەو دەشتی فەڵەستین، دوای ئەوەی فەرمانی بۆ عەمر دەرکرد کە پاشەکشە بکات و سوپای ڕۆم بەرەو پێش هاتن ناچار بکات تا سوپاکەی ئەم فریای دەکەوێت و پێکەوە سوپای ڕۆم دەدەن بە یەکدا، بۆیە عەمر بەرەو ئەجنادین گەڕایەوە.[1]

کاتێ سوپای خالید گەیشتە لای عەمر بە هەردوولاوە ژمارەیان گەیشتە نزیکەی (٣٠) هەزار جەنگاوەر، و گەیشتنی خالید لە کاتێکی زۆر گونجاودا بوو، لەو کاتەدا بوو کە سوپای عەمر ناچاری پێکادان بوو ڕۆمەکان و خالید بە سوپا سەرەکیەکەوە گەیشت، و جەنگێکی زۆر دژوار دروست بوو، و لێهاتووی سەربازی هەردوو سەرکردەی گەورە-خالید و عەمر-خوا لێیان ڕازی بێت-ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە سەرکەوتنی یەکجاری موسوڵمانەکان، و بەجۆرێ کە هێزێکی تایبەت توانی خۆی بکات بەناو ڕیزی سەربازەکانی ڕۆمدا تا گەیشتنە سەرکردەی ڕۆمەکان و کوشتیان، و بە کوشتنی ئەو سەرکردەیە توانای خۆگری و بەرگری ڕۆم کوژایەوە و هەریەکەو بە لایەکدا ڕایان کرد.[2]

---

[1] شوێنێکە لە وڵاتی فەڵەستین.

[2] ابوبکر نزار الحدیثي لا ٧٠.

جەنگی ئەجنادین یەکەمین جەنگی گەورە بوو کە لە نێوان موسوڵمانەکان و ڕۆمەکانـدا لە وڵاتی شام ڕوویدا، و کاتێ هەواڵی تێکشکانەکەیان گەیشتە — هێرقل - کە لـەو کاتـەدا لـە (حمص) بوو-هەستی بە گەورەیی کاریسەکە کرد.[1]

خالیـد (رضي الله عنه) نامەیـەکی نـارد بـۆ جێنـشینی پێغەمـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) و هـەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانانی پێ ڕاگەیاند وتی: بۆ عبـدالله ئـەبوبکر جـێ نـشینی پێغەمـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە شمشێری خوا بۆ سەر گەردنی بێ باوەڕان، و پاشـان..(الـسلام علیکم)

من سوپاسی ئەو خوایەت بۆ دەکەم کـە جگـە لـەو خـوای تـر نـی یـە، و پاشـان مـن ئاگادارت دەکەم ئەی —صدیق - کە ئێمـە و بـێ بـاوەڕان تـێ هـەڵڕژایین کـە سـەربازێکی بـێ شومار یان بۆ کۆکردبوینەوە لە ئەجنادین، کـە خاچـەکانیان بـۆ بەرزکردبوویـەوە و کتێبەکـەیان هەڵبڕیبوو، سوێندیان بەخوا خواردبوو کە ڕانەکەن تا نەمان شکێنن یان لـە وڵاتەکـەیان ڕاومـان نەنێن، و ئێمەش پشت ئەستور بەخوا بۆیان دەرچوین لە سەرەتاوە ڕم بەدەستەکان و پاشان شەڕە شمشێر، و لە هەموو کون و قوژبن و جێگایەکدا بەرامبەریان وەستاین، سوپاسی خوادەکەم لەسەر سەرخستنی ئاینەکەی و لوت شـکاندنی دوژمنـانی، چـاکەکاری لەگـەڵ دۆسـتەکانیدا والـسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.[2]

کاتێ ئەو نامەیە گەیشتە خەلیفە ئەبوبکر زۆر دڵخۆش بوو، زۆریش سەرسام بوو، ووتی:

**سوپاس بۆ ئەو خوایەی موسڵمانانی سەرخست و چاو دڵ ڕۆشنی کردم پێی.**

**٢- یەرموك**

**سەرکەوتن لە جەنگی ئـەجنادین تۆمـەرەکرا، دوای ئـەوەی ئـەو سـەرکەوتنە گـەورەیی دەستی موسڵمانان کەوت، ڕۆمەکان تێـك شـکان و بـاوەڕدارانیش زۆر دڵنیـابوون بـەهۆی ئـەو سەرکەوتنە گەورەیەوە.**

---

[1] **هەمان سەرچاوەی پێشوو لا ٧١.**

[2] **فتوح الشام، ئەزدی (٨٤-٩٣).**

لەسەر بڕیاری جێنشینی پێغەمەری خوا (ﷺ) سوپای موسڵمانەکان لە یەرموکدا کۆبونەوە، ڕۆمەکانیش بەفەرمانده‌یی -تیرۆر - لە (واقصة) دابەزین و سەربازگەیان دروست کرد لەو جێگەیەدا کە شوێنێك بوو لە زۆر لاوە دەتوانرا لێیان بدرێت و بفڕێنرێن، و بواری ڕاکردنیشی تێدا کەم بوو.

هێزەکانی هەردوولا:

* موسڵمانەکان (٤٠) هەزار جەنگاوەر بوون و هەندێ دەڵێن (٤٥) هەزار بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید.

* ڕۆمەکان: ژمارەیان (٢٤٠) هەزار چەکدار مەزەندە دەکرا و بە فەرماندەیی تیدۆر.

پێش جەنگەکە:

موسڵمانەکان:

موسڵمانەکان گەیشتنە یەرموك و سەربازگەیان تیادا دروستکرد، و ڕۆمەکانیش لەگەڵ فەرماندەکانیاندا لە کەناری خوارووی دەریا کە سەربازگەیان دروستکرد، و عمری کوڕی عاصیش (ﷺ) ووتی: «مژدەتان بدەمێ ئەی خەڵکینە وەڵلاهی ڕۆم گەمارۆدرا، و کەم جاریش گەمارۆدراو تووشی خێردەبێت»[1]

خالید (ﷺ) شێوازێکی نوێی گرتەبەر کە پێشتر عەرەب شتی وایان نەکردبوو[2] شێوازی بەش بەش کردنی- کرادیس - ی بەکارهێنا، و سوپاکەی (٣٦) کردۆسەوە تا (٤٠).

سوپاکەشی بەم جۆرە ڕیز کرد:

-فیرقە: کە (١٠) تا (٢٠) کردۆس بوو، ئەمیرێك و سەرکردەیەکی هەبوو.

-کەرادیس: هەزار جەنگاوەر کە ئەمیرێك و سەرکردەیەکی هەبوو.

سوپاکەشی کرد بە (٤٠) کردۆس بەم شێوازەی خوارەوە:

١- فیرقەی ناوجەرگە: کە (١٨) کردۆس بوو بە سەرکردایەتی ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح بە هاوکاری عەکریمەی کوڕی ئەبوجەهل وقەعقاعی کوڕی عەمر

---

[1] العمليات التعرضية والدفاعية (لا: ١٦٣).

[2] البداية والنهاية(٨\١٧)

٢- فیرقەی دەستە راست: لە (١٠) کە کردۆس پێکهـاتووە و بەسـەرکردایەتی عـەمری کوڕی عاص و شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە.

٣- فیرقەی دەستە چەپ: لە (١٠) کردوس پێك هاتووە بە سەرکردایەتی یەزیدی کـوڕی ئەبو سوفیان.

٤- فیرقەی پێشەوە: پێك هاتووە لـە ئەسـپ سـوارەکانی پێـشەی بـەرەکانی جـەنگ و ئەرکیشی چاودێری و ئاگاداری و پاراستنی سوپایە لە نووسان بە دوژمنانەوە، بۆیە ئەم فیرقەیـە بچوك و سوکە.

٥- فیرقـەی دواوە: لـە (٥) هـەزار جـەنگاوەر پێـك دێـت واتـە (٥) کـردۆس و بـە سەرکردایەتی سەعیدی کوڕی یەزید و ئەرکیشی سەرپەرشتی کاری ئیداری و دادگایی کە (ئـەبو دەردا بوو) لەگەڵ کاری دارایی، کە عبداللە ی کوڕی مەسعود بوو ئەرکیشی بەڕێوە بردنی ئـیش و کاری چێشت و خواردن و کۆکردنەوەی غەنیمـەکان، و قورئـان خوێنـدن کـە میقـدادی کـوڕی ئەسوەد دەگەڕا بەناو جەنگاوەراندا و ئەنفال و ئایەتـەکانی جیهـادی بەسـەردا دەخوێندنـەوە تـا بەردەوام ورەیان بەرز دەکاتەوە، و ووتاربێژی سوپا- ئـەبو سـوفیانی کـوڕی حـەرب کـە بەسـەر ڕیزەکاندا دەگەڕا و ووتاری دەدا و هانی خەڵکەکەی دەدا بۆ جیهاد و کوشتار.[1]

فەرماندەی گشتیش. خالیدی کوڕی وەلید بوو لەناوەڕاستی سوپاکەدا بوو، بەدەوریشیدا گەورە هاوەڵان بوو، سوپای ئیسلامی بە شێوەیەکی جوان ئامادەکرا بـە فەرمانـدەیی خالیـدی کوڕی وەلید، و هەموو ئامادەکاریەکی سازکرد و هەر سەرکردەیەك دەگـەڕا بـەناو کۆمەڵەکـەی خۆیدا و سووری دەکردن لەسەر خۆڕاگری و ئارامی و جیهاد.

فەرماندە سەربازیەکانی موسڵمانەکان بەجۆرێ بۆ ئەم جەنگەیان دەڕوانی کە جەنگێکی زۆر گەورەیە و یەکلاکەرەوەیە-حاسم- و خالیدیش چاك دەیزانی کە ئەگەر لەم جەنگەدا بتوانێت ڕۆومەکان هەڵبکەنێت لە شوێنەکانیان، ئەوە ئیتر بـەردەوام لـە سـەرکەوتندا دەبێـت و ئەگـەر بشکێت ئەوە هەرگیز سەرکەوتوو نابێت، واتە شکاندنی ڕۆم لەم جەنگـەدا واتـە شـکاندنیان لـە

---

[1] البداية والنهاية (٨\٧)

هەموو وڵاتی شامدا و دواتر بە ئاسانی وڵاتی شام ڕزگار دەکرێت و دەروازەیەکیش دەبێت بۆ ڕزگارکردنی میسر و ئاسیا و ئەوروپا.[1]

* ئامادەکردنی سوپا لە لایەن بیر و باوەڕیەوە:

کاتێ کە هەردوو کۆمەڵەکە کەوتنە بەر چاوی یەکتر و دەرکەوتن لە یەکتری ئەبو عوبەیدە ئامۆژگاری موسڵمانەکانی کرد دەیوت: بەندەکانی خوا، ئێوە خوا سەر بخەن ئەویش سەرتان دەخات و ڕاوەستاوتان دەکات و پەیمانی خوا ڕاستە، ئەی کۆمەڵی گەلی موسڵمان، ئارامیتان هەبێت چونکە هەر بە ئارامی لە بێباوەڕان ڕزگارتان دەکات و خواشتان لێ ڕازی دەبێت، و لە ئابڕو چوونیش پارێزراو دەبن، و ڕیزەکانتان مەشێوێنن و هەنگاوێك مەچنە پێشەوە و دەست بە جەنگ مەکەن تا ئەوان دەست پێ نەکەن و سەرەتا ڕم بە دەستەکان خۆیان ئامادە دەکەن و خۆتان بپارێزن بە قەڵغانەکانتان و زۆر بێ دەنگ بن مەگەر زیکر و یادی خوا بکەن لە دڵی خۆتاندا، تا فەرمانی منتان بۆ دێت انشاء الله.

مەعاذی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) ڕۆیشتە ناو خەڵکەکە و بەردەوام بیری دەخستنەوە و دیوت: ئەی پیاوانی قورئان و قورئان لەبەران، و پشتیوانانی ڕێنومایی و دۆستانی هەق و ڕاستی، ڕەحمەت و سۆزی خوا بە ئاوات خواستن دەست ناکەوێت، لێخۆش بوونیش نیە مەگەر بۆ کەسێك ڕاست بکات، ئەی ئایا گوێتان نەبووە لە فەرمایشتی خوای گەورە کە دەفەرموێت:

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ﴾ (نور: ٥٥).

واتا: خوا پەیمانی داوە بە باوەڕدارانتان ئەوانەی کاری چاکەشی پێ دەکەن کە سەریان بخات هەروەك چۆن پێش ئێوەشی سەرخست، شەرم بکەن لە خوا ڕەحمەتتان لێ بێت، لەوەی بتانبینێت هەڵدێن، و ئێوەش لەبەر دەستیدان، بێجگە ئەو ڕێگەیەکی ترتان نیە و جگە لەویش کەس سەرتان ناخات.

---

[1] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين لا ١٦٤

عەمری کوڕی عاصیش (رضي الله عنه) دیوت: ئەی موسوڵمانان سەر داخەن و لەسەر ئەژنۆ بوەستن و ڕمەکانتان بەرز بکەنەوە، ئەگەر هێرشیان بۆ هێنان لێیان گەڕێن تا نزیك دەبنەوە ئەو کاتە شێر ئاسا پەلاماریان بدەن، سوێند بەو کەسەی بە ڕاست کردن لەگەڵی ڕازی دەبێت و پاداشتیشی لەسەر دەداتەوە، ڕقیشی لە درۆکردنە و سزایشی لەسەر دەدات و پاداشتی چاکە و چاکە دەداتەوە و بیستومە کە موسڵمانان هۆز بە هۆز و قەسر بەقەسر ڕزگاری دەکەن نەتان ترسێنێت چونکە ئەگەر ئێوە ڕاست بکەن هەریەکە و بەلایەکدا هەڵدێن».

ئەبو سوفیانیش دەیووت: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئێوە ئێستا لەناو خاکی عەجەمدان و لە کەس و کار دەستتان بڕاوە و لە (امیر المؤمنین) و کۆمەکیەکانی دوور کەوتوونەتەوە، وەلاهی کەوتوونەتە بەر کەڵبەی دوژمنێکی زۆر و بێ شوومارەوە و زۆر ڕقیان لێتانە چونکە ئێوە بێ ماڵتان کردوون، بێ منداڵتان کردوون، بێ ژنتان کردوون.

سوێند بە خوا کەس لە دەستی ئەوانە ڕزگارتان ناکات، سبەینێش ناشگەنە ڕەزامەندی خوا مەگەر بە ڕاست کردنتان لەم ڕووبەڕووبوونەوەدا و خۆگری لەناو سەنگەرەکانتان و بە شمشێرەکانتان بەرگری بکەن و یارمەتی یەکتریش بدەن و ئەوەش قەڵای ئێوە دەبێت.

پاشان ڕۆیشتە ناو ئافرەتەکان و ئامۆژگاری کردن[1] و پاشان گەڕایەوە و هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی گەلی موسوڵمان ئەوەی دەیبینن وا هاتە پێشەوە، ئەمە پێغەمبەری خوا و بەهەشتە لە بەردەمتاندایە و ئەوەش شەیتان و سزای سەختی خوایە لە دواتانەوەیە، پاشان ڕۆیشتەوە شوێنی خۆی (رضي الله عنه).[2]

ئەبو هورەیرەیش (رضي الله عنه) ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد و دەیووت: خێراکەن بگەنە حۆریەکانی بەهەشت و میوانداری پەروەردگارتان لە بەهەشتی پڕ ناز و نیعمەتدا، پەروەردگارتان لە هیچ شوێنێکدا ئەوەندەی ئەم کاتە پێی خۆش نیە بتان بینێت، بۆ ئارامگرانیش چاکەی خۆیان هەیە.

---

[1] البداية والنهاية (٧/٩).

[2] ترتيب وتهذيب البداية والنهاية (لا: ١٦٣).

ئەبو سـوفیانیش (ﷺ) بەسـەر ڕیزەکانـدا دەگـەڕا و لەبـەر دەم هـەموو کردۆسـێکدا دەوەستا و دەیووت: الله... الله.. لـە پارێزگـارانی عـەرەب و پـشتیوانانی ئیـسلام و ئـەوانیش پارێزگاری ڕۆمانن و پـشتیوانانی بـێ بـاوەڕی، خوایـە ئەمـە یەکێکـە لـە ڕۆژەکانـت، خوایـە سەرکەوتنت ببارێنە بەسەر بەندەکانتدا.[1]

یەکێك لە گاورە عەرەبەکان بە خالیدی وت: ڕۆمەکان چـەند زۆرن و موسـوڵمانەکانیش چەند کەمن!! خالیدیش وتی: لە ناوچیت! بە ڕۆمەکان دەمترسێنیت؟ زۆری سوپا بە سەرکەوتنە و کەمیش دەبن بە سەرشۆڕی نەك بە ژمارەی چەکدار، وەڵاهی ئاواتم ئەوەیە ئەشقەر — ئەسپەکەی خالید نەخۆشی ڕێگای دوور بوو — چاك بێتەوە ئیتر چش هێزی ڕۆم دوو بەرامبەر ببنەوە.[2]

(معاذی کوڕی جەبەل) (ﷺ) هەر کاتێك گوێی لە دەنگ و هاواری ڕوهبان و قەشـەکان بوایـە، دەیووت: خوایە قاچە لەرزەیان پێ بخەیت و دڵیان ڕاچڵەکێنە، ئارامیش بەسەر ئێمـەدا ببارێنـە، خواناسیمان تێدا بڕوێنە و گەیشتن بە دیدارت خۆشەویست بکە لە لامان، ڕازیمان بکە بە قـەزا و قەدەر.[3]

**ڕۆمەکان:**

ڕۆم بە کەش و فشێکەوە هات و لە زۆریاندا دەشتەکەیان بە تەواوی داگیر کردبـوو، لـە شـێوەی پەڵـە هـەورێکی ڕەشـدا بـوون، بـە هـەموو دەنگیانـەوە هاواریـان دەکـرد، قەشـە و ڕوهبانەکانیان ئینجیلیان بۆ دەخوێندنەوە و هانیان دەدان بۆ جەنگ.[4]

لە (واقصە) بەزین کە نزیك بوو لە یـەرموك و ئـەو دۆڵـە وەك خەنـدەقی لێ هـاتبوو بۆیان، ئەوانیش خۆیان سازدا لە شێوەی کردۆسدا، هەموویان لەسەر دوو هێڵ بوون، هـەر پێـنج کەسێك لە بازنەیەکدا بوو کە لە نێوان ئەو و پێنجەکەی تردا بۆشاییەك هەبوو، بە دوای ئەویشدا هێڵی دووەم دەهات.

---

[1] البداية والنهاية (٧/١٠).

[2] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[3] ابو بكر رجل الدولة (لا: ٨٨).

[4] ترتيب وتهذيب البداية والنهاية (لا: ١٦٣).

کەواتە ڕۆمەکان تەرتیبی سوپاکەیان بەم چەشنە کردبوو:

- تیرهاوێژەکان لە پێشەوە، کاریشیان دەست پێکردنی جەنگ و پاشان پاشەکشەکردن بۆ دواوە.
- ئەسپ سوارەکان کە کاریان پارێزگاری بوو لە تیر هاوێژەکان لە کاتی پاشەکشەیان بۆ دواوە.
- کردۆسەکان — پیادەکان — کاریان بڕینی ڕیزەکانی بەرامبەر.
- سەرکردەی پێشەوە — (جرجە) بوو.
- سەرکردەی دوباڵەکە: هامان و (دارقص) بوو.[1]

**وتو وێژی ڕێککەوتن پێش جەنگەکە:**

کاتێك هەردوو سوپاکە لەیەك نزیك بوونەوە ئەبو عوبەیدە و یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان ڕۆیشتنە پێشەوە بەرەو سوپای ڕۆم و (ضراری کوڕی ئەزور) و (حارث)ی کوڕی هەمامیان لەگەڵدا بوو، بانگیان کردن کە ئەمیرەکەتانمان دەوێت و دەمانەوێت وتو وێژی لەگەڵدا بکەین، ڕێگەیان پێ درا و چوون بۆ خێمەکەی — تەزارووق — دەبینن هەمووی ئاوریشمە، هاوەڵان وتیان: دروست نیە بچینە ژێریەوە و تەزارووق فەرمانی دا قالیەکی ئاوریشمیان بۆ ڕاخستن، ئەوانیش وتیان: ئێمە لەسەر ئەمە دانانیشین.

ئەوە بوو گەورەی ڕۆمەکان بەو شێوەیەی هاوەڵان پێیان خۆش بوو لەگەڵیان دانیشت و ڕێککەوتن لەسەر ئاشتەوایی، هاوەڵان پاش ئەوەی بانگیان کردن بۆ ڕێگای خودا — ئەوانیش بە قسەیان نەکردن، گەڕانەوە و ڕێککەوتن سەری نەگرت.[2]

وەلیدی کوڕی موسلیم دەڵێت: هامان داوای کرد لە خالید لە ریزەکە بێتە دەرەوە و لەو نێوانەدا پێکەوە وتو وێژ بکەن و هامان وتی: بۆمان دەرکەوتووە کە ژیانی چەرمەسەری و هەژاری پاڵی پێوە ناون لە وڵاتی خۆتان دەربچن، دەی وەرن با هەر یەکەتان (١٠) دینار و

---

[1] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٦٧).

[2] البداية والنهاية (٧/١٠).

پۆشاك و خواردنتان پێ دەم و بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، ساڵی ئایندەش هەمان ئەندازەتان بۆ دەنێرین!!

خالیدیش (ﷺ) وەڵامێکی ڕەق و شایستەی دایەوە و وتی پێی: لەبەر ئەو شتانە تۆ باسی دەکەیت لە ماڵ دەرنەچووین، بەڵام ئەوەی تێدایە ئێمە گەلێکین حەزمان لە خوێن خواردنە، بیستوشمانە کە هیچ خوێنێك لە چێژ و لەزەتدا ناگاتە خوێنی ڕۆم، بۆ ئەوە هاتووین، هاوڕێکانی هامان وتیان: وەڵاهی ئێمەش هەر ئەوەمان وتووە سەربارەت بە عەرەب.[1]

**هەڵگیرسانی جەنگ:**

پاش ئەوەی ئامادەکاری تەواو بوو، وتو وێژەکان سەریان نەگرت، خالید ڕووی کردە عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و قەعقاعی کوڕی عەمر و فەرمانی پێدان جەنگ هەڵگیرسێنن، ئەوانیش بە کەشخەیەکەوە چوونە دەرەوە و داوای شمشێربازیان لە ڕۆماکان کرد و پاڵەوانەکانیان هاتنە دەرەوە و جەنگ گەرم بوو، هەڵگیرسا.

خالیدیش (ﷺ) لەگەڵ کردۆسی پارێزگارە ئازاکاندا بوو لە ناو جەرگەی جەنگدا بوو، سەیری دەکردن و بۆ هەر هۆزێك پیاوێکی دەنارد کەچی غیرەتیان زیاتر دەکات پێیان بکەن و بە جوانترین شێوە جەنگەکەی بە ڕێوەبرد.[2]

* موسوڵمان بوونی سەرکردەیەکی ڕۆمەکان لە ناو جەنگەکەدا:

(جەرجە) کە یەکێك بوو لە سەرکردە گەورەکانی ڕۆم لە ڕیزەکەی ڕۆیشتە دەرەوە و خالیدیش بانگی کرد و ئەویش لێی نزیك بوویەوە و بە جۆرێك کە ملی هەردوو وڵاخەکەیان گیرایە یەکتر.

(جەرجە) وتی: خالید ڕاستم پێ بڵێ و درۆم لەگەڵ مەکە، چونکە پیاوی — سەربەست - درۆ ناکات، مەمخەڵەتێنە چونکە پیاوی بەڕێز ئەو کەسانە ناخەڵەتێنێت کە ڕجای خوای لێ بکات.

---

[1] هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

[2] البداية والنهاية (٧/١٠).

ئایا خوا لە ئاسمانەوە شمشێرێکی دابەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەتان، ئەویش دابێتی بە تۆ و لەگەڵ کەسدا شەرت پێ نەکردووە و نەت شکاندبێت؟ خالید وتی: نەخێر.

جەرجە وتی: ئەی بۆچی ناوت نراوە شمشێری خوا؟ وتی: خوای گەورە لە ناوماندا پێغەمبەرێکی هەڵخست و بۆ لای خۆی بانگی دەکردین، بەڵام ئێمە باوەڕمان پێ نەکرد و دەستمان کردە دژایەتی کردنی، پاشان هەندێ لە ناوماندا باوەڕیان پێ هێنا و شوێنی کەوتن و هەندێکمان بە درۆی دەزانی و دووریان دەخستەوە، من یەکێك بووم لەو کەسانە، بەڵام پاشتر خوای گەورە دڵی نەرم کردین و باوەڕمان پێ هێنا و شوێنی کەوتین، پێشی وتم: «انت سیف من سیوف الله سله الله علی المشرکین»، واتا: تۆ یەکێکی لە شمشێرەکانی خوا و هەڵکێشاوی بۆ گەردنی بێ باوەڕان،[1] دوعای سەرکەوتنی بۆ کردم، پاش ئەوە ناویان ناوم شمشێری خودا و منیش توند و تیژترین کەسم بەرامبەر بێ باوەڕان.

(جەرجە) وتی: خالید ئێوە خەڵکی بۆ لای چی بانگ دەکەن؟ وتی: بانگیان دەکەین بۆ ئەوەی شایەتی بدەن هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) و محمدیش بەندە و پێغەمبەری خوایە، باوەڕهێنانیش بە هەموو ئەو شتانەی لە لایەن خواوە بۆی هاتووە.

(جەرجە) وتی: ئەی ئەگەر کەسێك نەیەت بە دەم بانگەوازەکەتانەوە؟ وتی: سەرانەی لەسەر دادەنێین و پارێزگاری لێ دەکەین، و وتی: ئەی ئەگەر ئەوەشی نەدا؟ وتی: داوای جەنگی لێ دەکەین و پاشان دەجەنگین لەگەڵیدا، وتی: ئەی پلە و پایەی ئەو کەسەی ئەمڕۆ بێتە ناوتانەوە چۆنە؟ خالید وتی: هەر وەك یەك واین، پیاوماقوڵمان، خواترسیمان، پێشینەمان و دواییینەمان،

جەرجە پرسی: ئایا کەسێك ئەمڕۆ بێتە ناوتانەوە هەمان پاداشتی ئێوەی هەیە؟ وتی: بەڵێ، بەڵکو زیاتریش، پرسی چۆن وەك ئێوە دەبێت کە ئێوە پێشتر باوەڕتان پێ هێناوە؟

خالید وتی: ئێمە بە ناچاری لە سەرەتاوە ئەم بانگەوازەمان وەرگرت و بە جۆرێك بەیعەتمان پێدا کە خۆی زیندوو بوو لە ناوماندا بوو، لە ئاسمانەوە نیگای بۆ دەهات، بەڵگە و موعجیزەمان لێ دەدی، دەی شایانیشە بۆ هەر کەسێك ئەوەی ئێمە لێمان دی و لێمان بیست

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، (١٣/٧).

بیبیستێت، بەیعەت بدات و موسوڵمان ببێت ئەوەی ئێمە دیومانە ئێوە نەتان دیوە، ئەو هەموو بەڵگە و موعجیزانەتان نەبیستووە، دەی هەر کەسێك لە ئێوە لە دڵەوە و بەڕاستی باوەڕ بهێنێت پێی، ئەوە لە ئێمە باشترە.

(جەرجە) وتی: توخوا ڕاستت کرد لەگەڵمدا و نەت ویست بمخەڵەتێنیت؟ خالید وتی: بە خوا ڕاستم پێ وتوویت و خوایش ئاگادارە لە پرسیارەکانت.

لەو کاتەدا جرجە قەڵغانەکەی هەڵگەڕاندەوە و خۆی خوار کردەوە بۆ لای خالید و پێی وت: لە ئیسلام حاڵیم کە، خالیدیش لەگەڵ خۆی بردیە ناو خێمەکەی و دەست نوێژی پێ گرت و دوو رکات نوێژی پێکرد، ڕۆمەکان دیان وا (جەرجە) لەگەڵ خالیددایە و چووەتە ناو چادرەکەی، لە داخا یەك هێرشی گەورەیان هێنا و موسوڵمانەکانیان لە شوێنی خۆیان هەڵگەڕاند، تەنها کردۆسی پارێزگاران نەبێت کە عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و حارث کوڕی هەمام فەرماندەییان دەکردن.[1]

* لای چەپی ڕۆمەکان دایان بەسەر موسوڵمانەکاندا:

ڕیزەکانی ڕۆم وەك شەوی تاریك هەموو پێکەوە هاتنە پێشەوە بەرەو سوپای ئیسلامی لای چەپی سوپاکەیان پەلاماری للای ڕاستی سوپای ئیسلامی دا و لەوێ هاتنە ناوەوە و سوپای ئیسلامی کەلێنی تێکەوت و ڕۆمەکان توانیان درزێك بکەنە سوپای ئیسلام و لێیەوە هاتنە ژوورەوە.

بۆیە مەعاذی کوڕی جەبەل (ﷺ) هاواری کرد: ئەی بەندەکانی خوا، موسوڵمانەکان، ڕۆمەکان خۆیان نارەحەت کردووە تا ئێوە سەغڵەت بکەن، نا وەڵاهی خۆگری و ئارامی و ڕاوەستاوی نەبێت هیچ شتێك کەڵکی نیە، پاشان لە وڵاخەکەی دابەزی و وتی: کێ ئەسپەکەمی دەوێت با بیبات جەنگی لەسەر بکات، خۆی وای بە باش زانی بە پیادە جەنگ بکات.[2]

هۆزەکانی (ئەزد) و (مەزحەج) و(حەزرەمەوت) و (خەوەلان) لە شوێنی خۆیاندا خۆیان گرت و نەجوڵان، تا بەرپەرچی هێرشەکەی دوژمنانی خوایان دایەوە، ڕۆمەکان وەك شاخ

---

[1] البداية والنهاية (١٣/٧).

[2] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٦٩).

هەر بەرەو پێش دەهاتن و موسوڵمانەکانی لای ڕاستیان بەرەو ڕیزەکانی ناوجەرگە برد، کۆمەڵێك کەس خۆیان ئاخنیە ناو سەربازگەکە، وێنەی کۆمەڵێك کەس بەدی دەکرا لە موسوڵمانەکان کە ئازایانە لە ژێر بایەخدانیاندا دەجەنگان، پاشان هاوار کرا بگەڕێنەوە تا ڕۆمەکان زیاتر بێنە بەر دەستیان، خەریکیان کردن لەوەی کە لە کەلێنەکەوە بێنە ناو موسوڵمانان و ئافرەتانیش بە تەختەدار و بەرد دەهاتن بە سەر و چاوی ئەوانەدا کە دەشکان و دەگەڕانەوە، ئەوانیش دەچوونەوە شوێنەکانی خۆیان.[1]

عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل دەیووت: لە دژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە زۆر جێگادا جەنگاوم کەچی ئێستا لە دەستی ئێوە ڕابکەم؟! پاشان هاواری کرد: کێ پەیمانی مردنم پێ دەدات؟ حارث کوڕی هیشامی مامی و زرازی کوڕی ئەزوریش لەگەڵ (٤٠٠) کەس لە موسوڵمانە ناودارەکان و سوارچاکەکانیان پەیمانیان پێدا و لەبەر دەم چادرەکەی خالیددا خۆگرانە دەجەنگان تا هەموویان بریندار بوون و کۆمەڵێکیشیان لێ شەهید بوو لەوانە زراری کوڕی ئەزور (رضي الله عنه).[2]

واقیدی و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە کە کاتێك بریندار بوون و دەیان ناڵاند و هاواری ئاویان دەکرد، ئاویان بۆ هێنان و کاتێك دەیانویست بیخۆنەوە، دەبینن برینداریکی تر لە پاڵیەوە سەیری ئاوەکە دەکات، من ناخۆمەوە بیدە بە ئەو، ئا بەو جۆرە ئاوەکە لەمیانەوە دەیانبەخشیە برا برینداڕەکەی پاڵیان تا یەك یەك گیانیان سپارد و کەسیان دەمیان نەبرد بۆ ئاوەکە خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

دەڵێن: یەکەمین کەسێك لە موسوڵمانەکان شەهید بوو، پیاوێك بوو هات بۆ لای ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح و پێی وت: من خۆم ئامادەکردووە بۆ مردن ئایا ئیشێك یان پێویستیەکت بە پێغەمبەری خوا هەیە (ﷺ)؟

---

[1] **فتوح الشام**، ئەزدی، (لا: ٢٢٢).

[2] **ترتيب وترهيب البداية والنهاية** (لا: ١٧٠).

ئەویش وتی: بەڵێ، سەلامی ئێمەی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هەموو ئەو پەیمانانەمان بە چاوی خۆمان دی و هاتنە دی کە خوای گەورە بە ڕاستی پێی دابووین، دەڵێ ئەم پیاوە چووە ناوجەرگەی جەنگەوە و شەهید بوو — ڕەحمەتی خوای لێ بێت-.

هەموو هۆزەکان خۆگرانە لە ژێر بایەخدانیاندا بەردەوام دەجەنگان تا وایان لە ڕۆمەکان کرد ئەو ئاش و لە شوێنی خۆیان دەسوڕانەوە و لەو ڕۆژەی یەرمووکدا هیچ لە ڕۆم بەدی نەدەکرا جگە لە مۆمی پژاو و قاچی بڕاو و دەستی قرتاو بە حەواوە.[1]

* لای ڕاستی ڕۆمەکان دایان بەسەر چەپی موسوڵمانەکاندا:

لای ڕاستی ڕۆمەکان بە فەرماندەیی (قەناتیر) دایان بەسەر لای چەپی سوپای موسوڵمانەکاندا کە هۆزی کەنانە و قەیس و خەشم و جوزام و قوضاعە و عاملە و غسان بوون، لە جێگەی خۆیان هەڵیان کەندن و ناو جەرگەی سوپای ئیسلام دەرکەوت لە لای چەپەوە، ڕۆمەکان شوێنی موسوڵمانە هەڵاتووەکان کەوتن، تا کردنیانەوە بە ناو سەربازگەی موسوڵماناندا و ئافرەتە موسوڵمانەکانیش چوون بەرەو ڕوویان بە بەرد و بە کۆڵەکەی چادرەکان لێیان دەدان و پێیان دەوتن: کوا سەربەرزی ئیسلام و دایکان و خێزانەکان؟ بۆ کوێ ڕادەکەن و ئێمە بەجێ دەهێڵن بۆ عەلوجەکان؟ هەر کە ئاوا سەرزەنشتیان دەکردن، شەرم دەیگرتن و دەگەڕانەوە ناو جەنگەکە و خەڵکێکی زۆریان کوشت لە ڕۆم، لەم قۆناغەشدا سەعیدی کوڕی زەید (ﷺ) شەهید بوو.

جارێکی تر لای چەپی ڕۆمەکان ویستیان هەوڵی کەلێن تێکردنی لای ڕاستی موسوڵمانەکان دا و زۆریان هێنا بۆ عەمری کوڕی عاص و سەربازەکانی لە جێی خۆیان هەڵیانکەندن، بە هیوای چوار دەورە گرتن لێیان، بەڵام عەمر و سەربازەکانی خۆگرانە نەجوڵان لە جێی خۆیان ڕاوەستان و شێرانە لەگەڵیان جەنگان، بەڵام هێزی ڕۆم توانیان بێنە ناو سەربازگەی موسوڵمانەکان، ئافرەتە موسوڵمانەکانیش لەسەر گرتەکە هاتنە خوارەوە و دەیاندا لە دەم و چاوی ئەو پیاوانەی کە هەڵاتبوون، کچەکەی عەمر وتی: دەك خوا ڕووی ئەو کەسە ڕەش بکات کە هەڵدێت و خێزان و خانەوادەی بە جێ دەهێڵێت، ئافرەتانی تریش دەیانووت:

---

[1] البداية والنهاية (١٢/٧).

ئێوه هاوسەرمان نین ئەگەر بەرگریمان لێ نەکەن، ئا بەو جۆرە ورە و غیرەت گەڕایەوە بۆ موسوڵمانەکان و دووبارە گەڕانەوە ناو گۆڕەپانی جەنگەکە و دایان بەسەر ڕۆمەکاندا و ئەو شوێنانەی گرتبوویان لێیان سەندنەوە.[1]

* دەروو لێکرانەوە و لەناوبردنی پیادەکانی شام:

خالید و ئەسپ سوارەکانی هاوڕێی هێرشیان برد بۆ لای ڕاستی سوپای ڕۆم کە دابوویان بەسەر لای چەپی موسوڵمانەکاندا و گەڕاندنیانەوە ناوجەرگە، لەم هێرشەدا شەشە هەزار کەسیان لە ڕۆمەکان کوشت و خالیدیش وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەمە دوایین توانا و خۆگریەکیان بوو کە نواندیان، من تکام وایە کە خوای گەورە پشتیانتان پێ پیشان بدات، پاشان خۆی و (١٠٠) جەنگاوەر کە هێزی (١٠٠) هەزار جەنگاوەریان تێدا بوو بەریان بە هێرشەکە گرت و هەر هەموویانیان تەفر و تونا کرد، موسوڵمانەکانیش کەوتنە سەریان و هیچ شتێك ڕێگریان نەبوو.[2]

لای ڕاستی موسوڵمانەکان هەستان بە داخستنی کون و کەلەبەرەکان لێیان و لە نێوان دۆڵی یەرمووك و ڕووباری (زەرقاء)دا گەمارۆ دران و شەڕ گەرم بوو، موسوڵمانەکانیش نەبەردیەکی چاکیان نواند، توانیان سوارەکانی ڕۆمەکان لە پیادەکانیان جیا بکەنەوە و کەوتنە سەریان و دوایان کەوتن هەتا هێزیان لێ بڕین، بۆیە سوارەکانی ڕۆم چاوە چاوی ئەوەیان بوو کونێك بدۆزنەوە لێوەی ڕابکەن.

خالید (ﷺ) فەرمانیدا بە عەمری کوڕی عاص (ﷺ) کە مەجالیان بۆ باکتەوە تا لێوەی هەڵبێن و ئەویش وای کرد، سوارەکانی ڕۆم هەڵاتن و ئیتر پیادەکانیان کەس نەمان بیانپارێزێت و ناچار هاتنە ناو چاڵەکانیان کە خۆیان بەستبوویەوە بە زنجیر پێکەوە و وەك دیواریان لێ هاتبوو بەڵام بە ڕووخاوی.

موسوڵمانەکانیش هاتن بۆیان و لە ناو چاڵەکانیاندا بە تاریکایی شەو و زۆربەیان لە کەوتنە ناو دۆڵەکەوە و کە پیاوێکیان دەکەوتە خوارەوە کۆمەڵێکی زۆر بە خۆوە دەخستە

---

[1] العمليات التعرضية والدفاعية عند المسلمين (لا: ١٧٤).

[2] ترتيب وترهيب البداية والنهاية (لا: ١٧١).

خوارەوە بە هۆی ئەوەی بە زنجیر خۆیان بەستبووەوە پێکەوە، موسوڵمانەکان لەم قۆناغەدا نزیکەی (١٢٠) هەزاریان لە ڕۆمەکان کوشت و ئەوانی تریش بەرەو وووو یان بەرەو (فەحل) یان بەرەو دیمەشق هەڵاتن.[١]

لەو ڕۆژەدا (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان (ﷺ)) خۆی گرت و جەنگێکی دژواری ئەنجامدا، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە باوکی دای بە لایدا و پێی وت: کوڕی خۆم لە خواترسان و ئارامیت تێدا بێت، چونکە کەس نیە لە موسوڵمانان لەم دۆڵەدا شایانی جەنگ کردن نەبێت، چجای تۆ و وێنەی تۆ ئەوانەی دۆستی موسوڵمانانن؟ ئەوانە دوو جار شایەنە بە ئارام بن و ئامۆژگاری خەڵکیش بکەن، دەی کوڕی خۆم لە خوا بترسە و با کەس لە تۆ زیاتر حەز لە پاداشت و ئارام گرتنی ناو گۆڕەپانی جەنگ و غیرەت تر بەرامبەر دوژمانی نەبێت، یەزیدیش وتی: وا دەکەم انشاء الله، ئەو ڕۆژە جەنگێکی ناهەمواری دەکرد لە ناوجەرگەی شەڕەکەدا (ﷺ).[٢]

سەعیدی کوڕی موسیب (ﷺ) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کش و ماتی و بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر ڕۆژی یەرمووکدا و دەنگێکمان بیست کە لە هەموو سەربازگەکە دەنگی دایەوە و دەیووت: ئەی سەرکەوتنی خوایی نزیك بەرەوە، خۆتان بگرن، خۆتان بگرن ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، دەڵێت: کاتێك ڕوانیمان دەبینین ئەبو سوفیانە و لە ژێر ئاڵاکەی یەزیدی کوڕیدایە،[٣] نوێژی بە موسوڵمانان دواخست تا بە تەواوی سەرکەوتن هاتە کایەوە.[٤]

خالیدیش ئەو شەوەی لە چادرەکەی (تەزاروق)دا بردە سەر کە برای هەرقل بوو لەگەڵ هەڵاتووەکاندا ئەویش هەڵهات و ئەو ڕۆمانەی دەکوشت کە بە نزیکیاندا تێدەپەڕین و تەزاروقیش کوژرا و سی چادری هەبوو بە فەرش و ئاوریشم ڕازابوویەوە و لە بەیانیەکەیدا هەموو غەنیمە و دەسکەوتەکانیان کۆکردەوە، ژمارەی شەهیدانی موسوڵمانان (٣) هەزار کەس

---

[١] العمليات التعرضية والدفاعية (لا: ١٧٥).

[٢] فتوح البلدان للازدي (لا: ٢٢٨).

[٣] ترتيب وترهيب البداية والنهاية (لا: ١٧٣).

[٤] هەمان سەرچاوە.

بوو، کە پێکهاتبوون لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و سەرۆك هۆزەکان و ناوداران، لەوانەی کە شەهید بوون لەوێ: عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل و عەمری کوڕی، سەلەمەی کوڕی هشام، عەمری کوڕی سەعید، ئەبانی کوڕی سەعید و کەسانی تریش.[1]

بەڵام ژمارەی کوژراوەکانی ڕۆم (١٢٠) هەزار کەس بوون و هەشتا هەزاریان بە کۆت و زنجیر خۆیان بەستبوویەوە پێکەوە و چل هەزاریشیان کەوتنە ناو دۆڵەکەوە و ملیان شکا.[2]

موسوڵمانەکان زۆر دڵخۆش بوون بەم سەرکەوتنە مەزنە، بەڵام مردنی ئەبو بەکری صدیق (رضي الله عنه)، لەم کاتەدا ئەو خۆشیەی لێ تێکدان، کە زۆر زۆر غەمبار و دڵتەنگ بوون، خوای گەورەیش بە عومەری فاروق شوێنەکەی بۆ پڕکردنەوە خوا لە هەموویان ڕازی بێت.[3]

نامەبەر هەواڵی کۆچی دوایی صدیقی هێنا لە کاتێکدا موسوڵمانەکان خەریکی پاکتاوکردنی ناوچەکە بوون لە ڕۆمەکان، بۆیە خالید (رضي الله عنه) ئەو هەواڵەی بە نهێنی هێشتەوە تا پشت سارد بوونەوە و سستی ڕوو لە سوپای موسوڵمانان نەکات، کاتێك هەموو شتێك تەواو بوو مەسەلەکەی بۆ موسوڵمانان باس کرد.

عمر کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی کرد بە فەرماندەی گشتی سوپای ئیسلام لە شام لە باتی خالیدی کوڕی وەلید، خالیدیش بە سنگی فراوانەوە فەرمانەکەی وەرگرت.[4]

سەرەخۆشی خۆی لە موسوڵمانان کرد و وتی: سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە ئەبو بەکری گەڕاندەوە بۆ لای خۆی، کە هەردەم لە عومەر خۆشترم ویستووە و سوپاسی ئەو خوایەش دەکەم کە عومەری کرد بە گەورەمان کە لە ئەبو بەکر زیاتر داخ لە دڵ بووم بۆی و بەڵام خۆی وا لێکرد خۆشم ویست، ئەبو عوبەیدەیشی داناوە بە سەرکردەی گشتی سوپای شام.

---

١ العمليات التعرضية والدفاعية (لا: ١٧٩).

٢ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣ البداية والنهاية (١٤/٧).

٤ هەمان سەرچاوە (١٦/٧).

هەرقل تووشی پەژارەیەکی زۆر گەورە بوو بەهۆی شکانی سوپاکەی لە یەرمووك و کاتێك سەربازە هەڵاتووەکانی گەیشتنە ئینتاکیە و هەرقل پێی وتن: لەناو چن، هەواڵم بدەنێ دەربارەی ئەوانەی جەنگتان لەگەڵدا دەکەن، ئایا هەروەك ئێوە مرۆڤ نین؟ وتیان: بەڵێ.

وتی: ئێوە زۆرن یان ئەوان؟ وتیان: ئێمە، لە هەموو جەنگێکدا چەند قاتی ئەوان بووین، وتی: دەی هۆی چیە ئێوە تێك دەشکێن؟

یەکێك لە شێخە بە ساڵاچووەکانیان وتی: لەبەر ئەوەیە کە ئەوان کە بە شەو نوێژ دەکەن و بە ڕۆژ بە ڕۆژوون و پەیمان دەبەنە سەر، فەرمان بە چاکە دەدەن و بەرگری لە خراپە دەکەن و لە ناو یەکدا بە ویژدانن، بەڵام ئێمە مەی دەخۆینەوە و شەرواڵ پیسی دەکەین و حەرام دەخۆین و پەیمان شکێنی دەکەین و تووڕە دەبین و ستەم دەکەین، فەرمان بە خراپە دەدەین کە خوا لە خۆمان دەڕەنجێنین، خراپە لەسەر زەوی بڵاو دەکەینەوە، هەرقل وتی: تۆ ڕاستت وت لەگەڵمدا.[1]

## جێ باسی سێیەم

### گرنگترین سوود و وانە و ئامۆژگاری

### یەکەم: سیاسەتەکانی دەرەوە لە دەوڵەتی صدیقدا (رضي الله عنه):

لە سەردەمی جێنشینی صدیقدا (رضي الله عنه) نەخشەی کۆمەڵێك ئامانج کێشرا لە بواری سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، گرنگترینیان:

١- چاندنی تۆوی هەیبەتی دەوڵەتی ئیسلامی لە دڵی گەلانی دەرەوەدا:

أ- گەیشتنی هەواڵی سەرکەوتنەکانی موسوڵمانان بەسەر پاشگەزبووواندا لە لایەن خوای گەورەوە بوویە هۆی ئەوەی ئاژاوەکان دابمرکێنەوە و دەوڵەت جێگیر ببێتەوە، ئەم هەواڵانەش دەگەیشتە وڵاتانی دراوسێ و بە تایبەت ئەو وڵاتانەی کە چاودێری هەواڵەکانی دەوڵەتی ئیسلامیان دەکرد و بە دوای جموجۆڵەکانیدا دەڕۆیشتن و بە جۆرێك سەیریان دەکرد کە مەترسیەکی تازەیە و ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، لەو کاتەشدا فارسەکان و ڕۆمەکان توانای زانینی هەواڵەکانیان هەبوو، کاتێك هەواڵی پاشگەز بووان

---

[1] البداية والنهاية (٧/١٥-١٦).

و جێگیر بوونی ئیسلامیان بیست بۆیان ڕوون بوویەوە کە بونیانی ئەم دەوڵەتە نوێیە زۆر لەوە بەهێزترە کە بە پیلان بتوانرێت لە ناو ببرێت و سەردەکەوێت بەسەر هەموو گرێ و کۆسپ و تەنگەشەیەکدا، ئەمەش کاریگەری هەبوو لە بڵاوبوونەوەی هەیبەتی دەوڵەتی ئیسلامی.

ب- سوپاکەی ئوسامە: سوپای ئوسامەیش کە صدیق (ﷺ) خستیە ڕێ، کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر بڵاوبوونەوەی هەیبەتی دەوڵەتی ئیسلامی، ڕۆمەکان هەواڵی ئەو سوپایەیان دەپرسی کە هات ئازایانە لەگەڵیان جەنگا و سەرکەوتووانە گەڕایەوە پایەختی دەوڵەتەکەی خۆی، دڵیان بوو بە یەك پارچە ترس و بیم و تا وای لێ کە هەرقل کرد لە ترساندا دەیان هەزار سەرباز لە سنووری دەوڵەتەکەیاندا بڵاو بکەنەوە، ئەو هەواڵانەشی دەگەیشتنە لای کیسرا و هەیبەتی ئەم دەوڵەتە نوێیە دەچوویە دڵی ئەو دەوڵەتانە.[1]

٢- بەردەوام بوون لەسەر کاروانی جیهاد کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردبوو:

ئەبو بەکر (ﷺ) هەستا بە بەرپاکردنی جیهاد بۆ پارێزگاری بانگەواز و گەیاندنی بە خەڵکی، سوپای ئامادە کرد و خەڵکی هاندا بۆ ڕۆیشتن بۆ جیهاد لە پێناوی خوا و بڵاوکردنەوەی بانگەوازی هەق و لادانی ئەو دیکتاتۆرانەی کە ڕەدی ئەو بانگکردنەی پێغەمبەری خوایان دەدایەوە کە بۆ لای ئیسلام بانگی کردبوون، بڕیاری ئەوەیان دابوو نەهێڵن نور و ڕووناکیەکەی بگاتە گەلەکەیان.

خەڵکی هاتن بەدەم ئەم بانگەوازە خۆشەویستەوە لە لایان کە جیهاد بوو، ئەمەش لە ژێر بەیداخی سەرکردەکانی هاوەڵان خاوەنی سەروەری و نەبەردی لە پێناوی خوادا، وێنەی خالید و ئەبو عوبەیدە و عەمر و شەرحەبیل و یەزید — خوایان لێ ڕازی بێت — و جێنشین خۆی هەڵبژاردبوون بە وردی و دنیا دیدەیی و سەلیقەی سەربازی خۆی کە ڕۆژان فێری کردبوو، ئەو بار و زروفە ناهەموارانەش بە هێزی کردبوون بەسەر ئومەتی ئیسلامدا، ئەمەش وای لێکرد گرنگی بەم لایەنە بدات و بە جوانترین شێوەی هەڵبژاردن سەرکردەکانی دیاری بکات و بە بڕیارە

---

[1] تاريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٥٩-٢٦٠).

جوانەکانی خۆی ڕێگەیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە و بە هۆیەوە وڵاتی شام و عێراق ڕزگار بکەن لە کەمترین کاتدا و بە کەترین تێچوون.[1]

٣- دادپەروەری لە نێوان گەلە ئازادکراوەکان و نەرمی نواندن بەرامبەریان:

سیاسەتی دەرەوەی صدیق (رضي الله عنه) بە جۆرێك بوو کە ئەوپەڕی دادپەروەری و نەرم و نیانی بنوێنرێت لەگەڵ ئەو گەلانەی ڕزگار دەکرێن و دڵنیا بکرێنەوە لەسەر و ماڵ و سامانیان، تا خەڵکی هەست بەو جیاوازیە گەورەیە بکەن کە لە نێوان دەوڵەتی هەق و دەوڵەتی ناڕەوادا هەیە، تا خەڵکی وا نەزانن کە ستەمکارێکی خوێن ڕێژ و دڵڕەق لابراوە و دەسەڵاتێکی لەو ڕەقتر یان وەك ئەو هاتۆتە شوێنی.

هەمیشە ئامۆژگاری فەرماندەکانی دەکرد بە سۆز و نەرم و نیان و دادپەروەری و هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ خەڵکی، چونکە دەوڵەتی شکاو و سەرکز پێویستی بە سۆز و بەزەیی هەیە، لەو هۆکارانە دوورکەوێتەوە کە غیرەتی تۆڵە و جەنگیان تیا دروست دەکاتەوە.

سوپای ڕزگاری موسوڵمانەکان بە ئەوپەڕی تواناوە هەوڵی پاراستنی خودی مرۆڤ و ئاوەدانی ئەو گەلانە بپارێزن، ئەو گەلانەش چاویان هەڵتەقی بە ئەم گەلە ڕزگارکەرە ڕەوشت بەرزەدا و مرۆڤایەتی ڕاستەقینە، و تەرازووی شەریعەتی ئیسلام بەبێ جیاوازی حوکمی ئەو گەلانەی دەکرد، ڕووناکی ئیسلام بڵاوبوویەوە و دڵەکانی بۆ خۆی کەمەندکێش کرد، گەلان پێشبڕکێیان دەکرد لە بەرەو ڕوو چوون و چوونە ژێر ئاڵایەوە.

بەڵام سەربازە عەجەمیەکان لە فارس و ڕۆم بیاندایە بەسەر ناوچەیەکدا پان و پلیقیان دەکردەوە، ترس و بیم و شکاندنی ئابڕوو بەشێ بوون لەو ئازارانەی گەلە داگیرکراوەکان پێوەی ناڵاندوویانە، بەرە لە دوای بەرە، ئەو هەواڵە ترس و بیمانەیان بۆ نەوەکانیان باس دەکرد کە ئەو سەربازانە بەسەریان هێنابوون.

بەڵام هەر کە خۆری ئیسلام لەو گەلانە هەڵهات و سەربازەکانی پێیان نایە ناو ئەو وڵاتانەوە، دادپەروەریان بینی باڵی کێشا بەسەریاندا، ئەو مرۆڤایەتیەیان بۆ گێڕانەوە کە زوڵم و

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو (لا: ٦٠).

ستەم لێی زەوت کردبوون، ئەبو بەکر (ﷺ) زۆر سوور بوو لەسەر ئەم سیاسەتە بەردەوام پارێزگاری لێ دەکرد، هەر هەڵەیەك یان لاریەك ڕووی بدایە ڕاستی دەکردەوە.

ئەوەتا بەیهەقی دەگێڕێتەوە کە فارس و ڕۆمەکان ئەگەر سەربکەوتنایە بەسەر دوژمنێکیاندا هەموو شتێکی ئەو ئەمیرە یان پادشایە بۆ خۆیان حەڵاڵ دەکرد و سەری مرۆڤەکانیان بە دیاری دەبردەوە بۆ پاشاکانیان وەك مژدەی سەرکەوتن و شانازیان پێوە دەکرد، بۆیە عەمری کوڕی عاص و شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە سەری سەرکردەیەکی ڕۆم بە ناوی (بنان) یان نارد بۆ ئەبو بەکری صدیق بە عەقبەی کوڕی عامردا و کاتێك خستیە بەر دەستی خەلیفە، ئەبو بەکر زۆری پێ ناخۆش بوو، عەقبەیش پێی وت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ئەوانیش وامان لێ دەکەن ئەویش فەرمووی: «أفيستنان بفارس والروم؟! لا يحمل الي رأس انما يكفي الكتاب والخبر»، واتا: بۆ ئەو دوانە — عەمر و شەرحەبیل — شوێن پێی فارس و ڕۆم دەکەون؟! کەس جارێکی تر سەری کەسم بۆ نەهێنێتەوە، بەڵکو بە نامە و هەواڵ ئاگادارم بکەنەوە لە مەسەلەکان.[1]

٤- زۆر لێ نەکردنی گەلە ڕزگارکراوەکان:

لە نیشانە دیارەکانی سیاسەتی صدیق (ﷺ) بۆ کاروباری دەرەوە زۆر لێ نەکردنی دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی ڕزگار دەکرێن بۆ وەرگرتنی ئاینی ئیسلام، ئەویش لەمەدا لەو ئایەتە پیرۆزەی قورئانەوە وەریگرتووە کە دەفەرموێت: ﴿أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾﴾ (یونس: ٩٩)، واتا: ئایا تۆ دەتەوێت زۆر لە خەڵکی بکەیت تا ببنە موسوڵمان؟!.

موسوڵمانەکان مەبەستیان لەو جەنگە ڕزگاری خوازیانە لادانی سەرۆکە سەرکەشەکان و کردنەوەی دەرگا لەسەر گەلەکانیان، تا بە چاوی خۆیان ڕووناکی ئیسلام ببینن، مادەم گەلەکان ڕزگار کرابن لە زوڵم و ستەم ئیتر دەبێت وازیان لێ بهێنرێت و سەربەست بن لە

[1] تاريخ الخلفاء للسيوطي.

هەڵبژاردنی بیروباوەردا، تا ئەو کاتە بەردەوام دەبن لەسەر پارێزگاری کردن لە پەیمانەکانیان بەرامبەر موسوڵمانان، کە ئەمەش خاڵەکانیەتی:

١- سەرانەی ساڵانە — جزیە — بدەن بە سەرشۆڕی.

٢- لە هەندێ شوێنی گرنگدا دانەنرێن وەك ڕیزەکانی سوپا.

٣- نابێت دژی ئیسلام بن لە بەندایەتی و شەریعەت و جێبەجێ کردنی ئەرکە ئاینیەکانیان.

٤- ئەگەر بیانەوێت ئاینەکەی خۆیان بگۆڕن دەبێت تەنها بن بە موسوڵمان، دەوڵەتی ئیسلامی بە وردی زەمینە ساز دەکات بۆ تەفسیر کردن و ڕوون کردنەوەی ئیسلام بە کردەوە و بە وتە، بە جۆرێك وایان لێ بکات قەناعەت بکەن بە هەڵبژاردنی بەرنامەی ئیسلام، تا موسوڵمان بوونەکەیان بە خۆشی خۆیان بێت، چونکە بیروباوەڕ بە زۆر ناسەپێت.[1]

٢- لە نیشانەکانی داڕشتنی نەخشەی جەنگی لە لای صدیق (ﷺ):

ئەو کەسەی دەربارەی جەنگە ڕزگاریخوازیەکانی صدیق بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە کۆمەڵێك نەخشەی سەربازی هەبووە و لەسەری کاری کردووە، وە چۆن ئەم جێنشینە مەزنە سونەتی بەکارهێنانی هۆکاری بەکارهێنانەوە، چۆن ئەم نەخشە و پلانانەی بوونە هۆی سەرکەوتن و زاڵ بوون لە لایەن خواوە بۆ موسوڵمانان لەم نەخشانە:

١- زۆر نەچوونە ناو قوڵایی خاکی دوژمنەوە تا دێنە ژێر سایەی ئیسلام:

صدیق (ﷺ) زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە سوپای ئیسلام زۆر پێشڕەوی نەکات لە ناو خاکی دوژمناندا، ئەمەش زۆر بەڕوونی لە بەرەکانی جەنگی وڵاتی شام و عێرقدا بەدی دەکرا، لە ڕزگارکردنی عێراقدا، صدیق داوای کرد لە (خالید و عیاض) کە لە باکوور و باشوورەوە بچنە ناوەوە و لە نامەکەیدا هاتووە و دەڵێت: کامتان پێشتر بگاتە حیرە ئەو ئەمیر دەبێت بەسەر ئەوی ترەوە، ئەگەر (انشاء الله) لە حیرە یەکتان گرت و چەکدارەکانی نێوان عەرەب و فارستان بڵاوە پێکرد، لەوە دڵنیا بوون کە موسوڵمانان لە دواوە کەس نایەت بۆیان،

---

[1] تاریخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٦٣).

با یەکێکتان لە حیرە بێنێتەوە و ئەوی ترتان بدات بەسەر دوژمناندا، لەگەڵیان بجەنگن تا چی لە دەستتاندا هەیە لێیان بسەنن، داوای کۆمەکی لە خودا بکەن و لێی بترسن، پاداشتی ڕۆژی دواییتان بوێت نەك دونیا، ئەو کاتە هەردووکتان دەست دەکەوێت و بە تەمای دونیا مەبن، چونکە لە هەردووکی دەبن، خۆتان بپارێزن لەوەی کە خوا ترساندووتانی لێی وەك گوناه کردن و تەوبە نەکردن، دەخیلتان بم لەسەر گوناه بەردەوام مەبن و تەوبەکردن دوا مەخەن.[1]

ئەم نامەیە بەڵگەی ئەوەیە کە تا ئاستێکی زۆر بەرز صدیق خاوەنی پلانی سەربازی ورد بووە، پێش ئەوەش هاوکاری خوای گەورە بۆ سەرگرتنی نەخشەکانی، نەخشەکانی کت و مت دەگونجا لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی سوپای ئیسلامدا لە کاتی جێبەجێ کردنیاندا لە لایەن سوپاوە، وە کەسێکی زۆر زیرەك و شارەزا بە وردەکاریەکانی جەنگ شایەتی زیرەکی نەخشەی سەربازی بۆ دەدات کە خالیدی کوڕی وەلیدە، ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە هەستا بە جێبەجێکردنی کارەکانی (عیاض) لە ڕزگارکردنی باکووری عێراقدا و لە کەربەلا لایدا و موسوڵمانەکان سکاڵای ئەوەیان دەکرد کە مێش هەراسانی کردوون لەوێ، ئەویش بە عبدالله کوڕی وثیمەی وت:

«ئارام بگرە من دەمەوێت ئەو چەکدارانەی کە بە (عیاض) وتراوە هەڵیان بکەنێت لەو ناوچانە و لە شوێنەکانیان عەرەب نیشتەجێ بکەم، تا سوپای ئیسلام دڵنیا بن لە پشتەوەیان و لە دواوە کەس بۆیان نەیەت، عەرەب ئەمینن و فات و فیتیان نیە، خەلیفە بەم کارە فەرمانی پێداوین، ڕاو بۆچوونەکانی ئەویش ڕزگاری ئومەتی ئیسلامی پێوەیە».[2]

(مثنی کوڕی حارثة)یش لەسەر ئەم نەخشەیە دەڕۆیشت لە عێراقدا، ئەم سەرکردە ناوازەیە دەڵێت: «بجەنگن لەگەڵ فارسەکاندا لەسەر سنوورەکانیان و ئەو شوێنانەی لە عەرەبەوە نزیکن و لە ناو جەرگەی خاکی خۆیاندا هەرگیز شەڕیان لەگەڵدا نەکەن، چونکە ئەگەر خوای گەورە سەری خستن ئەوە چی لە دوایانەوەیە بۆ ئێوەیە، ئەگەر لە کاتێکیشدا شکان دەتوانن

---

[1] تاريخ الطبري (٤/١٨٨-١٨٩).

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو (٤/١٨٩).

بگەنە کۆمەڵێکی ترتان، ئەو کاتە زۆر شارەزایی خاکەکیان دەبن و دووبارە دەدەنەوە بە سەریاندا خوا سەرتان دەخات)).[1]

لە جەنگەکانی شامدا، لە پشتەوە بیابان پارێزگاری لە موسوڵمانان دەکرد، و موسوڵمانەکان بە تەواوی لەوە دڵنیا دەبوون لە ڕۆمەکان نەیان دەتوانی لە دواوە کتوپڕی بدەن بە سەریاندا، یان هەوڵ بدەن شار و ناوچەکانی ڕاست و چەپیان لێ بگرن، هەموو کەلێنەکانیان بە جەنگاوەر پڕکردبوویەوە، ئەم بنەمایەش زۆر بە جوانی کاری پێ دەکرا و زۆر لەسەری سوور بوون.[2]

٢- خۆسازدان و هێز کۆکردنەوە:

کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) خەلافەتی گرتە دەست نەخشەی ئامادەکاری سەربازی دانا، لەوانە: خۆسازدان و کۆکردنەوەی هێز، خەڵکی بانگ کردن بۆ جەنگ کردن دژی هەڵگەڕاوەکان و پاش ئەوەش هەموویانی خستەکار بۆ جەنگە ڕزگاریخوازیەکان و نامە بە ناوبانگەی نارد بۆ خەڵکی یەمەن.[3]

٣- ڕێکخستنی کرداری کۆمەکی کردنی سوپاکان:

کاتێك کە جەنگەکانی بەرەی ڕۆژهەڵات پێشکەوت و هەردوو سەرکردەی بەرەکە (خالید و مثنی) بۆیان دەرکەوت کۆمەکی بەشەریان پێویستە، چونکە بەو سەربازانەی لەبەر دەستیاندا بوو نەیاندەتوانی ئیدارەی جەنگەکە بدەن، بۆ ئەو مەبەستە نامەیان بۆ ئەبو بەکر نووسی و داوای سەربازی زیاتریان لێ کرد، ئەویش پێی وتن: هەموو ئەوانەی جەنگاون دژی هەڵگەڕاوەکان و ئەوانەشی لەسەر ئیسلام ڕاوەستاو بوون سازیان بکەن بۆ جەنگ و نەدەن بەسەر هیچ کەسێکدا لە پاشگەزبوان تا ڕاوبۆچوونی منتان پێ دەگات،[4] تا دوا ساتەکانی ژیانیشی هەر بەردەوام کۆمەکی بەرەکانی جەنگی عێراق و شامی کردووە.

---

[1] الاصابة في تميز الصحابة (٥/٥٦٨).

[2] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٣١).

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو(لا: ٣٣٢).

[4] تأريخ الطبري (١٦٣/٤).

٤- دیاریکردنی ئامانج لە جەنگکردندا:

ئەم خاڵە لە نەخشەی هەموو جەنگە ئیسلامیەکاندا لە کاتی ڕزگارکردنی وڵاتاندا کاری پێکراوە و هەمووان بۆ ئەو ئامانجە هەوڵیان داوە، صدیق (ﷺ) بە جۆرێك لەم مسەلەیە پلانی دارِشت کە هەموو تاکێکی جەنگاوەر بزانێت کە ئامانج لە جەنگی موسوڵمان دژی بێ باوەڕان، بڵاوکردنەوەی ئیسلام و گەیاندنیەتی بە گەلان، ئەمەش بە لابردنی دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان کە هەوڵی ئەوە دەدەن گەلەکانیان بێبەش بکەن لەم خێرە گەورەیە، هەموو سەرکردەکان لە پێش دەست پێکردنی جەنگەکەوە دوژمنەکانیان بانگ دەکرد بۆ یەکێك لەم سێ شتە: یان موسوڵمان بوون، یان سەرانە – جزیە – دان، یان جەنگ.[1]

٥- گرنگی زیاتر بە گۆڕەپانە جەنگیەکان:

صدیق (ﷺ) هەر بە خۆی سەرکردایەتی یەکەمین جەنگی دژی پاشگەزبوەکانی کرد، سوپای ڕێکخست دژیان، بەڵام گۆڕەپانەکانی تری جەنگەکانی پشت گوێ نەخست، ئوسامەی نارد بۆ شام، (مثنی) بۆ عێراق، ساڵی یەکەمی تەرخان کرد بۆ لەناوبردنی هەڵگەڕانەوە، کاتێك بە تەواوی دوورگەی عەرەبی کردەوە یەك، وای لێهات بگونجێت کە ببێتە بنکەیەکی بەهێز و دڵنیا، پاشان قورسایی هاوکاریەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ شام و عێراق، کاتێك بەرەکانی شام پێویستیان بە کۆمەکی هەبوو، ئەوە هەموو کۆمەکیەکانی بۆ شام تەرخان کرد و خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ ئەوێ و (مثنی) لە عێراق هێشتەوە.

٦- قۆرخ کردنی گۆڕەپانی جەنگ:

کاتێك صدیق دەستی کرد بە سازکردنی هێز بۆ جەنگ دژی ڕۆم و فارسەکان، خالیدی کوڕی سەعیدی نارد بۆ تەبووك بە کارێك بۆ ناوچەکانی پڕ لە سوپا و خاڵی بەرەو پێش چوون، فەرمانی پێدا کە لە دواوە پارێزەر بێت بۆ سوپاکەی ئیسلام، کاتێك سەرنەکەوت لەم کارەیدا و ڕۆیشت، عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهل هەستا بەم کارە.[2]

٧- برەودان بە شێوازەکانی جەنگ:

---

[1] **تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٣٢).**

[2] **هەمان سەرچاوەی (لا: ٣٣٤).**

کاتێك صدیق (ﷺ) بیستی وا سوپای ڕۆم پێشڕەوی دەکەن و خەڵکی دیمەشقیش پەیوەندیان پێوە کردوون نامەی نووسی بۆ ئەبو عوبەیدە و پێی وت: ئەسپ سوارەکانت لە ناو لادێ و باخچەکاندا بڵاو بکەرەوە، نارەحەتیان بکە بە وەرگرتنی خواردن و کۆمەکی لێیان و گەمارۆی شارەکان مەدەن تا فەرمانی منتان بۆ دێت.[1]

کاتێك کۆمەکی سەربازی باشی بۆ نارد و پێی وت: ئەگەر ناچاریان کردی، بڕۆ بۆیان و پشت ببەستە بە خوا، چونکە یەك کۆمەکیان بۆ نایەت ئێمەش وێنەی ئەوەت بۆ دەنێرین.[2]

٨- بێ وەیی هێڵی پەیوەندیەکانی لەگەڵ سەرکردەکان:

هێڵەکانی پەیوەندی نێوان صدیق و سەرکردەی سوپاکان زۆر ڕێك و پێك بوو، بە جۆرێك هەموو نامەکان بە دڵنیاییەوە لە سەرکردەکانەوە دەگەیشتن، وەڵامی خەلیفەیش بە خێراییەکی وا دوژمن نەتوانێت گورزی لە ناکاو بدات لە موسوڵمانان و هەروەك بە نهێنییەکی تەواوەوە دەگەیشتە دەستیان، ئا بەو جۆرە نەخشەی سەربازی لە لای موسوڵمانەکان زۆر بە وردی بەڕێوە چوو، کە ئەوەش هۆیەك بوو لە هۆیەکانی تێکشکاندنی دوژمنان و سەرکەوتن بە کۆمەکیێ خوا بەسەریاندا لە هەموو جەنگە ڕزگاریخوازەکان.[3]

٩- زیرەکی و وریایی خەلیفە:

هەموو جەنگە ئیسلامیەکان سەرەتای (ڕزگاریخوازیەکان) وای دەگەیاند کە عەقڵێکی زۆر زیرەك لە پشتیەوە بەڕێوەی دەبات، خاوەنی زیرەکی و دووربینی، پێشبینی و فیراسەت بوو، کە ئەویش صدیق بوو (ﷺ) و ئەوەشی یارمەتی دابوو ببێتە خاوەنی ئەم نەخشە سەربازیە، هاوڕێیەتی بەردەوامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پەروەردەکردنی لەسەر دەستی ئەو، زانیاری هەمە لایەنەی دەسکەوتن شارەزایی لێوە فێر بوو.

دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە جوانترین شێوە هەستا بە ئیش و کاری جێنشینی، بوو بە خاوەنی بینایی تیژ و ئامۆژگاریە بە نرخەکانی سوپای دەوڵەمەند دەکردن لە

---

[1] **العمليات التعرضية (لا: ١٤٨).**

[2] **تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٣٤).**

[3] **هەمان سەرچاوەی پێشوو و لاپەڕە.**

کاتی پێویستدا کۆمەکی گونجاوی دەگەیاندە موسوڵمانەکان و فریایان دەکەوتن وره بەرزی و بەرەو پێش چوونی تیا دروست دەکرن.[1]

## سێیەم: مافەکانی خوا و سەرکردەکان و سەربازەکان لە وەسیەت نامەکەی صدیقدا (ﷺ):

١- مافەکانی خوا:

هەمیشە مافەکانی خوا وەبیر سەرکردە و سەربازەکانی دەهێنایەوە، وەك خۆگری بەرامبەر دوژمنان و جەنگ کردن لەگەڵیان بە دڵسۆزی و جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکان و سستی نەنواندن و خۆشویستنی سەرخستنی ئاینەکەی خوا.

أ- خۆگری بەامبەر دوژمنان:

کاتێك عەکریمەی کوڕی ئەبو جەهلی خستە ڕێ بۆ عومان لە ئامۆژگاریەکانی بۆی: (لە خوا بترسە و وەگەر گەیشتی بە دوژمنان خۆگربە)[2]، هەروەك صدیق بە هشامی کوڕی عەتبەی کوڕی ئەبی وەقاسیشی وت – لە کاتێکدا ناردی بۆ کۆمەکی سەربازەکانی شام «ئەگەر گەیشتی بە دوژمنەکانت خۆت بگرە و خۆگریش لە چوار دەورتدا دروست بکە و بزانە کە تۆ یەك هەنگاو نانێیت، یەك شت خەرج ناکەیت، تینووت نابێت و ناڕەحەت نابیت لە پێناوی خوادا، مەگەر کردەوەیەکی چاکت بۆ دەنووسرێت و چونکە خوا چاکەی چاکەکاران ون ناکات، انّ الله لايضيع أجر المحسنين».[3]

ب- مەبەستیان سەرخستنی ئاینی خوا بێت:

لە وتەی صدیق (ﷺ) دا هاتووە کاتێك خالیدی نارد بۆ شام شتێکی وای پێ وت کە مانایەکی ئا لەم جۆرە بگەیەنێت، بە جۆرێك کە پێی وت: تێبکۆشێت و دڵسۆزی بنوێنێت بۆ تاقە خوا، لەبەر خۆدا نازین و شانازی کردن و کەشخەیی خۆی بپارێزێت، چونکە ئەوانە بەشی نەفسن و کردەوەکان گەندەڵ دەکەن، دەیدەنەوە بە ناو چاوی خاوەنەکانیاندا، هەروەك

---

[1] تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٣٣٦).

[2] عيون الاخبار (١٨٨/١).

[3] فتوح الشام – للازدي – (لا: ٣٤).

لەوەش ئاگاداری کردەوە کە بە کردەوە باشەکانی خۆی ناز نەکات بەسەر خوادا چونکە خوا شایانە ناز بەسەر بەندەکانیدا، سەرکەوتن بەس لە لای ئەوەوەیە.[1]

ئەمە هەندێکە لەو نامەیە: (....... ئەی ئەبا سولەیمان با نیەتت بۆ خوا یەکلابێت، کارەکانت بە تەواوی ئەنجام بدە خوایش بۆت تەواو دەکات، لە خۆبایی بوون نەیەت بە لاتدا ئەو کاتە دەدۆڕێیت و سەرشۆڕ دەبیت، نەکەی بە کردەوەتدا بنازیت و هەموو ناز و منەتێك بۆ خوا جوانە و ئەویش خاوەنی پاداشتە.[2]

ج- جێبەجێکردنی ڕاسپاردە:

لە ئاراستەکانی صدیق (ﷺ) بۆ فەرماندە و سەربازەکانی زۆر بە ڕوونی ئەوەبوو کە دەست پاك بن لە ئاست ئەو غەنیمە و دەستکەوتانەی دەستیان دەکەوێت، کەسیان هیچی لێ نەشارێتەوە، بەڵکو هەمووی لە شوێنی خۆی کۆبکەنەوە بە یەکسانی جێبەجێ بکرێت بەسەر ئەوانەدا کە بەشداری جەنگەکەیان کردووە و یەك دەست بوون بەرامبەر دوژمنان،[3] بۆ نموونە ڕوو دەکاتە یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان و بەرگری لێ دەکات کە غەنیمە بشارێتەوە.[4]

ئەمەش هەندێك بوو لەو ئامۆژگاریانەی صدیق (ﷺ) سەبارەت بە مافەکانی خوا لەسەر فەرماندە و سەربازەکان.

٢- مافەکانی سەرکردە:

ئەمەش هەندێك لەو مافانەی لەسەر سەربازەکانە بەرامبەر سەرکردەکانیان و دەبێت جێبەجێی بکات:

**١- پابەند بوون بە گوێڕایەڵی کردنیەوە:**

---

[1] **تأريخ الدعوة الى الاسلام (لا: ٢٩٥).**

[2] **تأريخ الطبري (٢٠٢/٤).**

[3] **الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية (٤٦/١).**

[4] **تأريخ الخلفاء – سيوطي (لا: ١٢١).**

یەکەمین شت و لە یەکەمین ڕۆژی جێنشینیەکەیدا کە وەبیر موسـولْمانانی هێنایـەوە ئەوەبوو کە پڕاوپڕ لەسەر ڕێـڕەوی پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەڕۆم و هـەروەها گوێڕایـەڵی وەبـیر خستنەوە و وتی: بزانن ئەوەی بۆ خواتان کردووە لە کردەوەی چاك گوێڕایەڵیەکە پێی هەستابن.

لەسەر سەرکردەکانی دادەنا هەندێکیان گوێڕایەڵی هەندێکیان بن لەوانە ئەوەی کە (مثنی کوڕی حارثة شیبانی) وت: ئەوا خالیدی کوڕی وەلیدم بۆ ناردی بۆ زەوی عێراق و خۆت و هۆزەکەت بچنە پێشوازی و پشتی بگرن و سەرپێچی نەکەن و دژی ڕاوبۆچوونەکانی نەوەستنەوە، ئەو لەو کەسانەیە کە خوای - تبارك و تعالی — لە قورئانەکەیدا وەسفی دەکات و دەفەرمووێت: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا﴾ (الفتح: ٢٩).

هەروەها ڕووی کردە ئەو سوپایانەی بۆ ڕزگارکردنی شام ئامادەباش بوون و پێی وتن گوێڕایەڵ بن و پێی وتن: ئەی خەڵکینە، ئێوە خوای گەورە بەشداری کردوون بە ئیسلام و ڕێزداری کردوون بە — جیهاد — و بەم ئیسلامەوە لە هەموو ئاینەکانی تری بە چاکتر داناون، دەی بەندەکانی خوا خۆتان ساز بدەن بۆ غەزوەی ڕۆم لە شام، من کۆمەڵێك سەرکردەتان بە سەرەوە دادەنێم و کۆمەڵێك بەشتان لێ دروست دەکەم، گوێڕایەڵی پەروەردگارتان بکەن و سەرپێچی فەرمانەکانتان مەکەن، نیەتتان، خواردنتان، خواردنەوەتان، پاك بکەنەوە، چونکە خوا لەگەڵ لە خواترسان و چاکەکاراندایە.[1]

وەڵامی ئەوانیش بۆی بەم جۆرە بوو: تۆ گەورەمانیت و ئێمەش ژێردەستەی تۆین، وە لە تۆوەیە فەرمان، وە لە ئێمەوەیە جێبەجێکردن، ئێمە گوێڕایەڵی تۆین و بۆ هەر کوێمان دەنێریت دەچین.[2]

---

[1] فتوح الشام — للازدي — (لا: ٦٠-٦١).

[2] **الفتوح إبن اعثم** (٨٢/١).

کاتێك خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بە سەرکردەی سوپای ڕزگاریخوازی وڵاتی شام، داوای لە ئەبو عوبەیدە کرد گوێڕایەڵی خالید بێت تا سوود لە شارەزایی و لێهاتوویی سەربازیەکەی ببێت.

کاتێك خالیدیش گەیشتە شام و داوای لە ئەبو عوبەیدە کرد کە جواب بنێرێت بۆ هەموو بەیداخەکان تا گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بن، ئەبو عوبەیدەیش (ضحاکی کوڕی قەیس)ی بانگ کرد و ڕای سپارد بەو کارە هەستێت، (ضحاك)یش چووە ناو خەڵکەکە و داوای لێ کردن گوێڕایەڵی سەرکردەی نوێ بن — خالیدی کوڕی وەلید — هەموویان پێکەوە وەڵامیان دایەوە کە گوێڕایەڵی دەکەین.[1]

٢- کارەکانیان بگێڕنەوە بۆ لای ئەو:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾﴾ (النساء: ٨٣).

لەم ئایەتەدا خوای گەورە لەسەر ژێر دەستەکانی پێویست کردووە کە کارەکانیان بگێڕنەوە بۆ لای فەرماندەکانیان کە ئەوەش دەبێتە هۆی زانایی بوون و وەدەست هێنانی ڕای دروست، ئەگەر شتێکی شاراوەیان بۆ دەرکەوت با وەك پێشنیار پێشکەشی بکەن و بۆی ڕوون بکەنەوە و پێکەوە ڕاوێژ بکەن تا دەگەڕێنەوە سەر ڕێگای ڕاست.[2]

لە سەردەمی خەلافەتی صدیقدا (ﷺ) دەبینین داوای لە فەرماندە و سەرکردەکانی سوپاکانی کە بۆ شامی دەناردن و دەڵێت: «ئەی ئەبا عوبەیدە، ئەی معاذ، ئەی شەرحەبیل،

---

[1] **فتوح الشام، ازدي (لا: ١٨٩).**

[2] **الاحکام السلطانية، ماوردي، (لا: ٤٨).**

ئەی یەزید، ئێوە پارێزگاری ئەم ئاینەن و کاری ئەم سوپایانەم بە ئێوە سپاردووە، پێکەوە تێبکۆشن و مەسەلەکان تاوتوێ بکەن و یەك دەست بن بۆ دوژمنانتان».[1]

پاشان فەرمانی پێدان ئاگایان لە ماڵی سەربازەکان بێت و دڵسۆزی بنوێنن، یەك ڕا بن و دژی ڕا و بۆچوونی یەکتر نەبن، پاشان زیاتر لەسەری ڕۆیشت و وتی: ئەگەر گەیشتنە ئەوێ و ڕووبەڕووی دوژمنانتان بوونەوە، ئەبو عوبەیدە سەرکردەتانە، ئەگەر ئەبو عوبەیدەتان نەبینی ئەوە زەیدی کوڕی ئەبو سەفیان ئەمیرتانە،[2] تا بەم شێوەیە جینشینی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕێوەبردنی سەربازەگەکانی دەدایە دەستی یەکێك لە سەرکردەکانی تا لە ناو یەکدا ناکۆکی ڕوویان تێ نەکات، ئەمەی دووپات کردەوە کاتێك بە (عەمری کوڕی عاص)ی وت: تۆ یەکێ لە سەرکردەکانمان دەبیت لەوێ، ئەگەر جەنگ کۆی کردنەوە پێکەوە ئەوە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح فەرماندەتان بێت.[3]

لەگەڵ سەرکردەکانی عێراقیشدا بە هەمان شێوەی کرد، ئەوەبوو بە (مثنی کوڕی حارثة)ی شەیبانی وت: من خالیدی کوڕی وەلیدم بۆ ناردی بۆ وڵاتی عێراق.... تا ئەو لەوێ بوو ئەو ئەمیرتان بێت، ئەگەر لەوێ نەما تۆ وەك جاران ئەمیر دەبیت و (والسلام عليك).[4]

ج- پەلەکردن لە گوێڕایەڵی کردنیدا:

لە جەنگی پاشگەز بوەکاندا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) نامەی نارد بۆ خالیدی کوڕی وەلید و فەرمانی پێدا بڕوات بۆ جەنگی موسەیلەمەی درۆزن، خالیدیش هاوڕێ سەربازەکانی خۆی کۆکردەوە و نامەکەی بۆ خوێندەوە و پرسیاری لێ کردن سەبارەت بە بۆچوونیان و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: بۆچوون بۆچوونی خۆتە و کەس نیە لە ناوماندا پێچەوانەی ڕای تۆ بێت.[5]

---

[1] **فتوح الشام للازدي (لا: ٧).**

[2] **هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.**

[3] **فتوح الشام (لا: ٧).**

[4] **الوثائق الاسياسية – حميد الله، (لا: ٣٧١).**

[5] **فتوح ابن اعثم، (١/٢٩).**

هەروەك صديق (ﷺ) نامەی نارد بۆ خالید کە لە عێراق بوو و فەرمانی پێدا کە نیوەی سوپا بەرێت و بڕوات بۆ شام و نیوەکەی تری بۆ مثنی بەجێ بهێڵێن و پێی وت: ئازایەکت جیاکردەوە ئازایەکیش جێ بهێڵە بۆ مثنی، خالیدیش بە خێرایی فەرمانی صدیقی جێبەجێ کرد و سەربازەکانی کرد بە دوو لەتەوە.[1]

نامەیشی نارد بۆ عەمری کوڕی عاص، تا لە (قضاعة)وە بەرەو (یەرمووك) بڕوات، ئەویش وای کرد، ئەبو عوبەیدە و زەیدی نارد بۆ وڵاتی شام و فەرمانی پێدان کە زۆر نەچنە قوڵایی خاکی دوژمنەوە تا بە ئاسانی لە دواوە نەیەن بۆیان، هەموو سەرکردە و سەربازەکانی زۆر بە وردی و بە جوانی فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکرد.[2]

د- بەرامبەر نەوەستانی لە شێوازی دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا:

ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لەسەر هەمان ڕێڕەوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڕۆیشت لە دابەشکردنی غەنیمەکاندا، پاش تەواو بوونی جەنگی یەمامە و سەرکەوتنی موسوڵمانان خالید (ﷺ) نامەی نارد بۆ صدیق باسی سەرکەوتنی مەزنی خوایی بۆ کرد و باسی ئەو دەستکەوتە زۆرەیشی بۆ کرد کە لەو جەنگەدا دەستیان کەوت بوو.

ئەبوبەکریش(ﷺ) نامەی بۆ نووسی لەوبارەیەوە:"هەموو غەنیمە و دەستکەوتی و کەنیزەك و ئەو شتانەیشی بەبێ شەڕ دەستان کەوتووە کۆی بکەرەوە و ١/٥ی لێ جیابکەرەوە و بینێرە بۆ مەدینە تا دابەشی بکەین بەسەر موسڵمانانی ئێرەدا و ئەوی تریشی بدە بەو کەسانەی کە دەیان کەوێت و السلام.

هەموو سەرکردەکانی تری ئەبوبەکریش بەهەمان شێوەیان دەکرد لە ئیدارەی سەربازگە و دابەش کردنی دەستکەوتەکان، هیچ یەکێ لە سەربازەکانیشنارەزایی یەکیان دەرنەبڕیوە و داوای یەکسانیان نەکردووە.[3]

٣-مافەکانی سەربازەکان:

---

[1] الادارة العسكرية في الدولة الاسلامية، سليام ال كمال، (١١٢/١).

[2] هەمان سەرچاوە (١١٣/١).

[3] الاداره العسكريه فى الدوله الاسلاميه(١٢٠/١). (٢)هەمان سەرچاوە(١٣١/١)

صدیق‌ﷺ له ڕێگای نامه و وه‌سیه‌تنامه‌كانی یه‌وه كه بۆ فه‌رمانده‌كانی ده‌نارد تیایاندا به‌جوانی مافه‌كانی سه‌ربازی دیاری ده‌كرد *وه‌ك مانۆڕِ ئه‌نجامـدان و پرسـینه‌وه لـه حـال و گوزه‌رانیـان و نه‌رمی و به‌زه‌یی به‌رامبه‌ریان له كاتی ڕێ و ڕۆشتنیاندا و دانـانی سـه‌رلق و سـه‌رپه‌ل تیایانـدا، هه‌لبژاردنی شوێنی چاك وه‌ك سه‌ربازگه بۆ جه‌نگاندنیان له‌گه‌ڵ دوژمنان، ئاماده‌كردنی خواردن و ئالف، ئاگاداربوون له هه‌نگاوه‌كانی دوژمنه‌كانیان له ڕێگه‌ی سـیخوری متمانه‌چـێ كـراوه‌وه تـا سه‌ربازه‌كان بێ وه‌ی بن، هانیان بدات له‌سه‌ر به‌ره‌نگاری، پاداشتی خوا و پله‌ی به‌رزی شه‌هیدییان بخاته‌وه بیر، ڕاوێژپێ كردنی ژێرمه‌نده‌كانیان، خه‌ریكیان بكات به جێ بـه‌جێ كردنـی مافـه‌كانی خوا به‌سه‌ریانه‌وه، به‌رگریان لێ بكات لـه هه‌رشـتێ كـه لـه جیهادیـان بكـات وه‌ك بازرگـانی و كشتوكاڵی و هتد...،

ئه‌مه‌ش ئه‌و خالانه‌ی سه‌ره‌وه‌یه‌كه‌مێك به درێژی:

١-مـانۆڕپێ كردنیان و به‌سه‌ركردنه‌وه‌ی حال وگوزه‌رانیان:

پێشتر ئه‌وه‌مان دی كه چۆن پاشگه‌زبوه‌كان ده‌وری شـاری مه‌دینـه‌یان دا، ئه‌بوبـه‌كریش هـه‌موو خه‌لكه‌كه‌ی له مزگه‌وت كۆكرده‌وه و پێی ووتن: زه‌وی بێ باوه‌ڕبۆته‌وه و نوێنه‌ریان ئێوه‌یان به‌كه‌م هاتۆته به‌رچاو، ئێوه‌ش نازانن شه‌و ده‌ده‌ن به‌سه‌رتاندا یان ڕۆژ؟ ئه‌وه‌تا تا ناوچـه‌ی بـه‌دیر لێتـان نزیك بوونه‌ته‌وه.

هاوه‌ڵه‌كانی خۆیان كۆكرده‌وه و له چوارده‌وری شاردا پاسه‌وانی لێ دیارده‌كرد[1].

كاتێ سوپای ڕزگاركردنی شام له مه‌دینه كۆبونه‌وه وئه‌بوبه‌كر سواری ولاخه‌كه‌ی بـوو بـوو چـووه ناویان و سه‌یری ده‌كردن، ڕووی وه‌ك گوڵ گه‌شبوویه‌وه كه ده‌یبیـنین وا زه‌ویـان پڕكـردووه، ڕیـزی ده‌كردن و ئامۆژگاری ده‌كردن، لیواكانی لێ دروست ده‌كردن و تا دوو میلیش له‌گه‌ڵیان ڕۆیشت و ڕه‌وانه‌ی ده‌كردن[2].

٢-بـه بـه‌زه‌یی بێـت به‌رامبـه‌ریان لـه كـاتی ڕێ و ڕۆشـتنیاندا: ئه‌بوبـه‌كر ﷺ لـه جـه‌نگی پاشگه‌زبوواندا ئامۆژگاری خالیدی كوڕی وه‌لیدی ده‌كرد كه به‌به‌زه‌یی بێ به‌رامبه‌ر سـه‌ربازه‌كانی

---

[1] تاريخ الطبری(٤/٦٤).

[2] الادارة العسكرية فی الدولة الاسلامية(١/١٣٦).

هاوڕێی، دەلیلی ڕێگەیان بۆ پەیدابکات[١]. هەموو سەرکردەکانی جەنگی پاشگەزبوانی بەوە ئامۆژگاری دەکرد[٢]، لە ڕزگارکردنی عێراقدا و کاتێ ڕێککەوتنامەی لەگەڵ ئەلیسدا ئیمزاکرد، یەکێ لە مەرجەکانی لەسەریان دانا ئەوەبوو کە دەلیلی موسڵمانەکان بن لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی فارسدا، چونکە ئەوان خەڵکی ناوچەکەن و شارەزای ڕێگەوبانەکانی ولاتەکەیانن.

کاتێك داوای لە خالید کرد عێراق بەجێ بهێڵێ و بەرەو شام بڕوات بۆ کۆمەکی و هاوکاری سوپای ئیسلام لەوێ، خالید دەلیلەکانی ڕێگای کۆکردەوە و سەبارەت بە ڕێگەوبانەکانی بیابان ڕاوێژی پێکردن، چونکە ئەو ڕێگایە خێراتربوو بۆ زوتر فریاکەوتنی براکانیان، پاشان رافیع ی کوڕی عومەیری گائی کرد بە دەلیلی ڕێگا[٣]، هەروەها صدیق کاتێ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیانی نارد بۆ وڵاتی شام پێی ووت: ئەگەر بەڕێ کەوتیت نەخۆت تەنگاو بکە و نەهاوەڵەکانت لە ڕێ و ڕۆشتندا[٤]، کاتێك یەزید بە خێرایی سەربازەکانی دەبرد بەڕێوە، یەکێ لە ناویاندا ئامۆژگاریەکەی صدیقی بیرخستنەوە کە پێی وتبوو لە ڕێگادا بەزەیی بە سەربازەکانیدا بێتەوە[٥].

هەروەك ئامۆژگاری عەمری کوڕی عاصی کرد کاتێ ناردی بۆ فەلەستین و پێی ووت: ببە بە باوك بۆ ئەوانەی لەگەڵتدان و لە ڕۆیشتندا ڕەحمیان پێ بکە چونکە لاوازیان تێدایە[٦].

هەموو سەرکردەکانی سوپای ئیسلام پابەندی ئەم ئامۆژگاریانەی جێنشینی پێغەمبەری خوا بوونﷺ، وایان لێهاتبوو هەرگیز سەربازەکانیان نەدەبرد بۆ شەڕ تا دەلیلی ڕێگەیان نەبوایە بۆ پیشاندانی ڕێگای کورت و پڕ لە ئاو و گژو گیا، تا بتوانن بەردەوام بن لەسەر ڕۆیشتن بەرەو دوژمنەکانیان، بەبێ هێز لەدەست دان و ورە دابەزاندن[٧]،

---

[١] هەمان سەرچاوە(١٤٧/١)

[٢] تأثر الاناقة/ قلقشندی(١٤٠/٣).

[٣] الادارة العسكرية فی الدولة الاسلامیة(١٤٨/١).

[٤] فتوح الشام واقدی (٢٣/١)

[٥] هەمان سەرچاوە

[٦] هەمان سەرچاوە(١٣٠/١)

[٧] الادارة العسكرية فی الدولة الاسلامیة(١٤٩/١)

٣-بۆ هەموو لایەنێکی سەربازگە دروشمی خۆیان هەبێت:

لە ناردنی سوپای ئوسامەد ابۆ جەنگ لە دژی ڕۆمەکاندا دروشمی موسڵمانان ئەمە بوو(یا منصور أمت)[1]، لەجەنگی هەڵگەڕاوەکاندا، کاتێ خالیدی کوڕی وەلید بەمەستی جەنگ لەگەڵ موسەیلەمەی درۆزندا کەوتە ڕێ و دروشمیشیان (یا محمداه) (یا محمداه) بوو[2].

دروشمی تەنوخ لە ڕزگارکردنی عێراقدا ئەمە بوو (یا آل عباد اللـه)[3]، لە ڕزگارکردنی شامدا دروشمی موسڵمانان لە جەنگی یەرموکدا هەرهۆزەو دروشمێکی جیاواز لە دروشمی هۆزەکانی تری هەبوو، لە کاتی جەنگەکاندا یەکتریان پێ دەناسیەوە، دروشمی ئەبوعوبەیدە (أمت أمت) و دروشمی خالید و ئەوانەی لەگەڵی بوون (یا حزب الله) و دروشمی هۆزی عەبەس (یا لعبس) بوو، دروشمی یەمەنیەکان (یا أنصارالله) بوو. دروشمی حومەیر (الفتح) بوو، دروشمی دارم وسکاسك (الصبر الصبر) بوو، دروشمی بەنی حوراد(یا نصر الله انزل) بوو، ئەمانە دیاترین دروشمەکانی جەنگی یەرموك بووز

٤-بەسەریانکاتەوە و بیانپشکنێت لە کاتی ڕێ وڕۆیشتندا:

لە ئامۆژگاریەکانی صدیقﷺ بۆ سەرکردەکانی کاتێ کە دەیناردن بۆ جەنگ لەگەڵ پاشگەزبوواندا پێی دەوتن: نەهێڵن هاوڕێکانتان پەلەپەل بکەن و کارەکان خراپ بکەن و کەس نەئاخنێتە ناویان تا بەجوانی نەزانێ کێن، تا نەبن بەسیخور بەسەریانەوە و لەو ڕێگەیەوە لە موسڵمانان نەدرێت[4].

هەروەك فەرمانی دەرکردبوو بۆ سەرکردەکانی کە بە هیچ جۆرێك پشت بە پاشگەزبووەکان نەبەستێت و بەشداری جەنگیان نەکات، ئەمەش لەبەر سەلامەتی و پارێزگاری لە گیانی سەربازە موسڵمانەکان.

---

[1] الطبقات لابن سعد(٢/١٩١)

[2] )التاريخ الطبرى(٤/١١١).

[3] الادارة العسكرية فى الدولة الاسلامية(١/١٧٤)

[4] تأريخ الطبرى(٤/٧١,٧٢)

هەروەها ئامۆژگاری سەرکردەکانی ڕزگارکردنی ولاتی شامی دەکرد بەوەی زۆر وریا بن و ئاگادارین و بە هۆش بن بەرامبەر نێرراوەکانی دوژمنان، تا کەلێن و خالّە لاوازەکانی سوپای ئیسلامیان بۆ دەرنەکەوێت، پێی دەووتن کە نەهێلن تێکەلی سەربازەکان بن و قسەیان لەگەلدا نەکەن، وەك ئەوەی کە بە یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیانی ووت: ئەگەر نوێنەری دوژمنەکانت هاتەلات، تا بۆت دەکرێت ڕێزی زۆریان بگرە چونکە ئەوە یەکەمین هەوالّتە بۆیان، کەم بیانهێلەوە تا کاتێ دەڕۆن شتێکی زۆر دەربارەی تۆ نەزانن، مەهێلە کەسێك لە سەربازەکانت قسەیان لەگەلدا بکات، تۆ هەموو قسەیەکیان لەگەلدابکە، نهێنی و ئاشکرات تێکەل مەکە تا کارەکانت تێك نەچێت لێت[1].

٥- دانانی پاسەوان بە بەردەوامی بە دەوری سەربازگەدا یان لە کاتی ڕۆیشتندا:

ئەمەش بە ئاشکرا لەوەدا بەدی دەکرێت کە صدیقﷺ بە دەوری مەدینەدا پاسەوانی دانا، لە ترسی ئەوەی نەبادا هۆزە هەلگەڕاوەکان بدەن بە سەریاندا، کاتێ خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ جەنگ دژی هەلگەڕاوەکان، ئاگاداری کردەوە لەوەی بەشەو نەدەن بەسەرتاندا چونکە یەکێکە لە ئارەزوەکانی عەرەب[2]. هەروەها ئامۆژگاری فەرماندەکانی سوپاکانی ولّاتی شامی کرد بەوەی بەردەوام پاسەوان دەربکەن و سەربازگە بپارێزن لە دوژمنان، هەستن بە بەسەرکردنەوە و پشکنینی کتوپڕی پاسەوانەکان، تا بۆی دەربکەوێت بەجوانی و وەك پێویست هەلدەستن بە ئەرکەکانیان، وەك ئەوەی بە یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانی ووت: پاسەوان زۆر دابنێ و لە کتوپڕیدا سەریان لێبدە بە شەو ورۆژ[3].

بە عەمری کوڕی عاصی ووت: فەرمان بدە بە سەربازەکانت پاسەوان دەربکەن و خۆیشت بەسەریانەوەبە، بەشەودا لەناو سەربازەکانی هاوڕێدا بمێنەوە و لەگەلیان زۆر دابنیشە، هەموو سەرکردەکانی تریشی بەم شێوەیەیان دەکرد و بەردەوام پاسەوانیان دەردەکرد[4].

---

[1] مروج الذهب، مسعودی (٢/٣٠٩)

[2] نهاية الارب، نویری (٨/١٦٨).

[3] مروج الذهب (٢/٣٠٩.

[4] الادارة العسكرية فى الدولة الاسلامية(١/١٩٦)

٦-دابینکردنی خواردن بۆ سەربازەکان و ئالیفیش بۆ وڵاخەکان:

ئەبوبەکرﷺ حوشتر و ئەسپ و چەکی دەکڕی و و لە پێناوی خوادا دەیبەخشی[١]، ئەمە جگە لەو هەموو دەست کەوتانەی لە کاتی جەنگەکاندا دەستیان دەکەوت، کاتێ داوای کرد لە خالیدی کوڕی وەلید کە بەرەو جەنگی هەلگەڕاوەکان بەڕێ بکەوێت یەکێ لە ئامۆژگاریەکانی بۆی ئەوەبوو کە گەیشتە ناو خاکی دوژمنان، نەڕوات بۆیان تا خواردن و ئازوقەی چاکی پێ نەبێت[٢]، یەکێ لە مەرجەکانی هەموو سەرکردەکانی صدیق لەکاتی ڕێکەوتن لەگەڵ ناوچەیەکدا ئەوەبوو ﷺ کە خواردن و خزمەت گوزاری پێشکەش بە سوپای ئیسلام بکەن هەرکاتێ بەناوچەکەیاندا تێپەڕین[٣]، ئەبوبەکریش ﷺ ڕێگای دا بە سوپاکانی کە ئەگەر برسیان بوو مەڕ و ماڵاتی دوژمنان سەربڕن و بیخۆن[٤]،

٧-تەرتیب کردنی سەربازەکان لە شێوەی ڕیزبەندی دا:

سەرکردەکانی صدیق ﷺ شێوەی ڕیزبەندیان بەکاردەهێنا لە جەنگەکانیاندا، ڕیزەکانیش کەم و زیادیان پێدەکرێت بە پێی پێویستی ئەو کاتە و ویستی سەرکردەی گۆڕەپانی جەنگەکە[٥].

بەلام خالیدی کوڕی وەلید لە جەنگی یەرموکدا یاسایەکی نوێی هێنایە کایەوە کە یاسایی (کردۆس) بوو، یاسای کردۆسیش بریتی بوو لە کۆمەلێ سەرباز لە یەك ڕیزدا دەوەستن و لەیەکتری جیانین و لە کردۆسێکی تر ماوەیەکی باش دورن لەیەك کاری بلاوبونەوە ئاسان دەکات. لە وتەی خالید بۆ سەربازەکانی دەربارەی دروست کردنی (کەرادیس) پێی وتن: دوژمنەکانتان زۆر و بێ ژمارەن، هیچ خۆسازدانێکیش وەك کردۆس نیە بۆ ئەوەی بە ژمارەیەکی زۆر بکەوینە بەرچاویان[٦].

---

[١] هەمان سەرچاوە

[٢] نهاية الارب، نويرى (٦/١٦٨).

[٣] الخراج، أبى يوسف (٢٨٩)

[٤] نهاية الارب، نويرى (٦/١٦٨).

[٥] الادارة العسكرية فى الدولة الاسلامية(١/٢٣١)

[٦] تاريخ الطبرى (٤/٢١٥)

ناوەندی سوپاکەی -قلب المعركه- کرد بە کۆمەڵێ کردۆسەوە و ئەبوعوبەیدەی کرد بە سەرۆکیان و کەرادیسی دەستەی ڕاستیش عەمری کوڕی عاص-ﷺ- و شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە-ﷺ کەرادیسی دەستە چەپیش یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان.

بەو چەشنە، سوپاکەی کرد بە (٣٦ تا ٤٠) کردۆس بە جۆرێ سازێ کردن کە پێشتر عەرەب شتی وایان نەکردبوو، کارە ئیداریەکانی لە نێوان سەرکردەکاندا دابەش کردبوو[1]،

پاش جەنگی یەرموك ئەم یاسایە کاری پێدەکرا لە هەموو جەنگە ڕزگاری خوارزەکانی ئیسلامدا[2].

٨-هاندانیان لەسەر جەنگ:

ئەبوبەکر-ﷺ- موسڵمانانی هاندەدا بۆ جەنگ و جیهاد و ورەی بەرزدەکردنەوە بەجۆرێ کە هەست بکەن سەردەکەوتن، هۆکارەکانی سەرکەوتنی دەخستەوە بیریان، تا دوژمنانیان لەبەر چاو بچوك ببوایەتەوە و پێیان بوێرانایە، چونکە وێران سەرکەوتنی لەگەڵدایە[3]. هانی خالیدی کوڕی وەلیدی دا بۆ جەنگ و پێی ووت: بە تەمای مردن بە ژیانت پێ دەبەخشرێت[4]، کاتێ سەرکردەکانی ئامادەکرد بۆ ڕزگارکردنی وڵاتی شام هانی دەدان و لەسەر جیهاد و سوری دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن و دوعای خێر و سەرکەوتنی بۆ دەکردن[5].

٩-پاداشتی خوایی و گەورەیی پلەی شەهیدیان بخاتەوە یاد:

یەکێ لەو ووتانەی کە صدیق-ﷺ- ڕووبەڕوی ئەو سوپایانەی کرد کە بۆ ڕزگارکردنی شام بەڕێکەوتبوون ئەمە بوو: لە قورئانەکەی خوای پەروەردگاردا ئەوەندە باسی پاداشتی جیهاد و گەورەیی جەنگاوەر کراوە، شایەنە بۆ موسڵمان دەستی خۆی بخات ئەوەش ئەو بازرگانیەیە کە

---

[1] [3] هەمان سەرچاوە و لاپەڕە

[2] الادارة العسكرية فى الدولة الاسلامية (٢٣٢/١)

[3] الادارة العسكرية فى الدولة الاسلامية (٢٣٢/٢)

[4] هەمان سەرچاوە لا (٢٣٨/١).

[5] فتوح الشام ، نتزدىلا ٧-١٥

پیشانی خەڵکی دەدات و لە نزمی و سەرشۆڕی ڕزگاریان دەکات و ڕێـزداری دنیـا و ئاخیرەتیـان دەکات[1].

١٠-پرس و ڕاوێژ بە ژێرمەندەکانیان بکات:

ئەبوبەکر-ﷺ- لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا ئەمەی کرد، لە ڕزگارکردنی شام وزۆرێك لە مەسەلە فیقهیەکان و پێشهاتە نوێیەکانی ناو کۆمەڵگەی موسڵمان دا داوای لە سەرکردەکان دەکـرد کـە ڕای جوان دەربڕن و ئامۆژگاری پێشکەش بکەن[2].

صدیق-ﷺ - لەم بوارەدا سەرمەشق بوو، لە جەنگی پاشگەزبواندا عەمری کوڕی عاص ی بانگ کرد و پێی ووت: ئەی عەمر تۆ جێگای پرس و ڕای قوڕەیشیەکان بوویت دەی تولەیحە پاگەنـدەی پێغەمبەرایەتی دەکات، تۆ دەڵێی چی؟ پاش ئەم ڕاوێژەش پێی ووت: سەبارەت بە خالیدی کوڕی وەلید چی دەڵێیت چی؟ کە دەیکەم بە سەرکردەی سوپاکە؟ لە وەڵامدا عەمر ووتـی: سیاسـەتی جەنگی لە لایە و تا مردن هەوڵی سەرکەوتن دەدات، ئارامی و نەرمی پشیلە و پەلاماری شێری لەخۆدا کۆکردۆتەوە، ئاڵای بدەرە دەست[3].

خالیدیش هەستا بەکاری خۆی، دەستی کرد بە ڕاوێژ بەوانەی لەگەڵیدابوون، بۆ داڕشـتنی پلانـی جەنگ لەگەڵ پاشگەزبواندا و پاشان سەرکردایەتی گشتی ئاگاداردەکرد لە دوا بڕیاریان[4].

هەروەها کاتێ ئەبوبەکری صدیقﷺ ویستی دژی ڕۆمەکان بجەنگێت و سـوپا ئامادەبکـات بـۆ ڕزگارکردنی شام، ڕاوێژی بە کۆمەڵێك لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەرﷺ کـرد و ڕای وەرگـرتن لـە مەسەلەی خۆسازدان و دەرچوون بۆ ئەو مەبەستە[5].لە ئامۆژگاریـەکانی بـۆ سـەرکردەکانی شـام ئەوەبوو کە ڕاوێژ بە سەربازەکان بکەن، وەك ئەوەی بە یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانی ووت: ئەمـە (ڕەبیعـەی کـوڕی عـامر)ە و کـە پیـاوێکی مـەزن و جێگـای شـانازیە و خـۆت دەزانیـت چ

---

[1] تاریخ الطبری (٢٠٨/٤)

[2] العملیات التعرضیة و الدفاعیة عند المسلیمن لا ١٤٣

[3] تأریخ الیعقوبی(١٢٩/٢).

[4] الفتوح ،ابن أعثم (٢٩/١).

[5] هەمان سەرچاوە(٨١/١).

جەنگاوەرێکە؟! من کردومە بەیەکێ لە سەربازەکانت و تۆم کردووە بە فەرماندەی ئەوسا تـۆیش ڕاوێژی پێ بکە و دژی بۆچونەکانی مەوەستە. یەزیدیش ووتی : وەی بەسەر چاو.

ئەبوبەکریەردەوام بوو لەسەر ووتەکانی و پێی ووت: ئەگەر بەڕێ کەوتیت نەخۆت و نەهاوڕێکانت تـەنگاو مەکـە لـە ڕێگـەدا، لـە هۆزەکـەت تـوڕە مەبـە و ڕاویـژیان پـێ بکـە و دادپـەروەری بەکاربهێنە[1].

هەروەك پێی ووت: ئەگەر ڕاوێژت پێکردن، بەڕاسـتی مەسـەلەکە بخـەرە ڕوو، بەڕاسـتی ڕاوێـژی جوانت دەخەنە بەردەست، هیچ لە ڕاوێژ پێکراو مەشارەوە ئەو کـات لـە خۆتـەوە کاربکـەیت[2].

ئەمە و شتانێکی تریش کە بە یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیانی ووت، سەبارەت بە ڕاوێژو پابەندبوون پێیەوە، ئامۆژگاری سەرکردەکانی شامی کرد کە لەو ڕێـرەوە لانـەدەن، سەرکردەکانیـشی جـوان گوێڕایەلیان دەکرد و ڕاوێژیان بە سوپاکانیان دەکرد.

ئەوەتا ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح (ﷺ) ڕوودەکاتە عەمری کوڕی عاص و پێی دەڵێت : ئەی عـەمر لەوانەیە بەشداریکردنی تۆ لە یەك ڕۆژی جەنگدا بە ڕاوێژ و ئامادەیی بۆچونەکانت، سەرەنجامەکەی پـیرۆزی و سـەرکەوتن بێـت بـۆ موسـلمانان، خـۆ مـن یـەکێکم لـە ئێـوە-بـا فەرمانده‌شتان بم- خۆ لە ئێوەش چاکتر نیم و بەبێ ئێوە هیچ کارێك ناکەم و هەموو ڕاوبۆچـونی خۆتم پێ بڵێ چونکە من بێ ئەوانە نامکرێت[3].

ئەمە و سەرەڕای ئەوەی کە سەرکردە مەیدانیەکان لەهەر مەسەلەیەکدا کە نەیان زانیایە چی بکەن خێرا پرس و ڕایان بە سەرکردەی گشتی دەکرد و تا لە بواری پلانـی سـەربازی و جـێ بەجێ کردن و هەڵس وکەوت لەگەڵ دیلەکاندا شارەزابونایە[4]،

١١-ئەو مافانەی کە خوا دایناوە بیدات بەسەریاندا:

---

[1] فتوح الشام ، واقدی (٢٢/١)

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[3] تأریخ فتوح الشم، ئتزدی لا ٥١-٨٤.

[4] الادارة العسکریة فی الدولة الاسلامیة (٢٧٢/١)

ئەبوبەکرئامۆژگاری سەرکردەکانی بەوە دەکرد، کاتێ عەمری کوڕی عاص ی نارد بۆ فەلەستین پێی ووت: لە نهێنی و ئاشکراتدا لە خوا بترسە و لە چۆلەوانیشدا شەرمی لێ بکە، چونکە ئەو لە کارەکانتدا ئەتبینێت، خۆ دەبینی چۆن تۆم پێش خستووە لە کەسانێك کە پێشینەیان لە تۆ زیاترە و ڕێزیشیان گەورەترە، دەی تۆش پیاوی ئاخیرەت بەو کارەکانت لەبەر خوا بێت و ببە بە باوك بۆ هەموو ئەوانەی لە ژێر دەستت دان. نوێژەکان، پاشان نوێژەکان لە کاتی خۆیدا بانگەکان بدەن و هیچ نوێژێ مەکەن تا بانگێکی بۆ نەدەن کە هەموو سەربازگەکە بیبیستێ، ئەگەر ڕووبەڕوی دوژمنانت بویتەوە لە خوا بترسە، پێویستی بکە لەسەر هاوڕێکانت قورئان خوێندنی بەردەوام و مەهێلە باسی سەردەمی نەفامی و هەرشتێ پەیوەندی پێوەی هەیە بیکەن، چونکە ئەوە دوژمنایەتی دروست دەکات لە نێوانیاندا، لە خۆشی و شادی دونیا خۆت بەرزبگرە تا تۆش دەگەیتە ئەو کەسانەی پێشتر گەڕانەوەبۆ لای خودا و ببە لەو سەرکردانەی لە قورئاندا وەسفی چاکەیان کراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ٧٣﴾ (الانبياء: ٧٣)

واتە: کردمانن جۆرە سەرکردەیەك کە لەژێر ڕۆشنایی ڕێنماییەکانی ئێمەدا دەجولانەوە و ئێمەش خستمانە سەر ڕێگەی چاکە و بەرپاکردنی نوێژ و زەکات دەرکردن و بەڕاستی بووبوونە بەندەی ڕاستەقینەی ئێمە.

ئەمە گرنگترین مافەکانی خودا و سەرکردەکان و سەربازەکان بوون کە صدیق لە ئامۆژگاری و نامەکانیدا بۆ سەرکردەکانی خۆی ڕوون دەکردەوە.

**چوارەم: ئەو نهێنیانەی کە لە ڕامالینی دوو زلهێزدابوون لە لایەن موسلمانانەوە:**

ئەو کەسەی لە بزاڤی ڕزگاریخوازی ئیسلامی وردبێتەوە پشتیوانی خوا بەجوانی دەبینێ بۆ ئەبوبەکرﷺ ، کە ئەو سوپا سەرکەوتوانەی بەرەو عێراق و شام بەڕێ کرد و توانی دەسەلاتی ڕۆم و فارسەکان بشکێنێت و ناوچەکانیان لەکاتێکی قیاسیدا لە مێژووی جەنگ ڕزگاربکات، هۆی خێرایی ئەم سەرکەوتن و ڕزگارکردنانە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەلێ هۆکار هەندێکیان

پەیوەندیان بەخودی موسڵمانە ڕزگاریخوازەکانەوە هەبووە، هەندێکی تریشیان پەیوەندیان بە خودی ئەو وڵاتانەوە هەبوو کە ڕزگاریان دەکردن، لەو هۆکارانەی کە پەیوەندن بەخودی موسڵمانەکانەوە ئەمانەن:

١-باوەڕی موسڵمانەکان بەو بەرنامە ڕاستەی لە پێناویدا دەجەنگان.

٢-موسڵمانەکان یەقینی تەواویان هەبووە بە خوای خۆیان لە مەسەلەی ڕۆزی و ئەجەل و قەزاو قەدەر.

٣-جێگیربوونی ڕەوشتە جەنگیەکان لەلای موسڵمانەکان.

٤-لێبوردەیی و دادپەروەری سوپای موسڵمانان لەگەڵ گەلاندا.

٥-سۆز و بەزەیی موسڵمانەکان لە مەسەلەی سەرانە و دەستکەوت، جێ بەجێ کردنی بەڵێن و پەیمانەکانیان.

٦- سامانێکی فراوان لەلایەن سەرباز و هێزی زۆر و زەبەندەوە.

٧- جێ بەجێ کردنی نەخشە و پلانی سەربازی ئیسلامی[1]،

**ئەو هۆکارانەی پەیوەندە ئەو وڵاتە ڕزگارکراوەکانەوە، گرنگترینیان:**

لاوازبوونی ڕۆم و فارسەکان، هەردولایان لاوازبوو بوون، گەندەڵی و ستەم ونارەوایی لە ناویاندا تەشەنەی کردبوو، ڕەوشت نزمی ڕەگی داکوتابوو، شارستانیەتەکەیان بەرەو پیربوون دەڕۆیشت، زیادەڕەوی پاشاکایان بەرەو لەناوبردنی دەبرد، لە بەرنامەی خوا لایان دابوو، سوننەتی خوایان تیاهاتبووە دی کە سوننەتی خوایش بەزەیی بەکەسدا نایەتەوەو و ناشگۆڕێت، بەڵام موسڵمانەکان خودا ڕێزداری کردبوون بە بەرنامەیەکی ناواز و لەسەری دەڕۆیشتن، هەموو هۆکارەکانی زاڵبوونیان گرتبووە بەر و مەرجەکانیان جێ بەجێ دەکرد، لەسەر ڕێڕەو و سوونەتی خوایی هەلس و کەوتیان لەگەڵ گەلاندا دەکرد و وڵاتەکانیان بینادەکردەوە و چاکسازی دەکردەوە، ناشبێت وایش تێبگەین کە لاوازبوونی هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارس و ڕۆم بووبنە هۆی سەرکەوتنی موسڵمانان، لەگەڵ لاوازی هەردوو دەولەتەکەدا لەبەر ئەو هۆکارانەی پێشو کە باسمان کرد نەبوونە هۆی بەرگری لەوەی کە سوپای گەورە و بێ شمارە بخەنە ڕێ بۆ بەرپەرچی

---

[1] تأريخ الدعوة الى الاسلام لا ٢٢٢-تا٢٢٧

سوپای موسڵمانان، سەدان هەزار سەربازی مەشق پێکراوی پڕ چەك و كەرەسە و خواردەمەنی تەواو ئامادەبكەن و هەروەك چەكی وایان بەكاردەهێنا لای موسڵمانەكان بوونی هەرنەبوو، وەك بەكارهێنانی فیل و سەگی جەنگی كە پاسەوانی قەلاكانیان پێ دەكرد و ڕاوی ئەو موسڵمانانەیان پێ دەكرد كە خۆیان دەگەیاندە ناو قەڵاكە.

هەروەك گومانی ئەوەی كە گوایە بەسوك سەیركردنی موسڵمانەكان لە لایەن ڕۆمەكانەوە وای لێ كردین بەجوانی خۆیان بۆ ئامادە نەكردبێت، ووتەكانی پێشوو ڕەدی دەكاتەوە و ڕیوایەتی (ابن عساكر) دەڵێت: هیرقل لە شاری (حمص) بوو هەموو دەست و پێوەندەكانی كۆكردەوە و پێی ووتن: ئائەمەبوو ئێوەم لێ ئاگادارکردەوە و نەتان ویست لێمان قبول بكەن!! كە عەرەب لە دوری مانگێ ڕێگاوە هاتوون و دێنە ڕێگایان، پاشان لەوكاتەدا هەستا و چووە دەرەوە، پاشان براكەی ووتی: كۆمەڵێ سەرباز بنێرە بۆ پاراستنی سنورەكان-رباط- و پیاوێكیش بكە بە سەركردەیان، بەردەوام ئەو سوپایە لەوێ بوو تا سوپای موسڵمانەكان لە سەردەمی ئەبوبكر و عمر لەناوبران.

## جێ باسی چوارەم

### دانانی عمر بە جێنشینی خۆی و مردنی:

یەكەم/ دانانی عمر بە جێنیشین:

لە مانگی جەمادی ئاخیری ساڵی (١٣)یەمی كۆچیدا، جێنشینی پێغەمبەری خوا- - نەخۆش كەوت و نەخۆشیەكەی قورس بوو، پاش ئەوەی لێ پیس كرد-گومانی لە دونیا دەرچونی خۆی كرد- خەڵكی كۆكردەوە و ووتی: وەك دەبینن من لە چ حاڵێكدام و گومانیش نابەم كە نەمرم پێی-خوای گەورە لە بەڵێن و بەیعەتی من دەستی كردنەوە و هیچ گرێبەستێكتان لەگەڵ مندا نەماوە، ئەم مەسەلەیش دەگێڕمەوە بۆ خۆتان و كێتان پێ خۆشە بیكەن بە سەرگەورەی خۆتان، چونكە تا من لە ژیاندام وا باشە ئەو كارە بكەن نەك من بمرم و ناكۆكی بكەوێتە نێوانتان دوای خۆم[١].

---

[١] التأريخ الأسلامی (٢/٢٥٨)

ئەبوبەکرﷺ کۆمەڵێ کاری ئەنجامدا بەرلەوەی کرداری هەڵبژاردنی خەلیفە ئەنجام بدات:

١- ڕاوێژپێکردنی گەورەهاوەڵان لە پشتیوانان و کۆچەریان:

هاوەڵانﷺ لەناو خۆیاندا ڕاوێژیان کرد، هەریەکەو دەیویست لە خۆی دوربخاتەوە و بیدات بەسەر براکەیدا، چونکە پیاوچاکی و شایستەیی تێدا دەبینی، بۆیە بەبێ ئەنجام هاتنەوە بۆ لای صدیق و پێیان ووت: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا-ﷺ- خۆت ڕات لەسەر کێیە پێمان بڵێ، ئەویش ووتی: کاتم بدەنێ تا بە وردی بزانم بۆ خوا و ئاینەکەی و بەندەکانی کێ باشە؟! پاشان عبدالرحمنی کوڕی عەوفی بانگ کرد و پێی ووت: پێم بڵێ عمری کوڕی خطاب چۆنە بەلاتەوە؟ ئەویش ووتی: لە شتێ پرسیارت لێ نەکردوم کە لە من باشتر نەیناسیت، ئەبوبەکریش-ﷺ- ووتی ئەی ئەگەر، عبدالرحمنیش قسەکەی پێ بڕی و ووتی: سویند بە خوا عمر زۆر لەوە باشترە کە تۆ باسی دەکەیت.

پاشان عثمانی کوڕی عەفانی بانگ کرد و پێی ووت: تۆش پێم بڵێ عمر چۆنی بەلاتەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: تۆ لە هەموومان باشتری دەناسیت و ئەبوبەکریش پێی ووت: لەگەڵ ئەوەشیدا ئەی باوکی عبدالله؟ عثمانیش-ﷺ- ووتی: خوا ئاگادارە ئەوەی من بزانم نهێنیەکانی لە ئاشکراکانی زۆر باشترە، وێنەی ئەومان تێدا نیە، ئەبوبەکریش ووتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت، والله ئەگەر ئەو نەکەم بە جێنشین ئەبێ تۆبە بکەم.

پاشان (ئوسەیدی کوڕی خضیر) ی بانگ کرد و هەمان شتی پێ ووت، ئەویش ووتی: خوا ئاگادارە دوای تۆ کەسێ لەو باشتر نابینم، بە شتی چاك ڕازی دەبێ و بە شتی خراپیش تورە دەبێت، نهێنی لە ئاشکرای باشترە، کەسێ شك نابەم بۆ ئەم کارە لەو بەهێزتربێت.

هەروەها ڕاوێژی کرد بە سەعیدی کوڕی زەید و ژمارەیەکی تر لە کۆچەریان و پشتیوانان و هەموویان یەك ڕایان هەبوو لەسەر عمر، جگە لە (طەلحەی کوڕی عبدالله) کە لە توندو تیژیەکەی دەترسا، بە ئەبوبەکری ووت: چی جوابی پەروەردگارت ئەدەیتەوە سەبارەت بە دانانی عمر بە جێنشین و خۆیشت دەزانیت چەندێ ڕەق و توندو تیژە؟

ئەبوبەکر ووتی: ئادەی دام نیشێنن، ئەم ترسێنن بە خوا؟ بێ هیوا بێت ئـەو کەسـەی دەیەوێت لەم کارە گەورەیەدا ناڕەوای بکات، لە وەڵامی خوادا دەڵێم ئەی پەروەردگارم باشترینی ئومەتەکەم کرد بە جێنشین بە سەریانەوە[1]،

وەڵامی ئەوانەی دایەوە کە باسیان لە توندڕەوی و ڕەقـی عمـر کـرد و ووتـی: ئـەو لەبەرئەوەیە کە من دەبینێت ئەوەندە نەرم و لەسەرخۆم -بۆیە وایە- بەڵام ئەگەر خـۆی بکرێتـە جێنشین زۆرێ لەو هەڵوێستانەی خۆی واز لێ دێنێت[2]،

٢- پاشان هەستا بە نوسینی بەڵێننامەیـەك کـە لـە شـوێنە قەرەباڵخـەکانی شـاری مەدینەدا بخوێنرێتەوە لە ڕێگـەی سـەرکردەکانی سـوپاکانی ئیـسلامەوە بـۆ هـەموو شـار و ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئیسلام بخوێنرێتەوە کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

(بسم الله الرحمن الرحيم، ئەمە بەڵێننامەیەکە لە ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقوحافەوە لـە دوا ساتەکانی تەمەنیدا و لەکاتی لە دونیا دەرچونیدا، لەکاتی یەکەمین هەنگاوی ڕۆژی دواییدا، لەو کاتەدا کە هەموو بێ باوەڕان باوەڕدێنن و خراپەکێلان بە چـاوی خۆیـان ئـەو ڕۆژە دەبیـنن، درۆزنان باوەڕدەکەن، من عمری کوڕی خطابم کرد بە جێنشینی لە شوێنی خـۆم، دەی گـوێی بـۆ بگرن و گوێ ڕایەلیشی بکەن، من چاکەی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئایینەکەی و خۆم و ئێوەشـم دەوێت، ئەگەر ڕاست و دادپەروەربوو، ئەوە گومان و بۆچونم لە شوێنی خۆیـدا بـووە دەربـارەی، ئەگەر واش دەرنەچوو ئەوە هەموو کەس خۆی بەرپرسی کردەوەکانی خۆیەتی، مەبەستم چـاکە و خێربووە و زانستی نادیار و غەیبم پێ نیە)

﴿وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ٢٢٧﴾ ( الشعراء: ٢٢٧)[3]

ئامۆژگاری کەری ئەبوبەکر بوو بۆ هەرکارێك خێری ئومـەتی ئیـسلامی تێـدا بوویێـت، دنیـای دەبینی کە بـەرەو ڕووی مـرۆڤ دەهـات و هۆزەکەشـی لـە کۆنـەوە هـەژاریان تێـدابوو، ئەگـەر

[1] الكامل (ابن أثير (٢/٧٩))

[2] التأريخ الأسلامي محمود شاكر لا(١٠١)

[3] تأريخ الأسلام ، ذهبي ،عهد الخلفاء لا ١١٦,١١٧.

زیادەڕەویان تێدابکردایە و سەریان بکردایەتە ناو حەز و ئارەزووەکانیان، ئەوە لەناوی دەبردن و بەرەو ستەمکاری دەیبردن وئەمەش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ ترساندبوونی لێی[1].

وەك دەفەرموێت ((فواللة لا الفقر اخشى عليكم، ولكن اخشى عليكم ان تبسط عليكم الدنيا كما بسطت على من كان قبلكم، فتنافسوا كما تنافسوها وتهلكم كما اهلكتهم))[2]،

واتە: وەللاهی من لە هەژار بوونتان ناترسم، بەڵکو ئەوەی لێی دەترسم ئەویە کە دنیا بێتە بەردەستان هەروەك چۆن هاتە بەردەستی خەڵکانی پێش ئێوە، شانشانێتی لەسەر بکەن هەروەك چۆن ئەوان شانشانێیان لەسەر کرد و لەناوتان ببات وەك چۆن ئەوانی لەناوبرد.

ئەبوبەکر-ﷺ- نەخۆشیەکانی دەزانی بۆیە ئاماژەی بۆ چارەسەری چاك دەکرد... کێوێکی بەرزبوون، ئەگەر دنیا ویستی بەرەو ڕوویان بهاتایە لێیان بێ هیوا دەبوو، پشتی تێ دەکردن.

عمر ئەو پیاوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەفەرموێ (ايها يا ابن الخطاب، و الذى نفسى بيده ما لقيك شيطان سالك فجا قط الا سلك فجا غير فجك[3]،

ئێی کوڕی خطاب سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لە هیچ کۆلانێك شەیتانت توش نابێت، مەگەر ئەو خێرا کۆلانێکی تر دەگرێتەبەر.

هەموو ئەو ڕووداوە گەورانەی توشی ئومەتی ئیسلام بوون، لەدوای شەهیدکردنی عمر دەستی پێکرد، ئەم ڕووداوە پشت شکێنانەش باشترین بەڵگەن لەسەر فیراسەتی بە هێزی صدیق و دروستی تێڕوانینەکەی بۆ هەڵبژاردنی عمر بە جێنشینی دووەم،

عبداللە ی کوڕی مسعود-ﷺ - دەڵێت: سێ کەس لەهەموو خەڵکی دوربینی فیراسەتیان زیاترە: یەکەم/ کچەکەی شوعەیب-سەلامی خوای لێ بێت- کاتێ ووتی بە باوکی باوکە گیان بیگرە بە کرێ چونکە پیاوێکی زۆر بە توانا و دەستپاکە، دووەم/ عەزیزی میس کە ووتی بە خێزانی : ڕێزی بگرە بەڵکو سودی لێ ببینین یان هەر بیکەین بە کوڕی خۆمان، سێیەمیان/

---

[1] ابوبکر رجل الدولة ل٩٧.

[2] البخاری کتاب الجزیا و الموادعة ژمارة(١٣٥٨)

[3] البخاری کتاب فضائل اصحاب

ئەبوبەکر کاتێ ڕای هاتە سەر عمر کە ببێت بە خەلیفە دوای خۆی)[1]. بە ڕاستی عمر بوو بووبە بەربەست لەنێوان ئومەتی ئیسلام و دەریایەك ئاژاوە و کارەسات[2].

٣-خۆی بە عمری ووتبوو کە بە نیازم تۆ هەلبژێرم بە جێنشین، ئەوەبوو کاتێك عمر سەردانی ئەبوبەکری کردبوو، مەسەلەکەی چێ ووتبوو، ئەویش ڕازی نەبوو بەرپرسیارێتی وەربگرێت، ئەبوبەکریش بە شمشێرهەڕشەی کوشتنی لێکرد، عمریش چاری نەما و ڕازی بوو[3].

٤-ویستی بە زمانیش بە خەلکی ڕابگەیەنێ تا تێکەل نەبێت لێیان، ئەبوبەکر چووە ناو خەلکی پێی ووتن: ئایا بەو کەسەی من دەستنیشانی بکەم ڕازی دەبن؟ وە من سوێند بە خوا کەمتەرخەمیم نەکردووە لە بیرکردنەوەی تەواو لەمەسەلەکە، خزمایەتیشم نەخوێندۆتەوە و من عمرم لە شوێنی خۆم کردۆتە جێنشین بەسەرتانەوە و گوێی بۆ بگرن و گوێ ڕایەلیشی بکەن، ووتیان: گوێی بۆ دەگرین و بە گوێیشی دەکەین[4]،

٥- ڕووی دەکردە خوای گەورە و لێی دەپاڕایەوە و ڕازی دلی خۆی بۆ دەدرکاند، دەیووت: ئەی خواوەندی من، من عمرم هەلبژاردووە بەبێ پرسی پێغەمبەرەکەت، هیچیشم لەو کارەدا مەبەست نەبووە جگە لە چاکە نەبێت، لە ئاژاوەی ناویان ترساوم، هەموو بیرو بۆچوونی خۆمم خستۆتە کار، چاکترینیانم کرد بە سەرۆکیان، سورترینیان لەسەر ڕێنمایی کردنیان، خەریکە ئەمری تۆ بەجێ دێنم-دەمرم- و دەی جێنشینی چاکی من دەرچێت بەسەر بەندەکانتەوە[5].

٦-عثمانی کوڕی عەفانی ڕاسپارد کە بەلێننامەکە بخوێنێتەوە ، بەیعەتی لە خەلکی وەرگرت بۆ عمر پێش مردنی و بۆ زیاتر پتەوکردنی بەلێننامەکە خۆیشی مۆری کرد، هیچ ئاسەواریکی خراپیشی لێ نەکەوتەوە، عثمان بە خەلکەکەی ووت: ئایا ئامادەن بەیعەتی خۆتان بدەن بەو

---

[1] اخرجه الحاكم و صححه و وافقه الذهبی ، و رواه الطبرانی وجال اسناده صحيح

[2] ابو بكر رجل الدولة لا ١٠٠

[3] تأثر الأنافة (٤٩/١)

[4] تأريخ الطبری (٢٤٨/٤)

[5] تأريخ المدينة لابن شيبة (٦٦٩,٦٦٥/٢)

کەسەی ناوی لەوبەڵێننامەیەدا هاتووە؟ هەموو ووتیان بەڵێ، هەموویان پێکەوە بە مەسەلەکە رازی بوون[1].

٧-بەیعەت دان بە عمری کوڕی خطاب-ﷺ- پێش مردنی ئەبوبەکر-ﷺ-و پاش ئەوەی بەڵێننامەکە خوێنرایەوە، بەسەر خەڵکەکەدا و هەموو قبولیان کرد و پێی ڕازی بوون و بەیعەتیان پێدا[2].

پاش مردنی ئەبوبەکر-ﷺ-بەیعەت درایەوە بە عمر، بەڵکو دوابەدوای مردنی ئەو، ئەم دەستی بە کارەکانی کرد وەك جێنشینی دووەم دەست بەکاربوو[3]،

ئەوەی بەوردی لە مەسەلەکە بکۆڵێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە هەڵبژاردنی عمر-ﷺ- بەرێکەوتنی هەموو ( ئەهلی حەل و عەقد) بوو، لەسەر ویستی ئەوان بوو، هەر ئەوان بوون کاری دیاریکردنی خەلیفەیان گێڕایەوە بۆ ئەبوبەکر، کردیان بە نوێنەری خۆیان لەو مەسەلەیەدا، ئەویش پرس و ڕاوێژی پێ کردن، ئەوجا جێنشینی دیاریکرد، پاشان ئەنجامی دیاریکردنەکەی لە ڕاپرسی جەماوەریدا خستە بەردەستی خەڵکەکە، ئەوانیش دانیان پێدانا، پێی ڕازی بوون و جێ بەجێیان کرد، (ئەهلی حەل و عەقد) واتە نوێنەرانی سروشتی ئومەتی ئیسلام، کەواتە هەڵبژاردنی عمر-ﷺ -بەڕاست و دروسترین شێوازی ڕاوێژکاری بوو.

ئەو هەنگاوانەی ئەبوبەکر-ﷺ - گرتیە بەر لە دیاریکردنی عمردا، بە هیچ شێوەیەك لادان نەبوو لە سنوری شوراو ڕاوێژکاری، هەرچەندە لە شێوازدا زۆر جیاوازبوو لە شێوازی هەلبژاردنی خودی ئەبوبەکر[4].

ئا بەو شێوەیە عمر هەڵبژێردرا، لەسەر بنەمای شوراو ڕێککەوتن، مێژوو هیچ شتێکی وای تۆمارنەکردوە کە ئەوە بگەیەنێت ناحەز و ناڕازی هەبوبێت لەو مەسەلەیەدا، کەسیش بە

---

[1] طبقات ابن سعد(٣/٢٠٠)

[2] دراسات فی عهد النبوة و الخلافة الراشدی لا ٢٧٢.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[4] ابو بكر الصديق — علی طنطاوی (٢٧٣)

درێژایی حوکمڕانیەکەی کێشمە کێشمی لەگەڵ نەکردووە، بەڵکو لەکاتی حوکمڕانیەکەیدا هەموو کۆکبوون لەسەری، هەموویان وەك یەك پیاو وابوون لە خزمەتیدا[1].

٨- ئامۆژگاری صدیق-ﷺ - بۆ عمری کوڕی خطاب-ﷺ -: ئەبوبەکرﷺ بە تەنیا و دوو بە دوو لەگەڵ عمردا دادەنیشت و کۆمەڵێ ئامۆژگاری پێشکەش کرد، بۆ ڕزگارکردنی خۆی لە هەموو شتێك، تا کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا لە هەموو شتێك خاوێن بێت دوای ئەوەی بە ئەوپەڕی توانای لە مەسەلەکەی کۆلی وەتەوە[2]،

لە وەسیەتنامەکەیدا هاتووەو پێی دەڵێت: (عمر لە خوا بترسە، بزانە کۆمەڵێ کار هەیە دەبێت لە ڕۆژدا بیکەیت و لەشەودا وەری ناکرێت لێت، کۆمەڵێ کاری شەویش هەیە لە ڕۆژدا وەری ناگرێت، سوننەتیش وەرناگرێت تا فەرز وەستابێت، کێشی ئەو کەسە قورسە کە لە ڕۆژی دواییدا کێشانەکەی قورس بێت، ئەمەش بەوەی لە دونیادا شوێن هەق و ڕاستی کەوتووە و شایانیشە تەرازوی کێشانی کردەوەکان کە ڕاستی بخرێتە سەر قورس بێت، ئەو کەسەش سوکە کە کێشی سوك دەبێت لە ڕۆژی دواییدا و شایانە بۆ تەرازوی پێوانەی کردار کە ناڕەوای بخرێتە سەر سوك ببێت،

خوای گەورە باسی ئەهلی بەهەشتی کردوە و بە باشترین کردەوەیان ناویان دێنێ و لە خراپەکانیان خۆش بووە، ئەگەر باسیان بکەیت دەڵێیت: لەوانەیە هەرگیز پێیان نەگەم، هەروەها باسی ئەهلی دۆزەخی کردوە بە خراپترین کاریان ناویان دەبات و چاکەکانی لێ وەرنەگرتوون، ئەگەر باسیان بکەیت دەڵێیت: تکام وایە من لەگەڵ ئەوانە دانەنێم، ئەمەش بۆ ئەوەیە بەندە لە نێوان ترس-رهبە- و حەز-رغبە- دا بژی، بەخۆڕایی بە تەمای بەهەشتی خوا نەبێت و لەلایەکی تریشەوە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوا هیوابڕاو نەبێت، ئەگەر تۆش ئەم ئامۆژگاریانەم بگریتە گوێ، ئەوا هیچ شتێکێ نادیارت ئەوندەی مردن بێ ناخۆش نیە، پێیشی ناوێرێت)[3].

دووەم/ کاتی لە دنیا دەرچوون هات:

---

[1] دراسات فی العصر النبوة و الخلافة الراشیدة ٢٧٣.

[2] دراسات فی العهد النبوة ٢٧٢

[3] صفة الصفوة (٢٦٥,٢٦٤/١).

عائیشه-خوا لێی خۆش بێت-دەڵێت (یەکەم جار نەخۆشی سەری لە ئەبوبەکر هەڵدا، خۆی شۆرد، ڕۆژێکی زۆر ساردبوو، ماوەی (١٥) ڕۆژ تا دایگرت و عمری ڕاسپارد تا بەرنوێژی موسڵمانان بکات، هەموو دەهاتنە سەردانی و عثمان لە هەمووان زیاتر لەلای بوو لەکاتی نەخۆشیەکەیدا[١]،

کاتێ نەخۆشیەکە زۆری بۆ هێنا، پێیان ووت دوکتۆرت بۆ بانگ نەکەین؟ ووتی: هات بۆ لام و بینیمی و پێی ووتم من (فعال لما یرید) و هەرچیم بوێت دەیکەم[٢]،

عائیشە-خوا لێی خۆش بێت-دەڵێت: لەو کاتەدا ئەبوبەکر ووتی: بڕۆن بزانن لە دوای ئەوەی بووم بە خەلیفە سەروەتەکەم چی زیادکردوە بیدەنە خەلیفەی دوای خۆم، ئێمەش سەیرمان کرد دەبینین خزمەتکارێکی زیادکردوە کە منداڵەکانی هەڵگرتووە و لە کانیەك ئاو دەهێنێ و باخەکەی پێ ئاو دەدات، ئێمەش ناردمان بۆ عمر و عمریش دەستی کرد بە گریان و ووتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر دوای خەلافەت زۆر زۆر ناڕەحەت تربوو[٣].

عائیشە-خوا لێی خۆش بێت-دەڵێت: کاتێ ئەبوبەکر نەخۆش کەوت ئەو نەخۆشیەی کە پێی مرد، چومە لای دەبینم ناڕەحەتە و لە سەرەمەرگدایە و بەدەم خۆیەوە ئەم دێرە شیعرە دەڵێتەوە:

لعمرك مایغنی الثراء عن الفتی　　اذا حشرجت یوما وضاق بها الصدر

واتە: (خۆشگوزەرانی و دەولەمەندی چی سودی هەیە بۆ مرۆڤ، ئەگەر ڕۆژی بکەوێتە جێگە و سنگی بێتەوە یەك)، وەك کەسێکی تووڕە سەیری کردم، پاشان ووتی: وایش نیە ئەی دایکی باوەڕداران، بەڵام ووتەی خوا ڕاسترە: ﴿وَجَآءَتۡ سَكۡرَةُ ٱلۡمَوۡتِ بِٱلۡحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنۡهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾﴾ (ق:١٩).

---

[١] اصحاب الرسول ﷺ محمود المصری (١/١٠٤)

[٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣] صفة الصفوة (١/٢٦٥).

پاشان ووتی ئەی عائیشە ، لەناو هەموو خزمەکانمدا کەسم ئەوەندەی تۆ خۆش ناوێـت، مـن کـاتی خـۆی باخـچەیەکم بـە تـۆداوە، بـەلام وام پێباشـە بیگێڕیتـەوە بـۆ نـاو مـاڵی پاشبەجێماوەکانم-میراث-،عایشە دەڵێ ووتم: بەڵێ[1] .

پاشان ئەبوبەکرﷺ فەرموی: (ئێمە لەو کاتەوەی ئەم بەرپرسیاریێتیەمان وەرگرتووە نـە دینار و نە درهەمێکی موسڵمانانمان نەخواردوە، بەڵام خواردنی سـادە و سـاکاری موسـڵمانانمان خواردوە، بەرگی سادە و زبریانمان پۆشیوە، نەزۆر و نە کەم سامانی موسڵمانانمان نەکەوتۆتـە لا، تەنها ئەو خزمەتکارە حەبەشیە نەبێت لەگەڵ ئەم ئەسپەدا بۆ ئاودێران و ئەم پارچە قوماشەیش، ئەگەر مردم بیانێرن بۆ عمر و خۆتـانی لێ ڕزگاربکـەن) ومنـیش وام کـرد، کاتـێ ئـەم شـتانە گەیشتنە دەستی عمر، دەستی کرد بە گریان بە جۆرێکی وا کە فرمێسکەکانی بـەردەمی خـۆی تەڕکرد، بەدەم خۆیـەوە دەیـووت: ڕەحمـەتی خـوا لـە ئەبوبـەکر، بەڕاسـتی کەسـی دوای خـۆی ماندوکردوە، ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر، بەڕاستی کەسی دوای خۆی ماندوکردوە[2] .

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە و دەڵێت: ئەبوبەکر کاتی سـەرەمەرگی هـات ووتـی: عمـر وازی لێ نەهێنام تا ناچاری کردم لە (بیت المال)ی موسڵمانان شەش هەزار درهـەم وەرگـرم، ئـەو باخەم کە لە فلان شوێندایە تیایەتی، کاتێ وەفاتی کرد ئەم مەسەلەیان بۆ عمر باس کرد ووتـی: خوا ڕەحم بە ئەبوبەکر بکات، حەزی کردوە دوای خۆی بوار بۆ کەس نەکاتـەوە قـسە و قـسەلۆك بکەن[3] .

لەم هەلوێستەدا خۆبەدورگرتنی ئەبوبەکر بەدی دەکرێت لە خـواردنی سـامانی هـەموان (الاموال العامە). ئەو جێنشینە مەزنە وازی لە بازرگانی خۆی هێنا و دەستی لە کـار و کـاسبی خۆی هەلگرت و هەموو کاتەکانی خۆی تەرخان کرد بۆ ئیش و کاری موسڵمانان و هەسـتان بـە ئەرکی جێنشینایەتی و ناچاربوو بژێوی ژیانی خۆی لە خەزێنەی موسڵمانان وەربگرێت، بەڵام بـە ئەندازەیەك بژی و نەمری و بەشی خواردن و پۆشاکیان بکات و بەس، پاشان کۆمـەلێ خزمـەتی

---

[1] صفة الصفوة (١/٢٦٦)

[2] الطبقات لابن سعد (٣/١٤٦,١٤٧) رجالة ثقات.

[3] المنتظم لابن الجوزی (٤/١٢٧)

واپێشکەش بە موسڵمانان بکات کە  هەموو خەزێنـەکانی سـەر زەوی نـەتوانن بەرامبەرەکـەی بدەن. کاتی مردنی هاتە پێشەوە و هەندێ کـەل و پـەلی بـێ نرخـی لـە مـاڵی موسـڵمانان لـە بەردەستدا بو، وازی لێهێنان، فەرمانی دەرکرد کە بیانگێڕێتەوە بۆ جێنشینی دوای خۆی، تا بـە دڵئارامیەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، بە دڵێکی خاوێن و دەروونێکی پاك، باری سوك  مەگەر لـە تەقوا و خواناسی ، بەدەستی  بەتاڵ مەگەر لە باوەڕ، بەڕاستی ئەمەش زەنگی ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەو کەسانەی ژیرن و هۆش دەخەنەکار[1] .

هەروەك چۆن باخەکەی خۆی-کـە شـتی تایبـەتی خـۆی بـوو- خـستیە نـاو خەزێنـەی موسڵمانان لەبەرامبەری ئەو مووچانەی کە لە خەزێنەوە وەریگرتووە بۆ بەخێوکردنی خۆی و ماڵ و منداڵەکانی.

ئەمەش تەنها لەبەرئەوە بوو کە -ورع- لە خۆیدا بێنێتە دی، حەزی کردوە هەمووکارەکانی بـە تەواوەتی بۆ خوا بێت، دوربێت لە هەموو دەستکەوتێکی دنیایی.

نەخۆشیەکەی ماوەی (١٥) ڕۆژی خایاند، تا لە ڕۆژی دووشەممە و شەوی سێ شەمە لـە (٢٢)ی مانگی جەمادی الاخرەی ساڵی (١٣)ی کۆچی، عائیشە-خوا لێی خۆش بێـت-دەڵێـت: ئەبوبەکر پێی ووتم: ئاتا لە چ ڕۆژێکدا بوو پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد؟ ووتم: دووشەممەبوو، ووتی: دەی منیش تکام وایە لە نێوان ئەمڕۆ و شەویدا بمرم، ووتی لە چیدا کفنتان بۆ کرد؟ ووتم: لە سێ بەرگی یەمانیـدا بـەبێ کـراس و عـەمامـە، ووتـی: دەی سـەیری ئـەم بەرگـە بکـە کـە زەعفەرانی تێدایە و دوو بەرگی تری بۆ زیادبکەن[2] .

پێیان ووت: خوای گەورە ڕۆژی تەواوی داوین و کفنی تازەت بۆ ئامادەدەکـەین، ووتـی: نەکەن، چونکە زیندووەکان شایانە بەرگی تازە بپۆشن نەك مردووەکان، بەڵکو مردوو بەرەو کـێم و جەراعەت و ڕزین دەڕوات[3] .

---

[1] اشهر مشاهیر الاسلام (٦٤/١)

[2] اصحاب الرسول ﷺ(١٠٦/١).

[3] التأریخ الاسلامی ، محمود شاکر. الخلفاء الراشیدون (١٠٤)

وەسیەتی کرد کـە خێزانەکـەی ـئـەسمای کـچی عومـەیش- بیشوات و لـە تەنیـشت پێغەمبەری خواداﷺ بەخاکی بسپێرن، دوایـن ووشـەیەك کـە لـە دەمـی صـدیق بیـسترا ئـەم ئایەتەپیرۆزە بوو (توفنی مسلما و الحقنی بالصالحین) واتە خوای گەورە بە موسڵمانەتی بم مرێنـە و بمگەیەنە قافلەی پیاوچاکان[1].

شاری مەدینە بە کۆچی دوایی صدیقﷺ هەژا، تا ئەو ساتەوەختە شاری مەدینە و لـە دوای مردنی پێغەمبەری خواﷺ گریان و هاواری وای بەخۆوە نەدیبوو، ئێوارەی خەمناکی وای بەسەردا نەهاتبوو، عەلی کوڕی ئەبوطالـبﷺ بـە هەڵـە داوان و بـە گریانـەوە، ڕای کـرد بـۆ بەردەرگای ماڵی ئەبوبەکر و بەدەم گریان و (انا للـه وانـا الیـه راجعـون)ەوە و بـەدەنگی بـەرز دەیووت:

((ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی ئەبوبەکر، تۆ هاوڕێ و دڵخۆشـکەر و جێـی حەوانـەوە و متمانە و نهێنیەکان و ڕاوێژکاری پێغەمبەر بووی، تۆ یەکەم کەس بووی هاتی بەدەم بانگـەوازی ئیسلامەوە، بەوپەڕی یەقینەوە، ئەوپەڕی یەقین و دڵنیایی بە خـوا، ئەوپـەڕی ترسـان لـە خـوا، ئەوپەڕی دەوڵەمەندی لە ئاینی خـوای (عـز وجـل)دا، ئەوپـەڕی پارێزگـاری پێغەمبـەری خـوا، پشتیوانی ئیسلام بووی، باشترین هاوەڵ بووی، لە هەمووان زۆرتربوو چاکیەکانت، لـە هـەمووان باشتربوو پێشینەکانت، لە هەمووان پلەت بەرزتربوو، لە هـەمووان زیـاتر هۆکـاری ڕزگاربوونـت بەکاردەهێنا، لە هەمووان زیاتر لە پێغەمبـەری خـوات دەکـرد لـە شـێواز و هـەلس وکەوتـدا، بەرزترین پلەو بلندترین شوێنەوارت هەبوو لەناو دڵێدا، بەڕێزترین بـووی لـەلای ئـەو، دەی خـوا بەجوانترین شێوە پاداشتت بداتەوە لە باتی پێغەمبەرەکەی و ئیسلام،

تۆ باوەڕت پێ هێنا لەکاتێکدا خەڵکی بەدرۆی دەخستەوە، تۆ لـەلای ئـەو وەك چـاو و گوێی وابووی، خوا لە کتێبەکەیـدا نـاوی لێ نـاوی(صـدیق)، وەك دەفـەرموێت (( والـذی جاء بالصدق وصدق به أولئك هم المتقون)).

دڵنەوایت کرد کاتێ خەڵکی ڕژدیان دەنواند، لە ناڕەحەتترین کاتـدا لەگەڵیـدا بـە پێـوە بووی خەڵکی دانیشتبوون، لە ناهەموارترین کاتـدا باشـترین هـاوڕێ بـوی بـۆی، دوەمـی دوەم

[1] الشیخان ابوبکر و عمر ، بلازري لا ٦٩

کەسەکەی ناو ئەشکەوت، ئەو کەسەی ئارامی دابەزیە سەرتان، هاوڕێی کۆچی بووی، جێنشینی بووی لەکاری خزمەت بە ئیسلام و ئوممەتەکەی، لەکاتێکدا خەڵکی پاشگەزدەبوویەوە و بە جۆرێ بە کاری جێنشینی هەستایت هیچ جێنشینی پێغەمبەرێك نەیتوانیوە بەو جۆرە بکات، ڕاپەڕیت لەکاتێکدا هاوڕێکانی دەترسان، تۆ خۆت دەردەخست لەکاتێکدا ئەوان سەریان دادەخست، تۆ بەهێزبووی لەکاتێکدا ئەوان لاوازبوون، تۆ بەردەوام ڕێڕەوی پێغەمبەری خواتﷺ بەرنەدەدا لەکاتێکدا خەڵکی سستیان تێدادەنواند،

تۆ هەر بەوشێوەیە بوویت کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێت: ((ضعیفا فی بدنك قویا فی أمر الله تعالی، متواضعا فی نفسك عظیما عند الله تعالی، جلیلا فی أعین الناس کبیرا فی أنفسهم)) واتە: بەلەش و لار لاوازبوویت بەڵام لە کاروباری خوای تەعالادا بەهێزبوویت، بچوك بوویت لەلای خۆت بەڵام مەزن بوویت لەلای خوای تەعالا، لەبەرچاوی خەڵك بەڕێز بوویت و گەورە بوویت لەلایان))،

هیچ کەس قسەیەکی لەسەرت نەبوو، کەسێ شتێکی بەرامبەرت نەبوو،باکت لە هیچ مەخلوقێ نەبوو، لاواز و بێ دەسەلات لات بەهێزبوو تا مافی خۆیت دەدەست دەخست، خزم وبێگانە لەلات وەك یەك وابوون، نزیکترین کەس لەلات ئەوانەبوون زیاتر بۆ خوا دەژیان و لە خوا دەترسان...

ئیش و کارت بریتی بوو لە نەرم و نیانی و ڕاستگۆیی، ووتەکانت جێی خۆی بوو، کارەکانت نەرم ونیان و سووربوون، ڕاوبۆچونت لە زانست و کردارەوەبوو، ئاین بە تۆ ڕێك ڕاوەستا، باوەڕ بە تۆ بەهێزبوو، بەرنامەی خوا زاڵ بوو، تۆ پێشکەوتیت سوێند بە خوا پێشکەوتنێکی دوور، کەسانی پاشی خۆتت ماندوکرد بە ماندبوکردنێکی توند، لەکاری چاکەدا سەرکەوتیت بە سەرکەوتنێکی ئاشکرا، دەی سا" انا لله وانا الیه راجعون" ڕازین بە قەزای خوا و کارەکانی خوای تەعالا، سەرنزمی دەبین، وەڵڵاهی لەدوای کۆستی پێغەمبەری خواﷺ موسڵمانان هەرگیز کۆستی وەك تۆیان ناکەوێت، ئاین بەتۆوە سەر بەرزبوو، پارێزراو بوو، دەی خوا بتگەیەنێت بە محمدﷺ ، لە پاداشتت بێ بەشمان نەکات، دوای تۆ سەرگەردانمان نەکات)).

لەم کاتەدا خەڵکەکە هەموو بێ دەنگ بوون تا لە قسەکانی بوویەوە، ئەوندە گریان، بانگ و سەدایان بەرزبویەوە و بەیەك دەنگ ووتیان: ڕاستەکەیت[1].

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەڵێت: علی کاتێ هاتە ژوورەوە و ئەبوبەکری بینی کفنکراوە، هاواری کردو ووتی: هیچ کەسێك گەڕابێتەوە بۆلای خوا بە نامەی کردارییەوە ئەوەندەی ئەم ڕاکشاوە خۆشەویست نیە لەلام[2].

ئەمەو صدیق لە تەمەنی (٦٣)ساڵیدا وەفاتی کرد، هەموو ڕیوایەتەکان یەکن لەسەر ئەم مێژووە، تەمەنی پێغەمبەری خوای تەواو کرد، خێزانەکەی –ئەسمائی کچی عومەیس- شۆردی، کە خۆی وەسیەتی کردبوو[3]. لەتەنیشتی پێغەمبەری خوا ﷺ نێژرا بە جۆرێ سەری لە ئاستی هەردوو شانی پێغەمبەر دابوو[4]، عمری کوڕی خطاب نوێژی لەسەر کرد و عمر و عثمان و طەلحە و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف دایان هێلایە گۆڕەکە و قەبرەکەیان نوساند بە قەبری پێغەمبەر خوداوە ﷺ[5].

ئا بەم شێوەیە ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه لە دنیا دەرچوو، پاش هەوڵ و تێکۆشان وجیهادێکی مەزن لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئاینی خوادا لە هەموو دنیادا،

بەردەوام شارستانیەتی مرۆڤایەتی قەرزباری ئەم پیاوە بەرزە بەنرخەیە لە لیوای بانگەوازەکەی پێغەمبەری پاش وەفاتی ئەو بەرزکردەوە و پاشتر لە زەویدا چەقاندی، هەستا بە چاودێری کردنی تۆوی داد و سەربەستی و بە خوێنی شەهیدان ئاوی دان، بەروبومی زۆر و زەبەندی هاتە بەر، لە مێژوودا پێشکەوتنێکی گەورەی هێنایە کایەوە لە بواری زانست و بیر و ڕۆشنبیریدا، بەردەوام شارستانیەت قەرزباری صدیقە چونکە بەهۆی ئەو جیهادە بێ وێنە و ئارامی گەورەیەوە توانی ئاینی پاکی خوا بپارێزێت و پەتای پاشگەزبوونەوەی لێ دووربخاتەوە،

---

[1] التبصرة، ابن الجوزي (٤٧٩،٤٧٧/١)

[2] التأريخ الاسلامي ،محمود شاكر- الخلفاء الراشيدون ل١٠٤.

[3] التأريخ الاسلامي ،محمود شاكر- الخلفاء الراشيدون ل١٠٤.

[4] الطبقات لابن سعد (٢٠٣/٣)

[5] اصحاب الرسول (١٠٦/١)

ئیسلامی لە ناو ئومەمەت و گەلانی دنیادا بڵاوکردەوە بە هۆی جەنگە پیرۆزە ڕزگاریخوازیەکانیەوە بەجۆرێ کە بە خۆیەوە نەیدیوە.

ئەم کتێبە کۆتایی پێ دەهێنم بە چەند دێڕە شیعرێکی ئەبی محمد (عبداللة القحطانی الاندلسی) کە دەربارەی صدیق ﷺ دەڵێت[1]:

قل ان خير الانبياء محمد — واجلّ من يمشى على الكثبان
واجل صحب الرسل صحب محمد — وكذلك افضل صحبه العمران[2]
رجلان قد خلقا انصر محمد — بدمي ونفسى ذانك الرجلان
فهمااللذان تظاهرا لنبينا — فى نصره وهما له صهران
بنتاهما اسنى نساء بنبينا — وهماله بالوحى صاحبتان
ابواهما اسنى الصحابة احمدا — ياحبذا الابوان والبنتان
وهما وزيرا اللذان هما هما — لفضائل الاعمال مستبقان
وهما لأحمد ناظره و سمعه — و بقبره فى القبر مضطحعان
كانا على الاسلام اشفق أهله — وهما لدين محمد جبلان
اصفاهما اقواهما اخشاهما — اتقاهما فى الستر والاعلان
أسناهما أزكاهما أعلاهما — أوفاهما فى الوزن والرُجحان
صديق احمد صاحب الغار الذى — هو فى المغارة و النبى اثنان
اعنى ابابكر الذى لم يختلف — من شرعنا فى فضله رجلان
هو شيخ اصحاب النجا وخيرهم — وامامهم حقا بلا رجلان
وابو المطهرة التى تنزيهها — قد جاءنا فى النور و الفرقان[3]

" واخر دعوانا ان الحمدلله ربالعالمين"

((سبحانك اللهم و بحمدك استغفرك و اتوب اليك))

---

[1] پێم خۆش بوو ئەم چەند دێڕە بە زمانی عەرەبی وەك خۆی دابنێم لەبەر بەهێزیان. وەرگێڕ

[2] مەبەست ئەبوبەکر و عمرە

[3] نونية القحطانی لا٢٢,٢١.

## پوختەی ئەم ژیاننامەیە

١- ژیـان و بەسـەرهاتی جێنـشینە ڕاشـیدەمان و مێـژووی ژیـانی پیرۆزیـان بـەهێزترین سەرچاوەکانی باوەڕ و سۆزی موسڵمانەتی ڕاستەقینەیە کە تـا ئێـستایش ئـەم ئوممەتـە مەشخەڵی باوەڕی لێ وەردەگرن، تیشکی بانگەوازی پێ هەڵدەگرن و دڵی خەڵکی ڕوناك دەکەنەوە بە نوری حەق و ڕاستی تا نەڕوخێ و نەکوژێتەوە بـە ڕەشـەبای ڕوخێنـەر کـە دوژمنانی ئوممەتی ئیسلام لە دژی بانگەواز و مێژووە زێڕینەکەی.

٢- موسڵمانان -بەڵکو مرۆڤایەتی- ئەمڕۆ زیاتر پێویـستیان بـە زانینـی پیاوچـاکیەکانی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ هەیە، کاریگەری پەروەردەکردنی لەسەریان و پلەی بـەرزیان بـە جۆرێ کە بوونە بەرەیەکی ناوازەی بێ وێنە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

٣- مێژووی ئیسلام بەگـشتی و مێـژووی بـەرەی یەکـەمی ئیـسلام بـە تایبـەتی تووشـی دەستکاری کردن و تەزویرکردن و لادان و لێ کردنەوە و بۆ زیادکردن و خراپ مانـاکردن بـووە لەلایـەن-شـیعە- ڕەفزکراوەکانـەوە- و ڕۆژهـەڵاتنناس و جولەکـە و گـاور و عەلمایەکانەوە.

بوو لە بابی- فەرزی کیفایەیە- لەسەر ئوممەتی ئیسلام ڕاستیەکان ڕوون بکەنەوە، هەرکەسێ توانای زانستی تێدایە دەبێت مێژووی بەرەی یەکـەمی ئیـسلام ڕاسـت بکاتـەوە ئـەوە لـە گەورەترین بەندایەتی و پەرستشە، بۆی ڕادات و خـۆی مانـدوویکات بـە ئەوپـەڕی توانـای، لەبەردەمی نەوەکانی ئەم ئوممەتەدا نمونەی بەرجەستە هەبێت لە موسڵمانانی پێش خۆیان تـا چاوی لێبکەن و ئەوانیش پەیمان تازەبکەنەوە لەسەری و لەسەر پرۆگرامی ئەوان چاکسازی لە ژیانی خۆیاندا بکەنز

٤- ژیانی ئەبوبەکری صدیق‌ﷺ پڕیەتی لە پەند و وانە، گەورەترین کەسایەتی لە ئیـسلامدا پاش پێغەمبەری خواﷺ ئەم هاوەڵە بەڕێزە خاوەنی بەرزترین ئاستی ڕەوشـت جـوانی و سیفاتی بەرزبووە لەسەردەمی نەفامیشدا و نەبیستراوە سوژدەی بـۆ بـت بردبێـت یـان مەی خواردبێتەوە.

٥- صدیق شارەزاییەکی باشی هەبووە لە زانستی نەژادزانیدا و ئەم تایبەتمەندیەشی وای لێکردبوو خۆشەویست بوو لە ناو عەرەبدا و بەجۆرێ هیچ نەژادێکی لەکەدار نەدەکرد و باسی لایەنە عەیب دارەکانی نەدەکردن بە پێچەوانەی خەڵکانی ترەوە، یەکەمین کەس بوو لە زانینی نەژادی قورەیشدا و شارەزاترینیان بوو لەو بارەیەوە و لایەنی چاکی و خراپیانی دەزانی، بە بازرگانی ناوبانگی دەرکردبوو، سامانی دەبەخشی بە دەستبڵاوی و بەخشندەییەوە لەسەردەمی نەفامیدا.

٦- ئەبوبەکرﷺ کانزایەکی بەنرخ بوو خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی هەڵگرتبوو و لەناو قورەیشیەکاندا خۆشەویسترینیان بوو، لەبەرئەو ڕەوشتە جوانە پڕلە لێبوردنانەی کە خوا پێی بەخشی بوو وای لێکردبوو کە هاوڕێیەتی کردنی خۆش بوو،ئەەیکرا لەگەڵ خەڵکی و خەلکیش لەگەلی دەیکرا.

٧- جولانەوەی صدیقﷺ بە بانگەوازەکەیەوە وێنەیەکە لە وێنەکانی باوەڕی تەواو بەم ئاینە، بەدەمەوەچوونی خوا و پێغەمبەرەکەی، وێنەی ئەو باوەڕدارەیە کە ئازانێ دانیشێ و ناحەوێتەوە تا ئەو باوەڕەی ئەگەیەنێتە هەموو خەڵکی.

٨- ئەبوبەکرﷺ تووشی جۆرەها سزادان و ئەشکەنجە بوو، زۆر ئەشکەنجەدەدرا و بەرد و خۆڵیان دەکرد بەسەریدا، لەناو کەعبەدا بە نەعل هاتن پیایدا بە جۆرێ لوت و چاوی دیارنەمابوو لە ناو خوێندا، تا بردیانەوە بۆ ماڵ.

٩- لەو ڕەوشتانەی صدیقی پێناسرابوو: ئازایەتی و بە غیرەتی- بەجۆرێ لەو مەسەلەی هەقدا لەکەس نەترساوە، گوێی بە لۆمەکارانیش نەداوە، لە پێناو ئاینی خوا و کارکردن بۆی و بەرگریکردن لە پێغەمبەری خواﷺ.

١٠- صدیق بەشداری کردبوو لە ئازادکردنی بەندەکاندا و ئەمەش بوو بە پرۆگرامێك و سەرکردەکانی ئیسلام کاریان لەسەردەکرد تا لە ناهامەتیەکان بەندەکان کەم بکەنەوە، پشتگیری بانگەوازبوو بە پیاو و سامان، بەجۆرێ بەندە و کەنیزەکی دەکڕی لەبەر خاتری خوا ئازادی دەکردن.

١١- صديق زانستی نەژادیەکەی خستبووە پێناوی بانگەواز، بۆ ئەو مەبەستە هەمیشە هاوەڵی پێغەمبەری خوای دەکردﷺ کاتێ بۆ بانگەواز دەچوونە ناو هۆزە عەرەبەکان لە مەوسیمەکاندا.

١٢- هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوای کردﷺ لەکاتی کۆچکردن بۆ مەدینە، وەك باڵی ڕاستی پێغەمبەری خوا وابووە، هەر لە سەرەتای بانگەوازەوە تا وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ، بەبێ دەنگی لە کانیاوی پێغەمبەرایەتی حیکمەت و باوەڕ و یەقینی و سوربوون و تەقوا، دلسۆزی، ئەم هاوڕێیەتیە بەروبومی گەیشت، بە چاکی و ڕاستگۆیی، بە ئاگایی، خۆشەویستی، پاکی، دڵسۆزی، تێگەیشتوویی، پاش وەفاتی پێغەمبەر بووبە خاوەنی کۆمەڵێ هەڵوێستی بەرز وەك لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە و شوێنەکانی تریش، وەك ناردنی سوپای ئوسامە، جەنگی دژی پاشگەزبوان، ئەوەی خراپ بوو بوو چاکی کردەوە و ئەوەی ڕووخابوو بینای کردەوە و ئەوەی بڵاوبوو کۆی کردەوە و ئەوەی لایدابوو ڕاستی کردەوە.

١٣- لە خزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ ئامادەی هەموو جەنگەکان بووە و یەك غەزای لەدەست دەرنەچووە، لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ لە جەنگی ئوحود دا لە جێگەی خۆی ڕاوەستا لەکاتێکدا خەڵکی هەموو ڕایان کرد، پێغەمبەرﷺ بەیداغی گەورەی دایە دەستی لە جەنگی تەبوکدا کە ئاڵایەکی ڕەش بوو.

١٤- ژیانی ئەبوبەکر ﷺلە کۆمەڵگەی مەدەنیدا پڕبووە لە پەند و وانە، نمونەیەکی زیندووی بۆ بەجێهێشتووین لەتێڕوانین و تێگەیشتنی ڕاستەقینەی ئیسلام، جێ بەجێ کردنی لەناو خەڵکدا، کەسایەتی صدیقﷺ بە کۆمەڵێ ڕەوشتی جوان جیادەکرێتەوە، وەسفکردنی لەلایەن پێغەمبەری خواداﷺ لە زۆرێ لە فەرمودەکانیدا، چاکی و لەپێشی ئەو باس دەکات بەسەر هەموو هاوەڵە بەڕێزەکانیدا، خوا لە هەموویان ڕازی بێت.

١٥- صدیقﷺ باوەڕی بە خوای گەورە زۆر قایم بووە، لەناو کرۆکی باوەڕ گەیشتبوو، شوێنەوارەکانیشی لە جەستەیدا بەدی دەکرا، لە هەموو ژیانیدا ئەو کاریگەریە بەدی دەکرا تێیدا، بە ڕەوشتە بەرزەکان خۆی ڕازاندبوویەوە و لە ڕەوشتە نزمەکانیش خۆی

دارڕنیبوو، زۆر سوربوو لەسەر دەستگرتن بە شەرعی خواوە و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خواداﷺ. بوونی باوەڕی بتەوی خودا... هۆکاری جموجۆڵ و هیمەت بەرزی و چالاکی و هەوڵ و کۆشش و لێبڕان و جیهاد و پەروەردە و بەرزی و سەربەرزی بووە بۆی، لەناو دڵیدا یەقین و باوەڕێکی زۆر مەزن هەبوو کە یەقین و باوەڕی هیچ هاوەڵێکی تری پێ نەگەیشتووە.

١٦- صدیق زاناترین کەس بوو بە خوای گەورە و لە هەمووان زیاتر لێی دەترسا، ئەهلی سوننە هەموو لەسەر ئەوەن کە ئەبوبەکر شارەزاترین کەسی ناو ئوممەتی ئیسلام بووە، زۆرکەسی کۆدەنگی -اجماع-ی لەسەر ئەوە هێناوە، هۆی ئەم شارەزایی و پێش ڕەفتیەی دەگەڕێتەوە بۆ بەردەوامی هاوڕێیەتی کردنی پێغەمبەری خواداﷺ، لە هەموو هاوەڵان زیاتر هاوڕێی شەو و ڕۆژی بووە، چ لە شار یان لە گەشت و گوزار، لەپاش عیشایش بۆ شەونشینی لە خزمەت پێغەمبەردا بووە، سەبارەت بە ئیش و کاری موسڵمانان ڕاگۆڕینەوەیان دەکروە.

پێغەمبەری خوداﷺ لە جیاتی خۆیدا کردوویەتی بە جێگری خۆی وکردوویەتی بە ئەمیری حەج و فیقهی حەجیش لە مەسەلە زۆر وردەکانی بەندایەتیدا، ئەگەر لەبەر فراوانی شارەزاییەکەی نەبوایە لەو جێیەدا دای نەدەنا، هەروەها نوێژ کە لە جێی خۆی داینا بە بەرنوێژ، ئەگەر لەبەر زانست و شارەزاییەکەکی نەبوایە نەئەویش و نە کەسی تریشی نەدەکردە ئەمیری حەج یان بەرنوێژ، یان دەربارەی زەکات و صدقە کە پێغەمبەری خوا فەرزی کرد، ئەنەس ئەو زانستەی لە ئەبوبەکرەوە وەرگرتووە و ئەوش گەورەترین سەرچاوەی ئەو مەسەلەیەیە، زاناکانی ئیسلام پشتیان پێی بەستووە بۆ زانینی کام فەرمودە لە پێش کام فەرمودەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە هەموان شارزاتربووە لە زانینی ئەو فەرمودانەی کە حوکمی فەرمودەی پێش خۆیان سڕیوەتەوە -الناسخ و المنسوخ- . لەوبارەیەوە ووتەیەکی نەوتووە کە پێچەوانە بێت لەگەڵ دەقێکدا، ئەمەش ئەوپەڕی پایە بەرزیە لە زانست و زانیاریدا.

١٧- کاتێ پێغەمبەری خواداﷺ وەفاتی کرد خەڵکی تێکچوون، بەڵام خوا ئەم ئوممەتەی ڕاوەستاوکرد بە هۆی صدیقرضي الله عنه ، هەڵوێستە مەزنەکەی گرتەبەر ووتی: (( هەرکەسێ

محمدی دەپەرست، محمد مرد، بەڵام هەرکەسێ خودای پەرست ، خودا زیندووە و نامرێت)).

هەروەك لە سەقیفەی بەنی ساعیدە هەڵوێستی مەزنی دەرکەوت، بە جۆرێ توانی پشتیوانان ڕازی بکات بەوەی کە ڕاست و دروستە، بەبێ ئەوەی موسڵمانان تووشی ئاشوبی ئاژاوە ببنن، باسی چاکە و لێهاتوویی پشتیوانانی کرد و ئەو فەرمودە و ئایەتانەی لەسەریان هاتبوو باسی کردن بە چاکە.

١٨- سەعدی کوڕی عوبادەﷺ بەیعەتی دا بە ئەبوبەکر بە جێنشینی لە دوای ئەو وتووویژەی لەسەر سەقیفەی بەنی ساعیدە ڕوویدا، لەو پلە و پایە بەرزەی کە بانگەشەی بۆ دەکرد دابەزی و بەیعەتی خەلافەتی دا بە ئەبوبەکر، ئامۆزاکەشی کە بەشیری کوڕی سەعدی ئەنساری بوو یەکەم کەس بوو لە لەو کۆنفرانسەدا بەیعەتی دا بە ئەبوبەکر، یەك قەیرانی بچوك یان گەورە لەو بارەیەوە نەقل نەکراوەبۆمان، هیچ کەرت بوون یان جیایی کە هەر لایەك حەزبکات کاندیدەکەی ئەو هەڵبژێرێت وەك چۆن هەندێ نوسەری مێژوو کەوتوونەتە ئەو هەڵەیەوە، بەڵام برایەتی موسڵمانی لەناویاندا مایەوە وەك خۆی، بەڵکو زیادیشی کرد وەك لە ڕیوایەتە صەحیحەکاندا هاتووە.

١٩- کۆمەڵێك ئایەتی پیرۆز و بڕێك فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هاتووە کە ئاماژە بۆ خەلافەتی صدیقﷺ دەکات و هەموو ئەهلی سوننە و جەماعەت لەسەر ئەوەی کە ئەبوبەکر شایانترین کەسی ئوممەت بوو بە جێنشینی پێغەمبەری خواﷺ، ئەمەش لەبەر پێشینەی سپی و پیاوچاکی و دیاریکردنی بە پێش نوێژی موسڵمانان لەلایەن پێغەمبەری خواﷺ لەناو هەموو هاوەڵاندا،هاوەڵان تێگەیشتن بۆچی پێغەمبەر لە نوێژ پێشی خستووە، ئەمانیش لەوەوە وەریانگرت کە دەبێت بکرێتە جێنشینی ئەو.

٢٠- خەلافەتی ئیسلام پرۆگرامێکی بەڕێوەبردنی حوکمڕانیە و موسڵمانەکان وەك ڕێگایەك هێنایانە کایەوە، لەو ڕێگایەوە ئیش و کارەکان جێ بەجێ دەکرێت و بەرژەوەندیەکان ڕەچاودەکرێن، دروست بوونی-خەلافەت-لەوە دەستی پێکرد کە ئوممەتی ئیسلام

پێویستی پێی بوو، هەر لەو سەرچاوەیەوە بوو کە موسڵمانان زۆر پەلەیان دەکرد لە دیاریکردنی جێنشینی بۆ پێغەمبەرەکەیانﷺ.

خەلافەت دەستوری حوکمڕانی موسڵمانانە و قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خواﷺ سەرچاوەی گرتووە، زانایان دەربارەی بنەماکانی خەلافەتی ئیسلامی قسەیان کردوە و شورا و بەیعەتیان بە دوو بنەمای گرنگی داناوە کە قورئانی پیرۆزیش زۆر ئاماژە بۆ ئەو دووانە دەکات.

٢١- زانای پایەبەرز ئەبوالحسن الندوی باس لەمەرجەکانی جێنشینی پێغەمبەری خواﷺ دەکات، بە بەڵگە لە ژیانی ئەبوبەکرداﷺ دەرکەوت کە سەرجەم ئەو مەرجانە لە ئەبوبەکردا هەبوون و هاتنەدی.

٢٢- دوای بەیعەتی گشتی صدیق ووتارێکی بۆ ئوممەت دا، کە بە یەکێك لە سەرچاوەکانی ووتاری ئیسلامی دادەنرێت کە لەگەڵ کورتیەکەیدا بەرنامەی حوکمی دەوڵەتی ئیسلامی تیا ڕوون کردەوە، بنەماکانی دادپەروەری و سۆز و بەزەیی تیادەرخست لە نێوان حاکم و گەلدا و داکۆکی لەسەر ئەوەکرد کە گوێ ڕایەڵی ئەمیر بەندە بەگوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەوە، باسی جیهادی ڕێگەی خوای کرد باسی گرنگیەکەشی بۆ کردن لە بەدیهێنانی سەربەرزی ئوممەتی ئیسلام بەهۆیەوە، هەروەك باسی دورکەوتنەوە لە ڕەوشتە نزمەکانی بۆ کردن ئەمەش لەبەر گرنگی پاراستنی کۆمەڵگە لە گەندەڵبوون و ڕامان.

٢٣- صدیق ویستی هەستێ بەجێ بەجێ کردنی ئەو سیاسەتەی کە بۆ دەوڵەتەکەی کێشابووی، لەناو هاوەڵاندا یارمەتیدەری لەو کارەدا بۆ خۆی دانا، کاروباری دارایی سپارد بە دەستپاکی ئوممەتی ئیسلام ئەبوعوبەیدە سپارد، وەزارەتی دادیشی دایە دەستی عمری کوڕی خطابﷺ بەهاوکاری ڕاستەوخۆی خۆیشی لەو کارەدا.

هەروەك دانانی زەیدی کوڕی ثابتﷺ وەك وەزیری پۆستە و گەیاندن و هەندێ جاریش عەلی کوڕی ئەبوطالبﷺ یان عثمانی کوڕی عەفانﷺ ئەو کارەی بۆ دەکرد،پاش ئەوە موسڵمانان نازناوی -جێنشینی پێغەمبەری- خوایان بڕی بە بەری

ئەبوبەکردا کرد و وایشیان بە باش زانی یەکلای بکەنەوە بۆ ئیش و کاری خەلافەت و موچەیەکی تایبەتی لە (بیت المال) بۆ ببڕنەوە.

٢٤- ئەبوبەکری صدیق ﷺ لە ناو موسڵمانانداو وەك خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەژیا، هیچ هەڵێکی لەدەست نەدەدا و تیایدا یان فەرمانی بە چاکە دەکرد یان بەرگری لە خراپەدەکرد، هەڵوێستەکانی تیشکی هیدایەت و باوەڕ و ڕەوشت بەرزی بە چواردەورەکەی دەبەخشی.

٢٥- سەردەمی صدیق ﷺ کە سەرەتای سەردەمی ڕاشیدین بوو، گرنگیەکەی لەوەدایە کە نووساوە بە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ و نزیکە لێیەوە، بەگشتی سەردەمەکەی ڕاشیدین و بەتایبەتی لایەنی دادگا درێژەپێدەری دادگای سەردەمی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، جێگیرکردنی تەواوی هەموو ئەو حوکمانەی لە سەردەمی پێغەمبەردا دەرکراوە، جێ بەجێ کردنی پیت بە پیت و بە وردی.

٢٦- ئەبوبەکر ﷺ بەسەر وڵاتە ڕزگارکراوەکانەوە والی دادەنا، سەربەستی ئیش و کاری دەدانێ لەلایەن ئیدارە و حوکمڕانی و بەرنوێژی و کۆکردنەوەی خێر و زەکات و هەموو کارەکانی تر کە بۆ والی هەبوون بیانکات، زۆر بە وردی لە هەلبژاردنەکانی پێغەمبەر ﷺ وورد دەبویەوە و چاوی لێدەکرد لە هەلبژاردنی والی و سەرکردەکانیدا، بۆیە دەبینین هەموو ئەو بەرپرس و والییانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەردەمی خۆیدا دایناببوون، ئەبوبەکر -لە پاش وەفاتی پێغەمبەر- لەشوێنی خۆیان هێشتیەوە، کەسیانی لانەبرد مەگەر ناردبنی بۆ جێگەیەکی تر کە گرنگ تر بووبێت لە کاری یەکەمی و خۆیشی پێی خۆش بووبێت، وەك ئەوەی بە عەمری کوڕی عاصی کرد ﷺ.

هەموو دەسەڵاتەکانی والییەکانی ئەبوبەکر ، هەمان دەسەڵاتی والییەکانی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، بە تایبەت ئەگەر ئەو والییانەی پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ دایناببوون.

٢٧- ریواتی زۆر باسکراوە دەربارەی دواکەتنی علی ﷺ لە بەیعەتدان بە ئەبوبەکر ﷺ، هەروەها دواکەوتنی زوبێری کوڕی عەوام ﷺ، زۆربەی ئەو ڕیوایەتانە ڕاست نین و دەستکردن، مەگەر ئەو فەرمودەیە نەبێت کە (ابن عباس) ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

عەلی و زوبێر لە ماڵی فاطمە بوون و بە بۆنەی خەریکبوونیان بە شـۆرین و کفنکردنـی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیانتوانی ئامادەی بەیعەتـدان بـن لـە ڕۆژی یەکەمـدا، لـە ڕۆژی داهاتوودا هەردووکیان رضي الله عنهما بەیعەتیان پێدا کە ڕۆژی سێ شەممەبوو.

٢٨- کاتی دەربارەی میراتییەکانی پێغەمبەری خوا پرسیاکرا، بە فاطمە و عباسـی ووت: لـە پێغەمبەری خوام بیستووە کە فەرمویەتی: (( لا نـورث ماترکنـاه صـدقه، انما یأکـل ال محمد من هذا المال)) واتە ئێمەی پێغەمبەران میراتمان دابەش ناکرێت و دەکرێت بە خێر، بەڵکو دەتوانین لە سامانی غەنیمە کراو بخۆین)).

لە ڕیوایەتێکی تردا ئەبو بەکر (رضي الله عنه) وتوویەتی: «واز لە هیچ شتێك ناهێنم کە پێغەمبەری خوا کردبێتی و منیش وا دەکەم، ترسی ئەوەشم هەیە ئەگەر جێبەجێیان نەکەم لە ڕێگەی ڕاست لابدەم».

لە مێژوودا ئەوە ئاشکرا و جێگیرە کە ئەبو بەکر بە درێژایی ژیانی لە ماڵی — فەیئ — و دەستکەوتی غەزاکان بەشی (ئالوبەیتی) داوە و بەڵام میراتی پێ نەداون بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

٢٩- ئەبو بەکر (رضي الله عنه) لە وتارەکەیدا سروشتی جێنشینیەکەی خۆی ڕوون کردەوە و وتی من جێنشینی پێغەمبەری خوام نەك جێنشینی خوای گەورە، بەڵکو جێنشینی پێغەمبەرەکیم و منیش مرۆڤم و مەعصوم و بێگوناه نیم، من ئەوەی پێغەمبەری خوا کردی بۆ ئیسلام و پەیامەکەی من ناتوانم ئەوە بکەم، لە سیاسەتیدا شوێن کەوتە بووە نەك داهێنەر.

٣٠- لەو پەند و ئامۆژگاریانەی لە ناردنی سوپاکەی ئوسامە (رضي الله عنه) وەری دەگرین، ئەوەیە کە بار و زروف بە هەر لایەکدا بسوڕێت و هەموو ناڕەحەتیەکان دەستەی باوەڕ لە گرنگیدان بە کاروباری ئاین لانادەن و کاروانی بانگەواز بە کەسەوە بەند نیە، پێویستی گەڕانەوەی هەموو ناکۆکیەکانی ناو موسوڵمانان بۆ لای قورئان و سونەت، بانگەواز دەبێت کردەوەشی لەگەڵدا بێت و ڕۆڵی گەورەی لاو لە خزمەتکردنی ئیسلام، جوانی ئادابە ئیسلامیەکانی جیهادکردن و هێنانەوەی ئامانجەکانی سوپای ئوسامە، کە بەرەی باکوور کە پاشگەزبوەکان بووبوون بە لاوازترین بەرەکانی جەنگ.

٣١- ئەو پاشگەزبوونەوەیەی کە هۆزە عەرەبەکانی گرتەوە لە پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چەند هۆکارێکی هەبوو لەوانە:

گەروەیی کارەساتی مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و تێنەگەیشتن لە ڕاستی ئاینەکە و دەقەکانی، بیرکردنەوەی سەردەمی نەفامی و بەراوردکردنی ڕەوشتە زەشتەکانی لە بەرامبەریشدا حەزی لە باس دەرچوون و گەڕانەوە بۆ بێ شەرعی و دەمارگیری سەردەمی نەفامی و دەستکەوتنی پلە و پایە، کاسبی کردن بەسەر ئاینەوە و ڕەزیلی لە پارە و پوولدا و حەسوودی و کاریگەری بێگانە وەك ڕۆڵی جوولەکە و گاور و مەجووسەکان.

٣٢- جۆرەکانی پاشگەز بوونەوە: هەبوو بە تەواوی وازی لە ئیسلام هێنابوو، گەڕایەوە سەر نەفامی و بت پەرستی و هەندێکیان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی خۆیانیان دەکرد، هەندێکیان وازیان لە نوێژ هێنا، هەندێکیان خۆیان بە موسوڵمان دەزانی و نوێژیان دەکرد بەڵام زەکاتیان دەرنەدەکرد، هەندێکیان دڵخۆش بوون بە مردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گەڕانەوە سەر وەزعی سەردەمی نەفامی جارانیان، هەندێکیشان ئەبڵەق بووبوون نەیاندەزانی چی بکەن و چاوەڕوانیان دەکرد تا بزانن وەزعەکە بەرەو کوێ دەڕوات، هەموو ئەم جۆرانە بە درێژی لە لایەن زانایانی فیقھ و مێژوو باسیان لێوە کراوە.

٣٣- هەڵوێستی صدیق (ﷺ) دەربارەی پاشگەزبووان لامسەرلایی نەبوو، صولحی نەبوو، نەدەچووە سەر قسەیان، بەڕاستی دوای خوای گەورە ئەو پیاوە ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە پاراستنی ئیسلام و مانەوەی بەو شێوە پاك و خاوێن و ئەسیلەوە، هەموو دان بەوەدا دەنێن و مێژوو شایەتە کە ئەو ڕاوەستانە جوامێرانەی صدیق (ﷺ) لە بەرامبەر مەسەلەی پاشگەزبوونەوەدا و نەهێشتنی هەڵوەشانەوەی ئیسلام وا بوو لەسەردەمی خۆیاندا، ئەو جێنشینەی کە شوێنی پێغەمبەری خوا گرتەوە و بەڕاستی مافی تەواوی خۆی پێدا بە جۆرێك کە شایستەی سەنا خوانی هەموو موسوڵمانان بوون لەگەڵ دوعای خێر بۆی تا ڕۆژی دوایی.

٣٤- ئەوەی ڕاستیەکە و دەبێت بوترێت کە ئەم ئاژاوەی پاشگەزبوونەوەیە هیچ ناوچەیەکی جوغرافی سەرتاپای نەگرتبوویەوە بەڵکو کۆمەڵێك سەرکردە و هەندێ هۆز و

کەسایەتی و تاکەکەس مابوون کە دەستیان بە دینەکەیانەوە گرت و وازیان لیّ نەهێنا لە هەموو ناوچەکاندا.

٣٥- لە جەنگی هەڵگەڕاوەکانی یەمەندا دوو جۆر ئافرەت بەدی دەکران، یەکەمیان وێنەی ئافرەتی پاك و بێگەرد کە لەگەڵ ئیسلامدا مانەوە و دژایەتی بەدڕەوشتیان دەکرد و شان بە شانی پیاوان بەرەنگاری پاشگەزبووانیان دەکرت وەك – خاتو ئازاد – ی فارسی خێزانی شەهری کوڕی بازان و کچی مامی فەیرۆزی فارسی، لە بەرامبەردا وێنەیەکی تر بەدی دەکرێت کە ناشیرین و تاریکستانە وەك ئەوەی هەندێ لە کچانی جوولەکە لە یەمەن پێی هەستان و لە خۆشیاندا دەفرێن بە بیستنی هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، وە شەوە سوورەکانیان زیندوو دەکردەوە لەگەڵ گەنجە بێ ڕەوشتەکاندا، هانی خەڵکیان دەدا بۆ بێ ڕەوشتی و گاڵتەیان بە داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی دەکرد، بە جۆرێك شەیتانیش لەگەڵیاندا کەوتبووە سەما بۆ ئەو پاشگەزبوونەوەیەی خەڵکیە لە ئیسلام و داوایان دەکرد زیاتر خەڵك واز بهێنێت.

٣٦- هەندێ لە خەڵکی یەمەن هەڵویستی بەرزیان نواند لە ڕاوەستاویان لەسەر ئیسلام و بانگەوازکردن بۆی و ترساندنی هۆزەکانیان لە ئاکامی پاشگەزبوونەوە، لەوانە (مەرانی کوڕی ذي عومەیری هەمەدانی) کە یەکێك بوو لە پاشاکانی یەمەن و عبداللە کوڕی مالیکی ئەرحەبی کە هاوەڵی پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) و شەرحەبیلی کوڕی سەمط و کوڕەکەی لە بەنی معاویە لە کیندە.

٣٧- پاش جەنگی هەڵگەڕاوەکان، یەمەنیەکان لە ژێر فەرماندەیی پایتەختی ئیسلام مەدینەدا کۆبوونەوە و یەمەن کرا بە چەند یەکەیەکی ئیداری لە جیاتی چەند یەکەی عەشایەری جاران و کرا بە سێ یەکەی ئیداریەوە: صنعاء و جند و حضرموت، و پاش ئەوە مەسائلی خێڵایەتی بووبووە سەرچاوەی حوکمڕانی و هۆزەکان تەنها وەك سەربازگەیەك مانەوە بۆ سوپای ئیسلام، ئیتر پێوەری باوەڕ و لە خواترسان و دڵسۆزی و کردەوەی چاك پێوانەی پیاوانی پیّ دەکرا.

٣٨- تێکشکانی تولەیحەی ئەسەدی – لە جەنگی بوزاغەدا کاریگەرە گەورەی هەبوو لە گەڕانەوەی زۆرێك لە هۆزەکان بۆ باوەشی ئیسلام، بەنو عامر پاش تێکشکاندنەکە وتیان:

دێینەوە ناو ئەو ئاینەی لێی چووینە دەرەوە، خالیدیش بەیعەتی لێ وەرگرتنەوە بەو جۆرەی لە ئەهلی بوزاخەی وەرگرت لە ئەسەد و غطفان و طیئ.

٣٩- کوژرانی مالیکی کوڕی نوێرە بە هۆی لووت بەرزی و خۆبەل زانینەکەیەوە، چونکە خەوش و خالّی سەردەمی نەفامی تێدا مابوو، بۆیە هەر دەستی و سستی نواند لە شوێنکەوتنی بەرپرسانی ئیسلام لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و مافی (بیت المال)ی نەدەدا کە زەکات بوو.

٤٠- ئەبو بەکر (ﷺ) هەستا لێپرسینەوە و لێپێچینەوەی مەسەلەی کوشتنی مالیکی کوڕی نوێرە و لە ئاکامدا دەرکەوت خالیدی کوڕی وەلید بێتاوانە، صدیق لەو مەسەلانەدا لە هەموو هاوەڵان زیاتر دەکۆڵیەوە و ئاگادار بوو، چونکە خەلیفە بوو، هەواڵەکان بۆ ئەو دەهات.

٤١- لەتەوای ئەبو بەکر (ﷺ) ئەوەبوو کە خۆی زۆر نەرم بوو، بۆیە بۆ ئەوەی لایەنی نەرمی و توندی لە یەك گرێ بدات و هیچ لایەك زاڵ نەبێت بەسەر ئەو لاکەی تردا خالیدی توند دەکاتە سەرکردە و عومەری توند دەکاتە ڕاوێژکاری خۆی و بە هۆیەوە سیفاتی صدیق کەمال و تەواوگیری بۆ دروست بوو، چونکە نەرمی بە تەنها خراپە و توندیش بە تەنها خراپە.

٤٢- (مثنی کوڕی حارثة الشیباني) ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە کوژاندنەوەی ئاژاوەی هەڵگەڕانەوەی بەحرەیندا و وەستانی بە هەموو هێز و سەربازەکانیەوە لە پشتی (عەلای حەزرەمی)، کە بە سەربازەکانیەوە لە باکووری بەحرەین دەستی گرت بەسەر قطیف و هجردا تا گەیشتە سەر چەشمەی دیجلە و لەو ڕێیەدا توانی سەرکەوێت بەسەر هێزی فارسەکاندا، هەواڵەکانی دەگەیشتە صدیق و لە هاورێکانی دەپرسی دەربارەی و قەیسی کوڕی عاصم (المنقری) وتی: ئەمە پیاوێکە بە ناوبانگە و نەژادی ئاشکرایە و پشت ئەستوورە ئەمە (مثنی کوڕی حارثة الشیباني)یە.

٤٣- شکانی سوپای بەنی حەنیفە لە یەمامەدا بە دەستی سوپای موسوڵمانان و بە سەرکردایەتی خالید، دادەنرێت بە پشت شکێن بۆ بزاڤی پاشگەزبوونەوە، لەناو شەهیدەکانی

موسوڵمانان‌دا زۆرێك له (قورئان له‌به‌ران)ی تێدابوو، بۆیه ئه‌وه‌ی لێ كه‌وته‌وه كه ئه‌بو به‌كر (ﷺ) له‌سه‌ر ڕاوێژی عومه‌ر (ﷺ) هه‌ستا به كۆكردنه‌وه‌ی قورئان له‌سه‌ر پێست و ئێسقان و ته‌خته به‌رد، ئه‌بو به‌كریش (ﷺ) ئه‌م كاره مه‌زنه شارستانییه‌ی سپارد به هاوه‌ڵی به‌ڕێز و شیرینی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) زه‌یدی كوڕی ثابت (ﷺ).

٤٤- هه‌موو مه‌رجه‌كانی سه‌ركه‌وتن و زاڵ بوون و پێداویستیه‌كانی له سه‌رده‌می ئه‌بو به‌كر و سه‌رجه‌م خه‌لیفه ڕاشیده‌كاندا هاتبووه‌دی، له دوای خوا ئه‌بو به‌كر له هه‌موو كه‌س زیاتر ئه‌م مه‌رجانه‌ی ده‌خسته‌وه یادی موسوڵمانان، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ش بوو كه ڕازی نه‌بوو له ئه‌عرابه‌كان قبووڵ بكات زه‌كات نه‌ده‌ن و سووریش بوو له‌سه‌ر ناردنی سوپای ئوسامه، به ته‌واوی پابه‌ند بوو به شه‌رعی خواوه و له بچووك و گه‌وره‌دا لێی لانه‌ده‌دا.

٤٥- ئاماده‌كاریه‌كانی صدیق (ﷺ) بۆ به‌ره‌نگاربوونه‌وه‌ی پاشگه‌ز بوونه‌وه، چ له ڕووی ماده‌وه چ له ڕووی ده‌روونیه‌وه، سوپای خسته ڕێ، لیواكانی جیاكرده‌وه و سه‌ركرده‌ی ناوازه‌ی هه‌ڵبژارد بۆ جه‌نگی پاشگه‌زبووان و نامه‌ی نارد بۆ هه‌ڵگه‌ڕاوه‌كان، هاوه‌ڵانی هاندا بۆ جه‌نگ دژیان و چه‌ك و وڵاخ و حوشتر و پێداویستیه‌كانی ئاماده‌كرد و دژی بیدعه و نه‌فامكاری و ئاره‌زووكاری.

شه‌ریعه‌تی كار پێكرد و بنه‌مای یه‌كبوون و یه‌كگرتن و كۆبوونه‌وه‌ی جێبه‌جێ ده‌كرد، به به‌رنامه‌ی خۆیه‌كلایی كردنه‌وه و تایبه‌تمه‌ندی كارپێ ده‌كرد، خالیدی هه‌ڵبژارد بۆ سه‌ركردایه‌تی سوپا، زه‌یدی هه‌ڵبژارد بۆ كۆكردنه‌وه‌ی قورئان، ئه‌بو به‌ره‌زه‌ی ئه‌سله‌می بۆ ناردنی پۆسته و نامه‌كان، گرنگی ده‌دات به لایه‌نی ئاسایش و ڕاگه‌یاندن و هۆكاره‌كانی تریش.

٤٦- ئاسه‌واری جێبه‌جێكردنی شه‌رعی خوا له سه‌رده‌می صدیقدا له‌وه‌دا به‌دی ده‌كرا كه زاڵبوونی هاوه‌ڵان له دوا بوو، كه هه‌موویان سوور بوون له‌سه‌ر به‌رپاكردنی هه‌موو به‌ندایه‌تیه‌كان له ناو خۆیان و ماڵ منداڵ و دڵسۆزانه خۆیان یه‌كلایی كردبوویه‌وه بۆ خوا و به‌رپاكردنی شه‌رعه‌كه‌ی، خوای گه‌وره‌ش پشت ئه‌ستووری كردن و سه‌ری خستن به‌سه‌ر هه‌ڵگه‌ڕاواندا و ئه‌من و ئاسایشی پێ به‌خشین.

٤٧- جیهادی موسوڵمانان دژی هەڵگەڕاوەکان ئامادەسازیەکی خوا بوو بۆ جەنگە ڕزگاریخوازەکانی پاش ئەوە، کە توانا و دەسەڵاتەکان و ئاڵاکان دەرکەوتن و تواناکان تەقینەوە و سەرکردەکانی ناو مەیدانی جەنگ دەرکەوتن و سەرکردەکان هەرچی هونەری جەنگی هەبوو بە کاریان هێنا و نەخشەسازیەکانیان جێبەجێ دەکرد.

سەربازی ئازا و گوێڕایەڵ و تێگەیشتوو و یاساپارێز ئامادەکرا، بە جۆرێك دەیزانی بۆچی دەجەنگێت هەموو شتێك لەو پێناوەدا بە خەرج دەدات و دەزانێت بۆ کێ ئەم قوربانیە دەدات، بۆیە کارەکانی بە جوانی و گیان فیدایی بە دڵسۆزی دەنواند.

٤٨- نیمچە دوورگەی عەرەب بۆ یەکەمجار لە ژێر ئاڵایەکی یەکگرتوودا یەکیان گرت ئەمەش پاش هاوکاری خوا بەهۆی جیهاد و بەرخودانی هاوەڵانەوە بوو لە پشتی ئەبو بەکری سەرکردەیانەوە (ﷺ) هۆی ئەمەش لابردنی سەرکردەلاوەکیەکان و هێنانیان بۆ ناو سوپای نیزامی ئیسلامی، شاری مەدینەی پڕنوور باڵی دەسەڵاتی خۆی کێشا بەسەر دوورگەی عەرەبیدا، وای لێهات هەموو ئومەت لە دوای یەك سەرکردەوە و بە یەك بیروباوەڕەوە دەجەنگان.

سەرکەوتنەکانیان سەرکەوتن بوو بۆ بانگەوازی ئیسلامی و هێشتنەوەی ئومەت بە یەك پارچەیی و پاراستنی لە هۆکارەکانی پەرتەوازەبوون و هەڵوەشان.

هەروەك بەڵگەیەکیش بوو لەسەر ئەوەی دەوڵەتی ئیسلام بەسەرکردایەتی صدیق (ﷺ) توانای هەیە زاڵ بێت بەسەر گەورەترین قەیراندا.

٤٩- ڕووداوە مێژوویەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هەر هەوڵێك بۆ یاخیبوون لە ئیسلام ئیتر تاکەکان یان دەوڵەتان پێی هەڵبستن ئاکامی هەر تێکشان و بێ هیواییە.

چونکە ئەو یاخیبوونە یاخیبوونە لە خوا کە لە قورئانەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە کە خۆی کەفالەتی پاراستنی کردووە و پاراستنی ئەو کۆمەڵەشی کە لە چوار دەوری خڕبوونەتەوە هێشتنەوەی لەسەر ڕێگای ڕاست بە درێژایی تەمەن، جێبەجێکردنی حوکمی خۆی لە قازانجی (لە خواترسان) و منەتیش دەخات بەسەر چەوساوەکاندا کە لوتی ستەمکارەکانیان بۆ شۆڕ دەکات.

٥٠- هەر کە جەنگی هەڵگەڕاوەکان تەواو بوو، ئاژاوەی پاشگەزبوونەوە کوژایەوە، یەکسەر صدیق (ﷺ) دەستی کرد بە جێبەجێکردنی جەنگە ڕزگاریخوازیەکانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتی خۆی مەشخەڵی بۆ هەڵگرتبوو، سوپای گەورەی خستەڕێ بۆ ڕزگارکردنی عێراق و شام.

٥١- ئەو فەرمانانەی کە صدیق (ﷺ) بۆ سەرکردەکانی عێراق و شامی دەکرد – (خالید و عیاض) بەڵگەیە لەسەر بوونی هەستی ستراتیژی کە لە صدیقدا هەبووە، کۆمەڵێك زانیاری عەسکەری پێدان کە هەندێکیان ستراتیژی و هەندێکی تریشیان تەکنیکی بووە، بۆ هەر سەرکردەیەکیان ناوچەی هێرش و چوونە ناوەوەی بۆ دیاریکردن، وەك بڵێیت خۆی لە عێراقدا ژیابێت یان نەخشەیەکی وردی جوغرافیای عێراقی لەبەر دەستدا بێت.

٥٢- خالید لە عێراقدا کۆمەڵێك جەنگی لاوەکی ئەنجامدا کە بوونە هۆکاری ڕزگارکردنی عێراق، وەك جەنگی (ذات السلاسل) و (جەنگی مەزار) و (وەلجە) و (ئەلیس) و (ڕزگارکردنی حیرە) و (ڕومادی) و (عین تەمر) و (دومة الجندال) و (ڕوداوی حصید) و (مصیخ) و (فراض).

٥٣- صدیق (ﷺ) کاتێك ویستی وڵاتی شام ڕزگار بکات ڕاوێژی بە گەورە هاوەڵانی کرد و پاشان خەڵکی یەمەنی بەرەو جیهاد ڕاپەڕاند و لیواکانی دیاری کرد بۆ سەرکردەکان و چوار سوپای نارد بۆ وڵاتی شام و سەرکردەکانیش ئەمانە بوون:

١- یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان.

٢- ئەبی عوبەیدەی جەڕاح.

٣- عەمری کوڕی عاص.

٤- شەرحەبیلی کوڕی حەسەنە.

٥٤- ئەو سوپایانەی دیاری کرابوون بۆ ڕزگارکردنی شام، نارەحەتیەکی گەورە لە ڕێیاندا بوو، چونکە بەرەنگاری ئیمپراتۆریەتێکی زۆر گەورە دەبوونەوە کە بە شێوازێکی گەورە و پڕچەك و ئامادەی جەنگ بوو.

نامەیان نارد بۆ صدیق (ﷺ) باسی بار و زروفە ناڕەحەتەکەیان بۆ کرد کە تێی کەوتبوون، صدیقیش (ﷺ) فەرمانی دەرکرد بۆیان کە پاشەکشە بکەنەوە بۆ یەرمووك و لەوێ کۆببنەوە، فەرمانیشی دا بە خالید لە عێراقەوە بە نیوەی سوپاکەیەوە بڕوات بە هانایانەوە و خۆیشی ببێتە فەرمانده‌ی گشتی سوپای ئیسلام لەوێ.

٥٥- خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) توانی کۆمەڵێك سەرکەوتنی مەزن بەدەست بێنێت بۆ سوپای ئیسلام کە گرنگترینیان جەنگی ئەجنادین و یەرمووك بوو.

٥٦- لێکۆڵەرەوان دەتوانن دیارترین مەشخەڵی سیاسەتەکانی دەرەوەی دەوڵەتی صدیق دەست نیشان بکەن لەم خاڵانەدا:

دروست کردنی هەیبەت بۆ ئیسلام لە دڵی گەلانی تردا، نواندی، دادپەروەری لە نێوان گەلە ئازادکراوەکاندا، نەرمی نواندن لەگەڵیاندا، لابردنی هەموو ئاسەوارەکانی زۆرلێکردن لەسەر هەموو ئەو گەلە ئازاد کراوانە و لابردنی هەموو ئەو بەربەستە مرۆییانەی دەکەوێتە نێوان ئەوان و ئیسلامدا.

٥٧- ئەو کەسانەی دەربارەی جەنگە ڕزگاریخوازەکانی ئیسلام دەخوێننەوە بۆیان دەردەکەوێت کە نەخشە و پلانی سەربازی ورد بەکارهاتووە، وە چۆن ئەم خەلیفە مەزنە هەموو هۆکارەکانی بەکارهێنا و کۆمەکی لەو پێناوەدا، وە چۆن ئەم پلانە سەربازیە ژیرانەیە دوای کۆمەکی خوا هۆکاری سەرەکی سەرکەوتن و زاڵ بوونی سوپای موسوڵمانان بوو.

**لەو نەخشانە:**

١- زۆر پێشڕەفتی نەکردن بۆ ناو قوڵایی خاکی دوژمن.

٢- ئامادەسازی و سوپاخستنە ڕێ، ڕێکخستنی گەیاندنی کۆمەکیەکان بە سوپاکان، دیاری کردنی ئامانج لەو جەنگانە، دیاریکردنی ئازا و لێهاتوویی بە پێی لێهاتوویی ناو مەیدانی جەنگ، وە دابڕانی مەیدانی جەنگ، پێشخستنی شێوازەکانی جەنگ، سەلامەتی هێڵەکانی پەیوەندی نێوان سەرکردەکان و زیرەکی و لێوەشاوەیی خەلیفە.

٥٨- صدیق (ﷺ) مافەکانی خوای بۆ سەرکردە و سەربازەکان ڕوون دەکردەوە وەك: خۆگری لەناو جەنگدا، بە دڵسۆزی جەنگان، جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکە، خزم خزمێنە و خۆشەویستی نواندن نەبێت لە سەرخستنی ئاینی خوا.

دیاری کردنی مافەکانی سەرکردەکان لەسەر سەربازەکان وەك: گوێڕایەڵی کردنیان، بە پەلە جێبەجێکردنی فەرمانکانیان و لام و چیم نەکردن لە مەسەلەی دابەشکردنی دەستکەوتەکاندا و شتانی تریش لەو مافانەی کە صدیق (ﷺ) بە درێژی لە نامەکەیدا بۆ سەرباز و سەرکردەکانی دەنارد و ڕوونی دەکردەوە.

لە مافەکانی سەربازەکانیش: پشکنینی حاڵیان، ڕیزکردنیان و ماندوو نەکردنیان لە ڕێ و ڕۆیشتندا، هەڵبژاردنی ئاستەکانی وەك نەقیب و عەریف لە ناویاندا، هەڵبژاردنی شوێنی چاك بۆ دابەزینیان بەرامبەر دوژمندا، ئامادەکردنی خواردن بۆ سەربازەکان و ئالف بۆ وڵاخەکانیان و چاودێری وردی جموجۆڵی سوپای دوژمن لە ڕێگای سیخوڕە باوەڕپێکراوەکانەوە، ئەمەش بۆ پاریزگاری لە سەربازە موسوڵمانەکان و هاندانیان لەسەر جیهاد و گیان فیدایی و پاداشتی خوا و گەورەیی شەهیدیان بخاتەوە یاد، ڕاوێژ پێکردنی ژێرمەندەکانیان، ئەرك و واجباتەکانی خۆیان بەسەردا جێبەجێ بکات، نەهێڵێت بە شتی ترەوە جگە لە جیهاد خۆیان خەریك بکەن، وەك بازرگانی و کشتوکاڵ کردن، هەموو ئەم ئامرژگاریانە لە دوو توێی نامەکانیدا دەرهێنراوە.

٥٩- بۆ هەر کەسێك ورد بێتەوە لە جوڵەی جەنگە ڕزگاریخوازیەکانی ئیسلام سەرکەوتن و کۆمەکی خوای باڵادەست بۆ سوپاکانی خەلیفە هەست پێ دەکات، کە ئەو سوپایانە لە ماوەیەکی کورتدا توانیان سەرکەون و دەسەڵاتی ڕۆم و فارس ڕامماڵن.

**گرنگترین هۆکاری ئەو سەرکەوتنانە ئەمانە بوون:**

باوەڕی تەواوی موسوڵمانەکان بەو هەق و ڕاستیەی لە پێناویدا دەجەنگان، بەرجەستەبوونی ڕەوشتی جەنگاوەر لە موسوڵمانەکاندا، لێبووردەیی و دادپەروەری موسوڵمانەکان لەگەڵ ئەو گەلانەدا، ڕەحم و سۆز نواندنی موسوڵمانەکان لە کاتی دانانی سەرانە و جزیە لە سەریان و بردنە سەری هەر بەڵێنێك کە پێیان دەدات، سامانی بێشوماری

موسوڵمانان لە سەرباز و سەرکردەی ناوازە و مەزن، بەهێزی نەخشە سەربازیەکانی موسوڵمانەکان و شتانی تریش.

٦٠- کاتێك ئەبو بەکر (ﷺ) مردنی نزیك بوویەوە، کۆمەڵێك کاری ئەنجام دا بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی دوای خۆی لەوانە:

ڕاوێژ پێکردنی گەورە هاوەڵان لە کۆچەریان و پشتیوانان، کاتێك ڕای هەمووان هاتە سەر ئەوەی کە عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) بە خەلیفەی دووەم هەڵبژێردرێت یەکسەر صدیق (ﷺ) پەیمانێکی نووسراوی بۆ خەڵکی خوێندەوە، لە شاری مەدینە و هەموو شارەکانی تریش، عومەری ئاگادار کرد لە هەنگاوەکانی و مەبەستەکانی و زۆریشی لێکرد خەلافەت قبووڵ بکات.

خۆی بە زمانی خۆی مەسەلەکەی بە خەڵکی ڕاگەیاند تا کەس لێی تێك نەچێت گومانیان نەمێنێت، لە خوایش دەپاڕایەوە و داوای لێ دەکرد کە ئاواتەکانی دوای خۆی بێنێتە دی، داواشی لە عوسمانی کوڕی عەفان کرد کە پەیماننامەکە بۆ خەڵکی بخوێنێتەوە، پێش مردنی بەیعەتی بۆ عومەر وەرگرت و کۆمەڵێك ئامۆژگاری عومەری کرد کاتێك دوو بە دوو پێکەوە بوون.

٦١- ئەو هەنگاوانەی ئەبو بەکر گرتیە بەر بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەی دوای خۆی هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ بنەماکانی شورادا نەبوو، ئیتر با ئەو شێوە هەڵبژاردنە جیاواز بووبێت لە شێوازی هەڵبژاردنەکەی خۆی، ئا بەو جۆرە عومەر هەڵبژێردرا بە خەلیفەی موسوڵمانان بە شورا و ڕێککەوتن، لە مێژوودا هیچ نەیاریەك دژی هەڵبژاردنەکەی تۆمار نەکراوە، بە درێژایی تەمەنیشی کەسێ بەربەرەکانی نەکردووە لەسەر ئەوە، بەڵکو هەموو موسوڵمانان کۆك بوون لەسەر حوکمڕانیەکەی و هەموویان یەك ڕایان هەبوو.

٦٢- ئەبو بەکری صدیق (ﷺ) لە دونیا دەرچوو پاش تەمەنێکی پڕ لە جیهاد و گیان فیدایی لە پێناو بڵاوکردنەوەی ئایینی خوادا، هەموو مرۆڤایەتی قەرزاربارى ئەو شێخە مەزنەن کە ئاڵای بانگەوازی پێغەمبەری خوای هەڵکرد و نامەکانی پێغەمبەری خوای پارێزگاری لێکرد.

هەستا بە چاودێری کردنی داد و سەربەستی و بە خوێنی پاکی شەهیدان ئاوی دا و بەروبوومی زۆری لێ کەوتەوە، لە مێژوودا پێشکەوتنێکی گەورە بەدی هات لە هەموو بوارەکانی ڕۆشنبیری و فیکر و هۆشدا.

بەردەوام شارستانیەتی قەرزارباری صدیق (ﷺ)ە، چونکە بە جیهادە جوانەکەی و هۆش و بیناییە مەزنەکەیەوە توانی ئاینی ئیسلام لە ناو گەل و هۆز و وڵاتاندا بڵاو بکاتەوە بە هۆی ئەو جەنگە ڕزگاریخوازیە مەزنانەوە.

٦٣- ئەم هەوڵە کەمەی من کە جێگەی ڕەخنە و پێشنیاری هەموو لایەکە، تەنها هەوڵێك بووە بۆ دەرخستنی ڕاستی سەردەمی خەلافەتی ڕاشید، تا بەردەوام سوود لەو بزوتنەوە مەزنە وەربگرین لە هەڵنانی هەنگاوەکانی بەردەوامماندا بۆ جێگیر کردنی حوکمی خوا لەسەر زەوی و بڵاو کردنەوەی ئاینەکەی لە ناو خەڵکدا و بە ڕەخنە گرانیشم دەڵێم وەك شاعیر دەڵێت:

ان تجد عیباً فسد خللا        جلّ من لا عیب فیه و علا

واتا: ئەگەر عەیب و ناتەواویەکت بینی، تۆ تەواوی بکە، بەرزی و بڵندی بۆ ئەو خوایەی ناتەواوی نیە.

داواکارم لە خوای مەزن، پەروەردگاری عەرشی ڕێزدار، کە ئەم کارەم لێ قبووڵ بفەرموویت و پیرۆزی بکات و بیخاتە ڕێزی کردەوە چاکەکانم تا لێوەی نزیك ببمەوە و منیش و هەموو ئەو برایانەی کە هاوکاریان کردم لە نووسینی ئەم ژیاننامەیەدا بێبەش نەکات لە پاداشت و هاوڕێیەتی ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان.

ئەم کتێبە کۆتایی پێ دێنم بە ئایەتێکی پیرۆزی قورئانەکەی پەروەردگارم کە دەفەرموویت:

﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ۝١٠﴾ (الحشر: ١٠).

(سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ان لا اله الا انت أستغفرك وأتوب اليك واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين).

